ألمَصْدوقَــه) (مــص): راســتيى/ ســاغيى/ راسگۆيى.

٢-(صَــدَقَ- في الحَمْلَــةِ صَدْقــاً وصِدْقــا ومَصدوقَةً وتَصْداقاً): هێرشەکەی بە ڕاستیی کردو ئازایەتیی‌و دلێریی نواند.

(«صَدَقَ القِتالَ وصَــدَقَ فُلاناً القتالَ»): لە پەلامارەکەدا بە ڕاست شەڕیکردو توندوتیژو خۆڕاگرانە بوو.

(ألصَدْق (مص) (ج) صُدْق وصُدُق وصَدقُون (م) صَدْقَةُ (ج) صَدْقات): نێزەو شتی وەهای ڕاست‌و ڕێک‌و پتەو.

(ألصِــدْق): تونــدو ســەختیی/ ڕەقیــی‌و بەڕاستیی.

(تَمْرٌ صادِقُ الحلاوة): خورمایەکی بە ڕاست شیرین/ زۆر شیرین.

(حَملَــةٌ صادِقَةٌ): هێرشــێکی ڕاســتەقینەو توند/ سەخت.

(ألمَصْدَق): دلێرو ڕاست‌و بوێر.

(«إنَّهُ ذو مَصدَقٍ أو ذو مِصْدَقٍ»): بەڕاست‌و بوێــرو نەبــەردە لــە پەلامــاردان‌و هەموو کارێکیدا.

٣-(صادَقَ- على الشــيءِ) (عامية): لەســەر شتەکە ڕێککەوت‌و ڕایدا/ پەسەندیکرد.

(الصادِقَة): ڕوونبوونەوەو بڕواپێهێنان.

(«فَعَلَهُ غِبَّ صادِقَــةٍ»): کارەکەی ئەنجامدا پاش ئەوەی بــۆی ڕوونبووەوە بڕوای پێهێنا/ پەسەندیکرد.

٤-(أَصْــدَقَ- الإبنَــةَ): مارەیــی بــۆ کچەکە بڕییەوە یان دانا/ دیاریکرد.

(الصَدُقَــةُ والصُدْقَــةُ والصَدُقَــةُ والصُدُقَةُ والصَــداق والصِــداق (ج) أَصْدِقَة وصُدُق): مارەیی ژن.

٥-(تَصَدَّقَ): خێریکرد/ بەخشی/ بەخشندەییکرد.

(تَصَــدَّقَ على الفَقــيرِ بكَــذا): هێندەی بە هەژارەکە (بەخشی/ خێرکرد).

الصِــدْق): ١-چاکە/ پیاوەتیی/ بەخشــندەیی ٢-باشیی‌و دڵنەرمیی.

(ألصَدَقَةُ (ج) صَدَقات): خێری بەلاگەردان/ خێر بۆ پاداشت.

الملحق:

صــدق: ألمُصَدَقَةُ: مۆرکــراو/ بڕوانامەیەکە کە کارەکەو ڕاســتییەکەی دەسەلمێنێت‌و جێی بڕوابوونی دەردەخات‌و دەداتێ.

---

صدم: ١-(صَدَمَ-ه): خۆی پێدادا/ بە ڕێکەوت پاڵیپێوەنا.

(«صَدَمَــهُ أَمــرٌ شــديد»): کارێکــی گران‌و سەختیی بەرکەوت‌و بەسەرهات.

(صادَمَ- هُ مُصادَمَة): پیایدا کێشا.

(تَصادَمَ واصْطَدَمَ- الفارِسان): دوو سوارەکە بەیەکیانداداو یەکتریان تەنگەتاو کرد.

الصَدْمَة: ١-جارێك(بەیەکدادان/ بەریەککەوتن)/ جارێك بەرکەوتن/ تووشبون.

(«صَرَعَهُ بِصَدْمَةٍ») به پێداكێشانێك داى به زەويدا.
(أَعطاهُ رزقَ شَـهرَينِ صَدْمَـةً): رۆژیی دوو مانگی بەیەكجار دایە.
(رَجُلٌ مِصْدَمٌ): پیاوێكی بەتەكانی شەركەری ئازایە.
٢-(ألصِـدام) (طب): نەخۆشـییەكە دەداتە كەللەی چوارپێ.
(ألصَدْمَتانِ والصَدِمَتانِ): ئەملاولای (تەوێڵ/ ناوچەوان).
(ألأَصْدَم= الأَنْزَع): كەسـێكە كـە قژی هەر لەمـلاولای ناوچەوانیدا هەبێت، واتە تەپێڵی سەری رووتابێتەوە.
الملحق:
صدم: (ألإصْطِدام): بەیەكدادانی دوو شـتی رەقو سـەخت بە جووڵە لەیەك دەدەن وەك («إصْطِـدام سَـیَّارَتَین»): لەیەكدانـی دوو ئوتومبیل.

---

صـدا: (صَدا وصَـدَّى بِیَدَیه. صَـدْواً): بە هەردوو دەست چەپڵەیلێدا.
صـديَ: ١-(صَـدِيَ. يَصْـدى صَـدىً): زۆر تینووبوو.
(صَدٍ وصـاد وصَدْیـان (م) صَدْیا وصادِیَة (ج) صَوادٍ):زۆر تینوو.
(«أَنا صَدْیـان إلى حدیثِـكَ»): من تینووی قسەكانتم.

(«لي أَحشاء صَوادٍ إلَیك»): دڵم زۆر تینووی تۆیە.
(ألصَدى (ج) أَصداء): تینوێتییەكی زۆر.
٢-(صَدِيَ. يَصْدى- الشـيءُ. صَدىً): شتەكە درێژ بوو.
٣-(صَـدَّى- بِیَدَیه. تَصْدِیَـةً): بە هەردوو دەست چەپڵەیلێدا.
(أَصْدى. إِصْداءً): مرد، كپبوو. نەدەبیسـێتو نە دەنگی هەیە.
(-الجَبَلُ): كێومكە دەنگیدایەوە.
(ألصَدى (ج) أَصداء): ١-دەنگدانەوە/ زایەڵە.
(«أَسْـرَعُ مِن رجع الصَـدى»): ١-لە دەنگی گەراوە خێراترە» ٢-تەرمی مردوو.
(«هُم الیوم أَعداءُ وهُم غداً أَصداءُ»): ئەمرۆ دوژمنن سبەی تەرمی مردوون.
(«صُمَّ صَداهُ»): دەنگی برِا فەوتا. وەك هیچ شتێك نەبیسێتو وەڵامی بداتەوە.
(«أَصَـمَّ اللهُ صَـداهُ»): خـودا فەوتانـدی/ لەناویبرد/ دەنگی بری.
(ألصَدى): ٣-مێشك ٤-ئەوەی لە كاسەیسەردایە ٥-العامةَ: بایەقوش. جۆرە كوندەبەبوویەكە كەللە گەورە سـەرت بۆ هـەر لایەك بادا ئەو لە پێش تۆوە سەربادەدات لە كەلاوەو وێرانە تاریكەكانـدا دەژی. عەرەبـی پێش ئیسـلام بروایـان وابوو كە لە كەللەسـەری كوژراوەوە پەیدا دەبێت كەللە سەرەكە هەر هاوار دەكات

ئاومیدەنێ ئاومیدەنێ تا تۆڵەی کوژراوەکە دەسێنرێت ئەوسا بێدەنگ دەبێت بۆیە ناونراوە صدی واتا دەنگدانەوەی کوژراوەکە.

٤-(صادی-ەُ مُصاداةً): ١-بەرهەڵستیکرد ٢-دڵیراگرت و لەگەڵیدا هەڵیکرد ٣-شاردیەوە.

(تَصَدَّی- لە): بەرەنگاریبوو/ ڕێپیگرت.

(تصدی- للأمر): سەری بۆ کارەکە بڵند کردەوەو تێیڕوانی.

(ألصَدی (ج) أصداء): بەرەنگاریی.

(«مَنَعَت صَداهُ»): بەرهەڵستی بەرەنگارییەکەی کرد.

صرّ: ١-(صَرَّ- الصُرَّةَ. صَرّاً): تووڕەکەی پارەکەی بەست.

(-الدَراهِمَ في الصُرَّةِ): پارەکەی خستە تووڕەکەی/ پریاسکەی پارەکەوە.

(-النَاقَةَ وبالنَاقَةِ):گوانی مێحوشترەکەی لە پریساکە هەڵکێشا تا بەچکەکەی نەیمژێت.

(ألصارّ) (فا): پێچخواردوو/ بەیەکداچوو.

(شَجَرٌ صارّ): درەختێکی بەیەکداچوو تێکئالاو.

(ألصارَّة (ج) صَوارّ): مێی وشەی (الصارّ).

(ألصَرّ) (ت): ئەو پارەیەی دەخرێتە تووڕەکەوەو بۆ شوێنان دەنێردرێت.

(ألصَرَّة): ناوچەوان بەیەکدادان/ کرژبوون.

(ألصُرَّةُ (ج) صُرَر): تووڕەکە/ پریاسکە کە پارەی تێدەخرێت.

(ألصِرار (ج) أصِرَّة): پەتێکە گوانی مێحوشترەکەی پێدەبەسترێت تا بەچکەکەی نەیمژێت.

(ألصَرّار): زۆربەیەکداچوو.

(ألصَريرَة (ج) صَرائِر): پارەی لە تووڕەکەنراو.

(ألمِصَرّ): تووڕەکەی بژێویی ڕۆژانە.

(ألمِصار): ڕیخۆڵە.

(ألمَصْرور) مفع: دیلی کۆتکراو/ بەستراو.

٢-(صَرَّ- الفَرَسُ. أُذُنَهُ وبأُذُنِهِ. صَرّاً): چارەوێکە گوێی قوتکردەوەو گوێی هەڵخست.

(صَرَّرَ أُذُنَهُ): گوێی قوتکردەوە/ ڕەپکرد/ گوێی هەڵخست گوێگرێت.

(-تِ الناقَةُ): مێحوشترەکە پێشکەوت.

أصَرَّ- الفَرَسُ أُذُنَهُ وبأُذُنِهِ: گوێی (ڕەپکرد/ قوتکردەوە) ببیسێت.

(-السُنبُلُ): لاسکی گوڵە گەنمەکە یان جۆگە ڕەق و پتەو بوو.

(ألصَرَر الواحِدَةُ (صَرَرَة): گوڵە گەنم یان جۆ پاش ئەوەی لاسکەکەی ڕەق و پتەو دەبێت.

(ألصَرَرَةُ): لاسکە گەنمێکی ڕەقبوو.

٣-(صَرَّ- الشيءُ. صَرّاً وصَريراً): شتەکە (دەنگی/ جیڕەی/ خشەی/ ورشەی) هات/ لێوەهات.

(-الرَجُل): هاواریکرد/ قیژاندی.

(-تِ الأُذُنُ): گوێکە وژەوژی لێوەهات.

ريحٌ صِرٌّ: بايەكى (بەگفەگف/ گفەتوند).
(ألصَرَّة):١-هاتو هاوار/ گرمەگرمو ناڵەناڵ/ ڤيژەڤيــژ/ هەراوهوريــا ٢-گەرمەى شــەرو ڤرچەى گەرماو گەرمەى شتيتر.
ألصِرَّة: هــاتو هاوارى تونــد/ ناڵەو گرمەى بێئەندازە.
(صَرَّارُ اللَّيل) (ح): سيسرك.
(ألصَــرَّارَة) (ح) = أبي صَــوَيّ) (ح): جۆرە باڵندەيەكــى گۆشــتخۆرە وەك كــۆلارە وايە مارخۆرە.
٤-(صَــرَّ- الرَجُــلُ. صَــرّاً و صَريــراً): تينويبوو.
(ألصَارَّة (ج) صَوارّ): تينوێتى.
٥-(صُرَّ- النَّباتُ): سەرمابردى.
(ألصِرّ والصِرَّة):١-سەرما.
٢-ريحٌ صِرٌّ: بايەكى زۆر سارد.
٦-(صــارَّ- هُ على كــذا. مُصــارَّةً): ناچارى نەوميكرد.
٧-(أصَرَّ- على الأمرِ): سوور خواستو هەتەر بوو لەسەر ئەو كارە پێيداگرت (بە زۆريى بۆ خراپەو گوناە بەكاردێت).
(«أصَــرَّ على الذَّنبِ»): لەســەر گوناهكردن هەتەر بوو لەسەرى ڕۆيشت/ پێيداگرت.
(صِرَّى): ڕاستو تەواو.
«هي مِني صِرَّى»: ئەوە سوورخواستى منە.
(يمــينٌ صِرَّى): ســوێنديكى تەواوو ڕاســت بێپەشيمانبوونەوە.
(ألصَرُور والصارُور والصَرُوريّ والصارُوريّ): پياوى ڕەبەن يان حەجنەكردوو.
(ألصَرارَة والصَرُورَة والصارُورَة والصارُوراء): كەسێكە نە حەجيكردبێت نە ژنيهێنابێت (بۆ تاكو كۆ هەروا دەوترێت).
٨-(ألصَــرَّة):١-دەســتە/ كۆمــەڵ ٢-موروو و پەتەكەى كە بۆ هۆنينەوەيە.
(ألصارَّة (ج) صَوارّ): پێداويستيى.
(ألصِرار (ج) أصِرَّة): شــوێنێكى بەرزى وەها كە ئاو نەيگاتێ.
(ألصَراريّ (ج) صَراريون): دەرياوان.
٩-(صَرْصَرَ- الصُــرَدُ أو الصقرُ): كۆلارە يان هەڵۆ كە زريكاندى، خوێندى.
(-الرَجُــلُ): پياوەكــە تونــد هاواريكــرد/ گرماندى.
الصَرصَر (ح): كەڵەشێر.
(- من الرياح): باى توند هەڵكردوو يان زۆر سارد.
(الصَرْصَــرَ والصُرْصُــر (ج) صَراصِــر والصُرْصُــور (ج) صَراصــير (ح)= صَــرَّارُ اللَّيل): سيســرك/ زيكزيككەرە كە بە شــەو دەردەچێتو زيكەزيكدەكات.
١٠-(صَرْصَرَ-الشَيءَ): شــتەكەى كۆكردەوەو گرمۆڵە كردو پێچايەوە.
١١-(الصُرْصُور): پاپۆر.

صــــرب: ١-(صَــرَبَ. صَرْباً): برِی ٢-ماســتی ترشــی کرده مەشــکەوە بۆ گرتنی کەرەکەی ٣-میزەکــەی ڕاگرت یــان ماســتەکەی کردە مەشکەوەو بەندیکرد.

(-الصَبِــيُّ): منداڵەکە چەنــد ڕۆژێك گووی نەکرد.

(صَرِبَ-اللبَنُ. صَرَباً): شیرەکە لە گوانەکەدا کۆبووەوە.

(صَــرَّبَ): ماســتی ترش یان شــیری ترشــی هەڵگرتــووی نــاو مەشــکەی خــوارد یــان خواردەوە.

(إصْطَــرَبَ- اللــبنَ في الوَطْبِ): شــیرەکەی تــۆزە تۆزە کۆکردەوەو کردیە مەشــکەکەوەو هێشتیەوە تا ترشبێت.

(ألصَرْب والصَرَب الواحِدَةُ صَرْبَة وصَرَبَة): شــیر یان ماستی لە مەشــکەدا هێڵراوەی زۆر ترش.

(ألصِــرْب): چەنــد ماڵێکــی عەرەبــی لاتو بێدەسەلات.

(ألصَريــب (ج) صُــرْب): شــیر یان ماســتی ترش.

(ألمَصْروب) (مفع): ماست یان شیری هێڵراوەی ترشاو.

(ألمِصْــرَب (ج) مَصــارِب): دەفرێــك یــان مەشکەیەك کە شیری تێدا کۆدەکرێتەوە.

٢-(صَرَبَ. صَرْباً): دەستیکەوت/ دەستگیربوو.

(أصْرَبَ إليهِ. مالاً): دارایدایە.

٣-(إصْــرَأبَ- الشَــيءُ): شــتەکە: پوختــەو لووسبوو.

٤-(الصَرْب والصَرَب): لۆکیســوور/ کەتیرەی سوور.

(صَرْبَة وصَرَبَة): ١-لۆکێکی سوور ٢-کەتیرەی درەخت.

صَــرج: (صَــرَّجَ- الحــوض): گۆلەکــەی/ حەوزەکەی بە قسڵ دروستکرد (فارسية).

(-الحَوضَ): بە قسڵ سواغیدا.

(ألصــاروج): گــەچو قســڵو لــەو بابەتانە (فارسية).

صرح: ١-(صَرَحَ- الأمــرَ صَرْحاً): کارەکەی (ڕوونکردەوە/ ئاشکراکرد/ دەرخست.

(صَرُحَ. صَراحَةً وصُرُوحَةً): ڕوونو پوختو ئاشکراو دیاربوو.

(صَريحٌ (ج) صُرَحاء (م) صَريحَة): پوختو بێخەوش/ ئاشکرا/ ڕوون/ بێپێچو پەنا.

(«رَجُــلٌ صَريــحُ النَسَــب»): پیاوێکــی ڕەسەنپاك.

(«جاءَ بَنــو فُلان صَريحَةً»): فیســار بەرە هاتنو بێگانەیان تێکەڵ نەبوو.

(صَــرَّحَ- الأمــرَ): کارەکــەی ئاشــکراو ڕوونکردەوە/ دەرخست.

(-الأمــرُ): کارەکــە ڕوونو ئاشــکرا بــوو/ دەرکەوت.

(-المُتَكَلِّمُ): قسەكەرەكە بە ڕاشكاوییو ئاشكرا دەریبڕیو قسەیكرد.
(-بما في نَفسِـــهِ): چی لە دڵدا بوو دەریبڕیو هەڵیڕشت.
(-النَّهارُ): هەورەكــە ڕەوییەوەو نەماو خۆر دەركەوتو ڕووناكیدا.
(-الخَمرُ): كەف مەیەكە ڕۆیشتو نەما.
(«صَرَّحَ الحَقُّ عَن مَحضِهِ»): ڕاستیی كورۆكی خۆی بەدەستەوە داو دەركەوتو ڕوونبووەوە كە لەوەپێش شاررابووەوە.
(-تِ السَّنَةُ): ســاڵەكە تەواو سەختو وشكە ساڵو گرانییەكی تەواو بوو.
(صـــارَحَ-هُ. صِراحاً وصُراحــاً ومُصارَحَةً): رەپو راستو ئاشكرا لەگەڵیدا دوا.
(«شَتَمَهُ مُصارَحَةً أَو صَراحاً»): بە ئاشكراو ڕووبەڕوو جنێوی پێدا.
(-بِما في نَفسِهِ): چی لە دڵیدا بوو دەریبڕیو ئاشكرایكرد.
(أَصْـــرَحَ- الأَمـــرَ): كارەكــەی دەرخســـتو ڕوونكردەوە.
(تَصَـــرَّحَ- الزُبــدُ عَنِ الخَمــرِ): كەفەكە لە مەیەكە بووەوەو مەیەكە سافبوو.
(إِنْصَـــرَحَ- الحَــقُّ): ڕاســتییەكە/ مافەكــە دەركەوتو ڕوونبووەوە.
(أَلصَـــرْح (مــص) (ج) صُرُوح): ١-كۆشــك ٢-تەلارو هەموو بینایەكی/ خانەیەكی بەرز.

(أَلصَرْحَةُ (ج) صَرَحات): ١-جارێك بە ئاشكرا دەربڕین ٢-زەویی بەرزو ڕێكو سەخت.
(صَرْحَةُ الدار): حەوشەی خانوو.
(«خَرَجَ لَهُــم صَرْحَةً»): لێیــان پەیدابوو/ بۆیان دەركەوتە دەرەوە.
(أَلصَـــرَح والصَـــراح والصِـــراح والصُراح): پوختەی هەموو شتێك.
(كأسٌ صُـــراح»): جامێكی پوختە كە هیچی تێكەڵ نەكرابێت.
(أَلصَراحَة والصُرُوحَة): ڕاشكاویی/ بێپێچو پەنــا/ ڕەپوراســـت/ یەكانــدەردوو/ ڕوونو ئاشكرایی ٢-دڵسۆزییو پاكیی.
(أَلصُراحِيَّـــة- مِنَ الخَمـــرِ): مەیی پوختو ساغ.
(«كِــذْبٌ صُراحِيَّة»): درۆیەكی ئاشــكرا كە خەڵك دەیزانێت.
(«أَتاهُ بالأَمرِ صُراحِيَّةً»): كارەكەی بە پاكیی خستە بەردەستی.
(أَلصُراحِيُّ): دیار/ ئاشكراو ڕوون.
(أَلصُراحِيَّةُ): سوراحی/ جامی مەی.
(يومٌ مُصَـــرِّحٌ ومُصَـــرَّحٌ): ڕۆژی (ســامالٌ/ سایەقە).
٢-(صَرَّحَ- الرَّامي): تیرهاوێژەكە نیشانەكەی نەپێكا.
الملحق:
صرح: (أَلتَصْريح (ج) تَصريحات وتَصاريح

(مـص): ١-بڕوپاما قسـەکردنو دەربڕین/ دانپێدانـان/ ئاشـکراکردن ٢-ڕاگەیانـدنو ڕوونکردنەوەی کارێك.

(«تَصريـحٌ صُحُفِـي»): ڕاگەیاندنێکـی ڕۆژنامەگەریی.

(اَلتَصْريح): ڕێپێدانو مۆڵەتدان.

(اَلتَصريح بِالمـرُور): ڕێ بە تێپەڕبووندان/ ڕێدان.

الترخيـص والاجازة: مۆڵـەتو ڕێگەپێدانی کردنـی هــەر کارێك یـا گوزارێك یـان هەر بزاوتنێکیتر کە دەسەلاتدارێتی بیدات.

صــرخ: ١-(صَرَخَ. صُراخاً وصَريخاً): ١-توند هاواریکرد/ قیژاندی/ گرماندی ٢-هاواریکرد فریامکەون/ بەهانامەوە بێن.

(صَرَخَ لَـهُ) (عامية): هــاواری (لێکرد/ بۆ کرد) بانگیکرد.

(تَصَرَّخَ): قیژەی درۆیکرد/ بە درۆ قیژاندی.

(تَصــارَخَ- القَومُ): هاواریــان لە یەکتریکردو هانایان بۆ یەکتریبرد.

(إصْطَرَخَ- الرَجُلُ): هاواری لێهەســتا هانای بردە بەر خەلکی.

(-القَومُ): هاواریان لە یەکتریکردو هانایان بۆ یەکتریبرد.

(إسْتَصْرَخَ-هُ): ١-قیژەو هاواری لێهەستاند ٢-هانای بۆ برد.

(اَلصَّارِخ) (ح): کەڵەشێر.

(الصارِخَــةُ): مێی وشــەی (الصــارِخ) دادو هاواری داوای بەفریاکەوتن/ هانابۆبردن.

(«سَـمِعْتَ صارِخَةَ القَـوم»): دەنگی هاناو فریابۆکەوتنی خوێشگەلم هاتە گوێ.

(اَلصَــرَّاخ): ١-دەمبەهــاوار/ فرەقیژەو هاوار ٢-(ح) تاوس.

(اَلصَارُوخ): ١-فیشەکەشێتە: تیرێکە قەدەکەی قامیشێکی پێومیە سەرێکی لوولەکێکی مقەبای تێدایــە لە بــارووت پڕدەکرێــت پلێتەیەکی پێومیە کــە ئاگرنرا بە پلێتەکەوەو ســووتاو گەیشــتە باررووتەکە گــازی لێدەبێتەوەو پاڵ بە تیرەکەوە دەنێتو دەردەچێت ٢-مووشەك: چەکێکــی جەنگــە. لەوانەیە بــۆ کاروباری تریــش بەکاربهێنرێــت لوولەکێکی گەورەیە شــێوە قووچەکییە دوو باڵی بچووکی پێومیە کە یارمەتیو جێگیربوونی دەرچوونی دەداتو ڕادەگیرێــت لەســەر بیرۆکەی فیشەکەشــێتە کاردەکات لەوانەیشە بە ڕادار کاری پێبکرێتو ڕووی بکرێتــە ئــەو شــوێنەی بوێســترێتو تێیبکەوێت.

(اَلقَذائِــف الصاروخِيــة) (ا ع): گوللــە مووشەك. جۆرە گوللەیەکی پڕ لە کەرەسەیە کــە دەتەقێتــەوەو لــە شــەڕدا/ جەنگــدا بەکاردێت ئەمەیش ســێ جۆرە: یەکەمینیان بە هــۆی ئامێــری تایبەتییەوە لــە خۆیەوە دەردەچێــت دووەم ڕادار دەیبزوێنێتو دوای

تیشکی رادارەکــە دەکەوێــت و لێیلانــادات هەیشە بەرەو شــوێنی ویســتراو دەردەچێت بە هێزێکی تایبەتی کە بۆ ئەو نیشــانەیە بە کێشــیدەکات بەبێ ئــەوەی راداری بوێت یان رادار ئاراستەیبکات.

(ألصَريــخ (مــص) (ج) صُرَخــاء) (ضد): ١-هاواربــەر/ فریاخــواز ٢-بەفریاکەوتــوو/ بەهاناوەچوو/ بەدەنگ هاوارەوە چوو.

٢-(صَــرَخَ- القَــومَ. صُراخــاً وصَريخــاً): بــە فریــای خوێشــگەل کــەوت یارمەتیدان بەهانایانەوە چوو.

(أصْــرَخَ-هُ): بە دەنگ هاواریــەوە چوو/ بە هانایەوە چوو و کۆمەکیکرد/ یارمەتیدا.

(الصارِخَــةُ): (بــە هانەوە/ بــە فریاوە/ بە دەنگی هاوارەوە) چوون.

(ألصَريــخ (مــص) (ج) صُرَخــاء: (ضد): بەهانــاوە چــوو/ بەدەگی هــاوارەوە چوو ٢- هاواربەر/ فریاخواز.

صــرد: ١-(صَرِدَ- السَّــهمُ صَــرَداً) (ضد): ١-تیرەکــە نەیپێــکا ٢-تیرەکــە پێــکای/ لــە نیشانەکەیدا.

(صَــرَدَ- الرَّامــي السَّــهمَ): تیرهاوێژەکــە نیشانەکەی شکاند/ پێکا.

(أصْرَدَ السَّهمُ): تیرەکە ئامانجەکەی نەپێکا.

(-الرامي السَّهْمَ): تیرهاوێژەکە نیشانەکەی پێکا.

(ألصَرَد): بزمارێکە بە ســەری نێزەوەیە بە نێزەکەدا دەچەقێنرێت.

(الصادِر) (فا): پێداچوو/ پێکاو.

(سَهْمٌ صارِد): تیرێکی ئامانجپێك.

(سَــهمٌ مِصــراد): تیرێکی نیشــانەپێك/ بە نیشانە گەیشتوو.

(-مُصَرِّد): تیری نیشانەشــکێن/ بە نیشــانە گەیشتوو.

٢-(صَرِدَ- الرَّجُلُ. صَرَداً) (ضد): ١-بەرگەی سەرمایگرت ٢-بەرگەی سەرمایەنەگرت.

(الصَرْدَ): ١-سەرما ٢-شوێنی بەرزی شاخ.

(يَومٌ صَرْد (ج) صُرُود): رۆژی سارد.

(«مات صَرْداً»): لە سەرماندا مرد.

(أرضٌ صَــردٌ (ج) صُرود): خاکێکی ســارد/ کوێستان.

(خِلافُ الجُروم): پێچەوانەی گەرمیان.

(ألصَوارِد): بای سارد.

(ألصَرِد- مِن الرجــال (ج) صَرْدى) (ضد): پیاوی بەرگەگری سەرماوســۆڵە/ ســاردی ٢- بەرگەنەگری ساردی.

(يَومٌ صَرِد): رۆژێکی سارد زۆر.

(ألصُرَّاد والصُرَّيد) تەنکــە هەور کە بارانی پێوە نییە.

(نَعْجَةُ صَريدَةُ (ج) صَرائِد): مەرێکی سەرما بردووی لاواز بوو.

(ألمِصْــراد) (ضد): بەرگەگری ســەرمان یان

بەرگەنەگری سەرما.
٣-(صَرِدَ- السقاءُ. صَرَداً): کەرەی مەشکەکە تۆزە تۆزەو پچڕ پچڕ هاتە دەرێ.
(صَرِدَ قَلْبي عَنْهُ): دڵم لێی هەڵکەنرا.
(صَــرَّدَ- الشــيءَ): شــتەکەی لەتلەتکــرد/ پارچەپارچە کرد.
(-العَطاءَ): بەخششەکەی کەمکردەوە.
(-الرَجُــلَ): نــاوی دایــە بــەڵام تینوێتیی نەشکاند.
٤-(الصَرْد): پوختو پاکی هەموو شتێك.
(ســقاهُ الخَمرَ. صَرْداً): مەیەکی ساغو پاکو پوختی دەرخوارد دا.
(«أَحَبَّــهُ حُبّــاً صَرْداً»): لە هەمــوو کانگای دڵیــەوە خۆشیویســت/ دڵدارێکــی پــاكو ساغبوو.
(اَلصَرَد) (ا ع): سوپایەکی بێشومار/ مەزن.
(اَلصُــرَد (ج) صِــردان) (ح): باڵندەیەکــی کەللەزلی بەرســك ســپیو سەرپشــت سەوز باڵندەی لە خۆی بچووکتر دەخوات.
(اَلصَرِد- مِنَ الخَيل (ج) صَرْدى): ئەسپێکە شوێن زینەکەی بریندار بووە.
(اَلصَرَدان) (ع ا): دوو ڕەگی ژێر زمانە.
(اَلمِصْراد): زەویی بێدرەخت.
(اَلمُصْطَــرِد): ڕقاوییەکــی/ ڕقئەســتووری دەمارگیر.
صرط: (اَلصِراط (ج) صُــرُط) (یونانیة): ڕێ.
(اَلصُراط): شمشێری درێژی برەرو تیژ.
صرع: ١-(صَرَعَ-هُ صَرْعاً وصِرْعاً ومَصْرَعاً): دایبەزەویدا.
(صُرِعَ- الشَجَرُ): درەختەکە بڕرایەوەو خرا.
(صَرَّعَ-هُ): توندی بە زەویدا دا.
(صــارَعَ- هُ. صِراعــاً ومُصارَعَــةً): زۆرانی لەگەڵدا کردو ویستی بە زەویدا بدات.
(تَصَــرَّعَ- لِصاحِبــهِ): نەرمیــیو بێفیزیی لەگەڵ دۆستەکەیدا نواند.
(«مازلــتُ أَتَصَرَّعُ إِلَيهِ ولَهُ حتى أَجابني»): هــەر ناســکییو نەرمیم لەگەڵــدا نواندو بە دەوریدا هاتم تا بە دەنگمەوە هات.
(تَصــارَعَ واصْطَــرَعَ- الرجــلانِ): کەوتنە زۆرانبازییو هێنانو بردنی یەکتری تا یەکتری بــە زەویــدا بــدەن/ کەوتنــە ڕقەبەرایەتی یەکتری.
(اِنْصَرَعَ): بە زەویدا دراو کەوت.
(اَلصِرْع (ج) أَصْرُع وصُروع): زۆرانباز.
(هُما صِرعان): ئەو دوانە زۆرانبازن.
(اَلصَرْعَة): بە زەویدا دانێك، کەوتنێك.
(اَلصُرْعَة): کەسێکە کە زۆر بە زەویدا بدەن/ تەپەترە.
(اَلصُرَعَــةُ): ســەرمەندییو هێمنی لە کاتی تووڕەییدا (چونکە هێمنیەکەی تووڕەییەکەی دەبەزێنێت).

(اَلصُرْعَةُ والصَــرَّاع والصُرَّاعَة والصِرِّيع): كەســێکە خەڵــك زۆر (بــە زەویــدا بــدات/ بیبەزێنێت).
(قَــومٌ صُرَعَــةٌ): خوێشــگەلێکن نــەوەی زۆرانیــان لەگەڵدا بگرێت (بە زەویدا دەدەن/ دەیبەزێنن).
(اَلصِراعَة): زۆرانبازی.
(اَلصَرُوع (ج) صُرُع): پاڵەوانبەزێن.
(اَلصَریع (ج) صَرْعی= المَصروع): بە زەویدا دراو/ بەزیو.
(«بات صَریعَ الكأس»): بەدرێژایی شەو مەی بە زەویدا داوەو پەکیخستووە.
(اَلصَریــع (ج) صُرْع): چڵێك بە دارەوە بێت شۆڕبووبێتەوە سەری لە زەویدا بێت.
(اَلمَصْرَع): شوێنیو مەیدانی زۆرانگرتنو بە زەویدادانو بە زەویداکەوتن.
(اَلصِراع): زۆران/ کێشمەکێش/ ڕقەبەرایەتی.
٢-(صَرَع- الشِــعْرَ أو البابَ. صَرْعاً وصِرْعاً ومَصْرَعاً): هەڵبەســتەکەی کرد بە دوولا یان دەرگاکەی دوو لاییکرد/ دووتاککرد.
(اَلصَرْع (ج) أَصْرُع وصُرُوع): ١-هاوچەشــن/ تاك/ وەکو ئەو هاونموونە/ هاووێنە ٢-جۆرو هونەریی شتەکە.
(«هو صَرعُ كَذا»): ئــەو هاوکووفو هاوتای ئەوەیە/ تاکی ئەوەیە.
(اَلصَرعان): شــەوو ڕۆژ یان ســەرلەبەیانی پێش هەتاوکەوتنو سەر لە ئێوارێ.
(«هو ذو صَرْعَین»): ئەو دوو ڕەنگە.
(«تَرَكْتُهُــم صَرْعَــین»): بەجێمهێشــتن لە بارێکەوە دەچوونە بارێکیتر.
(اَلصِرْع (ج) أَصْرُع وصُرُوع): هاووێنە/ وەکو ئەو/ هاوچەشن/ جۆرو شێوە هونەریی شت.
(اَلصَرْعَةُ): بار/ ڕەوش.
(هو يَفعَلُهُ على كُلِّ صَرعَة): ئەو بە هەموو بارێك دەیکاتو کارەکە ئەنجامدەدات.
(اَلمِصْراع- مِنَ الباب (ج) مَصارِيع): تاکێکی دەرگا.
(دَرْفَة) (عامية) = المصراع — مِنَ الشِــعْر): نیــوە دێــری هەڵبەســت (دەڵێــن گوایــا لە (صَرعَین)ەوە واتا دوو تاقی ڕۆژەوە هاتووە).
٣-(صُرِعَ): تووشی فێبوو/ پەرکەم گرتی.
(اَلصَــرْع (ج) أَصْــرُع وصُــرُوع) (طــب): پەرکەم/ فێ.
(اَلصَــرْع) (عنــد العامة): سەریەشــەیەکی توند.
(اَلصَریع (ج) صَرعی): شێت شێتۆکە.
(اَلمَصْروع) (مفع) عامية: پەتەڕی/ هاروهاج/ هەڵەشەو بەرەڵا.
الملحق:
صرع: (اَلمُصارِع): زۆرانباز کەســێکە پیشەی زۆرانبازیبێت.
(اَلمُصارَعَــة): زۆرانبازیی جۆرە وەرزشــێکە

دوو کـەس بەگژیەکـدا دەچـن بـە بێچەك هەریەکە هەوڵی ئەوە دەدات پشتی ئەویتر لە زەوی بداتو بە پێی دەستورێکی دیاریکراوی یارییەکـە بیبەزێنێـت/ لـە جۆرەکانـی زۆرانبازیـی: سەربەسـتە زۆران هەروەهـا زۆرانبازیی رۆمانی.

صـرف: ١-(صَـرَفَ-هُ صَرفـاً): گێرایەوەو دەسـتیپێوەنا ٢-بەریداو رەوانەی شوێنەکەی خۆی کردەوە کە لێوەی هاتبوو.

(-الكَلِمَةَ): سەرو بۆری بۆ وشەکە کرد.

(«صَرَفَ اللهُ قُلُوبَهُم»): خودا گومڕایکردن.

(صَرَّفَ- هُ): تەواوو چـاك بەریداو رەوانەی شوێنەکەی خۆی کردەوە/ دەستیپێوەنا.

(-اللهُ الرِياح): خودا ڕووی باکەی لە لایەکەوە بۆ لایەکیتر وەرگێڕا.

(-هُ في الأمـرِ): کارەکـەی بـەرەو ڕووی ئەو کردەوە/ بەویسـپارد/ جڵەوی کارەکەی دایە دەست ئەو.

(صارَفَ- نَفسَهُ عَنِ الشيءِ): خۆی لە شتەکە لاداو دوورخستەوە.

(أصْـرَفَ- هُ عَن كـذا): لـەوەی گێڕایەوەو دەستی پێوە ناو دووریخستەوە.

(تَصَـرَّفَ- في الأمـرِ): بـە هەوەسـی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەو کارەدا کرد.

(-ت بِهِ الأحوالُ): بـارو گوزەرانی وەرگەڕاو گۆڕرا/ باروگەزەران گۆڕی.

(إنصَرَفَ- الرَجُلُ): ڕۆیشتو وازیهێنا.

(-تِ الكَلِمَةُ): وشـەکە خرایە بەر دەستووری زمانەوە/ سەروبۆری بۆ کرا.

(إصطَرَفَ): بۆ دەستکەوتو بژێویی ڕەنجیداو هەڵسوورا.

(إستَصْرَفَ اللهَ المَكارِهَ): لە خودای خواست کە وەیو ناخۆشی لەسەر لابات.

(ألصَرْف) (مـص): زانسـتیی لێکۆڵینەوەی شـێوەی پێکهێنانو باری گۆڕینو نەگۆڕینی دوای وشەکان ناگرێتەوە.

(«صَرفُ الدَّهر وصُروفُـهُ»): نارەحەتییو لێقەومانو گرفتاریی ڕۆژگار.

(ألصَرْفَةُ): ١-مووروو ئەفسـووناویی کە بۆ بەرزبوونـەوەو خۆشەویسـتی دەیکەنە ملو هەڵیدەگرن ٢-(فك) هەوارگەیەکی مانگە.

(ألصَرْفان والصِرفانِ): شەوو ڕۆژ.

(ألصَرَفانُ): مردن.

(ألصَـرَّاف والصَرْفِـيُّ): زانـای زانسـتیی وشەسازیی زمانی عەرەبی.

(ألصَريف والمَصْروف): درەختی وشکبوو.

(ألصَريفَةُ): وشەکە مێیە.

(ج) صُرُف وصِراف وصَريف: پەلی وشـکی دارخورما.

(تَصاريـفُ- الدَّهـرِ): وەی/ لێقەومـان/ گرفتاریی ڕۆژگارو ڕووداوەکانی.

(ألمُتَصَرِّف): پارێزگار.

(اَلْمُتَصَرِّفِيَّة): پارێزگا.

٢-(صَـرَفَ- الدَنانيرَ. صَرفــاً): دینارەکانی ١-پارەکانــی گۆڕییــەوە بــە دینــارو پارەیتر (-المالَ) ٢-خەرجیکرد/ بەختیکرد.

(صَرَّفَ- الشيءَ): شتەکەی فرۆشت.

(-المــاءَ): ١-ئاوەکــەی بەردایــەوە ٢-ڕاکێشـا ٣-کارکرد.

(-الدَراهِــمَ): پارەکــەی وردکــردەوە/ گۆڕییەوە.

(-الـكَلامَ): هەندێــك وشــەی لــە وشــەیتر دەرهێنا.

(صارَفَ-هُ): لەگەڵیدا گۆڕییەوە.

(إِصْطَــرَفَ الدَراهِمَ): پارەکــەی وردکردەوە، گۆڕییەوە.

(«إِصْطَرَفــتُ هذه الدراهِــمَ بدينار»): ئەم پەنجاییانەم بە دینار گۆڕییەوە.

(اَلصَرْف): چاکە/ پیاوەتیی.

(«لَهُ عَلَــيَّ صَرْفٌ»): چاکەی بە ســەرمەوە هەیە.

(صَرْفُ المال): خەرجکردنی پارە/ بەختکردنی دارا.

(صَرفُ الحَديثِ أَوِ الكَلام): لە فەرمایشــتو قســە زیادکردن/ خستنەسەریو جوانکردنی فەرمایشتو قسەکە (لەوردکردنەوەی پارەوە هاتووە).

(اَلصَرفَــةُ): جارێــك وردکردنــەوەی پارەو چاککردنو جوانکردنی ئاخاوتن.

(اَلصِّرافَة): پیشەی پارەگۆڕینەوە.

(اَلصَــرَّاف والصَيْــرَف والصَيْرَفِــيّ (ج) صَيارِفَــة): پارەگــۆڕەرەوە/ پارەفــرۆش بــە پارەیتر.

٣-(صَرِفَ- الشَرابَ): هیچی تێکەڵی شەرابەکە نەکرد یان بە خەستی خواردیەوە.

(صَــرِّفَ- الخَمــرَ): مەیەکەی بە خەســتی خواردەوەو هیچی تێنەکرد.

(أَصْرَفَ- الشَّرابَ): شەربەتەکەی بە خەستی هێشتەوە.

(اَلصِــرْف): پەتیــی/ خەســت کــە هیچــی تێنەکرابێــتو تێکەڵــی هیــچ نەکرابێت ٢-بۆیەی سوور.

(اَلصَريف): زیوی پوختو ڕووت.

(اَلصَريف والمَصْروف): هەموو شتێکی ساغو ڕووت کە هیچی تێکەڵ نەکرابێت.

٤-(صَرَفَ-البابُ صَريفاً): دەرگاکە جیڕەیهات.

(-بِنابِهِ): کیڕەی بە دانی هێنا.

(اَلصَروف): مێحوشترێك کە کیڕەی دانیبێت.

(صَريفُ الباب): جیڕەی دەرگا.

(-القَلَم): سیڕەی قەڵەم.

٥-(اَلصَرفَــةُ): دۆشــینێکە ســەرلەبەیانی پێــش هەتاوکەوتن ئیــتر نەدۆشــرێتەوە تا بەیانییەکیتر.

(اَلصَرَفان): ١-مس ٢-قورقوشم.

الملحق:

صــرف: (أَلمَصْــرَف (ج) مَصــارِف): بانك/ دامەزراوێکــی داراییــە. وام وەردەگرێت‌و وام دەدات. داراو پارەی لادانراو دەخەملێنێت.

(أَلمَصــرَف المَرْکَــزي): بانکــی (ناوەنــدی/ جەرگەیــی) دامەزراوێکــی میرییــە کە پارە دەردەکات‌و سەرپەرشــتیی گورجوگۆڵیــی‌و چالاکیی دارایی دەکات.

---

صــرق: (صَرقَــعَ- أَصابِعَــهُ): پەنجەکانی نوشتانەوە تا تەقەیبێت.

(صِرقاعَةُ المِقْلاع): دەنگی قۆچەقانی کاتێك بەردەکە هەڵدەدات.

صرم: ١-(صَرُمَ- الرَجُــلُ صَرامَةً): پیاوەکە رەق‌و توند بوو/ بە زەبرو زەنگبوو.

(تَصَرَّمَ- الرَجُلُ): خۆڕاگر بوو.

(أَلصــارِم (فا) (ج) صَــوارِم): ١-دلێر/ ئازا ٢ (ح) شێر.

(رَجُلٌ صارِم): پیاوێکی توندو سەرگەرمو بە برِشت لە هەموو کارێکدا.

(«حاكِمٌ صارِم») (عامية): کاربەدەســتێکی دڵــرەق‌و بێلێبــوردوو لــە کاتــی ســزادان‌و لێپرسینەوەدا.

(«حُكْمٌ صــارِم»): بریارێکی (زۆر دڵرەقانەو سەخت/ ستەمکارانە).

(رَجُلٌ صَرامَــةٌ): پیاوێکی توندورەق‌و لەڕاو کاروباردا هەتەرو سوور لە سەر ڕای خۆی.

(أَمرٌ صَريم): کارێکی براوەو بڕیاردراو.

(أَلصَريمَة (ج) صرائِم): سوورخواستیی.

(أَلصَيْرَم): راپتەو/ خواستکار/ رابرِشت.

٢-(صَرَمَ- الحَبــلَ. صَرْماً وصُرْماً): پەتەکە (پسا/ پچرا).

(-الشَّــيءَ): ١-شــتەکەی ١-بــری ٢-لەتکــرد/ پچراند.

(-فُلاناً): ١-پەیوەندیی لەگەڵ فیســاردا بری/ بەجێیهێشت/ وازی لێهێنا ٢-قسەکەی پێبری.

(-الخَيّاطُ الثَوبَ): بەرگدرووەکە بەرگەکەی چرچ درووو.

(-فــلانٌ عِندَنا شَــهراً): مانگێك لەلای ئێمە مایەوەو دانیشت.

(صَرُمَ- السَّــيفُ صَرامَةً): شمشێرەکە تیژو برەر بوو.

(صُرِمَت أُذُنُهُ): گوێی لە بندا دەرهێنرا.

(صَرَّمَ-ه): زۆر بری‌و لەتیکرد.

(صــارَمَ-ه مصارَمَةً): پەیوەندیــی لەگەڵدا بری.

(أَصْرَمَ النَخْــلُ): کاتی برینــی دارخورماکە هات.

(-الرَجُلُ): نەدارا بوو.

(تَصَرَّمَ وانصَرَمَ): براو لەتوپەتبوو.

(-تِ السَنَةُ): ساڵەکە (برایەوە)/ تێپەری).

(تَصارَمَ — القَومُ): لەیەکپچران/ لەیەکبران.

(إِصْطَــرَمَ- الشَــيءَ): شــتەکەی بــری‌و

لێکردەوە.

(اَلصُرْم) (مص): لەیەکبوون/ لێکپچڕان.

(اَلصِـرْم (ج) أَصْـرام وأَصـارِم وأَصاریـم وصُرْمان): ١-کۆمەڵ/ دەسـتە/ تاقم ٢-تاقمە خانوویەك ٣-پۆل.

(اَلصِرمَة): جۆر.

(اَلصِرمَةُ (ج) صِرَم): ڕەوە حوشتر یان چەند پەڵە هەورێك یان چەند پارچە زیوێك.

(اَلصارِم (ج) صَوارِم): شمشێری تیژی بڕەر.

(اَلصُرام): ١-وەی/ بەڵا. قەومانی سـەخت/ جەنگ چونکە هەموو شتێك لە بێخ دەکەنێت. تاوی جەنگ.

(رَجُـلٌ صُـرامٌ): ١-جەنگاوەرێکـی بەتوانـا ٢-پیاوێکی بەتوانا لە بڕینداو جیاکردنەوەدا.

(اَلأَصْرَم (م) صَرماء (ج) صُرْم): لای هەردوو گوێبڕاو.

(اَلأَصْرَم والمُصْرِم): نەدارایەکی خێزانزۆر.

(اَلأَصْرَمان): ١-شەوو ڕۆژ (چونکە لە یەکتری دەپچڕین) ٢-(ح)گورگ‌و قەلەڕەشکە (چونکە لە خەڵکی دەپچڕێن.

(«تَرَكْتُهُ بِوَحشِ الأَصْرَمَین»): بەجێمهێشت لە بیابانێکدا کە هەر گورگ‌و قەلەڕەشـکەی تێدایە.

(اَلصَرْمـاء): ١-مێـی وشـەی (اَلأَصْـرَم) ٢-بیابانێکی وشکی بێئاو ٣-(ح) مێحوشترێکی کەمشیر.

(اَلصَـرُوم): ١-شمشـێری بڕەر ٢-بەبڕشـت‌و خاوەن دەسەڵات.

(اَلصَریم): ١-بڕراو/ پچڕاو/ پسـاو ٢-بەیان/ ڕۆژ (چونکە لە شـەودا دەبڕرێت) ٣-شەو یان بەشێکی شـەو ٤-چیلکەیەکە دەخرێتە دەمی کارەوە تـا دایکی نەمژێت/ بەڵامك ٥-پەرێز/ زەوییەك کشتەکەی دروێنەکرابێت ٦-شارا ٧-پارچە لمێك.

(«أَفعی صَریم»): مارێکی ژەهردار.

(جاءَ صَریمَ سَـحْرٍ): بە نائومێدی‌و بێهواوە هات.

(صَریما اللَّیل): سەرەتاو کۆتایی شەو.

(اَلصَریمَة (ج) صَرائِم): بەشێکی شەو.

(اَلصَیْرَم): ١-وەی/ ئاپۆرە ٢-ژەمە خواردنێك لە ڕۆژێکدا.

٢-(اَلصَرْم= الجلد) (فارسیة): چەرم.

(اَلصِـرْم (ج) أَصْـرام وأَصـارِم وأَصاریـم وصُرْمان): سۆل.

(صِرمایة) (عامیة): سۆل.

(اَلصَرّام): چەرمفرۆش.

(اَلصَرْماء): مەنجەڵ/ قازان.

(اَلمَصْرِم): خورگەی ئاو.

صرن: (اَلصُرْنایة (مو) (فارسیة): زوڕنا.

صر: (صَرا- إِلَیهِ صَرْواً): سەیریکرد.

صری. (صَـرَی- الشـيءَ صَرْیـاً): پاڵی بە شتەکەوە ناو دووریخستەوە.

(«صَرى اللهُ عَنهُ الشَـرَّ»): خـودا خراپەی لێدوورخستەوە.
(-بَولَهُ): میزەکەی بری.
(-فُلاناً): ١-دەستی نایە بەر فیسار/ رێپلێگرت ٢-پاراستی ٣-لە مردن رزگاریکرد.
(-بَینَهُم): جیایکردنەوە/ لەیەکیکردنەوە.
٢-(صَرى- الشـيءُ صَرياً) (ضد): ١-شـتەکە سـەرکەوتە سـەرەوە ٢-هاتـە خـوارەوە/ داکەوت.
(-القَومَ): (ضد) پێشیانکەوت.
(-عَنهُم): دوایانکەوت/ کەوتە پشتیانەوە.
٣-(صَـرِيَ. يَصْـرى- الماءُ. صَـرىً): ئاوەکە مایەوەو گەرایەوە/ گەنبوو.
(-اللَّبَنَ): شیرەکە چێژی گۆڕا.
(-فُـلانٌ في يدِ فُلان): فیسـار کەس بارمتەو دەستبەرسەرو بە بەندیی بە دەستی فیسارەوە مایەوە.
(-الدَمـعُ): فرمێسـك لە چاودا قەتیسـماو نەهاتە خوارێ.
(صَرى وأَصـرى-ت التاقَةُ): شـیر لە گوانی حوشترەکەدا کۆبووەوە.
(صَرَّى- الشاةَ تَصْرِيَةً): مەڕەکەی هێشتەوە نەیدۆشـی تا شـیر لـە گوانیـدا کۆبێتەوەو پڕبێت.
(أَلصَرَى): پاشماوەی شت.
(أَلصَرَى والصِـرَى): ئاوێك زۆر بمێنێتەوەو بگەڕێتەوە.
(لَبَـنٌ صَـرىً): شـیرێك (چێـژی/ تامـی) گۆڕابێت.
(الصاريَـةُ): چالاوێـك ئاوەکـەی زۆر تێـدا مابێتەوەو چێژی گۆڕابێت.
(أَلصَراة والصُـرَّى والمُصَرَّاة- مِن الشـاء أَو النُـوق): مەڕو حوشـتری بۆ چەنـد ڕۆژێك نەدۆشراو تا شیر لە گوانیدا کۆبێتەوە.
٤-(أَلصاري (ج) صُرَّاء وصَراريّ وصَرايُّون): ١-پاپۆڕەوان/ دەریاوان.
٢-الصـاري (ج) صَـرار: پاپۆڕەسـتوون کە لـە ناوەڕاسـتی پاپۆڕەکـەدا دەچەقێنرێتو چارۆکەکەی پێوە قایمدەکرێت.
(أَلصَّاريَة): مێی وشەی (الصاري).
صصـل: (الصَاصَـل أَو لَبَـنُ الطَـيرِ) (ن): سـرێش- گێلاخـە ڕووەکێکـە لـە ئەورووپاو وڵاتە فێنکەکانی ئاسـیاو دەریای ناوەڕاستو خـوارووی ئەفەریقادا زۆر بـڵاوە. گوڵەکەی سـپیو جوانە جـۆری هەیە کە بـۆ جوانیی دەروێنرێت.
صطب: (أَلمِصْطَب): دەستگای ئاسنگەر.
(أَلمِصْطَبَة والمِصْطَبَّة): سەکۆی دانیشتن.
صطح: (أَلمِصْطَـح (ج) مَصاطِح): ١-بیابانی بێلەوەڕگا ٢-شـوێنێك بـۆ کوتانی بەرهەمی کشتو ئامادەو خۆشدەکرێت.
صطر: (صَطَرَ وصَيْطَرْ والمِصطار = سَـطَرَ

وسَيطَرَ والمِسطار): مەیی کەلەپچەی خواردەوە (مەیێك كە زوو بیگرێتو بە زەویدا بدات).

صطـع: (المِصْطَـع): زمانپاراوی بــە زمانی رەوانبێژ.

صطم: (ألأُصْطُمَّــة): ١-(زۆربەی/ زۆرینەی) شــت ٢-كۆمەڵی شــتەكە/ تۆپەڵەی شتەكە ٣-ناوەراستی شتەكە (وەك: أُسطُمَّة).

صــع: ١-(صَعْصَــعَ- القَــومَ) لەیەكیكردنو بلاویكردنەوە/ لێكیجیاكردنەوە.

(-الشيءَ): شتەكەی (بزواند/ جولاند).

(تَصَعْصَــعَ): ١-بزوا/ جــوولا ٢-بلاوبووەوە/ جیاجیابووەوە.

(«تَصَعْصَعَ- بِهِــمُ الدَّهرُ»): رۆژگار پەرشو بلاویكردنەوە/ لە یەكی جیاكردنەوە.

(«تَصَعْصَعَــت صُفوفُهُــم»): ریزەكانیــان شلۆقبوو لە جێی خۆدا نەمان.

(ألصَعْصَع): بلاو/ جیاجیا/ لەیەكبوو.

٢-(صَعْصَعَ- مِن فُلان): لە فیسار ترسا.

(تَصَعْصَعَ- الرَجُلُ): ١-زیرەمیكرد/ زۆرترســا ٢-سەری شۆركردو خۆی بە دەستەوە دا.

٣-(صَعْصَعَ- رَأسَــهُ بالدِهنِ): سەری بە رۆن چەوركرد.

٤-(ألصَعْصَع والصُعْصُع (ج) صَعاصيع) (ح): باڵندەیەكە خاڵخاڵاویە.

(صعب: صَعُــبَ- علیــه الأَمــرُ: صُعُوبَةً): كارەكەی (لێ/ بۆ/ لا) گرانبوو.

(الأَمر الصَعْب (م) صَعبَة (ج) صِعاب): كاری (گران/ قورس/ دژوار).

(صَعَّبَ-هُ): گرانیكرد/ قورسیكرد.

(صاعَــبَ-هُ. مُصاعَبَــةً): بــۆی گرانكــرد/ لێیقورسكرد.

(أَصْعَبَ- الأَمرُ): كارەكە گرانبوو/ قورسبوو.

(-الشَيءَ): شــتەكەی لا گرانبــوو/ گران هاتە بەردەستی.

(-الجَمَل): حوشــترەكەی بەرەڵا كردو سواری نەبوو ئەویش لێی تۆرو یاخیبوو.

(تَصَعَّبَ): قورسو گرانبوو/ دژوار بوو.

(-الأَمرَ): كارەكەی گرانكرد.

(تَصاعَبَ): قورسیكرد/ گرانیكرد/ تەگەرەی خستە بەر.

إسْتَصْعَبَ): دژوار بوو/ گرانبوو.

(-الشَيءَ): شــتەكەی لا گرانبوو/ دژوار هاتە بەرچاوی.

(ألصَعْب): ١-گران/ قورس/ دژوار/ نارەحەت/ سەخت ٢-ملنەدەر/ سەربەرز ٣-شێر.

(ألصُعْبُوب= الصَعْب): گران.

(ألمَصْعَب (ج) مَصاعِب ومَصاعیب): ١-كەڵ/ نێرە ٢-(ح) ئەســپی تۆر كە هێشــتا ســواری نەبووبن.

(«جِمالٌ مَصاعِب ومَصاعیب»): حوشترانی تــۆر كــە ژێربــار نەخرابــنو سواریشــیان نەبووبن.

(أَلمَصاعِب): گیروگرفت/ تەگەرە/ سەختیی/ نارەحەتیی/ دژواریی/ تەنگژە.

صعت: (صَعْتَرَ- النَحْلُ): هەنگەکە بەسەر گوڵی جاترەکەوە نیشتەوەو هەڵیمژی.

(-الرَجُلُ الشيءَ): پیاوەکە شتەکەی رازاندەوەو جاترەی پێوە کرد.

(الصَعْتَر) (ن): جاترە. رووەکێکی بۆنخۆشە. گوڵەکەی سپیو مەیلەو بۆرە. هەندێك جۆری بۆ بۆنکەیو بۆ پزیشکیی بەکاردێت.

أَلصَعْتَرِيّ: ١-چابوك ٢-جوامێرو دڵفراوان ٣-ئازا/ بەجەرگ/ دلێر.

صعد: ١-(صَعِدَ-في السُلَّم. صُعوداً وصَعَداً وصُعُداً): بە پەیژەکەدا سەرکەوت.

(-بِهِ): سەریخست/ پلەوپایەیدایە/ بەرزیکردەوە.

(-المَكانَ صُعُوداً): سەرکەوتە سەر شوێنەکەو بەملاولادا روانی.

(صَعَّدَ- فيهِ النَظَرَ): سەرنجیدایەو لەسەریەوە تا خواریەوە پێدا هەڵیروانی.

(-في وعلى الجَبَلِ): بەکێوەکەدا هەڵزناو سەرکەوت.

(-في الوادي) (ضد):١-لە دۆڵەکەوە خلبووەوە/ سەرەوخوار بووەوە ٢-بەدۆلکەدا سەرکەوت.

(أَصْعَدَ): سەرکەوتە مەککە/ هاتە مەککە.

(أَصْعَدَ-هُ): سەریخست.

(-تِ السَفينَةُ): چارۆکەکەی هەڵکردو با سەرەو ژوور پاپۆرەکەیبرد.

(-في الأَرضِ): لە زەویەکەوە بۆ زەوییەکیتر سەرکەوت.

(-في الوادي) (ضد): ١-بە دۆڵەکەدا سەرکەوت ٢-لە دۆڵەکەوە سەرەوەخوار بووەوە.

(تَصَعَّدَ وتَصاعَدَ): سەرەو ژوور رۆیشت/ سەرکەوت.

(أَلصاعِد) (فا): سەرکەوتوو/ سەرەوژوورەوە بوو/ هەڵزناو/ بەرەو ژوورەوە بوو.

(«بَلَغَ كذا فَصاعداً»): گەیشتە ئەویو بەرەو ژوور بووەوەو هەر بەرەو ژوور.

(أَلصَعَّاد): فرمباڵا (رۆیشتوو/ سەرکەوتوو).

(أَلصُعُد= العُلُوّ): بڵندیی/ بەرزیی.

(«هَبَطَ مِن صُعُدٍ»): لە بەرزییەوە هاتەخواری/ داپەرییە خواری.

(«هذا النَباتُ يَنمو صُعُداً»): ئەم رووەکە سەرەو ژوور بەرزدەبێتەوەو باڵادەکات.

(الصَعْدَةُ (ج) صِعاد وصَعَدات): ١-بەرز بوونەوەیەك/ سەرکەوتنێك/ باڵاکردنێك ٢-پێشکەوتنێك ٣-جۆگەی راستی تەخت.

(أَلصَعُود (ج) صُعُد وأَصْعِدَة وصَعائِد): ١-سەرکەوتن/ بەرزبوونەوە/ هەستان ٢-سەرەوژوورە پێچەوانەی سەرەوخوارە ٣-رێی سەرەوژوورە/ باسکە.

أَلصَعيد (ح) صُعُدْ وصَعَدات وصُعْدان: هەڵەت/ بەرزیی زەویی.

أَلتَصَعُّــد (ك): يەكســەر تەنێكــی ڕەق بێتوانەوەی ببێتە هەڵم وەك یۆدو كافوور.
(أَلصَعَــد) (ف): گەیەنرێكــە تەوژمــی كارەبایی پێدادەڕوات لە قاپی شــیكردنەوەی كارەباییەكەوە یان لە لوولەی گازی سوككراوە گەیەنەرەكــەوە بە مەرجێك بە جەمســەری گەرمی دینەمۆی كارەباكەوە بەسترابێت.
(أَلمِصْعَد (ج) مَصاعِد): سەرخەرە كارەبا. كە لە خانووە چەند نهۆمەكاندا بۆ سەرخســتنی خەڵك دادەمەزرێت.
(أَلمِصْعــاد): پەتێكــە/ تەنافێكە بۆ بەســەر خورمادا سەركەوتن بەكاردێت.
(جَبَلٌ مُصَعَّد): چیایەكی بەرز/ بڵند.
٢-(أَصْعَدَ- فِي العَدْوِ): لە ڕاكردندا تینی دایە خۆی/ توند ڕایكرد.
(تَصَعَّدَ-هُ الأَمرُ): كارەكەی (لێگران/ لێدژوار) بوو.
(-النَفسُ): هەناسەدانگرانبوو/ تەنگەنەفەس بوو.
(تَصاعَــدَ- هُ الأَمرُ): كارەكەی لێقورســبوو/ سەختبوو.
(أَلصَعَد): كارگرانیی/ دژواریی/ نارەحەتیی/ ماندوێتیی/ سەختیی.
(«عَذابٌ صَعَدٌ»): ئازارێكی سەخت.
(أَلصَعُــود (ج) صُعُــد وأَصْعِــدَة وصَعائِد): (گیروگرفتی/ تەگەرەی/ قۆرتی) ناهەموار.
(«لأُرْهِقَنَّكَ صَعوداً»): تووشی گیروگرفتێكی سەختت دەكەمو ماندووتدەكەم.
(أَلصَعْداء): ماندوێتیو نارەحەتیی.
(أَلصُعَداء): هەناسەهەڵكێشانی درێژی داخو خەفەت یان ماندوێتیی.
(أَلصَعُوداء): تەگەرە/ گیروگرفتی ســەختو گران/ قۆرت.
٣-(الصَعيد (ج) صُعُد: وصَعُدات و صُعدان): ١-خاك/ گڵ/ خۆڵ ٢-گۆڕ ٣-ڕێ.
(صارت الحَديقَةُ صَعيداً):باخچەكە تەختبوو هەر خۆڵبوو بێدارو درەخت بوو.
(أَلمُصَعَّــد- مِــنَ الأَشْــرِبَة): شــەربەتێك/ خواردنەوەیەك كە بە ئاگر پەرومردە بكرێت تا تامو ڕەنگی خۆی وەربگرێت.
الملحق:
صعد: (التَصاعُدِيّ): ئەوەی ســەردەكەوێت/ سەركەوتووانە.
(ألإرتِفاعِي): بەرزەوەبووانە.
(حركــة تَصاعُدِيَّة): جووڵــەی بەرەو بەرز بوونەوە.
(المُتَزايــد تَدريجيّاً): كە بە شــێنەیی/ وردە وردە زۆر دەبێت.
(فائِــدة تَصاعُدِيَّة): قازانجێكی شــێنەیی/ وردەوردە/ زۆربوو/ سەركەوتوو.
أَلضَريبــة التَصاعُدِيَّــة: باجــی شــێنەیی سەركەوتوو/ زۆربوو كە ڕێژەی بە پێی پارەی

سوودلێکراو سەردەکەوێت‌و زۆردەبێت.

صعــر: ١-(صَعِرَ- وَجْهُهُ صَعَــراً): ڕووی بە لایەکدا لاربوو/ کەچبوو.

(أصْعَــر (م) صَعــراء (ج) صُعْــر): ملگێڕ/ ملخوار یان ڕووگێڕ.

(صَعَّــرَ وصاعَــرَ وأصْعَــرَ- خَــدَّهُ): ڕووی لەبەر فیزو خۆبەزلزانین لە خەڵك وەرگێڕا. لەوانەیشە هەر سروشتی وابێت.

(تَصَعَّــرَ وتَصاعَرَ): ڕووی لــە خەڵك (کرد/ وەرگێــڕا) لەبــەر فیزو دەعیــەی زۆری یان خەڵکی بە هیچ نەزانێ.

(ألصَعَّــار): ڕوو وەرگێڕی بــە دەعیەو فیزو خۆبەزلزانین.

٢-(صَعِرَ-رأسُهُ. صَعَراً): سەری بچووکبوو.

٣-(صَعْرَرَ- الشَــيءَ): شــتەکەی چەرخاند/ وەرگێڕا.

(تَصَعْرَرَ): وەرچەرخا/ وەرگەڕا.

(إصْعَتْرَرَ واصْعَرَّرَ): لە شوێنی خۆی چەرخاو خۆی گرمۆڵە کرد.

(ألصُعْرورَة): خلێنکەی قالۆنچەرمشە.

٤-(إصْعَــرَّ-تِ الإبــلُ): حوشــترەکان هەڵیان تیزاند.

(ألصُعُرُّر والصُعْرُور (ج) صَعارِیر): کەتیرەی درەخت.

صعــف: ١-(صُعِــفَ. صَعَفــاً): هەڵلــەرزی‌و موچڕکــی پێداهات یان هی ســەرما یان هی ترس.

(أصْعَفَ- الزَرعُ): کشتەکە سیس‌و شلبوو.

صَعیف: سیس‌و شل‌و داکەوتوو.

(الصَعْفَــة): مووچڕك‌و هەڵلەرزینی ســەرما یان ترس‌و تۆقین.

٢-(ألصَعْفَــقُ والصُعْفُــوق والصَعْفَقِيّ (ج) صَعافیق وصَعافِقَــة) (ت): ١-خۆتێهەڵکێش/ خۆپێدا هەڵواس لە بازاردا. کەســێك بێپارەو سەرمایە بێتە بازارەوە ئەگەر کەسێك شتێکی کــڕی ئەم خــۆی تێهەڵدەکێشــێت بۆ ئەوەی شتێك سوود وەربگرێت ٢-بوودەڵەیەك کە نە چەکی هەبێت‌و نە بوێرو ئازابێت.

(ألصَعْفــوق (ج) صَعافیــق وصَعافِقَــة): زمانبەد/ ناچیزە.

صعق: ١-(صَعَقَ-ت السَماءُ القَومَ. صاعِقَةً): ئاسمان خوێشگەلی دایە بەر هەورە تریشقە.

(صَعَقَتْهُم- الصاعِقَةُ): بەر هەورە برووسکە کەوتن/ هەورە تریشقە لێیدان.

(صَعِــقَ- الرَعــدُ. صَعَقاً): هــەورە گرمەکە ناڵەیهات.

-الثَّورُ. صُعاقاً): گاکە بۆڕەیەکی توندیکرد.

(أصْعَقَ-تْهُ السَّماءُ): هەورە برووسکە لێیدا.

(ألصَعَق) (مص): گرمەی بەرز/ ناڵەی توند.

(ألصُعاق): هەورەگرمە.

(ألصَّاعِقَة (مص) (ج) صَواعِق): ١-برووسکەی هەور ٢-(ناڵە/ زریکە/ قیژە/ هاوار)ی ئازار.

٢-(صَعِـقَ-ت الركيَّـةُ صَعَقـاً): چالاّوەكـە هەرەسیهێناو تەپی.

(صَعِـقَ وصُعِـقَ. صَعْقـاً وصَعَقـاً وصَعْقَةً وتَصْعاقـاً): ١-بێهۆشـكەوتو ئاگـای برا (بە ناڵەو دەنگێكی زراوبەر).

(صَعِق): ئاگابڕاوی سـایەمەلێدراوی زراوچوو ٢-مرد.

ومِنه ألآيَة: («ونُفِخَ في الصُّورِ فَصَعِقَ مَن في السماءِ ومَنَ في الأَرضِ»): فوو بە شەیپووردا كرا هەموو، هەرچی لە ئاسـمانو زەویدا بوو كـەوتو چاوە زەقەیان پێكـەوتو مردن یان هۆشیان لەبەر براو كەوتنو زارەترەكبوون.

(أَصْعَقَ-هُ): كوشتی.

(ألصَّعَق): مردن.

(الصاعِقَةُ (ج) صَواعِـق): ١-مردن ٢-هەموو ئازارو ژانێكی كوشندە.

(أَلمَصْعوق): ١-ئەو كەسەی لە پڕ بەلادا دێتو دەمرێت ٢-لە هۆشخۆچوو.

٣-(أَلصُّعْقُر): گەرای ماسی/ هێلكەی ماسی.

صعل: ١-(صَعِلَ واصْعَالَّ صَعَلاً): سـەروملی باریك بوو.

(أَصْعَـل (م) صَعـلاء (ج) صُعـل): سـەرو ملباریك.

(أَلصَّعـل): ١-وشـترمرخ یـان دارخورما یان خەڵكێكـی سـەر باریكو بچـووك ٢-درێژ ٣-كەری تووكومریو.

٢-(صَعْلَـكَ-هُ صَعْلَكَـةً): هەژاریكـرد/ نەدارایكرد.

(تَصَعْلَكَ): هەژار كەوت.

(أَلصُّعْلُـوك (ج) صَعاليك وصَعالِك): هەژار/ رەزەڵخواو داماو.

(صَعاليكُ العَرَب): رەشـوڕووتو رەزەڵخواو دزانی عەرەب.

٣-(صَعْلَكَ-هُ. صَعْلَكَةً): پووكاندیەوە.

(أَلصُّعْلُوك (ج) صَعاليك وصَعالِك): بێتوانا/ لاواز/ نەبوو.

صعـن: (أَصْعَـنَ- الرَجُـلُ): پیاوەكە سـەر بچووكو كەمئاوەز بوو.

(إِصْعَنَّ- الشَيءُ): شتەكە وردیلەو ناسكبوو.

صعا: (صَعَا. يَصْعا ويَصعو صَعواً): وردیلەو بچووكبوو.

(أَلصَّعـو (مـص) (ج) صِعَـوات): بەچكـە چۆلەكەی بچووك/ زەرنەقووتە.

صَعْوَة: زەرنەقووتەیەك.

أَلصَّعُو (ج) صِعـاء و أَصْعاء (ح): فیرنەگولە (باڵندەیەكە لە چۆلەكە بچووكترە.

(ناقَةٌ صَعْوَة): مێحوشترێكی سەربچووك.

صغب: (أَلصُّغَب): رشكە ئەسپێ.

صغـر: ١-(صَغِرَ. صَغَـراً وصَغـارَةً وصِغَراً وصُغْرانـاً): بچووكبـووەوە/ كەمبـووەوە/ پووكایەوە. بچووكبوو.

(-القَـومَ. صَغْـراً): بچووكترینیانبـوو/

بچووکیانبوو.
(-فُلاناً): له فیسار بچووکتر بوو.
(صَغُرَ- القَومَ صَغْــراً): له هەموان بچووکتر بوو/ بچووکیانبوو.
(-فُلاناً): له فیسار بچووکتر بوو.
(«ماصَغَرَني إلاّ بِسَنَةٍ»): تەنها ساڵێك له من بچووکتر بوو.
(صَغُرَ. صَغَراً وصَغــارَةً وصَغَراً وصُغْراناً): بچووکبوو/ پووکایەوە/ بچووکبووەوە.
(صَغَّرَ-هُ): بچووکیکردەوە.
(أَصْغَــرَ- القَــومُ): منداڵــی بچــووك بچووکیانبوو.
(-هُ): بچووکیکردەوە.
(-تِ الأرضُ): زەویەکە ڕووەکی وردو بچووکی دەرکرد.
(إسْــتَصغَرَ-هُ): بــە بچــووك‌و کەمیدانــا/ بــە بێبایــەخ‌و ســووك تەماشــایکردو هاتە بەرچاوی.
(-فُلانٌ): بچووکی خواست/ ویست/ داواکرد.
(ألصِغرَةُ): ١-بچووکترین زارۆڵە/ فرزەند یان خوێشگەل.
(«هُو صِغْــرَةُ أَبَوَیــهِ أَو أَولادِ أَبَوَیهِ»): ئەو بچووکتریــنی منداڵی دایــك‌و باوکیەتی یان (صغار القوم): بچووکی ناو خوێشگەلە.
(ألصُغار والصُغران): بچووك/ گچکە.
(الصَغارَة) (مص): بچوك‌و پایەنزم.

الصَغارَة: پایەنزم.
ألصِغَر: لەشبچووك/ ڕیوەڵە.
(ألصَغــیر (ج) صِغار وصُغَــراء): ١-بچووك/ وردیلە ٢-پایە نزم/ کەمپایە/ بێپایە.
(ألأَصْغَر (ج) أَصاغِر وأَصاغِرَة و أَصْغَرون (م) صُغرى (ج) صُغْر): بچووکترو بچووکترین.
(ألأَصْغران): دڵ‌و زمان.
(«ألمَــرْءُ بأَصْغَرَیْهِ»): مــرۆڤ به دڵ‌و زمانی دەناسرێت.
٢-(صَغُرَ. صِغَراً وصِغْــراً وصَغاراً وصَغارَةً وصُغْراناً): ســووك‌و ڕســوا بوو/ سەرشــۆڕو کەساسبوو/ لەبەرچاوی خەڵك نزم‌و بێبایەخ‌و بێپایە بوو.
(صَغَّرَ-هُ): ڕسواو سووکیکرد.
(صَغَّرَهُ في أَعیُنِ الناسِ): لەبەرچاوی خەڵك/ سووك‌و ڕسوایکرد.
(أَصْغَرَ-هُ): سووکیکرد/ سەرشۆڕو پایەنزمی کرد.
(صاغَرَ- الرَجُلُ): خۆی به بێپایەو نزم دانا.
(«تَصاغَرَت إلَیهِ نَفسُهُ»): خۆی به سەرشۆڕو سووك‌و بچووك هاتە بەرچاو.
(ألصَغار والصُغر): ١-سەرشۆڕیی‌و ٢-زۆرداریی/ زەبوونی‌و ستەم.
(ألصاغِــر (ج) صَغَــرَة وصاغِــرون) (فا): ١-ســووككراو/ ڕســواكراو/ سەرپێشــۆڕكراو ٢-بەسەرپێشــۆڕكردن‌و ڕســواكردن قایــل/

گەردنكەچی بچووكیو بێپایەییو ڕسوایی.
٢-(صَغُرَ-تِ الشَمسُ. صِغراً وصُغْراً وصَغاراً وصَغــارَةً وصُغْرانــاً): خۆرەكــە (داكەوت،/ بەرەو ئاوابوون بوو).
الملحق:
صغر: (أَلتَصْغــير) (مص): ١-بچووككردنەوە ٢-بێپایەكردنو نزمكردنــەوە/ كەمكردنەوە بچووككردنــەوەی ناوێــك لــە وشەســازیدا ئەویش بەوە دەبێت بۆر بخرێتە ســەر پیتی یەكــەمو (ی)ی زیادەی بێدەنگ بخرێتە پاش پیتی دووەم پیتی وشەكە وەكو: (جَبَلْ جُبَيل وشاعِر. شَوَيعِر) كە ئەوە بۆ خۆشەویستییە یان سووككردن نزمكردنەوەیە.

---

صغــا: ١-(صَغــا- إِلَيــهِ- صَغــواً): گوێی بۆ شلكرد/ گوێیگرت.
(صَغِيَ. يَصغى- إِلَيــهِ صَغىً وصُغِيّاً): گوێی بۆ شلكرد/ گوێی بۆ هەڵخست.
(أَصْغــى- الى حَديثِــهِ. إِصْغــاءً): گوێــی لە ئاخاوتنەكەیگرت.
إِلَيهِ: گوێیلێگرت/ گوێی بۆ شلكرد.
(صاغِيَةُ الرَجُلِ): خوێشگەلو نەتەوەی پیاو كە گوێرایەڵیبنو بە قسەی دەكەن.
(أَكرَمُوا فُلاناً في صاغِيَتِهِ) ئەوانەی گوێرایەڵی فیســار بونو قسەكانیان وەرگرت ڕێزیانداییەو بە گەورەیانگرت لەبەر كەسایەتی.
٢-(صَغــا-تِ النُجــومُ أَوِ الشَّــمسُ. صَغواً): ئەســتێرەكان یــان خۆرەكــە داكەوتــنو لە ئاوابوونبوون.
(صَغــواء): خــۆری (داكەوتــوو/ ڕوو لــە ئاوابوون).
(أَلنُجــومُ صَــواغٍ): ئەســتێرەگەلی ڕوو لــە ئاوابوون/ داكەوتوو.
صَغِيَ. يَصغى-تِ النُجُومُ أَوِ الشَــمسُ. صَغىً وصُغِيّاً): ئەستێرەكان یان خۆر داكەوتن/ ڕوو لە ئاوابوونبوون.
(أَصْغى- الإِناءَ. إِصْغاءً): قاپەكەی لاركردەوە.
(أَلصِغْــو (ج) أَصْغــاء): لێــواری نوشــتاوەی دۆڵكەی سەر بیر/ چاڵاو.
٣-(أَصْغــى- الشــيءَ. إِصْغــاءً): شــتەكەی كەمكرد.
(«أَصْغــى حَقَّــهُ»): مافەكــەی كەمكــردو لێیلادا.
٤-(أَلصِغْو (ج) أَصْغاء): كەناری چاڵاو/ بیر.
(صِغْوُ الكَفِّ أَوِ المِغْرَفَةِ): لەپیدەست یان ناوی ئەسكوێ.
صف: ١-(صَفَّ- الشيءَ صَفّاً): شتەكەی ڕێكو ڕاست ڕیزكرد.
(«صَــفَّ الصِبيــانُ الكِعــابَ»): منداڵــەكان میچەكانیان ڕیزكرد.
(-القَومَ): خوێشــگەلیان لە شەڕ یان شتیتردا ڕیزكرد.
(-القَومُ): ڕیزبوون.

(تَصُفُّ النِسـاءُ خَلـفَ الرجـالِ ولا تُصَفُّ مَعَهُم): ژنان له پشـت پیاوانەوە ریز دەبن‌و لەگەڵ پیاواندا ریز نابن.
(صَفَّ-تِ الإبِلُ قوائِمَها): حوشترەكان قاچیان بە ریز دانا.
(-اللَّحْـمَ): گۆشـتەكەی لـە بـاری درێژیی توێكرد.
(-الطائِـرُ جَناحِيـهِ): باڵندەكە لـە فڕیندا باڵەكانی كردەوە بێنەوەی بیانجووڵێنێت.
(صافَّ- القَومُ في القِتال. مُصافَّةً): لە شەڕدا راوەسـتان‌و ریزیانبەسـت یـان لە شـتێتردا ریزبوون.
(تَصافَّ- القَومُ): بە ریزێك وەسـتان/ بوون بە ریزێك/ ریزیانبەست.
(إصْطَفَّ- القَومُ): ریزبوون/ ریزیانبەست.
(ألصَـفّ (ج) صُفوف): ریـزی رێكی هەموو شـتێك وەكو ریزی درەخت‌و سـەربازو پۆلی دەسـتەیەك قوتابیان كە پێكەوە بن لە ئاست چینێكبن لە خوێندندا. خوێشگەلی ریزبوو.
(ألصافَّةُ- مِنَ الإبِـلِ (ج) صافّات وصَوافّ): گەلە حوشترێكی كە پێیان رێكی یەكبن.
(ألصافّات): فریشتەكان.
(ألطيرُ الصَوافّ): باڵندەی باڵكراوە لە فڕیندا كە نەیبزوێنێت.
(ناقَةٌ صَفُوفٌ): حوشـتری فرە شیر كە چەند دەفری لێپڕبكەن لە بەر زۆریی شـیرەكەی یا لە دۆشیندا دەست‌و پێی رێك دابنێت.
(ألصَفيف): شـتی لەبەر هەتـاو هەڵخراو تا وشكبێتەوە یان سەرئاگر خراو تا بیرژێت.
(ألمَصَـفّ (ج) مَصافّ): ١-شـوێنی ریزبوون/ ریزگـە ٢-وێسـتگەی جەنـگ ٣-وێسـتگە بە گشتی.
(مَصَفُّ الكلام) (عامية): شوێنی قسەكردن.
٢-(صَـفَّ وصَفَّفَ- السَـرْجَ): سـەرزینی بۆ زینەكە كرد.
(صـافَّ- فُلانٌ. فُلانـاً ومُصافَّـةً): كەپری فیسـار بەرامبەر كەپرەكەی فیسار كەسبوو. ئەو بەرامبەرمە.
(أصَفَّ- السَرجَ): سەرزینی بۆ زینەكە كرد.
(ألصُفَّـةُ (ج) صُفَـف وصُفّـات وصِفاف): كەپری هاوین.
(صُفَّـةُ السَـرجِ أو الرَحـلِ): سـەرزین یان سەركورتان.
(صُفَّةُ المَسجِدِ): ژووری مانەوەو تێدا دانیشتن كە لە پاڵ مزگەوتەكەدا دەبێت.
٣-(ألصُفَّـة (ج) صُفَف وصُفّـات وصِفاف): ١-ئەو هێندە گەنم‌و دانەوێڵەیەك كە دەخرێتە سەر بەریدەست ٢-سەكۆیەكی تەسكی بەرز.
(صُفَّةٌ- مِنَ الدَّهر): دەمێكی رۆژگارو چەرخ/ ماوەیەك.
(عِشنا صُفَّةً مِنَ الدَّهرِ): سەردەمێك ژیاین/ ماوەی رۆژگارێك ژیاین.

(أَلصَفَف): ژێر زرێ که له بەردەکرێت.

٤-(صَفصَــفَ- الرَجُــلُ): بــه تەنیــا بــه تەختانیەکەدا ڕۆیشت.

(أَلصَفْصَف): زەویی تەختانی.

(قــاعٌ صَفصَــف): زەوییەکــی تەختی نرم/ تەختانییەکی نرم.

(أَلصَفصَفة): بیابان.

٥-(صَفْصَفَ العُصْفُورُ): چۆلەکەکە جریواندی.

أَلصُفْصُف) (ح): چۆلەکە/ چێشکە.

٦-(صَفصَفَ- الأَمْتِعَةَ) (عامية): کەلوپەلەکەی ڕیزکردو ڕێکخست.

٧-(أَلصَفْصَــاف) (ن): داری بــی. له شــوێنه ســاردو فێنکەکاندا دەڕوێت به تایبەتی نزیك ئاو، زۆر جۆری هەیە.

(صَفصــاف السَــلاّلين): بیــه کاژاو کــه ســەبەتەکەرەکان به چڵه تــەڕو نەرمەکانی سەبەته دروسدەکەن.

(الصَفصاف المُستَحي): شۆڕەبی که بۆ جوانیی دەڕوێنرێت.

صفت: (صَفتَ- حَقَّهُ صَفتاً) (عامية): وازی له مافەکەی خۆی هێنا.

(تَصَفَّــتَ- الرَجُلُ): خــۆی قایمکردو خۆی ڕاگرتو بەرگەیگرت.

(أَلصِفِــت والصِفَّتان والصِفَّتــان): ١-کەتەی توندوتیــژ ٢-بەهێــزی (نەزانــدوو/ ڕەق ڕەفتار).

صفح: ١-(صَفَحَ- الشــيءَ صَفْحاً): شتەکەی پانکرد تەختکرد.

(-هُ بالسَيفِ): به باری پانیی دەمی شمشێرەکه لێیدا/ پێیداکێشا.

(-الناسَ): ڕووی خەڵکەکەی (دی/ تەماشاکرد).

(صَفَّحَ- المَكانَ): شوێنەکەی بەردڕێژکرد/ به بەردی پان فەرشیکرد.

(-الشــيءَ): شــتەکەی تەخــتو پــان کردو درێژیکردەوە.

(-بِيَديهِ): بەدەست چەپڵەی لێدا.

(صافَــحَ-هُ صِفاحــاً ومُصافَحَــةً): تەوقەی لەگەڵدا کرد/ دەستی خسته ناودەستیەوە.

(تَصافَــحَ- القَومُ): تەوقەیــان لەگەڵ یەکدا کرد.

(«تَصافَحَــتِ الأَجفانُ): پێڵووەکان نیشــتنه سەر یەك.

(أَلصَفْح (مص) (ج) صِفاح): تەنشت.

(-مِنَ الإنسان): (تەنشتی/ لای) مرۆڤ.

(-مِنَ السَيف): ڕووی/ دەمی شمشێر.

(-مِنَ الوَجه): ڕوومەت.

(أَلصُفْــح): ١-ڕووی پانی شمشــێر ٢-ڕوومەتی مرۆڤ.

(صُفْحا الكَفَّــين): (لەپی/ بــەری) هەردوو دەست.

(أَلصَفْحَةُ- مِنَ الشيء (ج) صَفَحات): ڕووی‌و تەنشتی شتەکه.

(-مِن الكِتاب): ڕووی پەڕەی کاغەز.
(صَفحَةُ الرَجُل): پانیی سنگی پیاو.
(«أبدی لَهُ صَفحَتَهُ»): دڵی خۆی بۆ کردەوەو چی لە دڵدا بوو پێیوت.
(ألصَفْحـانِ والصَفْحَتـانِ): هـەردوو لای ڕوومەت.
(ألصِفـاح والصَفَح): ڕوومـەتو ناوچەوانی زۆر پان.
(«لَقِیَهُ صِفاحاً»): لەپڕ ڕووبەڕوویبووەوە.
(ألصُفّاح (ج) صُفّاحات وصَفافیح): ١-بەردی تەنکـی پان ٢-حوشـتری کۆپـارە (خەملاو/ گەورەبوو).
(ألصَفیـح): ١-ڕووی هەمـوو شـتێکی پـان ٢-ڕووی ئاسمان.
(ألصَفیحَةُ (ج) صَفیح وصَفائِح): ١-شمشێری دەمپان ٢-بەردەپانە ٣-ڕووی هەموو شـتێکی درێـژو پان ٤-(ط) گونکـە هەویری بچووکی پانکـراوە کە گۆشـتو بەهاراتـی تێدەکەنو پێوەدەکەنو دەیبرژێنن.
(ألصَفیحَة أو النَّصل) (ز) ڕووی پانی گەڵای ڕووەك.
(صَفیحَةُ الوَجهِ): پێستی ڕوو.
(ألصَفائِح): ١-تەختەی دەرگـا ٢-پارچەکانی کەللەی سەر.
(ألمُصْفَح): پان
(-مِنَ الوجوه): ڕووی پانو جوانو لووس.
(-مِـنَ الـرُؤوس): سـەری درێژەوەبـوو/ سەردرێژ.
(-مِنِ النـاس): مرۆڤی دووڕووی ناپاك/ لای ئـەم ڕوویەکی هەیەو لای ئـەو ڕوویەکیتری هەیە.
(-مِنَ الأُنوف): لووتی ڕێکو جوان.
(-مِـنَ القُلـوب): دڵێـك بڕواو کفـری تێدا کۆبێتەوە/ پاکیو ناپاکیی تێدابێت.
(ألمُصَفَّح): ١-پان ٢-بە تەختەی پان/ شتی پان داپۆشراو.
(أنْـفٌ مُصَفَّـح): لووتـی ڕێـکو جـوانو مامناوەندی.
(ألمُصَفَّحَةُ والمُصَفَّحَةُ (ج) مُصَفَّحات ومُصَفَّحات): شمشێر.
(ألمُصَفَّحـات واحدتهـا مُصَفَّحَـة) (ا ع): ئوتومبیلی جەنگ ئەملاولاکەی تەختە پۆڵای تێگیراوەو تۆپی لەسەر بەستراوە.
٢-(صَفَـحَ- عَنهُ. صَفحاً): ١-ڕووی لێوەرگێڕا ٢-خۆی لێلاداو وازی لێهێناو بەجێیهێشـت ٣-لێیبورد/ لێیخۆشبوو.
(-السـائِلَ عَن حاجَتِهِ): دەسـتی بە ڕووی سواڵکەرەکەوە یان خواستیارەکەوە نا.
(«أتَیتُـه في حاجَـةٍ فَصَفَحَني»): هاتمەلای شـتێکم پێویستبوو دەسـتی بە ڕوومەوە ناو نەیدامێ.
(-تِ الناقَةُ وغَیرُها صُفُوحاً): وشـترەکە یان

ئاژەڵی تر شیرەکەی نەما وشکیکرد.
(صافِح): شیروشککردوو.
(صافَحَ- المريضُ) (عند العامة): نەخۆشەکە پاڵی بە مەترسییەکەی سەریەوەنا.
(أَصْفَحَ-السائِلَ): دەرۆزەکەی رووکشێنکردو دەستی پێوەنا.
(-الشيءَ): شتەکەی هەڵگێرایەوە.
(إستَصفَحَ-هُ الذَنْبَ): داوای لێکرد لە گوناهی خۆشبێت.
(الصَفْح) (مص): ١-خۆلێلادان/ خۆلێگێلکردن.
(«ضَـرَبَ عَنـهُ صَفْحـاً»): خـۆی لێلاداو لێگێلکرد ٢-لێبوردن/ لێخۆشبوون.
(أَلصَفَّاح): (لێبوردوو/ لێخۆشبوو) لە گوناهی خەڵك.
(أَلصَفُوح): ١-لە گوناه (خۆشـبوو/ لێبوردوو) ٢-بەخشندە/ جوامێر.
(أَلمُصْفَح): هەڵگەراوە/ لارکراوە.
٢-(صَفَحَ-النـاسَ صَفْحـاً): دیدەنیـی خەڵکیکردو سەرنجی دایە گوزەرانیانو باری ژیانیان.
(-وَرَقَ المَصْحَـفَ): قورئانەکـەی پەرەپەرە هەڵدایەوە.
(-فِي الأَمر): سەرنجی لە کارەکە (دا/ گرت).
(تَصَفَّحَ- الشـيءَ): لە شتەکەی روانیی/ ورد سەرنجی لێگرتو بیری لێکردەوە.
(-القَـومَ): ١-رووانییە گوزەرانو رەوشـیان/ بەسـەریکردنەوە ٢-روانیە رووی خەڵکەکەو دیقەتی لێگرتن تا بزانێت کاروباریان چۆنە.
صفد: (صَفَدَ وصَفَّدَ-هُ صَفْداً وصُفوداً): کۆتو زنجیریکرد/ پێوەندیکرد/ کەلەپچەیکرد.
(أَصْفَدَ-هُ): بەستیەوە/ پێوەندیکرد.
(-هُ مالاً): دارایدایە.
(أَلصَفَد (ج) أَصْفاد): ١-بەخشش/ خەڵات.
(«أَلصَفَدُ صَفَدٌ»): بەخشش کۆتە/ پێبەستە ٢-کۆتو زنجیر/ پێوەند/ پێبەست.
(أَلصِفـاد): ١-ئـەوەی دیلـی پێدەبەسـترێت وەك کۆتو زنجـیر/ پێوەندو دەسـتبەند ٢-پێوەندکـردنو بەسـتنەوە/ زنجیرکـردنو لێتوندکردنی.
صفـر: ١-(صَفَـرَ. صَفيراً): فیکـەی بە لێو لێدا.
(صَوفَرَ) (عامية) = صَفَـرَ- بِالفَرَسِ عِندَ الـورود): فیکەی بـۆ چارەوێکە لێـدا تا ئاو بخواتەوە.
(صَفَّـرَ- لِلدابَّةِ): بـۆ چوارپێکە/ وڵاخەکە فیکەی (لێدا/ کێشا).
(-بالدابَّـةِ): بـە فیکـە وڵاخەکـەی بـۆ ئاوخواردنەوە بانگکرد.
(أَلصُفار= الصَفير): بە لێو فیکەکێشان.
(أَلصَفَّارَة): شـاور/ فیکە ئامێرێکی بچووکی فیکەلێدانە.
(صُوفَيْرَة) (عامية): شاور/ فیکە.

(صَفَّــارَةُ الخَطَــرِ= صَفَّارَةُ الإنذار): ترســه شووته/ ئاگاشــووته/ ئامێرێکه کاتی جەنگ بۆ وریاکردنەوەو ئاگادارکردنی خەڵکی ناوشار کاتی بۆردومانــی فرۆکه به هەڵم یان هەوای پەستێوراو شــووت واتا فیکەی بەرزو بەهێز لێدەدات.

(ألصَفير) (مص): هەموو دەنگێکی ناســکو درێژەوەبووی بێ وشەیە.

(حُروف الصَفير): وشــەی فیکــه ئەمانەن: (س) و (ز) و (ص).

(ألصافِــر): ١-هەمــوو باڵندەیەکــی دەنگدار ٢-(ح) تاقتاقکەرە. باڵندەیەکه به شــەو هەر دەخوێنێت ئەوەکا بنوێتو بەیدەستی بکەن/ بیگرن.

(«هو أَجْبَنُ مِن صافِر»): ئەو له تاقتاقکەرە ترسنۆکترە.

٢-(صَفِــرَ. صَفْــراً): زەرداو لــه گەدەیــدا کۆبووەوە/ سەفرای زۆر بوو.

(مَصْفور): کەسێکه (زەرداوی/ سەفرای) زۆر بێت.

(صَفَّرَ- الشيءَ): شتەکەی زەرد کرد.

(-الثَوبَ): بەرگەکەی له ڕەنگی زەردهەڵکێشا/ زەردیکرد.

(إصْفَــرَ واصْفــارَّ): زەردهەڵگــەڕا/ ڕەنگی زەردبوو.

(ألصُفْر): ١-پارە ٢-زێڕ ٣-مسی زەرد.

(ألصُفْرَةُ): ڕەنگی زەردی زێڕین.

(ألصَفَــر) (طــب) = اليَرَقــان: زەردوویــی دەردێکه ڕوو و لەش زەرد دەکات.

(ألصُفار): ١-زەرداوێکه له گەدەدا کۆدەبێتەوە ٢-زەردییەکه دەداته پێستو ڕوو.

(ألصُفار والصِفار) (عند العامة): زەردێنەی هێلکە.

(الصُفارَةُ): زەردهەڵگەڕانی ڕووەك.

(ألصَفَّار): مسگەر.

(ألصُفارِيَّة) (ح): باڵندەیە. زەردیوەلی.

(ألأَصْفَر (م) صَفْراء (ج) صُفْر): ئەو شتەی ڕەنگی زەرد بێت.

(ألأَصْفَران): ١-زەعفەرانو زێڕ.

(ألصَفْراء): مێی وشەی (ألأَصْفَر): ٢-زێڕ.

(ألصُفَيْراء) (ن): درەختی دڵداری. درەختێکی جوانــه له وڵاتانــی خۆرهەڵاتی ناوەڕاســتدا دەڕوێت گەڵاچڕو ڕەنگسەوزی مەیلەو زەردە.

(ألصُفَــيراء اليابانـية) (ن): درەختی دڵداریی ژاپۆنــی درەختێکــی جوانه بــۆ ڕازاندنەوە گەڵاکانی له شێوەی پەڕدان گوڵەکانی هێشوو شــێوەن سپی مەیلەو زەردن به زۆریی له زۆر شوێنی ئاووهەوا جیادا دەڕوێنرێت.

٢-(صَفِرَ- الإناءُ. صَفَراً و صُفوراً وصُفُورَةً): قاپەکه بۆشبوو/ بەتاڵبوو.

(«صَفِرَ وطابُهُ أَو إِناؤُهُ»): قاپەکەی بۆشــه واتا مردووە.

(«دَخَلْنا الدارَ فَوَجَدْناها تَصْفُر») (عامية): چووینه ماڵەکەوە بینیمان چۆڵ و هۆڵ بوو.
(صَفَّرَ- البَيْتَ): خانووەکەی چۆڵکرد.
(أَصْفَرَ): نەبوو بوو/ هەژار بوو.
(-ألإناءُ): دەفرەکە بۆشبوو/ بەتاڵبوو.
(-البَيتَ): خانووەکەی چۆڵکرد.
(أَلصَفْر والصُفْر): چۆڵ/ بۆش/ بەتاڵ.
(«بَيتٌ صَفْرٌ مِن المَتاع»): خانویەکی چۆڵ و بێکەلوپەل.
(«هُوَ صَفْرُ اليَدَين»): ئەو دەستبەتاڵە هیچی پێنیه.
(أَلصِفْــر): ١-چــۆڵ/ بۆش/ بەتــاڵ ٢-(ع ح): سفر. (سِفر) (عامية): سفر.
(الصَفَر): برسێتی.
(صَفَرٌ (ج) أَصْفار): مانگی سەفەری عەرەبی کە پــاش مانگی موحەرەم دێـــتو (٢٩) ڕۆژە (دەڵێــن بۆیـــە وا ناونــراوە چونکـــە خەڵکی مەککە کــە کۆچیاندەکرد مەککە چۆڵ دەبوو هەروەهـــا دەڵێن پەلامـــاری خێڵەکانیان دەدا تاڵانیـــان دەکـــردن هیچیـــان پێنەدەهێشـــتن سفریاندەکردن.
(أَلصَفَران): دوو مانگی عەرەبییە لە ئیسلامدا یەکێکیان ناونا موحەرەم ئەویتریان لەســەر ناوی خۆی هێشتەوە.
(أَلصِفر (ج) أَصْفار): چۆڵ/ بۆش/ بەتاڵ.
(إناءٌ أَصْفار): قاپێکی بۆش.
(أَلصَفْرَة): ١-جارێك چۆڵبوون ٢-برســێتیی و گەدەچۆڵبوون.
(أَلصُفار) (ح): جۆرە کرمێکی گەدەیە/ کرمی ئەسکارس.
(أَلصِفريت (ج) صَفاريت): هەژار/ ڕەزڵخوای داماو.
(أَلصافِر) (فا): دز.
«مابالـــدارِ صافِـــرٌ»: کەس لـــە خانووەکەدا نییە.
(أَلصَفْـــراء) (ح): ١-گوللـــە پـــاش فڕێدانـــی گەراکـــەی ٢-زراو یەکێکـــە لـــە ئـــاوەکان کە دەرژێتە سەر خواردن.
(أَلْمُصْفِر) (فا): کەمدەست/ نەبوو/ نەدارا.
(أَلمَصْفُور والمُصَفَّر): برسی.
٤-(الصَفَر): ١-ناخیدڵ ٢-ئاوەز/ ئەقڵ.
(أَلصُفْرَةُ): ڕەشیی.
(أَلصُفار والصِفار): کاو پاشماوەی خواردنێك کە بەدانی چوارچێوە دەمێنێتەوە.
(أَلصَفَـــرِيُّ والصَفَرِيَّـــةُ): ١-بارانـــی پایـــز ٢-رووەکێك کە پایزە بێت.
(أَلصافِر): هەموو باڵندەیەك کە ڕاو نەکات.
٥-(أَلصِفْرِد) (ح): باڵندەیەکی زۆر ترسنۆکە. دەکرێتە نموونە بۆ ترسنۆکی.
صفع: (صَفَـــعَ- هُ صَفْعاً): بە بەریدەســـتی کێشای بە پشتیملی یان ڕوومەتی یان لەشیدا/ دایە بەر زللە.

(صافَـعَ ـهُ وتَصافَعا): یەکتریـان دایە بەر زللە.
(ألصَفعانُ والمِصَفعانِيّ): کەسێکە کە زۆر بەر زللە دەدرێت/ زللە زۆر دەخوات.
صفق: ١-(صَفَـقَ-هُ صَفقاً): بە شـێوەیەك لێیدا کە دەنگی لێدانەکەی هات.
(صَفَـقَ- الطائِـرُ بِجَناحَیـهِ): پەلەوەرەکە باڵەکانی بەیەکدادا.
(-العُودَ): لە عوودەکەیدا.
(-لَـهُ بالبَیعِ وصَفَقَ علی یَـدِهِ وصَفَقَ یَدَهُ بالبَیعَةِ): دەستی کێشـا بە دەستی ئەودا کە ئەوە نیشانەی ڕێککەوتنی فرۆشتنەکەیە.
(-هُ بالسَّیفِ): شمشێری پێداکێشا.
(-تِ الریـحُ الأشـجارَ): باکـە درەختەکانی هێناو برد/ بزواندی.
(صَفَّقَ- الطائرُ بَجَناحَیهِ): باڵندەکە باڵی بە یەکدا داو شەقەی لێهەستاند.
(-الرَجُلُ یَدَیهِ): چەپڵەی لێدا.
(صافَـقَ- الرَجُـلانِ- عِنـد البَیـعِ): لـە فرۆشتنەکەدا دوو پیاوەکە دەستیان بە دەستی یەکتردا داو نیشانەی فرۆشتن دەبێت.
(أصفَقَ- القَومُ): شپرزەبوون.
(تَصافَـقَ- القَـومُ): لەگەڵ یەکـدا کەوتنە سەوداو کڕینو فرۆشتن.
(إصْطَفَـقَ- العُـودُ): ژێـی عودەکـە کەوتە دنگەدنگو جووڵە.

(-البَحْرُ): شەپۆلی دەریاکە بەیەکیاندادا.
(-القَومُ): شپرزەبوون.
(-تِ الأشـجارُ): بـە با درەختـەکان کەوتنە لەرەو بەیەکیاندادا.
(ألصَفْقَةُ): ١-دەسـت بە دەسـتی یەکتردا دان لە کڕینو فرۆشتندا ٢-ڕێککەوتنی فرۆشتنو کڕین.
(«صَفْقَةٌ رابِحَة وصَفقَةٌ خاسرة): فرۆشتنێك بە قازانجو فرۆشتنێك بە زیان.
(«رَبِحَت صَفقَتُـكَ»): کڕینو فرۆختەکەت قازانجیکرد/ قازانجی تێدابوو.
(ألصّافِقَةُ): زۆرزان.
(ألصَفّاق): ١-کەسـێکە بـۆ کڕینو فرۆختو بازرگانیـی گـوزارو هاتوچـۆ زۆر بـکات ٢-چەپڵەکوتێکی ئازا.
٢-(صَفَقَ- الرَجُلُ. صَفْقاً): ڕۆیشت.
(-الرَجُلَ عَن مُرادِهِ): پیاوەکەی لە نیازەکەی (پەشیمانکردەوە/ ساردکردەوە) و گێڕایەوە.
(-عَیْنَهُ): چاوی نووقاند.
(-البـابَ) (ضـد): ١-دەرگاکـەی پێـوەدا/ ٢-کردیەوە.
(-الشَـرابَ): قاپەو قاپی بە شەربەتەکە کرد تا (سافبێت/ پوختبێت).
(صَفَّقَ- الرجل): کابرا ڕۆیشت.
(-الشرابَ): قاپەو قاپی پێکرد تا پوختبێت.
(-حَولَ الشيءِ): خولی شتەکەیدا.

(صافَـقَ- الرَجُـلُ بَينَ جَنْبَيـهِ): ئەمدیوو ئەودیویکرد/ تلاوتلیکرد.

(أَصْفَـقَ-هُ): دەسـتی پێـوە نـاو گێڕایەوە نەیهێشت.

(-البـابَ والقَـدَحَ والشَـرابَ): دەرگاکـەی پێوەدا یان کردیەوەو قاپەکەی خوارکردەوەو شـەربەتەکەی ئەم قاپو ئەوقاپکرد تا سافو پاکبێت.

(تَصَفَّقَ – الرَجُلُ): پیاوەکە ڕارا بوو.

(إصطَفَـقَ-تِ النسـاءُ علـى المَيِّـتِ): ژنان لەسەر مردووەکە لاوانەوەکەیان دەسەندەوەو شینەکەیان گەرمدەکرد.

(إنْصَفَقَ): لایداو گەڕایەوەو پاشەکشەیکرد.

(ألصَفْق (مـص) (ج) صُفُوق): ١-تاکی دەرگا ٢-کەنار/ لا/ تەنشت.

(صَفقُ الجَبَلِ): ڕووی شاخ.

(صَفقا العُنُقِ): ئەملاولای مل.

(صَفْـقُ- الفَـرَسِ): هـەردوو دیـوی ڕووی چارەوێ.

(ألصَفْق): کەنار/ لا.

(ألصِفْق): تاکی دەرگا.

(ألصَفائِق): سوارانی هاتوچۆکەر.

(ألمُصافِـق- مِن الإبل) (فا): ئەو حوشـترەی هەر جارەی لەسەر لایەك دەنوێت.

٣-(صَفَقَ- القَدَحَ. صَفْقاً): قاپەکەی پڕکرد.

(«صَفَقَت عَلَينا صافِقَةٌ»): کۆمەڵێك خۆیان بەسەرماندا دا. واتا لامان دابەزین/ لایاندا.

(أَصْفَـقَ- الحَـوضَ): ئـاوی لـە گۆلەکـەدا گردکردەوە.

(-لِلقَوم): خواردنی تەواوی بۆ هێنان کە پێی تێربن.

(«أَصْفَقوا على قَولٍ واحِدٍ»): لەسەر قسەیەك هەرموو پێکهاتنو دەنگیان کرد بە یەك.

(إنْصَفَـقَ- القَومُ عَلَيهِ): خوێشـگەل بەرەو ڕووی چوون/ بۆی چوون.

(ألصافِقَة): کۆمەڵی دابەزیو/ داپەڕیو.

٤-(صَفُـقَ- الثَوبُ صَفاقَـةً): جلەکە چووە یەكو سفتبوو.

(صافَـقَ- بَـينَ ثَوبَـينِ): دوو کراسـەکەی بەسەریەکدا لەبەرکرد.

(أَصْفَـقَ- الثَوبَ): کراسـەکەی چوانەیەك/ سفتکرد.

(ألصِفاق (ج) صُفُق): ١-پێستی ژێرینی لەش ٢-ئەو پێسـتەی بەسـەر ورگەوە/ سکەوەیەو رایدەگرێـت ئەگـەر دڕا فتق پەیـدا دەبێت ٣-ئەو پێستەی کە لە داری قەڵغان دەگیرێت.

(ثَوْبٌ صَفيقٌ): بەرگێکی کووتاڵ سفت.

٥-(صَفُقَ- الرَجُلُ. صَفاقَـةً): چەرداوەروو بوو/ بێحەیا بوو/ بێشەرمو شکۆ بوو.

(وَجْـهٌ صَفيـقٌ): ڕوویەکـی بێئابـڕوو/ چەرداوەروو.

٦-(أُصْفِقَ-لي): بۆم ڕێکەوتو لووا.

(تَصَفَّـقَ- للأَمـرِ): ڕوویکـردە کارەکـەو بەرەنگاریبوو.

(اَلصَفائِـق والصَوافِـق): قەومـاوەکان/ ڕووداوەکان.

٣-(اَلصَفَـق): دواییـنی مێشـك/ پاشـەوەو پشتەوەی مێشك.

(اَلصَفُوق (ج) صُفُق): ١-کێوی سەختی هەزار بە هەزار ٢-ماهیزەرد/ تاوێری قووچی لووس ٣-کەوانەی نەرم.

اَلمَصْفَق: ڕاگوزەر.

صفن: ١-(صَفَنَ- الفَرسُ صُفوناً): چارەوێکە لەسەر سێ لاقی وەستاو نووکی سمی چوارەمی خستە سەر زەوی.

(-الرَجُلُ): قاچی جووتکرد.

(- بِهِ الأَرضَ): پێی بە زەویدا کوتا.

(صافَـنَ- القَـومَ): لەگەڵیانـدا وەسـتاو بەرامبەریانبوو.

(الصافِن- مِنَ الخَیل (ج) صافِنات وصَوافِن وصُفون): ئەسپی لەسەر سێ پێ وەستاو.

٢-(صَفَـنَ- الطائِـرُ- الحَشـیشَ أَو الوَرَقَ. صَفْنـاً): باڵندەکە پووشـەکەی یان گەڵاکەی لە هێلانەکـەدا بۆ بەچکەکانـی دامەزراندو داچاندو ڕێکخست.

(-الرَجُلَ): کیسەی گونی هەڵدری.

(اَلصَفْـن (ج) صُفْـن وصُفُـن وأَصْفـان وصُفْنان): توورەکەی گون.

(اَلصَفَن (ج) أَصْفـان وصُفْنان): توورەکەی گون.

(اَلصَفْنَـةُ): جارێـك هەڵدڕینـی توورەکەی گون.

(اَلصَفَنَةُ): توورەکەی گون.

٣-(صافَـنَ- الماءَ بَینَهُم): ئاوەکەی لە نێواندا بەشـکردن. چەنـد چەوێـك دەخاتـە بنی قاپێکەوە ئاودەکاتـە قاپەکە تا ئاوو چەوەکە دادەپۆشـێت ئەو کەسـە ئەو ئاوە دەخواتەوە پاشـان بۆ یەکێکیتر ئاو دەکاتـەوە قاپەکە تا ئاوەکە چەوەکە دادەپۆشـێت ئەویش ئاوەکە دەخواتـەوە بەو شـێوە ئاوەکەیان وەك یەك لێدابەشـدەکات ئەمە لە کاتێکـدا دەبێت لە کارواندا بن و ئاویان کەم پێبێت.

(تَصافَنَ- القَومُ الماءَ): ئاوەکەیان وەك یەك و بەو شێوەیە بەشکرد.

(اَلصُفـن): ١-کاسـەیەکی پێسـتینە بـۆ ئاوخواردنـەوە ٢-توورەکە چەرمێکە شـوان نان و شتی پێویستی خۆی تێدەخات.

(اَلصَفْن (ج) صُفْن وصُفُن وأَصْفان وصُفْنان): شتێکە وەك خوان وایەو لە پێستە.

(اَلصَفْنَة= السُـفْرَة): ١-خـوان ٢-توورەکەی شوان کە لە پێستەو نان و شتی پێویستی خۆی تێدەخات.

٤-(الصافِن (ج) صافِنات وصَوافِن وصُفُون): ڕەگێکـە لە دامێنـی لاقدایە بـۆ حەجامات

دەبڕرێت.

(أَلصَفْــن (ج) صُفْــن وصُفُــن وأَصْفــان وصُفنان= أَلشِقْشِقَة): شتێکە وەك سی کاتێك حوشــتر مۆزدەکاتو دەبۆڕێنێت لە دەمیەوە دەیهێنێنە دەرەوە.

(أَلصَفْنَةُ= الشِقشِقَةُ):

صفــا: ١-(صَفا. صَفْــواً وصَفــاءً وصُفُوّاً): ڕوونو پاکبوو.

(-الجَوُّ): ئاســمان سایەقەو ســامالْ بوو هیچ هەوری پێوە نەبوو.

(-القِــدْرَ): پوختــەو پالاْوتــەی شــتی نــاو مەنجەلْەکەی دەرهێنا.

(صَفَّى- الشَيءَ. تَصفِيَةً): شتەکەی پالاْوتو پوختەکرد.

(الصافِي) (فا): پوختەو پالاْوتە/ پاك.

(يَومٌ صافٍ): ڕۆژی سایەقە/ سامالْو خۆشو بێلەکە.

(كلأٌ صافٍ): گیایەکی پاكو پوخت کە شتێکی بێکەلْكو زیانبەخشی تێدا نەبێت.

(الصافِيَــةُ (ج) صَــوافٍ): ١-مێــی وشــەی (الصــافِي) ٢-خاکێکــی/ زەوییەکــی بێخاوەن خاوەنەکانی یان مــردوونو میراتگریان نییە یان کۆچیانکردووەو نەگەڕاونەتەوە.

(أَلصَفْو والصَفْوَة والصُفْوَة- مِن كُلِّ شــيءٍ): پوختەو هەلْبژاردەی هەموو شتێك/ ناوێزەو نایابی هەموو شتێك.

(-عند العامة): خۆلْەمێش.

(أَلصِفْوَة): ناوێزەو کورۆکی/ جەوهەری ئەو شتە.

(يَومٌ صَفوان): ڕۆژێکی سامالْو پاك.

(أَلصَفيّ): پوختەو ساف/ پاكو پالاْوتە.

(المِصْفاة (ج) مَصافٍ): پالْێوگە.

٢-(صَفا وصَفُوَ-تِ الناقَةُ. صَفْواً وصَفاوَةً): شیری زۆر بوو.

(أَلصَفِيَّــةُ (ج) صَفايــا): ١-مێحوشــترێك کە شــیری زۆر بێــت ٢-دارخورمایــەك کــە بەر زۆربگرێت.

٣-(صافى- فُلاناً. مُصافاةً): بە دلْ دۆســتو دلْســۆزیبوو/ دلْســۆزییو خۆشەویســتیی ڕاستەقینەیکرد.

(تَصافى- القَومُ): خۆشەویستیی ڕاستەقینەو دلْســۆزیی یەکتریانکــرد/ دلْیــان لــە یــەك پاکبووەوە.

(إِسْــتَصفى- الرَجُلَ): پیاوەکەی بە دلْسۆزو دۆستی ڕاست دانا.

(«إِســتَصفاهُ واصْطَفــاه»): هەلْیبژاردو بە دۆستو دلْسۆزی خۆی زانیو دانا.

(أَلصَفْو): بە دلْ دۆستایەتیی/ خۆشەویستییو دلْسۆزیی ڕاستەقینە.

(أَلصِفْوَة): دۆستی ڕاستەقینەو دلْسۆز.

(أَلصَفِيّ (ج) أَصْفيــاء (م) صَفِيّ وصَفِيَّة): دۆستی دلْسۆزو ڕاست.

(اَلْمُصْطَفى): هەڵبژاردە/ هەڵبژێرراو ٢-دەفر قاپ ٣-نازناوی پۆڵسی نێرراوە.

٤-(أَصفى- الـذي يَحْفُرُ. إصفـاءً): چاڵاو هەڵکەنەکـە گەیشـتە تاوێرێك کـە رێگەی هەڵکەندنی لێبگرێت.

(-تِ الدَجاجَةُ): مریشـکەکە لە هێلکەکردن چووەوە.

(-الشـاعِرُ): شـاعیرەکە/ هۆزانڤانەکـە لـە هەڵبەستدانان کەوت.

(أَصفى- مِنَ المالِ): نەدارا بوو/ نەبوو بوو.

(اَلصَفا): ١-کۆی وشـەی (الصَفاة)ە ٢-نازناوی پەتروسی سـەرداری نێرراوەکانە (سريانية) واتاکەی (تاوێرە).

(اَلصَفاة (ج) صَفا وصَفَوات و (جج) أَصفاء وصُفِـيّ وصِفِـيّ والصَفْوانَــة (ج) صَفْوان وصَفَــوان والصفْــواء): تاوێــری گــەورەی سەخت.

(«فُلان لاتُقــرَعُ لَهُ صَفاةٌ»): فیســار قایمە کەس پێی ناوێرێت و دەرەقەتی نایەت.

(«فُــلان لا تَندى صَفاتُهُ»): فیســار هیچی لێهەڵناوەرێت واتا چرووکە.

(اَلصِفْوَةُ-مِــنَ الماءِ ونَحوِهُ): چــۆرە ئاوێك و تۆزە شتێکی وەهایتر.

(اَلصَفْوان): تاوێری لووس.

٥-(أَصفـــى-هُ بِكَذا): بە تایبەتی ئەو شــتەی بەوداو دڵی پێ قایلکرد.

(-الشــيءَ): هەموو شــتەکەی (ماشــییەوە/ برد).

(إِسْتَصْفى المالَ): داراکەی هەموو برد.

(اَلصَفيّ والصَفِيَّة- مِنَ الغَنيمةِ (ج) صَفايا): هەڵبــژاردەی تاڵانیــی کە ســەرۆك بۆ خۆی دادەنێت و هەڵدەبژێرێت.

المُلحق:

صفو: (اَلتَصْفِيَة): پوختەکردن و پاك و روون خاوێنکردنــەوە بەوەی هەموو خەوشــێك و پیسییەکی لێبگیرێت و سافبکرێت.

(تَصْفِيَــةُ شَــراب): پاککردنــەوەو پاڵاوتن و پوختەکردنــی خواردنــەوە شــەربەت یــان شەرابێك.

(اَلتَنقِيَــة بالمصفاة): پاڵاوتــن و پاککردن بە پاڵێو پاڵاوتنی گیای کوڵاوتە.

(اَلتَصْفِيَة): دۆزینەوەی چارەسەری شتێك.

(«تَصفِيَةُ خلاف»): چارەسەرکردنی ناکۆکییەك و برانەوەی ناکۆکییەکە.

(تَصفِيَــةُ دَيــن) نەهێشــتنی قەرزێــك و قەرزارییــەك یەکســەر بە دانــەوەی یان بە بەشبەش و ماوەی دیاریکراوی.

(تَصفِيَةُ البَضائِع): فرۆشتن و نەهێشتنەوەی کاڵا لە دەم و کەشــێکدا بە داشکانی نرخەکەی لە هەل و مەرجێکدا.

(تَصفِيَةُ الحســاب): پاکتاوکردنی ژمێرەو بە سەرجەمکردن و نەهێشتنی.

(تَصْفِيَةُ الشركة): پاكتاوكردنى كۆمپانيا: بە سەرجەمكردنى ژمێرەى و هەڵوەشاندنەوەى.

صقب: ١-(صَقِـبَ- المَـكانُ. صَقَباً) (ضد):
١-شوێنەكە نزيكبوو ٢-دوور بوو.
صاقَبَ- هُ. صِقاباً و مُصاقَبَةً): نزيكيكردەوە.
«لَقِيتُهُ صِقاباً» رووبەڕوو (ديم/ پێيگەيشتم).
(أَصْقَبَ-هُ): نزيكيكردەوە.
(-الشيءُ): شتەكە نزيكبووەوە.
(«أَصْقَبَـكَ الصَيـدُ»): نێچيرەكـە لێـت نزيكبووەوەو لەقەمچابوو.
(أَلصَقَب والصَقِب): نزيك.
(«داري مِـن دارهِ بَصَقَـبٍ»): خانووەكـەم نزيكى خانووەكەى ئەوە.
(«الجارُ أَحَقُ بِصَقَبِهِ»): دراوسێ زۆرتر هەقى بەسەر ئەو دراوسێيەوەيە كە نزيكيەتى.
(المُصاقَبَةُ عِندَ المولدين):(لەلاىتازەگەرييەكان) لە يـەك نزيكبوونـەوە، ڕێككەوتـن، پێكهاتن (دەشێت بە (س) لە برى ص بيلێن).
٢-(صَقَبَ-هُ): مستەكۆڵەى پێداكێشا.
(-الشيءَ): شتەكەى (گرد كردەوە/ كۆكردەوە).
٣-(صَقَـبَ- الطائـرُ. صَقْبـاً): باڵندەكـە خوێندى.
٤-صَقَـبَ- البِنـاءَ. صَقْبـاً): خانەكـەى بەرزكردەوە.
(أَلصَقْـب (مص) (ج) صُقُـوب): درێژترين كۆڵەكەى ناوەڕاستى خانووەكە.

(أَلصَقْـب (ج) صِقـاب وصُقْبـان): هەموو شتێكى درێژ.
٥-(الصَيقَبانِيُّ): وردەواڵەفرۆش/ عەتار.
صقح: (أَلصَقَح والصَقَحَة): سەر رووتانەوە.
(أَلأَصْقَح (م) صَقْحاء): سەر رووتاوە.
صقــر: ١-(صَقَرَ-هُ بِالعَصــا. صَقْراً): بەدار لێيدا.
(«صَقَرني بِكَلامِهِ»): بە قسە ئازارى بە دڵم گەياند/ جەرگى داخدام/ كوشتمى.
(-بِهِ الأَرضَ): كێشاى بە زەويدا/ بە زەويدا دا.
(-الحجـارَةَ): بــە پيك يان پاچ يــان قوڵنگ بەردەكەى شكاند.
(أَلصاقُور): ١-پيك كە بەردى پێدەشـكێنرێت ٢-پاچ/ قوڵنگ ٣-زمان.
(أَلصاقور والصاقِـرَة): (چورتوم/ ئاپۆرەى/ وەيى) گەورەو گران.
(أَلصَقّار): ١-زمانبەد/ دووزمان ٢-نەفرەتكەر لە كەسـانێك كـە نەفـرەت هەڵنەگرنو كە شايان نەبن.
٢-(صَقَرَ-تِ الشَمسُ أَو النارُ. صَقْراً وصَقْرَةً): خۆر تينو تاويسەند ئاگرەكە تاويسەند.
(-النارَ): ئاگرەكەيكردەوە.
صَقَّـرَ- النـارَ: ئاگرەكـەى كـردەوە/ هەڵگيرساند.
(أَصْقَـرَ-تِ الشَّـمسُ أَو النّـارُ): خۆرەكـە تاويسەند يان ئاگرەكە كڵپەيسەند.

(تَصَقَّــر واصْطقَــرَ-تِ النــارُ): ئاگرەکــە کڵپەیسەندو گڕی بەرزبووەوە.
(صَقَرَ= سَقَر): دۆزەخ/ جەهەنەم.
٣-(صَقَرَ وأصْقَرَ اللبنُ صَقْراً): ماستەکە یان شیرەکە زۆر ترشبوو.
(ألصْقــر (ج) صُقُور وصِقار): ماســتی زۆر ترش.
(ألصَقْرَةُ): ماست یان شیری زۆر ترش.
٤-(تَصَقَّرَ- بالصَقر): بە هەڵۆ ڕاویکرد.
(الصَقْر (ج) أصْقُر وصُقُور وصُقُورة وصِقار وصِقارَة وصُقر (ج)): باڵندەیەکی گۆشتخۆرە ڕاوی پێدەکرێــت. هەمــوو باڵندەیــەك کــە ڕاوبکات جگە لە داڵو سیسارەکە کەچەڵە.
(ألصَقر- صائد الحيَّــات) (ح): باڵندەیەکی جوانــی گۆشــتخۆرە شــەوانە دەگەڕێــت دەنووکخــوارو قایمە لاقدرێژە مــارو مێروو دەخوات.
("صَقر صاقِرٌ"): هەڵۆیەکی چاوتیژ.
(ألصُقْــرَةُ): تێکەڵبوونــی ڕەنگــی ڕەش یان سەوزی باڵندە بەرەنگی سوور یان زەردەکەی.
(إمْرَأةٌ صَقِرَةٌ): ئافرەتێکی زیرەکی چاو زۆر تیژ.
٥-(تَصَقَّرَ- بالمَکانِ): لە شوێنەکەدا مایەوە.
(الصَقَر (ج) صُقُور وصِقَار): ئاوی گەراوە.
(ألصَقَرَةُ): ئاوێك لە گۆڵدا مابێتەوە.
٦-(ألصَقــر والصَقَر): شــیلەی خورمای تەڕ یان مێوژ.
("هذا التَّمرُ أصْقَرُ مِن ذاك"): ئەم خورمایە شیلەی لەویتر زۆرترە.
(ألصَقِر- مِنَ الرُطَب أو الزبيب): خورما یان مێوژێك کە بە کەڵکی دۆشاو لێگرتن بێت.
(ألصُقَر والصُقَاری): درۆو دەلەسە.
("جــاءَ بالصُقــرِ والبُقَــرِ أو بالصُقــاری والبُقاری"): درۆو دەلەســەو فیشــاڵی زۆری هێنا.
(ألصَاقُورَة): ناوەوەی کاسەی سەر کە مێشکی تێدایە.
(ألصَقّــار): ١-کافــر/ بێــبڕوا ٢-دۆشــاوگر ٣-دۆشــاوفرۆش ٤-ڕاهێنــی هەڵــۆ ٥-بە هەڵۆ ڕاوکەر.
(أبو مِصْقار) (ح): جۆرە ماسییەکە.
مِسقار (عامية)= أبو مِصقار.
صقع: ١-(صَقَعَ- هُ): کێشای بەسەریدا.
(-بِهِ الأرْضَ): دایبەزەویدا.
("صَقَعَتْــهُ الصاعِقَــةُ"): هەورە برووســکە لێیدا.
(صَقِعَ- الرَجُلُ- صَقَعاً): پیاوەکە بێهۆشکەوت یان مرد..(-تِ البِئرُ): چاڵاوەکە تەپی.
(الصاقِعَــةُ= الصاعِقَــةُ): هەورەبرووســکە/ هەورە تریشقە.
(ألصَقْعَــاء): خۆر (چونکە لە ســەری مرۆڤ دەدات و دەیبات).

٢-(صَقَــعَ- الرَجُــلُ): ١-پیاوەكــە بەلایەكدا ڕۆیشــت. ("ماأدريْ أَين صَقَع"): نازانم بە چ لایەكدا ڕۆیشــت ٢-لە ڕێی لایدا یــان لە ڕێی چاكەو پیاوەتیو جوامێریی لایدا.

(أَلصُقْع (ج) أَصْقاع): لا/ كەنار/ سوێ.

(أَلصَقِع): كەســێكی دوورە وڵات كە سۆراغی نازانرێت.

(أَلصَاقِع) (فا): درۆزن.

("صَه صاقِعُ"): درۆزن/ وزبە.

(الصاقِعَةُ): مێی وشەی (الصاقِع).

٣-(صَقَعَ- الدیُكُ. صَقْعاً وصُقاعاً وصَقیعاً): كەڵەشێرەكە قوقاندی/ خوێندی.

(-بِصَوتِــهِ. صَقْعــاً وصُقاعــاً): دەنگــی بەرزكردەوە/ شیراندی.

(أَلمِصْقَــع (ج) مَصاقِــع): ١-دەنگگــەورە/ دەنگبەرز ٢-ڕەوانبێژ/ زمانپاراو ٣-كەســێكە كە زمانی تەتەڵە ناكاتو قســەی بە ڕەوانیی بۆ نەكرێت.

خَطیــبٌ مِصْقَــع: وتاربێژێكــی زمانپاراوو ڕەوانبێژ.

٤-(صَقَعَ- الحِمارَ بِكَيٍّ. صَقْعاً): كەرەكەی بە داخكردنی سەری یان ڕووی نیشانەیكرد.

(صَقِعَ الفَرَسُ أَو الطَّائِرُ صَقَعاً): ئەســپەكە یان باڵندەكە مارۆ بوو/ سپێتی لە ناوەراستی سەریدا بوو.

(أَصْقَع): مارۆ.

(أَلصَقَــع) (مــص): كەمیی تــووك یان هەر نەبوونی لەسەردا.

(أَلصَقِع): كەمتووكی سەر یان هەر نەبوونی/ كەچەڵ.

(أَلصُقْعَةُ): مارۆیی/ ســپێتی لە ناوەراســتی سەری ئەسپ یان باڵندەو هیتردا.

(أَلصِقاع): پەڵەیەكی ســەری حوشــتر كە لە نێوان هەردوو گوێیدایە.

(أَلصَقعاء): مێی وشەی (أَلأَصقع).

٥-(صُقِعَ- المكانُ): شــوێنەكە زوقمی لێباری یان شوێنەكە بەستی.

(صَقَعَ- الماءُ أَو غَیْرُهُ): ئاوەكە یان شــتیتر وا ساردبوو وەك بەستووی لێهات.

(أَصْقَعَ- الرجُلُ): چووە ناو سەهۆڵبەندانەوە.

(-الصَقیــعُ الأَرضَ): زەویەكــە بــوو بــە سەهۆڵبەندان یان زوقمی لێباری.

(أُصْقِعَ- المكانُ): شــوێنەكە زوقماویبوو یان سەهۆڵاویبوو.

(أَلصَقَع): دڵتەنگییەكە كە بە هۆی سەرماوە تووشدەبێت.

(مَكانٌ صَقِعٌ): شــوێنێكی زوقــم لێدراو یان سەهۆڵگرتوو.

(أَلصَقعَــةُ): جارێــك ســەهۆڵاویبوون یــان زوقملێدان.

(أَلصَقْعَةَ- عند المولدین): لای تازەگەرییەكان: سەرماو سۆڵەیەكی سەخت.

(ألصَقاعَــة- عند المولدين): سەرســاردیی‌و هێمن سروشتی/ دڵ‌و دەروون سارد.

(الصَقيع): ســەهۆڵ یان زوقوم کە بە شــەو دەبارێت.

٦-(صَقَّعَ- لِفُلان): (بۆ شتێك/ لەسەر شتێك) سوێندی بۆ خوارد/ پاکانەی بۆ کرد.

٧-(الصِقــاع): ١-پەرۆیەکــە مەیفــرۆش لە چــەوری دەپارێزێــت ٢-پەچــەی ئافرەت ٣-شتێکە لووتی حوشتری پێدەبەسترێت.

(صِقاعُ الخَبــاء): راگری دەوار/ گوریســێکە بەســەر دەوارەکەدا رەتدەکرێت‌و دەبەسترێت هەردوو سەریشی بە دوو سنگی چەقێنراوەوە توند شــەتەکدەدرێت. ئەمــە کاتێکە کە بای توند هەڵبکات‌و لە هەڵدان‌و تێکدانی دەوارەکە بترسن.

(ألصَقيع) ) (ح): جۆرە زەردەواڵەیەکە.

٨-(صَوقَعَ-هُ): کێشای بە سەریدا.

(الصَوقَعَــةُ )(مص): ١-سەروبەســت/ مێزەر ٢-ناوەراســتی ســەر ٣-پارچــە پەرۆیەکــە مەیفرۆشەکە لە چەوربوون دەپارێزێت.

٩-(ألصَقعَب): ١-درێژ ٢-دان کە کیرمیبێت یان دەرگا جیرمیبێت.

١٠-(صَقعَرَ-فِي أُذُنِهِ): قیژاندی بە گوێیدا.

(ألصُقْعُر): ١-ئاوی ســارد ٢-ئــاوی گەراوە کە رەنگ‌و بۆنی تێکدەچێت.

صقل: ١-(صَقَلَ- الشــيءَ صَقــلاً وصِقالاً): شــتەکەی سووەوەو لووس‌و ســافکردو ژەنگی پێوە نەهێشت.

(صاقِل (ج) صَقَلَة): ئەوەی شت دەسوێتەوەو لووس‌و سافیدەکات‌و بریقەی لێدەهێنێت.

(مَصْقول): سوواوەو لووس‌و سافکراو.

(صَقِل. صَقَلاً): ساف‌و لووسبوو، سووابۆوە.

(ألصَقَّال): لووس‌و سافکەرەوەیەکی چاك ئازا.

(ألصَقيل= المَصْقول): لوس‌و سافکراوو سوواوە ٢-شمشێر.

(ألصَيقَــل (ج) صَياقِل وصَياقِلَة): ١-لووس‌و سافکەری چاکئازا ٢-مشتومالکەری شمشێر.

(ألمِصْقَلَــة): ئەوەی شــتی پێ لووس‌و ســاف دەکەن‌و بریقەی پێلێدەهێنن.

٢-(صَقَلَ- الدابَّةَ صَقْلاً وصِقالاً): چوارپێکەی پووکاندەوە.

(ألصَقَل): درێژیی هەردوو تەنشتی ئەسپ. .

الصُقْل: ١-تەنشت ٢-ولاخی سووکەڵە.

(ألصُقْل والصُقْلَة): کەمەر.

(ألصَقِل): ئەسپی کەمگۆشت.

(فَــرَسٌ صَقِلٌ): چارەوێیەکــی غالیگەدرێژو کەمەر تێقوپاو.

(صَقَلَ- هُ بالعَصا. صَقْلاً وصِقالاً): بەدارلێیدا.

(-بِهِ الأَرضَ): بەزەویدا کوتا/ کێشای بە زەویدا.

٤-(ألصَقِل): نارێکرۆیشتوو.

(ألصِقالَة): داربەســت بۆ گەیشــتنە شوێنی بەرز.

(أَلمِصْقَل- مِنَ الخُطَباء): وتاربێژی ڕەوانبێژو بەزمان.

صك: ١-(صَكَّ-ه. صَكّاً): توند لێیدا یان بەر زللەیدا.

(إصْطَكَّ- القَومُ بالسُيوفِ): شەرمشێریانکرد.

(الأَصَــكّ (م) صَكّاء (ج) صُــكّ): مرۆڤ یان زیندەوەری بەهێز.

(الصَــكّاك): کەســێکە تونــد بــە یەکێکــدا بکێشــێت یان زللەی توندی لێبدات/ کەسێکی دەستقورس.

(الصَّكيك): بێهیز/ لاواز/ دەستسووك.

(المِصَــك): مرۆڤ یــان زینــدەوەری بەهێزو تین.

(أَلمَصكوكات): سکەی پارە/ پارەی داڕێژراو.

٢-(صَكَّ- البابَ. صَكّاً): دەرگاکەی داخست.

(أَلمِصَكّ): کۆلۆمی دەرگا.

٣-(صَكَّ- الرَجُلُ أَو الفَرَسُ. صَكَكاً): پیاوەکە یان چارەوێکە لە ڕۆیشتندا ئەژنۆیو دەماری سەر قولەپێی شپرزە دەبوو/ دەلەرزی.

(أَصَك): لە ڕۆیشــتندا شپرزەو ئەژنۆ لەرزیو بوو/ بەریەککەوتوو.

(تَصاكَّ- تِ الرُكَبُ): ئەژنۆکان بەیەکیانــدادا/ بەریەککەوتنو لەرزین.

(إصْطَكَّ- تِ رُكْبَتاهُ): ئەژنۆکانی لەرزینو لە ڕۆیشتندا بەریەککەوتن.

(الأَصَك (م) صَكّاء (ج) صُكّ): ١-لە ڕۆیشتندا ئەژنــۆ لەرزیــوی ئەژنــۆ بەریەککەوتــوو ٢-کەســێکە دانەکانــی ســفتبنو بەیەکــەوە نووسابن.

(أَلمَصَك= الأَصَك)

٤-(أَلصَــكّ (ج) أَصُــك وصُكــوك وصِكاك): ١-نامە نووســراو/ بەڵگەنامــە ٢-چەکی پارە (فارسية).

(الصَكّاك): ١-چەکنووس ٢-چەکپارێز.

صكم: (صَكَمَ-هُ): لێیدا.

(-الفَــرَسُ على لِجامِهِ): ئەســپەکە دانی لە لغاوەکە گیر کرد/ پیایدا نووساو سەری هەڵداو ڕاتەکاند وەك بەربەرەکانیی سوارەکە بکات.

(أَلصَكْمَة): بەرکەوتنێکی توند.

(الصَواكِم): بەڵاو وەیی گران.

(صَكَمَتْــهُ صَواكِمُ الدَهْــرِ): بەرچورتووم/ وەیی گرانی ڕۆژگار کەوت.

صلّ: ١-(صَلَّ- السِــلاحُ صَليــلاً): چەکەکە قرمەیهاتو دەنگی بیسترا.

(-الشيءُ): شتەکە دەنگی لێوەهات/ دەنگیهات.

(-المســمارُ): بزمارەکە بە زۆر چەقێنراو بە شتەکەدا کرا.

(-تِ الإبلُ): حوشترە زۆر تینووەکە سکی وشکبووەوە لە ئاو خواردنەوەدا ورگی قۆرەی لێوەهات.

(-السِقاءُ): کوندەکە وشکبووەوە.

(-الخُفُّ. صَلاً): بەری گرتە پێڵاوەکەی.

(أَلصِلّ (ج) أَصْلال): شمشێری بڕەرو تیژ.

(اَلصِلّ والصَلّ): (نمه/ ڕشینه) بارانێی کەمی بڵاو.
(اَلصلّة): ١-جارێك ڕشـێنەکردن ٢-پێسـتەی وشـکەوەبووی خۆشنەکراو ٣-ڕشێنە بارانێکی کەمـی بڵاو ٤-پێڵاو/ سـوول (لەبـەر ئەوەی وشکبۆتەوەو کە پێیدەڕۆیت دەنگی لێوەدێت) ٥-پێسـتەی بۆگەنبـوو لـە خۆشـەکردندا ٦-لێزمەبارانێکی بەربڵاو.
(اَلصِلالَة (ج) اَصِلَّة): بەری پێلاو.
(الصَـلاّل والمِصْـلال- مِن الطـين): قوری وشـکەوەبوو کـە کرچەیبێـتو وەك ئاسـن دەنگی لێوە بێت.
(اَلصَليل) (مص): تەقەی ئاسن کە بەر یەك بکـەون بە زۆریش بـە بەرکەوتنی بەریەکی شمشێر دەوترێت.
(اَلمُصَلِّل): بارانی چاکی بە فەرو زۆر.
٢-(صَـلَّ- اللَحْـمُ. صُلُـولاً): گۆشـتەکە بۆگەنیکرد.
(-المـاءُ): ئاوەکـە گەڕایەوە/ ڕەنـگو بۆنی گۆڕا.
(اَصَلَّ- اللَحمُ): گۆشتەکە بۆگەنیکرد.
(-القِدَمُ الماءَ): کۆنیی ئاوەکە ئاوەکەی گۆڕی.
(اَلصَلّ): بۆگەنبوونی گۆشتو شتیتر.
(اَلصَلَّة): ئاوو شتیتری ماوەو گەڕاوە.
(ماءٌ صَلاّل): ئاوی گەڕاوەو بۆنکردو.
٣-(صَلَّ- الشَـرابَ. صَلاًّ): شـەرابەکەی پان شەربەتەکەی پاڵاوتو سافکرد.
(-الحَبَّ المُختَلِطَ بِالتُرابِ): دانەقوڕاوییەکەی بە ئاوشتەوە.
(صَلالَةُ الحَبِّ): شتنەوەی دانەوێڵەی قوراویی بە ئاوو پاککردنەوەو جیاکردنەوەی دانەکە/ قوڕە شۆرکردنی دانەوێڵە.
("صَوَّلَتِ المَرأةُ القَمـحَ"): ژنەکە گەنمەکەی قوڕەشۆر کرد.
(اَلمِصَلَّة): دەفری پاڵاوتنی دانەوێڵە پاش قوڕە شۆرکردنی.
٤-(صَلَّ-تِ الصالَّةُ القَومَ. صَلاًّ): خوێشـگەل تووشی چورتومبوون.
(اَلصِـلّ (ج) اَصْـلال): ١-چورتـوم/ وەی/ بەڵا/ ئاپـۆرە ٢-(ح)جۆرە مارێکی زۆر پیسو کوشندەیە لەم جۆرە مارانە جۆرێکی مەیلەو سـەوزەو پەڵەی تۆخی پێوەیە بـە تایبەتی لـە ئەفەریقاو میسـردا هەیـە جۆرەکەتیری زەردەمارە لە هندستانو ئێراندا هەیە.
("هُوَ صِلُ أَصلال"): ئەو لە پیسیی و ناپاکییو زۆرزانیو ترسناکیدا وەك زەردەمارە.
(اَلصَّالَة): ١-زۆرزان ٢-ئاپۆرە.
٥-(اَلصِـلّ (ج) اَصْـلال): هاوکـوف/ هاوتا/ وەك/ هاولەوێنە.
("هذا صِـلُ ذاكَ"): ئەمە لـە وێنەی ئەوە/ وەکو ئەوە.
(اَلصَلَّـةُ): ١-بن ٢-پەڵەپەڵـەی گیای بڵاوبڵاو

٣-گڵی تەڕ.
(ألصُلَّة): بای بۆگەن.
(ألُصَلِّل): گەورەیەکی میهرەبانی (خانەدان/ وەجاخزادە).
٦-(صَلْصَـلَ- الحُلِـيُّ أو اللِجامُ): خشـڵەکە خرەی هاتو لغاوەکە زرنگەی هات.
(-الرَّعْـدُ): هـەورە گرمەکـە ناڵەیهـات/ گرمەیهات.
(-الجَرَسُ): زەنگەکە دەنگیدایەوە/ زرەیهات.
(-فُلانـاً): بەسـەری فیسـاردا گرمانـدیو هەڕەشەی لێکرد.
(تَصَلْصَلَ اللِجامُ أو الحُلِيُّ): لغاوەکە زرەیهاتو خشڵەکە خرەیهات.
(ألصَلْصال): قوڕە سووری وشکەوە بوو کە لە وشکیی خۆی دەنگی لێوە دێت/ دەرەنگەی لێوە دێت.
(-طـ أ): قوڕی پوخت کە لی تێکەڵبکرێت.
(ألصَلْصـال والصُلاصِـل والمُصَلصِل): کەری زەریو یان کەرێك کە لوشکەلوشکیکات.
٧-(ألصُلْصُـل): ١-ناوچەوانـی چارەوێ ٢-ئەو بەشە پشـتەی چارەوێ کە سپیبێت ٣-پیاڵەی بچوك ٤-پاشـماوەی ئاوو شـتیتر لە دەفردا ٥-شڤانی/ شوانی/ شارەزاو کارامە.
(ألصَلْصالَة): زەویی چۆڵو هۆڵ.
(ألُمصَلْصَـل): گـەورەو جوامێـر (خانەدان/ وەجاخزادە).

صلب: (صَلَبَ-ەُ): هەڵیواسی/ لە سێدارەیدا.
(مَصلوب): هەڵواسراو/ لەداردراو.
(صَلَّـبَ- اللـصَّ): دزەکەی بـەداردا کرد لە قەنارەیدا.
(-المَسيحِيُّ): دیانەکە ئاماژەی خاچی بەدەست لەسەر خۆی کرد.
(ألصَلْبوت): بـە بڕوای دیانـەکان خاچێکی بچووکە.
(ألصَليـب (ج) صُلْبـان وصُلُـب): ١-ئـەو خاچەی حەزرەتی عیسـای پێدا هەڵواسرا ٢-هەموو شتێك کە لە شێوەی دوو هێڵی ڕاستی یەکتربڕدا بێت وەك خاچ ٣-قەنارە.
(ألصَليـب (ج) صُلُـب) ١-لـەداردراو/ لـە قەنارەدراو ٢-نیشـانەی داخی ڕاستو چەپی حوشتر.
(ذو الصَليب): (ئەختەل) کـە هوزانڤانێکی دیانبوو.
(ألُمصالَـب) (ب): تاقێکـە لەسـەر چوارپایە بە پێچەوانەی ڕاسـتە تاق کە پایەی لەژێردا نییە. ڕاستەگیر ئەوەیە نیوەی دووپای هەبێت نیوەکەیتری ڕاستە بێت.
(بَعـيرٌ مُصَلَّب (م) مُصَلَّبَة): حوشـترێك کە نیشانەخاچی لێدرابێت.
(شيءٌ مُصَلَّبٌ عَلَيهِ): شتێك نیشانەی خاچی لەسەربێت.
(ثَوبٌ مُصَلَّـب): بەرگێك نیگارێکی لەسـەر

بێت لە شێوەی خاچ.

(مُصَلَّـبُ الطُرُقِ) (عند العامة): چوارڕێیان کە دوو ڕێگای ڕاستو چەپ یەکتری ببڕن.

(بَعيرٌ مَصلُـوب (م) مَصْلُوبَة): حوشـترێك نیشانەکەی ڕاستو چەپی بە داخ لێکرابێت.

٢-(صَلَبَ- العِظامَ. صَلْباً): مۆخی ئێسقانەکەی (دەرهاورد/ دەرهێنا) و کوتای.

(إصْطَلَـبَ العِظـامَ): مۆخی ئێسـقانەکەی/ چەوریی ئێسقانەکەی دەرهێنا.

(أَلصُلْـب (ج) أَصْـلاب وأَصْلُـب وصِلَبَـة): بڕبڕاگەی پشت. ئێسـقانێکە گرێگرێ لەسەر شانەو تا خوارووی پشت درێژدەبێتەوە.

(أَلصُلْب (ج) صِلَبَة): پشت/ باوو باپیران.

"هُوَ مِن صُلْبِ فلان": ئەو لە پشتی فیسارە/ وەچەی ئەوە/ لە نەوەی ئەوە.

أَلصَلَـب (ج) صِلَبَـة وأَصـلاب= الصُلْب: ١-ئێسقانی پشت ٢-مۆخی ئێسقان.

(ألصالِب والصالَب): بڕبڕەی پشت.

(أَلصُلَّب): ئێسقانی بڕبڕەی پشت.

(ألصليب (ج) صُلُب): ١-مۆخی ئێسقان.

("إسْـتَخرَجَ صَليـبَ العَظـمِ"): مۆخـی ئێسقانەکەی دەرهێنا ٢-ڕەسەن.

("هـو عَرَبـيٌّ صَليـبٌ"): ئـەو عەرەبێکی ڕەسەنە.

٣-(صَلُبَ وصَلِبَ. صَلابَةً): ڕەقبوو/ سەختبوو.

(-على المالِ): ماڵخۆشەویستبوو/ چرووکبوو.

(صَلَّبَ- الشيءَ): شتەکەی ڕەقکرد/ سەختکرد.

(-الشيءُ): شتەکە ڕەقو وشکبوو.

(تَصَلَّبَ): ڕەقبوو.

(أَلصُلْب (ج) أَصلاب وأَصْلُب وصِلَبَة): توند/ پتەو/ سەخت.

("هـوَ صُلْبٌ في دينِهِ"): ئەو لـە ئاینەکەیدا توندە/ توند ئاینەکەیگرتووە.

("راعٍ صُلْـبُ العَصـا"): شـوانێکە لەگـەڵ حوشترەکانیدا ڕەقە.

(أَلصُلْب (ج) صِلَبَةٌ): ١-هێز ٢-شوێنێکی ڕەقی بەردەڵانی ٣-پۆڵا.

(أَلصَلَب (ج) صِلَيبَة وأَصْلاب): زەویی ڕەقەن بەو زەویانە دەڵێن کـە دەمێکی زۆر بێت بە هیچ نەکرابێت دەڵێـن ("إنَّها "لأَصلابٌ مُنذُ أَعـوام"): زەوییەکـە چەند سـاڵە بورە واتە نەکراوە بە هیچ.

(أَلصُلَّب): ١-توند/ سـەخت ٢-بەردی هەسان کە چەقۆی پێ تیژدەکرێتەوە.

(أَلصُلَّبَةُ): بەردەهای هەسان.

(أَلصُلَّبِيّ): ١-توند/ سەخت ٢-بەردی هەسان ٣-چەقۆو شتیوەهای لە هەساندراوو لووسو تیژکراو.

(سَـنانٌ صُلَّبِـي): نووکی نێزەیـەك کە تیژ کرابێت.

(أَلصُلَّبِيَّـةُ= الصُلَّبِـيُّ): ١-توند/ سـەخت ٢-بەردی هەسان.

(أَلصَليب (ج) صُلُب): توند.

(ماءٌ صَليبٌ): ئاوێك كــە ئاژەڵی پێ بەهێزو توندو تۆڵبێت.

(سَنانٌ مُصَلَّب): نووكی نێزەیەكی تیژكراو.

٤-(صَلَــبَ- اللَّحْــمَ. صَلْبــاً): گۆشــتەكەی برژاند.

(-تَهُ الشَمسُ): خۆرەكە برژاندی/ سووتاندی.

(-ت عَلَيهِ الحُمَّــى): تاكە توند بوو درێژەی لێكێشا.

(مَصلــوبٌ عَلَيهِ): كەســێكە تای لــێ توندو درێژ بووبێت.

(ألصالِب) (فا): درێژەكێشو توند بوو.

(حُمــى صالِــب): تایەكــی توندو بــەرز بە لەرزەوە.

٥-(صَلَّبَ- الحَجَرَ) (ســريانية): بەردەكەی بەرزكردەوە.

(أصْلَبَ- تِ الناقَةُ): مێحوشــترەكە هەســتاو ملی بۆ ئاســمان بەرزكردەوە بۆ ئەوەی تەواو شیر بۆ بەچكەكەی دابدات.

٦-(ألصُلْب (ح): باڵندەیەكە.

ألصَليب (ج) صُلُب: بەیداخ.

الملحق:

صلــب: (المُصَلَّبِيَّة): چوار رێدان بە شــێوەی خاچ.

---

صلت: ١-(صَلَتَ- الفرسَ صَلْتاً): ئەسپەكەی تاودا.

(إنْصَلَتَ في عَدوِهِ): دایە غارو خۆی گوشــیو پێش هەمووان كەوت.

(ألصَلْت والإصْليت والمُنْصَلِت- مِن الرجال): پیاوی ئازای هەتەر لەسەر ئامانجەكانی.

("هُوَ مِــن مَصاليت الرجال"): ئەو لە پیاوە نەبەردو هەتەرەكانە بۆ پێویستیەكان.

٢-(صَلُــتَ- الرَجُــلُ. صُلُوتَةً): ئــەو پیاوە ناوچەوان بەرزو پانو دیار بوو.

(أصْلَتَ- السَّيفَ): (شیرەكەی/ شمشێرەكەی) لە كێلان دەركێشا.

(ألصَلْــت): ناوچــەوان دیــاری تەختــی دەركەوتوو.

(جَبينٌ صَلْــتٌ): (ناوچەوانێكی/ تەوێڵێكی) دیارو تەختو پانو دەركەوتوو.

(ألصَلْــت والصُلْــت (ج) أصْــلات): كێــرد/ چەقۆی گەورە.

٣-المُصالَتَــة: دزینــی دێــرە هەڵبەســتێكی شــاعیرێكیتر بــە وشــەو واتــاوەو كردنی بە هی خــۆ كــە ئــەوە ناشــیرینترین دزییە لە هەڵبەستداناندا.

صلج: ١-(صَلَجَ- الفِضَّــةَ. صَلْجاً): زیوەكەی توانەوە.

(الصُلُج): پارەی ساغ.

(ألصَولَج): زیوی ساغو پوخت.

(ألصَليجَة): زیوی دارشــتەی پوختو ســاغو پاڵێوراو.

٢-(صَلَجَ-هُ بالعَصا): بە دار لێیدا.

٣-(صَلِجَ- سَــمْعُهُ. صَلَجاً): گوێی تەواو كەڕ

بوو هیچی نەدەبیست.
(تَصالَـحَ- الرَجُلُ): خۆی کەڕ کرد/ خۆی بە کەڕ نواند.
(أَلصَولَـج): ١-کونەگوێی ناوەوە کە بۆ سەر دەچێت ٢-زیوی پوختو ساغ.
٤-(أَلصُلَّجَـة (ج) صُلَّـج): قۆزاخـەی کرمی ئاوریشم.
(أَلصَولَج) (فارسـیة): داری سەرچەماوە کە بۆ یاریی سواریی بەکاردەهێنرێت.
(أَلصَولَجـان والصَولَجانَـة (ج) صَوالِجَـة): داردەستی سەرچەماوە.
(صَولَجان المَلِك): داردەسـتی سـەرچەماوەی شا.
(أَلأَصْلَج): زۆر لووسو پووس.
صلـح: (صَلُـحَ وصَلَـحَ صَلاحـاً وصُلُوحاً وصلاحِيَةً): خاسبوو/ چاکبوو/ باشبووەوە/ گەنیی نەما، دەستیدا/ دروستبوو.
("صَلُحَـت حالُ فلان"): باری ژیانی یان هەر شتێکیتری باش بوو.
("هذا يَصْلُحُ لَـكَ صَلاحاً"): ئەمە تەواو بۆ تۆ دەگونجێتو بۆ تۆ باشە.
(-الرَجُـلُ): پیاوەکـە چاکبـوو/ ڕاسـتو لەخوداترس بوو.
(-في عَمَلِـهِ): لە کارەکەیدا سـاغو ڕاسـتو دروستبوو.
(صالَـحَ-هُ صِلاحـاً ومُصالَحَـةً): لەگەڵیدا ڕێککەوت.
(أَصْلَـحَ- الشـيءَ): شـتەکەی (چاککردەوە/ گونجاند).
(-إلَيهِ): چاکەی لەگەڵدا کرد/ بۆی چاکبوو.
("أَصْلَـحَ اللهُ لَـهُ في ذُرِيَّتِهِ ومالِـهِ"): خودا میهرەبانی لەگەڵ وەچەو دارایدا کردو بە دڵی خۆی بۆی گونجاندن.
(إسْـتَصْلَحَ- الشـيءُ): شـتەکە چاکبـوو/ دروستبوو.
(أَلصَلاح) (مص): چاکیی/ باشیی/ دروستیی.
(أَلصَلاحِيَّة):١-چاکەکاریی ٢-شایسـتەیی/ بۆ بوون/ بۆ لوان/ بۆگونجان/ بۆ دەستدان.
(أَلإصلاحِيَّة (ج) إصلاحِيَات): بەندیخانەی پەروەردەکاریـی. دامەزراوەیەکی میرییە ئەو منـداڵو هەرزانەی کـە تاواندەکـەن تیایدا بەندیاندەکەنو ڕەوشـتیان ڕاسـتدەکەنەوەو فێری پیشـەیاندەکەن تاکە هاتنەدەرەوە پێی بژینو لە تاوان دووردەکەونەوە.
(أَلصالِح (ج) صالِحون وصُلاّح): چاك/ باش/ دروست ٢-لواو/ گونجاو/ شیاو ٣-بەجێهێنەری ئەركو پێویستیی سەرشانو ڕاگری ماف.
("هُـو صالِحٌ لِكَـذا"): ئەو شـیاوی ئەوەیەو لێیدێت ئەو کارە بگرێتە دەسـت یان بۆ ئەوە باشە.
("لَـهُ حَظٌ صالِـح مِنَ الأَدَب"): لـە وێژەدا دەستێکی باشیهەیەو لێهاتووە.

(ألصالِحَةُ): مێی وشەی (الصالح)ە.

("أتَتنــي صالِحَــةٌ مِن فُــلانٌ"): چاکەیەکی گــەورە یان دەســتپیاوەتییەکی چاکم لەوەوە پێگەیشت.

(ألصَلُوح= الصالِح): ١-باش/ چاك/ دروســت/ شایستە.

(ألصَليــح (ج) صُلَحاء= الصالــح): ١-چاك/ باش/ دروست/ شایستە.

(ألمَصْلَحَة (ج) مَصالِح): ١-هۆکاری (باشــیی/ چاکیــی) ٢-کاروبارێــك کە مــرۆڤ بیکات بۆ کەڵك و قازانجی خۆی یان نەتەوەکەی/ سوودو بەرژەوەندیی.

("هــو مِــن اهــل المَفاسِــد لا المصالِــح"): ئــەو لەوانەیــە کــە خراپــە بەخشــن نەك کەڵکبەخشن.

٢-(صالَحَ- مُصالَحَةً وصِلاحاً): ١-دۆستایەتیی لەگەڵدا گرت ٢-ئاشتیکردەوە.

(أصْلَحَ- بَينَهُم): رێکیخستن و ئاشتیکردنەوە.

(تَصالَحَ واصْتَلَحَ واصْطَلَحَ واصّلَحَ- القَومُ): خوێشــگەل تەبابوون/ رێکبوون ئاشــتبوون و ئاشتبوونەوە/ رێککەوتنەوە.

(ألصُلْــح): ئاشــتیی/ ئاشــتبوون/ ئاشــت/ تەبایی.

("هُم لَنا صُلْحٌ"): ئەوان لەگەڵماندا ئاشتن.

(ألصُلْــح- عنــد أربــاب السياســة): لەلای رامیــارەکان: بــە مــەرج جەنگوەســتاندنە/ راگرتنی جەنگە بە پێی مەرج.

(ألصُلُوح): ئاشتیخواز.

"قَومٌ صُلُوحٌ": خوێشگەلێکی ئاشتیخوازن.

(ألإصْطِــلاح (ج) إصْطِلاحــات): ١-نەریت/ باو/ مۆدە ٢-زاراوە ٣-شتێك کە خەڵك لەسەری رێکەون و پەیرەویبکەن.

الملحق:

صلح: (ألصَلاحِيَّة): ١-باش ئامادەبونی کردنی کارێــك/ شایســتەیی/ لێهاتوویی ٢-ســنوری دەسەلاتی یاسایی کە بە بەرپرسیارێك دەدرێت کە پەیرەویی بکات و بە کاری بهێنێت.

("صلاحِيَّــةُ مدير الشــرطة"): دەســەڵاتی بەرێوەبەری پۆلیس (ألصَلاحية): دەسەڵاتێکی دادوەرییە کە بۆی هەبێت تەماشای سکاڵایەك و داوایــەك بکات و لێبکۆڵێتــەوەو بریاری تێدا بدات دەیشوترێت (اختصاص): پسپۆری.

(إعْتَرَضَ على صلاحِيَّة المحكمة): نارەزایی بەرامبەر دەسەڵات و شیاویی و دەستدانی دادگا بۆ بینینی داوایەك دەربری.

---

صلخ: ١-(صَلِخَ- سَــمْعُهُ صَلْخــاً): گوێی کەر بوو/ نابیستبوو.

(تَصالَخَ- الرَجُلُ): خــۆی بە درۆ کەر کرد/ خۆی بە کەر پیشاندا.

(ألأصْلَــخ (م) صَلْخــاء (ج) صُلْــخ): کەری تەواو.

(ألصَلَخ) (مص): کەریی.

٢-(إصْطلَخَ): راكشا/ پاڵكەوت.
٣-(ألصالِخ = السالِخ) (ح): رەشمار.
(ألأَصْلَخ (م) صَلْخاء (ج) صُلْخ- مِنَ الجمال): حوشتری زۆر گەر. (ألصَلَخ): گەریی.
(داهِيَــةُ صَلُــوخ): وەیــی (فەوتێنــەر/ بەفەتاردەر).
٤-(إصْلَخَــدَّ- الرَجُــلُ): پیاوەكــە قنــج راستبووەوە.
(ألصَلْخَــد والصِلْخَــد والصِلْخِــد والصِلْخاد والصُلاخِــد والصَلْخَــدى (ج) صَلاخِــد): ١-بەهێز بە توانا ٢-مەردی بە برشتو هەتەر.
٥-(ألصَلَخْــدَم- مِنَ الإبِل): حوشــتری توندو تۆڵ.
صلد: ١-(صَلَــدَ- الزَنْدُ. صُلُوداً): چەرخەكە دەنگیكردو ئاگرینەدا.
(-السـائِلَ): هیچــی بــە (سـواڵكەرەكە/ دەرۆزەكەرەكە) نەدا.
(صَلُدَ. صَــلادَةً): ڕژدیكــرد/ چرووكیكرد/ وشكینیواند.
(أَصْلَدَ- الزَنْدُ): چەرخەكە دەنگیهاتو ئاگری نەكردەوە.
(-الرَجُلُ): چەرخەكەی ئاگری نەكردەوە.
(-الزَندَ): چەرخەكەی داگیرساندو ئاگری نەدا.
(فَرَسٌ صَلْدٌ): چارموێیەكی وشكە سروشتەو ئــارەق ناكاتــەوە (كــە ئــەوە نیشــانەیەكی دزێوە).

(رَجُلٌ صَلْدٌ): پیاوێكی چرووك/ ڕژد.
(ألصَّالِد) (فا): چەرخی گرنەگرتوو.
(ألصالِدَةُ (ج) صَوالِد): مێی وشەی (الصالِد).
(الأَصْلَد (م) صَلْداء (ج) صُلْد): زۆر چرووك/ زۆر ڕژد/ زۆر ڕەزیل.
(عودٌ صُلاَّدٌ): چیلكەیەك كە ئاگر نەگرێت/ گری لێنەبێتەوە.
(ألصَلُود): ١-چەرخێك كــە ئاگرنەدات ٢-زۆر چرووك.
(قِدرٌ صَلُودٌ): مەنجەڵێكی درەنگ كوڵێن.
(إمْرأَةٌ صَلُودٌ): ژنێكی كەمفەر/ كەمخێر.
(فَرَسٌ صَلُودٌ): چارموێیەكی درەنگ ئارەقكەرەوە.
(عــودٌ مِصْــلادٌ): چیلكەیــەك كــە ئاگــری لێنەكەوێتەوە.
(ناقَةٌ مِصْلادٌ): مێحوشترێك كە بزێو شیری نەبێت.
٢-(صَلَــدَ-تِ الأَرضُ. صُلُــوداً): زەوییەكــە ڕەقبوو.
(-صُلْعُتُهُ): سەرە ڕووتاوەكەی بریقەیدا.
(أَصْلَدَ-تِ الأَرضُ): زەوییەكە ڕەقبوو.
(ألصَلْــد (ج) أَصلاد): ١-ڕەقی لووس ٢-ئەوەی كە هیچی تێدا ناڕوێت.
(أَرضٌ صَلْــدٌ ومَــكانٌ صَلْــدٌ): زەوییەك یان شــوێنێك كــە هیچی تێــدا نەڕوێــت/ هیچ دەرنەكات.
(جَبينٌ صَلْدٌ): ناوچەوانی ڕەق/ سەخت.

(رأسٌ صَلْدٌ): سـەرێك كە تووكی لێنەڕوێت/ تووك دەرنەكات.

(اَلصَلُود): ١-سەخت/ ڕەق ٢-وشك.

(اَلصِلوَد): سەختی لووس.

(الصِلْداء والصِلْداءَة): زەویی سەختی ڕەقەن‌و زبر.

٣-(صَلَـدَ-تِ الدابَـةُ صَلْـداً): ١-لـە غـاردا چوارپێكـە تونـد دەسـتی بە زەویـدا كوتا ٢-ڕاستبووەوە/ ڕەق وەستا.

(-بَيَدِيه): بە هەردوو دەست چەپڵەی لێدا.

(اَلصالِـدَةُ (ج) صَوالِـد): دان كـە كیرەكـیڕ بكات.

٤-(صَلَـدَ- الرَجُـلُ فِي الجَبَـلِ صَلْـداً): بە كێوەكەدا هەڵزنا.

٥-(اَلصَلُود والصَليد): تاك/ تاكەوە بوو.

٦-(اَلصَلْدَح): پانە بەرد.

(اَلصَلَوْدَح): زۆر ڕەق/ فرە سەخت.

٧-(اَلصِلْدِم (ج) صَلادِم): ١-سەخت ٢-ڕەقەسم/ سمی سەختی ولاخ ٣-شێر.

صلر: الصِلَّور (ح) (يونانية): ماسییەكی ناو ڕووبارە وەك ماسی نقە وایە.

صلص: (اَلصالِصَة) (ط) (ايطالية): ساس كە لە دۆشاوی تەماتە یان ناوی لیمۆو بەهارات‌و شتیتر دروستدەكرێت.

صلـط: ١-(اَلصَلَطَـة أَو الصَـلاط) (ط) (ايطالية): زەڵاتە كە لە سـەوزەو سركە یان ترش‌و خوێ‌و سیرو شـلەڕۆن‌و گەلێك شتیتر دروستدەكرێت.

٢-(اِصْلَنطَحَ-تِ البَطحاءُ): شیوەكە فراوانبوو.

(اَلصُلاطِح والمُصلَنْطَح): پان‌و فراوان.

صلع: ١-(صَلِعَ. صَلَعاً): تووكی پێشـی سەری وەری/ پێشی سەری ڕووتایەوە.

(أَصْلَع (ج) صُلْع وصُلْعان): سەر ڕووتاوە.

("صَلِعَـت الشَـجَرَةُ"): گەڵای سـەر پۆپەی چڵەكانی درەخت وەری.

(صَلَّعَ- الشَـيءَ) (عامية): شـتەكەی تەواو والأكردودەرخست.

(مُصَلَّع) (عامية): ڕووت‌و داماڵراو.

(صَلَّـعَ وانْصَلَـعَ-تِ الشَـمسُ): خۆرەكـە دەركەوت‌و لە هەورەكە هاتە دەرێ.

(-تِ الحَيَّةُ): مارەكە دەركـەوت خۆڵی پێوە نەبوو.

(تَصَلَّـعَ-تِ الشَـمسُ): خۆرەكـە لـە هەور هاتەدەرێ‌و دەركەوت.

(-تِ السَـماءُ): ئاسـمان سـاماڵبوو/ هەوری لێبڕا.

(-تِ الحَيَّةُ): مارەكە دەركـەوت خۆڵی پێوە نەبوو.

(اَلصَلَع) (مص): ڕووتبوونی پێشـی سـەرو وەرینی تووكەكەی.

(اَلصُلْعَـةُ والصَلَعَـةُ): شـوێنی ڕووتانەوەی قژەسەر.

(أَلصَلْعاء (ج) صُلْع): ١-مێی وشـەی (الأَصْلَع)
٢-بیابانی چۆڵ.
(رَمْلَةٌ صَلْعاء): لمەلانی رووتی بێدرەخت.
(أَلصُلَّع والصُلاَّع والصَليع): (تاشی/ تاوێری) پان.
(-مِنَ الأَمْكِنَة): شـوێنانێك كـە هیچی تێدا نەروێت.
(رَأْسٌ صَليـعٌ): سـەرێك كـە پێشـەكەی رووتابێتەوە.
٢-(صِلاعُ الشَمس): گەرمیی خۆر.
(أَلصَلْعاء (ج) صُلْع): وەی/ بەلاّ/ ئاپۆرە.
٣-(صَلْعَم): سـەللەللاّهو عەلەیهی وسەللەم كورتكردنەوەی (صلى الله عليه وسلم)ە.
(صَلِـفَ. صَلَفـاً): روو قایمیكـرد/ خـۆی هەڵكێشـاو كەوتە فیشاڵو فیز نواندن/ لافو گەزافی خۆرایی لێدا.
(صَلِف (ج) صَلِفون وصُلَفاء وصَلافى): روو قایمو خۆنوێن/ لافو گەزافلێدەرو فیزنوێن.
(صَلِـفَ- لِصاحِبِـهِ): قسـەیەكی بـە گوێی دۆستەكەیدا دا پێی ناخۆشبوو/ قسەی بەرزو نزمیی لەگەڵدا كرد.
(تَصَلَّفَ): ١-خـۆی بە رووقایمو لافو گەزاف لێدەر نواند ٢-مەراییكرد/ ریاییكرد.
٢-(صَلِفَ- السَحابُ صَلَفاً): هەورەكە گرمەی زۆر بوو و بارانی كەمبوو.
(-المَرأَةُ عِندَ زَوجِها): ژنەكە لای مێردەكەی نەینواندو چارەی گرانبوو.
(صَلِفَـة (ج) صَلِفات وصَلائِـف): ئافرەتی چارەگران و نەنوێن لەلای مێرد.
(أَصْلَفَ): كەمفەربوو.
(-فُلانـاً): چارەی فیسـاری نەویسـتو رقی لێبوو.
(تَصَلَّـفَ- القَومُ): كەوتنـە زەوییەكەوە كە هیچی تێدا نەروێت.
(أَلصَلِف): خواردنێكی بێتامو چێژ.
(إناءٌ صَلِفٌ): قاپێك كە كەم بگرێت.
(سَـحابٌ صَلِفٌ): هەورێك گرمەی زۆر بێتو بارانی كەمبێت.
(أَرضٌ صَلِفَـةٌ): زەوییـەك كـە هیچـی لێنەروێت.
(أَلأَصْلَف (ج) أَصالِف): زەوییەكی رەقەن كە هیچی تێدا نەروێت.
(أَلصَلْفاء والصِلْفاء والصَلْفاءَة والصِلْفاءَة (ج) أَلصَـلافي): زەوییەكی رەقـەن كە هیچی تێدا نەروێت.
(طعـامٌ صَليـفٌ): خواردنی بێتـامو چێژ/ ناخۆش.
(أَلمُصْلِف) (فا): كەسێكە كە ژن لای نەنوێنێت/ حەز لە چارەی ژن نەكات.
٣-(أَصْلَفَ): بێفەرو چارە گرانبوو.
(أَلصَلِف): قاپی قورس.
٤-(أَلصَلْف): كورۆكی دارخورما.

أَلصَلْفَة: كورۆكێكی دارخورما.

الصَليف: ئەملاولای مل.

("أَخَذَهُ بِصليفِهِ"): ئەملاو لای ملیگرت/ ملی هەموو گرت.

٥-(صَلْفَعَ): نابووتبوو.

(-رَأْسَهُ): سەری تاشی.

صلق: ١-(صَلَقَ- الرَجُلُ صَلْقاً): لە لێقەوماندا زیرەی لێهەستاو هاواریکرد.

(-نابَهُ. صَلْقاً): دانی لە یەك خستو کیرەکیری پێخستن.

(أَصْلَقَ-الرَجُلُ. يَصْلُقُ): لە لێقەومانا هاواری لێهەستا.

(-النابُ): دانەکە کیرەکێریکرد.

(تَصَلَّقَ- المَريضُ): نەخۆشـەکە لە تاو ئازار تەپاوتلیبوو.

(-تِ المَرأَةُ): ژنەکە ژانـی منداڵبوون گرتی/ ژانی منداڵبوونی پێداهات.

(إِصْطَلَقَ- البَعيرُ بِنابِهِ): حوشترەکە کیرەکیری بە دانیکرد.

(أَلصَلْق) (مص): دەنگی توندو بەرز.

(المِصْلَق والمِصلاق- مِنَ الخُطَباء (ج) مَصالِق ومَصاليق): وتاربێژی زمانپاراوو ڕەوانبێژ.

٢-(صَلَـقَ-هُ بالعَصـا): بـە دار کوتـای/ دارکاریکرد.

(-تْهُ الشَمسُ): گەرمای خۆری بەرکەوت.

٣-(الصُلاقَـة): ئـاوی گـەڕاوە/ ئاوێـك لە شوێنێکدا زۆر بمێنێتەوە.

(أَلصَلَق (ج) أَصْلاق و (حجج) أَصالِيق): بنکی تەختی نزم.

(أَلصَليق): لووس.

(أَلصَلِيقَـةُ (ج) صَلائِـق): ١-نانـی تەنـك ٢-پارچە گۆشتێکی برژاو.

(أَلمَصاليـق): ١-گابەرد/ گاتاوێر ٢-حوشـتری سووکەڵە.

٤-(صَلْقَعَ): نابووتبوو.

(-رَأْسَهُ): سەری تاشی.

(أَلصَلْقَع): بۆش/ چۆڵ/ بەتاڵ.

(مَكانٌ صَلْقَعٌ بَلْقَع وصَلَنْقَعٌ بَلَنقَعٌ): یەك لە دوای یەکی وشەکان چۆڵو هۆڵو بیابان.

٥-(صَلْقَـعَ- صَوتَهُ): دەنگـی بەرزکردەوەو توندکرد/ تەواو شیراندی.

(أَلصَلَنْقَع): ڕابوردویەکی سەختو تاڵ.

صلـم: ١-(صَلَـمَ وصَلَّمَ-الشَـيءَ. صَلْمـاً): شتەکەی (ڕیشەکێشکرد/ بنبڕکرد).

(-هُ): لووتو گوێی لە بنا بڕی.

(إِصْطَلَم-هُ): لە بێخ هەڵیکەند/ بنەبڕیکرد.

("إِصْطَلَمَهُـمُ الدَهرُ"): ڕۆژگـار بنبڕیکردن/ قڕیتێخستن.

(رَجُلٌ أَصْلَمُ (م) صَلْماء (ج) صُلْمُ الأُذنَين): گوێقوت: گوێکورت. (هەر وەکو لە خوداییەوەو —زکماك- بڕرا بنەوە).

(أَلصَيْلَم): ١-شمشێر ٢-چورتوم/ وەی/ ئاپۆرە

(چونكـه ڕیشەكێشـدەكات) ٣-لێقەومانـی سەخت.

(وَقْعَةٌ صَیلَمَةٌ): لێقەومانێكی بنەبڕ كردوو.

(اَلْمُصَلَّمُ الأُذُنین): كەسێكە گوێقوتبێت.

(ظَلیـمٌ مُصَلَّمُ الأُذُنَین): نێرە وشـترمرخی گوێكەریل.

٢-(أَلصَلَـم والصَلمَةُ والواحِد صالِم): پیاوی جەربەزەو قایم.

(الصُلامَـة والصَلامَـة والصِلامَـة (ج) صُلامـات وصَلامات وصِلامـات): ١-تیپێك خەڵك ٢-خوێشـگەلێكی بە تەمەن وەكیەكو لە ئازایەتیو دڵفراوانیدا چونیەك.

(أَلصَّیلَم): ژەمەخواردنێك لە ڕۆژێكدا.

٣-(صَلْمَعَ): نابووتو هەژار بوو.

(-الرأسَ): سەرەكەی تاشی.

(-الشيءَ): ١-شتەكەی هەڵكێشا ٢-لووسیكرد.

(صَلْمَعَةُ): كەس نەناس/ نەناسراو.

("هو صَلْمَعَةُ قَلْمَعَـةُ"): نەدەزانن كێیەو نە كوڕی كێیە/ نەخۆیو نە باوكی دەناسرێت.

صلـە: (إِصْلَهَـبَّ- الشَـيءُ): شـتەكە درێژ بووەوە/ درێژبوو.

(أَلصَلْهَب): خانوی گەورە.

(أَلصَلْهَب والمُصْلَهِبّ): پیاوی (قووچ/ درێژ).

(أَلصَلْهَـج): ١-گاشـە/ تاوێـری زۆر گەورە ٢-مێحوشتری توندوتیژ.

٣-(أَصْلَهَمَّ): سەختبوو.

(أَلصِلْهـام): ١-بوێـر/ نەبـەرد/ بێبـاك ٢-(ح)شێر.

صـلا: ١-(صَلا- فُلانـاً. صَلْواً): كێشـای بە ناوەراستی پشتی فیساردا.

(صَلِـيَ. تَصْلـی وأَصلی-تِ الناقَـةُ): لەبەر نزیكبوونـەوەی زانـی ناوەراسـتی پشـتی مێحوشترەكە شلو خاو بووەوە.

(أَلصَـلا (مـص) (ج) صَلَـوات وأَصْـلاء): ناوەراسـتی پشـتی مـرۆڤو هەمـوو چوارپێیەك.

٢-(صَلَّی. صَلاةً): نوێژیكرد.

(صَلاة): نوێژ.

(صلـی اللهُ عَلَیهِ):خـودا پیرۆزیـی لێكردو ستایشی باشی كرد.

(أَلصَلاة(ج)صَلَوات أَو الصلوة):١-نوێژ/ڕووكردنە خوداو كورنووش بۆ بردنو سوپاسـكردنو نزاو پاڕانـەوە لێـی بۆ ئـەوەی یارمەتیمـان بداتو سـەرمانخاتو بەفریامان بكەوێت ٢-دۆعاو نزاو پاڕانەوە ٣-تەسبیحاتكردن.

(أَلصَـلاةُ- مِـنَ اللهِ): میهرەبانیی و بەزەیی خوداو ستایشی بۆ بەندەكانی خۆی.

(اَلْمُصَلَّی): ١-مزگەوت/ شـوێنی خواپەرستیو نوێژكردن ٢-گۆڕسـتانێك كە دۆعای لەسـەر مردوان تیا دەكرێت.

٣-(صَلَّی- الفَـرَسُ. تَصْلِیَةً): ئەسـپەكە لە پێشبڕكێ یان لە غاردا دووەم بوو.

(فَرَسٌ مُصَلٍّ): ئەسپێك دووەمینە لە غاردا.
صَلی: (صَلَــی- اللَّحْمَ. صَلیاً): گۆشــتەکەی برژاند.
(لَحمٌ مَصلِيٌّ): گۆشتی برژاو.
(-فُلاناً النارَ وفيها وعَلَيها): فیســاری خستە ئاگرەکەوەو تیایدا هێشتەوەو برژاندی.
(صَلِــيَ- النارَ وبِهــا. صلىً و صِلــىً وصُلِيّاً وصِلِيّــاً): تینــی ئاگرەکەی چەشــت یان بە ئاگرەکە سووتا.
(-الأَمْرَ وبِالأمرِ): گرفتاری کارەکەبوو پێوەی سووتاو شپرزە بوو.
(صَلَّــى- العَصــا علــى النّــارِ أو بِالنّــارِ): داردەســتەکەی دایــە بــەر ئاگرەکــەو نەرمیکردەوەو ڕاستیکردەوە.
(-يَدَهُ): دەستی گەرمکردەوە.
(أَصْلى-يَدَهُ): دەستی گەرمکردەوە.
(-هُ النــارَ): خســتیە ئاگرەکــەوەو تیایــدا هێشتیەوە/ تیایدا پیشاندی.
(تَصَلَّــى- النــارَ وبِالنــارِ تَصْلِيًــا): ١-تینی ئاگرەکــەی چەشــت ٢-بــە ئاگرەکــە خــۆی گەرمکردەوە.
(-عَصاهُ على النارِ): داردەستەکەی دایە بەر ئاگرەکە.
(إِصْطَلــى- بِالنــارِ. إِصْطِلاءً): بــە ئاگرەکە خۆی گەرمکردەوە.
("فُــلانٌ لايُصْطَلــى بِنارِهِ"): فیســار کەس نەبەردێکە کەس بەرگەی ئاگری ناگرێت.
(أَلصِــلاءِ والصَلــى): ١-ئاگــر یــان ئاگرێکی بێئەنــدازە ٢-چاوگی ئاگــر/ هەرچی ئاگری پێبگرێت.
٢-(صَلَــى- الرَجُــلَ. صَلْيــاً): دڵیراگرت یان فریویداو لە خشتەیبرد.
(-لِلصَيدِ): داوی بۆ نێچیرەکە نایەوە.
(-لَــه الشِــركَ) (عامیــة): تــۆڕو تەڵــەی بۆنایەوە.
(-تِ الحَيَّةُ) (عامیة): مارەکە خۆی بۆ ئەوە نایەوە کە شــتێك بەلایدا بڕواتو ملی خۆی ئامادەی ئامبازبوونیکرد.
(أَلمِصْلاةُ والمِصْلى (ج) مَصــالٍ): داو/ تەڵە/ تۆڕ کە بۆ نێچیر دەنرێتەوە.
(إِنَّ لِلشَّيطانِ فَخاخاً ومَصاليَ): شەیتان داوو تەڵەی زۆری هەیە.
٣-(الصَلايَــةُ والصَــلاءَةُ (ج) صُلِيٌّ وصِلِيٌّ): ١-تەوێڵ/ ناوچەوان ٢-دەســکەوانی پزیشکیی یان بۆ نهارین ٣-هەمــوو بەردێکی پان کە لە سەری شت بهاڕێتو بکوترێت.
صــمَّ: ١-(صَــمَّ- القــارورَةَ صَمّاً): ســەری سوراحییە ملباریکەکەی نایەوە.
(-الجُــرحَ): برینەکــەی تیمارکــردو تونــد بەستی.
(-صَمَماً وصَمّاً): گوێی گیراوگرانبوو یان کەر بوو.

(أَصَم (م) صَمَّاء (ج) صُمّ وصُمَّان): گوێگران یان کەڕ.
("صَمَّتِ الأُذُنُ"): گوێکە قەپاتبوو/ کەڕ بوو.
(صُمَّ- صَداهُ): دەنگی بڕا واتا مرد/ فەوتا.
(صَمَّمَ-هُ): کەڕیکرد یان گوێی گرانکرد.
(أَصَمَّ): گوێی قەپاتبوو.
(-هُ): گوێی کەڕ کرد یان بە کەڕیزانی.
(-القارورَةَ): سەری بوتڵەکەی نایەوە.
(-دُعـاءَهُ): پاڕانـەوەو نزاکـەی ئاراسـتەی خوێشـگەلێکیکرد کە کەڕبوون‌و نەیانبیست یان بە دەنگیەوە نەهاتن.
(-اللهُ صدى فُلان): خودا دەنگی فیساری بڕی واتا مراندی.
(تَصامَّ- عَنِ الحديثِ): خۆی لە قسـەکە کەڕ کردو خۆی بە کەڕ پیشاندا.
(أَلصِمّ): جورتومێکی گەورەو سەخت.
(أَلصِمَّـةُ (ج) صِمَـم): ١-جـۆرە کەڕییەکە ٢-دەمەڵبێن/ سـەرقاپی سـوراحیی/ سـەری قاپ‌و شتیتر.
(أَلصَمَم) (مص): کەڕیی.
(صَمام): ناهەمواریی‌و ومیەکی ئێجگار گران.
(صَمِّي صمام): ئاپـۆرەو ومیی گران زۆرتـرو سەختتر بە.
(صَمـامِ صَمـام): خۆتـان تـەواو کـەڕو بێدەنگبکەن.
(أَلصِمام (ج) أَصِمَّة والصِمامَة): دەمەڵبێنی سوراحیی ملباریك.
(أَلأَصَمّ): (سەختی/ رەقیی) پتەو.
("حَجَرٌ أَصَـمّ وصَخْرَةٌ صَمّـاء"): بەردێکی سەخت‌و تاوێرێکی سەخت‌و پتەو.
(رمحٌ أَصَم): نێزەیەکی قایم‌و پتەو.
(رَجُلٌ أَصَمّ): پیاوێکی سەرسەخت‌و نەبیست/ چەتـوون ئەوەی خـۆی بیەوێت هـەر ئەوە دەکات‌و ناگەڕێتەوە.
(دَهرٌ أَصَم): رۆژگارێکی سـەخت‌و نەبیست. چەند لە دەسـتی هـاوار بکـەن کەڵکی نییە زوو بـە مانگی (رەجەب)یان دەوت: (أَلشَـهرُ الأَصَم): چونکە شەڕی تێدا نەبوو تەقەتەقی پیاکێشانی چەکی تیا نەدەهات، کەس هاواری فریاکەوتنـی نەدەکرد. تـازە گەڕییەکان بە مانگـی (کانـون) دەڵێـن: (الأَصـم): لەبەر بێدەنگیی‌و کپـی دەنگی خەڵك لەبەر باران‌و سەرماو سۆڵە.
(أَلصمَّاء (ج) صُمّ): ١-مێی وشەی (الأَصَم) ٢-زەویی رەقەن ٣-(بەڵاو ئاپۆرە/ ومیی) گەورەو گران.
(أَلصَمَّـان والصَمانَـةَ): هەمـوو زەوییەکی سەختی بەردەڵانیی.
٢-(صَمَّ- عَزيمَتَهُ صَمّاً): خواست‌و ئارەزووی خۆی بەرچاوگرت/ بڕیاری خۆی بردەسـەر/ سوور بوو لەسەر ئەنجامدان.
(صَمَّـمَ- على الأَمـرِ وفيه): سورخواسـتی

کارەکــە بــوو (کۆڵینەدا/ لێیســارد نەبوو) و گوێی بە کەس نەدا وەك کەڕ بێت.

(-السَّــیفُ): شمشــێرەکە تیــژییەکەی کەرتکرد.

(أَلصِمّ) (ح): شێر.

(أَلصِمَّــةُ (ج) صِمَم): ١-ئــازا/ دلێر/ نەبەرد ٢-(ح)شێر.

(رَجُلٌ صَمَمٌ): پیاوێکە سوورو هەتەر لەسەر ئەنجامدان.

(أَلمُصَمِّم) (فا): سوورخواستو نەگۆڕ/ هەتەر لە کاردا.

(السَّیفُ المُصَمِّم): شمشێری بڕەر.

(أَلتَصمیم (ج) تَصامیم): ١-نەخشــەی خانە یــان ڕێگا یــان ڕەنگرێــژی پرۆژەو شــتیتر ٢-پیلانداناو دابەشکردنی باسێك/ پرۆژەیەك یان باسێكو پرۆژەیەکی زانستی یان وێژەییو شتیتر.

٣-(صَــمَّ- الرَجُلَ بِحَجَرٍ صَمّاً): بەردێکی بە پیاوەکەدا کێشا.

٤-(صَمَّمَ- الشيءَ): شتەکەیگەست.

(أَلصِمَّة) (ح): نێرەمار.

٥-(صَمَّــمَ- هُ الحدیــثَ): فەرمایشــتەکەی تێگەیاندو پێلەبەرکرد/ قسەکەی تێگەیاند.

٦-(أَلصِمَّة (ج) صِمَم) (ح): ژیشکەمێ.

(أَلصَمیــم): ئێســکی ســەرەکییو گرنگــی ئەندام.

(-مِن کُلِّ شَــيءٍ): پوختەو کورۆك/ ســاغی شتەکە (بۆ تاكو کۆدەوترێت).

("رجــل صَمیــمٌ ورجالٌ صَمیــمٌ"): پیاوی پیاوانەو ساغ/ پیاوی تەواوو کۆك.

(م) صَمیمَة: ژنێکی تەواوو کۆك.

("هــو مِن صَمیمِ القَومِ"): ئەو لە خانەدانو پوختو سەرچاوەی نەتەوەکەیە.

(أَلصَمیم- مِــنَ البَرد أَو الحَرِّ): ســەرمایان گەرمایەکی ڕاستەقینەیەو ئەوپەڕیەتی.

("ذَهَــبَ في صمیــم الحَــرِّ"): لــە قرچەی گەرماکــەدا/ لەو پــەڕی گەرماکــەدا بوو کە ڕۆیشت.

٧-(صَمْصَمَ-في الأَمرِ أَو السَـیرِ. صَمْصَمَةً): بێکۆڵدانو بەدەربەسەوە هاتن لەسەر کارەکە ڕۆیشت یان لەسەر ڕۆیشتنەکە ڕۆیشت.

(أَلصَمصــام والصَمصامَــة): شمشــێرێك کە نەنوشتێتەوە/ پتەوبێتو بڕەر بێت.

(أَلصِمْصِــم والصُماصِــم والصُماصِمَة- مِنَ الخَیــل): ئەســپی بەکێــش لە ڕۆیشــتنداو نەوەستاو.

٨-(صَمْصَمَ-تِ القُنفُذَةُ): ژیشکەکە زیکاندی.

٩-(صَمْصَــمَ- في إِصطــلاح العامَّــة): دەستیگرتەوەو پاشەکەوتیکرد/ کۆیکردەوە.

("رَجُلٌ یُصمصِمُ مالَــهُ ورجلٌ صَمصیمٌ"): پیاوێکە دەســتقووچاوە ســامانو دارا دەنێتە سەریەكو کۆیدەکاتەوە.

١٠-(أَلصِمصِم): گرگن/ کورتەبنەی ئەستورو.
(أَلصَمْصَمَـــةُ والصِمْصَمَـــةُ (ج) صِمْصِـــم وصَماصِـــم): ١-ناوەنـــدی نەتـــەوە ٢-کۆمەڵە خەڵکێك.
الملحق:
صـــم: (أَلصَمّـــام): زمانـــە ئامرازێکـــە بـــۆ دەستبەسەرداگرتنی شلەو گاز لە بۆرییەکانیداو ڕێکخستن‌و باش کشانی‌و ڕۆیشتنی بۆ ئەوەی بە یەك ڕێرەودا برۆن.
صَمّـــامُ الأَمـــان: زمانـــەی پارێزگاریـــی/ زمانـــەی دڵنیایی/ کە بەســـەر بۆریە توندیی لێکراوەکانەوەیـــە دەرچوونی شـــلەمەنییەکە ڕێکدەخات‌و بـــەری تەقینـــەوەی بۆرییەکان دەگرێت/ ناهێڵێت شەقبەرن.

---

صمأ: (صَمَأَ. صَمْأً): دەرچوو/ هاتەدەرێ.
(-فُلاناً على الأَمر): ناچاری ئەو کارەیکرد.
صمت: ١-(صَمَتَ. صَمْتاً وصُمُوتاً وصُماتاً): بێدەنگبوو/ کپبوو.
صَمَّتَ: بێدەنگبوو/ کپبوو.
(-هُ): بێدەنگیکرد.
(-تِ المَـــرأَةُ ولَدَهـــا): ژنەکـــە منداڵەکـــەی دەمکوتکرد شیروخواردنیدایە.
(أَصْمَتَ): بێدەنگبوو/ کپبوو/ وسبوو.
(-هُ): بێدەنگیکرد.
(-العَليـــلُ): نەخۆشـــەکە زمانـــی بەســـترا/ نقەینەما.

(أَلصُمات) (مص): بێدەنگیی/ کپیی/ کڕیی/ خامۆشیی/ و سکوتیی.
(أَلصِمْتَةُ والصُمتَةُ): دەمکوتکەرو دامرکێنی منداڵ وەك خـــواردن‌و خواردنەوەوەو یاری‌و شتیتر.
(أَلصامِت – مِنَ المال): مردەماڵ/ زێڕو زیو.
(ألمال الناطِق): زیندەماڵ/ ماڵیات‌و ئاژەڵ.
("مالَـــهُ ناطِقٌ ولا صامِـــتٌ"): نەمردە ماڵی هەیەو نە زیندەماڵ/ هیچی نییە.
(أَلصِميِّت والصَمُوت): کەمدوو/ نەدوو.
"ضَربَـــةُ صَموتٌ": لێدانێك بگاتە ئێســـقان‌و لەتیبکات بێئەوەی دەنگیبێت.
(جارِيَـــةُ صَمـــوتُ الخلخـــال): کەنیزەکێکی پێئەستور کە دەنگی پاوانەکەی نەیەت.
(أَلْصْمِت) (فا): خۆ بێدەنگکردوو.
(إنَّهُ يَشكو إلى غير مُصْمِتٍ): هاوار بۆ یەکێك دەبات کە بە دەنگیەوە نەیەت چونکە ئەگەر بەدەنگییەوە بچێت ئەم بێدەنگدەبێت.
٢-(أَلصُّمـــات): ١-زوو تینووبـــوون ٢-نیـــاز نامانج.
("هو على صُماتِ الأَمرِ أَو بِصُماتِهِ"): نزیکە بە نامانج‌و نیاز بگات.
(أَلصَمُوت): ١-قورســـە قەڵغـــان ٢-هەنگوینی بەشانە پروخەست.
(أَلصامِت) (فا): ماســـتی مەییـــوو چۆڕاوە/ خەست.

(اَلْمُصْمَت) (مفع): پتەوی بێبۆشایی.
(بــابٌ مُصْمَــتٌ): دەرگایەکــی داخــراو کە نەزانرێت چۆن داخراوەو چۆن دەکرێتەوە.
(حائِــطٌ مُصْمَت): دیوارێکــی (بێکەلەبەرو کون/ بێدەلاقە/ کونبڕ).
(فَرَسٌ مُصْمَت): ئەسپێکی یەکڕەنگ.
(إناءُ مُصْمَت): قاپێکی ساغو نەشکاو.
(أَلــفٌ مُصْمَت ومُصَّمَت): هەزاری خشــتو تەواو.
صمح: ١-(صَمَــحَ-هُ الحَرُّ. صَمْمــاً): گەرما ئازاری بە مێشکی گەیاند.
(الصُّمَاح): ١-بەز دەتوێنرێتــەوەو دەخرێتە سەر درزی قاچ بۆ تیمارکردنی/ بە زەتاوکردنی قلّیشی قاچ ٢-داخکردن.
(يَومٌ صامِــح وصَموح): ڕۆژێکــی داخ/ زۆر گەرم پیاو بیرژێنێت.
٢-(صَمَحَ-هُ بالسَوط صَمْحاً): بە قامچی لێیدا.
(اَلأَصْمَح): ئازای دەستوەشێن/ ئەوەی دلێرانە هەڵدەکوتێتە سەر ئازاکان لێیاندەدات.
(حافِرٌ صَموح): سمێکی بەکارو جێبەجێهێڵ.
٣-(صَمَحَ- فُلاناً. صَمْحاً): لە پرسە بابەتەکەدا لەگەڵیدا زۆر کارو توندو ڕەقبوو.
(اَلصِمْحاء والصِمحاءَة): زەویی ڕەقەن.
٤-(اَلصُماح): بۆمچك/ بۆنی ناخۆشی ئەرەقی لەش.
صمــخ: ١-(صَمَخَ-هُ. صَمْخــاً): دای بە کونی گوێیدا.
(-أَنْفَهُ): لووتی پانکردەوە/ شکاند.
(الصِمخ): هەموو لێدانێك/ پێداکێشانێك کە کار بکاتە سەر دەموچاو.
(اَلصِماخ (ج) صُمُــخ وأَصْمِخَة والأُصْمُوخ): کونی نــاوەوەی گــوێ کە بۆ ســەر دەچێت/ بۆریی ناوەوەی گوێ.
("كُلُّ أُذُنٍ ولــودٌ وكُلُّ صِمــاخ بَيــوضٌ"): هەمووو خاوەن گوێیەکی بە دەرەوە دەزێتو وەك مرۆڤ هەمــوو خاوەن گوێیەکی کورتو نووساو هێلکە دەکات وەك مریشكو باڵندە.
٢-(الصِمْخ): شــتێکی مەیلەو ڕەقە لە گوانی مەردایە پــاش زانەکەی ئەگەر بدۆشــرێتو گوانەکــەی پاکبکرێتەوە شــیرەکەی لە بەری دەڕوات.
(اَلشَمَنْدور) (عامية)= الصِمْخ. الصُماخ (ج) صُمُخ): چاڵاوی کەمئاو.
٣-(إصْمَخَدَّ): لە ڕقاندا سەری ئاوسا.
صمــد: ١-(صَمَــدَ وصَمَّدَ فُلاناً ولَــهُ وإليهِ. صَمْــداً): نیازی ئەویکرد/ ڕووکردە لای ئەو/ بۆ لای ئەو چوو.
(صَمَــدَ هذا الأمر. صَمْداً): پشــتی بەم کارە بەست.
(تَصَمَّدَ لَــهُ بالعَصا): بە دارەوە بەرەو ڕووی چوو.
(اَلصَمَد): ١-ســەردارێك گەورەیەك کە بەبێ

ئـەو هیــچ نەکرێت ٢ـهەمیشــە ٣ـلــە ناوە پیرۆزەکانی خودایە.

(اَلصَمْــدَةُ): ١ـجارێك بۆ لاچــوون ٢ـجارێك پشت پێبەستن.

(اَلصامِــد) (عامية): پاشــماوەی شــتێ/ کە ڕۆیشتبێت.

(اَلمُصَمَّــد والمَصْمُــود): نیازکــراو/ بۆچوو/ ڕوتێکراو.

٢-(صَمَدَ-هُ بِالعَصا. صَمْداً): بەدار لێیدا.

(-تِ الشَــمسُ وَجْهَهُ): هەتاو/ تیشــکی خۆر دەموچاوی هەڵپروکاندو کاری تێکرد.

(صَمَّدَ-ه بَالعَصا): بەدار لێیدا.

(صامَدَ-هُ صِمــاداً ومُصامَدَةَ): شــەرە دارو شەرە قسەی لەگەڵدا کرد.

٣-(صَمَدَ- القارورَةَ. صَمْداً): دەمەڵبێنێکی/ سەرێکی بۆ سووراحییەکە کردو سەرینایەوە.

(صَمَّدَ- الرَجُلُ رَاْسَــهُ): پیاوەکە ســەری بە پەڕۆیەك پێچا.

(اَلصِمــاد): ســەری شووشــە/ دەمەڵبێنــی سوراحی.

(اَلصِمــاد والصِمــادَة): دەستەســڕێك یــان پەڕۆیــەك کە بــە ســەرەوە دەبەســترێتو سەروبەستو مێزەر نەبێت.

(اَلصَمْــدَةُ في إصطلاح المَســيحيين): لەلای عیســاییەکان بــەو دەستەســڕە دەڵێــن کــە دەخرێتە ژێر قاپی قوربانیی پیرۆز.

٤-(صَمَدَ-تِ الماشِــطَةُ العَروسَ (في اصطلاح العامة). صَمْــداً): قژداهێنەرەکە بووکەکەی خستە سەر شوێنێکی بەرز.

(اَصْمَدَ- إليهِ. الأمرَ): کارەکەی پێسپارد.

(اَلصَمْد (مص) (ج) اَصْماد وصِماد): شوێنی بەرز.

(اَلصَمَد): بەرز/ بالاّ/ بڵند.

(اَلصَمــدَةُ والصُمْــدَةُ): تاوێــری بــەرزی چەسپیو.

٥-(صَمَّدَ- الدراهِم) (عامية): پارەیوردەوردە کۆکردەوەو نایە سەریەك هەڵیگرت.

(اَلصامِــد) (عاميــة): شــتی عەمارکــراو/ گەنجینەخراو.

٦-(اَلصَمَــد): ١ـپتەوێــك کە بۆشــیی نەبێت ٢ـئەو پیاوەی کە لە جەنگدا نە برسیدەبێتو نە تینوو/ بەرگەکر.

٧-(صَمْــدَحَ- اليَــومُ): گەرمــای ڕۆژەکــە تاویسەند.

(اَلصَمَيدَح): ڕۆژی گەرم.

٨-(اَلصُمــادِح): ١ـزۆر ســەختو پتەوو توند ٢ـپوختەو پاڵاوتەی هەموو شــتێك ٣ـڕێگەی ئاشکراو دیارو ڕوون ٤ـشێر.

(اَلصُمادِحِي): پوختەو پاڵاوتەو ساغی هەموو شتێك.

(اَلصَمَيدَح):زۆر سەختو پتەو/ توند.

صمــر: ١-(صَمَرَ- المــاءُ صَمْــراً وصُمُوراً):

ئاوەکە لــە لێژگەیەکەوە هاتەخوارێو مەنگ ڕۆیشت.

(ألصِمْر): شوێن مەنگیی ئاوی داپەڕیو.

٢-(صَمَــرَ. صَمْــراً وصُمــوراً): ڕژد بــوو/ چروکییکردو شتەکەی نەدا.

(صَمَّرَ وأَصْمَرَ- الرجُلُ): چرووکییکرد.

(-المَتاعَ): بۆ هەڵگرتن‌و عەمارکردن کەلوپەلی کۆکردەوە.

(ألصامِر (فا) (ج) صامِرون): چرووك/ ڕژد/ دەستقووچاو.

٣-(صَمَــرَ وصَمِــرَ- اللبنُ صَمْــراً وصَمَراً): ماستەکە زۆر ترشبوو.

(أَصْمَرَ- اللبن): ماستەکە زۆر ترشبوو.

(ألصَمْرَةُ والصامُورَة): ماســتێکی زۆر ترش کە ناخۆشبێت.

٤-(صَمَّرَ وأَصْمَــرَ- الرَجُلُ): پیاوەکە کەوتە خۆرئاوابوون.

(ألصُمَير): خۆرئاوابوون/ زەردەپەڕ.

٥-(ألصَمْر): بۆنی مسکی تازە.

(ألصَمْر والصَمَر): بۆگەن.

(ألصُمْــر) (ج) أَصْمار): لێوانلێو/ پڕ تا لێوی قاپ.

("مــلأَ الــكَأسَ إلى أصمارِهــا أو أصبارِها): جامەکەی (لێوانلێو کرد/ تا لێوانی پڕیکرد).

(ألصَمِر): بۆگەنبوو/ بۆنناخۆش.

("يَدى مِــنَ السَــمَكِ صَمِرَةٌ"): دەســتم بە ماسییەکە بۆنی ناخۆشبووە.

(ألصَمــير): پیاوێکی چرووســاو کە گۆشــتی بەسەر ئێسکیدا وشــکبۆتەوەو بۆنی ئەرەقی لێبێت.

صمع: ١-(صَمَعَ- هُ بالعَصا أو السَّيف): بە دار یان بە شمشێر لێیدا.

٢-(صَمَــعَ- الظَبــيُ. صَمْعاً): ئاســکەکە بە زەویدا بڵاوبووەوە ڕۆیشت.

(صَمِعَ. صَمَعاً): بێدەربەسانە ڕۆیشت.

(صَمَّــعَ- على رَأيــهِ): لەســەر ڕاکەی خۆی سوورو هەتەر بوو.

(إنْصَمَعَ- في غَضَبِهِ): ڕقەکەی نەنیشتەوە.

(ألأَصْمَع (ج) صُمعان): ١-شمشــێری/ شــیری بڕەرو تیژ ٢-دڵوشــیارو دڵقایم ٣-گەیشتو بە بەرزترین پایەو جێ.

(ألأَصْمَعــان): دڵــی وشــیارو قایــم‌و ڕای بە ئەنجام/ چەسپیو.

(ألصَمِع): ١-دڵوشیار دلێرو دڵقایم ٢-نەبەرد/ ئازا/ دلاوەر.

٣-(صَمِــعَ- في الكلام. صَمْعاً): لە قســەکەدا هەڵەیکرد/ بەهەڵەدا چوو.

٤-(صَمِعَ- أُذُنُهُ صَمعــاً): گوێقوتبوو/ گوێی بچووکبوو بە سەریەوە نووسابوو.

(أَصْمَع (م) صَمْعاء): گوێقوت.

(ألأَصْمَــع (م) صَمعــاء (ج) صُمــع): ١-گوێ بچــووك ٢-پەڕی نــەرم‌و جــوان ٣-ڕووەکێك

بـەری دەرکردبێت بەرەکەی نەخۆشـی لێی نەدابێت.

صمغ: (صَمَغَ- الشَيءَ): ١-شتەکەی کەتیراویکرد ٢-بە کەتیرە چەسپیکرد (عامية).

(أَصْمَـغَ-تِ الشَـجَرَةُ): درەختەکە کەتیرەی دەرکرد.

(-الشـدقُ): لالغاوەکـە کەفیچەندو تفی زۆر بوو.

(إِسْتَصْمَغَ- الشَـجَرَةَ): درەختەکەی بریندار کرد تا جەوی دەرکاتو کۆی بکاتەوە.

(أَلصَمْغ والصَمَغ. الواحِـدَةُ صَمْغَة وصَمَغَة (ج) صُمُوغ): کەتیرە/ گەومن/ جەوی. شتێکە درەخت دەریدەکاتو پێوەی رەقدەبێت.

(الصَمْغُ العَربي): کەتیرەی عەرەبی.

(صِمـغ (عاميـة)= الصِمـغ. الصِمغـان والصِمْغَتان والصامِيغان والصَماغان) (ع ا): ئەملاولای دەم/ لالغاوە.

(أَلصِمَغ والصِمَغَة): شـتێکی رەقە لە شـیردا دەبێتو یەکسەر پاش زانە/ ژەکی شیر.

(أَلصَمْغـان): کەسـێکە کە گوێـی چەوریی و پیسـی دەربدات یان لووتی کەمێڵو یان دەمی کەفو یان چاوی رپیۆق دەربداتو پێوە بێت.

٢-(إِسْتَصْمَغَ- فلانٌ): بریندار بوو برینەکەی پیس بوو.

(أَلصَمغَة): برین کە پیس بووبێت.

صمق: ١-(أَصْمَقَ- البابَ): دەرگاکەیداخست.

(-اللَّبَنُ أَو الماءُ): شیرەکە یان ئاوەکە خراپبوو تامی ناخۆشبوو.

(-الرَجُـلُ): کابـرا خراپـی لێدەرچـوو/ ناراستبوو.

(أَلصُمقَةُ): شیری ترشاوو خراپبوو.

٢-(صَمْقَرَ- اللَبَنُ): ماستەکە زۆر ترشبوو.

(إِصْمَقَرَّ- اللَبَنُ): ماستەکە زۆر ترشبوو.

(-تِ الشَمسُ): خۆرەکە تاویسەند.

صمك: (إِصْمَأَكَّ- الرَجُل): قوشـقیبوو/ زۆر توورە بوو.

(-اللـبَنُ): شـیرەکە وامەیـی وەك پەنـیری لێهات.

(-تِ الأَرضُ): زەویەکە باران تەریکرد.

(-الجرحُ): برینەکە هەڵاوسا.

(أَلصَمَكـوك والصَمَكيـك): ١-نەزانێکـی هەڵەشـەی شـەرانی ٢-بەهێزێکی توندوتیژ ٣-کەسـێکی وشـکی نەزاندووی کەرتر ٤-شتی لینج.

صمل: (صَمَلَ- الشيءُ صَملاً): ١-رەقو توندو سەختبوو ٢-وشکبوو.

(أَصْمَـلَ-هُ الصِيامُ): رۆژوو وشـکیکردەوە/ چرووساندی.

(إِصْمَأَلَّ): توند بوو.

(-النَبات): رووەکەکە بەیەکداچوو/ تێکئالا.

(الصُمُل): توند سروشت.

أَلصامِل والصَميل: وشك.

٢-(صَمَلَ-الرَجُلَ عَنِ الطَعام. صَمْلاً وصُمُولاً): دەستی لە خواردن گرتەوە/ وازی لە خواردنەکە هێنا.

٣-(صَمَلَ-ہُ بالعَصا. صَملاً وصُمولاً): دارکاریکرد/ بەدار لێیدا.

٤-(أَلْصَمَئِل): لە رقدا پیشی خواردەوەو سەری ئاوسا/ گیفی خواردەوە.

(أَلْصَمَئِلَّة): وەی/ چورتوم.

صمى: ١-(صَمى- الرَجُلُ صَمْياناً): تەپاوتلیکرد/ خۆی وەرگێرا.

٢-(صَمى- الرَجُلُ صَمَياناً): راپەڕی و گورجبوو.

(صَمى- الصَيدُ. صَمْياً): نێچیرەکە بەبەرچاوتەوە پاش پێکرانی مرداربوووەوە.

("ماصَماكَ عَليهِ"): چی پاڵی پێوەنایت پەلاماری بدەیت یان ئەوە بکەیت.

(أَصْمى- الرَجل. إصْماءً): خێرایکرد.

(-الصَيدَ): نێچیرەکەی پێکاو بە بەرچاویەوە مرداربووەوە (لە خێرایی و سوکدەستیەوە هاتووە).

(-الفَرَسُ على لِجامِهِ): چارەوێکە بە لغاوەکەیدا گەست و رۆیشت.

(إنْصَمى- عَلَيهِ إنْصِماءً): خۆی بەسەردادا.

(-الطائِرُ): باڵندەکە داهاتە خوارەوەو خۆی پێدادا/ پەلاماریدا.

(أَلصَمَيان (مص) (ج) صِمْيان): بە زەبرو زەنگ/ درو بە چنگ.

(رَجُلٌ صَمَيانُ): پیاوێکی بە ئازارو زەبرو زەنگ بەسەر خەڵکەوە.

٣-(صَمى- الأَمرُ. فُلاناً صَمْياً): کارەکەو بارەکەی بەسەردا کەوت و تووشبوو.

(أَصْمى- مَنيَتَهُ. إصْماءً): مەرگی نۆشی.

(إصْماء): مەرگنۆشین/ مردن.

صنّ: ١-(أَصَنَّ): بۆگەنیکرد/ بۆنی ناخۆشبوو.

(-الماءُ): ئاوەکە (گەرایەوە/ بۆگەنبوو).

(-اللَّحمُ): گۆشتەکە بۆگەنبوو.

(أَلصِن): میزی کورکن کە زۆر بۆگەنەو زیندەوەرێکە لە پشیلە دەچێت.

(أَلصَنَّة) (عامية): بۆنی میز.

أَلصِنَّة: ١-بۆی ناخۆشی بنباخەڵ ٢-بۆنی بۆگەن بە گشتی.

(أَلصُنان (ج) أَصِنَّة): هەموو بۆنێکی ناخۆش.

٢-(أَصَنَّ): بە فیزەوە لووتیکردە ئاسمان.

(-الرجُلُ): تەواو رقی هەستا.

(-على الأَمرِ): لەسەر کارەکە پێیداگرت و سوور بوو.

٣-(أَصَنَّ- الرَجُلُ): بێدەنگبوو.

٤-(أَلصَن (ج) صِنان): نیمچە سەبەتە.

(أَلصِنّ): سەرەتای برجی پیرێژن.

(أَلصَنّان): ئازا/ دلێر.

(أَلأَصَنّ): خۆبێئاگاکردن/ خۆگێلکردوو.

صنب: ١-(ألصِناب) (ط) (يونانية): پێخۆرێکە لە خەرتەلەو شلەرۆن دەکرێت.

(ألصِناب والصِنابَة): پشتو سکی درێژ.

(ألصِنابيّ): ڕەنگسوورفلیو سپی.

٢-(صَنْبَرَ-تِ النَخلَةُ. صَنْبَرَةً): دارخورماکە لە بنەوە باریكو قەدکزو کەمبەر بوو.

(ألصَنبَر): هەموو شتێکی باریكو بێهێز.

(ألصُنبور (ج) صَنابير): پیاوی زەبوونی داماوی بێماڵو مناڵ بێپشتیوان.

(ألصُنْبُور والصُنْبُورَة (ج) صَنابير): ١-دارخورمایەك كە لە بنەوە باریکبێتو کەمبەر بێت ٢-دارخورمایەك کە لە بنی دارخورمایەکیترەوە دەرهاتبێت بێ ئەوەی بروێنرێت.

٣-(الصِنَّبْر (ج) صَنابِر) (ضد):١-بای سارد ٢-بای گەرم ٣-دووەم ڕۆژی برجی پیرێژن كە لە کۆتایی زستاندایە.

(لَيلَةٌ صِنَّبْرٌ وصِنِّبْرٌ): شەوی زۆر سارد یان زۆر گەرم.

(صَنابِرُ الشِّتاءِ): ئەوپەڕی سەرماو سۆڵەی زستان.

(ألصُنْبُور (ج) صَنابير): ١-بەدزمان/ ناپاك/ موخەنەت ٢-منداڵێکی بچووکی زۆرزان ٣-( ضد) بای سارد/ بای گەرم ٤-کونی گۆل كە ئاوەکەی لێوە دەردەچێت.

(ألصَنَوْبَر) (ن):داری (کاژ/ سنەوبەر) دارێکی چرە لە نیوەی گۆی زەویی باکوردا دەروێت زۆر جۆری هەیە هەندێکی بۆ ڕازاندنەوەو جوانی دەروێنرێت لە هەندێکیان (ڕێین/ تربەنتین) دەردەهێنرێت.

(ألصَنَوبَريّ): ئەوەی لە شێوەی بەری سنەوبەردایە خڕو درێژ یان قووچەکییە.

(ألصَنَوْبَريات) (ن):کۆمەڵە دارێکە كە دوو لەتکەیین بەشی زۆریان درەختی هەمیشە سەوزنو ڕاتینجین (ئەوانەن کە جەوی دەردەدەن) وەکو داری کاژو داری ئەرزو تەنوبو سوورەچنارو سەرو عەرعەر.

٤-(صَنْبَعَ- البَخيلُ): چرووەکەکە گرژبوو لە شت لێخواستندا.

صنت: (أَصْنَتَ- الشيءَ): شتەکەی توند دامەزراندو چەسپاند.

(ألصَنُّوت (ج) صَنانِيت): بەرگی سوراحیی ملباریك.

صنج: ١-(صَنجَ-هُ بالعَصا صُنُوجاً):بە دار شلکوتیکرد/ لێیدا.

(صَنَّجَ- بِهِ تَصْنيجاً): دایبەزەویدا.

(ألصَنج (ج) صُنوج) (مو): (صفيحة مدورة من النحاس الاصفر تضرب على اخرى مثلها للطرب (مو) آلة اخرى للطرب لها اوتار). ساجۆك تەختە مسێکی زەردی خڕە بۆ خۆشی بە یەکێکیتری وەك خۆی بە یەکدا دەدرێت. ئامێرێکی مۆسیقایترە بۆ خۆشی كە

ژێردارەو لێدەدرێت.

(صَنجُ الجِنّ) (فارسية): دەنگی جنۆکە.

(ألصُنوج): ئەڵقەی کەمەی دەف/ چیوەی دەف.

(ألصَنّاج والصَنّاجة): خاوەن ساجی لێدان.

(صَنّاجَةُ الجَيش): تەپڵی سوپا.

(صَنَجَ- النَاسَ. صُنوجاً): هەر کەسەی بردەوە سەر ڕەسەن و ڕیشەی خۆی.

(صَنْج): ڕەسەن و ڕیشە.

("مادري أيَّ صَنْج هُوَ"): نازانم ئەو لە چ ڕەسەنێکەو ڕچۆن مرۆڤێکە.

٢-(لَيلَةٌ قَمراءُ صَنّاجَةٌ): مانگەشەوێکی ڕووناک.

صند: ١-(ألصِنْدِد (ج) صَناديد): گەورەیەکی نەبەرد/ ئازا.

(ألصِنْدِيد (ج) صَناديد): گەورەیەکی ئازا/ دلێر/ نەبەرد.

ألصِنديد (-مِن الريحِ أو البَرْدِ): بای زۆر توند یان سەرمایەکی زۆر سەخت.

("يَومٌ حامِيَ الصِنْدِيد أو الصَناديد"): ڕۆژێکی زۆر گەرم.

(-مِنَ الغَيث): بارانی لێزمەو دڵۆپ گەورە گەورە.

(ألصَناديد): ١-کەسانێکی زرنگ و زۆرزان ٢-دەستەیەکی سوپا.

٢-(صَندَقَ- البِضاعَةَ) (ت): کاڵاو کەلوپەلەکەی خستە سنوقەوە.

(ألصُنْدوق (ج) صَناديق): سنووق.

(ألصُنْدُوقَةُ): سنووقۆلکە/ گچکە سنووق.

(ألصَنْدَل) (ن): داری سەندەڵ. جۆرە دارێکی هیندی گوڵسپییە دارەکەی بۆنی خۆشەو زۆر پەسەندە بەرەکەی هێشوویيە تۆوێکی سەوزی هەیە. بۆ مەبەستی پزیشکی بۆ نەخۆشی دڵ بەکاردەهێنرێت بەری دارە سوورەکەی گەرم و تیژە پاشان زەردەکەی کەمترە و سپییەکەی ساردە.

(ألصَنْدَل والصُنادِل): کەللە گەورە.

ألصَندَلانيّ (ج) صَنادِلَة): دەرمانگرەوە.

صنر: (ألصِنار والصِنّار الواحدةُ صِنارَة وصِنّارَة (ن) (فارسية) =- شجر الدَلب): سوورەچنار.

(ألصِنّارَة (ج) صَنانير): قولاپ -ئەو قولاپەی بەسەری تەشییەوەیە ئەو قولاپەی ژنان کە شتی خووریی پێدەچنن.

(صِنّارَةُ الصَياد): قولاپی ماسیگرتن و ڕاو.

("رَجُلٌ صِنّارَةٌ وصَنّارَة (ج) صَنانير): پیاوێکی بەدڕەفتارە/ بەدخووە.

(ألصِنّور): ١-چرووك/ ڕژد ٢-بەدڕەوشت.

صنع: ١-(صَنَعَ-الشيءَ صَنْعاً وصُنْعاً): شتەکەی دروستکرد. سازاند.

(-بِهِ صَنيعاً قَبيحاً): بەدیی لەگەڵدا کرد/ کردەوەیە ناشرینی بەرامبەر کرد.

(صَنَّعَ- الشَيءَ): وەستایانە شتەکەی

دروستكردو رازاندەوە.

(أَصْنَعَ- الرَجُلُ): فێربوو لە پیشەکەیدا بوو بە وەستایەکی کارامەو ڤاڵ.

(تَصَنَّعَ): ١-رووکەشکاریکرد ٢-خۆی وا پیشاندا/ نواند کە شارەزایەو وایشنەبوو ٣-لە بەرگو ڤسەکردندا خۆی نواند ٤-ریاییکرد.

(-تِ المرأةُ): ژنەکە نارایشتی خۆیکرد بۆدرەو دەرمانی زۆری لە رووی هەڵسوو (عامیة)

(إصْطَنَعَ- شَیئاً): شتێکی بەدروستکردندا/ داوایکرد بۆیدروستبکەن.

(إسْتَصْنَعَ-هُ الشيءَ): داوای لەو کرد کە شتێکی بۆ دروستبکات.

(أَلصُنْع) (مص): دروستکردن/ سازدان.

(رَجُلٌ صَنْعُ اليَدَینِ (ج) رجال صَنْعُون): پیاوێکی دەسترەنگینە/ وەستایەو کارامەیە لە پیشەکەیدا/ کارزانە.

(أَلصِنْع (ج) أَصْناع): ١-دروستکراو/ کراو ٢-بەرگدروو ٣-بەرگ ٤-سەروبەست/ مێزەر ٥-گۆل/ حەوز ٦-ڤەلا ٧-شیشی گۆشتو کەباب برژاندن.

(رجُلٌ صِنْعُ الیَدَینِ (ج) رجالٌ صِنْعون): پیاوێکی دەسترەنگین/ کارزانو کارامە لە پیشەداو دەستسووکە لە کاردا.

(الصَنْعَة): جارێك دروستکردنو ئەنجامدان.

(أَلصَنْعَة): ١-پیشە/ کاری (دروستکەر/ پیشەساز).

(أَلصَناع):ئاوبەست دارێکە بۆ ماوەیەك بەری ئاوی پێدەگیرێت.

(رجلٌ صَناعُ اليَدَينَ (ج) صُنُع وصَنَعُ اليَدين): پیاوێکی دەسترەنگینو دەستسووك لە پیشەی دەستیدا کارامەیەو گورجە.

(إمْرَأَةٌ صَناعُ اليَدَينِ وإمرَأَتانِ صَناعانِ ونِسوَةٌ صُنُعٌ): ئافرەتێکی دەسترەنگینو دەستگورجەو کارامەیە لە کارەکەیدا دوو ئافرەتو ئافرەتانی دەسترەنگینو کارامەن لە پیشەو کارەکانیاندا.

(ويُقالُ للشاعِر وكُلّ بليغ: هو صَنَعُ اللِّسانِ ولَهُ لِسانٌ صَنَعٌ): بە هەموو شاعیرو رەوانبێژێك دەوترێت ئەو شارەزاو بە زمانو کارامەو زمانپاراوە.

(أَلصِناعَة والصَناعَة (ج) صِناعات وصَنائِع): ١-پیشە/ شارەزاییو فێربوونی بە کردنی ئەو پیشەو کارەو مەشق لەسەر کردنی وەك بەرگدروویيو چنینو پیشەیتر ٢-زانستیی چۆنیەتی کارکردنو لەسەر رۆیشتنی وەك زانستیی گفتە.

دەڵێن وشەی (أَلصَناعَة) بۆ ئەو شتانە دەوترێت کە پیشە بێتو دروستکردن بێت، مادیی دەبێت/ هەستپێکراو بێت بەڵام (أَلصِناعَة): بۆ شتێکە کە مادی نەبێت لە سروشتەوە بێت وەکو کێشەی هەڵبەست کە هەندێك بە خۆرست هەست بە کێشەکان

دەكات و پێیدەزانێت هەیشە بە فێربوون کێشەکان دەزانێت.

(اَلصَنّاعَة): ئاوبەست، دارێکە بەری ئاوی پێدەگیرێت.

(اَلصَنیع (ج) صُنُع): ١-دروستکراو ٢-شمشێری ساف و لووسکراو ٣-تیر ٤-بەرگی چاك و تەمیز.

("رَجُلٌ صَنیعُ الیَدَیـن"): پیاوێکی کارزان و بەدەستوبردە/ وەستایەکی چابوکە. (م)

(صَنیعَـةُ الیَدَیـن): ژنێکی دەسترەنگین و کارزان و بەدەستوبرد.

(قَـومٌ صَنْعـى وصِنْعى وصُنُعـى وصَنَعى وأَصْنـاع الأَیدي): خوێشـگەلێکی کارساز/ کارامە/ لێزان و چابوك/ وەستا لە کاردا.

(اَلصانِع (فا) (ج) صُنَّاع): ئەوەی بەدەست کاربکات/ بکەر/ ئیشکەر/ کرێکار/ کارگەر/ دروستکەر.

(الصانِعَةُ): مێی وشەی (الصانع).

(إمْرأَةٌ صانِعَةُ الیَدَینِ): ئافرەتێکی شارەزاو کارامەو چابوکە لە کاری دەستیدا.

(صانِعَة) (عامیة): کارەکەر.

(اَلصانِـع) (عامیـة): نۆکـەر/ خزمەتکار/ شاگرد.

(اَلمَصْنَع (ج) مَصانِع): ١-گۆلی باراناو ٢-کارگە/ شوێنکار وەك هی دارتاشـیی و ئاسنگەرخانە شوێنی بەرگدرووی.

(اَلمَصْنَعَـةَ): شـوێنی بەخێوکردنی هەنگ و کوورەهەنگ کە دوور لە خانووەوە بۆی تەرخاندەکرێت.

(اَلمَصْنَعَـة والمَصْنُعَـة (ج): مَصانِع): گۆلی باراناو کە باراناوی تێدا کۆدەکرێتەوە.

(المَصانِع): ئاوایی و دێیان و قەلاّو کۆشکان.

٢-(صَنَـعَ- إلَیـهِ مَعروفاً. صَنْعـاً وصُنْعاً): چاکەیەکی لەگەڵدا کـرد/ پیاوەتیی لەگەڵدا کرد.

(أَصْنَـعَ- الرَجُلُ): یارمەتـی یەکێکیتریداو کۆمەکیکرد.

(إصْطَنَـعَ- عِنـدَهُ صَنیعَـةً): چاکەیەکـی لەگەڵدا کرد.

(- فُـلانٌ): خواردنی دروسـتکردو لـە رێی خودادا بەخشییەوە.

(-الرزقَ): رۆژیی پێشکەشکرد.

(اَلصُنع): ١-چاکە/ پیاوەتی ٢-رۆژیی.

(اَلصَنیع (ج) صُنُع): ١-خێرو چاکە ٢-خواردن.

(اَلصَنیعَة (ج) صَنائِع): چاکە/ خێر پیاوەتی/ دەستگیرۆیی.

(اَلمَصْنَعَة): میوانییکردن و نانی بۆ کردن.

("کُنـا في مَصْنَعَـةِ فُـلانٌ"): لـە میوانیی و نانخواردنی فیساردا بووین.

٣-(صَنَعَ- الفَرَسَ صَنْعاً وصَنْعَةً): ئەسپەکەی چاك بەخێوکردو دەرهێناو رامکرد.

(إصْطَنَـعَ- هُ): تەمێیکـردو پەروەردەیکردو باش دەریهێنا.

(-ه لِنَفسِهِ): بۆ خۆی هەڵبژارد.
(صَنْعَةُ الفَرَس): باش بەخێوکردنو چاودێریکردنی چارەوێ.
(اَلصَنيع (ج) صُنُع): ئەسپی چاك بەخێوكراوو پەروەردەكراوو چاك دەرهێنراو.
("سَيفٌ صَنيع"): شمشێرێكی چاك ڕاگیراو.
("هُوَ صَنيعي"): ئەو دەرهاتووی دەستی منە/ من بەخێومكردووەو باش پەروەردەمكردووە دەرمهێناوە/ باش پێمگەیاندووە.
(اَلصَنيعَةُ): ١-دەرهاتوو/ پێگەیشتوو ٢-چاكەو پیاوەتی.
(هو صَنيعَتي): ئەو دەرهاتووی دەستی منە/ چاك بەخێوو پەروەردەو فێرمكردووە.
٤-(صانَعَ-هُ.مُصانَعَةً): لەگەڵیدا هەڵیكردو بە پێچەوانەی ئەوەی لە دڵیدا بوو ڕەفتاریكرد ٢-دڵی ڕاگرت ٣-بەرتیلیدایە.
("مَن صانَعَ بالمالِ لَمْ يَحْتَشِم مِن طَلَب الحاجَة"): ئەوەی بەرتیل بدات شەرم لە داخوازییەكەی ناكات.
(-هُ عَن الشيءِ): هەڵیفریواند/ لە خشتەی برد.
(-الرَجلَ): هاورێیەتیی پیاوەكەیكرد.
٥-(الصَنع) (ح): كرمێكە یان جانەوەرێكی وردە.
اَلمَصْنَع (ج) مَصانِع: كارگە/ كارخانە.
الملحق:
صنع: (اَلصَنَّائِعي): ١-پیشەكار ٢-خاوەن پیشەیەكی دەستیی وەك بەرگدروو و ئاسنگەر.

(اَلإصْطِناعِيّ): ناسروشتیی/ دەستكرد.
("حَريرٌ إصْطِناعِي"): ئاوریشمی دروستكراو.
(زُهورٌ إصْطِناعِيَّ): گوڵی دەستكرد. ئەوەی بە ئاوێتەی كیمیایی بەرهەمدێت.
(مَطّاطٌ إصْطِناعي): لاستیكی دروستكراو/ دەستكرد.
(اَلتَصَنُّع): بەدرۆو خۆنواندن/ ساختەكاریی لە وتارو هەڵسوكەوتدا.
(تَصَنُّعُ القِتال): بە درۆو ساختە شەڕكردن.
(اَلتَصَنُّع): خۆنواندنو قەبەیی لە قسەوكرداردا.
(تَكَلَّم بتَصَنُّع): بەخۆدەرخستنو خۆنواندنەوە قسەیكرد.
("اَلتَصَنُّع في اللِّباس"): خۆنواندن بەبەرگەوە.
(اَلتَصَنُّع في النَّقْد الأدَبي): لە ڕەخنەی ویژەییدا. ڕازاندنەوەو درۆو ناڕاستیی تێهەڵكێشكردن پێداهەڵدان بە جۆرێك كە لە شێوەو ڕێڕەوی سادەو ئاسایی دەرچێت.
(اَلتَصنيع): ١-بە پیشەسازیكردن
تصنيع منطقة، بلاد: پیشەسازیكردنی وڵاتو دامەزراندنی پیشەسازی تیایدا ٢-بەهۆو لە ڕێی ئابوورییەوە میللەت پیشەساز بكرێت/ بكرێتە میللەتێكی پیشەسازیی.
("تَصنيع النفط"): نەوت بكرێت بە مادە یان كاڵاو كەلوپەلی پیشەسازیی.
("تَصنيع الفَواكِه"): میوە بكرێتە

کەرەســـەیەکی پیشەســـازییو کارگـــەی بـــۆ دابنرێت.

(ألتَصْنيــع- في النقد الأدَبــي): لە ڕەخنەی وێژەییدا ڕازاندنەوەی ئاخاوتنو جوانکردنی بەبێ پێوەنانی زیادڕەویی.

صنــف: ١-(صَنَّــفَ -الشـيءَ): شـتەکەی پۆلپۆلکردو لە یەکی جیایکردنەوە/ پۆلێنکرد.

(-الشَجَرُ): درەختەکە گەڵایکردو پۆلپۆلبوو.

(-التَمــرُ): خورماکــە هەندێکی گەیشــتو هەندێکی نەگەیشــت هەندێکــی ڕەنگیگرتو هەندێکی نەیگرت.

(تَصَنَّفَ- الشَجَرُ أو النَّباتُ): درەختەکان یان ڕووەکەکان چەشن چەشنبوون.

الصِنــف (ج) أصنــاف وصُنوف): نیشــانە/ سیفەت.

("صِنفُــهُ کــذا"): نیشــانەکەی ئەوەیە ئەو پۆلەیە.

(ألصِنــف والصَنــف (ج) أصناف وصُنوف): جۆرو بابەتو چەشن.

(عِنــدَهُ صِنــفٌ مِــنَ الأمتِعَــة): جــۆرە کەلوپەلێکی هەیە.

٢-(تَصَنَّف- الشَــجَرُ أوِ النَّباتُ): درەختەکان یــان ڕووەکــەکان/ گۆپکەی گــەڵای تازەیان دەرکرد.

(ت -الشَــفَةُ): لێوەکــە ترەکی/ قڵیشــا یان توێژی هەڵدا.

(-تِ السَّاقُ): لاقەکە قڵیشا.

(ألأصْنَف (ج) صُنْف) (ح): نێرە وشترمرخی لاق توێژهەڵداو.

٣-(صَنَّفَ- الكِتــابَ): پەرتووکەکــەی داناو بەشبەشیکرد.

(التَصانیــف الواحِــد تَصنیــف): پۆلێــن/ بابەتکردنو بەشبەشکردن.

(ألمُصَنَّف (ج) مُصَنَّفات):(کتێبی/ پەرتووکی) دانراو.

٤-(صِنْــفُ- الثَوب (ج) أصْنــاف وصُنُوف): پەراوێزو دامێنی کراس.

(ألصِنْفَةُ والصَنِفَــةُ- مِنَ الثَّوبِ): پەراوێزی بەرگەکە.

٥-(ألصُنافِــر):شــتەکە تەنهــاو هــەر خۆی بەرووتی.

(ألصُنافِرَة): زۆڵ.

"وَلَدٌ صُنافِرَة": منداڵێك کە نەزانرێت باوکی کێیە.

صنق: ١-(صَنِقَ- حَبَسَــدَهُ أو إبطُهُ. صَنَقاً): لەشــی یان بنباخەڵی ئارەقــی زۆریکردەوەو بۆنی پیسی دایەوە.

صَنِقٌ: لەش یان بنباخەڵ بۆگەن.

(ألصَنَــق) (مــص): ئارەقکردنــەوەی زۆری بنباخەڵو بۆمچکدانەوە.

(ألصَنیق): بۆگەن/ بۆمچك.

(ألصانِق (ج) صَنَقَة): بۆمچکێکی زۆر بۆگەن.

٢-(أَصْنَقَ-عليــه): پێی لێداگرت/ لەســەری سوور بوو.

٣-(أَصْنَقَ- في مالِه): داراکەی/ ماڵەکەی باش هەڵسووراند.

(المُصْنِق والمِصْناق): خوشــترداریی چاك كە باش بەخێویان بكات.

٤-(رَجُلٌ صَنِقٌ): پیاوێکی کەتە/ چەتەوڵ.

صنــم: (صَنِمَ- العَبدُ صَنَمــاً): کۆیلەکە بە هێز بوو.

(صَنِــم (م) صَنِمَة (ج) صَنِمــات): بەهێز/ بەتوانا.

(صَنِــمَ- تِ الرائِحَةُ): بۆنەکە ناخۆشــبوو/ بۆگەنبوو.

(صَنَّم): دەنگی لێپەیدابوو/ دەنگی هات.

(أَلصَنَــم (ج) أَصْنام (فارســة وقيل آرامية أو عبرانية): بتو هەر شــتێك بپەرســترێت خودا نەبێت وێنــە بێت/ پەیکەر بێتو هەر شتێکیتر/ هەموو خودا درۆزنەیەك.

(أَلصِنَمَة):١-هەموو لاســکی پــەری باڵندەکە ٢-وەی/ ئاپۆرە/ چورتوم یان مرۆڤی زۆرزان.

صنا: ١-(أَصْنــى وتَصَنَّى إِصْنــاءً وتَصَنِّياً): لای ئاگــرو مەنجەڵەکەوە دانیشــت لرفەلرف خواردنییبوو کەبابی لێئەداو گۆشتی دەبرژاندو دەیماشییەوەو تا چاومرێی خۆڵەمێشەکەیشی بوو.

الصِناء والصِنى: خۆڵەمێش.

٢-(أَصْنى- النَخــلُ): دارخورماکە براڵەی لە بنەوە دەرکرد.

(أَلصَنــو (م) صَنْوَة (ج) أَصْنــاء وصِنوان): ١-برای دایكو باوکیی ٢-کور ٣-مام.

أَلصِنْــو (م) صِنْــوَة (ج) أَصْنــاء وصِنْوان: ١-برای دایكو باوکی ٢-کور ٣-مام.

(صِنْوَة): ١-خوشــکی دایــكو باوکیی ٢-کچ/ دۆت ٣-پوور/ مەتی.

(أَلصِنْــو أَو الصُنْــو): دوو دارخورما یان پتر لە بنجێــك بێنــە دەرێ هەریەکەیان براڵەی ئەویترە.

(صِنوان وصِنيان وصُنيان وصَنيان وصَنوان وصُنوان (ج) صِنوان): دوو براڵە.

(رُكْبَتان صِنوان): دوو بیر نزیکییەکن یان بە سەرچاوەیەکن.

(أَلصَنْــوَةُ): ١-خوشــکی دایكو بــاوك ٢-کچ/ دۆت/ کەنیشك/ کیژ ٣-پوور/ مەتی/ خوشکی باوك.

(أَلصَنْوَة والصِنْوَة): براڵە.

٣-(أَلصَنْوُ (ج) صُنُوٌ): نشێوی نێوان دوو شاخ کە ئاوی پێدا بڕوات/ دۆڵ.

(أَلصَاني): کەســێکە کە بــە کارکردنەوە بە گوزارە کردنەوە بەندبێت.

(أَلصِنايَة): پاکی شتێك/ گشت شتەکە.

("أَخَــذَهُ بصِنايَتِهِ"): پاکی شــتەکەی برد/ هەموو شتەکەیبرد.

صه: ١-(صَهْ): وسبه/ قورِوقەپکە/ بێدەنگبە (بۆ نێرومێو بۆ هەموان هەروا دەوترێت).
(صَهٍ): وسبه/ کەمێك وسبه/ ئاتۆ بێدەنگ.
(صَــهَّ- القَــوْمَ): خوێشــگەلی دەمکوتکردو پێیاندا هەڵشاخا.
٢-(صَهْصَـــهَ- بالقَوم): پێیوتـــن: وس وس/ بێدەنگ بێدەنگ.
صهب: (صَهِــبَ واصْهَبَّ واصْهابَّ- الشَــعَرُ. صَهَباً وصُهْبَةً وصُهُوباً): قژەکە ســورباو یان زەردباو بوو/ مەیلەو ســوور یان مەیلەو زەرد بوو.
أَصْهَب: سووورباو یان زەردباو.
(ألصُهاب): شوێنێکە کە حوشتری بەو ناوەوە نراوە. حوشتری (صُهابي).
(ألصُهابِيّ): ١-سپیواشت/ زۆر سپی نەبێت.
(-مِن الجمال): حوشتر سوهابی.
(ألأَصْهَــب (م) صَهْبــاء (ج) صُهْــب): ١-ئاڵ/ سپیی سووورباو ٢-(ح) شێر.
(أَصْهَبُ السِبال): دوژمن.
(ألصَهْبــاء): ١-مێی وشـــەی (ألأَصْهَب) ٢-مەی (لەبەر رەنگەکەی وا ناونراوە).
(أَلمُصَهَّــب): ١-گۆشــتی بــەزدار/ چەوریـــدار ٢-گۆشتی کەمبرژاو.
٢-(ألصُهابِــيّ): ١-مشـــەو فرمبێـــتو کەمـــی نەکردبێت ٢-توندوتیژ/ سەخت.
("المَــوتُ الصُهابِــيّ"): مردنێکـــی ســـەختو گران.
(المَوتُ الأَحْمَر): مردنێکی بەکوشتەچوون.
(أَلصَيهَــب (ج) صَياهِب): ١-پیـــاوی درێژ ٢-تاوێری سەخت ٣-زەویی تەختانیی ٤-ئەوپەری گەرمیی ٥-رۆژی گەرم/ گەرمەرۆژ ٦-شوێنێك کە خۆر داخیبکاتو گۆشتی لەسەر ببرژێت.
(ألأَصْهَب (م) صَهْباء (ج) صُهْب): ساردەرۆژ.
صهــد: ١-(صَهَدَ-تْهُ الشَــمسُ صَهْداً): خۆر (داخیکرد/ سووتاندی).
(أَلصَهْدان): تیژیی گەرما/ تینی گەرما.
(أَلصَيْهَد والصَيْهُود): تیژیی‌وە تینی گەرما.
٢-(أَلصَهُود): تەنگەورە.
(أَلصَيهَد والصَيْهُود): ١-بیابانی وشكو برنگو بێژیان ٢-تراویلکەی گەرۆكو بە جووڵە.
(عِــزٌّ صَيْهُــود): نگینێکی دارێـــژراوو لەبن نەهاتوو.
صهر: ١-(صَهَرَ- الشــيءَ صَهْراً): ١-شــتەکەی توانەوە ٢-بە پیوی تواوە چەوریکرد.
(-الخُبزَ): نانەکەی بە رۆن چەورکرد.
(أَلخُبزُ الصَهير ومَصْهُور): نانی بە رۆن/ نانی چەورکراو/ نانەبەچەورە.
(صَهَرَ-تْهُ الشَمسُ): هەتاو لێیداو داخیکرد.
(-فُلانـــاً باليَمـــين): ســـوێندی گرانیـــدا/ سوێندی گەورەی پێخوارد (وەك بەو سوێندە بیتوێنێتەوە).
(إِصْطَهَرَ-الشَيءَ): شتەکەی تواندەوە.

(إصْطَهَرَ واصْهارَّ-الحَرباءُ): پشتی خۆربەرستەکە بــە تیشـکی خــۆر بریســکایەوە/ بریقایەوە/ درەخشایەوە.
(إنْصَهَرَ- الشيءُ): شتەکە توایەوە.
(ألصَهْر) (مص): ١ـتوانەوە ٢ـگەرم.
ألصُهــارَة: ١ـشــتی تواوە ٢ـمۆخی ناو ئێســك ٣ـپارچە بەزێك.
(ألصُهُوْر (ج) صُهُر): ١ـتوێنەرەوە ٢ـگۆشتبرژێن.
(ألصَهير): تواوە.
٢-(صَهَرَ-الشيءَ.صَهْراً): شتەکەی(نزیککردەوە/ هێنایە پێشەوە/ هێنایە بەرەوە).
(صاهَرَ- القَومَ وفي القَوم مصاهَرَةً): بوو بە زاوایان.
(أصْهَرَ-هُ): نزیکیکردەوەو هێنایە پێشەوە.
(-بالقَوم وإليهم وفيهم): بوو بە زاوایان.
(-الجَيشُ لِلجَيش): ســوپاکان هەندێکیان لە یەك نزیکبوونەوە.
(ألصِهْر (ج) أصْهار (م) صِهْرَة): ١ـخزمایەتی/ خوێشــایەتی/ کەســایەتی ٢ـزاوا/ مێردی کچ یان خوشك.
٣-(صَهْرَجَ-الغُرفَةَ): ژوورەکەی گەچکارییکرد/ سپیکارییکرد.
(ألصاروج): گەچو گلەســپیو ئەوەی دیواری پێ سواغدەدرێت.
(ألصِهريــج والصُهــارِج): (ج) صَهاريــج والصِهرِيّ): ١ـئەستێل/ ئەستێرك/ گۆلی ئاو/ عەماراو یان هی ئەوت ٢ـئوتومبیلو تانکەری شــلەمەنی وەك ئاوو ئەوت ٣ـگۆلو عەماراوی بە قسلْ سواغدراو (فارسية)
صهــص: (ألصَهْصَلِــق والصَهْصَليــق- مِــنَ الأصوات): نالەو گرمەی بەرزو بەهێز.
صهــل: (صَهَلَ- الفَــرَسُ صَهيــلاً وصاهِلَةً وصُهالاً): حیلاندی.
(تَصاهَلَ-تِ الخَيلُ): ئەســپەکان بۆیەکتریان حیلاند.
(ألصَهَل): بەرزییو گرپی دەنگ.
(ألصاهِــل (ج) صَواهِــل) (فا): چــارەوێ/ ئەسپ.
(الصاهِلَــةُ (ج) صَواهِــل): مێــی وشــەی (الصاهل)/ ماین.
(ألصَواهِــل): ویزەویــزی مێشو شــتی لەو بابەتانە.
(ألصُهال والصَهل): حیلەی ئەسپو ماین.
(ألصَهّال- مِنَ الخَيل): ئەسپی زۆر بەحیلە.
صَها: ١-(صَها وصَهيَ. يَصْهى. صَهْواً وصَهَىً): برینێکی تووشبوو ئاوی دەردا.
(الرَجُلُ): دارای زۆر بوو/ دەولەمەند بوو.
٢-(صَهى. صَهْياً): دانی پیر بوو.
٣-(صاهى- الدابَّةَ): ســواری پشتی ولاخەکە بوو.
(أصهى- الفَرَسُ إصْهاءً): ئەسپەکە ناوکەرێژ بوو/ هاواری پشتیکرد.

(أَلصَهْــوَة (ج) صِهــاء وصَهَوات): ١ـشــوێنی سواربوونی سوار/ ناوەراستی پشتی ئەسپ.
("إِسْتَوى على صَهْوَةِ العِزِّ"): گەیشتە شوێنی پایەی نگینیی ٢ـپاشــەوەی/ دواوەی کۆپارەی حوشتر.
(أَلصَهْــوَة (ج) صُهىً)" برجی ســەرلووتکەی شاخ.
(-(ج) صِهاد): ١ـشــوێنی نزم/ زەویی نزم کە ئاوی تێدا کۆدەبێتەوە ٢ـکانیاو/ ســەرچاوەی ئاو.
صاب: ١-(صــابَ- المَطَرُ. صَوبــاً ومَصاباً): بارانەکە دایرِشتو باری/ هاتەخوارێ.
(-الشَيءُ): شتەکە. داکەوتو بەربووەوە.
(-الماءَ صَوباً): ئاوەکەی داکرد/ رژاند.
(-هُ المَطَرُ): بارانەکەی (بەرکەوت/ لێیدا).
(-تِ السَّــماءُ الأَرضَ): ئاســمان بارانــی بــۆ زەویەکە هێناو لێیدا.
(صَوَّبَ-المــاءَ): ئاوەکەی (داکــرد/ رۆکرد) و رژاندی.
(-الإِنــاءَ): قاپەکەی لارکردەوە تا چی تێدایە بێتە خوارەوە.
(-رَأْسَهُ): سەری دانەواند.
(-المَکانُ وغَیرُهُ): شوێنەکە لێژ بوو یان شتیتر سەرەوخوار بوو.
(أَصابَ- الشــيءَ): ١ـشــتەکەی ســەرەوخوار کــردەوە ٢ـبــە شــتەکە گەیشــت ٣ـلــە بنی دەرهێنا/ هەڵیکەند.
(-تِ المُصیبَــةُ فُلانــاً): وەی و بەدبەختیــی تووشی فیسار بوو.
(-الدَهــرُ القَــومَ بأَموالِهــم أَو نُفوسِــهِم. إِصابَةَ ومُصابَةً): رۆژگار خوێشگەلی تووشی نەهامەتیی سەروماڵیکردن.
(تَصَــوَّبَ): داشــکا/ هاتەخــوارێ/ داکــەوت پێچەوانەی (تَصَعَّدَ): سەرکەوت.
(إِنصابَ- الماءُ. إِنصیاباً): ئاوەکە رۆ بوو.
(أَلصَــاب والواحِدَةُ "صابَة") (ن): ١ـدرەختی شــیرمار/ درەختێکــی تاڵــە دەڵێــن ئەگــەر بگوشــرێت شتێکی وەك شــیری لێدەردەچێت ٢ـشیلەی دارەکە.
(أَلصابَة= المُصیبَة): وەی/ ئاپۆرە/ چورتوم/ نەهامەتی.
(أَلصَــوب): بەخشــین (بــە لێچواندنــی بە باران).
(أَلصَوْب والمُصَیَّب): هەوری باراناوی.
(مَطَرٌ صَیُّوب): بارانی دارشتوو لێزمەباران.
(ألأَصْوَب): گەورەترین وەی و نەهامەتی.
(أَلمُصیبَــة (ج) مَصائِب ومَصاوِب ومُصیبات والمُصاب والمُصابَة والمَصُوبَة): وەی/ چورتوم/ ئاپــۆرە/ بــەلا/ نەهامەتیــی/ گرفتاریــی/ لێقەومــان/ چارەرەشــیو هەمــوو شــتێکی ناخۆش.
٢-(صــابَ- السَــهْمُ نَحْــوَ الرَمِیَّــة صَوْباً و

صَيْبُوبَةً): تیرەکە ڕاست ڕوویکردە نیشانەکەو پێکای.
(-السَهْمُ القرطاسَ صيباً): مەبەستەکەی پێکا.
(صَوَّبَ- السَهْمَ): تیرەکەی ئاراستەیکرد.
(-الفَــرَسَ): جڵەوی بۆ ئەســپەکە شــلکرد بڕواتو غاربکات.
(-رَأيَهُ): ڕاکەی بە ڕاست داناو پەسندیکرد.
(-فُلانــاً): پێیــوت ڕاســتیتو ڕاســتتکردو دروستیت.
(أَصابَ- السَّهْمُ): تیرەکە ئامانجەکەی پێکا.
(-الرَجُلُ): ڕاستیکرد/ باش بۆی چوو/ کاری دروستبوو.
(-الشيءَ): شتەکەی بە ڕاستو دروست زانی/ بە باشی دانا.
(-هُ بِعَينِهِ): بە چاویەوە کرد.
إِســتَصابَ أَو إِسْــتَصْوَبَ- الــرَأيَ أَو الفِعلَ. إِستِصابَةً وإِستِصواباً): ڕاکە یان کردەوەکەی بە ڕاستو چاك داناو پەسندیکرد.
(أَلصَوْب) (مص): ١-ڕاست/ دروست/ پێچەوانەی هەڵە.
("فُلانٌ مُســتَقيمُ الصَوبِ"): فیســار ڕاســت دەڕوات، لە مەبەســت لانادات ڕێگەی ڕاســت دەگرێت.
(أَلصَّواب): ١-ڕاست/ ڕاستی ٢-شایستە ٣-ماف/ هەق/ ڕەوا.
٤-(العقل والرُشــد) (عامية): ئاوەز هۆشو هەست.
("غــابَ أَوطــارُ صَوابِــهِ"): هــۆشو ئاوەزو هەستی لای خۆی نەما.
(أَلصائِب (فا) (ج) صِباب): ڕاستبین/ ڕاستڕۆ ٢-پێکەر ٣-ڕاست ٤-لەبار/ گونجاو.
(صُوَّابَة وصُيَّاب وصِيَّابَة- القَوم): کەڵەپیاوو/ جوانمەردو هەڵبژاردەو دەمڕاســتی نەتەوەو خوێشگەل.
(أَلصَويب= الصَائِب): ١-ڕاســتبین/ ڕاستڕۆ ٢-پێکەر ٣-ڕاست/ دروست ٤-شیاو.
أَلصَيُوب: دەستڕاست/ زۆرپێکەر.
(أَلمُصاب): ١-تووشبوون/ گرفتاریی ٢-تووشبوو ٣-وەی/ بەڵا/ ئاپۆرە.
(أَلمُصيــب): ڕاســتکردار/ ڕاســتڕەفتار/ ڕاستبۆچوو/ بەهەڵەدانەچوو ڕاستپێك.
٢-(أَصابَ-مِن الشيءِ): لەو شتەی بەرکەوتو وەرگرت.
(أَلمَصْــوَب): ئــاو هەڵێنج/ ئــەوەی ئاوی پێ هەڵدەیەنجێنن.
٤-(أَلصابَة): ئاوەزسووکیی/ کەمئەقڵی/ بێمێشکیی.
("في عَقلِهِ صابَةٌ"): نیمچە شێتییەکی هەیە.
(الصُوْبَــة): گردەگەنم یان هەر شــتێکی لەو بابەتە کۆکرابێتەوە.
(أَلمُصَــاب): ١-نیمچــە شــێت ٢-(ن) قامیشــی شەکر.
٥-(أَلصَوْبَج والصُوْبَج) (فارسية): تیرۆك کە

نانی پێدەكەنەوە.

الملحق:

صـــوب: (ألإصابَـــة) (مـــص): ١-تووشـــبوون ٢-بەركەوتن ئازار بەجەستە گەیشتن.

(ألإصابَة): بریندار‌بوون.

(إصابَة مميتَة): بریندار‌بوونێكی كوشـــندە/ تووشبووونی نەخۆشییەكی پەتا.

(إصابَة بِشَلَلِ الأَطفال): تووشی ئیفلیجبوونی منداڵ.

(ألإصابَة): تووشبوونێكی لەناكاو كە زیانێكی مادی یان بە لەش بگەیەنێت.

(إصابَةُ العَمَل): تووشبوون بە هۆی كارەوە.

(ألإصابَـــة في الرياضَـــة): ئـــەو حاڵـــەی كە یاركەرێك یان تیپێك وەریدەگرێت و بەدەستی دەهێنێت.

صات: ١-(صاتَ. صَوتاً): ١-دەنگی (لێوەهات/ كرد/ پەیداكرد) ٢-بانگیكرد.

(صَـــوَّتَ. تَصويتـــاً): ١-دەنگـــی لێوەهـــات ٢- بانگیكرد/ هاواریكرد ٣-دەنگیدا.

(-الطَستَ): دەنگی لە تەشتەكەوە هێنا.

(تَصويـــت): ١-دەنگـــدان/ هاواركردن/ دەنگ لێوەهاتن.

(صَوتَ- في الإنتِخابات): لە هەڵبژاردنەكەدا دەنگی بەو كەسەدا كە هەڵیدەبژێرێت.

(أَصاتَ. إصاتَـــةً =صاتَ): ١-دەنگی (لێوەهات/ كرد/ پەیداكرد) ١٢-بانگیكرد/ هاواریكرد.

(-الطَستَ): دەنگی لە تەشتەكەوە هێنا.

(إنْصاتَ): بە دەنگەوە هـــات/ وەڵامیدایەوەو هات.

("دُعيَ فانصاتَ"): بانگكراو بەدەنگەوەهات.

(أَلصَـــوْت (ج) أَصـــوات): ١-دەنـــگ ٢-هەموو جـــۆرە ئاوازێك/ گۆرانییـــەك/ هەموو جۆرە وشەیەكی دەنگ لای ڕێزماناناسان: وەك (طَق) دەنگی كەوتن و لێكدانی بەرد. تەق. یان وەك دەركردكردنـــی چوارپێیـــەك زیندەوەرێك و دەنـــگ لێكردنی بۆ تیژكردنـــی ولاخ: (هَلا): ئـــەدەی. و (عَـــدَس): بـــۆ ڕاونانی ئێســـتر: (هەچە).

(أَو للتَعَجُـــب: وَی): ئـــاە/ ئـــای/ وەی (بـــۆ سەرلێسوڕمان).

و (للتوجع كَأَخ): بۆ هاواركردنی ئازار: ئای/ ئایش/ وەیش/ ئاخ/ وای/ ئۆی.

و(التَّحَسُّـــر): بـــۆ داخخواردن: ئـــای/ ئایش/ ئەفسوس/ داخەكەم.

(أَلصات والصَيِّت): دەنگگەورە/ دەنگبەرز.

(رجلٌ صـــاتٌ وصِيْـــت وصُـــوتٌ): پیاوێكی دەنگەورەو بەرزە.

(الصِيْتَةُ): جۆر.

(أَلتَصْويت): لە هەڵبژاردندا دەنگدان.

(المِصوات): دەنگەوەرە/ زۆر دەنگدەر.

("مابالدار مِصْواتٌ"): كەســێك لە ماڵەكەدا نییە كە دەنگیبێت.

أَلْمُصَـوِّت (ج) مُصَوِتُـون: ئـەو كەسـەی لە هەڵبژاردندا دەنگدەدات.
(أَلتَصويت): لە هەڵبژاردندا دەنگدان.
٢-(أَصات-بِفُلان): قسەی شوێنخست/ قسەی بۆ هەڵبەست. كە ئەو كەسە پێی خۆشنەبوو/ ناوی زڕاند/ بەدناویكرد.
(إِنْصاتَ بِهِ الزمانُ): بەناوبانگبوو/ بە چاك ناسرا/ ناوی دەركرد.
(أَلصَوت والصَات والصِيـت والصِيْتَة): ناوو ناوبانگی باش/ ناوداریی.
(إِنْتَشَـرَ صَوتُهُ بَـينَ الناس): ناوی باشـی بڵاوبووەوە.
٣-(إِنصات-الرَجُلُ): بە بێدەنگ بە دزییەوە/ بە پەنهانی ڕۆیشت.
٤-(إِنصـاتَ- الرَجُـلُ): پیاوەكە چەمیوە كە خۆی ڕاستكردەوەو قنج بووەوە.
صاج: (أَلصَّاج) (تركية): ساجی نانكردن.
(أَلصُوجَة) (ن): پاقلەی سویا؛ جۆرە گیایەكی كشتوكاڵییە لە پاقلە دەچێت لە یابانو صینو هند دەچێنرێت، پەلی گەڵاگری بە سێ گەڵای ورد دێت گوڵەكەی وەنەوشەیی یان پەمەیی یان سـپییە لە ئاردەكەی نان بۆ ئەوانە دەكەن كە شەكرەیان هەیە چونكە نیشاستەی تێدا نییە لـە ناوەندی ئەوروپاو ڕوسـیاو ئەمەریكایش دەروێنرێت (ڕۆنیشی لێدەردەهێنرێت).
صاح: ١-(صاحَ-هُ صَوحاً): قلێشاندی.
(تَصَـوُّحَ): قلێـش/ قلێشـبوو/ شـەقار/ شەقاربوو.
(إِنصـاحَ. إِنْصياحـاً): قلێشـا/ شـەقاربوو/ شەقیبرد/ قاشبوو.
(إِنْصـاحَ- الفَجرُ): سـپیدەیدا ڕووناكبووەوە (لە شەقبوونی تاركییەوەیە).
٢-(صَوَّحَ- البَقلُ): سەوزەكە وشكبوو.
(-تْـهُ الشَـمسُ أو الريـحُ): خۆر یان با وشـكی كردەوە.
(تَصَوَّحَ): وشكبووەوە/ وشكهەڵات.
(أَلصاحَة): زەوییەك كە هیچی لێنەڕوێت.
(أَلصُـوَاح): تـۆو نێـرەی دارخورمـای وشكەوەبوو.
أَلصُوْحان: وشك/ وشكبوو.
٣-(أَلصَـوْح والصُـوْح): (١-ڕۆخـی قەراغی) ڕووبار ٢-دامێنی چیا/ كێو/ شاخ.
أَلصُوَاح: ئارەقی ئەسپ.
صـاخ: (صـاخَ-فِي الأَرضِ. صَوْخـاً): چووە زەوییەكەوە.
(أَصاخَ-لَهُ وإِلَيهِ إِصاخَةً): گوێی بۆ شـلكرد/ گوێی لێگرت.
("أَصـاخَ عَن كَذا"): لێیگەڕاوە/ پاشەكشـەی لێكرد.
("أَصاف علـى حَقِّ فُلان"): لە مافی فیسـار بێدەنگبوو كە بیبات.
(أَلصاخَـة (ج) صَـاخ وصاخـات): ١-وەی

پاپۆرره/ بەلا ٢-شوێنی بەرکەوتن بە ئێسقاندا شوێنزەبری سەرئێسك.
(بَلَدٌ صُوَّاخ): شـوێنێك یان شـارێك سستەك بێت قاچی تێدا بچەقێت.
صـود: (الصُودْیُوم) (ك): تەنێکی سـادەیە سـپییەکی زیوییـە نەرمەلیقەیـە/ نەرمە کارلێکێکی کیمیایـی بەهێزە لە پێکهاتەکانی خوێی چێشـتەو کاربۆناتی سـۆدیۆمە کە لە شـتندا بەکاردێـتو بیکاربۆناتی سـۆدیۆمە کـە لە تەمەڵیی گـەدەدا بەکاردێتو نێتراتی سۆدیۆمە کە پەینی کیمیاییە.
صار: ١-(صارَ. صَوراً): دەنگی لێوەهات.
("صَوَّرَهُ بِصَوتِهِ") (عامیة) (سریانیة): بە شیرەی بەرزی کەریکرد.
(أَلصُوْر (مو): ١-کەرەنا/ شەیپور/ شاخنەفیل ٢-(مو) بۆری ئەوانە (فویان پێدادەکرێت).
٢-(صارَ- الشيءَ صَوراً): شتەکەی (لارکردەوە/ خوارکردەوە) وەرگێرا.
("صارَ عُنُقَهُ أَو وَجْهَهُ إِلَيَّ"): ملی یان ڕووی بۆ لای من وەرگێرا ٢-شـتەکەی بەلای خۆیدا (وەریگێرا/ لارکردەوە).
"صـرْتُ الغُصْـنَ لأَجتَنِيَ الثَمَـرَ": لقەکەم خوارکـردەوە تـا میوەکـەی/ بەرەکـەی لێبکەمەوە/ بچنم.
(صـارَ-هُ یَصـیرُهُ. صَـیراً): خواریکردەوە/ لاریکردەوە.

(صَوِرَ. یَصْوَرُ. صَوَراً): لاربووەوە/ وەرگەڕا/ ڕووی وەرگێڕا/ ڕووی تێکرد.
أَصْوَر: ڕوو وەرگەڕاو/ لارەوە بوو ڕووتێکەر.
("هو أَصْوَرُ الی کذا"): ئەو ڕووی یا ملی بەلای ئەوەدا وەرگێڕاوەو ڕووی کردۆتە ئەو.
(أَصارَ-هُ): ١-لایدا/ لاریکردەوە خواریکردەوە ٢-ڕماندی.
(تَصَوَّرَ- الرَجُلُ): کەوت/ ڕما یان خواربووەوە خەریکبوو بکەوێت.
("طَعَنَهُ فَتَصَوَّرَ"): شیرێکی یان تبغێکی پێدا کردو کەوت یان خەریکی کەوتنبوو.
(إِنْصارَ. إِنْصیاراً): لاربووەوە یان ڕما.
(أَلصَوْر (ج) صِیران): لامل/ ڕووی گەردن.
(أَلصَوَر): (مص): خواریيو کەچیی.
(فِي عُنُقِهِ صَوَرٌ): ملی خوارە/ ملی (کەچیی/ خواریی) تێدایە.
(أَلصَـوْرَ): جارێك ١-خواربوونەوە/ وەرگەڕان ٢-ڕمان ٣-لاریی کەچیی.
(أَلأَصْـوَر): لارەوە بـوو/ کەچبوو لار/ کەچ/ خوار.
٣-(صارَ-الشَـيءَ صَوراً): بـڕی/ لەتیکردو/ لەتیکردو کەرتیکرد/ جیایکردەوە.
(صَـوَّرَ-هُ): وێنـەی کێشـاو شـێوەیدایەو نیگارکێشیکرد/ وێنەی دایە.
(صَوَّرَ-لـي): وا هات بە مێشـکمدا/ وا هاتە بەرچاوم.

(تَصَوَّرَ-الشَّــيءَ): گومانی بۆ شــتەکە بردو هێنایە بەرچاوی خۆیو بیری لێکردەوە.
(-لَهُ الشــيءُ): وێنەو شــێوەی شــتەکە هاتە بەرچاوی/ تێیگەیشتو بۆی دەرکەوت.
(ألصُــورَة (ج) صُــوَر وصِــوَر وصُــوْر): ١. وێنە/ شــێوە ٢-هەرچی وێنەی بکێشرێت یان بگیرێت یان بهێنرێتە بەرچاوو بە بیردا بێت ٣-نیشانە/ سیفەت.
(صِورَةُ الأَمرِ كذا): شــێوەو نیشانەی کارەکە ئاوایە ٤-جۆر/ چەشن ٥-ڕوو/ بارو چۆنیەتیو وێنە.
(صُــورَةُ العَقلِ كذا): بارو چۆنیەتیو وێنەی مێشك ئە ئاوایە.
(ألصُــورَة) (فــك): کۆمەڵە ئەســتێرەیەکن شــێوەیان بە جۆرێکی دیــار دەزانرێت بەوە دەدۆزرێنــەوە. ژمــارەی ئەو جــۆرە کۆمەڵە ئەســتێرەیە (٨٩)ن لــەلای ئەستێرەناســانی عەرەبو بتلیمۆس (٤٨) بوون.
(ألصَيِّر): شێوە جوانو شیرین.
(رَجلٌ صَيِّرٌ شَــيِّرٌ): پیاوێکی شــێوە جوانو شیرینو نیشانە جوانە.
(ألتَصَوُّري): پسپۆڕی هونەری گەڕان بە دواو لێکۆڵینەوەی هزرو هێنانە پێشچاو.
(ألتَصْويــر) (ف ج): هونــەری بەرەنــگ وێنەکێشانی شتو کەس.
(ألتَصْويرُ الشَمْسي= التصوير الفوتوغرافي): وێنەگرتنــی هەتــاوی چەســپاندنی وێنەی کەســەکانو شتەکان لەســەر ڕوویەکی فلیمی وێنەگرتن کە ڕووناکــی زوو کاری تێدەکاتو فلیمەکە لە جێیەکی تاریکدایە کە بەشــێکی ئامێری وێنەگرتنەکەیە.
(آلَــةُ التَصوير= جهاز للتصوير الشمســي): ئامێری وێنەگرتن/ کامێرە.
(ألتَصويرَة (ج) تَصاوير): پەیکەر.
(أَلمُصَوِّر) (فا): وێنەگر.
(مُصَوِّرُ الكائنات): خودا.
(أَلمُصَوَّر أَو المُصَوَّرُ الجُغرافي): نەخشەی جوگرافی.
٤-(ألصَور (ج) صِيران وأَصْوار): دارخورمای بچووك.
(- (ج) صِيران): کەناری ڕووبار.
(ألصارَة- مِنَ الجَبَل): لوتکە یان ســەرەوەی شاخ.
(صارَهُ المِسْكِ): قاپ یان شووشەی مسك.
(الصَورَة): خوراندنی سەر تا خورووی دەشکێت.
(الصُــوار والصِــوار (ج) صــيران): ١-گاگەل ٢-بۆنی خۆش ٣-کەمەکێك مســك ٤-شووشەی بۆنی مسك.
(ألصَوَّار): گاگەل.
(ألصِيار (ج) صِيران): گاگەل.
الملحق:
صور: (ألصُوَرِيّ): ڕووکەش: دیمەنشێوە.
("وَعــدٌ صُــوَرِيٌّ"): گفتێکی ســەرزارەکی/

بەرواڵەت.

(إحْتجاجٌ صُوَرِي"): بیـزاری دەربڕینێکی ڕواڵەتی.

(ألصُّوَرِيّ) (ا ع): ناڕاسـت/ دروسـتکراو/ ڕووکەش/ بە درۆخستنە بەرچاو/ ڕواڵەت.

(مَعْرَكَـةُ صُوَرِيَّـة): بەیەکـدا دانێکـی بە ڕواڵەت.

(ألتَصَوُّر): هێنانە بەرچاوو ترسەخولیا.

(ليس ذلك سوى تَصَوُّرات): ئەوە تەنها ترسە خولیاو هێنانە بەرچاو/ خەیاڵە.

(ألتَّصَور): وێنە هێنانە مێشکەوە.

(ألتَصَوُّر- فِي الفَلْسَفَة): لە فەلسەفەدا ئەوەیە هەموو واتاکان تێبگەیت و بیزانیت کە چییە وەکو واتای تەواوی وشەی درەخت تێبگەیت. بـە وتەنەکەی، پێچەوانـەی ئەوە ئەوەیە کە بەهەست تێبگەیت کە درەخت چییە.

(ألتَصَوُّرِيَّة فِي الفَلْسَـفَة): ئەو ڕێڕەوەیە کە دەڵێت ئەو گشتە ڕاستیانەی کە بە هەستەکان نازانرێـن تەنهـا لە مێشـکدا هـەن و بە بیر پێیدەزانرێن.

(ألمُصَوِّرَة): ئامێری وێنەپێگرتن/ کامێرە.

---

صـوص: (ألصُّـوص): ١-بەدزمـان/ ناپاک/ موخەنـەت ٢-ڕژد بەرچاوتەنگ. بە دزییەوە دەخوات ئەوەکو میوانەکەی چاوی لێبێت.

(-عنـد العامة): جوجك كە تـازە لە هێلکە بێتە دەرەوەو جووکە جووك بکات.

(فصيحـة: القـوب): زمانـە ڕاسـتیەکەی (القوب)ە.

(صُـوص البـاب): گرێژەنـەی دەرگـا هی سەرەوەی پێیدەڵێن (ألصَمخ).

صـاع: ١-(صاعَ. الحَبَّ صَوعاً): دانەوێڵەکەی پێوانەکرد/ پێوا.

(الصاع (ج) أصواع وأَصْوُع وأَصْوُع صيعان): پێوانەی دانەوێڵە/ ربە.

(مَبذَر صاع مِن الحَب): شـوێن وەشێنی ربە گەنمێك یان جۆیەك یان هیتر.

(ألصَوْع والصُوْع (ج) أَصْواع. وأَصْوع وأصوُع وصُوع وصِيْعان): پێوانە.

ألصُـواع والصِـواع (ج) صيعـان: جامـی پێخواردنەوە.

٢-(صاعَ- القَومُ. صَوْعاً): خوێنگەل پەلاماری یەکتریاندا.

(-الشـيءَ): ١-شتەکەی نوشـتانەوەو لوولیدا ٢-جیایکردەوە.

(-القَومَ): بۆ خوێنگەل لەملاولاوە هاتن.

(-النَحلُ): هەنگەکان شوێن یەکتری کەوتن.

(-الرَجلَ): پیاوەکەی ترساندو تۆقاند.

(تَصَـوَّعَ): ١-جیابـووەوە/ ٢-دوورکەوتـەوە ٣-بلاوبووەوە.

(الشَـعَرُ): قژەکە مێخۆرکە تێیداو کرژ بوو/ چووە یەك.

٣-(صَـوَّعَ- لِلقُطنِ مَوْضِعاً): شـوێنێکی بۆ

شیکردنەوەی لۆکەکە ئامادەو چاککرد.
(ألصاع): شوێنێکە گەسکدەدرێتو یاری تێدا دەکرێت.
(ألصاعــة): شــوێنی تەکاندنی خــوری یان لۆکە.
("إتَّخِــذ لِصوفِــكَ صاعَــةً): بــۆ تەکاندنی خورییەکەت شوێنێك ئامادە بکە.
(صَوَّعَ-تِ الريــحُ النَّباتَ): باکە ڕووەکەکەی (هێناوبرد/ ڕاوەشاند).
(-الطائرُ برأسِهِ): باڵندەکە سەری ڕاوەشاند.
(-الفَرَسُ): چارەوێکە سەریهەڵگرت.
("صَــوَّعَ بِــهِ فَرَسُــهُ"): چارەوێکــەی سەریهەڵگرتو لە سوارەکەی یاخیبوو.
(تَصَــوَّعَ -النَّباتُ): ڕووەکەکە شــپرزە بوو/ ڕاوەشا.
٥-(صَوَّعَ- الشَيءَ): نووکی شتەکەی دیاریکردو لە تەنشتەکانی بنەوە خولیدا.
٦-(إنصــاعَ. إنصياعــاً): ١-زوو گەڕایــەوە ٢-تێپەڕی ٣-ملیدا/ گوێڕایەڵیکرد.
٧-(ألصَــاعُ): ١-داردەســت یــان گۆچــان ٢-ناوەڕاستی تەختی سنگ.
(ألصاع والصاعَة): زەویی نزمو تەخت.
صاغ: ١-(صاغَ الماءُ): ئاوەکەینشت.
٢-(صاغَ-الشَــيءَ. صَوغــاً): شــتەکەی قاڵبڕێژکرد. لەسەر شێوەیەك تەواو دایڕشت.
(-الكَلِمَةَ): بە پێی دەستوور وشەکەی لەسەر وشەیەکیتر دارشت.
("صــاغَ الــكلامَ"): قســەکەی هەڵبەســتو دارشتو درۆی تێداکرد.
(-اللهُ فُلانــاً صيغَــةً حَسَــنَةً): خــودا بــە شێوەیەکی باشو جوان فیساری دروستکرد.
("صيغَ علــى صيغَتِهِ"): وەك ئەو/ لەســەر شێوەی ئەو بەدیهێنراوەو دروستبووە.
(صاغَ-الشيءَ. صيغَةً وصياغَةً وصَيْغوغَةً): شتەکەی دارشت/ قاڵبڕشتیکرد.
(إنْصاغَ. إنْصياغاً): دارێژرا.
(ألصَوْغ) (مص): ١-دارشتن.
(ألصَوْغ): بە سکێك بوون یان بەرووددوا بوون.
("هــو صَوغُ أَخيــه"): لەگــەڵ براکەیدا بە ســکێك بــوون یان لــە دوای براکــەی بووەو پاشهاتوویەتی هیچیان بە نێواندا نەهاتووە.
("همــا صَوغــانِ"): هاوتەمەنــی یەکــن/ لەدایکبووی کاتێکن.
("هذا صَوغُ هذا"): ئەمە ئەوەندەی ئەوەیە.
(ألصَوْغَةُ): جارێك دارشــتن یان دروستکردن یان بەدواداهاتن یان پێکەوە بە سکێکبوون.
("هو صَوغَةُ أَخيهِ"): ئەو لەگەڵ براکەیدا بە سکێکبوون یان پاشهاتووی براکەیەتی.
(الصائِغ (فــا) (ج) صاغَة وصُيَّاغ وصُوَّاغ): زێڕنگەر زیوگەر کە خشڵو قاپ لە زێڕو زیو دروستدەکەن.
("هو مِن صاغَةِ الكلامِ"): ئەو قسە دارشتو

رازێنــەرەوەو جوانكردیەتــی/ ئەو لە قســە داڕێژەرانە.

(اَلصِیْغَــة (ج) صِیَــغ): ١-جــۆر/ چەشــن ٢-(دارشتە ٣-شێوە ٤-بنەچە.

("هو مِن صیغَةٍ كَریمَة): ئەو لە بنەچەیەكی ڕەسەنە/ بنەچەكەی ڕەسەنە/ خانەدانە.

("صیغَةُ الأَمرِ كذا وكذا"): شــێوەی كارەكە واو وایەو وا داڕێژراوە.

(اَلصیغَــة) (ف. ج): ١-مادەیەكی دیاریكراوی وێنەگرتنــەو كــە جــار لــە دوای جــار بەكاردەهێنرێت ٢-خشڵی لە زێڕو زیوو شتیتر دروستكراو (عامیة).

(اَلصیاغَة): زەڕەنگەریی‌و زیوگەریی.

(اَلصَوّاغ والصَیّاغ والصَیِّغ): درۆزنێك كە بە درۆو قسەكانی بڕازێنێتەوە/ زمانلووس.

(اَلمَصاغ): خشڵی دروستكراو/ داڕێژراو.

٣-(صاغَ- لَهُ الشَــرابُ صَوْغاً): شەربەتەكەو خواردنەوەكــەی لــەلاو بــە دەم خۆشــبوو، پێیشادبوو.

صاف: ١-(صافَ- عَن كَذا صَوفاً): لەوە لایدا.

(-السَّــهْمُ عَنِ الهَدَفِ): تیرەكە لە نیشــانەكە لایداو نەیپێكا.

(أَصافَ-هُ): خواریكردەوە/ لایدا/ لاریكردەوە/ كەچیكرد.

٢-(صــافَ وصَوِفَ. یَصُــوفُ- الكَبشُ. صَوْفاً وصُؤُوفاً وصَوَفا): بەرانەكە خوریی زۆر بوو.

(أَصْوَف): خوریدار/ بە خوریی/ خوریی زۆر.

(اَلصُوف (ج) أَصْواف للشــاء): خوریی مەڕ/ پەشم.

(اَلشَعر للمَعزی): مووی بزن.

(الوَبر لِلإبل): (كوڵكی/ تووكی) حوشتر).

(صوفَة): تۆپەڵە خورییەك.

("أَخَذَهُ بِصوفِ رَقَبَتِهِ"): پشــتی ملی گرت‌و بە زۆر بردی.

("أعطــاهُ إیاهُ بصوفِ رَقَبَتِــهِ"): بە خۆی‌و بەرییەوە دایە یان بە خۆرایی دایە.

("خَرقاءُ وَجَدَت صُوفاً"): گەوجە نافرەتێك خوریی دەستكەوتووە. بە گەوجێك دەڵێن كە سامانێكی هاتبێتە دەست‌و لە دەستی بدات.

(اَلصَوّاف): خوریفرۆش.

(اَلصَــاف والصَــافِي والأَصْــوَف والصَائِف): خوریدار.

(اَلصوفانُ (م) صَوْفانَة): خاوەنخوریی زۆر.

(اَلصَوف والصُوفانِيّ): خوریدار/ فرەخوریی.

(جُبَّــةٌ صِیِّفَــة): جبەیەك كــە خوریی زۆر تێدابێت.

٣-(صَوَّفَ-هُ): كردی بە سۆفی.

(تَصَــوَّفَ): ١- بــوو بــە ســۆفی ٢-ڕەفتــاری سۆفیانەیكرد.

(اَلصُوْفِیَّة): سۆفیەتی. ســۆفیگەریی/ تاقمە خواپەرستێكن.

(اَلصُوفي): ســۆفییەك، لای ئەوان كەسێكە كە

خۆی له خوداپەرستیدا بفەوتێنێت و بۆ خودا بژی و هەمیشە پەیوەندو بەندی ڕاستیی و هەقیقەتبێت که خودایه.
٤-(ألصوفان الواحدةُ صوفانة): پووشوو که له کورۆکی دار دەردەهێنرێت. و نەرم وشکه ئاگری پێدەکرێتەوە.
(قُطْرُ الصُوفان): جۆره قارچێکه که لەسەر قەدی دار دەروێت و پووشووی لێپەیدا دەکرێت و دەردەهێنرێت.
الملحق:
صوف: (ألصوفِيّ): له خوری دروستکراو وەك خوری.
(نَسيجٌ صوفِيّ): ١-چنراوێك که له خوریی دروستکرابێت ٢-شوێنکەوتووانی سۆفیەتی/ سۆفی.
(ألتَصَوُف): ١-خوریی پۆشین/ لەبەرکردنی بەرگی خوری ٢-بوونه سۆفی/ سۆفیگەریی. ڕێگەیەکه کۆمەڵه خوداپەرستێك له خوداپەرستیدا دەیگرێت. له خۆشی و چێژی دنیایی دوور دەکەوێتەوەو خۆی له هەموو خراپەیەك و لەکەیەك دەپارێزرێت و ڕەوشتی بەرز دەبێت تا بەوە دەروونی پاك بێت و گیانی بەرزو پیرۆز بێت.

---

(صاق: (صاقَ- الدابَةَ): وڵاخەکەی دایه پێش و لێیخوری.
(ألصاقُ والصُوْقُ والصُوَيقُ= الساقُ والسوقُ والسويق): وەپێشدان و لێخورین.
صاك: (صاكَ- بِهِ الزَعفرانُ والمِسْكُ ونَحْوَهُما): زەعفەران و بۆنی میسکی (پێوە بوو/ گرت).
(تَصَوَّكَ- في رَجيعِهِ وبرَجِعِهِ): خۆی له بۆمچکی ئارەق و پیسی هەڵکێشاو پێوه لکا.
صال: (صالَ- عَلَيهِ صَوْلاً وصَوْلَةً): لێراپەڕی و هەڵیکوتایه سەری.
(-عَلَيهِ. صَوْلاً وصِيالاً و وصالاً و صُؤُولاً و صيلاناً ومَصالَةً): چووه سەری، پەرماریداو بەسەریدا زاڵبوو.
(صاوَلَ- هُ. مُصاوَلَةً وصِيالاً وصِيالَةً): له یەکتری ڕاپەڕین و پەلاماری یەکتریاندا/ بەگژیەکداچوون.
(تصاوَلا): لەیەك ڕاستبوونەوەو بەگژیەکدا چوون.
(ألصَّولَة): ١-لێراپەڕین/ له یەك ڕاستبوونەوە ٢-زاڵبوون و بەزاندن ٣-دەسەڵات/ هێز ٤-له شەڕدا هەڵکوتانەوەسەرو پەلاماردان.
("لَقيتُهُ أوَّلَ صَولَةٍ") یەکەم بەرەنگاربوونەوە پێیگەیشتم و لووتم بە لووتیەوە بوو (ئیدۆم)/ ڕووبەڕووی بووم.
(ألصَؤُول- مِنَ الرجال): پیاوی درو دەستدرێژیکەری ئەم و ئەو/ به زەبروزەنگ بەرامبەر به خەڵك.
٢-(صِيلَ- لَهُ الأمرُ): کارەکەی (بۆ ڕەخسا/

بۆ هەڵكەوت).
٣-(صَوَّلَ- البَيدَرَ): دەوروپشتی خەرمانەكەی گەسكدا.
(-الشيءَ): ١-شتەكەی بە ئاو پاككردەوە خستيە ئاوەوە وەك چۆن گەج لە ئاودا دەتوێنرێتەوە ٢-پوختەيكرد ٣-بە ئاو گڵەكەی لێشتەوە وەك چۆن گەنم قورمشۆردەكرێت و بە ئاو دەشۆرێتەوە.
(صَوْلَةُ – الحُنطَةِ): گەنمی بە ئاو شۆراوە.
(اَلصُوالَة): ١-گەسكدانی ئەملاولای خەرمان ٢-ئەوەی بە ئاو لە گەنم رادرابێت و وەكو پووش و پەڵاش و شتیتر.
(التَصويل): پاككردنەوەو شتنەوەی گەنم و دانەوێڵە.
(اَلمِصْوَل (ج) مَصاوِل): تاسێك كە گەچی تێدا دەتوێننەوە.
(اَلمِصْوَلَة): گەسكێك كە شوێن خەرمان و دەوروبەری پێ پاكدەكەنەوە.
صام: ١-(صامَ. صَوْماً و صِياماً): بە رۆژوو بوو يان وازهێنان و مانگرتن لە خواردنەوەو خواردن لە قسەو رۆيشتن و شتیتر گرتەوە.
(صائِم (ج) صائمون وصُوَّام وصُيَّام وصُوَّم وصُيَّم وصِيام): رۆژووەوان بە رۆژوو يان وازهێناوو مانگرتووی خواردن و خواردنەوەو قسەو رۆيشتن و شتیتر.
(صامَ- الشَّهرَ): مانگەكە بە رۆژوو بوو.

(صَوَّمَ-هُ): بە رۆژوويكرد/ رۆژووی پێگرت.
(إصْطامَ): بەرۆژوو بوو/ رۆژوويگرت.
(اَلصَوم (مص) (ج) أصْوام): ١-خۆگرتنەوە لە كارێك و نەكردنی ٢-دەمگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە لە كاتی دياريكراودا/ خواردن نەخۆيت و نەخۆيتەوە وشەی (صَوم) بۆ هەموان بۆ نێرو مێ و تاك و جووت و كۆ بەكاردێت دەوترێت.
(هو صَوم وهِيَ صَومٌ وهُم صَومٌ): بەو جۆرە. ئەو بە رۆژووە ئەو ژنە بە رۆژووە. ئەوان بە رۆژوون. رۆژوو لای عيسايیەكان نەخواردنە لە نيوەشەوەوە تا نيوەرۆ كە دەڵێن: (اَلنَصراني في صَومِهِ/ بَيعَتِهِ"): ديانەكە لە پەيرەوكردنی ملداندايە بۆ ئاينەكە.
(شَهرُ الصَّوم): مانگی رەمەزان.
(اَلصَوام- مِنَ الأَراضي): زەويی وشك و برنگ و بێئاو.
(اَلصَومانُ (ج) صَيامی): رۆژووەوان.
(اَلصائِم): كەسێكە دەم لە خواردن و خواردنەوە بگرێتەوە.
(يَومٌ صائِم): رۆژێكی رۆژووگرتن.
(ماءٌ صائِم): ئاوێكی مەنگ و وەستاو.
(الصائِمَةُ مِنَ الخَيل): ئەسپێك بۆ خۆی بلەوەرێت و ئاليك و ئاوی نەدەنی.
(اَلصَوَّام): كەسێكە زۆر بە رۆژوو بێت.
"هو صَوَّامٌ قَوَّامٌ": ئەو بە رۆژ بە رۆژووەو بە

شەویش بۆ خوداپەرستی هەڵدەسێت.
٢-(صامَ- النَّهارُ. صَوْمــاً وصِياماً): ڕۆژ بوو بە نیوەڕۆ.
(-تِ الشَــمسُ): خۆر گەیشــتە ناوەڕاســتی ئاسمان.
(-تِ الريحُ): باکە (کپبوو/ کەوت).
(الصائِمَةُ- مِنَ السَــكاكين): چەقۆی کول کە هیچ نەبڕێت.
(الصائِمَةُ- مِنَ البكرات): چەرخی پەککەوتەو لە خول وەستاو کە نەسووڕێتەوە.
(مَصــامُ ومَصامَةُ الفَــرَس): جێوەســتانی چارەوێ.
("جِئتُهُ والشَّمسُ مَصامِها"): هاتمە لای خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماندا بوو.
٣-(صامَ واصْطامَ النَعــامُ. صَوْماً و صِياماً): حوشترمرخەکە ڕیقنەکەی (فرێدا/ کرد).
(صومُ النعام): ڕیقنەی حوشترمرخ.
٤-(صامَ واصطــامَ مَنِيَّتَهُ. صَوْماً و صِياماً): مەرگی (نۆشی/ چەشت) بە مەرگ گەیشت.
٥-(صَومَعَ- الشــيءَ): شتەکەی (گردکردەوە/ کۆکردەوە).
٦-(صَومَــع- البِنــاءَ): خانەکــەی/ بیناکەی بەرزکردەوە/ هەستان.
(اَلصَومَع (ج) صَوامِع):١-پەرستگا لە شوێنێکی بــەرزدا/ لە شــاخێکدا هی خوداپەرســتێك/ پارســایەك کە تیایدا دەژیو خوداپەرســتی خۆی تێدا دەکاتو دەیەوێت گۆشــەگیر بێت/ خەڵوەتگا ٢-کلیسەی دیان.
الصَومَعَةُ (ج) صَوامِع= الصَومَع: ١-پەرستگای گۆشــەگیر/ خەڵوەتخانــە ٢-پۆپەیەکی تیژی شــاخێك ٣-(ح) هەڵۆ. چونکە لــە بەرزترین لوتکەدا هێلانە دەکات.
٧-(اَلصَومَعَةُ (ج) صَوامِع= البُرنُس): هەموو بەرگێکی ئاودامان کە کڵاوی پێوە دورابێت.
٨-(صَومَــلَ- الرَجُلُ): پیاوەکە لە برســاندا پێستی بەسەر ئێســقانیەوە وشکبووبێتەوە/ پیاوی وشکهەڵاتووی برسێتی.
صــانَ: ١-(صانَ واصْطــانَ-هُ. صَوْناً وصِياناً وصِيانَةً و اصطِياناً): پاراستی.
(مَصُون ومَصْوُون): پارێزراو (ئەمەی دواییان دەگمەنە).
(صــانَ- الثَــوبَ أَوِ العِــرضَ): بەرگەکــە یــان ناموســەکەی پاراســتو لەکــەی لــێ دوورخستەوە/ لە لەکەو نەنگیی پاراستی.
(تَصَــوَّنَ- هُ): پاراســتنو ئاگادارییــی گرتــە ئەستۆی خۆی.
(تَصَــوَّنَ وتَصــاوَنَ- مِنَ العَيــبِ): خۆی لە خەوش و نەنگی پاراست.
(اَلصَــوان والصِــوان والصُــوان والصِيــان والصُيَان والصَيــان (ج) أَصْوِنَة): ئەوەی کە بــەرگو کتێبی تێــدا دەپارێزرێت/ کەنتۆرو دۆڵاب.

(أَلمَصَانُ والمِصْوان): بەرگی کەوانو شتیتر.

(أَلتَصْوينَــة): دیــواری دەرەوەی خانوو یان پەرژینی باخو بێستان.

(الصَّوانــة) ١-بــەرده نەســتێ کــە ئاگــری پێدەکەنەوە ٢-کلێسە.

الملحق:

صون: (أَلصِّيانَة): پارێزگاریی‌و پاراستن.

(صِيانَة المحاصيل): پارێزگاریی بەروبووم.

(أَلصيانة): سەرپەرشتیی کردنی هەمیشەیی دامەزراوەکانو بیناکانو ڕێگەوبان کەلوپەلی ئامادەکراوو چاکسازییانو هەرچی پێویستبێت بۆ بــاش بەکارهێنانیان بکرێتو چاودێرییان بکرێت.

(مَصلَحَةُ الصِيانَة): بەرژەوەندیی پاراستنو چاکسازیی.

(أَعمال الصيانَة): کاری پاراستنو چاکسازیی.

---

صوّ: (أَلصَوّ): بۆش/ بەتاڵ/ چۆڵ.

("إِناءٌ صَوٌّ"): قاپێکی بۆش.

أَلصُــوَّة (ج) صُوىً و (جج) أَصواء): ١-دەنگی دەنگدانەوە ٢-هەڵــەت/ زەویی ڕەقەنو بەرز ٣-بەردی نیشانەی ڕێگا.

(أَلصُــوَّةُ البَحرِيَّة= العَوامَة= الشــمندورة): تەنێکە بەســەر ئاوی دەریاوەیە/ نیشــانەی ڕێی ناو دەریایە/ ڕێی پاپۆڕە یان ئاماژەیە بۆ شوێنە مەترسییەکانی دەریاکە.

(أَلصُوى والأَصْواء): گۆڕستان/ گۆڕەکان.

صوى: (صَوَى وصَوَّى وأَصْوَى- النَخلُ. صُوِيّاً وتَصْوِيَةً وإِصْواءً): دارخورماکە وشکبوو.

(نَخلٌ صَوِيٌّ وصاوٍ): دارخورمای وشکبوو.

(-الضَرْعُ): گوانەکە وشــکهەڵاتو شیری تێدا نەما.

(صاوٍ): گوانی وشکهەڵاتو بێشیر.

(صَوِتُ فُلانٍ يَصوِي): (عامية ســريانية): دەنگی فیسار کزو زیکن دێتە گوێ.

صَوِيَ- النَخلُ صَوىً: وشکبوو.

نَخل صَوِيٌّ وصاوٍ: دارخورمای وشکبوو.

-الضَرعُ: گوانەکە وشکهەڵاتو بێشیر بوو.

صاوٍ: گوانی وشکهەڵاتوو.

(صَوِيَ- الرَجُلُ): بەهێز بوو.

(أَبو صُوَيٍّ أَو الصَــرَّارَة) (ح): بایەقوش: کە دەخوێنێت دەڵێن مار لە دەنگەکەی دەترسێت لەبەرئــەوە ناونراوە دەنگــەوەرە. دەنگەکەی زۆر ناخۆشە.

صابَ: ١-(صابَ. صَيباً ):١-ڕاستیکرد ٢-ڕاستیوت ٣-ڕاست ئەنجامیدا/ ڕاستبوو.

(صائِب): مرۆڤی ڕاست.

(صابَ-ُ السَّهمُ): تیرەکە پێکای/ ئەنگاوتی.

(سَــهْمٌ صَيُــوب (ج) صُيُــوب): تیرێکــی ڕاستڕۆیشتوو/ پێکەر.

٢-(الصُيَّاب والصُيَــاب والصُيابَة): ١-نایاب/ ناویزەی هەموو شــتێك/ پوختەو ســەرگوڵ ٢-هەڵبژاردەی هەموو شتێك.

("هوَ مِن صُیَّابِهِم"): ئەو لە هەڵبژاردەکانیانە.
(ألصُیَّابَــةَ= الصُیَّــاب): ١-ناێزەو ســەرگوڵو هەڵبژاردە.
("هو مِن صُیابَتِهِم"): ئەو لە هەڵبژاردەکانیانە ٢-سەرومر/ گەورە.
("هــو صُیابَــةُ قَومِــهِ"): ئــەو ســەرومری نەتەوەکەیەتی.
(صُیَّابَــةُ القَــوم): کۆمەڵــەو دەســتەی خوێشگەل.
صاح: ١-(صــاحَ: صَیْحاً وصَیْحَــةً وصیاحاً وصَیَحانــاً): تونــد (هاواریکــرد/ قیژاندی/ زریکاندی).
(-بِهِ): بانگیکرد/ هاواری لێکرد.
(-عَلَیــهِ): خــراپ دەنگی لێکرد/ بەســەریدا (گرماندی قیژاندی)/ پێداهەڵشاخاو شکاندی.
(-عَصافیرِ بَطنِهِ): برسیبوو لە برساندا سکی قۆرمیهات.
صِیحَ- بِهِم: تۆقین/ راچڵەکین.
(-فیهِم): فەوتان/ مردن.
(صَیَّحَ): کردی (بە گرمەگــرم/ هاوارهاوار) قیژاندی.
(صایَحَ- القَومُ): هاواریان لە یەکتر کرد.
(-بِهِ): بانگیکرد.
(تَصایَحَ- القَومُ): هاواریان لەیەکتریکرد.
(ألصَّیح): قیژە/ هاوار.
(ألصَیحَة): ١-هاوارێــك/ دەنگکردنێك ٢-فوو بە کەرەنای زیندووبوونەوەو حەشر ٣-ئازار/ ئەشکەنجە ٢-شــەبەیخوونێك یان پەلامارێك کە لە ناکاو بێتو شوێنەکە لێی بێئاگابن.
(الصائِحَةُ): ١-مێی وشەی (ألصَّائِح) ٢-هاوارو زریکەو قیژەی شیومنو گریان.
(ألصَیّاح): ١-فرە شــیومنو گریانکەر ٢-هاوارو قیژەقیژکەرێکی زۆر.
٢-(صاحَ- العُنقودُ. صَیْحاً وصَیْحَةً وصیاحاً و صَیَحاناً): هێشووەکە بە بەرسیلەییو تەڕی درێژبووەوەو داکەوت.
٣-(صَیَّحَ-تِ الریحُ أو الشَّــمسُ البَقلَ): باکە یان خۆرەکە سەوزییەکەی وشك کردەوە.
(تَصَیَّــحَ- البَقــلُ): ســەوزەکە ســەرەکەی وشکهەڵاتو هێشتا تەڕیی تێدابوو.
٤-(صَیَّحَ-الشَــيءَ): شــتەکەی شــکاند/ هەڵیقڵیشاندو دەنگی لێهێنا.
(تَصَیَّحَ): ١-شەقارشەقار بوو ٢-شکا.
(تَصایَحَ- جِفنُ السَّــیفِ): کاڵانی شمشێرەکە دادڕ دادڕ بوو.
(إنْصاحَ): ١-قڵیشا ٢-دادڕ دادڕ بوو.
(-الفَجرُ والبَرقُ): بەیان ســپێدەیدا. هەورە برووسکەکە (شەوقیدایەوە/ بریسکەیدا).
(-تِ الأرضُ): ڕووی زەویەکــە جێجێبــوو لە هەندێك شــوێندا گیا داپۆشیو هەندێکی بە وشکی مایەوە/ ڕووتەنبو.
صاد: ١-(صادَ- الطَیرَ. صَیْداً): پەلەوەرەکەی

ڕاوکرد/ و بە فێڵ گرتی.
(صائد): ڕاوکەر.
(-فُلاناً): ڕاوی بۆ فیسار کرد/ نێچیری بۆ گرت.
(-المَكانَ): لە شوێنەکەدا ڕاویکرد.
(أصادَ- هُ): ڕاوی پێکرد.
(تَصَيَّدَ- الطَيرَ): باڵندەکەی (بە فێڵ گرت/ ڕاوکرد).
(إصْطادَ- الطَيرَ): باڵندەکەی (ڕاوکردو بە فێڵ گرتی).
(-المَكانَ): ڕاوی لە شوێنەکەدا کرد.
(ألصَيْد) (مص): ١-نێچیری ڕاوکراو ٢-ڕاوکردن.
(ألصَيَّاد): ڕاوکەر/ ڕاوچی.
(ألصَيُود (ج) صِيْد وصُيُود: ڕاوکەر/ فێرەڕاو/ ڕاوچی.
("كَلْبٌ صَيُود و صِقْرٌ صَيُود"): سەگێکی ڕاوکەرو بازێکی ڕاوکەرو فێرە ڕاو.
(-مِنَ النِّساء): ئافرەتێک کە شتێک لە مێردەکەی بپچڕێت.
(ألَمصيد): ڕاوکراوو گیراو.
(المِصْيَد والمِصْيَدَة والمَصْيَدَة والمَصيدَة (ج) مَصائِد): تەڵەی ڕاو/ داوو فاقەو هەرچی ڕاوی پێبکرێت.
(ألمِصيادَة): دارو لاستیک.
(ألَمصاد والمُصْطاد والمُتَصَيَّد): ڕاوگە/ شوێنڕاو.
٢-(صادَ- زَيْداً. صَيداً): ملی زەیدی (خوارکردەوەو کەچکرد).
(صَيِدَ. يَصْيَدُ صَيْداً): ملی (خوار بوو/ کەچبوو).
(أصادَ- البَعيرَ) (ضد): ١-ئازاری بە حوشترەکە گەیاند ٢-تیماری ملخواریی حوشترەکەیکرد.
(ألأَصْيَد (م) صَيْداء (ج) صِيْد): ١-حوشترێك تووشی ملگێڕیبووبێت ٢-پیاوێکی پیر کە لەبەر زۆریی تەمەنیو پیریی سەربڵند دەکاتەوە ٣-شا لەبەر گەورەیی سەر (بڵند/ قنج) دەکاتو بەملاولادا ناڕوانێت ٤-(ح) شێر.
(ألصادُ) (طب): دەردێکە تووشی حوشتر دەبێتو ئاو بە لووتیدا دێتە خوارێ لە تاواندا سەر بەرزدەکاتەوەو ناتوانێت مل شۆڕبکاتەوە.
ألصاد (ج): شێر.
(بَعيرٌ صاد): حوشتری تووشبووی دەردی ئاوبەلووتداهاتوو.
(ناقَةٌ صادَة): مێحوشترێکی تووشبووی دەردی ئاوبەلووتداهاتوو.
(ألصَيَد (مص) والصِيْد= الصاد لداء الإبل): دەردی حوشتر کە ئاوبەلوتیا دێتە خوارێو لە تاواندا سەربەرزدەکاتەوە.
(ألصَيداء): مێی وشەی (ألأَصْيَد. ألصَيَّاد) (ح): شێر.
٢-(الصاد: پیتی (ص) کە لە ئەلفوبێی عەرەبییە.
(-(ج) صِيْدان): ١-زەرد ٢-مس.

(أَلصَيْداء): چەو.
(أَرضٌ صَيْداء): زەوییەکی رەقەنی چەولگ.
(أَلصَيود- مِنَ النِساء): ئافرەتی بەدرەوشت/ بەدناو.
(أَلصَيْدان): ١-زێر ٢-مس.
(صَيـدانُ الحَصَـى): چەوی بوحـس/ وردە چەو.
(الصَيدانَة): دێو.
(-مِـنَ النسـاءِ): ١-ئافرەتـی بەدرەوشـت ٢-ئافرەتی زۆربڵێ.
٤-(الصَيْدَلَة): دەرمانفرۆشـیو بۆنفرۆشی/ دەرمانگەریی.
(أَلصَيْدَلـيّ والصَيدَلانِـيّ): بـۆنو عەتـرو دەرمانفـرۆش/ دەرمانسـاز/ دەرمانگرەوە/ ئەجزاچی (دەڵێن وشەکە فارسییەو کراوە بە عەرەبی دەیشـڵێن لە وشەی (صَندَلاني) ئەو کەسـەی کە سەندەل دەفرۆشـێت کە دارێکی بۆنخۆشی هندستانە پاشـا بەو کەسە وتراوە کە بۆنی خۆشو داوودەرمان دەفروشێت. کە بۆنی خۆشو داوودەرمان دەفروشێت.
(أَلصَيْدَلِيَّة): دەرمانخانە/ ئەجزاخانە.
٥-(الصَيـدَنُ): ١-خانـەی تۆکمـەو قایـم/ باشـدامەزراو ٢-بەردی زیو ٣-بەرگی تەسـك ٤-(ح) کەمتیـار ٥-رێـوی ٦-شـا ٧-بۆنفرۆش ٨-مێروویەکـە بۆ خۆی لەنـاو زەویدا خانوو دروسـتدەکاتو لـە هەمـوو زیندەوەرێکـی دەشارێتەوە.
(الصَيدَنانِـيّ) (ح): خانـووی ژێـرزەوی بـۆ رێـویو بۆ ئەو مێـرووەی سـەرەوە کە باسمکرد.
صـار: ١-(صارَ. صَيْراً وصَيـرورَة ومَصيراً): ١-گەرایەوە ٢-بوو بە/ گۆڕا.
(صارَ زَيداً غَنياً): زەید دەوڵەمەند بوو کە لە پێشدا نەبووبوو ٣-گوێزایەوە.
(-إلى كـذا أَو إلى فُـلان): گەیشـتە ئـەوە/ ئەنجامی ئەوە بوو/ گەیشتە فیسار.
(صَيَّـرَ وأَصارَ- هُ. تَصيـيراً): گۆڕیو کردی بەوە/ لە بارێکەوە لە شـێوەیەکەوە گۆڕی بۆ بارو شێوەیەکیتر.
(تَصَيَّـرَ-هُ): لەو چـوو/ وەك ئەو بوو/ وەك ئەوی لێهات.
(أَلصَيْر) (مص): ئەوپەڕی کارو ئەنجامو کۆتایی.
(أَلصيـْـر= ١-أَلصَير): ٢-کەنـار/ لا ٣-لووتکەو کۆتایی.
("فُـلانٌ علـى صِيْرِ الأَمـر"): لـە کۆتایی کارەکەدایە خەریکە بە ئەنجامی بگەیەنێت.
(أَلصائِرَة): گیای وشك.
(أَلصَيُّـور والصَيُّورَة): ئەوپەڕی کار/ کۆتایی کارو ئەنجامی.
(أَلمَصـير (مص) مَصايـر): ١-کۆتایـیو ئەنجامی کارەکە ٢-چارەنووس ٣-شوێنی پێگەیشتنی ئاوەکە.
٢-(صارَ- هُ. صَيْراً): بڕی.

(-الشيءَ): شــتەكەی بەندكرد/ لە شوێنێكدا قایمیكرد.
(اَلصِيْر): درزی دەرگا.
(اَلصِيَار): گەلەگایەك.
(اَلصِيــارَة والصِيْــرَة (ج) صِيَــر وصِيَر): گەوری مانگاومەر/ پشتیری ئاژەڵ.
(اَلصَيِّر): گۆڕ/ گڵكۆ.
٢-(اَلصِيْــر): ١-وردەماســیی خوێكــراو/ ســوێركراو وەك ماســی ســاردینو ســنمۆرە ٢-مالومی جوولەكە.
(اَلصِيَار): دەنگی تاس.
(اَلصَيِّر): كۆمەڵ/ دەستە.
(اَلصَيُّور): ئاوەزو ڕادەربڕین.
صيــص: (اَلصيصَــة والصيصِيَّــة (ج) الصَياصِــي): ١-قولاپی جۆلا، چەتاڵی جۆلا بۆ ڕێكخســتنی تانو پۆ ٢-قولاپی چنین كە شتی پێدەچنرێــت ٣-چقەی كەڵەشــێر ٤-(قۆچی/ شاخی) ئاســكو مانگا ٥-مێخێكە كە خورمای پێهەڵدەكەنــن ٦-قــەلاو ســەنگەرو شــووراو هەرچی شتێك كە پەنای پێبەرن.
صاع: (صاعَ وأصاعَ- الغَنَمَ صَيعاً): مەڕەكانی بڵاوەپێكرد.
(-القَومَ): خوێشگەلی بەگژ یەكدا كرد.
(تَصَيَّحَ- المَاءُ): ئاوەكە وورووژاو هەستا.
(إنصاعَ- الرَجُــلُ): ١-(زوو/ خێرا) گەڕایەوە وازی هێنا ٢-ملیدا.

(-الطَــيْرُ): باڵندەكــە ســەركەوتنێكی تەواو سەركەوت/ بە ئاسماندا بەرزبووەوە.
صــاف: ١-(صافَ وتَصَيَّفَ بالــمكانِ. صَيفاً): هاوینی لەو شوێنەدا بەسەربرد.
(-صافَ وتَصَيَّــفَ واصَّيَّفَ- المَكانَ): هاوینی لەو شوێنەدا بەسەربردو تێدا مایەوە.
(صِيْفَ- المُــكانُ أَو الرَجُلُ): شــوێنەكە یان پیاوەكە بارانی هاوینی لێدا.
(مُصَيِّف ومَصْيوف): هاوینكردو/ هاوینی لە شوێنەكەدا بەسەربردوو بارانی هاوین لێیدا.
(هذا الطعام يُصَيِفُني): ئەم خواردنە بەشی هاوینم دەكات.
(صُيِّفَ المــكانُ أَو الرجلُ): باراینی لە هاوین لە شوێنەكە یان لە پیاوەكەی دا.
(-المَكانَ): بە هاوین تێدا مایەوە.
(صايَــفَ- هُ مُصايَفَــةً وصِيافــاً): بۆ دەمی هاوین لە گەڵیدا بەڵێنو كاری لەگەڵدا گرت.
(أَصافَ- القَومُ إِصافَةً): چوونە هاوینەوە.
(-تِ الدابَّةُ): چوارپێكە لە هاویندا زا.
(إِصْطافَ بالمَكانِ. إِصْطِيافاً): لە شــوێنەكەدا هاوینی بەسەربرد.
(صُيِّــفَ- المَكانُ أَو الرَجُــلُ): بارانی هاوینی بەركەوت.
(مُصَيِّف): بارانبەركەوتووی هاوین.
(اَلصَيــف (ج) أَصْياف): هاویــن/ یەكێكە لە چوار كەژمكەی ســاڵ لە (٢١)ی جۆزەردانەوە

تا (٢١)ی گەلاوێژ.
(أَلصَيفَـةُ (ج) صِيَـف): هاوینە/ تایبەت بە هاوین.
(ألصَيفـي): ١-ئەوەی لـە هاوینـدا بووبێت بێهێزو کز دەبێت ٢-گیا کە لە هاویندا بڕوێت ٣-ئەو میوەو بەرەی لە هاویندا پێدەگات وەك ترێو هەنجیرو سێوو هەڵووژەو هیتر.
(أَلصَيِّف): گژوگیای هاوینە.
(أَلصَيِّـف و الصَيِّفَة): بارانو تـاوە باران لە هاویندا.
("أَصابَتنـا صَيِّفَةٌ غَزيـرة"): تاوەبارانێکی هاوینەی لێداین.
(ألصاف): گەرم.
(الصائِفُ): گەرم.
("صَيفٌ صائِـف"): هاوینێکی زۆر گەرم کما يُقال("لَيلٌ لائِل"): وەك چۆن دەڵێن شەوێکی تاریکەشەو.
(ألصائِفَـةُ (ج) صَوائِـف): ١-مێـی وشـەی (الصائِـف) ٢-دەمـی هاویـن ٣-داگیرکردنو پەلاماردان لە هاویندا.
(صائِفَةُ القَوم): ئازوخەی هاوینەیان.
(أَلمَصيف والمُتَصَيِّف والمُصطاف): هاوینەهەوار.
(أرضٌ مِصيـافٌ (ج) مَصاييـف): خاکێـك کە سـەوزەو میوەی درەنـگ پێبگاتو بارانی هاوینەی زۆر بێت.
(أَلمَصاييف): ئەوەی لە هاویندا لە دایکدەبێت.

٢-(صـافَ- السَـهْمُ عَـنِ الهَـدَفِ صَيْفـاً وصَيفُوفَةً): تیرەکە لە نیشانەکە لایدا.
(-عَنّي وَجْهَهُ): ڕووی لێوەرگێڕام.
(أَصافَ اللهُ عَنهُ الشَرَّ. إِصافَةً): خودا خراپەو وەیی لێلادا.
(أَلمَصيف): پێچی ئاوەڕۆ.
٣-(أَصافَ. إِصافَةً): بە پیری ژنی هێنا یان بە پیری منداڵی بوو.
(رجلٌ مِصيـافٌ (ج) مَصاييف): پیاوێك ژن نەهێنێت تا سەری (ماشوبرنـج/ بۆز) نەبێت.
صيـق: (ألصيـق): ١-ئەرەقی لـەش/ خوەی ٢-بۆمچكو بۆگەنی لەش/ بۆنی بۆگەن ٣-دەنگ.
(أَلصيق (ج) صيْقان): چۆلەکە.
(أَلصِيْـق والصِيْقَة (ج) صِيَق): تۆزو گەردی کۆوەبووی ناو هەوا.
صاك: (صـاكَ- بِهِ الطِيْبُ أَو الـدَّمُ: صَيْكاً): بۆنی خۆشی پێوە لکا یان خوێنی پێوە نووسا.
صيل: (صِيْـلَ- لَهُ كذا): ئەوەی بۆ لواو ڕێی بۆ درا.
صيم: (الصِيَّم): داخوازییەکی زۆر.
صـين: (الصَوانِيّ مُفْرَدُهـا صِنبِيَّة): قاپو فەخفوریی چینی گوایا لە چینەوە هاتووە.
(الصينية): سینی کە شـتی دەخرێتە سەرو پێشکەش دەکرێت لە پوشە یان کانزا.
(أَلصيوان (ج) صَواوين) (فارسية): دەوارێکی گەورەی کووتاڵ/ قوماش.




ض: (ألضــاد): پازدەهەمــین پیتــی ئەلفو بێی عەرەبییە لە پیتە شــەجەرییەکانەو لە ژمێرەی کۆی پیتەکاندا (٨٠٠)ە.

ضئــب: (ألضئــب) (ح): ١-چــوار پێیەکــی دەریاییە ٢-دەنکە مرواری.

ضــأد: ١-(ضأد- ہ ضــأدا): لــە نەیاریانیدا بەسەریدا زاڵبوو.

٢-(ضئد. ضؤادا): تووشی هەڵامەتبوو.

(أضاد- ہ. إضآدا): تووشی هەڵامەتیکرد.

(ألضؤد والضؤدة والضؤودة): هەڵامەت.

(ألمضؤود): هەڵامەتگرتوو.

ضــأز- ہ. ضأزا وضــأزا): ســتەمی لێکردو زۆرداریی بەرامبەرکرد.

(-ہ حقە): لە (مافەکەی/ هەقەکەی) بڕیو هەمووی نەدایە.

(قسمة ضؤزی ١-وضأزی وضیئزی): بەشێکی لێکەمکراو/ کەمبوو.

(ألضیــأز): کەســێکی لــە هەمــوو کارێــك تێهەڵچوو.

(ألضؤزة): پیاوی ڕسواو سووك.

ضــأض: (ضأضا وضوضا – القوم في الحرب ضأضأة وضوضأة): لە جەنگەکەدا خوێشگەل کەوتنە هاتو هاوارو دەنگەدەنگ.

(ألضأضاء والضوضاء والضوضی): دەنگەدەنگ/ ژاوەژاو/ هاتو هاوار/ غەڵبەغەڵب لە جەنگدا.

(ألضؤضؤ (ح) = الأخیــل): باڵندەیەکە لای خەڵك شوومە/ قەلی کێڵگە.

(ألضؤضــؤ والضئضئ): کانگاو ســەرچاوەو بنچینە.

ضئط: (ضئط- الرجــل ضأطا): بە لەنجە ڕۆیشت شانو لەشی جووڵاند.

ضئك (ضئك): تووشی هەڵامەتبوو.

(الضؤاك): هەڵامەت.

ضــؤل: (ضــؤل. ضآلــة وضؤولــة):

١-بچووكبووهوه/ نابووتبوو ٢-بێهێز بوو.
(ضـاءَلَ- شَـخْصَهُ): كەسـيتيەكەى بچووككردەوەو سـووكيكرد تا دەرنەكەوێتو ديارنەبێت.
(تَضاءَلَ): ١-بچـووكو بێبايەخبوو/ بێتواناو هێز بوو ٢-خۆى بچووكو بێتوانا پيشاندا.
(-الشَّـيءُ): شـتەكە چووە يەكو كرژ بوو/ بەيەكداچوو/ بچووكبوو.
إضطَأَلَ: ١-بچووكبووهوه ٢-بێهێزو دەسەلاتبوو/ بێتوانا بوو.
(مُضطَئِل): بچووكو بێتوانا/ ورد.
(ألضَئيـل (ج) ضُؤَلاء وضِئـال وضَئيلون): ١-بچووك/ بێجـورم ٢-وردو نابـووتو بێهێز ٣-باريك.
(ألضُؤَلة): بێهێزى باريك.
(ألضَئيلَـة): ١-مێـى وشـەى (ألضَئيـل) ٢-توولەمار ٣-زمانە بچكۆلە.
ضأن: ١-(ضَأَنَ الضَـأْنَ ضَأْناً): مەرەكەى لە بزنەكە (جياكردەوە/ هەلاوارد).
(أضْأَنَ. إضْآناً): مەرى زۆر بوو.
(ألضَأن): مەر/ پەز.
(ألضائِـن (فـا) (ج) ضَأْنٌ وضَـأَنٌ وضَئينٌ وضِئينٌ): ١-لاواز/ لەر ٢-بێتوانا/ بێدەسەلات/ بێبڕشت.
("رَجُـلٌ ضائِـنٌ"): پياوێكى (بێدەسـەلات، بێبڕشـت)و نەرم وەك مەرصيخنبێت ٣-(ح) مەر/ پەز.
(-مِنَ الغَنَم): مەرى بە خورىى/ خورى زۆر.
(ألضائِنَـة (ج) ضَوائِـن): مێـى وشـەى (الضائِن).
(ألضِئنِيُّ): مەشكەكە ماستى تێدا دەژەندرێت.
(ألضَأْنِيّ) (عند المولدين): لاى تازەگەرييەكان: گۆشتى مەر.
٢-(ألضائِـن (ج) ضَـأْن وضَـأَن وضَئـين وضِئين): لى سپيى پانەوەبوو.
ضأى: (ضَـأَيَ- الرَجُلُ ضَأْياً): كابرا لەشـى باريكو تەنكبوو.
ضبّ: ١-(ضَبَّ. ضَبّاً): كپو بێدەنگبوو.
(أضَبَّ): (ضـد): ١-بێدەنگبوو ٢-دەنگى بەرز كردەوەو قسەيكرد.
(-على الشيءِ): شـارديەوەو دەستى بەسەردا گرت.
(-علـى ماَفي نَفسِـهِ): ئەوەى لـە دلێدا بوو دەرينەبرىو شارديەوە.
(-على غِلٍّ في قَلبِهِ): رقەكەى پەچنيە دلێەو بۆ رۆژى خۆى هەلێگرت.
(ألضَـبّ والضِـبّ (ج) ضِبـاب): قينو رقى دەروون.
(«رَجُـلٌ خَبٌّ ضَـبّ»): پياوێكـى بە پێچو پەناو قينلەدلە.
٢-(ضَـبَّ- الريـقُ أو الدَمُ ضَبّـاً وضَبيباً): ليكەكە يا خوێنەكە لە بەرى رۆيشت.

(-الشَــفَةُ): لێوەکە دەردێکــی گرتو خوێنی لەبەر ڕۆیشت.
(أَضَبَّ- الماءُ أو الريقُ): ئاوەکە یان لیکەکە لە بەری ڕۆیشت/ کشا.
(-المــاءَ أو الــدَّمَ): ئاوەکــە یــان خوێنەکەی ڕژاند.
(أَلضَبّ) (طب): هەڵزڵەپینی لێو/ دەردی لێو کە خوێنی لێدەچۆڕێنێت.
(أَلأَضَــبّ (م) ضَبَّاء (ج) ضُبّ- مِنَ الجمال): حوشترێك تووشی هەڵزڵەپینی لچی بێت لچی خوێنی لێبتکێت.
(أَلضَبيب) (مــص): هەڵزڵەپینی لچو خوێن لەبەر ڕۆیشتنی.
(ضَبيبُ السَّيفِ): تیژیی شمشێر.
٣-(ضَبَّ- الناقَةَ. ضَبّاً): گوانی مێحوشترەکەی بە هەموو دەستی گرتو دۆشی.
(-على الشَــيءِ): شتەکەی توند گرتەو تەواو دەستی بەسەردا گرت.
(ضَبَّهُ) (عامية): توند گرتی.
(-عَلَيهِ): توند چنگی لێگیرکردو گرتی.
(«فُــلان يَضُبُّ فُــوه أو تَضُبُّ لُثاتُــهُ بِكَذا أَو على كَــذا»): دانی بە شــتەکەدا گرتووەو نایەڵێت لە چنگی دەرچێت.
(ضَبَّــبَ- علــى الشَــيءِ): شــتەکەی تونــد گرتەخۆو نەیهێشت لە دەستی دەرچێت.
(أَضَبَّ- على الأَمرِ): دەستی بەسەر کارەکەدا گرتو خستیە ژێردەستی خۆی.
(-علــى المطلوبِ): خەریکبوو خواســتەکەی بهێنێتە دیو دەستگیری ببێت.
(-القَومُ): بۆ کارەکە گشت ڕاپەڕین.
(أَلضَبَّةُ (ج) ضِباب): ١-دۆشین بە گوشینێکی توندی گوانەکە ٢-(ا ع) پەلەپیتکەی تفەنگو تەقەمەنی.
(أَلمِضْباب): چرووك/ ڕژد/ ڕەزیل/ دەستقووچاو.
٤-(ضَبَّ- الشَيءُ.ضَبّاً): شتەکە بە زەویەکەوە نووسا.
(أَلضَبَّةُ (ج) ضِباب): شــتێکە لە ئاســن یان زەرد قــاپو دەفری پــێ چاکدەکرێتەوە پێی یەکدەگرنەوە.
٥-(ضَبُــبَ وضَبِبَ يَضَبُ- المَــكانُ. ضَبابَةً): مارمێلکە لە شوێنەکەدا زۆر بوو.
(ضَبِب وضَبِبَة): شوێنی پڕ لە مارمێلکە.
(ضَبَّبَ- على الضَبِّ): مارمێلکەکەی ورووژاند تا بیگرێت.
(-البابَ): دەرگاکەی پشتکۆڵکرد.
(أَضَبَّ- المكانُ): شــوێنەکە پــڕ لە مارمێلکە بوو.
(أَلضَبّ (ج) أَضُب وضُبّان و ضِباب ومَضَبَّة (ح): مارمێلکە.
(«أَعْقَدُ مِن ذنب الضَبِّ»): لە کلکی مارمێلکە بە گرێترە واتا ئاڵــۆزە. وتقول العرب : («لا أَفْعَله حتی يَرِدَ الضَب»): عەرەب دەڵێت ئەو

کاره ناکەم تـا مارمێلکە نەچێتە سـەر ئاوو ئـاو بخواتەوە، ئـەوان وایاندەزانی مارمێلکە ئاو ناخواتەوە (ئێمە دەڵێین: تا کلکی حوشتر نەگاتە زەوی ئەو کارە ناکەین).

(اَلضَبَّـةُ (ج) ضِباب (ح): ١-مێـی مارمێلکە ٢-داری پشـتکۆڵی دەرگـا لـە ئاسـن یان دار دەبێت (وەك شـێوەی مارمێلکەیە/ سوورگی کە دەرگای پێدادەخەن.

(أرضٌ مَضَبَّةٌ (ج) مَضاب): خاکێك مارمێلکەی زۆر بێت.

٦-(أَضَبَّ- تِ الأَرضُ): زەویەکە گژوگیای زۆر بوو.

(-اليَومُ): ڕۆژەکە تەماویبوو.

(-الشَعَرُ): قژەکە زۆر بوو/ چڕ بوو.

(-القَـومُ فِي بِغيَتِهِـم): بـۆ ئامانجەکـەو دەستگیربوونی بڵاوبوونەوە.

(أَضَبّوا- عَلَيهِ): لێیگردبوونەوە.

(أَضَبوا- لِفَـلان): بۆ فیسـار بڵاوبوونەوەو بەدوایدا کەوتنە گەڕان.

(أَلضَبَّـة (ج) ضِباب): پەلەپیتکەی تفەنگـو چەکیتر.

(أَلضَبابَة (ج) ضَباب): تەمو مژ.

٧-(تَضَبَّـبَ- الصَبـيُّ): کوڕەکـە کەوتـە (گۆشتگرتن/ قەڵەوبوون).

(أَلضَبيَـة): کـەرەو دۆشـاو کـە دەکرێتـە دەفرێکەوە بە منداڵەکە دەدرێت.

(أَلضَـبّ) (طـب): ١-لوویەکە لە سـنگی یان پێی حوشـتر دێت ٢-دەردێکە دەداتە ئانیشکی حوشتر.

ضبأ: ١-(ضَبَأَ- الرَجُـلَ ضَبْأً وضُبُؤاً): خۆی بە زەویەکەوە یان درەختەکەوە نووساند.

(ضَبِيء): بە زەویەوە یان درەختەوە متبوو/ نووساو.

(-هُ بالأرضِ): بە زەویەکەوەی نووساند.

(-الصائِـدُ): ڕاوکەرەکـە خۆی حەشـارداو متکردو خۆی نایەوە.

(-إلَيهِ): پەنای بۆ برد.

(- مِنهُ): شەرمی لێکردو خۆی پەنادا.

(أَضْبَأَ- الشيءَ): شتەکەی پەنادا/ شاردیەوە.

(-عَلَيهِ): لێیبێدەنگبوو شاردیەوە.

(-مـافي يَدِهِ وعَلَيهِ): ئەوەی لەدەسـتیدابوو شاردیەوەو پیشانی نەدا.

(إضطَبَـأَ- مِنهُ): خـۆی لێ ونکـرد/ خۆی لێشاردەوە.

(أَلمَضْبَـأُ (ج) مَضابِئ= المَخْبَأ): حەشـارگە/ پەناگا/ ژێرزەمین.

٢-(ضَبَأَ- على القَوم. ضَبْئاً وضُبُوءً): لە ناکاو لە خۆێشـگەل پەیدابوو بەسـەر سەریانەوە بوو.

ضبث: (ضَبَثَ واضطَبَثَ- بالشَـيءِ وعَلَيهِ. ضَبْثاً): شتەکەی توند گرت.

(-بِهِ): شلکوتیکرد/ هێندەی لێدا پەکیخست.

(ضُبِثَ- عَلَيهِ): لێیدرا.
(اَلضَبثَةُ (ج) ضَبْثــات وأَضْباث): ١ـگرتن ٢ـ مستەکۆڵە/ مشتەکۆڵە.
(اَلضُباث): چنگی شێر.
(اَلضَبَّاث والضَبث والضَبُوث) (ح): شێر.
(مِضبَث (ح) أَلمَضابِث): چنگی شێر.
ضبح: ١-(ضَبَــح-تِ الخَيلُ في عَدوِها ضَبْحاً وضباحاً): ئەســپەکە لە غاردا نرکەنرکێکی لێوەهات نە حیلەکردن بوو نە پرمەپرمبوو.
(-الأَرنَــبُ والثَعْلَــبُ والقَــوسُ ضُباحــاً): کەروێشــکەکەو ڕێویەکەو کەوانەکە دەنگیان لێوەهات.
(إِنْضَبَــحَ): دەنــگ لێوەهاتنی کەروێشــك و ڕێوی و کەوان.
٢-(ضَبَحَ- تِ النــارُ العودَ. ضَبحاً): ئاگرەکە ڕەنگی چێوەکــەی هەڵپروکانــدو چێوەکەی نەسووتاند.
(إِنْضَبَحَ- لَونُهُ): ڕەنگەکەی گۆڕا وەك ڕەنگی خۆڵەمێشی لێهات.
(اَلضَبح): خۆڵەمێش/ سووتوو.
(اَلضَبْحــاء): کەوانێــك (کــە ئاگــرکاری تێکردبێت/ کە بەر ئاگر درابێت).
٣-(ضابَحَ- هُ): ١ـبەرەنگاریبووەوە ٢ـناشیرینیکرد.
(تَضابَحــا): ١ـبەرەنگــاری یەکتریبوونــەوە ٢ـیەکتریان ناشیرینیکرد.
ضبر: ١-ضَبَرَ- الحِجــارَةَ ضَبراً): بەردەکانی ڕیزکردو ڕێکخست.
(-الكُتُبَ): نوسراوەکانی ڕێکخستو کۆکردەوە یان خستنیە دۆسیەوە/ فایلەوە.
(-الفَــرَسُ أَو المُقَيَّــدُ. ضَبْــراً وضَبَرانــاً): چارەوێکــە یان کۆتکراوەکــە قاچی یان خۆی گرمۆڵە کردو قەڵەمبازدیدا.
(ضَبَّــرَ- الشَــيءَ): شــتەکەی (کۆکــردەوە/ گرمۆڵەکرد).
(أَلضَبْــر (مــص) (ج) ضُبُور مــص. (ا ع): ئامێرێکی دارینبوو/ پێستتێگیراو بوو کۆن لە شەڕدا وەك سـوپێرێك بەکاردەهات لەژێریدا دەچوونــە نزیــك قــەڵای دوژمنــەوە. وەك دەبابەی ئێستە وابوو.
(فَرَسٌ ضَبِرٌ): گردە چارەوێ.
(اَلضِبار والضُبار): نوسراوەکان (وشەکە کۆیە تاکی نییە).
(اَلضِبــارَة (ج) ضَبائِر): ١ـ(دەســتە خەڵك/ کۆمەڵە خەڵك)ی زۆر.
(«رَأَيتُهُــم يَخْرُجون مِــنَ المَــكانِ. ضَبائِرَ ضَبائِر»): دیمن دەســتە دەستە لە شوێنەکە دەردەچوون ٢ـهەموو کۆمەڵگایەك.
(اَلضِبارَة والضُبارَة) (ج) ضَبائِر والإِضْبارَة (ج) أَضابــير): گورزە کاغەز/ دۆســیە/ فایل یان بەستە تیر.
(الضِبْر): پەلاماردەرێکی بەهەڵپە.
(الضَبُور والضَبير): تیژ ڕاپەڕ.

(اَلضَبُور والضَبير): ١-توندوتيژ ٢-(ح) شێر.
(اَلمِضْبَــر): ١-(ح) شــر ٢-قەڵەمبــازدەر/ خۆهەڵدەر توند، هەڵپەدەر.
٢-(اَلضَبْر): هەژاریی/ نەدارایی/ ڕەزەڵخوایی/ نەبوونی.
(اَلضِبْر): بنباخەڵ.
ضبز: (ضَبَــزَ- ەُ): تیژ ســەرنجی (لێگرت/ دایە).
(اَلضَبــز والضَبیــز- مِنَ الذِّئــاب): گورگی چاوبزی تیژ تێڕوان.
ضبس: (ضَبَسَ- علی الغَریم ضَبساً): تەنگی بــە (وامومرگرەکــە/ قەرزارەکــە) هەڵچنیو تەنگەتاویکرد/ زۆری بۆ هێنا/ زۆری لێکرد.
(ضَبِــسَ-ت نَفْسُــهُ. ضَبَســاً): دەروونــی بۆگەنبوو/ خراپبوو/ موخەننەتبوو.
(اَلضَبْس): چرووك/ ڕژد.
(اَلضِبْس): بەدخواز.
(«هُــوَ ضِبــسُ شَــرٍّ»): ئــەو بەدنەنگێزە/ خراپەكارە.
(اَلضَبِس): چەتوونونالەباری سەرسەخت.
(الضَبیس): ١-چەتوونیو نالەباری سەرسەخت ٢-تەمەڵی چارە (قورس/ گران) ٣-زیرەكردوو/ زۆر ترسنۆك ٤-گەوج.
ضبــط: ١-(ضَبَــطَ- ەُ ضَبْطــاً وضَباطَةً): ١-گرتــیو پێــوەی بەندبوو پێوەی نووســا ٢-شکاندیو بەسەریدا زاڵبوو/ بەزاندی.
(- عَلَیهِ): گرتی/ دەستگیریكردو بەندیكرد.
(ضُبِــطَ-تِ الأَرضُ): بــاران هەمــوو زەویی گرتەوە.
(تَضَبَّــطَ- ەُ): بــە زۆر بەزانــدیو گرتــیو بەندیكرد.
(-الضَأنُ): ١-مەڕەكە بەهێزو خرت بوو قەڵەو بوو ٢-شتێك گیای خوارد.
(إنْضَبَط): ١-گیرا ٢-شكێنراو بەزێنرا.
(«ضَبَطَهُ فَانْضَبَطَ): توندو ڕێك بەندیكرد/ گیراو دامركا.
(اَلضَبْــط) (مــص): بەنــدو ڕێككــردنو دامركاندن.
(اَلضابِــط (فــا) (ج) ضُبّــاط): ١-بەهێــز/ بەدەسەڵاتو دامركێن ٢-شێر ٣-(اع) ئەفسەری سوپا.
(ضابِطُ الإرتباط): (اع) ئەفسەری پەیوەندیی نێوان چەند دەستەیەك چ دەستەی سەربازیبێت یان شارستانیی بێت.
(اَلأَضْبَط): (ح) شێر.
٢-(ضَبَطَ- ەُ. ضَبطــاً وضَباطَة): ڕایگرتو تەواو پارێزگاریكرد.
(-العَمَــلَ): تەواو شــارەزای كارەكــە بوو بە باشیو كارامانە ئەنجامیدا/ دایمەزراند.
(-الكِتــابَ): نوســراوەكە، یــان كتێبەكــەی هەڵەچنكــرد/ ڕاســتیكردەوەو ســەروبۆری تەواوی بۆ كرد.

(إِنضَبَــطَ): ١-باش ڕاگیراو پارێــزرا/ ڕێکبوو ٢-ڕاســتکرایەوەو هەڵەچنکرا ٣-ســەروبۆری تەواوی بۆ کرا.

(«ضَبَطَهُ فانْضَبَطَ»): چاك وتوندئاگاداریکردو ڕاگیریکرد/ پارێزراو هەڵەچنکرا.

(أَلضابِط (ج) ضُبَّاط): ١-ڕاگیرکەرو دامرکێن ٢-ڕێکهێن ٣-فەرماندارو سەرکردە.

(أَلضابِط والضابِطَة- عنــد العُلَماء): لەلای زانایان ئەوەیە کە دەستوورو یاسا گشتییەکان بەسەر هەموو بەشەکاندا پیادە دەکرێت.

(أَلضابِطِيَّــة الواحد ضابِطِيّ): ١-ســەربازی تایبەتی والــی بۆ کۆکردنەوەی پــارەو ماڵو پارێزگــاریو گرتنی تاوانبــارانو هێنانیانو خەڵکیتر بۆ لای میری ٢ پیشــەی ســەربازیی تایبەتی والی کە کاری بۆ جێبەجێدەکەن.

٢-(ضَبِــطَ. ضَبَطــاً): بــە هەردوو دەســت کاریکرد.

(أَضبَط (م) ضَبْطاء (ج) ضُبْط): کەســێکە بە هەردوو دەست کاربکات.

الملحق:

ضبط: (الضَّابِطَة): پۆلیس.

(«الضبابِطَة العدلية»): پۆلیسی دادوەریی.

(أَلضابِطَــة الجُمْرِكِيَّــة): دەســتەی دەستبەســەرداگرتنی کەلوپەلــی قاچــاغو شتیتر.

(أَلضابِطَــة (ج) ضَوابِط في المَدافِع): (ڕاگر/ وەستێن) لە تۆپی تەقیندا.

(-في الآلیــات): ئیســتۆپی ماشــینو ئــەو بابەتانە.

(أَلإِنضباط): ڕاگیریی/ دابینکردن/ ملدانێکی تەواوی یاساو شێرازەو پەیرەوکردنی فەرمانو یاساکانە.

(أَلمَضْبَطَــة (ج) مَضابِــط): تۆمارێکــە چی لــە دانیشــتنە میرییەکانــدا دەوترێت تیایدا دەنوسرێت.

---

ضبــع: ١-(ضَبَعَ- البَعِــيرُ ضَبْعــاً وضُبُوعا وضَبَعاناً): حوشــترەکە پەلی باش هاویشتو خێرا ڕۆیشت.

(-القَــومُ لِلصُلْــحِ): خوێشــگەل ویســتیان ئاشتبنەوەو لایەنگیریبوون.

(-هُ ضَبْعاً): دەستی درێژکرد لێیبدات.

(-على فُلانٍ): دەســتی هەڵــبڕیو لێیکووڕا/ دۆعای لێکرد.

(ضَبَّــعَ-تِ الخَيلُ أَوِ الإِبلُ): ئەســپەکان یان حوشــترەکان لە ڕۆیشتندا پەلیانکوتاو پەلیان هەڵبڕی.

(ضَابَعَ- هُ. مَضابَعَةً): هەردووکیان شمشێریان لەیەك هەڵکێشا.

(-الرَجُلَ): تەوقەی لەگەڵ پیاوەکەدا کرد.

(إِضطَبَــعَ): ١-بازوویەکی دەرکرد ٢-عەباکەی خســتە بنباخەڵــی ڕاســتیەوەو لای چەپــی پێداپۆشی.

(-الشَيءَ): شتەکەیخستە بن هەردوو بنباخەڵیەوە.

(ألضَبْع (مص) (ج) أضْباع): ١-ناوەراستی بازوو ٢-بازوو ٣-بنباخەڵ.

(«أخَذ بَضَبْعِهِ»): دەستی دایە بنباڵی/ یاریدەیداو بەهێزیکرد.

(ألضَبْع و الضِباع): دەست بەرزکردنەوەو نزاو دۆعاکردنو هەڵکووران.

(ألضابع (فا) مِنَ الخَيل أو الإبل (ج) ضُبَّع): ئەسپو حوشتری تیژرەو.

٢-(ضَبَعَ- الرَجُلُ. ضَبْعاً): زۆرو ستەمیکرد.

٣-(ضَبِّعَ-الرَّجُلُ): زۆر ترسا.

٤-(ألضُبْع والضِبْع (ج) أضْباع): بنباڵو لاتەنیشت.

(ألضَبْع (ج) أضْباع ): باوەشو لاو تەنیشت.

(ألضَبُع (ج) ضِباع وأضْبُعْ وضُبْع وضُبُع وضُبُوعَة وضَبُعات ومَضْبَعَة) (ح): کەمتیار بە نێرومێی دەوترێت.

(أضَيبِع): کەمتیاری بچووك (بە پێی دەستوور نییە).

(ضَبْعَة): مێکەمتیار. دوو جۆر کەمتیار هەیە، کەمتیاری میلدارو کەمتیاری بەڵەك کە لە میلدارەکە گەورەترەو بەهێزترە.

(ألضَبُع): ساڵی گرانیو تووشو وشکەساڵ.

(ألضَبُعُ (ج) ضِباع وأضْبُع وضُبْع وضُبُع وضُبُوعَة وضَبُعات ومَضبَعَة) (ح): کەمتیار.

(ألضِبْعان مُثَنَّاهُ (الضَبْعَان): دوو کەمتیاری نێر (ناوترێت ضِبْعانان).

(ج) ضِباعين (م) ضِبْعانَة): (ج) ضَباعين وضِبعانات (ح): نێرەکەمتیار.

ضبن: ١-(ضَبَنَ- المَكانُ ضَبْناً): شوێنەکە (تەسکبوو/ تەنگبوو).

(ضَبن): شوێنی (تەنگەبەر/ تەسك).

٢-(ضَبَنَ- عَنهُ الهَدِيَّةَ ضَبْناً): خەڵاتەکەی لێگرتو نەیدایە.

٣-(ضَبَنَ- هُ. ضَبناً): خستیە سەر غالیگەیو هەڵیگرت.

(أضْبنَ واضْطَبَنَ- الشَيءَ): شتەکەی خستە سەر غالیگەیو هەڵیگرت.

(ألضَبْن) (مص): بە غالیگە هەڵگرتن.

(ألضِبن): غالیگە/ نێوان کەمەرو ناوكو بنباخەڵ.

(«فُلان في ضِبنِ فُلان»): فیسار لەژێر باڵی فیساردایەو لای ئەوە/ لەژێر سایەی ئەودایە بە خێوو چاودێریدەکات.

(ألضِبْنَة والضِبْنَة والضُبْنَة والضَبِنَة): ١-خێزان/ ماڵو منداڵ. کە لەژێر باڵی پیاودانو بەخێویاندەکات ٢-ژنی پیاو/ هاوسەری پیاو.

فلان في ضَبِنَةِ فلان: فیسار لەژێر باڵی فیساردایە.

٤-(ألضَبان) (ترکية): ناوی پێڵاو (یان لە

چەرم یان لە کووتاڵە)/ ناوکەف.

ضبا: (ضَبــا- إلَيهِ. ضَبْواً): خۆی دایە پاڵی/ پەنایبۆبرد.

(-تْهُ النارُ): ئاگرەکە برژاندیو گۆڕی.

أضْبــی- الشَــيءَ): ١-شــتەکەی بەرزکردەوە ٢-گرتی.

(-علیــه): بەســەریەوە بــوو خەریکبــوو بیگرێت.

(ألضابي) (فا): خۆڵەمێش.

(ألضَبْوَة- عِنْدَ العامَّة): (لای ڕەشە خەڵکەکە) تورەکەیەکی چەرمینی تووتنە. ڕاســتیەکەی (ألضبة) یــە لەوانەیــە وەرگێــڕاوی وشــەی (ألظَّبية) بێت کە هەمانەیەکی بچووکە.

(ألمَضْبــاة): نانی سەرپشــکۆ یان بــە ژیلەمۆ برژابێت.

ضــج: ١-(ضَــجَّ. ضَجّاً وضَجيجــاً وضَجاجاً وضُجاجاً): لە ترساندا کەوتە هاوارو زریکەو قیژە.

(ضاجَّ-هُ. ضِجاجاً ومُضاجَــةً): لەگەڵیدا بە دەنگی بەرز کەوتە مشتومڕو شەرە قسە.

(أضَجَّ- القَومُ إضجاجاً): خوێشــگەل کەوتنە هاوارو دەنگەدەنگ.

(ألضَجَّــة): هاتو هــاوار/ قاووقیــژ/ قیژو هــووڕ/ ژاوەژاو/ گرمەگــرمو دەنگەدەنــگ/ هەڵاوزەنا بە دەنگی بەرز.

(ألضَجّاج): دەمبەهاوار/ قیژەقیژکەر.

(ألضَجُــوج- مِــنَ النُوق): حوشــترێك کە لە دۆشینیدا مرقەمرقبکاتو دەنگی لێوەبێت.

٢-(ضَجَّجَ- الرَجُلُ): ڕۆیشتو لایدا.

٣-(ضَجَّجَ- الطائِرَ ونَحْوَهُ): ژەهری دەرخواردی باڵندەکە یاهیتریدا/ ژەهرکوژیکرد.

(ألضِجاج): هەمــوو درەختێك کە باڵندە یان درندەی پێ ژەهرکوژ بکرێت.

٤-(ألضَجاج): ١-داری عاج ٢-جۆرە مووروویەکە.

(ألضُجاج): گەوەنێکە کە دەخورێت.

ضجر: (ضَجِــرَ وتَضَجَّرَ- مِنهُ وبِهِ ضَجَراً): بەوو لێی دڵتەنگو وەڕسبوو و دڵخورد بوو.

(ضَجِــرُ): ١-بێــزار ٢-دڵتەنــگ/ بێقــەرار/ دڵخورد/ ئارام لەبەربڕاو/ تاقەتلێچوو.

(أضجَرَ-هُ): (وەڕس/ بێزار)ی کردو دڵتەنگو دڵخوردیکرد.

(ألضَجَــر) (مــص): دڵخورد بــوون بە هۆی مەراقو داخێکەوە/ دڵتەنگیو نائاسوودەیی.

(ألضَجر): شوێنی تەسك.

(ألضُجْرَةُ): دڵخوردییو دڵتەنگیی/ مەلوولییو هەراسانبوون.

(ألضَجَــرَةُ والضَجُور): زۆر وەڕسو دڵخورد/ زۆر مەلوولو دڵتەنگو بێزار/ زۆر بێقەرارو هەراسان.

ألمَضجَــر (ج) مَضاجِــر ومَضاجِــیر: هــۆی دڵتەنگیــیو بێقەرایــی/ هــۆی دڵخوردییو مەراقو هەراسانیی.

ضجع: ١-(ضَجَعَ وانْضَجَعَ واضَّجَعَ واضْطَجَعَ ضَجْعاً وضُجُوعاً): لەسەر لا ڕاكشا.

(ضَجَّعَ وتَضَجَّعَ- في الأمرِ): لە كارەكەدا كەمتەرخەمییكرد/ تەمەڵییكردو باش تێهەڵنەچوو/ باش ئەنجامینەدا.

(ضاجَعَ- هُ): لەگەڵیدا لەسەر تەنشت (ڕاكشا/ پاڵكەوت).

(مُضاجِع): هاوسەرین/ لەگەڵدا ڕاكشاو.

(«ضاجَعَ- هُ الهَمُّ»): مەراقو خەفەت (بەرینەدا/ لێینەبووەوە).

(أضْجَعَ- هُ): ئەوی لە پاڵ خۆیدا ڕاكێشا.

(تَضاجَعَ- عَنِ الأمرِ): خۆی لە كارەكە خەفاندو گوێینەدایە.

(ألضَجْعَة): ١-جارێك (ڕاكشان/ پاڵكەوتن لە پاڵدا) ٢-جارێك درێژبوون ٣-لاوازیی لە ڕا دەربڕیندا.

(ألضِجْعَة): ١-چونیەتی ڕاكێشان/ شێوەی ڕاكشان ٢-تەمەڵیی/ تەوەزەلیی.

(ألضُجعَة): ڕا لاوازیی.

(ألضُجْعَة والضُجَعَة والضُجْعِيّ والضِجْعِيّ والضُجْعِيَّة والضِجْعِيَّة): كەسێكە زۆر ڕابكێشێتو لەشگران بێت/ تەمەڵ/ تەوەزەل.

(ألضاجِع (ج) ضَواجِع): گەوج. لەبەر بێكارەیی و تەمەڵی هەر ڕادەكێشێت.

(-مِنَ الدَّواب): چوارپێی بێكەڵكو فەر.

(رَجُلٌ ضاجِع): ١-پیاوێكی بێكار هەر خۆی بەزەویدا بدات ٢-تەمەڵ.

(ألضاجِعَةُ (ج) ضواجِع): مێی وشەی

(الضاجِع): ١-گەوجەڕن ٢-ژنی تەمەڵ.

(ألضَجوع): ١-بێڕاو بوودەڵە ٢-هەوری سست لەبەر قورسییو ئاوی زۆری.

(ألضَجِيع (م) الضجيعَة = المُضاجِع): هاوسەرین/ هاوڕێی ناو جێگەو لەگەڵدا پاڵكەوتوو.

(ألمَضْجَع (ج) مَضاجِع والمُضطَجَع): شوێنی (پاڵكەوتن/ ڕاكشان)/ خەوتنگە.

(مَضاجِعُ الغَيْثِ): شوێنی باران لێبارین.

(ألمَضجُوع): بێڕا/ ڕابوودەڵە.

٢-(ضَجَعَ- النَّجمُ. ضَجْعاً وضُجُوعاً): ئەستێرەكە ڕووەو ئاوابوونبوو.

(ضَجَّعَ-تِ الشَّمسُ): خۆر ڕوو لە ئاوابوونبوو/ خۆرەكە نیشت.

(أضْجَعَ-الشيءَ): شتەكەی (نزمكردەوە/ نیشاند/ نەواند).

(-الحَرْفَ): پیتەكەی ژێردار كرد.

(-حَوالِقَهُ): جەواڵە پڕەكانی ڕۆكردو سەرەو خوار كردەوە.

(ألضِجْع): (لار/ خوار) بوونەوە/ كەچبوون.

(«ضِجْعُهُ إلَيَّ»): بەلای مندا لارە/ ڕوی بەلای مندایە.

(ألضَجْعَةُ): ١-جارێك پاڵكەوتن ٢-بوونو خۆشگوزەرانییو نەرمیی ژیان ٣-ڕابوودەڵەیی.

أَلضاجِــع (ج) ضَواجِــع: ئاورێژگــەو پێچی چەمو ڕووبار.
(-مِن النُّجوم): ئەستێرەی ڕوومو ئاوابوون.
(«أَراك ضاجِعاً إِلى فُلان»): دەتبینم مەیلو ڕووت بەلای فیسارداپە.
(أَلضاجِعَــة (ج) ضَواجِــع): ئاورێژگــەی ڕووبار.
(أَلضَجُــوع): ١-کونــدەی پــڕ ئاوو ســەنگین هەلگرەکەی خواردەکاتەوە ٢-دۆلکەی فراوانی/ چالاو.
٣-(أَلضَجع): پێشــۆر وەك سابونو ئەسپۆنو شتیتر.
(أَلضاجِعَةُ (ج) ضَواجِع): بان.
(الضاجِعَــةُ والضَجْعــاء): مەرێکــی زۆر/ ڕانەمەرێکی گەورە.
ضَجِــم. (ضَجِــمَ- الفَمُ أَو العُنــقُ. ضَجَماً): دەمەکە یان ملەکە خواروبو/ کەچبوو.
(أَضْجَم (م) ضَجْماء): دەمخوار یان ملخوار.
(«في فَمِهِ ضَجَمٌ»): دەمــی خواریی تێدایە/ دەمخوارە.
(تَضاجَمَ- الفَمُ): دەمەکە خواربوو.
(-الأَمــرُ بَینَهُــم): کارەکــە لــە نێوانیاندا یەکنەبوو/ لەسەری جیابوون.
ضَحّ: ١-(أَلضِحّ): ١-خــۆر/ هەتاو ٢-ڕووناکیی خۆر ٣-بەر خۆر کەوتوو.
٢-(ضَحْضَح وتَضَحْضَح – السَرابُ): تراویلکەکە بریقەیداپەومو شەپۆلیدا.
(-الأَمرُ): کارەکە ڕوونبووەوە/ دەرکەوت.
(أَلضَحْضَح): جۆرە ئاوێك/ ئاوێکی کەم.
(أَلضَحْضاح): ١-ئاوێکی کەم یان تەنکاو/ ئاوی کەمقووڵ ٢-حوشتری زۆر.
ضحك: ١-(ضَحِكَ. ضَحْــكاً وضِحْكاً وضَحِكاً وضِحِکاً): پێکەنیو ڕووی گەشــبووەوو دانی دەرکەوت.
(ضَحِــك وضَحْك وضِحْك وضَحِك وضِحِك): پێکەنین.
(ضَحِكَ مِنــهُ وبِهِ وعَلَیــهِ»): پێیپێکەنیو گاڵتەی پێکرد.
(ضَحِــكَ- علیــه): فریویداو فێڵــی لێکرد/ لەخشتەیبرد.
(ضَحِــكَ- بِــهِ): بــەومو بــە هۆی ئــەوەوە پێکەنی.
(ضاحَكَ- هُ): ١-لەگەڵیــدا پێکەنی ٢-لەو پتر پێکەنی.
(أَضْحَكَ- ه): هێنایە پێکەنین.
(تَضَحَّكَ واسْتَضْحَكَ): پێکەنی/ خەنی.
(تَضاحَكَ): پێکەنی/ خەنی.
(-الرَجُلُ): پێکەنینێکی درۆزنانەی گرت.
(-القَومُ): یەکتریان هێنایە پێکەنین.
(أَلضَّاحِکَــةُ (ج) ضَواحِــك): ١-مێی وشــەی (الضاحك) ٢-هەموو دانێك کە لە پێکەنیندا دەربکەوێت.

(«إفْتَــرَّ عَن ضَواحِكِهِ»): دانه سـپییەكانی خۆی دەرخست.
(اَلضُحْكَةُ): گاڵتەجاڕی خەڵك/ كەسـێكە كە خەڵك پێیپێدەكەنن.
(اَلضُحَكَــةُ): ئــەو كەســەی بــە خەڵــك پێدەكەنێت.
(اَلضُحْكَــةَ والضُحُكَّــةَ والضَحَّاك والضَحُوك والمَضْحــاك): هەمیشــە دەم بــە پێكەنـــین/ كەسێكە كە زۆر پێبكەنێت/ قۆشمە.
(الأُضْحُوكَــة (ج) أضاحِك): ئــەوەی خەڵك بهێنێته پێكەنین شتی پێكەنیناوی.
٢-(ضَحِكَ- الطريقُ. ضَحْكاً وضِحْكاً وضَحِكاً وضِحِكاً): ڕێگەكە دەركەوت/ دیاربوو.
(-تِ الأَرضُ عَنِ النَّباتِ): زەویەكە ڕووەكەكەی دەركرد
(- الشــيبُ بِرَأْسِهِ): مــووی ســپی لەسەریدا پەیدابوو.
(-طَلْعُ النَخْلَةِ): بەرگی تۆوە نێرەی دارخورما ترەكیو دەمیكردەوە/ شەقیبرد.
(اَلضَّحْــك) (مــص): ١-دانــی ســپی كــە دەردەكەوێــت ٢-گوڵ ٣-تۆوە نێرەی دارخورما كاتێــك بەرگەكەی دەمدەكاتــەوە ٤-كەرە یان كەف ٥-بەفر ٦-ناوەڕاستی ڕێگا/ نێرینەی ڕێگا ٦-هەنگوینی ساف یان هەنگوین بە شانەوە.
(اَلضَّاحِــك): ١-(فــا) كەســێكە پێبكەنێــت ٢-بەردێكی زۆر ســپی كە بە شــاخەوە بێتو دیاربێت.
(«لَــهُ رَأْيٌ ضاحِك»): ڕایەكــی دیارو ڕوونی هەیە.
(اَلضَّحُوك (ج) ضُحُك و الضَّحاك): ناوەڕاستی ڕێگەو بەشی دیاری.
٣-(ضَحِكَ- الرَجُلِ. ضَحَكاً): لای ســەیر بو/ سەری لە شتەكە سوڕما/ سەیری لێهات.
اَلضَحْك: سەیرو سەمەرە.
٤-(أَضْحَــكَ- الحَوضَ): گوڵەكــەی پڕكرد تا (لێیرژا/ سەریكرد).
ضحل: (ضَحَــلَ- الغَديرُ ضَحْــلاً): گۆمەكە ئاوی كزو كەمبوو.
(-الماءُ): ئاوەكە (كەمقووڵبوو/ تەنكاو بوو).
(«ماأَضْحَلَ خَيْرَكَ»): ئای كە خێرت كەمە.
(اَلضَحْــل (ج) ضِحال وأَضْحــال وضُحُول): تەنكاو/ ئاوی كەمقووڵ.
(اَلَمْضْحَل): شوێنی تەنكاو/ بوار.
ضَحــا: ١-(ضَحَا- الرَجُــلُ ضَحْــواً وضُحُوّاً وضُحِيّاً): خۆی دایە بەر هەتاوو ڕۆیشت/ كە خۆر دەركەوت ڕۆیشت.
(-الشــيءُ): شــتەكە خۆری لێدا/ بەرهەتاو كەوت/ هەتاوی لێدا.
(-الطَّريقُ): ڕێگەكە دەركەوتو دیاربوو.
(«ضَحا ظِلُّهُ»): سێبەری برا/ مرد.
(«شَــجَرَةٌ ضاحِيَــة»): دارێكــی (بێســایە/ بێسێبەر).

(ضَحِيَ. يَضحى. ضَحــاً.وضَحاءً): ١ـهەتاوی بەرکەوت ٢ـکە خــۆر بەرزبووەوەو دەرکەوت ئەوسا رۆیشت ٣ـئاشکرا بوو.
(-تِ اللیلَةُ): شەو سایەقە بوو.
(ضَحَّى فُلاناً. تَضحِیَةً): خواردنی چێشتەنگاوی دایە.
(-الغَنَمَ): کــە رۆژ بەرزبووەوە مەڕەکانی بۆ لەوەڕ برد.
(-بالشّــاةِ): چێشــتەنگاوو جەژنـــی قوربان مەڕەکــەی ســـەربڕی/ قوربانییکـــرد لەهەرکاتێکدا بووبێت مەڕەکەی ســـەربڕیو قوربانیکرد.
(-الرَجُلُ): خۆی کرد بە قوربانیی/ لە گیانی خۆی بوردو.
(ویَقولُ المُحَدِّثون: ضحی بنَفسِهِ أو بمَصْلَحَتِه أو بمالِهِ في ســبیلِ كذا أو مِــن أجلِ كذا): تازەگەریيــەکان دەڵێن: لە پێناوی ئەوەدا یان بۆ ئــەوە خۆی کرد بـــە قوربانییو لە گیانی خۆی بوردو بەختیکرد یان لە کەڵكو سوودی خۆی بوردو یان لە سامانو ماڵەکەی بۆ ئەوەو ئەو ئامانجە بوردو بەختیکرد.
(ضَحَّى- عَــنِ الأمرِ): کارەکەی دەرخســتو ئاشکرایکردو روونیکردەوە.
(ضاحی- الرَجُلَ. مُضاحاةً): چێشــتەنگاو/ کە رۆژ بەرزبــووەوە هاتە لای (أضحى): بوو بە چێشتەنگاو.

(الشَيءَ): شتەکەی دەرخست.
(«أَضحـــى اللهُ ظِلَّــكَ»): خــودا (فەوتتکات/ لەناوتبەرێت).
(-یفعل كذا): کە رۆژ بەرز بوو کارەکەیکرد. یان لەهەر کاتێکدا بوو ئەنجامیدەدا.
(تَضَحَّ. تَضحیاً): ١ـنانی چێشــتەنگاویخوارد ٢ـچێشتەنگاو نوست ٣ـچێشتەنگاو کەوتە رێ.
(استضحی- للشمس. استضحاءً): چێشتەنگاو خــۆی دایە بەر خۆرو لە زســتاندا چووە بەر بەرۆژگەکە. (الضحاء): دەمی بەرزبوونەوەی خۆر/ چێشتەنگاو.
(الضحو (مــص) والضحوة): بەرزبوونەوەی خۆر پاش هەڵاتنی.
(الضُحی): ١ـدەمی هەڵاتنی خۆرو چێشتەنگاو ٢ـخــۆر ٣ـروونبــوون/ روونا‌کبوونـــەوە/ ئاشکرابوون.
(«مالکَلامِهِ ضُحیً»): ئاخاوتنەکەی رووننیە.
(الضَحیـــان (م) ضَحْیانَة): ئەو کەســـەی لە پێشتەنگاودا نانەخوات.
(الضَحِیَّة (ج) ضَحایا): ١ـبەرزبوونەوەی رۆژ ٢ـقوربانی ٣ـمەڕی قوربانی ٣ـسەربڕراو.
(الأَضحــاة (ج) أضحی والأُضحِیَّة والإِضْحِیَّة (ج) أضاحِيّ): قوربانیی.
(یَومُ الأَضحی): رۆژی قوربانیکردنو قوربانی سەربڕین. رۆژی جەژنی قوربان.
(الأَضْحی (م) ضَحْیاء- مِنَ الخَیل): ئەســپی

سپیواشت.

(ألضاحي): ١-خۆ بەرخۆردەر/ لەبەر بەرۆژگە دانیشتوو ٢-پێستی لەش کە رووتدەبێت‌و هەتاو لێیدەدات.

(ألضاحِيَةُ (ج) ضَواحٍ): مێی وشەی الضاحي ٢-لای دەرکەوتوو/ دیار/ دەرەوەی هەموو شتێك.

(«شَكَت ضَواحيه»): هاواری ئەو شوێنانەی لەشیکرد کە بە دەرەوە بوون هەتاو لێیدان. شان‌و سەرشان.

(شَجَرَةٌ ضاحِيَةُ الظِلِّ): درەختێکە (بێسایە/ بێسێبەر).

(«فَعَلَهُ ضاحِيَةً»): بە ئاشکرا کردەکەی ئەنجامدا.

(ضَواحي البَلْدَة): دەرەوەی شار/ قەراغشار.

(-الحَوض): ئەملاولای گۆلەکە.

(يَومٌ إضْحِيان): رۆژێکی (سامال/ سایەقە).

(لَيلَةٌ إضحيانَة وإضْحِيَةٌ): شەوێکی (رووناك/ مانگەشەو).

(أرضٌ مَضحاةٌ): خاکێکی هەتاوگر یان کەم رۆژی لێناوابێت.

٢-(ضَحَّى- عَنِ الأمرِ تَضحِيَةً): بۆ کارەکە شێنەییبوو، پەلەی بۆ نەکرد.

(«ضَحِّ رُوَيداً»): لەسەرخۆو هێواش هێواشبە/ پەلەمەکە.

(أضحى- عَنِ الأمرِ): لە کارەکە دوورکەوتەوە/ خۆی لێلادا.

ضغ: (ضَغَّ- الماءَ. ضَغّاً): ئاوەکەی (رۆکرد/ رشت).

(-تِ العَينُ): چاوەکە فرمێسکی رشت.

(إنْضَغَّ- الماءُ): ئاوەکە رۆبوو/ رژا.

(المِضَغَّة): پەمپ/ ترومپا/ فیچقە.

(ألمِضَغَّة الماصَّة): ترومپای هەڵمژو پاڵپێوەنەر کە ئاو لەبیر/ چاڵاو دەردەهێنێت.

ضخز: (ضَخَزَ- عَينَهُ. ضَخْزاً): چاوی دەرهێنا.

ضخم: (ضَخُمَ. ضَخامَةً وضِخْماً): (جوستەی/ تەنی) گەورە بوو.

(ضَخِم (ج) ضِخام (م) ضَخْمَة (ج) ضَخْمات): جوستە (گەورە/ زل)/ کەتە/ قەبە/ زەبەلاح.

(ضَخَّمَ- هُ): کەتەیکرد جوستە گەورەیکرد/ زلیکرد.

(ألضُخام): هەموو شتێکی زل‌و کەتە/ زەبەلاح/ قەبە.

(ألأضْخَم= الضَخم): ١-کەتە ٢-زۆر کەتە/ زەبەلاحێکی تەواو/ قەبەترین.

(ألمِضْخَم): ١-توند (کوتە/ پێداکێش) ٢-گەورەو سەروەرێکی مەزنپایە.

الملحق:

ضخم: (ألتَضَخُّم): قەبەبوونێکی زۆر/ هەڵاوسان.

(تَضَخُّم الصَّوت): قەبەبوونی دەنگ.
التَضَخُم: زۆربوونێکی بێشومارو هۆو کەسان.
(تَضَخُّـم عـدد الموظفـين»): زۆربوونێکی زۆری ژمارەی کارمەندان.
(ألتَّضَخُم) (طب): نەخۆشـییەکە تووشـی ئەندامانـی لـەش دەبێـت نیشـانەکانی گەورەبوونی ئەندام وەکو («تَضخم القَلْب») دڵ گەورەبوونو هەڵاوسان.
(ألتَّضَخُّـم- في الاقتصـاد): هەڵاوسـانی ئابووری: بەرزبوونەوەی نرخە بە هۆی تواناى زۆری شـتکڕەکانو کەمیی ئەو کارگوزارییەی پێشکەش دەکرێتو ئەو کاڵایەی دەکڕرێت.
(ألتَضَخُّـم النَّقدي): زۆریی پـارە یان هۆی پێشکەشـکردنی بڕی پارە لـە چاو ئەوەدا کە پێویستە بدرێت بەرامبەر کاڵای ناوبازارو ئەو کارگوزارییەی کە پێشکەش دەکرێت.

---

ضدّ: ١-(ضَدَّ- فُلاناً في الخُصومَةِ. ضَدّاً): لە شەرو بناردا بەسەر فیساردا زاڵبوو.
(-هُ عَن كذا): بە نەرمی پاڵیپێوەناو دەسـتی نایەبەری/ لەوە دووریخستەوە.
(ضادَّ- هُ مُضادَّةً): دژی وەستایەوە/ ڕووبەڕیبوو.
(أضَدَّ): بەربەرەکانییکرد/ دژایەتیکرد.
(تَضـادّا. تَضـادّاً): ڕێکنەکەوتـنو شـەڕو بناریانبوو/ ڕووبەری یەکبوون.
(ألضِدّ (ج) أضداد وضِدّ) (ضد): دژ/ نارێك/ بەرەنگاربـوو/ پێچەوانەی یەك ٢-وەکو ئەو/ لەو چـوو/ هاوچەشـن ٣-دوژمـن/ ناحەز/ نەیار.
(ألأضداد): ئەو وشانەن کە دوو واتا دەگەیەنن دژ بەیـەك وەك (ضد): ١-دژ ٢-وەك ئەو/ لەو چوو/ هاوچەشن/ هاوشێوە.
(«هُـوَ ضِدُّهُ»): ئـەو لەو دەچێـت یان لەو ناچێتو دژیەتی.
(ألضَديـد): ١-دژ ٢-هـاو وێنـە/ لـەو چوو/ هاوچەشن/ هاوشێوە.
(«لاضديدَ لَهُ»): لە وێنەی نییە/ بێوێنەیە.
٢-(ضَـدَّ- القِرْبَـةَ. ضَـدّاً): کوندەکەی یان مەشکەکەی پڕکرد.
٣-(أضَدَّ): تووڕە بوو.
(ضدي: ضَـدِيَ. يَضْـدى- عَلَيـهِ ضَدىً): لێیتووڕە بوو.
(ضـادٍ (م) ضادِيَة (ج) ضَـوادٍ وضادِيات): تووڕە بوو/ گەرمبوو/ ڕقهەستاو.
(ضادَى- هُ مُضاداةً): بەربەرەکانێیکرد/ دژی وەستا.
(أضْدى- الاناءَ. إضـداءً): قاپەکەی لێوانلێو پڕکرد.
ضَرّ: ١-(ضَرَّ- فُلانـاً وبِفُلانٍ. ضَرّاً وضُرّاً): زیانی بە فیسار گەیاند/ زیانی لە فیسار دا.
(ضُرَّ بَصَرُهُ): چاوی کوێر بوو.
(ضَرَّرَ- هُ تَضْريراً): زیانی زۆر پێگەیاند.
(ضـارَّ- هُ. ضِـراراً و مُضـارَّةً): زیانـی

پێگەیاند.

(أَضَرَّ- الرَجُلُ): کوێر بوو.

(-ه): تووشی زیانیکرد.

(تَضَرَّرَ): تووشــی زیانبــوو/ زیانی لێکەوت/ بەرزیانکەوت.

(إِسْـتَضَرَّ- بِهِ): بەو یان بە هۆیەوە تووشـــی زیانبوو/ زیانی بەرکەوت.

(اَلضَرّ والضُرّ والضَرَر (ج) أَضْرار): ١-زیان/ ومزنـــد ٢-تەنگانـــەو ناهەمواریـــیو ڕەجاڵیی ٣-کەمبوونو کەموکورتیی شت.

(الضَــرَّاء): ١-تەنگانـــەو ناحۆشـــی/ داماویـــی/ نەهامەتیی ٢-گرانیی/ قاتو قڕیی ٣-کەمبوونەوەی (خەڵك/ سەر، کەمدەرامەتیی).

(اَلضَــرَّة): ١-جارێــك زیان لێکەوتن ٢-ســـزا/ ئەشکەنجە/ تووشی ئازاربوون ٣-ناگوزەرانییو داماویی.

(اَلضَرارَة): ١-کەمبوونەوەیسەروکەمدەرامەتیی ٢-کوێربوون (کە لە پەککەوتندایە).

(اَلضَّــار): کەڵکبەخــش. یەکێکــە لــە ناوە پیرۆزەکانی خودا.

(اَلضارُورَة): زیان/ ومزند.

(اَلضَریــر): ١-زیانپێگەیەنـــراو/ دامـــاو/ زیانخواردوو.

(اَلضَریر (ج) أَضِرّاء وأَضْرار (م) ضَریرَة (ج) ضرائِــر): ١-نابینا/ کوێر ٢-نەخۆشـــی لاوازو بێهێــز ٣-هەرچی زیانمەندو زیان خواردووە/

هەرچی ومزندی پێگەیشتووە.

(اَلتَضِرَّة والتَضُرَّة): پەککەوتەیی/ پەرێشانیی/ داماویی.

(اَلمَــضَــرَّة (ج) مَــضَــار): ١-زیـــان ٢-دەرد ٣-نەهامەتیی ٤-بارخراپیی.

٢-(ضَـــرَّ- هُ إِلى كـــذا ضَرّاً وضُـــرّاً): ناچاری ئەومیکرد/ پەنای ئەوەی پێبرد.

(ضـــارَّ- هُ ضِـــراراً ومَضـــارَّةً): لەگەڵیـــدا ناکۆکبوو/ دژی ومســـتایەوە/ پێچەوانەی ئەو بوو/ لەگەڵیدا ڕێکنەکەوت.

(أَضَـــرَّ- هُ علـــى الأَمـــرِ): بـــە زۆر ناچاری کارمکەیکرد.

(إِضْطَـــرَّ- هُ إِلى كـــذا): بـــە زۆر ناچـــاری ئەومیکردو پەنای ئەوەی پێبرد.

(أُضْطُرَّ): ناچارو داماوکـــرا/ بۆ ئەوە پەنای پێبرا.

(اَلضَـــرّ): بەڵا بەســـەرخۆدا هێنـــان/ ژنزۆر هێنان.

(اَلضَرُّة): پێداویستی.

(اَلضَرُورَة والضّارورَ والضّارُورَة والضارُوراء): پێداویستی/ بۆدامان.

(«الضَرورات تُبیحَ المَحْظورات»): پێویستیی زۆرو داماویی کاری نەشیاو بە مرۆڤ دەکاتو نەشیاو شیاو دەبێت.

(اَلضَّـــرُورِيُّ): پێداویســـتیی زۆر/ ناچارییو داماویـــی زۆر ٢-ئـــەوەی کە مـــرۆڤ ناچاری

بکریّت/ زۆری لیّبکریّت ٣-بیّدەسەڵاتکردنی مرۆڤو کارپیّکردنی یان وازپیّلیّهیّنانی ئەو کارەو ئەو شتە.

٣-(ضَارَّ إمْرَأتَهُ): ژنیّکی بەسەر ژنەکەی هیّنا/ هەویّی بەسەر ژنەکەی هیّنا.

(أَضَرَّ- الرَّجُلُ): پیاوەکە ژنیّکی بەسەر ژنەکەی خۆی هیّنا.

(اَلضِرّ والضُرّ): چەند ژن هیّنان بەسەر ژنەکەی خۆی.

(ضَرَّةُ المَرْأةِ): هەویّی ژن.

(ضَرَّتان): دوو هەویّ (ج) (ضَرائِر)

(«بَینَهُم داءُ الضَرائِر»): دەردی ئیّرەییان لە نیّواندا هەیە/ چاوچنۆکیی گرتوونی.

(اَلضَّریر): رقلیّبوونەوە.

(رَجُلٌ مُضِرٌ): پیاویّکە ژنی بەسەر ژنەکەی خۆی هیّناوە.

(إمْرَأةٌ مُضِرٌ ومُضِرَّةٌ): ژنیّکە هەویّسارە/ چەند هەویّیەیە.

٤-(ضارَّ- هُ. ضِراراً ومَضارَّةً): خستیە پاڵ خۆی.

(أضَرَّ- بِهِ): زۆر لیّی نزیکبووەوەو پیّوەی (نووسا/ لکا).

٥-(أَضَرَّ- إلَیهِ وعَلَیهِ): پەلەو هەڵپەی بۆ کرد/ نیشتەسەری.

(-یَعدُو): زۆرتر پەلەیکردو گوری دایە خۆی.

(-علی السَّیر الشَّدید): ئارامی لەسەر خیّرا رۆیشتنەکە گرت.

(اَلضَریر): ١-ئارامگرتن/ خۆگرتن/ دان بەخۆداگرتن ٢-زۆر بە ئارام/ زۆر خۆراگرو بە تابوشت.

(«إنَّهُ ضَریرٌ وذو ضَریرٍ علی االشيءِ»): بە ئارامەو خۆراگرە لەسەر ئەو شتەو بە تابوشتە.

(«ناقَةُ ذات ضَریر»): میّحوشتریّکی بە ئارام بە کیّشە لەسەر (شەکەتبوون/ ماندووبوونیّکی زۆر).

٦-(أَلضَّرّ (في استعمال العامة) (ح): وردە میّروولە (راستی وشەکەش (ألذَرّ)ە).

(اَلضَرَّةُ): ١-بنی گوان/ بنی مەمك ٢-هەموو مەمك یان هەموو گوانەکە ٣-دارای زۆر.

(اَلضَرَّتان): دوو بەرداشەکەی ئاشەك.

(اَلضَریر): لیّواری دۆڵەکە/ دەمی دۆڵەکە ٢-دەروون ٣-هەموو جوستە/ لەش خویّنو هەناو ئەویتری تەنو گرنگترین ئەندامی مرۆڤ.

الملحق:

ضر: (الضَّرُوریات): پیّداویستیەکان/ ئەو شتانەی بیّئەوە هەڵناکریّت.

(«ضَروریات الحیاة»): پیّداویستیەکانی ژیان.

---

ضرأ: (ضَرَأ- الشيءُ): شتەکە شاردرایەوە/

ونبوو.

(إنْضَــرَأَ- تِ الإبِـلُ. إنْضِراءً): حوشــترەکە مردارکرایەوە.

(-تِ الشَجَرَةُ): درەختەکە وشککرا.

ضرب: ١-(ضَــرَبَ- ه ضَرْباً): پیایدا کێشــا. شمشــێرێك یــان دارێك یان شــتێکیتری پێدا کێشا.

(-تِ العَقْرَبُ): دووپشکەکە پێوەیدا.

(-العَدُوَّ بِقَنابِلَ مدافِعِهِ أو بِقَذائِفِهِ المُدَمِّرَة): دوژمنی دایە بەر گوللە تۆپەکانی یا مووشەکە کاولکەرەکانی.

(ضَرُبَ- ضَرابَــةً): لێدانەکەی توندو چاكو رێك بوو/ تێیگرت.

(ضَرَّبَ- هُ): باش‌و زۆر پیایدا کێشا/ لێیدا.

(ضــارَبَ- هُ مُضارَبَــةً وضِرابــاً): ١-لــە بەیەکدادانــدا (بەزاندی/ بــۆری پێدا) ٢-ئەو دوانە کێشــایان بەیەکتریدا ٣-شــەرەقامچیان لەگەڵ یەکدا کرد.

(أضْرَبَ- الخُبزُ): نانەکە برژا.

(تَضــارَبَ- القَــومُ): کەوتنــە لەیەکــدان‌و بەگژیەکداچوون.

(إضطَــرَبَ- القَــومُ): بەگژیەکداچــوون‌و لەیەکتریاندا.

(«إضْطَرَبَ حَبْلُهُم»): ناتەبابوون‌و قســەیان یەکی نەگرت.

(ألضَربَةُ): ١-پێداکێشــانێك/ جارێك لێدان/ جارێك ناکۆکیی.

(«لاآخُــذُ مالي عَلَيــكَ إلاّ ضَربَةً واحدة»): بەیەك کوتەك/ پێداکێشانێك ئەوەی لە لاتەو بەسەرتەوەیە لێتوەردەگرمەوە.

(ألضَــرب والضَــرُوب): کوتەکوەشــێن/ دەستوەشێن/ لێدەر.

(ألضَرَّاب): فرە (پێداکێش/ لێدەر).

(«ضَرَّابَةُ الناقوس»): نێرکی زەنگ کە لەناو زەنگەکەدایەو هەر بە زەنگەکەدا دەکێشــێت زەنگەکە لە ئاسن یان مس دەکرێت.

(ألضَريب (ج) ضُرَباء): ١-لێدەر ٢-لێدراو.

(ألضَريبَــة (ج) ضَرائِب): ١-شــوێنی لێدانی لەش ٢-بە شمشێر لێدراو.

(-مِنَ السَّيفِ): تیژیی دەمی شمشێر.

(ألمَضْــرب (ج) مَضارِب): شــوێن یان دەمی/ کاتی لێدان.

(ألمَضرِب والمَضْرَب (ح) مَضارِب): ١-شمشــێر یان دەمی شمشــێر ٢-ئێسقانی کاسەی سەر کە مێشکی تێدایە.

(مَضْربَــةُ ومَضْرَبَةُ السَّــيفِ): تیژیی دەمی شمشێر.

(ألمِضْــرَب والمِضْــراب (ج)( مَضــارِب): ١-فرەلێدەر ٢-ئەوەی کــە زۆر پێی لێدەدرێت وەك پــەری دەســتی عودلێــدەرو نێرکــی ناوزەنگ‌و شتی لەو بابەتانە.

(ألمِضْرَبَةُ): ئامێری پێلێدان.

٢-(ضَرَبَ- الشـيءُ. ضَرْباً): شـتەکە بزوا/ جوولا.

(-العِـرْقُ): (ڕەگەکـە/ دەمارەکـە) لێیـدا/ پلیدا.

(الجرحُ أو الضِرسُ): برینەکە یان دانەخرێکە پلیداو ئازارو ژانەکەی توند بوو.

(-في الماءِ): لە ئاوەکەدا مەلەیکرد.

(-بيَدِهِ): بە دەست ئاماژەیکرد.

(-بالقِـدّاحِ): تیرەکانی قومـاری تێکەڵکردو گێڕای.

(-في البُوقِ): فووی بە بۆریەکەدا کرد.

(ضَرَّبَ- هُ في الحَرْبِ): بۆ جەنگین تیژیکردو هانیدا.

(تَضَرَّبَ الشـيءُ): شـتەکە جـوولاو تەکانو شەپۆلیداو بەیەکیدادا.

(إضْطَرَبَ): شـپرزە بوو/ جوولاو شەپۆلیدا/ بەیەکیدادا.

(-الأمرُ): کارەکە تێکچوو/ لەبارکەوت.

(-مِن كذا): لەو شتە وەڕس و دڵتەنگبوو.

(-في أُمـورِهِ): لـە کارەکانیـدا شـپرزەو سەراسیمەو ڕارابوو.

(اَلضَـرْب (ج) أَضْـراب): پیاوێکـی خاوەن چاکەو بەخشندەی لە ڕابوردوودا.

(اَلُمضْـرِب والمُضرِبَـة- مِن الحَيَّـات): ماری متبوو.

٢-(ضَرَبَ- الصَلاةَ. ضَرباً): نوێژیکرد.

(-الخَيمَةَ): دەوارەکەی هەڵدا.

(-اللَّيلُ): شەو درێژەی کێشا.

(-تِ العَنْكَبـوتُ نَسـيجَها): جاڵجاڵۆکەکـە (خانووەکەی تەنی/ تاڵی خانووەکەی چنی).

(-بنَفسِـهِ الأَرضَ) (ضد): ١-لە شـوێنەکەدا نیشـتەجێبوو ٢-لـە شـوێنەکە کۆچیکـرد/ باریکرد.

(ضَرَّبَ- المِظَلَّةَ بالخُيـوطِ): چەترەکەی بە دەزوو قایمکرد.

(أَضْرَبَ- في المَكانِ): لە شـوێنەکەدا مایەوەو نیشتەجێبوو.

(أَلضـارِب (ج) ضَوارِب): ١-شـەوی تاریك کە تاریکیەکەی درێژە بکێشێت ٢-شوێنی تەختو پڕ لە درەخت ٣-نیمچە دۆڵ.

(أَلِمضْرَب (ج) مَضارِب): (دەوار/ ڕەشـماڵ)ی گەورە.

٤-(ضَرَبَ- هُ البَردُ. ضَرْباً): تووشـی سەرما بوو/ سەرما لێیدا.

(ضَـرِبَ- النَباتُ ضَرَبـاً): گیاکە، ڕووەکەکە سەرما یان با لێیداو بردیو زیانی پێگەیاند.

(ضُرِبَ- تِ الأَرضُ): زەویەکە بەر زوقم یان بەفر کەوت.

(أَضْـرَبَ- القَـومُ): خوێشـگەل زوقـم یان بەفریان لێباری.

(أَلضَرْب (ج) أَضْراب): نەمەباران.

(مَطَرٌ ضَربٌ): بارانێکی نمە/ ڕشێنەباران.

(أَلضَريب (ج) ضَرائِب): ١-زوقم ٢-بەفر.
٥-(ضَرَبَ- على يَدِهِ): دەستیگرتو نەیهێشت ئەو کارە بکات.
(-القاضي على يَدِهِ): دادوەر دەستی بەسەر ماڵو سامانەکەیدا گرتو نەیهێشت دەستی بۆ بەرێتو هەڵیسوورێنێت.
(-على أُذنِهِ): نەیهێشت ببیسێت.
(-عَن فُلان كَذا): ئەوەی لە فیسار کەس گرتو نەیهێشت دەستی بیگاتێ.
(-فُلاناً عَن فلان): فیساری لە فیسار کەس کرد/ نەیهێشت پەیوەندیان هەبێت.
(«ضَرَبتُ عَنهُ صَفحاً»): خۆم لێلاداو پشتگوێم خست/ بەلایدا نەچووم.
(«ضَرَبتُ عَنهُ جَرْوَتی»): نەمویستو رۆیشتم.
(«ضَرَبَ بِذَقنِهِ الأَرضَ»): سەری لە زەویی چەقاند واتا زارەترەکبوو و ترسا.
(أَضْرَبَ- عَنهُ): لێیدوورکەوتەوە/ خۆی تێنەگەیاند/ مانیگرت.
(أَضْرَب العامِلُ عَنِ العَمَلِ): کرێکارەکە مانی لە کارەکە گرت، بۆ کارەکە نەچوو.
(مُضرِب (م) مُضرِبَة): مانگرتوو.
(الإضراب (ج) إضْرابات): مانگرتنی کرێکاران یان کۆمەڵە خەڵکێکی هاودەنگ بۆ مەرجێکی هاوبەشیانو لەسەر مانگرتنەکە برۆن بۆ بەدەستهێنانی خواستیان کە داوای دەکەنو دەیانەوێت.
٦-(ضَرَبَ- الزمانُ. ضَرباً): چەرخ، سەردەم/ چاخ تێپەری.
(-تِ الطَيرُ): پەلەوەرەکە/ باڵندەکە بە دوای خواردنو داندا رۆیشت.
(-بِنَفسِهِ الأَرضَ) (ضد): ١-گوزاریکرد/ سەفەریکرد ٢-گوزاری نەکرد.
(-ضَرباً وضَرَباناً في الأَرضِ): بۆ بازرگانی یان داگیرکردنی وڵاتان دەرچوو و رۆیشت.
(ضَرَّبَ-ت عَينُهُ): چاوی بە قوڵداچوو.
(ضارَبَ- هُ وضارَبَ- لَهُ في المالِ وبالمالِ): بە پارەی ئەو/ بە سەرمایەی ئەو بەرامبەر قازانجێکی دیار ئاڵشو وێڵشو بازرگانیکرد.
(الطَيرُ الضَوارِبُ): باڵندەی عەودالی خواردن.
٧-(ضَرَبَ- الشَيءَ بالشَيءِ): شتەکەی بەسەر شتەکەیتردا داو تێکەڵیکردن.
(ضَرَّبَ- الشيءَ بالشيءِ): شتەکانی تێکەڵی یەککرد.
(-النَجّادُ المُضَرَّبَةَ): هەلاجەکە لێفە لۆکەدارەکەی بە دەزوو بە لۆکەکەوە دروو.
(-تِ المرأَةُ اللِّحافَ): ژنەکە بەریگرتە لێفەکەو بە تەقەڵی درشت پێوەی دروو (عامية).
(أَلضَريبَة- مِنَ الصوف ونَحوِهِ (ج) ضَرائِب): تۆپەڵە خوری یان لەو بابەتە شیکرابێتەوەو ئامادەی رِستن کرابێت: برێسرێت.

(بساطٌ مُضَرَّبٌ): فەرشێك/ ڤاڵییەك دروابێتەوە.

(ألْمُضَرَّبَة): بەرگێکی ناودارو دووتوێ ناواخنەکەی لۆکە بێت.

٨-(ضَرَبَ- الدِرهَمَ. ضَرباً): سکەی لێدا.

(-الخاتِمَ): ئەموستیلەکەی دارشت و دروستکرد.

(-على المَكتُوب): نامەکەی مۆرکرد.

(إضْطَرَبَ فُلانٌ): داوایکرد بۆی دابرێژن و دروستیبکەن.

(إضطَرَبتُ خاتِماً مِن ذَهَب): داوامکرد ئەموستیلەیەکی زێرم بۆ دابرێژن و دروستیبکەن.

(«دِرهَمٌ ضَربٌ»): سکەیەکی لێدراو.

(دارُ الضَرب): (شوێن/ خانە)ی لێدانی سکەوپارە.

(اَلضَريبَةُ (ج) ضَرائِب): سروشت و نەریت و خوو دارشتن.

(هذه ضريبَتُهُ التي ضُرِبَ عَلَيها): ئەمە سروشتییەتی و وا دارێژراوە.

(المُضْرِب (ج) مَضارِب): رەسەن/ ریشە/ بێخ/ رەچەڵەك.

٩-(ضَرَبَ- الأَجَلَ. ضَرْباً): کات و دەمی دیاریکرد.

(-المَثَلَ): نموونەی هێنایەوەو دەریخست.

(-لَهُ سَهماً مِن مالِهِ): بەشێکی ماڵەکەی، سامانەکەی، داراکەی دایەو بۆ تەرخانکرد.

(ضُرِبَ- ذلك مَثَلاً): ئەوە کرا بە نموونە/ بە پەند/ بە نموونە هێنرایەوە.

(اَلضَرْب (مص) (ج) أَضْراب): ١-نموونە ٢-وێنە ٣-جۆری شت وەکو/ هاوشێوە ٤-سکەلێدان.

(اَلضَرْب (ج) ضُرُوب وأَضْراب وأَضْرُب- في العَروض): بەشی دوایی دێری دووەم لە هەڵبەستدا

(في قول الشاعِر):

(في فَمي ماءٌ وهَل يَنطِق مَن في «فيهِ ماءٌ»): ناو لە دەممدایە ئینجا ئەوەی ناو لە دەمیدا بێت قسەی بۆ دەکرێت؟

(اَلضَريب (ج) ضَرائِب): ١-پۆل/ جۆر/ چەشن ٢-چون/ وەکو/ هاوتا ٣-شێوە ٤-شێوەو روخساری مرۆڤ ٥-بەش/ بەرکەوت.

١٠-(ضَرَبَ- الجزْيَةَ عَلَيهِم): سەرانەی خستنە سەرو پێویستیکرد.

(-عَلَيهِم الذِلَّةَ): سەرشۆڕو کەساسیکردن/ زەبونیکردن.

(الضَريبَة (ج) ضَرائِب): ١-سەرانە ٢-باج.

١١-(ضَرَبَ- بَيْنَهُم. ضَرْباً): نێوانیانی تێکدا، دووزمانیی لە نێواندا کرد.

(-الدَّهْرُ بَينَنا): رۆژگار لێکیکردین.

(ضَرَّبَ- بَيْنَهُم): لێکیبەردان.

(اَلضَرْبَةُ): ١-گەندەڵیی/ خراپبوون

٢-كەمئەندامیی.
(ضَرَبانُ الدَّهر): لێقەومانی ڕۆژگار.
١٢-(ضَرَبَ- إليهِ. ضَرْباً): بەلای ئەودا لایدا/ ڕوویکردە ئەو/ ڕووەو ئەوە بوو.
(أَضْرَبَ): متبوو/ بێدەنگبوو.
(«أَضْرَبَ جَأْشاً لأَمرِ كذا»): خۆڕاگرانە خۆی بۆ ئەو کارە متو ئامادەو تەرخان کردووە.
١٣-(ضَـرَبَ- الحاسِـبُ كذا في كـذا ضَرباً): ژمێریارەکە ئەو ژمارەیەی لەو ژمارەیەدا.
١٤-(إِسْـتَضْرَبَ- العَسَـلُ): هەنگوینەکـە خەستو سپیبووەوە.
(أَلضَـرْب والضَـرَب): هەنگوینی خەسـتو سپی.
الملحق:
ضـرب: (أَلْمُضارَبَة) (مص): کێشـمەکێش/ پاڵەپەستۆو ڕکەبەریی.
(أَلْمُضارَبَـة التِجارِيَّة): لە کڕینو فرۆشـتندا یان پـارەو بەشـکردنیدا یان لـە کردەیتردا ڕکەبەریکردنو کێشمەکێشـکردن لە پێناوی قازانجو دەسـکەوتدا لە جیاوازی نرخەکانی ئەو کڕینو فرۆشتنەدا.

ضرج: ١-(ضَـرَجَ- الثَوبَ بالدَّم): بەرگەکەی خوێناویکرد.
(ضَرَّجَ- هُ): لەکەداریکرد/ پەڵاوییکرد.
(-الثَـوبَ): بەرگەکەی بە سـوور ڕەنگکردو پیسیکرد تەواو ڕەنگەکەی تێرنەکرد.
(-الأَنْفَ بالدَّم): خوێنی لووتی پڕژاند.
(تَضَرَّجَ — الشيءُ): لەکەدارو پەڵاویبوو.
(-الخَدُّ): کوڵمەکە ئاڵ هەڵگەڕا.
(أَلضَريج): ڕەنگسوورکراو نە تێرو نە کاڵ.
(الأَضريـــج): ١-ئاوریشـمی سـوور ٢-بۆیەی سوور/ ڕەنگی سوور ٣-بەرگی زەرد.
٢-(ضَرَجَ- الشيءَ. ضَرْجاً): شتەکەی دڕاند/ قڵیشاند.
(تَضَرَّجَ): دادڕدادڕ بوو/ قڵیشقڵیشبوو/ شیتڕ بوو.
(-الزَهْرُ): گوڵەکە دەمیکردەوە.
(إِنْضَرَجَ): قڵیشا.
(-لَنا الطريقُ): ڕێگەکەمان بۆ فراوانبوو.
(-مابَينَ القَـوم): لەیەکتری دوورکەوتنەوە/ ناتەبابوون.
(أَلمِضْـرَج (ج) مَضارِج): بەرگی کۆنی شـڕو وڕ.
(أَلمَضارِج): گێروگرفت، دەردیسـەری/ کێشەو نارەحەتیی.
(عَينٌ مَضرُوجَة): چاوێکی گەشی گەورە.
٣-(ضَـرَجَ- الشَـيءَ إلى الأَرضِ. ضَرجـاً): شتەکەی بە زەویدادا.
(ضَرَّجَ- الجيبَ): پشـتێنەکەی خاوکردەوەو شلکرد.
(-الإبلَ): حوشـترەکەی لە هێرشـبردنەکەدا (تاودا/ غارپێکرد).

(أَضْرَجَ- الجيبَ): پشتێنەکەی خاوکردەوە.
(إِنْضَــرَجَ-تِ العُقــابُ): کۆلارەکــە خۆی بە نێچیرەکەدا دا/ داپەڕییە سەر نێچیرەکە.
(عَــدْوٌ ضَريجٌ): تــاودان/ ڕاکردنێکی خێرا/ غاردان.
(الإضريج): چارەوێی تیژڕەو.
٤-(ضَرَّجَ- الكَلامَ): قسەکەی پوخت/ ڕازاوەو جێژدار کرد.
(تَضَرَّجَ-تِ المَرْأَةُ): ئافرەتەکە خۆی ڕازاندەوەو ئارایشتی تەواویکرد.
٥-(أَلضَرْجَع (ج)ضَراجِع) (ح): پڵنگ.
ضرح: ١-(ضَرَحَ- الشــيءَ ضَرحاً): شتەکەی قڵیشاند/ هەڵقڵیشاند/ دادری.
(-القَبرَ): گۆڕەکەی هەڵکەند.
(-لِلمَيت): گۆڕێکی بۆ مردووەکە هەڵکەند.
(إِنْضَرَحَ- الشيءُ): شتەکە شەقیبرد.
(أَلضَريح (ج) ضَرائِح): گۆڕ/ گڵکۆ.
٢-(ضَرَحَ- الشيءَ): شتەکەی لاداو پاڵپێوەنا/ دووریخستەوە.
(«ضَرَحــتُ عَني الثَــوبَ»): جلەکەم لەبەر خۆم داکەند.
(-تِ الدابَــةُ بِرِجْلِهــا. ضَرْحــاً وضِراحاً): چوارپێکە لەقەیوەشاند.
(ضارَحَ- هُ): ١-شتیانگرتە یەکتری ٢-جنێویان بەیەکتریــدا ٣-لــە یەکــتری نزیکبوونــەوەو یەکتریان چاوپێکەوت.
(أَضْرَحَ- هُ): دووریخستەوە.
(إِضْطَرَحَ- الشــيءَ): شتەکەی فرێدا/ تووڕی هەڵدا.
(إِنْضَرَحَ- مابَينَ القَوم):خوێشگەل لە یەکتری دوورکەوتنەوەو ناتەبا بوون.
(أَلضَــرْح): لــە یــەك دوورکەوتنــەوە/ لە یەکپچڕان/ ناکۆکبوون.
(نِيَّةٌ ضَرَحٌ): نیازێکی دوور.
(أَلضَروح- مِــنَ الــدَّواب): چوارپێی جوتە وەشێن.
(قَوسٌ ضَــرُوحٌ): کەوانێکی کرژ کە تیر باش بهاوێت.
(أَلضَريح (ج) ضَرائِح): دوور.
٣-(ضَــرَحَ-تِ الســوقُ ضُرُوحــاً وضَرْحاً): بازارەکە کەوتو کز بوو.
(أَضْرَحَ السُــوقَ): بازارەکەی خست/ شکاند/ وەستاند.
٤-(أَضْرَحَ- هُ): گەنیکرد/ خراپیکرد.
(أَلضَرَح): پیاوی پیس/ خراپ/ بەدرەوشت/ گەن.
(أَلضَرْح): پیست.
(أَلمَضْرَح): ١-(ح) هەڵۆ ٢-(ح) دالی باڵدرێژ.
(أَلمَضْرَحيّ= المَضْرَح): ١-هەڵۆ ٢-دالی باڵدرێژ ٣-گەورەی جوامێرو بەخشندە.
(أَلمَضْرَحيُّ): هەموو شتێکی سپی.
ضرس: ١-(ضَرَسَ- الشَيء. ضَرْساً): بە خرێی

(توند گەستی/ گازێکی توندی لێگرت).
(«ضَرَسَهُ الدَّهرِ»): ڕۆژگار سەختیی لەگەڵدا نواند.
(«ضَرَسَــتْهُ الخُطوبُ»): تاڵیی‌و گیروگرفتی زۆر ڤاڵیکرد.
(ضَــرَسَ- البِئرَ): (چاڵاوەکــەی/ بیرەکەی) هەڵچنی.
(-الرَجُلُ): لــە بەیانییەوە تا شــەوێ دەمی (لێکنــا/ هەڵنەپچــڕی) (لــە گەســتنەوە وەرگیراوە وەکو دانی بە زمانیدا نابێت‌و ئیتر بێدەنگبووبێت).
(ضَــرِسَ-تِ الأَســنانُ. ضَرَســاً): دانــی بە شتیتڕش (ئاڵبووەوە/ کوڵبو).
(ضَــرَّسَ- هُ الزَّمــانُ): ڕۆژگــار لەگەڵیــدا سەختبوو.
(-تْهُ الحــرُوبُ أَوِ الأَيامُ): شــەڕ یان ڕۆژانی سەخت ڤاڵیانکردو ئەزموونداریانکرد.
(ضــارَسَ- الأُمورَ): کاروبــاری تاقیکردەوەو لێوەی فێرو شارەزا بوو.
(-هُ): لەگەڵیدا جەنگی‌و دوژمنایەتیی لەگەڵدا کرد.
(أَضْرَسَ- هُ بِالکَلامِ): بە قسە (دەمکوتیکرد/ بێدەنگیکرد).
(-هُ): تووشی دڵخوردییکرد.
(-الحامِــضُ الأَســنانَ): ترشــییەکە دانــی ئاڵکردەوە/ کوڵیکرد.

(تَضارَسَ- القَــومُ): بوونە دوژمنی یەکتری‌و لەگەڵ یەکدا جەنگین.
(-البِنــاءُ): خانەکە/ بیناکە کــەچ‌و کۆمبوو وەك خرێ ڕێکنەبوو.
(أَلضِرس (ج) أَضْراس وضُرُوس) (ع ا): دانی خــرێ کە پێنج یان چوارن لە هەر لایەك‌و لە دواوەن/ دانی کاکیلەن.
(- ج ضُرُوس): ١-ئــەو بەردانەن کە چاڵاوی پێهەڵدەچنــن ٢-گردێــك کــە ســەرکەوتنی گرانبێت.
(أَلضَــرِس): ١-دڕو بەد سروشــت/ شــەڕانی ٢-کەســێکی خاوەنئەزمون کە زۆر گەڕابێت‌و چووبێتە شــەڕەوەو جەنگیبێت ٣-کەسێك کە لە برساندا بە گژدا بچێت‌و توورە بێت.
(أَلضَروس- مِــنَ النُوق): حوشــترێکی دڕو چەتوون کە لە کاتی دۆشینیدا گاز بگرێت.
(حَــربٌ ضَــروس): جەنگێکــی ســەختی فەوتێنەرو کاولکەر.
(أَلضَريس (ج) ضَراســی): بڕبڕاگەی پشــت ٢-چاڵاوی بە بەرد هەڵچنراو ٣-برسی.
(أَلمُضَــرَّس) (مفــع): گرفتــاری چورتووم‌و نەهامەتیی.
(-مِنَ الوَشي): نیگار وێنە بە شێوەی خرێ.
(رَجُلٌ مُجَرَّس مُضَرَّس): پیاوی بە ئەزموون‌و دنیادیدە.
(أَلتَضريــس (ج) تَضاريس): نیگارو هێڵ لە

یاقــووت یان مرواری یان لە تەختەدا کە وەك خرێ وا بێت.
(«فِي الياقوتَــةِ تَضريسٌ): یاقوتەکە نیگاری وەك خرپێ تێدایە.
(تَضاريــسُ الأَرضِ): بــەرزو نزمیــی ڕووی زەوی.
٢-(ألضِرس (ج) ضُــرُوس): بارانێکی کەم/ ڕشێنە باران.
(وقعــت فِي الأَرضِ ضُــروسٌ مِــن مَطَــر): ڕشێنەیەکی بارانی کەم باریو جێ جێ بوو.
ضرض: (أَلضَرْضَمُ): ١-(ح) شێر ٢-(ح) نێرەی درندەکان.
ضرط: ١-(ضَرَطَ. ضَرْطاً وضَرِطاً وضُراطاً وضَريطاً): تڕیکەند.
(ضَرَّطَ- الحِمارُ): کەرەکە زۆر تڕی.
(أَضْرَطَ- الحِمارَ): کەرەکەی تڕاند.
(-بِفُــلانٍ): جڕتی بۆ فیســار لێــداو گاڵتەی پێکرد.
(أَلضُرَّاط والضَــروط والضِرَّوط): ١-تڕکەن ٢-زۆر تڕکەن.
٢-(ضَــرِطَ. ضَرَطاً): ڕیشــی تەنكو برۆی باریکبوو.
(أَضْرَط): ڕیشك تەنكو برۆ باریك.
٣-(مُضَــرِّطُ الحِجارَةِ): لەبەر بەســامیی بە (عمرو کوڕی هند)یان وتوومو نازناوی بووە.
ضرع: ١-(ضَرَعَ- مِنَ الشــيءِ. ضُرُوعاً): لە شتەکە نزیکبووەوە.
(-تِ الشَمسُ): خۆرەکە ئاوا بوو یان خەریکی ئاوابوونبوو.
(ضَــرَّعَ- مِن فُــلان): بە پێــچو پەناو خۆ تێهەڵسوون لە فیسار نزیکبووەوە.
(-تِ الشَــمسُ): خۆرئاوابــوو یــان نزیکــی ئاوابوونبوو.
(-تِ القِــدرُ): دەمــی داگرتنــی مەنجەڵەکە هات.
(-الرُبُّ): دۆشاوەکە خراوەتە سەر ئاگر بەڵام هێشتا نەبووە/ نەگەیشتووە.
(ضــارَعَ-تِ الشَــمسُ): خۆرەکــە خەریکی ئاوابوونە.
(-القِدرُ): کاتی داگرتنی مەنجەڵەکە هات.
(تَضَــرَّعَ): ١-پاڕایــەوە/ داســتدامانبوو ٢-بە کلکەلەقێو خۆتێهەڵسوون لێینزیکبووەوە.
(-الظِــلُّ): ســێبەرەکە کشــایەوەو کــورت بووەوە.
٢-(ضَــرَعَ- فَرَسَــهُ. ضَرعــاً): چارەوێکەی ڕامکرد/ دایمرکاند.
(ضَــرَعَ وضَرِعَ وضَرُعَ. ضَرَعــاً وضَراعَةً): بێهێز بوو/ بێتوانا بوو.
(-إلَيهِ): ملکەچو سەرشۆڕبوو/ دەستدامانیبوو.
(ضــارِع وضَــرِع (ج) ضارِعــون و ضُرُوع وضَرَعَة): ١-نزاکار ٢-لەبەردەســتدا کەساسو زەبوون/ ملشۆڕ/ ملکەچ/ دەستدامان.

(أَضْـــرَعَ- الرَجُلَ): پیاوەکەی کەساســکرد/ زەلیلکرد/ سەرشۆڕیکرد.
(-تِ الحُمّــى فُلانــا): تاکــه بێهێزیکــردو پەکیخست.
(«اَلحُمّى أَضْرَعتنــي لِلنَّوم»): تاکە ناچاری ناو جێگەیکردم (بۆ ناچاریی‌و چاوبەرەژێریی پێویستیی دەوترێت).
(-تْهُ الحاجَةُ إِلى فُلان): نەبوونی‌و پێویستیی ناچاری دەستدامانی فیساریکرد/ چووە خاك‌و پای پەنای بۆ برد.
(-لِفُلانٍ مالاً): دارای پێبەخشی‌و باربوویکرد/ یاریدەیدا.
(تَضَـــرَّعَ): لالایـــەوە/ پاڕایەوەو کەســـایی‌و سەرشۆڕیی پیشاندا.
(-اللهِ): لە خودا پاڕایەوەو لالایەوە.
(إِسْــتَضْرَعَ- لَــهُ): کوڕنووشـــی بـــۆ بـــرد/ بێدەســـەلاتیی‌و زەبوونـــی خۆی (پیشـــاندا/ نواند).
(اَلضَــرَعُ) (مــص): ١-بێدەســـەلات/ بێتوانا ٢-زۆرترسنۆك.
(«رَجُلٌ ضَـــرَعٌ»): پیاوێکی زیرەکردوو/ زۆر ترسنۆك.
(«قَومٌ ضَرَعٌ»): خوێشگەلێکی زۆر ترسنۆك.
(اَلضارِعُ): ١-باریـــك ٢-لاوازو بێهێز ٣-هەموو شتێکی بچووك.
(اَلأَضْـــرَعُ= الضـــارِعُ): ١-باریکـــتر ٢-لاوازو بێهێزتر ٣-بچووکتر.
(اَلضَروعُ): سەرشۆڕ/ کەسێکە بێدەسەلاتیی‌و کەساسیی بنوێنێت.
٣-(ضارَعَ- هُ): لەوچوو.
(تَضارَعــا): ئـــەو دوانە لەیەکچـــوون/ وەکو یەکبوون.
(اَلضِرعُ (ج) ضُرُوعُ): نموونە/ چون/ وەکو.
(اَلْمُضــارِعُ): ١-هاوشـــێوە/ لێچـــوو/ هاووێنە ٢-کرداری ڕانەبوردوو ٣-یەکێکە لە کێشەکانی هەڵبەست/ شیعر.
٤-(أَضْرَعَ- تِ الشاةُ): ١-مەڕەکە گوانیکرد یان گوانی گەورە بوو.
(ضَرعاء وضَرُوع وضَريع وضَريعَة): مەڕی گوانکردو یان گوانگەورە بوو ٢-مەڕەکە پێش زانی شیری لەبەر ڕۆیشت/ شیری دادا.
(اَلضَرْع (ج) ضُرُوع): گوانی مەڕو مانگاو لەو بابەتەو وەك مەمکی ژن.
(اَلضَرعـــاء والضَريعَة مِنَ الشـــاء والبَقَر): مەڕو مانگای گوانگەورە/ گوانزل.
(اَلضَرُوع= الضَرعاء): گوانگەورە/ گوانزل.
٥-(اَلضِرْع (ج) ضُروع): قایمیی گوریسەکە.
ضَـــرغ: ضَرْغَـــمَ وتَضَرْغَـــمَ: وەك شـــێر جوولایەوەو پەلاماریدا/ وەك شێر بوو.
(اَلضَرْغَم (ج) ضَراغِم) (ح): شێر.
(اَلضِرْغام والضِرْغامَة): ١-(ح) شێر ٢-دلێر/ ئازا/ نەبەرد/ دلاوەر ٣-بەهێز.

ضرف: ١-(أَلضَرْف (عند العامة): لای ڕەشە خەڵکەکە دەفرێکی پێستە بۆ ڕۆن و چەوری و شلە ڕۆنی تێدەکەن ڕاستیەکەیشی (أَلظَرف)ە بەرامبەرەکەی (الزِق)ە: هیزەی ڕۆن.
(أَلضُرفَةُ): مشە/ فرە/ لێشاو.
(«هُـوَ فِي ضُرفَـةِ عَيـشٍ»): ئەو لـە تێرو تەسەلیی ژیاندایەو شت لای ئەو مشەیە.
٢-(ضَرْفَطَ- هُ بِالحَبلِ): بە گوریسەکە توند بەستی و شەتەکیدا.
ضرك: (ضَرُكَ. ضَراكَـةً): توندو تیژ بوو/ ڕەقبوو.
(أَلضُـرَاك): ١-پیاوی توندوتیـژ/ دەمارگیر/ ڕەق ٢-کەللەڕەق و نەزاندوو ٣-(ح) شێر.
(أَلضَريـك (ج) ضَرائِك وضُـرَكاء): ١-گەوج ٢-کوێر ٣-پەککەوتەو کەنەفت یان کەمئەندام و ناتەواو ٤-هـەژاری پەککەوتەو ڕەجاڵ ٥-نێرە سیسارك.
ضرم: ١-(ضَرِمَ. ضَرَماً): زۆر برسـیبوو یان زۆر توورە بوو.
(-عَلَيهِ): لێی توند بوو/ زۆر لێیتوورە بوو.
(-فِي الطَعام): لە خواردندا (چاك تێهەڵچوو/ باشی خوارد).
(تَضَـرَّمَ- الرَجُـلُ عَلَيـهِ): لێیتـوورەو گەرمبوو.
(أَلضَرَم) (مص): توورەیی برسێتیی.
(أَلضَرِم): برسی.

٢-(ضَـرِمَ-تِ النـارُ. ضَرَمـاً): ئاگرەکـە بەربووەوەو کڵپەی سەند.
(ضَـرَّمَ وأَضْـرَمَ واسْـتَضْرَمَ- النـارَ): ئاگرەکەیکردەوەو ئاگرەکەیخۆشکردو گراند.
(تَضَـرَّمَ-تِ النارُ): ئاگرەکە (کڵپەی سـەند/ گڕی بەرزبووەوەو خۆشبوو).
(إضطَرَمَ-تِ النارُ): ئاگرەکە کڵپەیسەند.
(-المَشيبُ): مووی سپی لەشیگرتەوە.
(أَلـضَـرَم): داری ئـاگـر پـێـکـردنـەوەو پێخۆشکردن.
(«نَفَخـتُ فِي غَـيرِ ضَـرَمٍ»): فـووم بـە خۆڵەمێشـدا کرد یان ئاسنی ساردمکوتا واتا: ڕەنجی بێهوودەمدا.
(أَلضَرَمَة (ج) ضَرَم): ١-پشکۆی ئاگر ٢-ئاگر.
(«مافِي الدَّارِ نافِخُ ضَرَمَة»): ئاگرکەرەوەیەك یان کەسێك کەفوو لە پشکۆکە بکاتو ئاگرەکە بگرێنێت لەماڵەکەدا نییە.
(أَلضِـرام): ١-ئاگرگرتـن/ ئاگربەربوونەوە/ زمانەکێشانی ئاگر/ گڕگرتن ٢-ئاردەدار.
(أَلضِرامَـةُ): دارو چیلکەو چەواڵێك کە ئاگر زوو بگرێتو پێیبکرێتەوە.
(أَلضَريم): سووتان/ ئاگربەروبونەوە.
٢-(أَلضُـرْم) (ن): درەختێکـە بۆنخـۆش بەرەکـەی وەك بـەڕووە گوڵەکەی وەك گوڵی جاترەیە.
(أَلضِرْم) (ن): ١-الضُرْم ٢-(ج) بەچکە داڵ.

أَلضَرم (ح): بەچکەداڵ.
(أَلضِرام): دەشت/ زەویی بەرفراوان.
(أَلضِرامَة) (ن): درەختی قەزوان.
(أَلضِريمَ): کەتیرەی درەخت.
ضـــرا: ١-(ضَرا- العِـــرقُ. ضُـــرُوًّا): دەماری خوێنەکە بێپسان خوێنی لێرۆیشت.
ضَرِيَ. (يَضرى- بالشــيءِ ضَـــراوَةً وضَرىً وضَرياً وضَراءَةً): خووی بە شتەکەوە گرت/ پێوەی ڕاهات/ حەزی لێکردو فێریبوو.
(ضَـــرِيَ- الكَلْـبُ بِالصَيــدِ ضَـــرىً وضِراءً وضَراءً): ١-ســـەگەکە بەڕاو ڕاهات/ فێریبوو/ چەشـــەی ڕاو بوو ٢-چەشەی گۆشتو خوێنی نێچیرەکە بوو.
(ضَــرِي وضــارٍ (م) ضارِيَـــةٌ (ج) ضَـــوارٍ): چەشەی خوێنو گۆشتی نێچیر.
(-النَبيذُ. ضَـــرىً): مەیەکە خەســـتو تیژ بوو.
(ضَرَّى- الكلبَ بالصَّيدِ): ســـەگەکەی (فێرە ڕاوکرد/ بەڕاو ڕاهێنا) و چەشەی ڕاویکرد.
(أَضْرى الكلبَ بالصَّيدِ): سەگەکەی فێرە ڕاو کردو چەشەی ڕاویکرد.
(-الرَجُلُ): مەیی کورۆکی بنی دارخورماکەی خواردەوە.
(أَلضِـــرْو (م) ضِـــرْوَة (ج) ضِـــراء وأَضْرٍ): ١-تانجیی ڕاو/ سەگی ڕاو ٢-سەگی دڕ.
(أَلضَرى) (مص): دڕندەیی و سەختیی شەڕ.

(ضَـــراوَةُ الحَـــرب): دڕندەیـــیو گەرمیـــیو توندیی شەڕ.
(«حَـــربٌ ضارِيَـــة»): جەنگێکـــی دڕندانەی بێبەزییانە.
(أَلضَرِيّ): ئاوی فەریکە خورما لەگەڵ ئاردی کورۆکی دارخورما تێکەڵدەکەنو دەکرێت بە مەی.
(أَلضاري- مِنَ الآنية): فێرە مەی بوو.
(أَلضَّـــواري): کـــۆی وشـــەی (أَلضَّاري)یـــە ١-دڕ ٢-چەشـــەو ڕاهاتـــووی گۆشـــتو خوێـــن ٣-خووپێوەگرتوو.
(أَلضاري- مِنَ الحَيَوانات): زیندەوەری دڕندە وەك شێرو پڵنگ.
٢-(ضَـــرا- الرَجُلُ ضُرُواً): خۆی شـــاردەوە/ خۆی پەنادا/ خۆی ونکرد.
(إِســـتَضْرى- لِلصَّيـــدِ): بـــۆ نێچیرەکە خۆی نایەوەو بە پارێز بۆیچوو.
(أَلضَراء): خۆنانەوە/ خۆشاردنەوە بۆ شتێك/ خۆبۆسەدان/ چوونە بنەوە.
(«هو يَمشـــي الضَـــراء»): بە دزییـــەوەو بە پارێز بەناو درەختەکاندا دەڕوات.
(أَلضَراء): ١-دارســـتانی چڕ ٢-دەشـــتو دەرو هەوای بەرەڵا.
ضرى: (ضَرَى- العِرقُ بِالدَّم ضَرياً): خوێن لەبەر دەمارەکە ڕۆیشت.
ضرِيَ: خوێنی لەبەر ڕۆیشتووی دەمار.

ضرز: ١-(ضَرَّ. ضَرَزاً): لالغاوەی تەسكبوو.
(أَضَرَّ- ەُ): هاریی.
(-عَلَیهِ): چرووكیی بەرامبەر كرد.
(ألأَضَرّ (ج) ضُرّ): ١-لالغاوە تەسك ٢-كەسێكە كاكیلەكانی نیشتبنە سەریەك‌و باش قسەی بۆ نەكرێت‌و لە قسەی نەگەن.
٢-(ألأَضَرّ (ج) ضُرّ): بەدخوو/ بەدرەوشت.
(ألمِضِـــرّ): ١-بەدرەوشـــت ٢-تـــوورەو تـــرۆ/ قوشقی.
ضرن: (ضَرَنَ- ەُ. ضَرناً): ئەوەی لێدەســـت نەكەوت كە ئەو دەیویست.
(تَضارَنَ- القَومُ): بۆ دەســـتكەوتنی شـــتەكە كەوتنە زۆرانبازی‌و بەزاندنی یەكتری.
(ألضَیزَن): ١-راگری بروابێكردن/ كەســـێكی جێـــی بـــروا ٢-كـــورو كـــورەزای پیاوەكـــە ٣-هاوبەشـــەكانی پیاوەكـــە ٤-كەســـێك لـــە ئاوبردندا كێشمەكێشت لەگەڵدا بكات.
ضعّ: (ضَعضَعَ- ەُ): وێرانیكرد/ تەختیكرد.
(تَضَعْضَـــعَ): ١-ملیـــدا ٢-ســـەری شـــۆڕكرد ٣-پەكیكەوت‌و زەبوونبوو ٤-باری شلۆقبوو.
(«تَضَعْضَـــعَ بِه الدُّهـــرُ»): رۆژگـــار داماوو زەبوونیكرد.
(تَضَعْضَعَ): بە هۆی نەخۆشـــییەوە یان داخ‌و مەراقەوە بێتواناو لاواز بوو.
(-مالُه): تێشكا/ دارایی كەمیكرد.
(ألضَعْضَـــع والضَعضـــاع): ١-هەموو شـــتێكی بێهێز/ لاوازو شلۆق ٢-پیاوی بوودەڵەی بێڕاو برشت‌و بێدەسەڵات.
(ألضَعْضَعَة) (مص): توندوتیژیی/ زەبروزەنگ‌و سەرشۆڕكردن.
(ضعط. ضَعَطَ- ەُ ضَعْطاً): سەربڕی.
ضعف: ١-(ضَعُـــفَ. وَضَعُفَ ضَعْفـــاً وضُعْفاً وضَعافَةً وضَعافِیَةً): بێهێز بوو/ بێتوانا بوو/ بێدەسەڵاتبوو/ كەمتینبوو.
(ضَعَّفَ- ەُ): بێهێزیكرد ٢-لاوازیكرد.
(-الحَدیثَ): حەدیسەكەی بە دانراو دانا.
(ضَعَّفَ وتَضَعَّفَ واسْـــتَضْعَفَ- ەُ): بە لاوازی زانی یان بە بێهێزی (دایە قەڵەم/ دانا).
(أَضْعَفَ- ەُ): لاوازیكرد/ بێهێزیكرد.
(مَضعوف): بێتواناكراو/ لاوازكراو.
(أَضْعَـــفَ- الرَجُلُ): چوارپێكەی لاوازو بێهێز بوو.
(ألضُعْـــف): ١-لاوازیـــی ٢-بێهێزیی بێتوانایی/ بێدەسەڵاتی.
(- (عنـــد العامـــة): المَرَض: (لەلای رەشـــە خەڵكەكە) نەخۆشی.
(ألضَعْف): بێهێزیی.
(ألضَعَـــف): ١-بێهێزیی/ بێتوانایی ٢-ســـستی ئاوەزو بێهۆشیی/ لاوازیی راوبووەدەڵەیی.
(ألضَعْفان (ج) ضَعافـــی والضَعُوف): لاواز/ بێهێز/ ناتوان.
(ألضَعیـــف (ج) ضِعـــاف وضُعَفـــاء وضَعَفَة

وضَعْفى (م) ضَعيفَة): بێهێز/ لاواز/ نەتوان.
(-مِنَ الكَلام): ئاخاوتنی نارەوانو ناپاراو.
(-عند العامَّة): نەخۆش.
(«هُوَ ضَعيفٌ) (عامية): ئەو نەخۆشە.
(أرضٌ مُضَعَّفَة): زەوییەك بارانێكی كەمی بەركەوتبێت.
٢-(ضَعَفَ- القَومَ. ضَعْفاً): زۆریكردن تا چەندانەی دۆستەكانیانبوون.
(-الشيءَ): شتەكەی چەندانە كرد.
(ضَعَّفَ وضاعَفَ وأَضْعَفَ- ه):دوو چەندانەیكرد/ دوو ئەوەندەی لێكرد.
(تَضاعَفَ- الشيءُ): شتەكە (دووقاتیی/ دوو ئەوەندەی) خۆیبوو.
(ضِعْفُ الشيءِ (ج) أضعاف): دوو ئەوەندەی شتەكە یان چەندانەی شتەكە.
(«لَكَ ضِعفُهُ»): دوو هێندەی بۆ تۆ بێت یان سێئەوەندە یان پتر دەشێت بوترێت.
(«هذا ضِعفُ هذا»): ئەمە ئەوەندەی ئەوە.
(هذا ضِعفاهُ): یان ئەمە دوو ئەوەندەیە.
(أَضْعافُ الكِتابِ): نێوان دێرەكانیو ناوەراستی كتێبەكە.
(الأَضعافُ- مِنَ الجَسَدِ): ئەندامەكانی لەشو ئێسقانەكانی.
(مُضاعَفُ عدد صحيح (ن) (ع ح) هو حاصل ضرب (ن) في عدد صحيح): چەندانەی ژمارەیەكی تەواو وەك (ن) بریتیە لە لێكدانی (ن) لە ژمارە تەواوەكە.
(المضاعَفُ الأَصغر للعدد (ن) هو اصغر مضاعفاته): بچوكترین چەندجارەی ژمارە (ن) بریتیە لە چەندجارەكانی ئەو ژمارەیە.
(المضاعَف المشترك بين عدة اعداد صحيحة هو عدد يكون مضاعَفاً لجميعها): چەندجارەیەكی هاوبەشی چەند ژمارەیەكی تەواو ژمارەیەكە چەندجارەی هەموویانە.
(المُضاعَفة مِنَ الدروع): چەندانەكردنی قوڵفەی زرێ ئەوەیە ئەڵقەكانی زۆر بكرێتو دوو دوو بچنرێت.
الملحق:
ضعف: (التَضْعيف) (مص): دووقاتكردن.
(-في الحساب): لە ژمێرەدا ئەوەیە ژمارەیەك لەگەڵ ژمارەیەكی وەك خۆیدا كۆبكەیتەوە وەكو چوار لەگەڵ چواردا كۆبكەیتەوە دەكاتە هەشت.
(-في الصَرف): ئەوەیە پیتێك پیتێكی وەك خۆی بخەیتە سەریو بیانگرێت وەكو قدَّمَ واحْمَرَّ.

---

ضمل: (ضَمِلَ. ضَمَلاً): لەشباریك دەرچوو بە هۆی نزیكیی خزمایەتیی دایكو باوكیەوە.
ضعا: (ضَعا. ضَعواً): خۆی شاردەوەو ونبوو.
ضغَّ: ١-(أَضَغَّ-تِ الأَرضُ): زەویەكە ئاوی هەڵچنیو گیاكەی تێرئاو بوو.
(-القَومُ): خوێشگەل كەوتنە (لالەزارەوە/

باخ‌و باخچەی شکۆفەدارەوە).

(إِضْطَغَّتِ الأَرضُ): (گیای/ رووەکی) زەویەکە تێرئاو بوو.

(اَلضَغیغ): ١-پیت‌و برەو.

(اَلضَغیغَة): ١-لالەزار/ باخچەی شکۆفەدارو جوان ٢-ژیانی تێروتەسەلیی خۆش ٣-هەویری نەرم‌و شل ٤-کۆمەڵە خەڵکێك کە تێکەڵ بە یەك ببن.

٢-(ضَغضَغَ- الشیخُ اللُقمة): پیرە بێدانەکە پارووەکەی لە دەمدا هەر هێنای‌و بردی‌و جووی.

(-الرَجُلُ): کابرا هەر پڵتەپڵتیبوو کەس لێی تێنەدەگەیشت.

(-الکلامَ): درێژەی بە قسەکە داو هێنای‌و بردی.

ضغب: ١-(ضَغَبَ- ضَغباً): ١-وەك گورگ لوورانــدی یان وەك کەروێشك نوزانــدی‌و دەنگی لێوەهات ٢-زیراندی‌و تۆقی.

٢-(اَلضُغْبُوس (ج) ضَغابیس): ١-(ح) بەچکە ڕێوی ٢-پیاوی کەمتوانا/ بوودەڵە.

ضغث: (ضَغَثَ- الحَدیثَ ضَغثاً): قسەکانی بەیەکدادا/ تێکەڵ‌و پێکەڵیکرد.

(-الشيءَ): شتەکەی گرموڵە کرد/ کۆیکردەوە.

(-الثَوبَ): جلەکەی شت بەڵام پاکینەکردەوە/ نیمەشۆریکرد.

(ضَغُثَ- النَباتَ): گیا تەڕو وشکەکەی تێکەڵ بەیەککردو شەتەکیدان.

(أَضْغَثَ- الحالِمُ الرُؤیا): خەوبینەرەکە خەونەکەی تێکەڵ‌و پێکەڵ گێڕایەوە.

(إِضْغَثَ- الحَطَبَ): داری کۆکردەوە/ داریکرد.

(اَلضِغْث (ج) أَضْغاث): چەپکێك گیای وشك‌و تەڕی تێکەڵ.

(-مِنَ الخَبَرِ والأَمرِ): هەواڵ‌و کاروباری (تێکەڵ‌و بەسەریەکداچوو/ ناتەواوو ناراست).

(أَضْغاثُ أَحلام): خەونی (بێسەرو بەر/ بەیەکداچوو) کە بە کەڵکی لێکدانەوە نەیەت.

(کلامٌ ضَغثٌ وضَغَثٌ): قسەی (هیچ‌و پووچ/ بێفەرو کەڵك).

(اَلضَغیث) (مص): زەویی‌و گیای بە باران تەڕ بوو.

ضغط: (ضَغَطَ وأَضْغَطَ- هُ ضَغْطاً): ١-گووشی ٢-تەنگی پێهەڵچنی ٣-پەستاوتی/ گوشاری خستە سەر.

(ضَغَطَ- علیه): زۆری لێکرد/ زۆری بۆ هێنا (ئەمە تازەگەرییەکان وا دەڵێن).

(ضاغَطَ- هُ ضِغاطاً ومُضاغَطَةً): کەوتە کێشمەکێش لەگەڵیدا/ یەکتریان تەنگەتاو کرد.

(تَضاغَطوا): كێشمەكێشیان لەگەڵ یەككرد/ یەكتریان تەنگەتاو كرد.
(إنْضَغَطَ): ١-گوشاری خرایە سەرو بەزێنرا.
(إضتغط- علیە): (دەبوو بوترێت إضْطَغَطَ): زۆری لێكـرد كە بە ناچاریـی پارەیەك بدات وەك سزا.
(اَلضُغْطَـةُ): ١-گوشـار/ هێنانـە گیروگـاز/ ناچاركردن/ تەنگەتاوكردن ٢-زۆربۆهێنان.
(«أخَـذتَ فُلاناً ضُغطَةً»): كابـرات هێنایە گیروگاز/ زۆرت بۆ هێناو ناچاری شـتێكتكرد كە خۆی پێیناخۆشبوو.
(اَلضُغْطَة): سەختیو زۆربۆهێنان شەرمشەق/ نارەحەتیی.
(اَلضَغْطَـةُ): ١-بەزانـدن/ ناچاركـردنو تەنگەتاوكـردن ٢-ناچاریـی/ تەنگەتاویـی/ گوشار.
(ضَغطَـةُ القَـبرِ): گۆڕەوشـاری مـردوو لە گۆڕدا.
(اَلضاغِط) (فا): ١-چاودێر ٢-پارێزەری شـت ٣-پەسـتێنەر/ تەنگپێهەڵچـن: زۆرلێكـەر/ گوشاریار.
(اَلضاغوط): ١-مۆتەكە ٢-مەنگەنە.
(اَلضَغِـط (ج) ضَغْطـى (م) ضَغیطـةَ): راپووچەڵ/ بێڕا/ ڕا لاواز.
(اَلَمَضْغَـط (ج) مَضاغِـط): زەویـی نـزم/ نەویو.
(اَلمِضْغَطُ): ئامێری پێوانی پەسـتاوتی هەواو زانینـی ئەنـدازەی لـە زەوی بەرزبوونەوە هەروەها بۆ زانینی ئاڵوگـۆڕی هەواو گەرما، گۆڕانی كەش.
الملحق:
ضغـط: (اَلضاغِطَـة): ١-ئامێـری پێوانـی پەسـتاوتی گاز ٢-مەنگەنە كە بۆ پەسـتانی لۆكەو شتی لەو بابەتە بەكاردێت.
(اَلضَّغْط): ١-پەستاوتن/ شەتەكدان ٢-گوشار/ زۆربۆهێنان.
(اَلضَّغْط علـى اليَد»): دەستگوشـین ٣-زۆر بۆهێنانو ناچاركردن.
(«تَحْتَ الضَّغط»): بە زۆر/ لەژێر گوشـاری زۆردا.
(«تحت ضَغط الرأى العام»): لەژێر گوشاری ڕای گشتیدا.
(اَلضَغط- في الجراحَة): لە نەشـتەرگەریدا ڕێگەیەكـەو هۆیەكـە بـۆ بچووككردنەوەی هەندێك ئەندامی لەش كە ناتەواومو نەخۆشە یان بۆ لێكدانو كۆكردنەوەی هەندێك پارچەی لە یەكترازاوو جیا.
(ضَغْطُ الغاز أو الهَواءِ): پەستانی گاز یان هەوا بۆ چڕكردنو بچووككردنەوەی قەبارەیان.
(اَلضَغْـطُ الجَويّ): پەسـتانی هەوا لەسـەر شوێنێكی دیاری سەرزەوی.
(ضَغْـطُ الدَم أو الضَغــط): تەوژمی خوێن/

خوێنپەستان/ تەوژمی خوێن لەسەر دیواری بۆرییەکانی خوێن.

ضغم: (ضَغَمَ- الشيءَ وبِهِ. ضَغْماً): پڕبەدەم قەپاڵی پێداگرتو گەستی.

(«ضَغَمَهُ ضغمَةَ الأَسَـدِ»): گازێکی شێرانەی توندی لێگرت.

(اَلضُغامَـةُ): ئەوەی کە قەپاڵـی لێگیرابێتو پاشان تفکرابێتەوە.

(اَلضَيْغَم (ج) ضَياغِم): گازگر.

(اَلضَيْغَم والضَيغَمِيّ) (ح): شێر.

ضغـن: ١-(ضَغِـنَ- عَلَيـهِ ضَغَنـاً): قینی لێبووەوە/ قینەی لێکێشا.

(ضاغَـنَ- هُ): ڕقەبەریی لەگەڵدا کرد/ کینە بە کینەیکرد.

(تَضاغَـنَ واضْطَغَـنَ- القَومُ): خوێشـگەل بەرامبەر یـەك قینە لە دڵبـوونو ڕقیان لە یەکتری بووەوە.

(«إضطَغَـنَ فلانٌ على فُلانٍ ضَغينَةً»): فیسـار ڕقی لە فیسار کەس هەڵگرتو پەچنییە دڵیەوە.

(اَلضِغْن (ج) أَضْغـان): ڕق/ ڕك/ پڕموغار/ ڕقەبەرایەتی.

(اَلضَغِن والضاغِـن»): قینلەدڵ/ کینەلەدڵ/ قیناوی.

(اَلضَغينَة (ج) ضَغائِن): کینە/ ڕق/ پڕموغار/ قین.

٢-(ضَغِنَ- إِلَيهِ. ضَغَناً): لایکردە ئەو/ ڕووی حەزی کردە ئەو.

(اَلضِغْـن (ج) أَضْغان): ١-حەزو تاسـە ٢-دڵ بەلادا لادانو ئارەزوویکردن.

(فَـرَسٌ ضاغِـنٌ): ئەسـپێکی پۆرخز کە بە لێدان نەبێت ناڕوات.

(فَرَسٌ ضَغِنٌ): ئەسپێکی پۆرخز.

(عودٌ ضَغِنٌ): چێوێکی کەچ/ خوار/ خێچ.

٣-(إِضْطَغَنَ- هُ): خستیە کۆشیەوە.

(اَلضِغْن (ج) أَضْغان): کۆش.

٤-(اَلضِغْن (ج) أضغان): تەنشـت/ لا/ کەنار ٢-لاپاڵی کێو/ شاخ.

ضغا: ١-(ضَغا- المُقامِرُ ضَغْواً): قومارچییەکە (گزیکرد/ ناپاکییکرد).

٢-(ضَغا- إِلَيهِ ضَغْواً): سەری بۆ شۆڕکرد.

(-السِنَّورُ ضَغْواً وضُغاءً): پشیلەکە میاواندی.

(أَضغى- هُ إضغاءً): کورووزاندیەوە.

(تَضاغى): لە برساندا یان لەتاو ئازاری لێدان کورووزایەوەو هاواریکرد.

(اَلضُغاء): کورووزانـەوە/ دەنگی زەبوونییو کەساسیی.

ضـفّ: ١-(ضَـفَّ- القَومُ على المـاءِ والطَّعام ضَفّـاً وضَفَفـاً): لەسـەر ئـاوو خواردنەکە کەڵەکەیانکرد.

(-الشـيءَ ضَفّـاً): شـتەکەی گرکـردەوە/ کۆکردەوە.

(تَضافَّ- القَومُ): خوێشگەل قەڵەباڵغییانکرد.

(اَلضَفَّة): كۆمەڵە خەڵك.

(عَـيْن ضَفُـوف): كانييەكـی نـاودار/ سەرچاوەیەكی فرەئاو.

(اَلضَفيف): گرتنەخۆ.

(«هُوَ مِن لَفيفِنـا وضَفيفِنا): ئەو لەوانەیە كە لـە لێقەومانـدا خۆی دەهاوێتـە لامانو ئێمەیش دەیگرینە خۆمان.

(مـاءٌ مَضْفُـوف): ئاوێكـە قەڵەباڵغیی زۆر لەسەر بێت.

٢-(تَضافَّ- القَومُ): (دەسـتكورت/ كەمدارا) بوون.

(ضَفُّ الحالِ): نەبوونیی/ نەداریی/ گوزەران خراپیی.

(اَلضَفَفْ)١-خێزانـی زۆرو دەسـتكورتی/ نەداریی ٢-نەداریی/ دەستكورتیی/ نەبوونیی ٣-بێتوانایی/ بێهێزیی.

(اَلضَفافَة): بێمێشكیی.

٣-(اَلضَفَّـةو والضِفَّة (ج) ضِفاف): (ڕۆخی/ قەراغی/ لێواری) ڕووبار.

(-مِنَ البَحرِ): كەناری دەریا.

(اَلضَفَف): هەڵمەهەڵو پەلەپەل لە كاردا.

٤-(ضَفْضَفَةُ- القَوم): كۆمەڵی خوێشگەل.

ضفـد: ١-(ضَفَـدَ- هُ. ضَفْـداً): زللـەی پێداكێشا.

٢-(ضَفْـدَعَ- المـاءُ): ئاوەكـە بۆقـی تێـدا پەیدابوو.

(الرَجُـلُ):١-قەبز بوو/ تووشـی گیرانبوو ٢-تری.

(اَلضِفدَع (ج) ضَفادِعْ وضَفادي): (ئەمەیان كەمە) (ح): بۆق كە لە ئاودا دەبێتو ماسـیی وردو مێشو مەگەز دەخوات.

(ضِفْدِعَة): بۆقێك.

ضفر: ١-(ضَفَـرَ وضَفَّرَ- الحَبـلَ. ضَفْراً): (گوریسـەكەی/ پەتەكەی) باداو بەسەریەكدا هۆنییەوە.

(-الشَـعَرَ): قژەكـەی هۆنییـەوەو كردی بە پرچ.

(اِنْضَفَرَ): هۆنرابووەوە.

(اِنْضَفَـرَ- الحَبـلانِ): دوو گوریسـەكە یـان پەتەكـە بەسـەریەكدا پێچیانخـوارد/ هۆنرانەوە.

(اَلضَفْـر (مـص) (ج) ضُفُـور وأَضْفـار): ١-بەسەریەكدا پێچخواردن ٢-تەنگەی كورتانو زیـن ٣-پرچكـراو ٤-لـی زۆری كەڵەكەبووی بەسەریەكدا لوولخواردوو.

(اَلضَفار (ج) ضُفُر): قایشقەیاسـەی تەنگەی كورتانو زین.

(اَلضَفِرَةُ): لی زۆری كەڵەكبووی لوولخواردوو ٢-تیردانی پڕ.

(اَلضَفـیر):١-گوریـس كـە لـە مـوو بێتو هۆنرابێتـەوە ٢-(لێـوار/ كەنـاری) دەریا ٣-تەنگەی چوارپێ/ تەنگەنی كورتانو زین.

(أَلضَفيرَة (ج) ضَفائِر): پرچی هۆنراوە.
(«كِنانَةٌ ضَفيرَة»): تیردانێکی پڕ.
٢-(ضَفَــرَ- البِناءَ. ضَفْــراً): خانووەکەی بە وشــکە کەڵەك دروســتکرد: بە بەرد بێقوڕو گەچو شتیتر.
٣-(ضَفَرَ وضَفَّرَ- الرَّجُــلُ ضَفْراً): پیاوەکە لە ڕاکردنەکەیدا قەڵەمبازدیدا/ بە قەڵەمباز ڕایکرد.
٤-(ضَفَرَ وضَفَّرَ- الدابَّةَ ضَفْراً): ولاخەکەی لغاوکرد.
٥-(ضافَــرَ- هُ على الأَمرِ): بــۆ ئەنجامدانی کارەکە کۆمەکیکرد/ یاریدەیدا.
(تَضافَــروا- علــى الأَمرِ): بــۆ ئەنجامدانی کارەکــە کۆمەکــی یەکتریانکــرد/ یاریــدەی یەکتریاندا.
ضفز: ١-(ضَفَزَ. ضَفْزاً): ڕاپەڕیو بازدیدا.
(-فُلاناً): ١-پاڵیپێوەنا ٢-تێیهەڵدا یان بەدەست لێیدا.
(-الفَــرَسَ): لغاوی ئەســپەکەیکرد/ جڵەوی خستە دەمیەوە.
(-البَعــيرَ): خواردنــی بــە زۆر بــە دەمــی حوشترەکەدا کرد.
(إِضْطَفَــزَّ- هُ): بــە زۆر خواردنــی کــرد بە دەمیەوە.
(أَلضَفَز): جۆی نیوەهاڕراو تەڕکراو دەکرێتە ئاڵف بۆ حوشتر.
(أَلضَفَّاز): بەدزمــان/ دووزمان (وتراوە وەك چۆن جۆ بۆ حوشتر ئامادە دەکرێت ئەویش وا قسەکان هەڵدەبەستێتو ئامادەیدەکات).
(الضَفيزَة (ج) ضَفائِز): پارووی گەورە.
ضفط: ١-(ضَفَــطَ- هُ بِالحَبلِ. ضَفطاً): بە پەت (شمتەکیدا/ بەستیەوە).
(أَلضافِــط) (فــا): گوزارکارێــك کــە لــە گوزارەکەیدا دور نەڕوات.
(أَلضافِطَــةُ): ١-مێــی وشــەی (الضافِــط) ٢-حوشتری بارهەڵگر ٣-حوشترەوانو کاروانیی.
(أَلضَفَّاط والضِفِطّ والضَفيط): ١-حوشترەوان ٢-قەتارچی/ کاروانی.
٢-(ضَفَــطَ- الرَجُــلُ. ضَفْطاً): چووە ســەر پێشاو.
(-بِسَلْحِهِ): پیساییەکەی (فڕێدا/ کرد).
٣-(ضَفُــطَ. ضَفاطَــةً): ورگــی (پەیداکردو داکەوت/ شۆڕبووەوە).
(تَضافَطَ- اللَّحْمُ): گۆشتەکە نیشتەسەریەك.
(أَلضَفَّاط والضِفِــط والضَفيط): ١-قەڵەوی گۆشتشل ٢-ورگن.
٤-(ضَفُطَ. ضَفاطَةً): نەفامو ڕاپووچبوو.
(أَلضَفطَةُ): تێنەگەیشتنو ڕاپووچەڵیی.
(أَلضَفَّاط والضِفِطّ والضَفيط): گەوج.
٥-(أَلضافِطَــةُ): خوێڕیو هیــچو پووچان/ سووكو ڕسوایان.
ضفــن: ١-(ضَفَنَ- إِلَيهِ ضَفْنــاً): هاتە لایو

لەگەڵیدا دانیشت.
(بحاجَتِهِ): پێداویستیەکەی بۆ جێبەجێکرد.
(-مَـعَ الضَیـفِ): لەگەڵ میوانەکـەدا هاتو شوێنی کەوت.
٢-(ضَفَنَ- بِرجلِهِ. ضَفْناً): بە قاچی لێیدا/ تێیهەڵدا.
(-الأَرضَ): زەویەکەی پێکوتایەوە.
(-فُلاناً): شەقی لە دواوەیدا/ شەقی لە قنگی هەڵدا.
٣-(ضَفَنَ- عَلَیه. ضَفْناً): زۆرداریی بەرامبەر کرد/ ستەمی لێکرد.
(تَضافَـنَ- القَـومُ عَلَیـهِ): خوێشـگەل گەلەکۆمەکێیان لێکرد.
٤-(الضِفْـنّ والضِفَـنّ): ١-گـەوج/ کەرۆکـە ٢-کورتەبنەی گۆشتن/ قەڵەو.
ضَفا: (ضَفَا- الرَأسُ. ضَفواً): تووکی سـەری زۆر بوو.
(-الحَوضُ): گۆلەکە پڕو سەرڕێژ بوو.
(-الثَوبُ): کراسەکە درێژ بوو.
(ضافٍ): درێژەو لە زەوی دەخشێت.
(أَلضَفا): تەنشت.
(ضَفَوان): دوو تەنشت/ دوولا.
(ضَفْوَةُ العَیشِ): تێرو تەسـەلییو پڕنازیی زیندەگانیی.
ضَقّ: (ضَقّ. ضَقّاً): دەنگی هات/ زیکاندی
ضـك: (ضکـە ضـکا): پەسـتاوتی/ زۆری لێکرد.
(-الأَمرُ فُلاناً): کارەکە فیساری تەنگەتاوکرد/ نارەحەتیکرد.
(- هُ بالحُجَّةِ): بە بەڵگە بەزاندی/ بەسەریدا زاڵبوو.
ضکز. (ضَکَزَ- هُ. ضَکْزاً): دەستی گرتو توند دەستی گوشی.
ضکل: (أَلضَکْل): ئاوی کەم/ جۆرە ئاوێك.
(أَلضَیْکَل (ج) ضَیاکِل وضَیاکِلَة): ١-کەتەیەکی زلە ٢-رووت/ قووت ٣-هەژار.
(أَلأَضْکَل): رووت/ قووت.
ضلّ: ١-(ضَلَّ. ضَـلالاً وضَلالَةً): گومڕابوو/ لە ئاینو یان ڕاستیو هەق یان لە ڕێ لایدا.
(ضـالّ (ج) ضُلاّل وضالُّون): گومڕا/ لەڕێو هەقو ڕاستیو ئاینو لادەر.
(ضَـلَّ- الطَّریـقَ أَو عَنـهُ): ڕێگەکەی ونو هەڵەکرد/ نەچووە سەر ڕێگەکەی.
(-الشَـيءُ عَنـهُ): شـتەکەی لـێ ونبـوو لەدەستیچوو.
(-سَـعْیُهُ): ڕەنجەکـەی بـە فیڕۆ ڕۆیشـت/ سەرنەکەوت.
(-الرَجُـلَ): کابـرای لەیادچـوو/ لەبـیری چووەوە.
(ضَلَّلَ- هُ. تَضلیلاً وتَضْلالاً): ١-گومڕایکرد/ ڕێـی ئایـنو ڕاسـتیو ڕێگـەی لێهەڵەکردو چەواشەیکرد ٢-بە گومڕایداناو زانی.

(تَضليل): گومڕاکردن، بەهەڵەدابردن، ونکردن.
(أضَلَّ- الشيءَ): شتەکەی ونکرد.
(-هُ اللهُ): خودا سەری لێ تێکدا/ گومڕایکرد.
(-فُلانٌ فَرَسَهُ): فیسار ئەسپەکەی لێونبوو نەیزانی بۆ کوێ چووە.
(-الشيءَ أو الرَجُلَ): شتەکەی ونکرد یان پیاوەکەی بە گومڕا هاتە بەرچاو.
(«أتى قومَهُ فَأضَلَّهُم»): هاتە ناو خوێشگەکەی تەماشایکرد، گومڕابوون و ڕێیان هەڵە کردووە.
(تَضالَّ): خۆی بە ونبوو/ بە گومڕا نواندو پیشاندا.
(إستَضَلَّ): گومڕایی خواست.
(ألضَلّ والضُلّ والضَلال والضَلالة): ١-گومڕایی/ سەرلێشێوان ٢-ناڕاستیی نارەوا.
(«هُوَ ضُلّ بن ضُلٍّ أو ضِلّ بن ضِلٍّ أو ضلٌّ أضْلالٌ»): ئەو هەر خەریکی گومڕاییە یان نازانرێت باوکی کێیەو کوڕی کێیەو بێفەرە/ بێکەڵکە.
(ألضَلَل): ١-گومڕایی/ ڕێهەڵەکردن/ سەرلێشێوان ٢-ناوی کشاوی ژێر تاوێر یان بە ناو درەختداو هەتاو لێینەدا.
(ألضُلَّةُ): شارەزای ڕێنومایی.
(«دَليلُ بِهِ ضُلَّةُ»): ڕێنومایەك کە شارەزای ڕێنومایی بێت.

(ألضَلَّة): ١-یەکجار گومڕابوون/ ڕێ هەڵەکردن ٢-ونبوون/ چەواشەو سەرگەردانبوون ٣-سەرلێتێکچوون بە دوای چاکە یان خراپەدا.
(ألضِلَّةُ): گومڕایی/ ڕێهەڵەکردن/ ونبوون.
(«ذَهَبَ دَمُهُ ضِلَّةً»): خوێنەکەی ونبوو/ تۆڵەی نەسەنرا.
(«ذَهَبَ ضِلَّةً»): کەس نەیزانی چی لێهات ونبوو.
(ألضالَّة (ج) ضَوالٌّ): ١-مێی وشەی (الضّال) ٢-شتێك کە ونبووبێت و بۆی بگەڕێیت.
(ألضَلُول): گومڕا/ گومبوو.
(ألضِلِّيل): ١-کەسێکە کە شتی زۆر لەبیر بچێتەوە- بیرکۆڵ.
(ألمَلِكُ الضِلِّيل): نازناوی (**امرؤ القيس**)ی شاعیری پێش ئیسلامە.
(ألأُضْلولَة (ج) أضاليل): ڕێهەڵەکردن/ چەواشەبوون/ ڕێ ونکردن/ گومڕابوون.
(ألمَضَل): ئەوەی خەڵك تیایدا وندەبێت تیایدا گومڕا دەبێت/ چەواشە دەبێت/ سەری لێتێکدەچێت.
(ألمُضِل) (فا): ١-چەواشەکار/ گومڕاکار ٢-تراویلکە.
(ألمَضَلَّة والمَضِلَّة): گومڕابوون/ ڕێ هەڵەکردن/ چەواشەبوون.
(أرضٌ مَضَلَّةٌ ومَضِلَّةٌ): خاکێکە تیایدا سەر لە ڕێگە دەرناکرێت وندەبێت. کۆی

وشـەكانی («أَرْضُونَ مَضَـلاَّت») (المُضَلّل):
١-تەواو گومڕاكراوو لە ڕێ لادراو ٢-كەسـێكە زۆر عەودالـی ناڕاسـتیو كەچیبیێت ٣-ئەو كەسـەی (چاكەی لەدەست نابێتەوە/ چاكەی لێناوەشێتەوە).
٢-(ضَلَّ- الشـيءُ. ضَلالاً وضَلالَةً): شـتەكە (پۆرتكا/ لەدەستچوو/ فەوتا).
(-الرَجُـلُ): مـردوو بەدەنی ڕزیـو بوو بە خۆڵو نێسك.
(أَضَـلَّ- الشـيءَ): ١-شـتەكەی (فەوتانـد/ لەناوبـرد) ٢-كردی بە ژێرەوەو سـاتاریكرد/ ونیكرد.
(ألضَـلّ والضُـلّ والضَلالَـة والضَـلال):
١-فەوتان ٢-مردن ٣-لەناوچوون.
ضلـع: ١-(ضَلَعَ- الرجُل. ضَلْعاً): كێشـای بە پەراسوویدا.
(ضَلُعَ. ضَلاعَةً): بەهێزو پەراسوو قایمبوو.
(ضَليـع): بە توانـا/ بەدەسـەلات/ بەهێزو پەراسوو قایم.
(ضَلِعَ- الرَجُـلُ ضَلَعاً وضَلْعاً): ئەوەندە تێر بوو و خواردیو خواردیەوە تا پەراسووەكانی هەستا.
(ضَلَّعَ- الثَوبَ): كراسـەكەی لە شـێوەی دانە پەراسوودا نیگاركێشكرد.
(-هُ): ١-قورسیكرد ٢-چەماندیەوە/ خواریكردەوە.
(أَضْلَعَ- هُ): گرانیكردو چەماندیەوە.

(«فلان أَضْلَعَتْهُ الخُطوبُ»): نەهامەتیی زۆر باری گرانكردو چەماندیەوە.
(تَضَلَّعَ): تێر ئاو یان تێرخواردن بوو.
(«تَضَلَّـعَ مِنَ العلوم»): زانسـتییەكی زۆری دەستگیر خۆیكرد.
(إضْطَلَعَ): بەهێز بوو.
(-بِحَملِهِ): هێزی بەسـەر كۆڵەكەیدا شـكاو هەڵیگرت.
(ألضِلَع (ج) أَضْلُـع وضُلوع وأَضْلاع) (ع ا): دانەی پەراسوو (مێیە).
(ألأَضْـلاعُ السَّـائِبَة) (ع ا): دانە پەراسـووە بەرەلاكان كـە بە تەختی سـنگەوە نینو لە بەشی خوارووی سنگەوەن.
(ألضِلَع- مِنَ البَطيخ): كووزێكی كاڵەك.
(ضِلْعُ السِـلقِ ونَحْوَهُ): شارەگی گەڵای سلقو شتی وەها.
(ألضِلَع (ج) أَضْلُـع وضُلوع وأَضْلاع) (ع ا):
١-دانـە پەراسـوو ٢-برۆكە بە دانە پەراسـوو چوێنراوە ٣-كووزێكی كاڵەك.
(«هُم عَلَـيَّ ضِلَعٌ جائِرَة»): ئەوان دوژمنانە كە لەكەیان لەسەرمكردووە.
(ألضَلَع): هێز/ توانا.
(ألضِلْعَةُ): ١-دەستەی كار ٢-لا/ تەنیشت.
(ألضِلَعَـةُ) (ح): ماسـییەكی وردی سـەوزی نێسقان كورتە.
(ألأَضْلَع (ج) ضُلْع): پیاوی توندوتۆڵو كەتە/

زەلام.
(أَلضليع (ج) ضُلُع (م) ضَليعَة): ١-پەراسوو قایمو بەهێز ٢-بەتوانا.
(رجلٌ ضَليعُ الفَم): پیاوێكی دەمپانو دەمگەورە.
(أَلْضِلِع- مِن الاحمالِ): كۆڵی گرانی نارەحەت وەك نیشتبێتە سەر پەراسووەكان.
(«هُوَ مُضلِعٌ بهذا الأَمرِ»): ئەو توانای بەسەر ئەو كارەدا دەشكێتو دەرەقەتیدێت.
(أَلْمُضَلَّع) (مفع): ١-پەراسوودار ٢-چەندلا.
(-مِنَ الثِّياب): بەرگی میلدار.
(أَلْمُضَلَّع= ذو الأضلاع) (هـ): هێڵێكی شكاوەی داخراو.
(ضلع (ج) أَضلاع): لایەكی هێڵە شكاوەكە.
(رؤوس الأَضلاع): سەری هێڵەكان.
(أَلْمُضَلَّعُ المُنْتَظم): (هـ) المتساوي الأَضلاع والزوايا وهو محدب او نجمي. ومركز المضلع المنتظم مركزه مركز الدائرة المرسومة عليه مثل (و) وعامد المضلع بعد مركزه عن ضلعة مثل (وع): چەند لای ڕێكی لایەكسانو گۆشەیەكسان قۆقز یان ئەستێرەیی دەبێت چەقی چەند لای ڕێكە كە بریتییە لە چەقی ئەو بازنەیەی كە لەسەری كێشراوە وەك (و) وە ئەستونی چەندلا كە بریتییە لە ڕاسەهێڵی (وع) كاتێك (وع) ئەستونە لەسەر لایەكی چەندلاكە.

(أَلمضلع الرباعي او الشكل الرباعي او الرباعي (هـ) مضلع ذو اربعة اضلاع): چەند لای چوارینە یان چواریی ئەو شێوە چوارلایەیە كە چوار لای هەیە.
(أَلمضلع الخماسي أَو الخُماسِيّ أَو المخَمَّس) (هـ) مضلع ذو خمسة اضلاع):چەند لای پێنجینە یان پێنجی ئەوەیە كە پێنج لای هەیە.
(المضلع السداسي او السداسِيُّ أَو المُسَدَّس (هـ) مضلع ذو ستة اضلاع): چەندلای شەشیی ئەوەیە كە شەش لای هەیە.
٢-(ضَلَعَ-الشيءُ): شتەكە خواربووەوە/ كەچیی تێكەوت.
(ضالِع): كەچبوو/ خواربوو.
(ضَلَعَ- عَلَيهِ): ناحەزانە بەسەریدا شكایەوە/ ستەمی لێكرد.
(ضَلِعَ. ضَلَعاً وضَلْعاً): سروشتانە لە خۆیەوە خواربوو (كەچیی/ خواریی/ گێڕیی) زگماكیی.
(ضَلِع): (كەچیی/ خواریی/ گێڕیی) زگماك.
(«لأُقيمَنَّ ضَلَعَكَ أَو ضَلْعَكَ»): خواریت ڕاستدەكەمەوە.
(ضَلِعَ- مَعَ فُلان): دۆستایەتی لەگەڵ فیساردا گرتو كۆمەكیكرد.
(أَلضَلْع) (مص):١-بەلادا لادان ٢-كەچبوون/ خواربوون/ كەچیی/ خواریی.

ضَلَـعَ- ـَ:١-كەچيكـرد/ خواريكردەوە ٢-لای پێدا.
(أَضْلَعَ- ـُ):١-كەچيكرد/ خواريكردەوە ٢-لای پێدا.
(«ضَلْعَـكَ مَـع فـلان»): حـەزت بـە لای ئەوەوەيە/ بەلای ئەودا لاتداوە.
(أَلضَلَع) (مـص): (خواربوونی كەچبوونی) زگماكيی.
(«أَخَـذَهُ ضَلَعَ الدَّيـنِ»): گرانيی قەرزاريی پشتی چەمانەوە.
(أَلضَلوع): زەويی خوار/ سەرەولێژ بوو.
(قَوسٌ ضَليعٌ وضَليعَةٌ ومَضْلُوعَة): كەوانێك كە كەلوەكەی/ دارەكەی خواريی تێدابێت.
٣-(الضَلَع): رەوشتبەرزيی.
(أَلضِلَع): ١-تاكەشـاخی باريكو تيژ هەڵچوو ٢-داو/ تەڵە.
ضـمّ: ١-(ضَـمَّ- الشَـيءَ ضَمّاً): شـتەكەی كۆكردەوەو دايە پاڵ يەك.
(-الشَيءَ إِلَيهِ): شـتەكەيگرتو كێشايە سەر ئەويتر.
-الشَـيءَ: شتەكەيگرت شـتەكەی خستە لای شتەكەيتر.
(«ضَـمَّ علـى يَدي»): دەسـتی خسـتە ناو دەستمەوەو دەستی گرتم.
(-فُلاناً إِلَيه): دۆستايەتيی لەگەڵ فيساردا.
(-الحَرفَ): پيتەكەی بۆردار كرد.

(-هُ إِلى صَدرِهِ): نای بە سـنگيەوە/ باوەشـی پێداكرد/ دەستی كردە ملی.
(«ضَمَّ- جَناحَهُ عَن الناسِ»): لەگەڵ خەڵكدا نەرمو بە سۆز بوو ميهرەبانيی نواند.
(ضامَّ- هُ إِلَيهِ): ئەوەی خستە پاڵی.
أَضَمَّ- ه الشَيءَ الى فلان: شتەكەی بە فيساردا بۆ ئەو نارد.
(تَضَمَّمَ- الشَيءَ): هەموو شتەكەی راماڵی.
(تَضامَّ- القَومُ): چوونە پاڵ يەك/ يەكيانگرت/ لەگەڵ يەك كۆبوونەوە.
(إِضْطَمَ- هُ): خستيە پاڵ ئەو/ يەكيخستن.
(-عَلَيهِ): گرتيە خۆ.
(«إِضْطَمَّـتْ عليـه الضُلـوع»): لەنـاو پەراسـووەكاندا بوو/ پەراسـووەكان ئەوەيان گرتەخۆ.
(إِنْضَمَّ): چـووە پاڵی/ تێكەڵبوو/ يەكيگرت/ چووە ريز.
(-علـى كذا): ئـەوەی لەخۆگرتبوو/ ئەوەی تێدابوو.
(أَلضَمّ): بۆری بزوێن كە لە كاتی دەربرينيدا لێـو دێتـەوە يـەك ٢-كۆكردنەوەو خسـتنە سەريەك: دانەپاڵ يەك.
(أَلضَمَّة): مەيدانی پێشـبڕكێی سـوارچاكيی چونكە لە هەموو لايەكەوە ئەسـپی تاودراوی تێيەت.
(أَلضَمَّة= الضَم): بۆر كە بزوێنێكە.

(اَلضِّمام): لكێن/ بەستێن/ ئەوەی شت بە یەکەوە دەبەستێت وەك گیرە.

(اَلضَمُوم): دەرەی نێوان دوو گردی درێژ.

(اَلضَمیم (م) ضَمیمَة): دۆست/ یار/ هاورێ.

(اَلإِضامَة (ج) أَضامیم): گرووپ/ تاقم/ کۆمەڵ.

(-مِن- الكُتُب): دەستەنوسراو.

(- المُنضَم- علی كذا): ئەوەی تێیدایە/ ئەوەی گرتویەتیە خۆ.

(«أَصْبَحَ مُنضَماً»): جۆتە یەك و جۆتە ناوەوە وەك بەناویەکدا چووبێت.

٢-(ضَمْضَمَ- فُلانٌ علی المالِ ضَمْضَمَةً): دەستی بەسەر هەموو داراکەدا گرت و هەمووبرد.

٣-(ضَمْضَمَ- الرَجُلَ. ضَمْضَمَةً): ورەیدایەو بەهێزیکرد.

(-الأَسَدُ): شێرەکە نەڕاندی.

(اَلضَمْضَم والضُماضِم) (ح): ١-شێر ٢-بوێر ٣-زەلام/ لەندەهوور/ زەبەلاح ٤-تووڕە.

ضمج: (ضَمَجَ- جَسَدَهُ ضَمْجاً): بۆنی خۆشی لە لەش هەڵسوو.

(-بالأَرض): بە زەویەکەوە لکا.

(ضَمَّجَ- جَسَدَهُ): بۆنی خۆشی لە لەش هەڵسوو.

(أَضْمَجَ-بالأَرض): بە زەویەکەوە نووسا/ لکا.

(اَلضَمَج): دەردێکە تووشی مرۆڤ دەبێت.

(اَلضَمْجَةُ (ج) ضَمج (ح): مێروویەکی بۆگەن بە خەڵکەوە دەدات.

ضمح: (إِضْمَحَلَّ): تەفروتوونا بوو/ نەما/ پووکایەوە/ فەوتا.

(-السَّحابُ): هەورەکە ڕەویەوەو نەما.

ضمخ: (ضَمَخَ وضَمَّخَ- جَسَدَهُ بالطیب. ضَمْخاً): بۆنی خۆشی لە لەشی هەڵسوو.

(تَضَمَّخَ واضْطَمَخَ وانْضَمَخَ بالطیب): بۆنخۆشاویبوو.

(اَلضِمْخَة): ١-ژن ٢-(ح) مێحوشترى قەڵەو.

ضمد: ١-(ضَمَدَ وضَمَّدَ الجرحَ. ضَمداً): برینەکەی پێچا.

(«أَضْمُد عَلَیكَ ثِیابَك»): جلەکەت لەخۆتەوە بپێچە/ بئاڵێنە.

(«ضَمَدَهُ بالعَصا»): بەدار کێشای بە سەریدا.

(«ضَمَدَ رَأسَهُ بالسَیف»): بە شمشێر لەسەریدا.

(أَضْمَدَ- القَومَ): کۆیکردنەوە/ یەکیخستن.

(تَضَمَّدَ- الجرحُ): برینەکە پێچرا.

(اَلضِمد): برادەر/ دۆست.

(اَلضِماد والضِمادَة): پێبەستە/ سارغی/ پێپێچ.

(«أَنا علی ضِمادَةِ مِنَ الأَمر»): من خەریکم کارەکە چارەسەر بکەم.

٢-(ضَمِدَ. ضَمَداً): وشکبوو.

(أَلضَمْد) (ضد): ١-وشك ٢-تەڕ.

(ضَمِدَ. ضَمَداً): زۆر تووڕە بوو.

(-عَلَيهِ): ڕقی لێهەڵگرت/ کینەی لێکێشا.

٤-(الضَمْد): ١-باشـترین مـەڕ خراپترین مەڕ (ضد).

(أَلضَمَد): ١-سـتەم/ زۆرداریـی ٢-(مافێکی/ هەقێکی/ قەرزێکی) کۆن.

(«لنا على فُلان ضَمَـدٌ»): مافێکی کۆن یان قەرزێکی کۆنمان لەسەر فیسار هەیە.

(أَلضامِد): کاربەستو شوێنکار کەوتوو.

(أَلمُضَمَّد): برینپێچ.

ضمر: ١-(ضَمَـرَ وضَمُرَ وضُمُـوراً): لاوازو باریك بوو پووکایەوە/ سیسبوو.

(ضامِـر (م) ضامِـرَة (ج) ضُمَّر وضَوامِر): لەشـپووکاوە/ لەشـتێقوپاوو لاواز بـوو/ سیسبوو.

(ضَمَّـرَ وأَضْمَـرَ- الفَـرَسَ): چارەوێکـەی تێقوپانـدو لاوازیکـرد (ئەویـش بـەوەی دایدەبەسـتن ئـاوو ئالیکـی زۆری دەدەنێ تا قەڵەو دەبێت پاشـان ماوەیەك ئـاوو ئالیکی کەمیدەدەنێو لە مەیداندا دەیچرووسـێنن/ غـاری زۆر پێدەکەن تا لەڕ دەبێت ماوەی ئەو چرووسـاندنو تێقوپانە لـەلای عەرەب چل ڕۆژە).

(تَضَمَّرَ وَجْهُهُ): دەموچاوی تێقوپاوو پێستی بەسەر ئێسکیدا وشکبووەوە.

(إنْضَمَـرَ- الغُصْـنُ): چلەکـە وشـکهەڵاتو سیسبوو/ تەڕایی تێدانەما.

(إضْطَمَرَ): چوومیەك.

(-الفَرَسُ): چارەوێکە تێقوپاو باریکبوو.

(أَلضَمْـر (م) ضَمْرَة): ١-کەمەرباریكو سـك تێقوپاو ٢-لەشجوان ٣-تەنگ/ تەسك.

(أَلضُمْر والضُمُر): لاوازبوون/ کەمگۆشتیی/ تێقوپان/ لەشسووکیی.

(أَلضَمِـير (ج) ضَمائِر): تریێی سـیس/ تریێی (قرپۆڵك/ وشکهەڵاتوو).

(أَلمِضْمار): ١-شوێنی لەشـباریککردنی ئەسپ ٢-ماوەی لەشـباریککردنی ئەسپ ٣-ئامانج لە پێشـبڕکێ پێکردنی ئەسپ ٤-بواری غارغارێن ٥-گۆڕەپانــی فراوانی غارغارێنو پێشــبڕکێی ئەسپو ڕامکردنو ڕاهێنانی.

٢-(أَضْمَــرَ – الأَمــرَ): شــتەکەی/ کارەکەی (پەنهانکرد/ پەنادا/ شاردیەوە).

(-فِي نَفسِـهِ شَـيئاً): لە دڵدا نیازی شـتێکی هەبـوو/ بڕیـاری کردنــی کارێکیــدا/ سوورخواستی کردنی ئەو شتە بوو.

(-الخَبَـرَ): سـۆراغی ڕاسـتیو ناڕاسـتیی هەواڵەکەیکرد.

(-تَ الأَرضُ فُلانــاً): کابــرا ونبــوو/ زەوی قووتیدا یــان گوزاریکرد/: ســەفەریکرد یان مرد.

(-الشاعِرُ): هوزانڤانەکە/ شاعیرەکە تەمومژی

خسته هه‌ڵبه‌سته‌كه‌یه‌وه‌.

(اَلضَمْر): ١-ویژدان.

(اَلضَمْر والمُضمَر): ون/ شاردراوه‌/ نادیار.

(اَلضِمار): نادیار/ له‌به‌رچاو نه‌بوو/ په‌نهان/ پۆشــراو ٢-گفتی (ده‌ستبڕین/ مسۆگه‌رنه‌بوو) گفتی ئه‌مرۆ به‌ سبه‌ی.

(«عِطاءٌ لَم يَكُن عِدَّة ضماراً»): ١-به‌خشینێك كه‌ هــه‌ر به‌ قســه‌ بێت ٢-هه‌موو شــتێك كه‌ پشــتی پێنه‌به‌ســترێت‌و جێی بــروا نه‌بێت ٣-داراو پارەیه‌ك كه‌ به‌ ته‌مای ده‌ستگیربوونی نه‌بیت ٤-وامێكی/ قه‌رزێكی دوانه‌خراو.

(اَلضَمير (ج) ضَمائِــر): ١-ده‌روون ٢-ویژدان ٣-لای زمانه‌وانه‌كان وشــه‌یه‌كه‌ كه‌ قســه‌كه‌ر بگه‌یه‌نێــت/ راناو وه‌ك (أَنـــا) من. مُخاطَب: گوێگــر: (تــۆ). (غائِب): نه‌بــوو. (هُوَ): ئه‌و (اَلأضمار)(مص) لای كێشكاره‌كانی هه‌ڵبه‌ست بێده‌نگكردنی پیتی دووه‌م وه‌كو پیتی (ن) له‌ (مُتفاعِلَن) ده‌كرێت به‌ (مُسْتفعِلَن).

ضمز: )ضَمَــزَ. ضَمْزاً): ١-كپبوو/ بێده‌نگبوو ٢ ده‌می هێنایــه‌وه‌ یه‌كه‌و نقه‌ینه‌كرد/ ده‌می داخست.

(-اللُقمَةَ): پارووه‌كه‌ی گه‌وره‌ كردو خســتیه‌ ده‌میه‌وه‌.

(-علــى مالِــهِ): ده‌ســتی بــه‌ ماڵه‌كه‌یــدا/ داراكه‌یدا گرت‌و چرووكی تێداكرد.

(ضامِز وضَمُوز (ج) ضُمُوز): ده‌ستقووچاو/ چرووك/ رژد.

(اَلضَمْــز والضَمُوز (ج) ضُمُــور): ١-تاكه‌كێو ٢-گردی نزم‌وته‌پیو.

(ضمس: (ضَمَــسَ- ُه ضَمْســاً): به‌دزییه‌وه‌ جووی.

ضمــن: ١-(ضَمِــنَ- الشــيءَ وبِــهِ. ضَمْنــاً وضَماناً): ده‌سته‌به‌ری شته‌كه‌ بوو/ پاراستنی خسته‌ ئه‌ستۆی خۆی.

(ضَمَّنَ- هُ الشيءَ):١-پێبژارد ٢ شته‌كه‌ی خسته‌ ئه‌ستۆی ئه‌و/ ئه‌ویكرد به‌ ده‌سته‌به‌ری.

(تَضَمَّنَ- الشــيءَ عَنِّي): شته‌كه‌ی له‌بری من (گرته‌ ئه‌ســتۆی خۆی/ ده‌ســته‌به‌ری شته‌كه‌ بوو) و شته‌كه‌ی بژارد.

(تَضامَنَ- الغُرَماءُ): پێكه‌وه‌ ده‌سته‌به‌ر بوون به‌رامبه‌ر خاوه‌ن هه‌قه‌كه‌/ مافه‌كه‌.

(«هُــم مُتكافِلــونَ مُتَضامِنــون»): ئــه‌وان هه‌موویان پێكه‌وه‌ن له‌ ده‌ســته‌به‌ر بوونیاندا به‌رامبه‌ر خاوه‌ن مافه‌كه‌. واتا ده‌توانێت داوای مافه‌كه‌ی له‌ هه‌ر یه‌كه‌یان بكات.

(تَضامَــنَ- القَومُ على أَمرٍ): له‌ســه‌ر كارێك گفتیارو یه‌كگرتوو بوون.

(اَلضامِن) (فا): ده‌سته‌به‌رو گفتیار.

(اَلـضَـمــان) (مــص): ده‌ســتـه‌بـه‌ربــوون‌و لێبــه‌رپرســیاربوون كــه‌ ئــه‌وه‌یــه‌ ئــه‌وه‌ی كــه‌ فــه‌وتــاوه‌ وه‌ك ئــه‌وه‌ بیبژێرن ئه‌گه‌ر ده‌سته‌به‌ربوونه‌كه‌ به‌و جۆره‌ بێت یان نرخی

شته فەوتاوەکەی بدریتێ.

(اَلضَمان الإجتِماعِي): دەستەبەری کۆمەڵایەتی/ کارگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان (ئەوەیە کۆمەڵ بەرپرسیار بێت لە دابینکردنی خەستەخانەو فێرگەو گەلێك کارگوزاریتر بۆ ئەندامەکانیو بە خۆرایی.

(شَرکاتُ الضَّمان): کۆمپانیای دەستەبەر کۆمپانیایەکن کە دەستەبەری ژیانو ماڵو سامانی گوێزراوەوو نەگوێزراوەی ئەندامانی دەبن لە مەترسیی سووتانو خنکانو گەلێکیتر بەرامبەر پارەیەك کە لەسەری ڕێکدەکەونو بە بەش بەشو لە کاتی دیاریکراودا بدرێت.

(اَلضَمانَة الدَولیة): ئەوەیە کە دەوڵەتە گەورەکان دەستەبەریی پاراستنی سەربەخۆیی دەوڵەتێکی بچووك بکەن.

(اَلضَمین (ج) ضَمْنی): الکَفیل: دەستەبەر/ کەفیل.

٢-(ضَمِن- هُ. ضَمْناً وضَماناً): گرتیە خۆی/ جێی تێدابووەوە/ تێیدابوو.

(ضَمَّنَ-الشَيءَ الوِعاءَ): شتەکەی کردە قاپەکەوە.

(-الشاعِرُ): نیوە دێری هەڵبەستی هۆزانڤانێکیتری خستە هەڵبەستەکەیەوە.

(تضَمَّنَ- الشَيءَ): ئەو شتەی تێدابوو/ شتەکەیگرت.

(اَلضِمن): توێی شت/ ناوشت.

(ضِمنُ الکتاب): توێی نوسراوەکە.

(اَلتَضمین) (مص): تێهەڵکێشکردن. ئەوەیە شاعیرێك دێری هەڵبەستێکی شاعیرێکیتر بخاتە ناو هەڵبەستەکەیەوە بەماناو وشەکانیەوە.

(اَلمَضمون (مفع) مِنَ الجُملَة (ج) مَضامین): ١-ناوەرۆك ٢-ئەوەی کە لە ڕستەکەدا تێیدەگەن کە بە وشە دیاری نەکراوە.

(اَلمُضَمَّن- مِنَ الأَصوات) (مفع): دەنگێکە نابێتو ناگات تا بە دەنگێکی تر نەگاتو نەگەیەنرێت.

٣-(ضَمِنَ- الرَجُلُ ضَمَناً وضَمانَةً): تووشی نەخۆشییەکی بێچارە بوو کە لێینەبێتەوە تا بێت دەردەکەی گرانتر بێت.

(ضَمِن): دەردەدارێکی بێچارە.

(اَلضَمَن والضُمْنَة و الضَمان والضَّمانَة): نەخۆشیو دەردێکی سەرتاسەری ژیان کە لێی نەبێتەوە.

(اَلضَمِن): لەشگرفتاری دەردێك یان شتێکیتر.

(«هُوَ ضَمِنٌ علی أَهْلِهِ»): ئەو بۆ خێزانەکەی ژانەو دەردە.

(اَلضَمِن): دڵدار.

(اَلضَمین (ج) ضَمْنی): گرفتاری دەردێکی بێچارە.

ضَنَّ. (ضَنَّ واضْطَنَّ- بالشَيءِ. ضَنّاً وضِنّاً

وضِنَّــةً وضَنانَــةً وضَنَّــةُ): چرووكيــی له شــتەكەدا كرد/ درێخیی تێداكرد/ شــتەكەی وەشاند.

(-بالمكان): شوێنەكەی بەرنەدا/ جێنەهێشت.

(اَلضِــنّ والضِنَّــة) (مــص): ١-ئــەوەی كــە چرووكیــی تێــدا دەكرێت/ ئەوەی دەســتی لێبەرنەبێت ٢-تایبەتمەند/ تایبەت.

(«هُوَ ضِنّــي وضِنَّتی»): ئەوەیە بە تایبەتی هی منەو من بۆی سووتاوەو دڵم دەیەوێت.

(اَلضَنَن): دلێر/ ئازا/ نەبەرد.

(اَلضَنین): رژد/ چرووك/ بەرچاوتەنگ.

(«إِنَّما يُضَنُّ بالضَنين»): پێویستە ئەوەی كە دۆستایەتیو برایەتی تۆی دەوێت تۆیش ئەو دۆستایەتییەو برایەتییە بەرنەدەیت.

(اَلضَنائِــن): شــتی گرانبەهــاو ناوێــزە بپارێزرێت.

(ضَنائِــنُ الله): بەدیهێنــراوە تایبەتیەكانی خودا.

(اَلضَنانَة) (مــص): گردیــی/ كۆمەڵبوون/ تەبابوون.

(هَجَمــتُ علــى القَــومِ وهُــمْ بِضَنانَتِهم): پەلامارمــدان كاتێــك كۆمەڵیان بەســتبوو/ كۆبوون.

(اَلمَضَــنّ والمَضَنَّــة (ج) مَضــانّ): ئــەوەی چرووكیی تێــدا بكرێت/ چنگی پێدا بگیرێت بەمو بەو نەدرێت.

ضنأ: ١-(ضَنَأَ. ضَنْأً وضُنُوءً): خۆی (شاردەوە/ خۆی ونكرد).

(-في الأَرض): رۆیشت.

(اِضطَنَــأَ- لَــهُ ومِنْــهُ): شــەرمی لێكــردو تەریقبووەوە.

٢-(ضَنَأَ- المالُ. ضَنْأً وضُنُوءً): داراكە زۆربوو/ پەرەیسەند/ماڵو سامان كە زۆر بوو.

(ضَنِــيءَ وأَضْنَــأَ- تِ المَرأَةُ. ضَنْــأً): ژنەكە منداڵی زۆر بوو/ شفتەڕژێیكرد.

(ضانِــيء وضانِئَة (ج) ضَوانِيء): ئافرەتێكە منداڵی زۆر ببێت. شفتەڕژێ بكات.

(اَلضَنْء (ج) ضُنوء): وەچەی زۆر.

(اَلضَنء والضِــنء): زاوزۆڵان/ فرزەندان (ئەو وشەیە كۆیەو تاكی نییە).

(اَلضَــنء (ج) ضُنُــوء): ١-بنەچــە/ ریشــە ٢-كانزا.

(اَلضُنْأَةُ و الضُناءَة): پێداویستی/ پێویستی.

(ضَنَبَ- بِــهِ الأَرضَ ضَنبــاً): دایبەزەویداو زەویەكەی پێكوتایەوە.

(-بالشيء): شتەكەی گرت.

ضنــط: (ضَنِطَ- الشَّــحمُ ضَنَطاً): لەشــی چەوریی زۆریگرت.

(اِنْضَنَطَ- القَومُ): هەڵمبالغییان كرد.

(اَلضَنْط): تەنگانە/ تەنگیی.

(اَلضَنَــط) (مــص): ١-بــەز ٢-چابوكیــی/ گورجوگۆڵیی ٣-بێئابروویی/ چەرداومرووییی.

(ألضِناط): تێكچڕانێكی زۆری سەر چاڵاو یان شتیتر.

ضنك: ١-(ضَنُكَ. ضَناكةً): لەشی لاوازو بێهێز بوو یان کەم هۆشئ ناوەز بوو یان ڕاپووچەڵو بوودەڵە بوو.

(ضَنیــك (ج) ضَنُك): لاواز یـــان کەمئاوەزو هۆش یان بوودەڵەو ڕاپووچەڵ.

-ضَناكةً وضَنُكاً وضُنُوكاً: لەتەنگانەدا بوو.

(ألضَنْك) (مص): تەنگبوونی/ تەســكبوونی هەموو شتێك (بۆ نێرو مێیە).

(«مَــكانٌ ضَنْــك»): شـوێنێكی تەســك/ تەنگەبەر.

(«عَشــیةٌ ضَنْــك»): ژیانێكــی پرتەنگانە/ نەدارایی/ كولەمەرگیی/ هەژاریی.

(ألضَنیــك): ژیانێكــی (مەمــرەو مــەژی/ کەمدەستیی/ دەســتكورتیی/ كولەمەرگیی/ هەژاریی‌و سەخت).

(ألضَناكــة) (مــص): ژیانێكــی (هەژارانە/ كولەمەرگیی/ سەخت‌و کەمدەستیی).

(ألضَنیــك): ژیانێكــی (مەمرەومەژیــی/ نەبوونی/ هەژارانە).

(ألضَنیك): کەسێك کە بە نانەسكیی نۆکەریی بكات.

٢-(ضُنِكَ. ضَنْكاً): تووشی هەڵامەتبوو.

(أضْنَكَ- ه الله): خودا تووشی هەڵامەتیكرد.

(ألضُناك والضُنكَة): هەڵامەت.

٣-(ألضِناك): لەش باش دارێژراوو تۆکمە (بۆ نێرو مێیە).

(رَجُلٌ ضِنــاك وامرَأَةٌ ضِنــاكٌ): ١-پیاوێكی لەشــتوندو چاك دارێژراو. ژنێكی لەش باش دارێــژراوو تۆكمــەو لەش توند/ تێكســمڕاو ٢-درەختێكی مەزن.

(ألضَنیك): شتی بڕراوە/ بڕاو.

ضنــا: (ضَنِــيَ. ضَنــىً): نەخۆشــكەوت نەخۆشــییەكە چرووســاندیو بێهێزیكــرد/ زەبوونیكرد.

(ضَنىً وضَنٍ): نەخۆشــی چرووساو بێتواناو هێز/ زەبوون.

(«تَرَكْتُــهُ ضَنــىً وضَنیاً»): بەجێمهێشــت نەخۆشییەكە (زێفی لێســەندبوو/ زەبوونی كردبوو). ئەگەر بڵێیت (ضَنىً) بۆ نێرو مێ‌و كۆ دەشێت.

(«هُوَ ضَنــىً وهِيَ ضَنىً وهُــم ضَنىً وهُنَّ ضَنــىً»): ئەگــەر نوونەكە ژێــردار بكەیت دەڵێیت: (هُوَ ضَنٍ وهِيَ ضَنِیَةٍ وهُما ضَنیان أَو ضَنیَتــان وهُم أَضناء وهُنَّ ضَنِیات): ئەو چرووســاوەو بێهێزە ئــەوان بۆ نێــرو مێ‌و جــووت: ئەوان. پەككەوتــە/ زەبوون/ لاواز/ چرووساویی نەخۆشین.

(ضانى- الشيءَ أَو الأمرَ مُضاناةً): سەختیو نارەحەتــیو تــاڵاوی ئــەو شــتە یــان ئــەو كارمیچەشت/: پەكیخست.

(أَضْنى- المَرَضُ فُلاناً): نەخۆشییەکە فیساری کەفتەکار کرد/ کەنەفتیکرد.
(-الرَجُلُ): پیاوەکە کەفتەکاری سـەرجێگە بوو/ لەپێکەوت.
(تَضَنَّى): بەدرۆ خۆی نەخۆشـی سەر جێگە خست.
(إنْضَنـى): کەنەفتـی سـەر جێگـە بـوو/ کەفتەکار بوو.
(أَلضَنَى): ١-نەخۆشیو چرووسان/ لاواز بوون ٢-پەرێشانیو پەککەوتن.
(أَلضِنَى): ئازاری سەخت.
٢-(أَلضِنْو والضَنْو والضُنَى): منداڵ/ زارۆڵە/ وەچە/ فرزەند.
(«لَهُ ضِنْـوٌ كثيرٌ): منداڵێکـی/ زارۆڵەیەکی زۆری هەیە.
ضنى. (ضَنى-تِ المَرأةُ ضَنئً وضَناءً): ژنەکە (منداڵی زۆر بوو/ سکی زۆر کرد).
(-نَصيبُ فُلانٍ): قازانجی زۆر کردو بەشەکەی زۆر بوو.
(ضَنِـيَ-تِ المَـرأةُ. ضَنئً وضَنـاءً): ژنەکە منداڵی/ وەچەی زۆر بوو/ زارۆڵەی زۆر بوو.
ضهب: ١-(ضَهَبَ- هُ بالنـارِ ضَهْباً): بە ئاگر (گۆری/ گۆرانی بەسەردا هێنا).
(ضَهَّبَ- اللَّحْمَ): گۆشـتەکەی نیوەبرژ کرد/ نیوە برژاو کرد.
(-القَـوسَ): کەوانەکـەی دایە بـەر ئاگر تا نەرمبێتو چاکبێت.
(ضَهْبـاء): کەوانە یان توولێـك درابێتە بەر ئاگر بۆ ڕاستکردنەوە سافکردنی.
(أَلضَيهَب): شـوێنێکی شـاخ کە دەبێتو بەر خۆری داخدەبێتو گۆشتی لەسەر دەبرژێنن.
(لَحْـمُ مُضَهَّب): گۆشـتی (جنـراو/ پارچە پارچەکراو/ کوتکوتکراو).
٢-(ضَهَـبَ. ضُهوباً): لاوازبوو/ بوودەڵە بوو/ بێهێز بوو/ ناتەوانبوو.
٣-(ضَهَّبَ- القَـومُ): زۆربوونو بەپەلەبوون/ پەلەیانکرد.
(ضَهْـبُ القَـوم): هەرچـیو پەرچیـی ناو نەتەوە/ ناو خوێشگەل.
٤-(ضاهَـبَ- هُ. مُضاهَبَـةً): شـەڕە جنێوی لەگەڵدا کردو یەکتریان سووكو ناشیرینکرد.
ضهت: (ضَهَتَ- هُ. ضَهْتاً): توند پێی پێداناو شێلای/ خستیە ژێرەوە.
ضهـد: (ضَهَـدَ- هُ): بەزانـدیو سـەری پێشۆرکرد.
(أَضْهَـدَ- هُ وأَضْهَـدَ- بِـهِ واضْطَهَـدَ- هُ): ١-بەسەریدا زاڵبوو/ بەزاندیو ستەمی لێکرد/ چەوسـاندیەوە ٢-ئـازاری پێگەیاندو بە هۆی ئاینو ڕێڕەوەوە ناچاریکرد.
(أَلضُهْـدَة): چەوسـێنراوو ناچارکـراو/ بەزێنراوو زۆرلێکراو.
(هُـوَ ضُهْـدَةٌ لِـكُلِّ أَحَدٍ): ئەو چەوسـاوەو

زۆرلێکراوی دەستی هەموو کەسێکە.

(ألضَهيد): سەختو قایم/ زۆر پتەو.

ضهر: (ألضاهِر): ١-پۆپەی شاخ/ کێو ٢-دۆڵ/ دەرە.

(ألضَهْـر= الظاهِـر): ١-لوتکەی شـاخ ٢-دۆڵ ٢-(ح) کیسەڵ.

(ضَهْز): (ضَهَزَ وضَهَسَ – هُ ضَهْزاً وضَهْساً): توند پێی پێدانا/ خستیە ژێرەوە.

(-تِ الدابَّـةُ): چوارپێکـە بە پێشـی دەمی گازیگرت.

ضهـل: ١-(ضَهَلَ- اللـبَنُ ضَهْـلاً وضُهُولاً): شیرەکە تۆزەتۆزە کۆبووەوە.

(-تِ الناقَـةُ ونَحوها): مێحوشـترەکەو هیتر (شیرەکەی کزیکرد/ کەمبوو).

(ضَهُول (ج) ضُهُل): مێحوشترى شیرکزبوو.

(-هُ حَقَّهُ): مافەکەی بۆ کەمکرد/ لە مافەکەی کەمکردەوە.

(أضْهَـلَ- النَخْـلُ): دارخورماکـە فەریکـە خورماکەی گەیشت/ دەرکەوت.

(إسْـتَضْهَلَ- الخَبَرَ): ئەوەی تێگەیشـت لە هەواڵەکەی هەڵێنجاو دەرهێنا.

(ألضَهْل): ١-شیری کۆمەڵبوو ٢-چۆڕەئاو.

(الضاهِلَةُ- مِنَ العيُون): کانیاوی کەمئاو.

٢-(ضَهَلَ وتَضَهَّلَ- الى فُلان. ضَهْلاً وضُهُولاً): بەبێ شەرو ئاشووب بۆ لای فیسار گەڕایەوە.

(أضْهَـلَ- الى فُلان مالاً): مـاڵو دارای بەرەو ڕووی فیسار کردەوە بۆ خۆیبێت.

ضهـو: (ألضَهْـواء): ئافرەتـی مەمکپوکاوەو بێشیر.

(ألضَهْوَة (ج) أضْهاء): ١-ئەسـتێرك/ ئەستێل ٢-زەلکاو.

ضهي: ١-(ضَهِيَ. تَضهـى- ت المرأةُ. ضَهىً): ئافرەتەکە نە مەمکی هەبوو نە شیر، مەمکی پووکابووەوە.

(ضَهباء (ج) ضُهَى): ئافرەتی مەمکپووکاوەو بێشیر.

(ضَهِيَ- تِ الأرضُ): زەویەکە هیچی لێنەڕوا/ وشك و برنگ بوو، بیابانبوو، بێئاو.

٢-(ضاهَى- الرَجُلَ. مُضاهـاةً): لە پیاوەکە چوو/ وەك ئەو بوو.

(ألضَهِيّ): لێچوو/ هاوشێوە.

(هُوَ ضَهِيُكَ): ئەو وەك تۆیە/ لە تۆ دەچێت/ لە شێوەی تۆیە.

ضاء: ١-(ضـاءَ- القَمَرُ وغَـيرُهُ. ضَوْءً وضُوْءً وضِياءً): مانگەکەیان لەو بابەتە شەوقیدایەوە. ڕووناکیـی پەخشـاند/ درەوشـایەوە/ ڕۆشنیکردەوە.

(ضَوَّأَ البَيتَ. تَضْوِئَةً): خانووەکەی (ڕۆشنکردەوە/ ڕووناکردەوە).

(أضاءَ- البَيتُ. إضاءَةً): خانووەکە ڕووناکبووەوە/ ڕۆشنبووەوە.

(-البَيتَ): خانووەکەی/ماڵەکەی ڕووناککردەوە/

ڕۆشنكردەوە.
(تَضَـوَّأَ): لـە تاریكیدا دانیشـت بـۆ ئەوەی چاودێریی ئەوانە بـكات كە لەبەر ڕووناكیی ئاگردابوونو بیانبینێت.
(-ە): خۆی پەنــادا بۆ ئەوەی ئەوانەی لەبەر ڕووناكی ئاگردابوون بیانبینێت.
(إِسْـتَضاءَ- بِـهِ): كەڵكی لـە ڕووناكیی ئەو وەرگرت. بۆ ڕووناكیی بەكاریهێنا.
(- مِــن فلان): لە بیروڕای ئەو كەڵكی بینی/ ڕاوێژی بەو كرد.
(أَلضَـوْء والضُـوْء (ج) أَضْـواء والضِيــاء والضِواء): ڕووناكیی/ ڕۆشنایی ئەوەیە كە بە هۆیەوە چاو شت دەبینێت.
(أَلضَـوِيء والمُضِـيء): ١-ڕووناك/ ڕۆشن ٢-شەوقدەر/ ڕۆشنكەرەوە.
٢-(ضَوَّأَ- عَـنِ الأَمرِ. تَضوِئَـةً): لە كارەكە لایدا.
ضـاج: ١-(ضاجَ- عَـن كذا ضَوجـاً): لەوە لایدا.
(-الوادي): دۆڵەكە بەرفراوانبوو.
(تَضَوَّجَ- الوادي): دۆڵەكە پێچی زۆر بوو.
(إِنْضاجَ – الوادي): دۆڵەكە فراوانبوو.
(إِنْضَـوَجَ في ضَـوجِ الوادي): چـووە پێچی دۆڵەكەوە.
(أَلضَوج (ج) أَضْواج): پێچی دۆڵ.
٢-(أَلضَوْجان (م) ضَوْجانَة): وشكی ڕەق.

ضوح- (ضَوَّحَ- اللبَنَ): ئاوی كردە شیرەكەوە/ شیرەكەی ڕوونكردەوە.
ضار: ١-(ضارَ. ضَوْراً): زۆر برسیبوو.
(-ە الأَمرُ): كارەكە زیانی پێگەیاند.
(تَضَوَّرَ): گینگڵیدا، لە برساندا یان لەتاو ژانی لێدان تەپاوتلیبوو.
(-الذِئـبُ و نَحْـوَهُ): گورگەكەو لەو بابەتە/ لەتاو برسێتی لووراندی.
(الضَوْر) (مص): برسێتیی (زۆر/ سەخت).
٢-(الضُور): هەوری ڕەش.
(أَلضُـورَةُ): ١-سەرشـۆڕو زەبوون ٢-سـووك/ ڕسوا/ بێڕێز.
ضاز: (ضـازَ- الثَمَـرَةَ ضَـوْزاً): بەرەكەی/ میوەكەی لە دەمدا (جوو/ هێناوبرد).
(-ە حَقَّـهُ): لە مافەكەی خـوارد/ مافەكەی كەلكرد.
ضـوض: (ضَوضَـى. ضَوضـاةً وضَيضاءً): ژاوەژاویكـرد/ غەڵبەغەڵبیكـرد/ كـردی بە هەراو دەنگەدەنگ.
(مُضَوْض): ژاوەژاوكەر/ هەراو دەنگەدەنگكەر/ غەڵبەغەڵنێرەوە.
(أَلضَوضَى والضَوْضاء والضَيضاء): ١-غەڵبەغەڵب/ ژاوەژاو/ دەنگەدەنگ/ هەراوهوریا/ گەردش و دەنگی خەڵك لە جەنگو قەڵەباڵغی و بەیەكداچووندا.
ضـوط. (ضَـوَّطَ- الأَشـياءَ): شـتەكانی گردكردەوە/ كۆكردەوە.

(تَضَــوَّطَ الشَــيءُ): شــتەكە گردبــووەوە/ کۆبووەوە.

(ألضَوَط): خواریی کاکیلە.

(ألأَضْــوَط): ١ـکەســێکە کاکیلــەی خواربێت ٢ـگەوج.

(ألضَويطَه): ١ـقوڕ لــە بنی گۆلدا ٢ـهەویری داهێزراو/ شلەوەبوو ٣ـگەوج.

ضــاع: ١-(ضــاعَ- ـُ. ضَوعــاً): ١ـبزواندیو وورووژاندیو دڵخوردیکرد ٢ـتۆقاندی.

(-المِسْكُ): (بۆنە خۆشــەکە/ بۆنی مسکەکە) بڵاوبووەوە.

(-الصَبيُّ): کۆرپەکە لە برساندا کرووزایەوە.

(تَضَوَّعَ- المِسْــكُ والصَبيُّ): بۆنی مســکەکە بڵاوبــووەوەو کۆرپەکــە لــە برســاندا کرووزایەوە.

(تَضَوَّعَ وانضاعَ- الفرخُ): بەچکەی باڵندەکە بۆ دایکی کەوت باڵەتەپێ تا بە دەنووکی شتی بداتێ.

(رجلٌ مَضُوعُ): پیاوێکی تۆقیو.

٢-(ضــاعَ- الدابَــةَ. ضَوْعــاً): چوارپێکەی لاوازکرد.

٣-(ألضُــوَع والضِوَع (ج) أَضْــواع وضِيعان) (ح): فشفشــە جــۆرە کوندەبەبوویەکــە باڵندەیەکی شەوەکییەو بە شەو دەگەڕێت.

(ألضُواع): دەنگی فشفشەکە.

ضاف: (ضافَ- عَنِ الشَــيءِ. ضَوفاً): وازی لە شتەکە هێنا/ لە شتەکە گەڕا/ خۆی لە شتەکە لادا.

ضان: ١-(ضــانَ وتَضَوَّنَ ضَونَــةً وتَضَوُّنا): منداڵی زۆر بوو.

(ألضَونَــة) (مص): کچە کۆرپە/ کچۆڵەیەکی بچووك.

٢-(ألضَيون (ج) ضَياوِن (ح): گوربە پشیلە/ پشیلە نێرە.

ضــوّ: (الضَــوَّة): (ژاوەژاو/ هــاتو هاوار)ی جەنگ.

ضَويَ: ١-(ضَويَ. ضَوىً): ئێسقانی باریکبوو هی زگماکی یان لە نەخۆشییەوە.

(أَضْــوى): خــۆی لــە خۆیــدا باریکەلــەو بێگۆشتبوو.

(-الرَجُلَ): لاوازیکرد/ بێتواناییکرد/ لەڕیکرد.

(-حَقَّهُ): مافەکەی (کەمکردەوە/ کەلکرد).

(-الأَمــرَ): کارەکــەی بــاش (دانەمەزرانــد/ بنجبەست نەکرد).

(-تِ المَــرأَةُ): ژنەکــە منداڵێکــی لاوازی باریکەلەیبوو.

(ألضاوي (م) ضاوِيَــة): ١ـباریکەلەی وردیلە ٢ـلەش بچووکی بێجورم هی زگماکیی یان هی لاوازیی.

٢-(ضَوى- إِلَيهِ. ضَيّــاً وضُوِيّا): پەیوەندیی پێوە کردو چووە پاڵی، پەنایبۆبرد.

(-هُ إِلَيــهِ): فیســاری دایــە پاڵ ئەوو ســەر

بەویکرد.

(أَضْوى- هُ إِلَيهِ): خستیه پاڵ ئەو.

(إِنْضَـــوى- إِلَيهِ. إِنْضِواءً): چـووه پاڵ ئەوو تێکەڵی ئەو بوو.

٣-(ضَوى- الرَجُل. ضَيّـاً وضُوِيّاً): پیاوەکە شەو (هات/ لایدا).

(أَلضَاوي) (فا): شــەو هاتــوو/ پەنابردە/ لە دەرگادەر.

ضاج: (ضاجَ- عَنــهُ وإِلَيهِ. ضَيجاً وضَيُوجاً وضَيَجاناً): خۆی لێلاداو ڕاستبووەوە.

(-ت عِظامُهُ): ئێسکەکانی لە لاوازیدا کەوتە تەکانو جووڵەو لەقەلەق.

ضـــاح: ١-(ضــاحَ- تِ البلادُ ضَيحــاً): وڵات چۆڵبوو.

٢-(ضـــاحَ- اللَبَـــنَ. ضَيحـــاً): ئـــاوی (کردە شیرەکەو/ ئاوی تێکەڵ شیرەکە کرد).

(-فُلاناً): شیراوی بە فیساردا.

(تَضَيَّحَ- اللَّبَنُ): شـیرەکە ئـاوی تێکەڵکراو ڕوونبووەوە.

(-الرَجُلُ): شیری ئاو تێکەڵکراوی خواردەوە/ شیراوی خواردەوە.

(أَلضَيح) (مص): هەنگوین.

(أَلضَيْــح والضَيَــاح): ١-شــیراو/ شــیرئاوی تێکرابێت ٢-شۆربا یان چێشتی شلە.

(أَلضَيحَة): شیر برنج/ شۆربا بە شیر.

(عَيــشٌ مَضيوحُ): ژیانێکی پڕ لە دەغەڵیو ساختەبازیی/ ژیانێکی ناپاکانە.

ضار: (ضارَ- هُ الأَمرُ ضَــيراً): کارەکە زیانی پێگەیاند.

ضاز: (ضازَ. ضَيزاً): زۆرداریکرد/ ستەمیکرد.

(-هُ حَقَّــهُ): لە مافەکــەی قرتکردو خوارد/ کەمی دایەوە.

(أَلضَيْز) (مص): ناڕاســتیی/ گزیی/ خوارو خێچیی.

(قِيسْمَةٌ ضِيزى): بەشــکردنێکی ناڕاستانەو زۆردارانە.

ضاط: (ضاطَ- في مَشيَتِهِ ضَيْطاً وضَيَطاناً): لەشـــی لەبەر قەڵەویی‌و شــلی لە ڕۆیشـــتندا لەرەی لێوە دەهاتو بە لەنجەولار دەرۆیشت.

(ضَيْطــان وضَيَّــاط): قەڵەوێکــی شــلی لە ڕۆیشـــتندا بـــە لەنجـــەو لار ڕۆیشـــتو/ لەش لەرەلێوەهاتوو.

ضـــاع: ١-(ضـــاعَ. ضَيْعـــاً وضِيْعـــاً وضَيْعَةً وضَياعـــاً): ١-ونبـــوو ٢-فەوتا/لەناوچـــوو/ لەدەستچوو ٣-پشگوێخرا ٤-مرد.

(ضائِــع): ١-ونبــوو ٢-فەوتــاو/ لەناوچــوو/ لەدەستچوو ٣-پشتگوێخراو ٤-مردوو.

(ج) ضُيَّع وضِياع. ضَيَّعَ- الشيءَ): ١-شتەکەی پشگوێخســت/ بەتەنــگ شــتەکەوە نەهــات ٢-فەوتاندی/ لەناویبرد ٣-ونیکرد.

(أَضاعَ- هُ): ١=ونیکرد ٢-لەدەستیدا/ فەوتاندی ٣-بەتەنگیەوە نەهات/ پشتگوێیخست.

(أَلضَياع (مص) والضِيْع والضِيَع): ١-ونبوون ٢-فەوتان/ لەناوچوون ٣ بەتەنگەوەنەهاتن.

(«ماتَ ضَياعاً وضِيْعاً وضِيَعاً»): مردو (كەس مشـوری نەخوارد/ بۆی نەگەڕاو بەتەنگیەوە نەهات).

(أَلضَيْعَـةُ (ج) ضِيَـع وضِيَـاع وَضَيْعات): جارێـك (ونبـوون، فەوتـان، لەناوچـوون، بەتەنگەوە نەهاتن. مردن).

ضُيَيْعَـة: بـچووكـكـراوەی (الـضَيـعَـة): نیمچە (لەناوچوونێك/ ونبوونێك/ بەتەنگەوەنەهاتنێك).

(أَلمِضْيـاع): ١-فـرە (فەوتێـن/ لەناوبـەر) ٢-بەتەنگەوەنەهاتـوو/ زۆر بێدەربەسـبوو ٣-زۆر شت بە فیرۆدەر.

(أَلمَضْيَعَـة والمَضْيَعَـة): ١-هـۆی (فەوتـان/ لەناوچـوون/ بەفیرۆچـوون ٢-هـۆی مردن ٣-هۆی بێدەربەرسیو پشتگوێخستن).

(بلدكم مَضيَعَةُ العِلـم): ولاتەكەتان تیایدا زانستیی دەفەوتێتو پێشناكەوێت.

٢-(أَضـاعَ- الرَجُلُ): پیاوەكـە خانوو بەرەو موڵكی زۆری پێكەوەنا.

(أَلضَيعَـة (ج) ضِيَـع وضِيَـاع وضَيَعات): ١-خانووبەرە ٢-زەویی بەرهەمهێن ٣-پیشـەو پیشەسازیی پیاوەكە.

(ضُيَيْعَـة): بچووككراوەی (أَلضَيعَة): نیمچە (خانووبـەرە زەویـی، بەرهەمهێن، پیشـەو پیشەسازیی كابرا).

(«كانَـتْ ضَيعَةُ العَـرَب سياسَـةُ الإِبلِ»): پیشـەی كۆنی عەرەب بەخێوكردنی حوشتر بوو.

٣-(تَضَيَّعَ- المِسْكُ): بۆنی مسك بڵاوبووەوە/ پەخشبوو.

(أَلضَياع): جۆرە بۆنێكی خۆشە.

ضاف: ١-(ضافَ- إِلَيـهِ ضَيْفاً): بەلای ئەودا (لایدا/ كەچبوو/ شكایەوە) ڕوویكردە ئەو.

(-تِ الشَـمسُ): خۆرەكـە نـەوی‌و ڕووەو ئاوابوونبوو.

(-السَـهْمُ عَنِ الهَدَفِ): تیرەكە لە نیشـانەكە لایدا.

(ضَيَّفَ- هُ إِلَيهِ): (بۆ لای ئەو/ بەلای ئەودا) لایپێدا.

(-الرَجُلُ): لایدا، پێچیخواردو گەڕایەوە.

(-تِ الشَمْسُ): خۆرەكە خەریكی ئاوابوونبوو.

(أَضـافَ- عليه): دەسـەڵاتی بەسـەردابوو/ بەسەریدا ڕوانی.

(-الشَيءَ إِلى الشَيءِ): شتەكەی بەسەر شتەكەی تردا كرد.

(-الكلمـةَ إِلى الكَلِمَـةِ): وشـەكەی (دایە پاڵ وشەكەیتر/ تایبەتیی وشەكەیتریكرد).

(تَضَيَّـفَ- الرَجُـلُ): بـەلادا لایـدا/ بەلادا شكایەوەو گەڕایەوە.

(-تِ الشَـمسُ): خۆرەكـە بـەلای ئاوابووندا شكایەوە.

(تَضايَفَ- الوادي): دۆڵەكە تەسكبووەوە.

(إنضافَ إلَيهِ): چوو سەر ئەو/ چووە پاڵ ئەو/ تێكەڵيبوو.

(ألضِيْف): تەنشت/ لا.

(«هُوَ في ضِيفِ فُلان»): ئەو لە تەنشت ئەوەوەيە.

(ألمُضاف): ١-كەسێكە بە خوێشگەلەوە بلكێت/ لەوان نەبێت و چووبێتە پاڵ ئەوان ٢-كەسێكە كە خۆی لە تاقمێك دابنێت و لەوانيش نەبێت.

(مَضايِفُ – الوادي): پێچ و پەنای دۆڵەكە.

٢-(ضافَ- هُ ضَيْفاً وضِيافَةً): ١-بوو بە ميوانی ئەو.

(«ضافَ الهَمُّ فُلانٌ»): ١-مەراق و خەفەت دای بەسەر فيساردا ٢-داوايلێكرد ميوانداريی بكات/ لای ئەو نانبخوات.

(ضَيَّفَ- هُ): نانی ميوانيی دەرخوارددا/ كردی بە ميوانی خۆی ٢-ميوانداريكرد.

(أضافَ- الرَجُلَ): ١-پياوەكەی خستە پاڵ خۆی ٢-داڵدەيداو پاراستی/ پەنايدا.

(-فُلاناً على فُلانٍ): كابرايكرد بە ميوانی فيسار.

(تَضَيَّفَ- هُ): ١-بوو بە ميوانی ئەو ٢-داوای لێكرد كە ببێتە ميوانی.

(إسْتَضافَ- هُ): داوای ميوانداريی لێكرد.

(-بِهِ): هاواری بۆ برد پەنايبدات/ هانايبۆ برد.

(-مِن فُلان إلى فُلان): لەتاو كابرا هاواری پەنای بۆ فيسار برد/ هانای بۆ فيسار برد.

(ألضَيْف): ١-ميوان ٢-داڵدەدراو (بۆ تاك و كۆ).

(م) (ضَيف وضَيفَة (ج) أضياف وضُيُوف وضِياف وضِيْفان وأضائِف): ١-ميوان ٢-داڵدەدراو.

(ألضَيْفَنُ): كەسێكە كە خۆی بە ميوانەكەوە هەڵواسێت/ مشەخۆر.

(ألضِيافَة): ميوانداريی/ نان بە ميواندان/ نان بۆ ميوانكردن.

(ألمُضاف- في الحَرْب): گەمارۆدراو لە جەنگدا.

(ألمَضِيْف والمَضيفَة): ميوانخانە، شوێنی نان‌دان بە ميوان/ ديوەخان.

(ألمِضْياف): ميوانپەروەر/ نانبدە/ كەسێكە هەميشە ميوانی هەبێت.

(ألمَضْيفَة): پەژارە/ داخ/ خەفەت/ مەراق/ جەخار.

(ألمُضْيفَة= المَضيفَة): ميواندار/ بەو كچانە دەڵێن كە لە فرۆكەدا ميوانداريی سەرنشينەكانی فرۆكەكە دەكەن و بەتەنگيانەوە دێن و كارگوزارييان بۆ دەكەن.

٣-(ضافَ- الرَجُل. ضَيفاً): ترسا(-مِنهُ): سڵی لێكردەوەو خۆی لێپاراست.

(أضافَ): ترسا(-مِنهُ): سڵی لێكردەوەو خۆی لێپاراست.

٤-(أضافَ- الرَجُلُ): رايكردو خێرا تێيتەقان.

الملحق:

ضَيف: (ألإضافَة): ١-خستنەپاڵ/ خستنەسەر ٢-سەرباره/ لەگەڵدا دانان.

(«إضافَة فَصْلٍ الى كتاب»): بەشێکیتر بخرێتە سەر پەرتووکەکە/ کتێبەکە.

(إضافة): زۆریی/ هیتر/ زیادە.

(أُدْخِلَ إضافة على نَص): بەشێکی تر خرایە سەر دەقەکە.

(-في النَّحو): لە رێزمانـــدا (وەپالنان/ کردن بە هیتر).

(«كِتـــابُ المُعَلِّـــم»): کتێبی مامۆســتاکە. بە کتێبەکە دەوترێت.

مضـــاف: وەپاڵـــدەر. المعلـــم: مضـــاف اليه: وەپاڵدراو.

(ألإضافـــة في المَنْطِق): لە گفتـــەدا لە یەکێك لە قسەوتراوە چوارینەکانی وتارەکانی ئارستۆ ئەوەیە دوو شت پەیوەستبن بە یەکەوە بەبێ یەك نەبن وەکـو بوونی کوڕو باوك کە بەبێ بوونی باوك کوڕو منداڵ نابێت.

(إضافي): ســـەربارەکراو/ لێزۆرکـــراو ئەوەی بخرێتە سەر.

(«مادة إضافية»): ١-مادەیەکی سەربارەکراو/ ســـەرناکراو ٢-(شـــوێنخراوی/ دواخـــراوی شـــتێکیتر، بـــە پاشـــکۆکردنی شـــتێکیتر/ بێزۆرکراوە بنچینەییەکە.

(نَفَقاتُ إضافِيَة): سەرنراوی خەرجی/ زێدە خەرجی.

(ســـاعات إضافية): کاتژمێـــر زیدە کارکردن کەسەربارەی کاری کاتی خۆیە.

---

ضاق: (ضـــاقَ. ضِيْقـــاً وضَيْقـــاً): (تەنگ/ تەسك) بوو/ هاتەوەیەك.

(ضَيْـــق و ضائِق وضَيِّق): تەنگ/ تەســـك/ تەنگەبەر.

(ضاقَ – الرَجُلُ): رژد بوو/ چرووکبوو.

(ضَيَّقَ- هُ. تضيقاً):تەنگیکرد/ تەسکیکردەوە/ هێنایەوە یەك.

(ضُيِّـــقَ- عليـــهِ): تەنگـــی پێهەڵچنـــرا/ تەنگەتاوکرا/ گوشـــاری خرایە ســـەر/ زۆری لێکرا.

(أضاقَ- هُ إضاقَةً):تەنگیکردەوە تەسکیکردەوە هێنایەوەیەك.

(-الرَجُلُ): نـــەدارا بوو/ دەســـتی کورتبوو/ نەبوو بوو/ هەژارکەوت/ کەوتە تەنگانەوە.

(تَضَيَّـــقَ): تەســـکبووەوە/ تەنگبـــووەوە/ هاتەوەیەك.

(تَضايَقَ): هاتەوەیەك/ تەسکبووەوە.

(-الأَمرُ بِهِ أو عَلَيهِ): کارەکە (نارەحەتیکرد/ ســـەغڵەتیکرد/ ماندوویکـــردو بێزاریکـــرد/ خستیە تەنگانەوە).

(«تَضايَـــقَ- القَـــومُ»): خوێشـــگەل کەوتنە (تەنگانەوە/ ســـەغڵەتییەوە/ لەبەر تەسکیی شوێنەکەیان یان دڵتەنگییان.

(اَلضَيْــق) (مــص): ١-دڵتەنگيــیو خەفەت ٢-سەغڵەتیی/ تەنگانە.

(اَلضَيِقُ): گومان.

(اَلضِيْــق) (مــص): ســەغڵەتیی/ تەنگانە/ دەستكورتیی.

(اَلضِيْقَــةُ والضَيْقَــةُ (ج) ضِيَــق وضَيْق): ١-بەدگوزەرانیی/ هەژاریی/ نەدارایی ٢-تەنگ‌و چەڵەمە.

(اَلضائِق) (ج) (ضاقَة): تەسك/ تەنگ.

(فلانٌ ضائِق صَدرهُ بِكَذا): فیســار بەوە دڵی (تەنگە/ نارەحەتە).

(اَلأَضْيَق (م) ضَيْقَى وضُوْقى): تەسكتر/ تەنگتر.

أَلمَضيــق (ج) مَضايق: ١-شــوێنی تەنگەبەر/ دەربەند/ گەلیی ٢-گەروو/ ناوێكی تەســك لە نێوان دوو پارچە زەویدا.

الملحق:

ضيــق: ١-(اَلضائِقَة): تەنگانــەو نەبوونیی/ بارخراپبوون/ داماویی.

(«ضائِقَــةُ العَيــش»): ژیانــی هەژاریــیو كولەمەرگیی/ نەدارایی.

٢-الأَزمَــة والشِــدَّة: قەیــرانو ســەغڵەتیی سەخت.

«الضائقة الماليَّة»: قەیرانی دارایی.

---

ضاك: (ضاكَ-تِ الناقَةُ ضَيكاً): مێحوشترەكە لە گەرمانــدا گەڵی بڵاوكردەوەو نەیتوانی بە سەرگوانیدا بیهێنێتەوە یەك.

ضائِــك (ج) ضُيَّك: حوشــتری لــە گەرماندا گەڵبڵاو.

(ضاكَ- عليه غَيظاً): رقی زۆر لێهەســتا/ لە رقاندا تووكەسەر بو/ لێی دڵ پڕ لە قینبوو.

ضيــل: (أَضــالَ وأَضْيَــلَ- المَــكانُ. إضالَــةً وإضْيــالاً): شــوێنەكە (عەنەبــە كێویلەی/ سنجوری) لێڕوا.

(أَلضال الواحدة ضالَة) (ن): عەنەبەكێویلە/ ســنجور درەختێكــە لــە ڕۆخــە باكورەكانی ئەفەریقادا باش دەڕوێت/ بەرەكەی دەخورێت.

(أَلضالَة): هەموو جۆرە چەكێك.

ضام: (ضــامَ- ہُ . ضَيْماً): ســتەمی لێكرد/ زۆرداریی بەرامبەر كردو سەری پێشۆر كرد.

(ضامَ واسْتَضامَ- ہُ حَقَّہُ): لە مافەكەی بری/ كەلیكرد/ لەهەقەكەی خوارد.

(أَلضَيْم (ج) ضُيُوم): ستەم/، زۆرداریی/ زۆر.

(ضِيْم- الجَبَل): لا/ تەنشتی شاخ.

(أَلضامَة): پێداویستیی/ پێویستیی.




(ط). الطاء: پیتی شـــازدەهەمینی ئەلفوبێی عەرەبییـــە لـــەو پیتانەیـــە کـــە زمـــان بـــە مەڵاشـــووەوە دەنووســـێت لە ژمێـــرەی کۆی پیتەکاندا (٩)یە.

طأطـــأ: ١-(طأطـــأ- الرأس وغیرَهُ): ســـەری (داخستن/ دانەواند) یان شتێتری شۆڕکردەوە/ دانەواند.

(طأطـــأ رأســـه عن کذا): ســـەری بـــۆ ئەوە نزمکردەوە/ لەبەرئەوە نزمی کردەوە.

(-ت المـــرأة ســـترها): ئافرەتەکە پەچەکەی دادایەوە.

(-الحفرة): چاڵەکەی (قوڵترکرد/ داخست).

(-فلانُ من فلان"): فیسار پایەی فیسارکەسی نزمکردەوە.

(-في قتـــل القـــوم): دەســـتی لـــە کوشـــتنی خوێشگەلەکەدا داگرتو تیژڕەوییکرد.

(تطأطا): داگەوت/ دانەوی/ داچوو/ نزمبووەوە.

(الطأطـــاء): ١-زەویی نزمو چاڵ ٢-حوشـــتری کورت.

٢-(طأطأ- فرَسَهُ): بە ڕانی لە ئەسپەکەیەوە ژەند تا تاوبداتو بکەوێتە غار.

(-یـــده بالعنان): جڵەوی بۆ شـــلکرد تا غار بکات.

طـــبَ: ١-(طـــبَ- هُ طبـــا): دەرمانیکـــرد/ تیماریکرد/ چارسەریکرد.

(ماکنـــت طیبـــا و لقـــد طببتَ): پزیشـــك نەبوویتو پزیشکیت کرد.

(-طبَ- الرجُل): هێواشو نەرمو لەســـەرخۆ بوو لە کارداو میهرەبانیی نواند.

("مـــن أحـــب طـــبَّ"): هـــەر کەســـێك خۆشەویســـتیی لە دڵدا بێت شێنەییو نەرمو میهرەباندەبێت.

(«اصْنعْـــه صنعـــة من طبَ لمـــن حَبَّ»): کارامانـــەو شـــارەزایانە دروســـتی بکـــە وەك

یەكێــك چۆن بۆ خۆشەویســتەكەی شــتێك دروستدەكاتو دەیرازێنێتەوە.

(طُبَّ- الرَجُلُ): كابرا ئەفسونی لێكراوە.

(طَبَّــبَ- هُ): تیماریكــرد/ چارەیكــرد/ چارەسەریكرد.

(«طــابَّ- الأمرَ. مُطابَــةً»): كارەكەی هێناو بردو چاریكرد/ گەیاندیە ئەنجام.

(«أنا أُطابُّ هذا الأمرَ مُنذُ حين كي أُبلِغُهُ»): من ماوەیەكە ئەم كارە هەڵگێڕو داگێڕ دەكەمو خەریكی چارەسەریم تا بیگەیەنمە ئەنجام.

(تَطَبَّبَ): ١-چارەسەركرا/ دەرمانكرا.

(تَطَبَّبَ- الرَجُــلُ): كابرا پزیشــككارییكرد گەرچی پزیشكیش نەبوو.

(-لِفُلان): پزیشكی بۆ فیسار داواكرد.

(إسْتَطَبَّ- هُ): ســەردانی پزیشكیكردو داوای لێكرد چارەسەری بكاتو دەرمانی بكات.

(ألطَبّ) (مص): ١ زانا لە پزیشكیدا ٢-شارەزاو كارامەو وەستا لە كارەكەیدا.

(هُوَ طَبٌّ بهذا الأمر): ئەو لێزانو كارامەیە/ شارەزایە لەم كارەدا.

(ألطَبّ والطِبّ والطُبّ): ١-پزیشــكیی لەشو دەروون/ چارەسەركردنو تیماركردنی تەنو دەروون/ پیشەیەكە یان زانیارییەكە كە لەش لــە نەخۆشــی لــەشو دەروون ڕزبگاربكاتو پارێزگاریی تەندروســتی بــكات لە بنچینەدا لە شــارەزاییو لێزانییو بــە تەنگەوەهاتنو دڵنەرمییەوە هاتووە ٢-جادوو/ سیحر.

(ألطَبَّة): مێی وشەی (ألطَبّ).

(ألطِبــاب): ئــەوەی كــە پێــی چارەســەر دەكرێت.

("هذا طِبــابُ مَرَضِكَ"): ئەمــە ئەوەیە كە چاری نەخۆشییەكەت دەكات.

(ألطِّبابَة): پزیشكیی.

(الطبیــب (ج) أطِبَّة وأطِبّــاء (م) طبیبَة): ١-پزیشــك/ دوختەر ٢-هەمــوو یەكێك كە لە كارەكەیدا لێزانو كارزانو كارامە بێت.

٢-(طَبَّ- خُــرزَ القِربَةِ طَبّــاً): كوندەكەی پینەكردو درووییەوە.

(والعامــة تقول طَبَّ علــى وَجهِهِ والصَواب أكَــبَّ): خەڵكە ڕەشــۆكەكە دەڵێــن: (طَبَّ) ڕاستیەكەی (أكَبَّ): دەمەونخونیكرد.

(طَــبَّ. الإناءَ. الصواب («كَبَّــهُ»): قاپەكەی هەڵگێڕایەوە/ دەمەونخونیكرد.

(طَبَّــبَ القربةَ): مەشــكە یــان كوندەكەی پینەكردو درووییەوە.

(ألطبابَــة) مِنَ الخَــرَز: كونكردنی جارێكو دروونەوەیەك.

٣-(طَبَّــبَ- الخَیاطُ الثَــوبَ): بەرگدرووەكە پارچەی دایە دەم بەرگەكەو فراوانتریكرد.

(ألطِبَّــةُ (ج) طِبَــب والطِبابَــة (ج) طِباب): پارچــەی درێژی دەمدراوی بــەرگ یان پارچە هەور یان پارچە چەرم یان پارچە زەوی درێژ.

٤-(أَلطِــبّ): ١-خواســتو ئــارەزوو/ هەوەس لێبوون/ هەوەسهەســتان ٢-باروكار ٣-نەريت/ خوو.

(«فُــلان طِبُــهُ المجُــون»): فيســار نەريتى بەرەڵاييە.

(أَلطِبَّة): لا.

"هُوَ فِي تلك الطِبَّةِ": ئەو لەولايەوەيە.

٥-(طَبطَــبَ- المــاءُ أَو السَّــيْلُ): ئاوەكە يان لێشاوەكە هاژەو خورەيهات.

(- الوادِي): دۆڵەكە/ ئاوى پێداڕۆيشت.

(-الماءَ): ئاوەكەى بزواند/ ڕاكێشا.

(أَلطَبْطابَة): ڕيكت/ تەختەيەكى پانە يارىى تۆپى پێدەكەن.

(أَلطَبْطَبِيَّة): قامچى كە پێى لێدەدرێت.

طبج: (طَبِجَ- الرَّجُــلُ. طَبجاً): گەوجبوو/ خۆى گەوجكرد.

(أَطْبَج): گەوج.

(طَبِجَ- عَلى رَأسِهِ وعلى كُلِّ أَجْوَفٍ): كێشاى بەسەريداو بە هەموو شتێكى بۆشدا.

(تَطَبَّجَ- فِي الكلام): قسەكەى ڕازاندەوە.

طبــخ: ١-(طَبَخَ وطَبَّــخَ- اللَّحْــمَ. طَبخاً): گۆشتەكەى لێناو پێگەياند.

(إِطَّبَــخَ- الرَجُــلُ): خواردنــى پەيداكــرد/ خواردنى بۆ خۆى دروستكرد.

(-اللَّحمَ): گۆشتەكەى لێناو پێگەياند.

(إِنْطَبَخَ): لێنراوو پێگەيشتوو.

(أَلطَبْخ (مص) والطِبْخ): چێشت/ ئەوەى كە لێدەنرێت.

(أَلطُباخَة): ١-كەفى هەڵچووى مەنجەڵى ســەر ئاگر ٢-ئەوەى كە لێدەنرێت.

(أَلــطِــبــاخَــة): چــێــشــتــكــەريــى/ پــيــشــەى چێشتلێنان.

(أَلطَبَّاخ= الطَّاهي): چێشتكەر/ چێشتلێنەر/ شێولێنەر.

(أَلطَباخ) عِندَ العامة): (لاى ڕەشە خەڵكەكە) ئاگردان/ كوورە ئەوەى كە چێشــتى لەســەر لێدەنێن.

(مُنصَــب: الطَبَّــاخ): ســێپا كــە مەنجەڵى دەخەنە سەر.

(طُبَّــاخُ العِنَبِ والتين (عِنــد العامة): لاى ڕەشە خەڵكەكە ئەو تەمەيە كە بە كێوەوەيەو هەنجــيرو تــرێ زوو دەگەيەنێــتو پێــش پێگەياندنى دەبێت.

(أَلطَبيخ (ج) أَطبِخَة):١-ئەوەى كە لێدەنرێت/ چێشت/ لێنراو ٢-گەچ ٣-خشتى سوور.

(الطابِــخ): ١-لێنەرى چێشــت ٢-تاى بەرزى بێپچڕ.

(الطابِخَــةُ): مێى وشــەى (الطابِــخ): ١-ژنى چێشــتكەر ٢-گەرمــاى قرچــەى نيــوەڕۆ تا (نزيكى عەسر/ پاشنيوەڕۆ).

(أَلمَطْبَخ (ج) مطابخ): شوێنى چێشتلێنان.

(أَلمِطْبَخ (ج) مَطابِخ): چێشتكولێن.

(اَلْمُطَبَّخ والمَطْبَخ): چێشتخانه.

(اَلتين المَطبوخ) (ط): هەنجیری وشـــککراوه. شەکر یان دۆشاوی پێوه دەکەن.

٢-(طَبَّـــخَ- الصَبيُّ): منداڵەکــه گەوره بوو/ پێگەیشت.

٣-(اَلطَبــاخ والطُبــاخ): ١-دامەزرانـــدن و قایمکردن ٢-هێزو پێز.

("مـــافي كَلامِهِ طبــاخٌ"): قســـەکەی بێپێزو کەڵکە.

(اَلأَطْبَخ): گەوجێکی تەواو گەوج/ کەرپیاو.

طبر: (طَبَرَ. طَبْراً): بازدیداو خۆی شاردەوه/ ونبوو.

(اَلطَبَــر والطَبَرْزيـــن): تـــەورو تەورزیـــن (اَلكليمتان فارسيتان).

اَلطَبَرِيّ): خەڵکی تەبرستان

الملحق:

طـــبر: (اَلطَّابـــور) (ج) طوابـــير: یەکەیەکی سەربازییەو چەند دەستەیەکی گرتۆتە خۆی.

(اَلطابـــور الخامِس): پاش شـــەڕی ناوخۆی ئیسپانیا بەو پێشمەرگانە دەوترا کە بە نهێنی لەناو دوژمنـــدا کاریاندەکردو دەجەنگین یان نەیار پشتی پێدەبەســـتێت لەناو نەیارەکانی خۆیدا.

---

(طبز. طَبَزَ- هُ طَبْزاً): پڕیکرد.

(اَلطِبْـــز):١-کەنـــاری شـــاخ ٢-(ح) حوشـــتری دووکۆپاره.

طبس: (طَبَّسَ- هُ):لەقوڕیگرت/ قوڕاوییکرد/

(الطَبس) هەموو شتێکی ڕەش.

(اَلطِبْس) (ح): گورگ.

(بَحرٌ طَبيسٌ): دەریایەکی پڕئاو/ ئاوزۆر.

طبش: ١-(اَلطَبْش): خەڵك.

(اَلطَبْشَـــةُ) (عامية) دارێکـــی درێژه پێی لە منداڵ دەدرێت.

(فَصيحُها: اَلمِخْفَقَة)

٢-(اَلطَبْشـــورَة (ج) طَباشـــير) (تركيـــة): دەباشیر کە لە مادەیەکی گەچینە کە پێیدەڵێن (المادة الطَباشـــيرية): مادەی دەباشـــیریی کە لەسەر تەختەیڕەش پێیدەنوسرێت.

طبع: ١-(طَبَعَ- الشـــيءَ. طَبْعاً): شـــتەکەی چاپکرد.

(-عَلَيهِ): شتەکەی مۆرکرد.

(«طَبَـــعَ اللهُ علـــى قَلْبِـــهِ»): خـــودا دڵـــی مۆرکردووەو قەپاتیکردووەو هۆشی لێبڕیوەو سەرکەوتنیشی لەدەستداوه.

(-الدِرهَمَ): ســـکەی پارەکەی لێـــداو نیگاری لەسەر کرد.

(-السَيفَ): شمشێری دارشتو دروستکرد.

(-اللهُ الخَلـــقَ): خـــودا خەڵکـــی (بەدیهێنـــا/ دروستکرد).

(طُبِـــعَ- على الجَهْـــلِ): هەر بـــه نەفامیی و تێنەگەیشتوویی ڕسکاوه.

(طَبَّـــعَ- الدابَّـــةَ) (عند العامـــة= فَصيحُها

راضها): چوارپێکەی ڕامکرد/ ڕاهێنا.
(تَطَبَّعَ): ١-چاپبوو ٢-مۆربوو/ مۆرکرا.
(تَطَبَّعَ- بِطِباعِ أبيه): ڕەوشتو خووی باوکی خۆی وەرگرت.
(إنْطَبَعَ): ١-چاپبوو ٢-مۆرکرا/ مۆربوو ٣-دروستبوو ٤-ڕەوشتگرتوو بوو.
(ألطَّبْع) (مص) (ج) طِباع: ١-سروشتو ڕەوشتێك کە مرۆڤ لە سەری دروستبووبێت ٢-نموونەو شێوە.
(«أضْرَبْهُ على طَبع هذا»): لەسەر ئەو شێوەیەو ئەو نموونەیە دروستی بکە یان چاپی بکە.
(ألطابع) (فا): سروشتێك کە مرۆڤ لەسەری ڕسکابێت.
(ألطابِع والطابَع (ح) طَوابِع): ١-مۆر/ هەرچی مۆری پێدەکرێتو شێوەی پێدەگیرێت.
(«هذا كلامٌ عليه طابعُ الفَصاحَة»): ئەمە قسەیەکە کە شێوە ڕەوانیی قسەی پێوەیە ٢ پوولی پۆستە.
(أوراق البُول (عامية): پولی پۆستە. کە ولاتان دەریدەکەنو بە نامەوەیدەنێنو بەملاولاو ولاتاندا دەینێرن.
(ألطوابع الأميرية): پولی دارایی کە میری دەریدەکاتو بۆ کاری دارایی بەکاردێت.
(الطوابع القُنْصُلِيَّة): جۆرە پوولێکە لە قۆنسولخانەکانو پالوێزخانەکاندا بەکاردێت.

(ألطِباع): سروشت کە مرۆڤ لەسەری ڕسکاوە.
(ألطَبَّاع): کەسێکە چاپ یان مۆر زۆربکات/ چاپکەری چابوك.
(ألطِباعَة): چاپکردن/ پیشەی چاپگەریی.
(دالر الطِباعَة): چاپخانە.
(ألطُبْعان): مۆر ئەوەی مۆری پێدەکەن.
(هذا طُبعانُ الأمير): ئەمە مۆری میرە.
(ألطبيعَة (ج) طَبائِع): سروشت کە مرۆڤ لەسەری ڕسکاوە ٢-سروشتو هەموو زیندەوەر کە لەسەر گەردوونە.
(جَمال الطَبيعَة): جوانیی سروشت.
(ألطَبائِع الأربع عند قدماء الطبيعيين): سروشت لە لای سروشتناسە کۆنەکان ئەمانەن: ١-گەرمی ٢ ساردی ٣-شێو ٤ وشکیی.
(الطَبيعِيّ): ١-سروشتیی/ خۆرسکی ٢-کەسێکە کە هەموو شتێك بۆ سروشت دەگێڕێتەوە ٣ کەسێکە کە خەریکی زانستییە سروشتییەکانە/ زانای سروشتیناسو سروشتناس.
(عِلمُ الطَبيعِيَّات): زانستیی سروشتی زانستێکە لە چۆنیەتی دروستبوونو ڕسکاندنیو سروشتی شتەکان دەکۆڵێتەوە کە خودا دروستیکردوونو بەدیهێناونو چ خەسلەتو نیشانەو هێزێکی داونەتێ.
(طَبع الكتاب): چاپکردنی پەرتووك.

(اَلمَطْبَعَة والمَطْبَع): چاپخانه (ج).
(مَطابِــع. اَلمِطْبَعَــة (ج) مَطابِـع): چـاپ/ ئامێری چاپکردن.
(اَلمطبوع (مفــع): ١-چاپکراو ٢-سروشــتانه ڕسکاو/ وا ڕاهاتوو/ خووپێوەگرتوو.
(اَلمطبوع- مِنَ الشُّــعَراء): شاعیری ئاسانگۆی هەڵبەستو ئاسان بۆ هاتوو.
٢-(طَبَــعَ- الدلــوَ. طَبْعــاً): دۆلکەکــە یان سەتڵەکەی پڕکرد.
(طَبَّعَ- الإناءَ): قاپەکەی/ دەفرەکەی پڕکرد.
(تَطَبَّــعَ- النَّهْرُ بِالماءِ): ڕووبارەکە لێوانڕێژی ئاو بوو/ سەرڕێژیکرد.
(اَلطِبــعُ (ج) طُبُــوع وطِبــاع): ١-زۆنگ ٢-پڕپێوەر ٣-گوندە/ مەشکە ٤-ڕووبار.
٣-(طَبِــعَ. طَبَعاً): لەشــی پیــسو گڵاو بوو، لەکەدار بوو یان بەدڕەوشــتو بێئابڕوو بوو/ بەدخوو بوو.
(-السَّیفُ): شمشێرەکە ژەنگگرتی.
(طَبِع وأَطْبَع): ژەنگاوی. ژەنگرتوو.
(طَبَّعَ- الإناءَ): قاپەکەی گڵاوکرد.
(اَلطِبْــع والطَبَــعَ (ج) أَطْبــاع): ١-ژەنــگو پیســیو گڵاویــی ٢-نەنگییو شــەرمەزاریی ٣-لەکەو خەوش.
(اَلطَبِــع): ڕەوشــتنزمو ناپــاك/ بەدزمانو بەدڕەوشت.
سَیفُ طَبِع: شمشێری ژەنگاوی.

الملحق:
طبــع: (اَلطَّبْعَــةُ): کۆمەڵە پیتو خشــتەو کلێشەی چەسپاوی سەر ئامێری چاپکردنەکە بۆ چاپکردنی ئەوەی کە دەبێت چاپبکرێت.
(اَلطَبعَة): چاپکردنــی جارێکی پەرتووك یا نامە یان بڵاوکراوەیەك.
("اَلطَّبْعَة الرابعة"): چاپی چوارەمی پەرتووکێك/ کتێبێك یان هەر نووسراوێك بێت.

---

طبــق: ١-(طَبِــقَ-تْ یَــدُهُ طَبْقــاً وطَبَقاً): دەســتی ١-قووچا/ نووقا/ داخــرا ٢-بە لایەوە نووساو نەکرایەوە.
(-یَفعَلُ- الشــيءَ): دەستی بە کردنی شتەکە کرد.
(طَبَّقَ- الشيءُ): شتەکە (پەخشو بڵاوبووەوە/ هەموو لایەکی گرتەوە/ بوو بە باو).
(-السَّــحابُ الجَوَّ): هەور ئاســمانی گرتەوەو داپۆشی.
(-الماءُ وجهَ الأَرضِ): ئاوەکە ڕووی زەویەکەی داپۆشی.
(-الفَرَسُ): ئەسپەکە توند غاریکرد.
(-السَّــیفُ المِفْصَــلَ): شمشــێرەکە دای بــە جومگەکەدا دەریخست.
(«إنَّه یُطَبِّقُ المِفْصَلَ»): بەڵگەو بیانووەکەی تەواو پێکایو کاریگەر بوو.
(«طَبَّقَ الحاكِمُ في حُكْمِهِ»): دادوەرەکە بڕیاری ڕاستیداو بە ڕاستو تەواو دادوەرییکرد.

(«طَبَّـقَ فُـلانٌ»): فیسـاری بـۆ لای خۆی ڕاکێشاو کردی بە هاوبیری ڕامیاری خۆی یان لە شتیتردا.

(طابـقَ- المقَیَّـدُ. طِباقـاً ومُطابَقَـةً): زنجیرکراوەکە بە هەنگاوی ورد ڕۆیشت.

(- الرجُلُ علی العملِ): لەسەر کارەکە ڕاهات

(-هُ): لەگەڵیدا ڕێکەوت/ پێکهات.

(-بین شیئین): دوو شـتەکەی بە ئەندازەی یەککردن/ خستنیە سەریەك، جووتیکردن.

(-هُ علـی الأمـر): لـە کارەکـەدا لەگەڵیدا پێکهاتو کۆمەکیکرد/ ڕێککەوت.

(- بالحـق): ملی بۆ ڕاسـتییەکە بۆ مافەکە شۆڕکردو پێیلێنا.

(-بین قمیصین): دوو کراسەکەی بەیەکگرتن بە قەدەر یەکیگرتن.

(-الفَرَسُ في جَريِهِ): لە غارەکەدا ئەسـپەکە هەردوو پێی خستە شوێن هەردوو دەستی.

(أطبَقَ- الشيءَ): شتەکەی بە سەریەکیدادا.

(-الرَحی): دوو بەرداشەکەی نایە سەریەك.

(«أَطْبِقْ شَفَتَيْكَ»): لچو لێوت بنی سەریەك/ دەمت داخە/ بێدەنگبە/ وسبە.

(-الشيءَ): شتەکەی داپۆشی.

(-اللیلُ): شەو هاتو تاریك داهات.

(-النُجـومُ): ئەسـتێرەکان دەرکەوتنو زۆر بوون.

(-الراکِعُ): بە چۆکدا هاتووەکە دەستی خستە سەر ئەژنۆی.

(-تِ الحُمَّـی علیه): تا شـەوو ڕۆژ دایگرتو بەرینەدا.

(أَطْبَقـوا علـی الأَمـرِ): لەسـەر کارەکـە ڕێککەوتنو کۆبوونەوە.

(تَطَبَّقَ وانْطَبَقَ- الشـيءُ): شتەکە پێچراوە بوو، داخراو بوو.

(تَطابَـقَ- القَـومُ): خوێشـگەل ڕێککەوتن/ پێکهاتن/ گونجان/ یەکیانگرت.

(«مـا أَطْبَـقَ فُلاناً»): ئای کە فیسـار کەس شارەزاو کارامەیە.

(أَلطِبْـق): ١-جـۆرە کەتیرەیەکـە لـە داری هەڵدەسوونو باڵندەی پێدەگرن ٢-کاتژمێرێکی ڕۆژ ٣-یەکسانە/ وەك ئەوە بە گوێرەی ئەوە/ بەرامبەری ئەوە/ بە پێی ئەوە.

("هذا طِبـقُ ذاك"): ئەمە تەواو وەك ئەوە/ (بە پێی/ بە گوێرەی) ئەوە.

(أَلطِبق- مِن الناس): کۆمەڵە خەڵکێك.

(أَلطَبَق (ج) أَطبـاق): ١-چونیەك، کتوومت وەك یەك بە گوێرەی ئەو ٢-سەرقاپ ٣-ئەوەی کە چێشتی تێدەکەنو تیادا دەخورێت/ دەفر/ دەوری ٤-بڕبڕەی پشت ٥-کۆمەڵ/ بەرە/ گرۆ.

(«مَضی طَبَقٌ بَعدَ طَبَقٍ»): بەرە دوای بەرە ڕۆیشتن یان کۆمەڵ دوای کۆمەڵ ڕۆیشتن.

(«جاءَهُ طَبَقٌ مِن جَرادٍ»): قاپێك پێکوللەی گەورەی بۆ هات ٢-بار/ ڕەوش.

("أَلدَّهــرُ أَطباقٌ"): ڕۆژگار بارەهای جیایە ٦-(الطبق) ڕووی زەوی.

(أَلطَبَق- مِنَ المَطَر): بارانی کشتلاگیر.

(«مَطَرٌ طَبَــقٌ وديمَةٌ طَبَقَــةٌ»): بارانێکی گشــتلاگیرو بارانێکــی نەرمــی بێبروســکەو هەوری گشتلاگیر.

(أَلطَبَــق- مِنَ اللَّيل والنَّهار): بەشــی زۆری شەوو ڕۆژ.

(أَقَمْتُ عِندَهُ طَبَقاً مِنَ النَّهار): بەشــی هەرە زۆری ڕۆژەکە لای مامەوە/ لایبووم.

(أُمُّ طَبَق): ١-بەلاّ/ وەی/ چورتوم.

(بَنــاتُ طَبَق): مــار: چونکە خۆی بەســەر ئەوەدا گرمۆڵە دەکات کە پێوەیدەدات ٢-وەیو گرفتارییەکان ٣-کیسەڵەکان.

(أَطْباقُ الرأس): ئێسکەکانی کاسەی سەر.

(الطَبق): بەستوو/ لوول/ نەکراوە/ پێچراوە.

(أَلطَبَقَةُ): ١-چین.

(«أَلطَبَقَةُ الإجتِماعية»): چینی کۆمەلایەتی.

(«طَبَقَةُ العمال»): چینــی کرێکاران ٢-بار/ ڕەوش.

(-مِــنَ البِنايَــة): نهۆمی خانــوو کە چەند ژوورو ساڵۆنو ڕاڕەوو شوێنیتر دەبێت لە ژێر یــەك بنمیچدا دەبێتو جــاری وا هەیە نهۆم لەسەر نهۆم دەبێتو دەکرێت بە چەند خانوو هەریەکەو هەر نهۆمەی بە شێوەیەك دەبێت یان لە یەك دەچن.

(أَلطِبْقَة (ج) طِبْــق وطِبَق): ١-کاتژمێرێکی ڕۆژ ٢-تەڵە/ داو/ تۆڕ.

(أَلطِبــاق= المُطابق): وەکیــەك/ چونیەك/ هاویەك.

(«هذا طِبــاقَ ذاكَ»): ئەمــە وەك ئەوەیە/ چونیەکن/ ڕێکی یەکن.

(طِباقُ الأَرض): ئەوەی کە بەسەر زەوییەوەیە.

(ألطابِق (ج) طوابِق): نهــۆم/ چین. نهۆمی خانوو.

(«بِنايــة ذات طابِــق»): خانوویەکــی چین چینە/ نهۆم نهۆمە.

(أَلطبيق (ج) طُبْق): کاتژمێرێکی شەو.

ألطِبيــق= المُطابِــق: وەك ئــەو/ هاوقەبارە/ هاو.

(هذا طِبْقُ ذاكَ): ئەمە هێندەی ئەوەو چون ئەوە.

(أَلتَطبيق عِنْدَ المُحَدِّثين): لای تازەگەرییەکان ١-ڕاکێشــانو دڵنەواییکردنــی کەســانێك یان کەســێك کە بیانەوێت بچنە پاڵیانو دڵیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشــن ٢-پیادەکردنی بڕیار یان یاساو دەستوورێك.

(أَلمُطْبِق): ١-زیندان/ بەندیخانەی ژێر زەوی. ٢-(الجنــون المُطْبِــق): شــێتییەکی تەواوو پەتمری/ پەتیارە کە هۆشو گۆشی لێببڕێت.

(الحــروف المطبقة): ئەم پیتانەن (ص، ض، ط، ظ).

(المطبقات): لێقەومانی سەختی جەرگبڕ.
(سنة مطبقة): ڕەشەساڵ/ ساڵی قاتوقڕی.
(المطَبِّق): ڕادروستو بۆکار باشچوو/ ڕاستپێك.
(سحابةٌ مُطَبِّقة): هەورێك بارانەکەی هەموو لایەك بگرێتەوە.
(المتطابِقَة) (ع. ج): مجموعة كميتين تتساويان أيا كانت قيمة الاحرف فيها: هاوئەنجام: دووبڕ یەکسان دەبن پیتەکانیان هێمایان هەرچەندێك هەبێت:
(ب+ج)$^{٢}$= ب$^{٢}$+ ٢ج+ ج$^{٢}$
(س+١) (س+٢)= س$^{٢}$+ ٢ س + ٢
٢-(الطِبق): هەموو بەری درەختەکە
(الطابق): (ت) ئەو شتانەی کە بازرگانێکی نابووت دەیمێنێت.
(الطابِق والطّابَق (ج) طَوابِق وطَوابيق): ١-دەفرێکە چێشتی تێدا لێدەنرێت ٢-لایەکی لاکی مەڕێك.
(الطابَق والطاباق): ١-شووشە.
٢-(الطاباق) (فارسية): خشتی سووری گەورە.
(ألطُبّاق) (ن): ژەهرەکێچ/ شابانە. ڕووەکێکە/ گیایەکە دەشتەکی گوڵەکەی زەردە.
ألملحق:
طبق: (ألطَبَقِيَّة): چینایەتی، ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی کە لەسەر دابەشبوونی خەڵکەکە بەسەر چەند چینێکدایە.
(ألمُطابَقَة): لەیەکچوونو چونیەکبوون هاوشێوەبوون ڕێکەوتنو گونجان.
(مُطابَقَة الأذواق): وەك یەك چێژ لەشتوەرگرتن.
(ألمُطابَقَة بين شيئين): دوو شت وەك یەك لێبکرێت.
(ألمُطابَقَة في البديع المَعنِوي): لە جوانکاریی واتادا ئەوەیە لە ئاخاوتندا دوو دژ بەیەك بهێنێت بە مەرجێك بە تەنگ بەرامبەرییەوە بێت واتا ناوێك لەگەڵ فرمانێکدا نەهێنێت یان فرمانێك لەگەڵ ناوێکدا نەهێنێتو وەکو («يَضحَكَ ويَبكى»): دەگریو پێشدەکەنێت.
(«يَومٌ عَلَينا ويَومٌ لَنا»): ڕۆژێك بۆ ئێمەیەو ڕۆژێکیتر دژ بە ئێمەیە.

---

طبل: ١-(طَبَل. طَبلاً): تەپڵی لێدا/ تەپڵێژەند/ دەهۆڵیژەند.
(طَبَّلَ): لە تەپڵیدا/ (تەپڵی/ دەهۆڵی) لێدا.
(-في المَشي (عند العامة) والصحيح بَلَّطَ): لە ڕۆیشتندا شەکەتبوو.
(ألطَبْل (ج) طُبُول وأطبال) (مو): تەپڵ/ دەهۆڵ کە دیوێك یان دوو دیو دەبێت.
(ألطَبْلَة): تەپڵی بچووك/ دومبوك.
(ألطَبَّال): دەهۆڵژەن/ تەپڵلێدەرو خاوەنەکەی.
(ألطِبالَة): دەهۆڵژەنی/ تەپڵکوتیی.
ألطَبلِيَّة (ج) (طَبلِيّات) (عامية): مێزێکی گردە نانی لەسەر دەکەنەوە/ پنە، یان نانی لەسەر دەخۆن/ تەپلەك.

٢-(ألطَبلِيَّة) (ج) طَبْلِيات): پارەی باج.
طــبن: ١-(طَبَنَ- النَّـارَ طَبْنـاً): ئاگرەكەی خەفەكرد/ داپۆشی تا نەكوژێتەوە.
(طابَــنَ- الحَفــيرَةَ): ئاگردانەكــەی/ چاڵی ئاگرەكــەی بە پــێ شــێلاو دەوروبەریگرتو لێیدڵنیابوو.
(إطْبَــأنَّ- بالمَكانِ إطْبِئْناناً): لە شــوێنەكەدا دڵنیابوو.
(ألطابُون): چاڵێكە ئاگــری تێدا دەپارێزنو دەهێڵنەوە.
٢-(طَبَــنَ وطَبِنَ- الشَــيءَ ولِلشَــيءِ. طَبْناً وطَبانَةً وطَبانِيَةً و طُبونَةً): بە شتەكەیزانی/ مێشكی بۆیچوو.
(طَبِن وطابِن): پێزان/ دەركپێكەر.
(طابَنَ- هُ): لەگەڵیدا ڕێككەوت.
(ألطِبنَــة (ج) طِبَــن): وریایــیو پێزانــی/ دەركپێكردن.
٣-(ألطَبْــن (ج) طُبَــن): ١-لاكــە تۆپیــو بۆ ڕاوكردنــی داڵو درِندە دادەنرێت ٢-یارییەكە عەرەبە كۆچەرەكان دەیكەن.
(ألطُبْن والطَبَن): كۆیەكی (زۆر/ بێشومار).
(«أيّ الطَــبن هــو»): ئــەوە چۆكۆیەكــی بێشوماری خەڵكە.
(ألطُبْن) (مو): تەمبور یان عود.
(ألطُبْــن والطُبَن (ج) طُبَن): ١-لاكەتۆپیو بۆ ڕاوكردنــی داڵو درِندە دادەنرێت ٢-یارییەكی عەرەبە كۆچەرییەكانە.
(ألطِبْن): ١-خانوو ٢-پووشو پەڵاشو چیلكەو چەواڵو شتیتر كە با دەیهێنێت.
(- (ج) طِبَــن): ١-لاكەتۆپیو كــە دەنرێتەوە بــۆ ڕاوی داڵو درِنــدە ٢-یارییەكــی عەرەبی كۆچەرییە.
(ألطُبْنَــة (ج) طُبَــن): ١-دەنگــی تەمبــور یاریەیكە.
٤-(ألطَبَنْجــة (ج) طَبَنْجــات (تركيــة): دەمانچە.
(طبــا- هُ واطَّبى – هُ. طَبْــواً وأطَّباءُ): بە قسەی خۆش بانگیكرد.
طبى – (طَبى- هُ. طَبياً): بە قســەی خۆش بانگیكردو دایە پێش خۆی.
(-هُ إلَيه): بۆ ئەو بانگیكرد.
(-هُ عَنهُ): لێیدوورخستەوە.
(أطبى- هُ. إطْباءً): بانگیكرد.
(طَبــيَ. تَطبــى- تِ الناقَةُ. طَبىً): ســەری گوانی مێحشوترەكە نەرمو شلبوو.
(ألطِبْي والطُبْيُ (ع ا) واحدُ الأطباء): سەری گوانی زیندەوەری یەكسمو دوو سمو درِندەو پێنەرم وەك حوشتر.
(ألطَبْواء والطَبيَّة- مِنَ النوق): مێحوشترێك سەری گوانی نەرمبێت.
طث: (طَثَّ- الشيءَ. طَثّاً): شتەكەی بە شەق یان بە لەپیدەست لە شوێنی خۆی لادا.

أَلطُّـث (مص): ١-به شـەق يان لەپيدەسـت لێدانو دوورخسـتنەوەو لابردن ٢-يارييەكى مندالانەيە بە دارێكى خر لەو شـتە دەدەن دارەكەى پێيدەلێن (اَلمِطَثَّة).

طثر: (طَثَرَ وطَثَّـرَ- اللَّبنُ طَثْراً وطُثُوراً): شيرەكە مەيينيى تێكەوت.

(طاثر): نميچە مەيو.

(أَطْثَرَ- الشيءَ): شتەكەى زۆر كرد.

(أَلطَثْرَةُ):١-مەيينى شير يان خەستبوونەوەى ماسـت ٢-قـورە رەش ٣-قـەوزە ٤-ژيانـى تێروتەسەل/ دەولەمەنديى ٥-خوريى مەر.

طَجن: (طَجَـنَ وطَجَّنَ — الشـيءَ. طَجْناً): شتەكەى سووركردەوە.

(أَلطاجن والطَيجَن (ج) طَياجن وطَواجن) (يونانيـة): تاوە يان ئەوەى شـتى لەسـەر سووردەكرێتەوە.

(اَلمُطَجَّن) (ط): شتى لە تاوەدا سوورەوەكراو.

طحّ: ١-(طَحَّ- هُ طَحّاً): رايخست/ پانيكردەوە/ كرديەوە.

إنْطَحَّ: كرايەوە/ راخرا/ والأكرا.

(أَلطُحُح): توێكرەوە/ رەندە.

(أَلطحّان): زەويى تەخت.

٢-(أَطَحَّ- هُ):١-دايبەزەويدا/ خستيە خوارەوە ٢-هەلێدا/ تووريدا.

٣-(طَحْطَحَ- هُ): شكاندى.

(-القَـومَ وبِالقَـومِ): پەرەوازەيكـردنو فەوتاندنى.

(-مالَـهُ): مالەكەىو سـامانەكەى لەناوبرد/ تەخشانو پەخشانيكرد.

(-الرَجُلُ): بە قاقاو دەنگى بەرز پێكەنى.

(تَطحْطَـحَ):١-فەوتـاو لەناوچوو ٢-شـكا ٣-پەرشو بلاوبووەوە ٤-قاقايكرد.

طحر: ١-(طَحَـرَ- ت العَينُ قَذاها): چاوەكە ريپۆقى دەركرد.

(طَحورَة): چاوى ريپۆقگرتوو.

(-تِ الريـحُ السَّـحابَ): باكـە هەورەكـەى بلاوكردەوە.

(أَلطحْر والطَحَر): هەورى تەنكى بلاوبلاو.

(أَلطَحْرَةُ والطِحْرِيَةُ): پەلەهەورێك/ گەوالە هەورێك.

(أَلطَحُور): خێرا/ گورج.

(أَلطَحُـور والمِطْحَر- مِنَ القِسِـي): كەوانى دوورهاوێژ.

(أَلطُحْرُور (ج) طَحارير): هەور.

أَلطَحارير: پەلەپەلەى هەور/ پارچە گەوالەى هەور.

٢-(طَحَرَ. طَحْراً وطَحيراً وطُحاراً): بە ئازارو تەنگەنەفەسييەوە نالينەوە هەناسەى بۆ درا.

(أَلطُحـار): جـۆرە زەحيرييەكـە كە مرۆڤ تەنگەنەفەسـدەكات بە ئازارەوە هەناسەى بۆ دەدرێت.

٣-(طَحْرَب): رايكرد/ هەلات.

(-القِربَةَ): مەشكەكەی پڕكرد.

(ألطِحرِب): كــەڤ مەنجەڵ یان پووش‌و دارو پیسی كە دەریا دەیخاتە لاوە.

(ألطَحْربة والطُحْربَــة والطِحْربَة): پارچە هەورێك/ گەواڵە هەورێك یان پارچە جلێك.

طحل: ١-(طَحَلَ- هُ. طَحْلاً): دای بە سپڵیدا.

(طَحِــلَ طَحْــلاً وطَحَلاً): ســپڵەكەی گەورە بوو.

(طُحِل. طَحْلاً): هاواری سپڵیكرد.

مَطْحُول: سپڵ تووشبوو/ سپڵئاوساو.

(ألطِحــال (ج) أطْحِلَــة وطُحُــل وطِحالات) (ع ا): ســپڵ كە نیســفەنجییە دەكەوێتە لای چەپی بۆشــایی مــرۆڤ‌و زیندەوەریترەوە بە لاتەنیشتەوە نووساوە.

(ألطُحال) (طب): دەردە سپڵ.

(ألطِحل): سپڵگەورە.

٢-(طَحَــلَ- الإنــاءَ. طَحْــلاً): قاپەكەی پڕ لێوانلێو كرد.

(ألطِحِل): ١-پڕ ٢-تووڕە.

٣-(طَحِــلَ- المــاءُ. طَحْلاً وطَحِــلاً): ئاوەكە بۆگەنبوو.

(ألحِحل): ئاوی (قەوزاوی قەوزەگرتوو).

٤-(ألطُحْل) (عند العامة): وردەكاو شتی وها زمانە ڕاستییەكەی (ألحَثا)یە.

(ألطُحْلَة): ڕەنگێكی شێوە خۆڵەمێشی.

(ألأطْحَــل (م) طَحْلاء (ج) طُحْل): شــتێكی ڕەنگ شێوە خۆڵەمێشی.

٥-(طَحْلَــبَ- المــاءُ): ئاوەكــە قــەوزەی سەركەوت.

(مُطَحْلَب ومُطَحْلِب): ئاوی (قەوزەسەركەوتوو/ قەوزە گرتوو).

(طَحْلَبَ- تِ الأرضُ): زەویەكە بە گیا ســەوز بوو.

(ألطُحْلَب والطُحْلُب والطِحْلِب) (ن): ڕووەكێـكە لە لكی قــەوزەواتــە زۆر ســەوزە لاسك‌و گەڵای هەیە بەڵام ڕەگی نییە لە شوێنە تەڕو شێدارەكاندا دەبێت زۆر جار شوێنێكی زۆر دەگرێتەوە. جاری وا هەیە بە دارەوەو بە تاوێرەوە دەبێت.

(ألطِحلِبَة): تاڵێك.

("ماعلیه طِحلِبَة): تاڵێكی پێوەنییە.

٦-(طَحْلَبَ- الرَجُلَ): پیاوەكەی كوشت.

طحم: (طَحَمَ- عَلیه طَحْمَــةً): لێبڕاپەڕی‌و پەلاماریــدا (عامیة) لەوانەیە لــە (قَحَمَ)وە هاتبێت‌و وەرگێڕرابێت.

(ألطُحْمَة و الطَحمَة والطِحْمَة- مِنَ الناس): كۆمەڵی خەڵك.

(-مِنَ السَّیل): لێشاوێكی زۆرو هاتووی.

(-مِنَ اللَّیل): تاریكیی زۆری شەو.

(ألطَحَمَةُ):١-پیاوی شەڕانی ٢-گەلە حوشترێكی گەورەو زۆر.

(ألطَحُوم): زۆر بە گوڕو بە تەكان.

(اَلمطحوم): پڕ.
طحن: ١-(طَحَنَ وطَحَنَّ البُرَّ.طَحْناً): گەنمەکەی هاڕیو کردی بە ئارد.
(-المَنِيَّةُ القومَ): مەرگ خوێشکەلی (فەوتاند/ مراندنی).
(تَطَحَّنَ): ١-مرد/ فەوتا ٢-بوو بە ئارد.
(اَلطِحن والطَحين): ئارد.
(اَلطاحِنَةُ (ج) طَواحِن): ١-مێی وشەی (الطاحِن): ٢-ئاردکەر/ هاڕەر ٣-دانی خڕێ.
(اَلطَحّان): ١-ئاشەوان ٢-ئاردفرۆش.
(اَلطِحانَة): ١-ئاشەوانی ٢-ئاردفرۆشیی.
(اَلطاحُون والطاحُونَة (ج) طَواحين): ١ دەستاڕ ٢-ئاش.
(اَلطَحُون والطَّحّانَة): ١-جەنگ/ شەڕ ٢-دەستەیەکی گەورەی سوپا ٣-حوشترگەلێکی گەورە.
(اَلمِطْحَنَة (ج) مَطاحِن): ئاشی ئاو یان ئاشی با یان ئاشی هەڵم یان بە کارەبا ئیشی پێدەکرێت.
(اَلمَطْحَنَة (ج) مَطاحِن): شوێنی هاڕین.
٢-(طَحَنَتِ الأفعى. طَحْناً): مارەکە پێچیکردەوە.
(مِطحان): ماری پێچکەرەوە.
طحا: ١-(طَحا. طَحْواً): ١-دوورکەوتەوە ٢-فەوتا/ مرد.
(-الشيءَ): پاڵی بە شتەکەوە نا/ ڕایدا/ دووریخستەوە.
(-بالكُرَةِ): تۆپەکەی هەڵدا.
(-القَومُ): پاڵیان بەیەکەوەنا/ کەوتنە پاڵنانی یەکتری.
(-الرَجُلُ): ڕۆیشت/ سەری خۆی هەڵگرت.
(«طَحا بِهِ هَمُّهُ»): مەراقو خەفەت سەری پێهەڵگرتو لە هەموو شتێکیکرد.
٢-(طَحا. طَحْواً): ڕاکشا/ پاڵکەوت.
(-الشيءَ): شتەکەی ڕاخستو درێژیکرد.
(-الشيءُ): شتەکە تەختبوو درێژبووەوە.
(-بِفُلانٍ شَحْمُهُ): بەزو چەوریی لەشی پانو پۆریکرد/ قەڵەویکرد.
(اَلطحا): زەویی تەخت/ تەختایی.
(اَلطاحِي) (فا): ١-تەختو پانبوو ٢-ڕاکشاو ٣-کۆیەکی گەورە/ کۆمەڵێکی مەزن.
(مَظَلَّةٌ طاحِيَةٌ ومَطحُوَّةٌ ومَطحِيَّةٌ): چەترێکی زۆر زل زۆر گەورە.
(بَقلَةٌ مُطَحِّيَة): سەوزەیەکی پانەوەبوو/ خۆی بەسەر زەویدا بڵاوکردۆتەوە.
٢-(طَحا- القَمَرُ. طَحْواً): مانگ هەڵهاتو ڕووناکیدا.
(اَلطاحي) (فا): بەرز/ هەڵهاتوو.
طحى: (طحى- الشيءَ. طَحْياً): شتەکەی ڕاخست/ تەختکرد.
(-الرَجُلُ): ڕاکشا.
(اَلطَحْيَةُ): پارچە هەورێك/ گەواڵە

هەورێك.

طـخ: ١-(طَـخَ. طَخّاً): درو سەرسـەریبوو/ هەڵکردن لە گەلیدا گرانبوو.

- الشيءَ: شتەکەی دوور هەڵدا.

(المِطَخَّـة): تەختەیەکـە منـدالآن یـاری پێدەکەن.

٢-(طَخْطَخَ- الشـيءَ): شـتەکەی رێکخست و دایە دەمیەك.

(- اللَّيلَ): شەوی تاریککرد.

(تَطَخطَخَ- السَّحابُ): هەورەکە بەیەکداچوو/ نیشتەسەر یەك و تەختبوو/ رێکبوو.

(الطُخاطِخ): تاریکیی.

٢-(الطَخْطـاخ): بەدخـوو/ سەرسـەری/ بەدرەوشت.

طخش: (طَخِشَ-تِ العَينُ طَخْشـاً وطَخَشاً): چاوەکە تاریکداهات/ تاریکبوو.

طخم: (طَخَـمَ وطَخُمَ. طَخْمـاً وطَخامَةً): لووتبەرزیی نواند/ فیزیکرد.

(اِطْخَمَّ-اللَّحـمُ): گۆشـتەکە وشـکهەڵات و رەشبوو/ رەشداگەرا.

(الطَخْمَةُ): رەوە بزن.

(الطُخْمَةُ): رەشی سەری لووت.

(الأَطْخَم): سـەری لـوٚزی چوارپێ یان دەمی مرۆڤ.

(الأَطْخَم والطَخيم): گۆشتی وشکەوەبوو.

طخـا: ١-(طَخـا- اللَّيـلُ. طَخـواً وطُخُوّاً): شەوتاریکبوو.

(الطَخاء): ١-هەوری بڵند/ بەرز ٢-دڵتەنگیی/ خەفەتی دڵ.

(الطُخْيَـةُ والطَخْيَة والطِخيَـة): ١-تاریکیی ٢-گەواڵە هەورێك.

(الطَخْواء والطَخْياء- مِنَ اللَّيالي): شـەوانی تاریك.

(الطاخِيَة): زۆر تاریك/ شەومزمنگ.

٢-(الطَخيَة (ج) طَخيون): گەوج.

طرّ: ١-(طَرَّ- الماشِيَةَ. طَرّاً): ئاژەڵەکەی توند (لێخوری/ رادا).

(-الإبل): حوشـترەکانی کۆکردەوەو دانیەوە دەمیەك.

(-فُلاناً): ١-فیساری دەرکرد ٢-بەرزڵلەیدا.

(أَطَرَّ- هُ): دەریکرد/ پەریکرد.

(-هُ على الأَمْر): فریوی کارەکەیدا.

٢-(طَرَّ- القَـومَ. طَرّاً): بەلای خوێشـگەلدا رابوارد.

(طُرّاً): گشتیان/ هەموویان.

(جاؤوا طُرّاً): گشتیان/ سـەراپا/ هەموویان هاتن.

٣-(طَرَّ- السِكّينَ. طَرّاً): چەقۆکەی تیژکرد.

(-البُنيانَ): خانەکەی تازە کردەوە/ دەسـتی بە خانووەکەدا هێنا.

(-الحَوضَ): گۆلەکەی سواغدا.

(سِنانٌ طَريرٌ): نووکی نێزەی تیژکراو.

٤-(طَـرَّ- الشـيءَ. طَـرّاً): شـتەكەى بڕى/ لەتكرد.

(-الثوبَ): جلەكـەى هەڵدڕى/ هەڵهێنايەوە/ هەڵقڵيشاند.

(-تِ الإبلُ الجبالَ): حوشـترەكان كێوەكەيان بڕى.

(-المـالَ): ماڵەكـەى سـامانەكەى تالانكرد/ بەتالانبرد.

("طَرَّ عَقلَهُ"): هۆشى لێسەند/ هۆشى/ ئەقڵى لەبەربڕى.

(طَرَّرَ-تِ الجاريَةُ):كەنيزەكەكە پەرچەميكردو بەريدايەوە.

(أَطَرَّ- هُ): بڕى/ لەتيكرد.

(ألطُرّ (ج) أَطْرار): كەنار/ قەراغ/ لێوار.

("هُوَ يَحمي أَطرارَ البِلادِ): ئەو كەنارى وڵات دەپارێزێت.

(ألطُرَّة (ج) طُرَّات و طُرَر وطِرار وأَطرار): ١-پەرچەمـى سـەرناوچەوان ٢-ناوچـەوان/: تەوێـڵ ٣-پێشـى سـەر ٤-(قـەراغ/ لێوارى/ پەراوێزى/ داميَنى) هەموو شتێك ٥-پەراوێزى پەرتووك/ كتێب ٦-(لێوارى/ ڕۆخى) ڕووبارو دۆڵ ٧-پارچـە هەورێكى درێژەوەبوو كە وەك ڕێگا بنوێنێت ٨-نيشانەو نمرەى بەرگ/ جل.

(ألطـرَّاز): گيرفانبڕ كـە گيرفـانو جـل هەڵدەهێنێتەوەو شت دەبات.

٥-(طـرَّ-تِ يَدهُ. طَرّاً وطُروراً): دەسـتەكە بڕرا/ قرتاو كەوت.

(-الرَجُـلُ مِنَ السَّطح): لە سـەربانەكەوە كەوتە خوارێ.

(أَطَرَّ- هُ): خستيە خوارەوە.

٦-(طَرَّ- الشـارِبُ أَو النَّباتُ): سـمێڵەكە يان ڕووەكەكە سەرى دەرهێنا/ دەرهات.

(-تِ النُجومُ): ئەستێرەكان (شەوقياندايەوە/ كەوتنە ورشەورش).

(ألطَرَّةُ): ١-جارێك سەر دەرهێنا/ دەرهاتن ٢-جارێك شەوقدانەوە.

(غُلامُ طـارٌ أو طَريـرٌ): مێردمنداڵێك/ كە سـمێڵى خەتيدابێت/ گەنمەمووى لێهاتبێت/ سمێڵى دەركردبێت.

(طَرَّ شارِبُهُ): سمێڵى دەرهات.

٧-(ألطَرَّةُ): كەمەر/ ناوقەد.

(ألطُـرَّة والصَـواب الطُغراء): نيشـانەيەكە لەسـەر بلاوكراوەو پارەكانى شـا دەدرێت كە تيايدا ناوو نازناوو شتيترى شاى تێدا دەبێتو بە شێوەيەكى تايبەتى دەبێت.

(ألطريـان): دەورييەكە كـە خواردنى تێدا دەخورێت.

(غَضَـبٌ مُطِرّ): تووڕەبوونێـك كە لە جێى خۆيدا نەبێت.

(ألمَطَرَّة): نەريت/ خوو.

(لَهُم مُطَرَّة حَسَـنَة): خويەكى/ نەريتێكى باشيان هەيە.

طرأ: ١-(طَرَأَ- عَلَيْهِم طَرْءاً وطُرُوءاً): له پڕ له ناكاودا له دوورەوه هاتنه لاى يان دايان به سەریاندا.

(«طَرَأَ عَلَيَّ هَمٌّ لا أُطِيقُهُ»): لەناكاو مەراقێك داى بەسەرمدا كه بەرگەى ناگرم.

(اَلطارئ (فا) (ج) طُرَّاء وطُراء): ١-ناكاويىو بەرێكەوت ٢-نامۆ/ بێگانه/ نەناس/ ناجسن/ نارەسەن ٤-تازه دەركەوتوو.

(اَلطارئَـــةُ (ج) طَـــوارئ وطارئـــات): ١-مێى وشەى (اَلطارئ) ٢-وەى/ چورتووم/ ڕووداوى گـــران/ بەســـەرهات ٣-تاقمـــه خەڵكێـــك كه كۆچيان بۆ وڵاتێك كردبێتو خەڵكى ڕەسەنى وڵاتەكه نەبن/ بێگانەبن.

(اَلطُرْآن): كارى ناشيرينو نابەجێ.

(حَمـــامٌ طُرآنـــيّ): كۆترێكى پـــەرەوازە كه پەڕيبێتـــه ئـــەو شـــوێنەو لـــه شـــوێنێترەوه هاتبێت.

("كَلامٌ طُرآني"): قســـەى (پيس/ ناشيرين)/ بێشەرمانه.

٢-(طَرُؤَ- النَباتُ ونَحْـــوُهُ. طَراءَةً وطَراءً): ڕووەكەكەو شتى لەو بابەته تەڕو ناسكو تازه بوو.

(طَرِيْء): نەرمو تازەو ناسك.

٣-(أَطْرَأَ- هُ): زۆر پيايدا هەڵدا/ هەڵينا.

٤-(اَلطُرْآن): ڕێ/ ڕێگا.

(طُرْأَةَ السَـــيل): تەوژمى لێشـــاوەكەو زۆرى ئاوەكەى.

طرب: ١-(طَرِبَ. طَرَباً): له خۆشياندا يان له داخو خەفەتدا كەوته هەڵەكەسەماو گۆرانى/ كەوته جرتو فرتو هاوار هاوار.

(طَرِب): هەڵبەزو دابـــەز كردوو گۆرانى يان هاوار كرد.

(طَرَّبَ): گۆرانيى (چڕى/ وت).

(-هُ): جووڵانـــدى/ خســـتيه هەڵەكەســـەماو گۆرانيوتن.

(-فِي صَوتِهِ): سۆزى به دەنگيداو چريكاندىو هێـــزى دايـــەو گۆرانييەكـــەى (وتـــەوه/ چەندبارەيكردەوه).

(أَطْـــرَبَ وتَطَـــرَّبَ- هُ): خســـتيه گۆرانـــىو هەڵپەڕين.

(اِسْتَطْرَبَ): خۆشيىگۆرانيىو هەڵپەڕينەكەى گەرمبوو/ ئارەزووى گۆرانى هەستا.

(-فُلاناً): داواى گۆرانىو هەڵپەڕينى لێكرد.

(-الإبلَ): بـــه گۆرانى حوشـــترەكانى هێنايه جووڵەو لێيخورين.

(اَلطَرُب والمِطْراب والمِطْرابَة): گۆرانيبێژێكى به بەزمو كەيفى هەميشەيى.

(اَلمُطـــرب): گۆرانيبێژ كه بـــه دەنگو ئاوازو گۆرانييەكەى خەڵك كەيفخۆش بكات.

٢-(طَرَّبَ- عن الطريق): له ڕێگەكه لايدا.

(اَلمَطْرَب والمَطْرَبَـــة (ج) مَطارِب): (باريكه/ تەسكه) ڕێگه.

(اَلمَطارِب): ڕێگەی جیاجیاو لەیەکەوە بوو.
٣-(اَلطِربـال (ج) طَرابيـل): ١-باڵەخانـە/ تـەلار ٢-ئالآیەك كە لە دوورەوە دەركەوێت ٣-تاوێرێكی گەپی دەرچووی لووتكەی شاخ.
(طَرابيلُ الشام): لووتكە بەرزەكانی شام.
(الطِربيل (ج) طَرابيل): ١-گاسن ٢-جەنجەر.
٤-(اَلطَرْبون) (سـريانية): چـووزی تازەی ناسك و نەرمی درەخت.
الملحق:
طربش: (اَلطَّرْبُوش (ج) طَرابيش): فێستی سـەركەخرە فیسـتی پیاو سـوورەو چەپكە ریشوویەك بەلایەكیدا دێتەخوارێ.

---

(طَرَحَ- الشـيَءَ وبالشيءِ): شتەكەی (هەڵدا/ فرێدا/ تووریدا/ هاویشت).
(-ەُ عَنهُ): لێدوورخستەوەو فرێیدا.
("طَرَحَـتِ النَّـوى بفُـلان كُلَّ مَطـرَحٍ"): نیـاز فیسـاری بـە هەمـوو لایەكـدا بردو دووریخستەوە.
(طَرَحَ- الثَوبَ عَلَيـهِ): جلەكەی (كردەبەر/ بەسەردا كرد).
(-تِ الأُنثـى): مێكـە بەراویتە بـوو. ژنەكە منداڵەكەی لەبارچوو.
(-الحاسِـبُ): ژمارەیەكی لـە ژمارەیەكی لە خۆی گەورەتر دەركرد.
(طَرَّحَ): ١-توندهەڵیدا زۆر دووریخستەوە.
(طَرَّحَ- الشَيءَ): شتەكەی تەواو دوورخستەوە.
(-بِهِ السَـفَرَ إِلى ناحِيَة كذا): گوزار/ سەفەر بۆ فیسار كەنار هەڵیداو دووریخستەوە.
(-الأُنثـى): بەری بـە مێكە یان بـە ژنەكە فرێدا/ منداڵەكەی بە ژنەكە لەباربرد.
(إطَّرَحَ- ەُ): ١-فرێیدا/ هەڵیدا ٢-دووریخستەوە.
(اَلطِرْح= المَطْرُوح): ١-فرێدراو ٢-دوورخراوە ٣-كورپەلەیەك كە دایكی (فرێیبدات/ لەباری بچێت) پێش تەواو پێگەیشتنی.
(اَلطَرَح (مص) والطَراح والطَرُوح): شوێنی دوور.
(اَلطَرحَةُ): ١-جارێك دوورخستنەوە/ جارێك لەبارچـوون ٢-تەیلەسـان ٣-سـەرپۆش كـە لاكێشەیە (ئەمە لای ڕەشە خەڵكەكەیە).
(اَلطَريح (ج) طَرْحى= اَلمَطروح): ١-پاڵكەوتوو/ ڕاكشـاو ٢-ڕاخراو ٣-هاوێژراو ٤-لەبەر بێكەڵكی فرێدراو.
(اَلمَطْرَح (ج) مَطارِح): ١-شـوێنی تێفرێدان/ گلێنجانە ٢-نوێن/ شوێنی ڕاكشان.
(«ماطَرَحَكَ هذا المَطْرَح»): چی خسـتیتیە ئەمەوە كە تێیكەوتوویت و تێیدایت.
(طَرْفٌ مِطْرَحٌ): چاوێكی تیژی دووربین.
(اَلمُطَّرَح) (مفع): فرێدراو/ بێكەڵك.
("قَولٌ مُطَـرَّح"): ئاخاوتنێكـی بێكەڵك كە كەس ئاوڕی لێناداتەوە/ ئافەرۆزكراوە.
٢-(طَـرَحَ- عليه مَسْـأَلَةً طرحاً): ١-پرسـە بابەتێكی خستە بەردەم ٢-ڕاوێژی پێكرد.

(طـارَحَ- هُ. الـكَلامَ أو الشِـعرَ أو الغِنـاءَ- مُطارَحَـةً): وتوێژیانكـرد یـان شـعره شیعریانكرد/ سەرنجیان دەربارەی هەڵبەستو وێژەو گۆرانیو مۆسیقا بۆیەكتر دەربڕی.

(تطـارَحَ- القومُ الكَلامَ أو الغِنـاءَ): هەریەكە بۆچوونـی خـۆی دەربڕیو قسـەیان لەسـەر مۆسیقاو گۆرانیو شتیتر كردو رایان گۆڕییەوە.

(ألأُطروحَة): ١-پرسەبابەتكە بخرێتە بەرچاو ٢-نامەیەكی دانراو دەربارەی بابەتێكی زانستی یان وێژەیی یان هەر بابەتێكیتر بۆ سەلماندنی باسێكو وەرگرتنی پلەیەكی بەرزی بڕوانامە وەك ماجسـتێرو دوكتۆرا پـاش لێكۆڵینەوەو هەڵگێڕو داگێڕكردنی نامەكە.

٣-(طَرِحَ. طَرَحاً): خۆشـگوزەرانو دارایەكی زۆر بوو/ كەوتە نازێكی تەواوەوە.

٤-(طَرِحَ. طَرَحاً): بەدڕەوشتبوو.

٥-(طَـرَّحَ البناءَ): خانەكـەی/ بیناكەی زۆر بڵند هەستاند.

(ألطَرُوح (ج) طُرُوح): دارخورماكە كە پەلو بنـی هێشـووە خورماكانی بە وشـكییو بە درێژیی بەدار خورماكانەوە پاش لێكردنەوەی خورماكە دەمێنێتەوە.

(رمْحٌ مِطْرَحٌ): نێزەیەكی/ رمێكی درێژ.

الملحق:

طـرح: (ألطَّـرْح): ١-فرێـدانو نەویسـتن/ ئەفەرۆزكردن.

("طَرْحُ النَّـواة"): فرێدانی ناوكە خورما یان هەر ناوكێكیتر فرێبدرێت ٢-خستنە بەرچاوو بە گوێدادان.

("طَرحُ السـؤال"): پرسیار لێكردنو خستنە بەرچاو ٣-پێشكەشـكردنی نامەیەك بابەتێك بۆ لێكۆڵینەوەو سەرنج لێدەربڕینی.

(ألعَرض= الطَّرْح): خستنە بەردەمو سەرنج.

(طَرحُ المَسْأَلَة): بابەت خستنەڕوو.

(ألطَّــرح) (ع ح): ژمارەیەكـی بچـووك لە ژمارەیەكی گەورە دەربكەیت.

(طَــرحُ الجَنــین): كورپەلـە لەباربردن یان فرێــدان پێــش ئــەوەی كۆكبێــتو تــەواو پێكەیشتبێت لە سكی دایكیدا.

طـرخ: ١-(ألطَرخـان والطَرخـان (ج) طَراخِنَة) (خُراسانیة): سەرۆك.

(ألطِرِّیــخ) (ح): وردە ماسـییەكە سـوێر دەكرێتو هەڵدەگیرێت.

(ألطَرْخُـون) (ن): تەرخوون سـەوزەیەكیە تەمەندرێژە لە سـیبریا یان توتاریاوە هاتووە لــە ئەوروپادا لــە سـەدەكانی ناوەڕاسـتەوە دەچێنرێت گەڵاكەی وەك بەهارات بەكاردێت.

٢-(إطْرَخَمَّ- اللَّیلُ): شەو تاریكبوو.

(-الرَّجُلُ): چاوی ماندوو بووو كز بوو.

طـرد: ١-(طَـرَدَ- هُ. طَرْداً وطَـرَداً): دەریكرد/ دووریخسـتەوە/ دەریپەڕاند/ راوینا ٢-لایخسـتو لایبردو پێی وت: لامەوە لاچۆ/ لێمدووركەوەرەوە.

(-هُ مِنَ البِلادِ): لە وڵاتەکەی دەربەدەریکردو دەرپەڕاند/ دووریخستەوە.

(طَرِدَ. طَرَداً): خەریکــی ڕاوکردنبوو کردی بە پیشەی خۆی.

(طَرَّدَ- هُ عَنِ البَلَدِ): لە وڵاتەکەی دوورخستەوە/ دەریکرد/ شاربەدەریکرد/ وڵاتبەدەریکرد.

(طارَدَ- الأَقرانُ. طِراداً ومُطارَدَةً): هاوڕێیان یەکتریان ڕاونا.

(«هُم فُرسانُ الطِراد»): سوارەیەکن یەکتری هەڵدەفڕێنن و ڕاودەنێن.

(أَطْــــرَدَ- هُ): ١-فــەرمـانـی دەرکــردنـیـدا ٢-دەربەدەریکرد/ پەرەوازەیکرد.

(تَطــارَدَ- القَومُ): یەکتریان ڕاوناو نیشــتنە سەریەك/ یەکتریان هەڵبڕی.

(إطَّرَدَ): دوورکەوتەوە.

(إنْطَرَدَ): دەرپەڕێنرا/ دەربەدەر بوو.

(إسْــتَطْرَدَ- لَــهُ): بە درۆو فێــڵ/ بە پیلان لەبەردەمیدا هەڵات و لێیدوورکەوتەوە.

(ألطِراد) (مص): کورتە نێزە/ کورتەرم.

(ألطَــرّاد): ١-دەرکەرێکی توند/ ڕاونەرێك کە زۆر ڕاوبنێــت ٢-پاپۆڕێکی جەنگیی خێرا کە ڕاوی پاپۆڕی دوژمن بکات و دووریبخاتەوە.

(ألطَريــد= ألمَطــرود): ١-دەرپەڕێنــراو/ دەرکــراو/ دوورخــراوە/ دەربــەدەر کــراو/ ڕاونراو/ پەرەوازەکراو ٢-هەڵاتوو.

(ألطَريــدَة (ج) طَرائِــد): ١-نێچیری ڕاونراو هەڵــبڕراو ٢-حوشــتری دزراو ٣-پەڕۆیەك کە تەڕدەکرێت و تەنووری پێدەسڕرێت.

(ألمِطْرَد (ج) مَطارِد): کورتە (نێزە/ ڕم).

(ألمَطْــرَدَة): هــۆو مایــەی (دەرکــردن/ دوورخستنەوە/ ڕاونان).

٢-(طَــرَدَ- الإبِلَ. طَرْداً و طَرَداً): حوشــترە بڵاوەکانــی ڕاونــاو گردیکردنــەوەو دانیــە پێشخۆی/ لێیخوڕین.

(طَرَّدَ- السَــوطَ): قامچیەکەی درێژکردەوە/ درێژکرد.

(إطَّرَدَ-تِ الأَنهارُ): ڕووبارەکان کشان.

(-الأَمرُ): کارەکە شــوێنی خۆی گرت و ڕاست ڕۆیشت و ڕوویکردە ئەنجامی باش.

(- القَومُ إلى المَســير): یەك لە دوای یەك ملی ڕێیانگرت و ڕۆیشتن.

(إسْتَطْرَدَ): لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و قسەی بە دوای قسەدا هێناو پێی تەواوکرد.

(-إلَيهِ الأَمرُ): کارەکەی پێگەیشت.

(ألطَرد): ئاوی پێداڕۆیشــتوو کە زەلام و ولاخ پیایدا بڕوات.

(ألطِراد): قنج/ ڕێك/ ڕاست.

(فُلان يَمشــي مَشــياً طِراداً): ڕێك/ ڕاست/ قنج دەڕوات.

(ألطَرّاد): ١-شوێنی بەرفراوان ٢-ڕۆژی درێژ.

(ألطَريــد): پاشــەبەرەو پێشــەبەرەی لەدایکبوو.

(-مِنَ الأَيّام): ڕۆژانی درێژ.

(اَلطَريدان): شەووڕۆژ.

(حُكْمٌ مُطَّرِدٌ): (فەرمانێکی گشتیی، بڕیارێکی گشتیی، دەسەڵاتێکی گشتیی) کە هەموو لایەك وەك یەك بگرێتەوەو شازی تێدا نەبێت.

(«القاعِـدَةَ المُطَّـرِدَة»): دەسـتوورێکی یان بنچینەیەکی گشتیی بێشاز/ بێدەرچیی.

(يَومٌ مُطَّرِد): ڕۆژێکی درێژ.

٣- (اَلطَرد (ج) طُرُود): بێچووولەی درەختی خورما.

(اَلطَـرَدان) (ز): زریزانە کـە لەگەڵ گەنمدا دەبێت.

(اَلطَريـدَة (ج) طَرائِـد): ڕاسـتە/ تەختە ناوریشمێکی درێژو لەو بابەتە.

(اَلمَطْـرَدَةْ والمِطْـرَدَةُ): ناوەڕاسـتی (ڕێگـا/ شەقام).

الملحق:

طرد: (اَلطَّرد): ١-دەرکردن/ دەسـتپێوەنان/ پەرکردن/ لە شوێن لابردن) وەك سزایەك.

(«طَرْدُ الخادِم»): نۆکەر دەرکردن.

(«طَـرْدُ تلميـذ»): دەرکردنـی قوتابیـەك ٢-لێکۆڵینەوەی بابەتە پرسـیار "ڕاستەوانەو پێچەوانـەن" لـە هەمـوو ڕوویەکـەوە لـە پرسیارەکە بکۆڵێتەوە.

اَلطرد (ج) طُرُود): کەلوپەلو شتی نێرراوەو پێچراوە بە پۆستەو شوێنیتردا.

طرز: ١-(طَرِزَ. طَرَزاً): ڕەوشتی ڕاستبووەوە کە لە پێشدا بەدخوو بوو.

(-فِي المَلْبَس): شیکپۆشـبوو/ بەرگی کەشخەو ڕێکی لەبەرکرد.

(طَـرَّزَ- الثَوبَ): پۆشـاکەکەی بە تێلقرمەو سـیم تێهەڵکێشـکردو بە وێنە نەخشاندیو چنی.

(تَطَّرَزَ- الثَّوبُ): پۆشاکەکە نیگارکێشبوو بە سیمو شتیتر ڕازێنرایەوە.

(-فِي لبسِـهِ): هـەر بەرگی جـوانو نایابو کەشخەی لەبەرکرد/ شیکپۆشبوو.

(اَلطَـرْز): ١-ڕوخسـارو قەڵافـەت ٢-دیمەن/ ڕواڵەت.

(«ماأحْسَـنَ طَـرْزَهُ»): قەڵافـەتو دیمەنی چەنـدە جوانـە ٢-ڕێ/ ڕێگـە/ چونیەتی ٤-ڕێکخستنو ڕێکهۆنینەوە/ ڕێکدامەزراندن.

(اَلطِـراز (ج) طُـرُز): ١-شـێواز/ شـێوە ٢ وێنـەو نیگـاری سـەرجل ٣-ئـەو شـوێنەی کە پۆشـاکی گرانو باشـی تێـدا دەچنرێتو دروستدەکرێت.

(«هـذا علـى طـرازِ ذاك»): ئەمە لەسـەر شێوەی ئەوەیە.

(«ليس هذا على طراظرازك»): ئەمە لە هی تۆ ناچێتو لەسەر ڕەوشیو بیرکردنەوەی تۆ نییە.

(اَلطَـرّاز والمُطَـرِّز): گوڵچـنو نیگارچـنو

نەخشچنی سەرپۆشاكو بەرگ.
(ألطِّرازَة): پیشـــەی نەخـــشو نیگارو گوڵو وێنە چنینی سەربەرگ/ پۆشاك.
٢-(طَـــرزَ- هُ. طَرْزاً): بە مشـــتەكۆڵە لێیداو دەریكرد.
طرس: ١-(طَرَسَ- الشيءَ طَرْساً): شتەكەی نەهێشت/ سڕییەوە.
(طَـــرَّسَ- الكِتـــابَ): تەواو نووســـینەكەی سڕییەوە.
(-هُ): گەنیكرد/ تێیكدا/ خراپیكرد.
٢-(طَرَسَ- الكتابَ طَرْساً): نووسییەوە.
(طَرَّسَ- الكِتابَ): نووسییەوە.
(-البابَ): دەرگاكەی ڕەشكرد.
(-الكاتِبُ): نووسەرەكە نووسینەكەی لەسەر شوێنە سڕراوەكە نووسییەوە.
(ألطِـــرس (ج) أطْراس وطُـــرُوس): ١-پەڕە كاغــەز. پـــەڕە كاغەزێـــك كە ســـڕرابێتەوەو لەسەری نوسرابێتەوە.
٢-(تَطَرَّسَ- في المآكل): كەوتە ســـەرنجدانو هەڵبژاردنی خواردنەكانـــی/ كامەی بەدڵبوو باشبوو ئەوەی خوارد.
(عَنِ الشيءِ): بێزی لە شتەكە بووەوە/ خۆی لێدوورخستەوە/ توخنی شتەكە نەكەوت.
طرش: ١-(طَرِشَ. طَرَشاً): گوێی پەكیكەوت/ كەربوو.
(أطْرَش (م) طَرْشاء (ج) طُرْش): كەڕ.

(تَطارَشَ): خۆی بە كەڕ (نواند/ دەرخســـت/ پیشاندا)/ خۆی بە ئارەزوو كەڕ كرد.
(ألطُرْشَةُ= الطَرش): كەڕیی.
(ألأطْرَش والأُطْروش): كەڕی تەواو.
٢-(طَرَشَ- هُ بالماءِ طَرْشـــاً) (عامية): ئاوی پێداكردو پیسیكرد.
(-البَيتَ) (عامية): خانووەكەی بە گەچ، بە گڵە سپی تەڕاو كرد.
(ألطَـــرْش (عاميـــة): ئەوەی خانـــووی پێی سپیدەكرێتەوە وەك گەچو گڵە سپی.
٣-(ألطَرْش) (ج): مانگاو گاجووتو گامێش/ ڕەشەوڵاخ.
٤-(طَرْشَمَ- اللَّيلُ): شەو (تاریكبوو/ تاریكداهات).
طرط: ١-(طَرِطَ. طَرَطاً): ١-گەوجبوو.
(طَـــرِط): گـــەوج ٢-طَـــيِرك: تووكـــی برۆی تەنكبوو.
(طـــارِط الحاجِبَـــين وطرطُهُمـــا وأطْرَتُها وأطْرَط (م) طرطاء): برۆ تەنك.
(إمْرَأةٌ طَرطـــاءُ العَينَـــين): ژنێكی برژانگ تەنك/ برژانگ سووتەمەرۆ.
٢-(طَرْطَـــرَ): بێنابڕوویيكردو كەوتە فشو هوور.
(ألطُرطور):١-پیاوی باریكەلەی قووچ٢-قوچەكی درێژی تەسكو باریك خەڵكی لوبنانو سوریەو فەلەســـتین بۆ ڕزاندنەوەی ژنان كڵاوقووچیان دەكردنە سەر لەوانە بوو پێیدەوترا (طَنطون)

یان (طاسة)

(اَلطَرطُور)(ط): جۆرەخواردنخۆشکەرمیەکە/ بەهاراتێکە کە لە ئاردو یان سـنەوبەرو سیرو ترش دەکرا.

٣-طَرْطَـقَ. طَرْطَقَةً (سـريانة) (عامية): تەقەتەقیکرد.

طرف: ١-(طَرَفَ- عَيْنَهُ طَرفاً): شـتێکی بە چاویدا کێشاو ئاوی لێدەرپەڕاند.

(طُرِفَـت عَينُهُ): چاوی ئـاوی لێدەرپەڕی/ چاوی ئاویکرد.

(عَـينٌ مَطْرُوفَة): چاوی ئـاو (لێدەرپەڕیو/ لێهاتوو).

(اَلطُرْفَة): چاو شت بەرکەوتوو ئاو لێهاتن.

(طَرَفَ- بَصَرَهُ أو طَرَفَ بعَينِهِ): پێڵوویەکی خستە سەر ئەویترو چاوی نووقاند.

(-ت عَينُهُ): چاوی گەڕا ببینێت.

(-فُـلانٌ): فیاسـر ١-بینـی/ تەماشـایکرد ٢-سەرنجیدا.

(ما بَقيَـت مِنهُ عَينٌ تَطْرِف): کەسـێکیان لێنەمان چاو بگێڕێت/ ببینێت واتا مردن یان هەموو کوژران.

(طَرَّفَ- هُ): تیلەیەکی تێکرد.

(أَطْـرَفَ): پێڵووەکانی سـەریەك نا/ چاوی نووقان.

(اَلطَرْف (مص) (ج) أَطراف): چاو.

("نَظَرَ بِطَرْفٍ خِفِيّ"): لە ژێرەوە تیلەیەکی کرد.

(اَلطِرف- مِنَ الناس): کەسـێکی چاوبرسیو چاوچنۆك/ هەرچی ببینیت بە ئاواتەوەیە بۆ خۆی بێت.

(اَلطَرْفَة): ١-تیلەیـەك/ نیگایەك ٢-(پنتێکی خوێن کە لە چاودا پەیدادەبێت).

(اَلطارِفَـةُ (ج) طَـوارِف): مێـی وشـەی (اَلطارِف): چاوفڕین.

(جـاءَ بِطارِفَـةِ عَـين): سـامانێکی زۆری چاوفڕێنی هێنا.

(اَلطَّوارِف): چاوەکان.

(لاتـراهُ الطَّـوارِف): چـاوەکان نایبینـن/ بەرچاوناکەون.

(طَوارِفُ الخَباء): لای دەوار کە هەڵدەدرێتەوەو لێی دەڕوانن.

٢-(طَرَفَ- هُ): زللەی لێدا.

(- هُ عَنهُ): دەسـتی نایە بـەریو گێڕایەوە/ لێیدوورخستەوە.

(طَرَّفَ- الخَيلَ): ئەسـپە پێشـەنگەکانی بۆ دواوە گێڕایەوە.

(تَطَرَّفَ- عَلَيهِم): هەڵیکوتایە سەریان.

٣-(طَرُفَ. طَرافَـةً): ١-ناوێزە بوو/ نایابببوو ٢-زۆر خۆشبوو.

(طَرَّفَ- الشيءَ): شتەکەی هەڵبژارد.

(أَطْـرَفَ): باسـی خۆش و عەنتیکـەو تازەی (هێنایە پێشەوە/ کرد).

(-هُ الشيءَ): شتی خەڵاتکرد.

(تَطَرَّفَ- الشيءَ): شتەکەی هەڵبژارد.

(إطَّرَفَ- الشيءَ): شتی تازەی کری.

(إستَطْرَفَ- هُ): ١-بە (تازەی/ نوێی) داناو زانی ٢-بە لایەوە سەیرو خۆشبوو.

(-الشيءَ): ١-دایهێنا ٢-هەڵیبژاد ٣-کەڵکی لێوەرگرت.

(ألطِرْف): شتی تازە/ ماڵێکی/ دارایەکی تازە کە دەستگیر بووبێت.

(-مِنَ الناس): کەسانێکی دڵتەنگ کە دڵیان بە کەس نەکرێتەوە تا سەر هاورێیەتی کەس نەکەن.

(رَجُلٌ طِرْفٌ في نَسَبِهِ): تازەپیاکەوتوو/ پیاوێك تازە بە پلەو پایە گەیشتبێت.

(إمْرَأةٌ طِرْفُ الحَديث): ژنێکی قسەخۆش و بە گوستاخ.

(ألطَرف): ١-تازە پێگەیشتوو/ کەسێکە تازە بە پلەو پایەو گەورەیی گەیشتبێت ٢-کەسێکە کە لەسەر کارێك یان لە شوێنێك ئۆقرەو ئارام نەگرێت ٣-کەسێکە کە تا سەر هاورێیەتیی کەس نەکات.

(ألطُرْفَة (ج) طُرَف): ١-قسەی خۆش و بەتام و بەچێژ ٢-ئاخاوتنی تازەو تازە داهاتووی چاك ٣-هەموو شتێکی تازە داهاتووی سەیرو ناوێزە.

(الطارِف) (فا): کاڵاو ماڵی تازەو تازە پەیدابوو بەرامبەرەکەی کۆنەو کۆن.

(طَوارِفُ القَرائِح): سەلیقەی تازەو بە دڵدا هاتن و بۆ هاتنی نوێ.

(ألطِراف): خانەدانی/ وەجاخزادەیی و نگینیی.

(تَوارَثوا طِرافاً عَن طِراف): پشتاوپشت هەر خانەدان و نگینبون/ بەرەدوای بەرە هەر خانەدان/ وەجاخزادەو نگینبوون.

(ألطَريف (ج) طُرْف وطِراف): ١-میوەو بەرو شتی ناوێزەو بێوێنە ٢-کاڵاو شتی تازە داهاتوو ٣-تازە بە پلەو پایەو بەرزیی گەیشتوو ٤-کەسێك بە رەسەنی خۆی گەیشتبێت.

(-مِنَ المال): دارای تازە بەدەستگەیشتوو پێچەوانەکەی سامانی کۆنە.

(ألطَريفَة (ج) طَرائِف): مێی وشەی (الطريف).

("هَل وراءَكَ طَريفَةُ خَبَرٍ تطرفنا بِهِ"): ئایا هەواڵێکی تازەت پێهەیە.

(طرائِفُ الحَديث): ١-هەڵبژاردەی وتەکانی پێغەمبەر ٢-قسەی نەستەق.

(ألأُطروفَة): ئاخاوتنی پاکداڕێژراوی کەموێنەو ناوێزە.

(ألمُطرف- مِنَ المال): دارای تازە دەستکەوتوو.

(ألمِطراف) (ح): مێحوشترێك کە زوو زوو لەوەڕگاکەی دەگۆڕێت.

٤-(طَرَّفَ- هُ): خستیە کەنارەوە/ خستیە سەرپەر.

(-بَنانَــهُ): ســەری پەنجــەی (خەناویکرد/ گرتەخەنە).
(أطرَفَ كذا بِكَذا): ئەوەی (شوێن/ دوای) ئەو خست/ دوابەدوای یەکیخستن.
(تَطَرَّفَ): گەیشتە ئەوپەڕی/ گەیشتە کەنار.
(-الشــيءُ): ١-شــتەکە کەوتــە کەنــارەوە/ کەناریگرت ٢-لە ئەنــدازە بەدەربوو/ تیژڕەو بو/ توندوتیژ بوو.
(تَطَرَّفَ في آرائِهِ): بە ڕاکانیدا (تیژڕەوییکرد توندڕەو بوو) زیادڕەو بوو.
مُتَطَرِّف: زیادڕەو/ توندڕەو.
(-تَطــرَّفَ-تِ الشَّــمسُ): خــۆر خەریکــی ئاوابوونبوو.
(-الشَيءَ): کەنارەکانی شتەکەیگرت.
(ألطَرْف (ج) أطراف): ١-(لێوار/ گوێ/ قەراغ/ کەنار)ی شــت ٢-لووتکــە/ پۆپــە/ ئەوپەڕ/ کۆتایی/ ئەوســەری شــت ٣-گەنــج و پیاوانی جوامێرو دڵفراوان.
(ألطِرْف (ج) أطْراف): دایك و باوکی جوامێرو بەخشندەو خانەدان.
(ألطِــرف (ج) طُرُوف وأطراف (م) طِرفَة): دایك و بــاوك و نێرومێــی وڵاغ و زیندەوەری تری ڕەسەن.
(ألطَــرَف (ج) أطراف و (جــج) أطاريف): ١-کۆتــا/ ئەوســەر/ ئەوپەڕی هەموو شــتێك ٢-کەنــار/ لا ٣-پیاوی بەخشــندەو جوامێر ٤-
هەردوو قاچ و هەردوو دەست و سەر.
(أطْراف الناس): ١-خەڵکــی ڕەمەکی ٢ ڕیش سپی و دەمڕاستان و گەورەپیاوان و سەرۆکان و مەزنان و خانەدانان.
(أطراف الرَجُل): خوێشان و کەسوکاری پیاو.
(ألطِــراف (ج) طُرُف): (کەنــاری/ قەراغی) کشتوکاڵ کە دەگیرێت و پاکدەکرێت.
٥-(ألطِرْف- مِنَ النَّبــات): چرۆی نەکراوە/ گۆپکەو خونچەی نەکراوە.
(ألطَــرَف (ج) أطْراف و (جــج) أطاريف): بەشێکی شت.
(ألطِراف (ج) طُرُف): خانەو دەواری چەرمین.
(ألمِطْرَف والمُطْرَف (ج) مَطارِف): پۆشاکێکی ئاوریشمین کە نەخش و نیگاری تێدایە.
(ألمَطْــروف): کارخانــەی ڕونگرتن کە بە ئاو بگەڕێت.
٦-(طَرْفَس): ١-تیژ تەماشایکرد ٢-جلی زۆری لەبەرکرد.
(-اللَّيلُ): شەو تاریکیکرد.
(-المَوردُ): سەرچاوەکە لێڵبوو.
(-الماءُ): ئاوەکە بە لێشاو بوو.
(ألطِرفِسان)٢-تاریکایی/ تاریکیی/ نووتەکیی ٢-ڕایەخ/ فەرش و حەسیرو بەڕەو شتیتر.
ألطِرفِســاء: تاریکیەکــی زۆر/ تاریکیەکــی ئەموستەچاو.
طرق: ١-(طَرَقَ- ـُ. طَرْقاً): بە چەکوش لێیدا/

چەکوشی پێداکێشا/ دایە بەر چەکوش.
(- الحِنْطَةَ عِنـــدَ المُغَرْبِلين): گەنمەکەی بە بێژنگدا کردو پووچەکەکەی لێگرت.
(-النَجّادُ الصــوفَ): هەلاجەکە خورییەکەی بە دار شیکردەوە/ هەلاجیکرد یان بە کوتەك کوتای.
(-الشـــيءَ): شـــتەکەی کوتایەوە/ توندلێیدا/ پیایدا کێشا.
(-البابَ): لە دەرگاکەیدا.
(-الرجُلُ): کابرا فاڵی بە بەرد گرتەوە.
(-القَــومَ طَرقـــاً وطُرُوقاً): بە شـــەو هاتنە لایان/ لە دەرگایان دان.
(طَـــرَقَ- الحديدَ): ئاســـنەکەی کوتا تەنكو درێژی کردەوە.
(إسْـــتَطْرَقَ- هُ): لێیخواســـت/ داوایلێکرد بە بەرد فاڵی بۆ بگرێتەوە.
(أَلطارِق (فا) (ج) طُرّاق وأَطراق): بە شـــەو (دەرگاکوت، لەدەرگادەر) بەشەو هاتوو.
(-فلك): هەسارەی بەیان.
(أَلطارِقَـــةُ (ج) طوارِق وطارِقـــات): ١-مێی وشەی (أَلطارِق) ٢-وەی/ چورتوم.
(الطَـــرْق والطُـــرْق والطَرْقَـــة): لێدانێك/ جارێك کوتان/ و لەدەرگادان.
(أَتَيتُهُ طَرْقَين): دووجار هاتمە لای.
(أَلطِرقَةُ (ج) طِرَق): جۆرە لە دەرگادانێك/ جۆرە کوتانێك/ کوتە/ تەقە.

(أَلطِراق): چەرم یان ئاســـن تەنك دەکرێتو بە پێی قەڵغان دەبڕرێتو تێیدەگیرێت یان بۆ شتیتر بەکاردێت.
(أَلطراقِيَـــةُ): گەنمە پووچەك کە بە بێژنگ دەگیرێتو لادەخرێت.
(أَلمِطرَق والمِطْرَقَة (ج) مَطارِق): ١-شیشـــێك یـــان تووڵێك کە خوریی پێشـــیدەکرێتەوە ٢-چەکوشو پیکی ئاسن کە بە ئاسن یان شتیتردا دەدرێت.
٢-(طَرَقَ-تِ الإبلُ الماءَ): حوشترەکان چوونە ناو ئاوەکەوەو پیایدا گەڕان.
(طَرِقَ. طَرْقاً): ئاوە لێڵەکەی خواردەوە.
(أَلطَرَق): زەلکاو، گۆلاو.
(ماءُ مَطْروق): ئاوێك کە حوشتر تێیچووبێتو پیادا گەڕابێت میزو پشقلی تێکردبێت.
٣-(طَرِقَ- البَعيرُ. طَرَقاً): حوشـــترەکە شلیی لە ئەژنۆیدا بوو یان قاچی گێر بوو.
(أَطْـــرَق (م) طَرقاء (ج) طُرْق): حوشـــتری ئەژنۆشلو قاچ گێر.
(طُـــرِقَ- الرَجُلُ): کابرا ئاوەزی ســـووکبوو/ کەمئەقڵبوو.
(أَطْـــرَقَ): ١-متبـــوو/ بێدەنگبـــوو ٢-ســـەری داخستو چاوی بۆ زەوی شۆڕکردەوە.
("أَطْرَقَ رَأسَهُ): سەری داخستو چاوی بڕییە زەوییەکە.
(أَطْـــرَقَ- الى اللّهْـــوِ): ڕوویکـــردە یـــاریو

رابواردن.
(اَلطِرِّيــق (م) طِرِّيقَــة والمِطْــراق (ج) مَطارِيق): كەســێكە ماتيى زۆر دايگرتبێتو بێدەنگبێت/ كرِبێت.
(اَلمَطروق) (مفع): ١-كەسـێكە نەرمو شـلو بێدرِكبێت ٢-كەسێكى هارو هاجو شێتۆكە.
٤-(طَرَّقَ)- لَه: رِێى (بۆ كرد/ بۆ راكێشا).
(-المَوضِعَ): شـوێنەكەيكرد بە سـەرە رِێگا/ رِێگەى بە شوێنەكەدا برد.
(«لا تُطَرِّقوا المساجد»): مزگەوتەكان مەكەن بە سەررِێگا.
(طَرَّقَ- طَرِيقَةً حَسَنَة): شێوازو رِێگەيەكى چاكى داهێناو دۆزِييەوە.
(-تِ الحامِـلُ بِوَلَدِها): ئافرەتە سـكپرِەكە منداڵەكـەى لـە سـكيدا گيربووەو بـە گران دەيبێت.
(-تِ القطاةُ): كورِكورِ/ قەتێ كاتى هێلكەكردنى هاتووە.
(«طَــرَّقَ بِحَقِّــي»): (نكوليى/ حاشــاى) لە مافەكەمكردو پاشان دانى پێدانا.
(أَطْرَقَ – الرَجُلُ): بە پێ رِۆيشت.
(تَطَرَّقَ- إلَيهِ): رِۆيشت تا پێيگەيشت.
(-إلى الأمرِ): بۆ ئەنجامدانى كارەكە رِێگەيەكى بۆ گرت.
(اِطَّــرَقَ- تِ الإبِلُ): حوشــترەكان بەملاولادا بڵاوبوونەوە.

(إِسْتَطْرَقَ- الشيءَ): شتەكەى كــرد بە رِێگەو كەڵكى لێبينى.
(-بَين الصُفوفِ): بە نێو رِيزەكاندا رِۆيشت.
(اَلطِرقَةُ (ج) طِرَق): رِێگە/ رِێباز/ تەرح.
(اَلطُرْقَــةُ (ج) طُرَق= الطَريــق): ١-رِێگە/ رِێبــاز ٢-رِێــى بۆچوونى شـتەكە چۆنيەتيى بۆچوون بۆ شتەكە ٢-خووپێوەگرتنو نەريت ٤-چاوچنۆكيى/ مرخلێخۆشكردن.
(اَلطَريــق (ج) طُــرق وأَطْــرُق وأَطْرِقَــة وأطْرِقــاء و (جــج) طُرُقات): رِێبــاز/ رِێ/ راگوزەر/ رِێوبان/ گوزەرگا/ شــەقام (بە نێرو مێ دەكرِێت).
(اَلطريــق عند الفُقَهاء): لاى زانايانى ئاينى: رِێرِەوى پەيرِەوكراوو گشتى/ لەسەر هەموانە لە ســەرى برِوات/ رِێرِەوى گشتى پێيدەڵێن: (الطريق النافِذ).
(الطريــق الخــاص): رِێــرِەوى تايبەتــى. پێيدەڵێن: (الطريق غــير النافذ): رِێرِەوێك كە هەموو پەيرِەوى ناكەن.
(اَلطَريقــة (ج) طَرائِــق): ١-رِەوشو رِەفتار ٢-بــار/ چۆنيەتــى ٣-رِێرِەو ٤-هێڵى كێشــراو يان هێڵ لە شــتدا ٥-تەختە چنراوێكى درێژ ٦-مەزنانــى خوێشــگەلو فاميليــا (بۆ تاكو كۆ)يە.
(«هو طريقَــةُ قَومِهِ»): ئــەو گەورە پياوى خوێشگەلەكەيەتى يان نەتەوەكەيەتى.

(«هُـم طَريقَـةُ قومِهِـم»): ئـەوان گەورە پیاوانی نەتەوەکەیانن.
(هـم طرائِـقُ قَومِهِـم): گەورەپیاوانـی نەتەوەن.
(طَرائِقُ الدَّهرِ): بەسەرهاتی ڕۆژگارو چەرخ و ڕەوش و وەرچەرخانی ڕۆژگار.
(ألمَطاریق): خوێشگەلی پیادە.
٥-(طـارَقَ- بَـينَ الثَّوبَـين): دووکراسـی بەسەریەکدا لەبەرکرد.
(-الظَـلامُ أَو الغمـامُ): تاریکـی یـان هەور پەیدەرپەی هات/ بە شوێن یەکدا هات.
(أطْرَقَ-تِ الإبِلُ): حوشترەکان یەك بە دوای یەکدا هاتن/ شوێنیەك کەوتن.
(تَطارَقَ- الشَـيءُ): شـتەکە پەیدەرپەیبوو یەك بە دوای یەکدا بوو.
(-تِ الإبِـلُ): حوشـترەکان یەك شـوێنیەك کەوتن.
(إطَّرَقَ-تِ الإبِلُ): حوشـترەکان شـوێنیەك کەوتن.
(-جَناحُ الطائِر): باڵی پەلەوەرەکە پێچیخوارد.
(-التُرابُ): گڵەکە نیشتە سەریەك.
(ألطَرَق (مص) (ج) أَطْراق): ١-لۆچی کوندە یان مەشکە ٢-شوێنپێی حوشتر.
(أَطـراقُ البَطـنِ): لۆچی سـەریەکی ورگ و سك.
(أَلطِـراق (ج) طُـرْق): ١-چەرمـی پێلاو ٢-هەموو پارچەیەکی پێلاو کە لە یەك بدرێن.
(ألطُرْقَـةُ (ج) طُرَق): کەڵەکە بەرد/ بەردی سەریەك.
(ألمِطـراق (ج) مَطاریق): هاوتـا/ هاووێنە/ هاوشێوە.
(ألمَطاریق): قەتاری حوشتر کە یەك بە دوای یەکدا دەڕۆن.
٦-(أطْرَقَ- الرَجُلُ): پیاوەکە ژنیهێنا.
٧-(أَطْـرَقَ- الصَّيـدَ): داوی بـۆ نێچیرەکـە نایەوە.
(ألطَرْق والطَرْق (ج) أطراق والطَرَقَةُ ج طَرَق): داو/ تەڵە/ فاقە/ تەپکەو شتی لەو بابەتە.
٨-(ألطارِقَة (ج) طَوارِق وطارِقات): ١-خێڵ و کەسـوکاری پیاوەکـە ٢-تەختێکی نوسـتنی بچووك.
(ألطَريقَةُ (ج) طَرائِق): ١-دار خورمای بڵند/ فووچ ٢-ستوونی چەتر.
(ثَوبٌ طَرائِق): بەرگی دڕاو.
الملحق:
(طرق: أَلطَّوارق): دەمولووت هەڵبەستوو.

---

(طـرم): ١-(طَـرِمَ- بَيْتُ النَحـلِ. طَرْماً): کوورەکـە لە هەنگوین پڕبـوو/ هەنگوین لە کوورەکەوە هاتەدەرێ/ سەرڕێژیکرد/ ڕژا.
(ألطَـرْم والطِـرْم): هەنگوینـی نەپاڵاوتە/ هەنگویـن بـە شـانەوە. جارێـك پڕبوونی شانەهەنگ لە هەنگوین.

٢-(أَطْرَمَ-ت أَسْنانُهُ): بەڵغی سەوز بە دانیەوە بوو/ دانی بەڵغی سەوزیگرت.

(-فُـوهُ): دەمـی بۆنی ناخۆشـبوو یان تامی دەمی ناخۆشبوو

(الطُرمَـةُ): ١-بەڵغی سـەوز كە بـە دانەوە دەبێتو داندادەپۆشـێت ٢-پاشماوەی خواردن كە لـە نێوان دانەكاندا دەمێنێتەوە ٣-وشـكە تف كە بە دەمەوە دەبێت.

٣-(تَطَـرَّمَ- فِي الـكَلام): دەمـی تێكـەڵو پێكەڵبوو/ قسەی تێكەڵو پێكەڵیكرد.

٤-(اَلطَرْمَةُ): جگەر/ جەرگ.

(اَلطَرْمَةُ والطِرْمَـةُ والطُرمَةُ): چالێك یان بەرزییەك لە ناوەراستی لێوی سەرەوە.

٥-(اَلطُروموث (ج) طَراميث): نانی بە پشكۆ یان ژیلەمۆ برژاو.

٦-(طَرمَحَ- البناء): خانەكەی درێژكردەوە.

(اَلطِرماح والطُرموح): درێژ.

(اَلطِرمَّـاح): ١-درێـژ ٢-رەچەڵەكـی ناودار ٣ ئاواتەخوازی كارەكە.

٧-(طَرْمَـدَ): رووقایمـیو بێئابروویيكردو كەوتە لافو گەزاف بە شتەوە كە نەیبوو.

(طِرماذ وطِرمِـذان): بێئابرووی رووقایمی لافو گەزاف لێدەر بە شتەوە كە نەیبێت.

٨-(طَرْمَسَ): ١-تۆقیو متبـوو/ دەنگی لێبڕا ٢-رقی لە شتەكە بووەوە ٣-هەڵات.

(طَرْمَسَ- الوَجهُ): رووگـرژو مۆنبوو/ روو تاڵبوو.

(-الكاتِبُ الكِتابَةَ): نووسەرەكە نووسینەكەی سرییەوە.

(طَرمَـسَ واطْرَمَّـسَ- اللَّيلُ): شـەو تەواو تاریكبوو.

(اَلطِرمـاس والطِرمِـس والطِرمِسـاء): تاریكەسەڵات/ زۆرتاریك/ شەومزەنگ.

طرا: ١-(طَـرُوَ وطَرِيَ- الغُصْـنُ أَو اللَحْمُ. طَراوَةً وطَـراءَةً وطَراءً وطَـراةً): چڵەكە/ پەلەكە یان گۆشـتەكە تەرو ناسـكو پاراوو تازە بوو.

(طَرِيّ): تەرو پاراو تازەو ناسك.

(طَرَّى- الشـيءَ): شتەكەی شلو نەرمو تەرو ناسككرد.

(أَطرَى- فُلاناً. إطراءً): ستایشێكی زۆریكردو چاك پێداهەڵیدا.

(اَلطَرِيّ): ناسكو پاراوو نەرمو نۆڵ.

(اَلأُطـرُوان- مِنَ الشَّـباب): گەنجی هەرەتی جوانییو ناسكییو غوبابیی/ هەرزەكار.

٢-(طَـرا- عَلَيهِـم. طُـرُوّاً): لە شـوێنێكی دوورەوە هاتە لایان.

٣-(طَـرَّى- الطيبَ): عەترەكـەی تێكەڵ بە بۆنی خوشێتر كرد.

(-الطَّعـامَ): بەهاراتـی كردە چێشـتەكەوەو تێكەڵیكرد.

(إطْرَوْرى): (تلْخەیكرد/ ئینتەلایكرد) و سكی

هەستا.
(ألإطرِيَة): خواردنێکە لە تاڵۆك (شـعرِيَة) دروستدەکرێت.
٤-(ألطـرا): ١-ئەوەی کە لە زەویدایە جگە لە گڵ/ خـاكو لەو چەوو بـەرد ٢-بەدیهاتووی بێئەندازەی جۆراوجۆر.
(طري. طرِيَ-إليهِ طرى): (بەرەو رووی/ بۆ لای) هات.
طـرز: (طَـرَزَ-هُ. طَـرزاً): بە مسـتەکۆڵە پاڵپێوەنا دەریکرد.
طسّ: ١-(طَسَّ-هُ طَسّـاً): بـە گژیدا چوو و بێدەنگیکرد/ دەنگیبڕی.
٢-(طَسَّ-هُ في الماءِ طَسّاً): نوقمی ناویکرد.
(-القَوْمُ): دوور ڕۆیشتن.
("مـاأدرى أيـنَ طَـسَّ"): نازانـم لـە کوێ نوقومبوو/ بۆ کوێ ڕۆیشت.
(طَسَّ): ڕۆیشت.
(-في البِلادِ): نوقومی ناو وڵاتبوو.
٣-(ألطَسّ (ج) أطاس وطُسُـوس وطَسـيس والطِسَّـةُ والطَسَّـةُ (ج) طَسَّـات وطِسَّـات وطَسَس وطِساس): تەشت کە لە مس دەکرێت (فارسیه)
(الطَسّاس): ١-تەشتگەر ٢-تەشتفرۆش.
(ألطِساسَة): تەشتگەریی.
طسأ: ١-(طَسَـأَ وطَسِيءَطَسْـأً): تڵخەیکرد/ ئینتەلایکرد.
(طاسِيءُ وطَسِيءٌ): تڵخەکردوو/ ئینتەلاکردوو.
(أطْسأَ-هُ): تڵخەی پێکرد.
(ألطُسـأَةُ): تڵخەکـردن/ ئینتەلاکـردنو سکچوونو ڕشانەوە.
٢-(طَسَأَ-مِنْهُ طَسْأً): شەرمی لێکرد.
طسـت: (ألطَسْت (ج) طُسـوت) (فارسية): تەشـت یان دەستشۆر/ لەگەڵنی دەستشتن کە لە مسە.
طسـع: (طَسَـعَ- في البِلادِ طَسْعاً): ڕۆیشتو بە وڵاتا گەڕا.
(طَسِعَ. طَسَعاً): بێوڕەو بێبڕشتو بێدەرەتانبوو.
(طَسِع وطسيع): بێوڕەو بێبڕشتو بوودەڵەو نابووت/ بێدەرەتان.
(طسـم: ١-طَسِـمَ. طَسَـماً): تڵخەیکـرد: ئینتەلایکرد.
٢-(طَسَمَ-الشـيءَ. طَسْماً): شتەکەی ونکردو نەیهێشت.
(-طُسُوماً): ونبوو/ دیارنەما.
(ألطَسَم): ١-تارکیی ٢-تۆز/ گەرد.
(طَسَمٌ أو أطْسامٌ مِن سَحاب): پەڵەهەور.
ألطَسـام والطُسام- مِنَ الغُبار: تۆزێکی زۆری بەرچاوگرتوو.
٣-(طَسَّمَ المُوسى) (عامية): گوێزانەکەی بە چەرمی تیژکردنەکەدا هێنا تیژی بکات.
(ألطَسْـمَة) (فارسـية): چەرمـی گوێـزان پێتیژکردن.

طش: (طَشَّ وأَطَشَّ-تِ السَّماءُ. طَشّاً): نمەنمەباران باری.

طُشَّ- الرَجُلُ: توشوی هەلامەتو سەرما بوو.

(اَلطش): نمەباران.

(اَلطُشَّةُ) (طب): هەلامەتو سەرمابوون.

اَلطِشَّةُ: کوری بچووك (طب).

(الطُشاش) (طب): هەلامەت.

(اَلطَشاش): کزیی چاو/ چاوکزیی.

(«اَلطَشاش ولا العُمی»): چاوکزیی نەك کوێریی.

(اَلطَشیش): نمەنمەباران.

(طَشت: اَلطَشت= الطست (فارسیة): تەشت.

طعم: (طَعِمَ- الشيءَ طَعْماً وطُعْماً): شتەکەی (چەشت/ تامکرد).

(-الطَعامَ طَعْماً وطَعاماً): خواردنەکەی خوارد.

(طَعَمَ. طَعماً): تێر بوو.

(«مایَطْعَمُ آکِلُ هذا»): پیاو لەمە تێر نابێت.

(طَعَّمَ- العَظمُ): ئێسقانەکە موخیگرت/ مۆخی تێدا پەیدابوو.

(طاعَمَ-ە): خواردنی لەگەڵدا خوارد.

(أَطْعَمَ- ە): ١-خواردنی دەرخوارد دا ٢-خواردنی بۆ کرد بیخوات.

(-الشيءُ): ١-شتەکە مەزەی پەیداکرد/ خواردنی خۆش بوو/ بەتامبوو ٢-چێژی گۆڕا.

(-الشَّجَرُ): درەختەکە بەرێداو بەرەکەی گەیشت.

(تَطَعَّمَ- الشيءَ): شتەکەی چەشت.

(«تَطَعَّمْ. تَطْعَمْ»): بێچێژە تا حەزی لێبکەیتو دڵت بچێتە سەریو بیخۆیت (بۆ هاندانی خواردنی شتەکەیە).

(إِطَّعَمَ): چێژی پەیداکرد/ چەشەی خۆشبوو/ تامی خۆشبوو.

(-تِ الشَجَرَةُ): بەری درەختەکە گەیشتو (تامی/ چەشەی) خۆشبوو.

(إِسْتَطْعَمَ): بە چێژەکەی زانی/ زانی تامی چۆنە.

(-الطَعامَ): چێشتەکەی/ خواردنەکەی چەشت تا بزانێت چێژی چۆنە.

(«إِسْتَطْعَمَهُ الحَدیثَ»): داوای لێکرد کە قسەی بۆ بکاتو چێژ لە قسەکانی وەربگرێت.

(اَلطَعْم (ج) طُعوم): ١-چێژ/ تام وەك تاڵییو شیرینی ٢-خواردنێك کە خۆشبێتو حەزی لێبکرێت.

(«رجُلٌ ذو طَعْمٍ»): پیاوێکی بە ئاوەزو هۆشو بەبڕشت/ سوورخواست.

(اَلطُعْم): ١-خواردن/ چێشت/ خۆراك/ خۆرشت.

(«هذا طعامُ طُعْمٍ»): ئەمە خواردنێکە/ خۆراکێکە: تێرەخۆرمیە/ تێرکەرە ٢-دانەی

ڕاوکردنی باڵندەو ڕاوەماسی/ ژارماسی. (عند العامة): ژەهر.

("وضَعَ لَهُ طُعماً"): ژەهری بۆ تێکرد/ ژەهری دەرخواردا.

(ألطُعْمَـةُ (ج) طُعَـم): ١-خـواردن/ خۆراك ٢-نان و خواردنکردن بۆ خەڵك/ داوەت/ ناندان ٣-ڕۆژیـی ٤-ڕێگـەو شـێوەی نانپەیداکردن/ کاسبیکردن: ڕۆژیی بەدەستهێنان.

(جَعَلْـتُ ضَیعَتي طُعْمَةَ لِفلان): زەویەکەم/ کێڵگەکەم بە فیسـاردا خۆی پێبەخێو بکات/ نانی لێبخوات.

(ألطِعْمَة): ١-جۆر/ چەشـن ٢-شێوەی ڕەنج و نانپەیداکردن.

(ألطَعـام) (مـص) (ج) أَطْعِمَـة و (جـج) أَطْعِمات): ١-خـۆراك/ خواردەمەنی ٢-گەنم و جۆو دانەوێڵە کە نانی لێ دروستدەکەن.

(ألطَعِم والطاعِم): تێر خۆراك و خۆراکباش.

("أَنـا طاعِمٌ عَن طعامِكُـم"): من خواردنی خۆش و تەواوم هەیە هی ئێوەم ناوێت.

(جَزُورٌ طَعُومٌ وطَعیمٌ): لاکێکی سەربڕراوی گۆشـت مامناوەندی نە قەڵەوو بە بەزەو نە لەڕ.

(ألطَعُومَة): مەڕی دابەستە.

(ألطَعامِيّ): خۆراکفرۆش/ خاوەن چێشتخانە.

(ألمطعام): نانبدە/ میواندۆست/ میوانپەروەر.

(ألمُطْعَم) (مفع): نانپێدراو/ ڕۆژیدراو.

(ألَمَطْعَم (ج) مَطاعِم): چێشتخانە ٢-چێشت/ خۆراك: خواردن/ خواردەمەنی.

(ألمِطْعَـم (م) مِطعَمَة): زۆرخـۆر/ چڵێس/ ورگدڕاو.

(ألَمطعوم) (مفع): خواردن/ خۆراك/ ئەوەی کە دەخورێت یان دەچێژرێت.

٢-(طَعِمَ- الغُصْـنُ. طَعْماً): (ز)چڵەکە/ لقی درەختەکە موتوربە بوو کـە هی درەختێکی تر بوو.

(طَعَّمَ الغُصْنَ): لقـی درەختەکەی موتوربە کرد.

(-الصَحیـحَ) (طـب): لەشسـاغەکە کوترا بۆ پاراسـتن یـان چاکبوونەوە بـە کەمەکە میکرۆبێکی لاوازی نەخۆشییەکان کوتراو یان بە مەسلی نەخۆشییە پەتاکان. وەك نەخۆشی ئاوڵەو ومناق.

(طاعَمَ وتَطاعَمَ- الحَمامُ): کۆترەکە دەنووکی خستە دەنووکی مێکەیەوە.

(أَطْعَـمَ- الغُصْـنَ) (ز): چڵەکـەی موتوربە کرد.

(إطَّعَمَ): نانی هاریی بەدەمەوە گرتووە.

("هـو لایُطَّعَـم"): ئـەو تەمـێ نابێـت و ئامۆژگاریی وەرناگرێت و چاکی ناکات.

(ألَمَطْعُـوم) (ز) (عامیـة): چڵێکـی باخـە موتوربەی چڵێکی داری دەشتی پێبکرێت.

(ألَمَطْعُوم): دەرمانی پێکوتانی ئاوڵە کە مرۆڤی

ساغی پێدەکوترێت تا بپارێزرێت (عامیة).
(التَطعيــم) (ز): چووزکردنـــی درەخـــت. گۆپکەیەکە یان چڵی دارێکە، چووزێکی ناسکە لە درەختێك وەرگیراوە لەســـەر درەختێکیتر موتوربـــە دەکرێـــت، ئەگەر دارەکـــە گرتیو دەرچوو ئەو چووزە یان گۆپکەیە دەبێتە ئەو درەختەی لێیوەرگیراوەو لە تویکلی درەختەکە یان چڵەکەی لەسەر کراوە خواردن دەگرێت.
٢-(طَعِـــمَ- عَلَيـــهِ. طَعْماً وطُعْمـــاً): توانای بەسەردا بوو.
(أَلطُعم): توانا.
طعن: (طَعَـــنَ- هـ بالرمح طَعْناً): ١-دایە بەر نێزەو پێیداکرد ٢ نێزەی تێوەژەند.
(-في الرَجُـــلِ وعَلَيـــهِ. طَعْنـــاً وطَعَنانـــاً): پیاوەکەی بەدناوو ڕســـواکرد/ لەکەداریکرد/ تەشەری لێدا.
(تَطاعَنَ واطَّعَنَ- القَـــومُ تَطاعُناً وطِعاناً): تەشەریان لە یەکداو یەکتریان لەکەدار کرد.
(أَلطَعْنَـــةُ (ج) طَعْـــن وطَعَنـــات): ١-جارێك نێـــزە پێداکردن یـــان تێوەژەنـــدن ٢-جارێك تەشـــەرلێدانو لەکەدارکـــردن ٣-شـــوێنکاری نێزەو تیغ پێداکردنو تێچەقاندن.
(أَلطَعَّـــان والمِطْعَـــن والمِطْعـــان (ج) مَطاعِن ومَطاعين): نێزەو تیغوەشـــێنو دەستڕاســـت تیایدا.
(«هو طَعَّانٌ في أَعـــراض الناس»): ئابڕوو و ناموسی خەڵکبەرە/ جنێوو شتی بێرعەت بە ناموسی خەڵك دەڵێتو دەدات.
(أَلطعين (ج) طُعْـــن): نێزەلێدراو/ بەرنێزە کەوتـــوو یـــان بەرتەشـــەرو جنێـــو کەوتوو سووککراو.
(أَلطِعِّين): دەستڕاستو نێزەوەشێنی چاك لە جەنگدا.
(أَلمَطْعَنَة): شەرەنێزە/ نێزەبازیی.
٢-(طَعَـــنَ- في المَفـــازَةِ. طَعْناً): بـــە بیاباندا ڕۆیشت.
(-في السِنِّ): چووە ساڵەوە/ پیر بوو.
(-الفَـــرَسُ في العَنـــانِ): چارەوێکـــە جڵەوی وەرگرت بە هەوەسی خۆی ڕۆیشت.
(-اللَّيلَ. طَعْناً وطَعَناناً): بە درێژایی شـــەو ڕۆیشت.
٣-(طُعِنَ- الرَجُلُ): پیاوەکە تووشی (ژەقنە/ تاعوون) بوو.
(أَلطاعـــون (ج) طَواعين) (طـــب): ژەقنە/ تاعون کە پەتایەکی ترسناکە یان بە (تاعون/ ژەقنە) مردن.
الملحق:
طعن: (أَلطَعن): تێوەژەندنو گومانلێکردن.
("أَلطَعـــن بالرُمـــح"): نێزەپێداکـــردن یان شەرەنێزە.
(أَلطَّعْن): جنێو پێدانو سووککردن.
(«أَلطَعْـــن في العَـــرض»): ناموسشـــکاندن/

ناموسبردن.

(«رسـالَة طَعْن»): نامەی تەشەرو شکاندنو هێرش بردنە سەرێکی توندوتیژی میری یان دەسـتگاکان یان دیـن یان پیاوە بـەرزەکانو دەرکەوتووەکان.

(ألطَعـن (ج) طُعـون): رەغنەو تەشـەر لە شتێك.

«لُجْنَـة الطُعون النِيابيَـة»: لیژنەی رەغنە لـە پەرلەمانـدا کە تەماشـای ئەو تەشـەرو رەغنانە دەکات کـە پالێوراوە دەرنەچووەکان پێشکەشـیدەکەنو دەربـارەی هەڵبژاردنەکە بێت.

(ألطَعـنُ –بطريـق النقـض في قانـون المُرافَعات): رەخنەگرتن لە بریارێك کە دادگا دابێتی. ئەومیە رەخنەکە پێشکەش بە دادگای هەڵوەشـاندنەوە بکرێت بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو بریارە لە رێی یاسـاوەو بە پێی سایا نەك بە پێی قەوماوەکان.

---

(طفر: طَفَرَ-هُ. طَفْراً): پالێوەنا.

(ألطغراء والطُغرى (ج) طُغْراءات وطُغْرِيات) (تركية): نیشانەیەکبوو کە لەسەر بلاوکراوەو پارەی سوڵتان دەبوو/ تورەی سوڵتانی خەڵکە رەشۆکەکە پێیاندەوت (الطُرَّة).

(الطُغْرانِيُّ): تورە دروستکەرەکە.

طغم: ١-(تَطَغَّـمَ- عَليهِ): خۆی لـێ بێئاگا کرد.

(ألطُغْمَة (ج) طُغمـات وطُغَم): تاقمێك کە کاریان یەکبێت.

(ألطَغَم):١-دەریا ٢-ئاوێکی زۆر.

(ألطَغـام والواحِـدَةُ «طَغامَـة»):١. هەرچیو پەرچیو رسواکانی ناو خەڵك/ سەرسەرییەکان. أوبـاش (عامية) = أوغاد٢-باڵندەی بچووکی بێجورم.

(ألطَغامَة): گەوج.

(ألطُغومَة والطُغومِيَّة): گەوجیيو نزمییو پوشتیی.

٢-(طَغْمَـشَ- الرَجُلُ. طَغْمَشَـةً): چاوی کز بووبوو/ کزی چاو بوو.

(طَغْمَـشَ- إلَيـهِ): بـە کزییو لـە ژێرەوە تەماشـایکرد ئەویش لەبەر کزییو بێتینیی چاوی.

(مُطَغمِش): تەماشاکەرێکی چاوکز.

طغا: (طَغا. طُغُـواً وطُغُوّاً وطُغْواناً): پێیلێ هەڵبری/ لە سـنوورو ئەندازە چووە دەرەوە/ شـووڵی لێهەڵکێشـا/ بێئەندازە ستەمیکرد: یاخیبوو.

(-البَحرُ): دەریا هەستاو ورووژا.

(-السيلُ): لافاو هاتو ئاو هەستا.

(طَغَّى وأطغى- هُ): شێتگیریکردو وایلێکرد لە رادە بەدەر ستەمبکات.

(أطغى- المالُ ونَحْوَهُ): سامانو داراییو شتیتر ستەمکاری لێدەرچواندو باییکرد.

(تَطَاغَـى- المـوجُ): شـەپۆلەكان ورووژانو هەستان/ هاربوون.

(أَلطَغْـوَةُ (ج) طَغَـوات): شـوێنی بـەرز/ هەڵەت.

(أَلطَغوى): لە سنوور دەرچوونو ستەمكردن/ لەخۆباییبوون.

(الطاغـوت (ج) طَواغ وطَواغيت): ١-هەموو سـتەمكارو دەسـتدرێژیكەرێك ٢-هەمـوو سەرگومراییەك ٣-شەیتانی گومراكەری مرۆڤ ٤-هەموو پەرستراوێك جگە لە خودای مەزن.

(أَلطَواغي والطَواغيت): بتخانە.

طغى: (طَغا وطَغِيَ. طَغْياً وطُغْياناً وطِغْياناً= طَغا): لە ئەندازە دەرچوو ستەمكارییكرد.

(-الكافِرُ): خودانەناسەكە كفری زۆر كرد.

(طَغـاهُ الشَـيطانُ) (عامية): شـەیتان ڕێی چاكەو خێری لەدەستداوە/ گومرایكردووە.

(-طَغى- الرَجُلُ): بێئەنـدازە زۆرداریكردو سەرپێچیی خودایكرد.

(-المـاءُ): ئاوەكـە هەسـتا/ بەرزبـووەوە ئەملاولایگرتەوە.

(طَغَّـى وأَطغى- فُلانـاً): وایلێكـرد ببێتە زۆردار/ لـە ئەندازە بـەدەر دەسـتدرێژیی بكاتو یاخی ببێت.

(أَلطَغْيَة): ١ جارێك لە ئەندازە بەدەر بوونو سـتەمكردن ٢-جارێـك لـە ڕێ دەرچـوون/ سەركێشیكردن ٣-ئەسپی سەركێشو ولاخیتری سـەركێش ٤-پۆپەی شـاخ ٥-هەموو شوێنێكی بەرز.

(الطاغي (ف) (ج) طُغاة وطاغون): زۆردار/ ستەمكار.

(أَلطَّاغِيَـةُ): ١-مێی وشـەی (ألطاغي) ٢-زۆر زەبربەدەسـت/ زەهەندە ٣-بە فیزی زۆرداری دڵسەخت ٤-گەوج ٥-هەورەتریشقە/ برووسكە ٦-نازناوی فەرماڵەكانی ڕۆمە (لەوانەیە عەرەب وایان بە بێگانەش وتبێت).

طف: ١-(طَفَّ- الشـيءُ مِنْهُ طَفّاً): شـتەكە لێینزیكبووەوە.

(طَفَّـفَ- المِكيالَ): شـتەكەی كـەم پێواو بە كەمیی دای.

(-بِهِ مَوضِعَ كذا): بۆ ئەو شوێنە پاڵیپێوەناو لێینزیككردەوە.

(أَطَفَّ- لَهُ): ویستی فریوی بداتو لە خشتەی ببات.

(-عَلَيهِ): بەسـەریدا ڕووانی یان ئەوەیشـی گرتەخۆ.

(إسْـتَطَفَ-تِ الحاجَـةُ): پێویسـتییەكە بە دەستهاتو دەستگیر بوو.

(أَلطَفّ (ج) طُفوف): ١-تەنشـت/ لا ٢ ڕۆخی دەریاو ڕووبار ٣-حەوشەی خانوو ٤-(قەدپاڵی/ لاپاڵی) شاخ.

(طَفافُ الشَّـمسِ): داكەوتنی خۆرو خەریكی ئاوابوونی/ زەردەپەڕ.

(أَلطافَــةَ: أَتانا عِندَ ظفاف الشَــمس): كاتی زەردەپەڕ هاتو بۆ لامان.

(أَلطافَــةَ): ١ـپەرژیــنو دیــواری ئەملاولای بێســتانو باخ ٢ـنێوان کێوو شوێنە نزمەکان/ دۆڵەکان.

(أَلطفیف): ناتەواو/ بەکەموکوور/ کەم.

٢-(طَــفَ- الحائــطَ. طَفّاً): ســەر دیوارەکە کەوت/ چووە سەر دیوارەکە.

(-هُ برِجلِهِ أَو یَدِهِ): بە قاچی یان بە دەستی هەڵیبڕی/ بەرزیکردەوە.

(أَطَفَّ- علیه): بەسەریدا ڕوانی، سەرپەرشتیکرد.

(-الکَیلَ): پێوانەکەی لێوانلێو کرد.

(-علیــهِ بَحَجَرٍ): بەردێکــی لێهەڵگرت پیادا بکێشێت.

(-لَهُ السَّیفَ): شمشێرەکەی لێداهێنایەوە.

(إِسْــتَطَفَّ- علیــهِ): بەســەریدا ڕوانــی/ سەرپەرشتیکرد.

(أَلطَــفّ (مــص) (ج) طُفــوف): هەڵــمەت/ بەرزایی.

(أَلطَــفّ والطَفَــف والطَفــاف والطِفــاف والطفافَــة- مِن الإِناءِ): (لێواری/ لێوی) قاپ ٢ـلێوانلێوی قاپ/ دەفر یان داماڵی قاپ.

(إِناءٌ طَفّان): قاپێکی پڕی داماڵ.

٢-(طَفَّفَ- علی عیالِهِ): بەرامبەر خێزانەکەی چرووکیکرد.

(أَلطفیــف): ١ کــەم/ کەمەکێك ٢ـســووك/ بێبایەخ ٣ـڕسوا/ هیچو پووچ ٤ـناتەواو.

٤-(طَفَّفَح- الطائِرُ): پەلەوەڕەکە/ باڵندەکە باڵەکانی کردەوە.

٥-(أَلطَــفَ والطَفاف- مِنَ الخَیلِ): ئەســپی سووکەڵەی خێرا.

(أَلطَفاف والطِفاف): تاریکیی شەو.

٦-(طَفْطَفَ. طَفْطَفَةً): بەدەست نەیارەکەیەوە شلبوو.

("هــو یُطَفطِــفُ علیــه") (عامیــة): ئەو پایەیەی پێیگەیشــتووە شــایانی ئــەو نییەو پێیبەرێوە نابرێتو بەدەستیەوە شلە.

(أَلطَفطَفَة (مص) (ج) طَفاطِف والطِفطِفَة): ١ـکەمەر ٢ـهەموو گۆشتێکی شلی خاو.

(أَلطَفطَاف): ١ـتەنشت ٢ـڕۆخی دەریاو ڕووبار/ کەنار ٣ـسەری تەرزی چڵی درەخت.

طفــئَ: (طَفِــئَ-تِ النارُ. طُفُــوءً): ئاگرەکە کوژایەوەو گڕی نەما/ دامرکایەوە.

(-ت عَینُهُ): چاوی ڕووناکیی لێبڕا.

(أَطْفَأَ- النارَ): ئاگرەکەی کوژاندەوە.

(«أَطْفَــأَ الفِتنَــةَ أَو الحَــربَ»): ئاگــری ئاشــووبەکەی یــان شــەڕەکەی (کوژاندەوە/ دامرکاندەوە).

(إِنْطَفَأَ-تِ النارُ. إِنْطِفاءً): ئاگرەکە کوژایەوە/ دامرکایەوە.

(ألإِطفائِيّ (ج) إِطفائِیُّون): پیاوی ئاگرکوژێنەوە.

(ألإِطفائِیَّة): کۆمەڵێك سەربازن کە شیرازەیەکی

تایبەتییان هەیە پیشەیان کوژانەوەی ئاگرە.

(مُطْفِئُ الجَمْرِ): رۆژی چوارەم یان پێنجەمی برجی پیرێژنە.

(مُطْفِئُ الرَّضف): وەی/ کۆسـت/ لێقەومانی سەخت: خاکەساریی.

(مُطفِئَـةُ الرَضِفِ): پارچـە پیوێك، بەزێك کـە خرایـە سـەر بـەردی داخ دەتوێتەوەو بەردەکەیش سارد دەکاتەوە.

(ألمِطْفَأة (ج) مَطافئ): ئامێری ئاگرکوژانەوە/ ئاگرکوژێنەوە.

طفـح: ١-(طَفَحَ- الإناءُ طَفحـاً وطُفُوحاً): قاپەکە پڕبوو لێیرژا.

(-الإناءَ): قاپەکەی پڕپڕ کرد تا لێیرژا.

(-السَـكْرانُ): سەرخۆشـەکە تـا بینەقاقەی خواردیەوەو تەواو مەستبوو.

(-تِ المَرْأَةُ بالوَلَدِ): ئافرەتەکە کۆرپەکەی لە کاتی خۆیدا بوو.

(«إطْفَح عَنِّي»): لێم دوورکەوەو برۆ.

(طَفَّـحَ وأطْفَحَ- الإناءَ): قاپەکەی پڕپڕ کرد تا لێیرژا.

(إطَّفَحَ- القِدرَ): کەفی مەنجەڵەکەیگرت.

(ألطِفاح): پڕ/ لێوانلێو.

(ألطُفاحَـةُ): کـەفو ئـاوی سـەرکردووی مەنجـەڵ کە هەڵدەچێت/ بـە لێواریدا دێتە خوارێ.

(ألطَفحـان (م) طَفحی): ئەوەی بەملاولایدا دێتە خوارێو لێیدەرژێت.

(ألطافِحَةُ): مێی وشەی (ألطافِح).

(فَرَسٌ طَفَّاحُ القَوائِم): ئەسپێکە تیژڕەو کە چاك پێهەڵدەگرێت.

(ألمِطْفَحَة المِغْرَفَة): کەوگیر.

٢-(طَفِـحَ- الرَجُـلُ. طَفْحـاً وطُفُوحـاً) (عامية): بووڕایەوە/ لە هۆشخۆیچوو.

٣-(ألطَفحان (م) طَفحانَة) (عامية): تەمەڵی نازیرەك.

(الطافِحَة): وشكو برنگ.

الملحق:

(طفح: ألطَّفْح) (مص): ١-پڕبوونو لێڕژان/ سەرکردن

٢-(ج) (طُفوُح) (طـب): زیپکە کە لە لەش دەردەچێت.

---

طفـذ: (طَفَذَ- المَیتَ. طَفْـذاً): مردووەکەی (نایە گۆڕەوە/ ناشت).

(ألطَفْذ والطَفَذ (ج) أطْفاذ): گۆڕ/ گڵکۆ.

طفر (طَفَرَ. طَفْراً وطُفُوراً): قەڵەمبازدیدا/ بازدیدا.

(طَفَّرَ- اللَّبَنُ): شیرەکە توێژیگرت.

(-الفرسُ النَّهْرَ): ئەسپەکە/ چارەوێکە بازدی بەسەر چەمەکەدا دا.

(-الفَرَسَ النَهرَ): بەسەر چەمەکەدا بازدی بە چارەوێکە دا.

(أطْفَرَ-الفَـرَسَ النَهرَ): بەسـەر چەمەکەدا

بازدی به چارەوێکه دا.

(ألطَفْرَة): بازدان (-عند العامَة): لای ڕەشه خەڵکەکه زیپکه ورده که له لەشدێت.

(-مِنَ اللَّبن): سەرتوێژی ماست.

(ألطَّفْران) (عند العامة): هیچ بەدەســـتەوە نەبوو/ بێپارەو نابووت.

طفس: (طَفِسَ. طَفَساً وطَفاسَةً): پیسبوو.

(طَفِسٌ): پیس/ پۆخڵ.

(طَفَسَ- الرَجُلُ. طُفُوساً): مرد.

طفق: (طَفِــقَ- يَفعَلُ كذا. طَفْقاً وطُفُوقاً): دەستی دایه ئەو کارەو دەستی پێکرد.

(-المَوضِعَ): له شوێنەکەدا مایەوە.

(طَفَقَ-يفعلُ كذا طَفْقاً وطُفُوقاً): دەســتی دایه کارەکەو دەستی پێکرد.

(-بمُرادِه): به ئامانجی گەیشت/ ئامانجەکەی دەستگیر بوو.

(أطْفَقَ- هُ بمُرادِهِ): به ئامانجو خواستەکەی گەیاند.

طفــل: ١-(طَفُلَ. طُفولَــةً وطَفالَةً): نەرمو نۆڵو ناسکبوو.

(طَفَــلَ-هُ): بەزەیی پێداهاتــەوەو لەگەڵیدا نەرمبوو.

(«طفَّــلَ الرّاعي الإبلَ»): حوشــترەوانەکە/ شــوانەکە بەزەیــی به حوشــترەکاندا هاتەوە لەگەڵیاندا نەرمو هێواشــبوو تا بەچکەکانیان پێیانبگەن.

(أطْفَــلَ-تِ الأُنثــى): مێکه بــوو به خاوەن بەچکه/ بەچکەی بوو.

(تَطَفَّلَ):ڕەوشــتی منداڵانەیبــوو/ خــۆی منداڵکردەوە.

(ألطَفَــل (ج) طِفال وطُفُــول (م) طَفْلَة): هەموو شتێکی نەرمو نۆڵو ناسك.

(ألطِفْــل (ج) أطْفــال (م) طِفلَة): ١-منداڵو بەچکەی زیندەوەر ٢ هەموو شتێکی بچووك.

(«هو يَســعَى لي في أطفالِ الحاجات»): ئەو بۆ بچووکترین پێداویستیم دەگەڕێت.

(«جارِيَــةٌ طِفــلٌ وطِفلَــةٌ»): کەنیزەکێکی منــداڵ (لەوانەیه (طِفل) یەکێك یان کۆبێت چونکه ناوی ڕەگەزە.

(ألطِفــل): بەچکــەی هەمــوو دڕندەیەكو کێویلەیەك.

("ريح طِفلٌ"): بایەکی نەرم/ شنەبا.

(ألطِّفل) (مــص): دەمیو بــاری منداڵییو بچووکیی.

(ألطُفوليَّــة والطفالَــة والطُفولَــة): بــاری منداڵیی/ دەمی منداڵیی.

(أَلْمُطْفِل (ج) مَطافِل): منداڵدار/ بەچکەدار بۆ مرۆڤو دڕندە.

("لَيْلَةٌ مُطْفِلٌ"): شــەوێکی ســاردی منداڵو بەچکه کوژ.

٢-(طَفَلَ. طُفولاً): کەوته تاریکییەوە.

(-تِ الشَّمسُ): خۆر نزیکی ئاوابوونبوو.

(أَطْفَلَ): کەوتە تاریکییەوە

(-تِ الشَّمسُ): خۆر لە ئاوابووندا سوورهەڵگەڕا.

(ألطِفل): ١-شەو ٢-خۆری زەردەپەڕ/ نزیك ئاوابوون.

(ألطَفَل): ١-تاریکیی.

(طَفَلُ الغداةِ): تۆزێك پاش خۆرهەڵاتن.

طَفَلُ العَشِيِّ): دەمەدەمی خۆرئاوابوون.

٣-(طَفِـل وطُفِّلَ- النباتُ طَفَلاً): ڕووەکەکە خۆڵ گرتیو باڵاینەکردو درێژ نەبوو.

٤-(طَفَّلَ- الرَجُلُ): کابرا بوو بە مشەخۆر.

(تَطَفَّـلَ): بـوو بەمشـەخۆر یـان خۆی لە کاروباری ئەمو ئەو هەڵقورتاند.

(ألطُفَيلِـيّ): مشـەخۆر/ کەسـێکە دەچێتە سـەرخوانێك بێئـەوەی بانگیبکەن وشـەی (طُفَيلي) لە ناوی کابرایەکەوە وەرگیراوە کە ناوی (طُفَيل) بووە.

(طُفَيلي): (ن،ح) ڕووەکێك یان زیندەوەرێك لەسـەر ڕووەكو زیندەوەرێـتر بـژی وەکـو (الجُعْفيل): گورگە/ گیاکەڵە. وەکو (الدِبْق): دەمووکانەی بـەڕوو کە ڕووەکـنو (القَمْلَة) ئەسـپێو (البَرغوث): کێچ کە زیندەوەرنو لەسەر زیندەوەریتر دەژین.

٥-(طَفَّلَ- الكَلامَ): ئاخاوتنەکەی هەڵسنگاندو ڕێکخستو بیری لێکردەوە.

(أَطْفَـلَ- الـكَلامَ): قسـەکەی ڕێکخسـتو هەڵسەنگاندو بۆی هات.

٦-(ألطِفْـل): ١-پێداویسـتیی/ نەبوونیـی ٢-پریشکی ئاگر.

(«تَطايَـرَت أطفالُ النَّارِ»): پریشـکی ئاگر بەزربووەوەو بڵاوبووەوە.

(ألطُفال والطَفال): قوڕی وشکەوە بوو.

الطَفيل: قـوڕاو/ ئاوی لیخن کە لە گۆلەکەدا دەمێنێتەوە.

طفن: (طَفَنَ. طَفْناً): مرد.

(-هُ): بەندیکرد.

(إطْفَأَنَّ-المَكانُ): شوێنەکە نزمبوو.

(-الرَجُلُ): ڕەوشتی پیاوەکە چاکبوو.

(ألطَفانين): ١-درۆودەلەسـە ٢-قسـەی هیچو پووچ ٣-بەندیی/ بەندبوون.

طفـا: ١-(طَفـا. طَفْـواً وطُفُـوّاً): کەوتـە سەرئاو.

(ألسَـمَكُ الطافي): ماسیی سـەرئاو کەوتوو/ ماسیی مردووی سەرئاو.

(طَفا- الظَبيُ): ئاسـکەکە گوری دایە خۆیو تیژ تێیتەقان/ ڕایکرد.

(-فَوقَ الفَرَس): بازیدایە سەر ئەسپەکە.

(ألطَفاوَة): ١-کەف کە سەر مەنجەڵ دەکەوێت.

(«أَصبنا تفاوَةً مِن الرَّبيعِ»): شتێکی بەهارمان بەرکەوت ٢-خەرمانەی مانگ یان خۆر.

(ألطَفْوَة): گیای تەنك.

٢-(طَفا- فُلانٌ طَفواً وطُفُوّاً): مرد.

(-فِي الأَرضِ): به زەویدا چوو.
٢-(أَلطُفيَة (ج) طُفـىً) (ح): جۆرە مارێكی پیسی كوشندەیە.
طق: ١-(طَقْ): تەقەی بە یەكبەركەوتنی دوو بەرد.
٢-(طَقطَـقَ-تِ الـدَّوابُ طَقطَقَةً): سـمی چوارپێكە تەقەیهات.
طقـس: (أَلطَقْـس (ج) طُقُـوس): رِێگە/ چۆنیەتی بەرِێوەبردنو شـێرازەو رِێكخستنی بۆنەو نەریتی ئایینی.
(-عند العامَّة): باری ئاوو هەواو ئەو گۆرِانەی بەسەریدا دێت (یونانیة).
(أَلطَقْسُـوس) (ن): عەرعـەر/ هەڤریسـك. درەختێكـی لەبەرچـاو جوانە لـە كۆمەڵەی سـنەوبەرە لە دارستانەكانی ئەوروپاو ئاسیاو ئەمەریكای باكوور دەبینرێـتو دەروێت. لە سـوریەو لوبناندا نییە لـە توركیادا هەیە بە زۆریی لـە باخچە گشـتییەكاندا دەروێنرێت دارەكەی چاكە.
الملحق:
طقم: (أَلطَّقْم (ج) طُقوم وطُقُومَة): ١-تاقم/ قـات قاتی جلی پیاوانە كە چاكەتو پانتۆڵەو یەلەگیشـە ٢-دەسـتەیەكی تەواوی كەرەسەو ئامێری ئامانجێكی تایبەتییە وەك تاقمی چا. تاقمی دان كە دروستدەكرێت.
(طَقْمُ الفَرَسِ): كەرەسەی چارەوێ.

طَلّ: ١-طَلَّ- الغَریـمَ طَلاً): خاوەنوامەكەی خایاند دەستیدەستیی پێكرد.
(-هُ حَقَّـهُ): مافەكـەی كەمكـردەوە یـان خواردی.
(طَلَّ وطُـلَّ- الدَمُ,. طَلاً): خوێنەكە رِژا یان بە فیرِۆ چوو/ تۆڵەی نەسەندرایەوە.
(طلیل ومَطلـول): خوێنی رِژاو یان بە فیرِۆ چوو.
(أَطَلَّ- على حَقِّي): دەستی بەسەر مافەكەمدا گرتو زەوتیكرد.
(-الدَّمَ): خوێنەكەی رِژاندو بە فیرِۆیبرد.
("أَطَـلَ على فُلان بالأَذى"): بێبینە سـزای فیساریدەدا.
(أُطِـلَّ الدَّمُ): خوێنەكە رِژا یان بە فیرِۆ چوو تۆڵەی نەسێنرا.
(مُطَلّ): خوێنی رِێژراوو تۆڵەنەسێنراو.
(أَلطُلاَّء): خوێنی بە فیرِۆچوو.
٢-(طَـلَّ-تِ السماءُ الأَرضَ طَـلاً): ئاسمان رِشـێنـەبـارانـێـكـی بـەرزەویـەكـە خست/ نمەبارانمێكی لێدا.
(أَلطَـلّ (مـص) (ج) طِـلال وطِلَـل): ١-بارانێكی كەم/ نمەنمەباران/ رِشێنە بارانێك ٢-ئاورنگ.
(أَلطَلَّة): ١-جارێك خوێـن رِژانو یان بەفیرِۆ رِۆیشـتن. جارێـك رِشـێنەبارین ٢-باخچـە رِشـێنەباران تەرِیكردبێـت یـان ئاورنگـی

لێباریبێت.
(أَلْمَطْـول (مفع)- مِنَ الأماكِن): شـوێنانێك ئاورنگـی بەرکەوتبێـت یـان ڕشـێنەیەکی لێباریبێت.
(أَلْمَطَلّ): تەم.
٢-(طَلَّ-هُ بالدِهْنِ. طَلاًّ): ڕۆنی تێهەڵسوو.
(طَلَلُ السَـفينَةِ): سـەر پاپـۆر/ چادرێکە/ سەرێکە پاپۆرەکەی پێدادەپۆشرێت.
٤-(طَلَّ- الإبِـلَ. طَلاًّ): توند حوشـترەکانی لێخوری/ ڕایفراندن.
٥-(طَـلَّ- الشَـيءُ فلاناً طَلالَةً): شـتەکەی لاجوان بوو بەدڵیبوو/ دڵی ڕاکێشا.
(أَلطَلّ): چاك و جوانی/ دڵکێش.
(أَلطَلَّـة): ١-مێی وشـەی (أَلطَـلّ): جوانیو چاکـی دڵکێش ٢-بۆنی خـۆش ٣-مەیی خۆش ٤-ژن/ هاوسـەر ٥-نەرمو شـلیی بەرگو چێژ خۆشیی خواردن.
(أَلطَلالَة) (مص): ١-سەروسیمای ڕێكو جوان/ قۆزییو قەشەنگیی/ شۆخیی ٢-ڕەوشی باشو خۆشگوزەرانی ٣-خۆشییدڵ/ کەیفخۆشی.
٦-(أَطَلَّ- الزَّمانُ): سەردەم/ زەمان نزیکبوو هاتە بەرەوە.
(_عليه): سەریکەوتو بەسەریدا ڕوانی.
(تَطَـالَّ): ملـی درێژکرد بڕوانێتە شـتێکی دوور.
("تَطالَلْـتُ له"): ملم درێژکـرد لە دوورەوە تێمڕوانی/ تەماشامکرد.
(إِسْتَطَلَ- عليه): بەسەریدا ڕوانی.
(-الفَـرَسُ ذَنَبَهُ وبِذَنبِـهِ): چارەوێکە کلکی بەرزکردەوە.
(أَلطُلَّة (ج) طُلَل): گەردن/ مل.
(أَلطَلَـل (ج) أَطْـلال وطُلُـول): ١-بەرزایی ٢-پاشماوەی کەلاوەی کۆن ٣-جوستەو قەڵافەتی هەموو شتێك.
(«أَعْجَبَنـي طَلَهُ وراقَنـي هَيْكَلُهُ»): لەشو قەڵافەتو خۆیم بەدڵبووو پێم سەیر بوو.
(أَلطَلَل- مِنَ الدار= المَسْطَبَة): سەکۆی خانوو کە لە سەری دادەنیشن.
(طَلَل- الماءِ): ڕووی ئاو.
("مشـي علـى طَلَلِ المـاءِ"): بەسـەر ڕووی ئاوەکەدا ڕۆیشت.
(أَلطَلالَة): بەدەنی ئەو شتە خۆی یان بەشی بەرچاوی هەموو شتێك.
(أَلْمَطَلّ): ڕوانگە/ تەماشـاگا/ شوێنی بەرز کە لێوەی بەسەردا بڕوانرێت.
٧-(أَلطَلّ): ١-پیاوی (تەمەنگەورە/ بەتەمەن) ٢-(ح) مار.
(أَلطَلّ والطُلّ): ١-شـیر، ماسـت. بەخوێنیش دەوترێت ٢-کەمیی شیری حوشتری.
(أَلطِلّ) (ح): مار.
(أَلطُلَّة (ج( طُلَل): جارێك خواردنەوەی شیر.
(أَلطَليل (ج) طِلَّة وأَطِلَّة وطُلُل): حەسیر کە

لە پەلی دارخورما یان شتیتر بچنرێتو کۆنو دراو بێت.
٨-(طَلْطَلَ-ەُ): بزواندی/ جوولاندی.
(ألطُلَطِل والطُلَطِلَة): وەی/ کۆست/ چورتوم.
(ألطُلاطِل): ١-مردن ٢-دەردی بێچارە.
(ألطُلاطِلَة): ١-چورتوم/ وەی/ بەلآ ٢-مردن/ مەرگ ٣-زمانە بچکۆلە.
(طُنْطُلَة) (عامية): زمانە بچکۆلە.
طلــب: ١-(طَلَبَ- الشــيءَ طَلَباً): شــتەکەی (خواست/ داواکرد) شتەکەی ویست.
(-إلَيهِ): لێی داواکرد.
("طَلَبَــهُ الى المُبارَزة"): بانگیکرد شەرمشــیر بکەن یان بەرەنگاری یەکبین.
(طَلَــبَ- بِدَمِ فُــلانٍ فُلانــاً): داوای خوێنی فیساری لە فیسار کەسکرد.
(-فُلانَةً): خوازبێنی ئەو ئافرەتەیکرد.
("طَلَبَها مِن أبيها فَطَلَّبَهُ إياها"): خوازبێنی کچەکەی لە باوکیکرد ئەویش دایە (عامية).
(طَلَّــبَ- الشــيءَ): شــتەکەی بــۆ ماوەیەك خواست.
(طالَبَ-ەُ. طِلابــاً ومُطالَبَةً): داوای مافێکی یان شتێکی خۆی لێکرد کە لەلای ئەو بوو.
(ألطَلَب والطِلْبَة): داواکاریی/ داواکردن.
(أطْلَبَ-ە): ناچاری داواکردنیکرد یان ناچاری پارانەوەیکرد.
(«أطْلَبَهُ الفَقْرُ»): نەبوونی/ هەژاریی ناچاری داواکردنیکرد.
(أطْلَــبَ-ەُ) (ضد): ١-ئــەوەی داوایکرد دایە/ داخوازییەکــەی جێبەجێکــرد ٢-دەســتی بە روویــەوە نــاو نەیدایــە یــان بــە دەنگیەوە نەچوو.
(تَطَلَّبَ واطَّلَبَ- الشــيءَ): شــتەکەی خۆش خۆش/ بە گەرمییو هەتەرەوە داواکرد.
(ألطِلــب (ج) أطْلاب وطِلبَــة): ١-داواکاریی/ داخوازیی/ ئەو شــتەکەی کە داوا دەکرێت ٢- داواکار/ خوازیار.
(ألطِلْبَــة): ١-داواکــردن/ داخوازیی ٢-جۆری داخوازییەکە/ داواکردنەکە.
(ألطِلْبَــة و الطَلِبَة): ئــەوەی (دەخوازرێت/ داوادەکرێت).
(ألطَلِبَــة): جارێك/ داواکردن/ داخوازیکردن ٢-نــزاو پارانەوە. وەك هینەکــەی حەزرەتی مریەم.
(ألطالِــب (فــا) (ج) طَلَبَة وطُــلاّب وطَلَب وطُلَّب): قوتابی/ خوێندکار.
(ألطَلــوب (ج) طُلُــب والطَليــب (ج) طُلَبَــاء والطَلاّب): فرەخواز/ زۆرداواکەر بە هەتەرەوە.
(ألطَليبَــة (ج) طلائِــب): مێــی وشــەی (ألطَليب).
(ألمَطْلَــب (ح) مَطالِــب): ١-داواکاریــی/ خواســت ٢-مەبەست/ ئامانج/ نیاز/ مەرام ٣-(باس/ بابەت)ی زانستی ٤-باسێکی دیار کە هونەرمەند وەریدەگرێتو

بە ئـارەزووی خـۆی هەڵیدەسـووڕێنێتو بەئەنجامیدەدات.

(اَلمَطلُوب (مفع) (ج) مَطاليب): ١ـداواكراو/ مافێـك یا شـتێك كە بخوازرێـتو بە دوایدا بگەڕێیت/ مەبەستبوو ٢ـ(ع ح): داواكراو.

٢ـ(طَلِبَ. طَلَباً): دووركەوتەوە.

(أَطْلَبَ- الماءُ): ئاوەكە دوور كەوتۆتەوەو بەبێ ماندوێتیو بەدوایدا گەڕان دەستگیر نەبێت.

(اَلطُلُبَة): گوزاری دوور.

(بِئـرٌ طَلوب): چاڵاوكـی/ بیرێكی قووڵ كە ئاوەكەی دوور بێت.

(مـاءٌ مُطْلِـب): ئاوێكـی دوور هـی بیرێكی قووڵ.

الملحق:

طلـب: (اَلطَّلَب): ئـەوەی كـە دەتەوێت بە یەكێـك یان زۆرتر بڵێیـت/ پێیرابگەیەنیت. ئارەزووەكـەت یـان نیـازو ئامانجەكەتی بۆ دەربڕیت.

(«طَلَـبُ المَعُونَـة»): داوای كۆمەكیـی یـان ياربووكردن.

(طَلَـبُ الإِسْـتِخدام): داوای كارپێكـردن/ كاركردن.

(طَلَبُ الشَيء الذي تَرْغَبُ في الحُصُولِ عَلَيهِ): داوای ئەو شتەی دەتەوێت دەستگیرتبێت.

(«ماهُـوَ طَلَبُـك»): چـی دەخوازیـت/ چیتدەوێت.

(أَلطَلَب: الإستِدْعاء والإِسْتِحضار): بانگكردنو هێنانو ئامادەكردن.

(«أَرسَلَ في طَلَبِهِ»): ناردی بەدوایدا بیهێنن.

(أَلطَلَب): داواكردنی شتێك.

(«يُدفَع عند الطَلَب»): ئەو شتە كە لە كاتی داواكردنی خۆیدا بدرێت.

(-الطَلَب): بە نووسـین داوای شتێك بكەیت، ئارەزووی شتێك بكەیت.

(«سِجِل الطَلَبات»): تۆماری داواكان.

(التَوصِيَـة بارسـال كَمِيَّة مِـن البضاعَة): ئامۆژگاریی ناردنێك برە كاڵایەك.

(أَلبضاعَـة المَطلوبَـة): كاڵا داواكـراوەكان/ خواستدراوەكان.

(«سَلَّم الطَلَب»): كاڵا خواستراوەكانی بەدەست گەیاند.

(أَلـعَـرَض والـطَـلَـب): خستنەبەرچاوو بازاڕبوونی كاڵاو ئەو برە كاڵایەیە كە كڕیار دەیەوێت بیكڕێت بە نرخێكی دیاریكراو بفرۆشرێت.

(أَلطَلَـب): جـۆرە دارشـتنێك پێچەوانە یان ئاوێنەی كارو نیازێكبێت.

(-طلـب المَحـال): خوازیاریـی شـتێك كە نەیەتەدی.

(أَلطَلَبـات في قانون المُرافَعات): داخوازیی لە یاسای دادبینیدا.

(«حاصل مايتقدم بـه الخصم الى المحكمة

مُلْتَمِساً الحُكمَ في الدعوى»): هەموو ئەو داواکارییانەی کە بەرامبەرەکە پێشکەشی دادگای دەکات تکاکارە بە پێی داواکانی بڕیاری لەسەر بدەن.
(ألطَلَبِيَّة): بڕی کاڵای داواکراو کە دەبێت بنێررێت.
(البضاعَة المطلوبَة): کاڵای داواکراو.
(«سَلَم الطَلَبِيَّة»): کاڵای داواکراوەکەی گەیاندە دەست.

---

طلث: (طَلَثَ- الماءُ طُلُوثاً): ئاوەکە کشاو ڕۆیشت.
(طَلَّثَ- على كذا): لەوەیتر بوو.
(ألطُلْثَة): نەفامێکی لەش و مێشك چرووك.
طلح: ١-(طَلَحَ-البَعيرُ طَلْحاً وطَلاحَةً): حوشترەکە ماندوو شەکەتبوو.
(طَلْح وطِلْح وطَليح): ماندوو شەکەت/ پەککەوتە.
(طَلَحَ- البَعيرَ): حوشترەکەی مانوو کرد.
(طَلِعَ. طَلَحاً): ناوسکی/ ورگی چۆڵبوو/ خواردنی هیچ تێدا نەبوو.
(طَليح وطَلْح وطِلْحٌ): ورگچۆڵ.
(طُلِحَ): ورگی چۆڵبوو.
(طَلِح وطَلْح وطِلح): ناوسکچۆڵ/ ورگچۆڵ/ برسی.
(طَلَّحَ- البَعيرُ): ماندوو بوو.
(أطْلَحَ- البَعيرَ): ماندوویکرد.
ألطِلح (ج) أطْلاح وطِلاح: پەککەوتە.
(«بَعيرٌ طِلْحٌ وناقَة طِلْحٌ»): ١-حوشترو مێحوشترێکی پەککەوتە ٢-لەرکەوتە.
(ناقَةٌ طالِحٌ وإبلٌ طُلَّحٌ): مێحوشترو حوشترێکی رووخاوو پەککەوتەی کاروانی زۆر/ شەکەت.
(ألطَليح): ماندووی شەکەت/ پەککەوتە.
(«بَعيرٌ طَليحَة (ج) طَلائِح وطَلْحى»): پەککەوتەی کاروان ٢-لەرولاکەوتە.
٢-(طَلَحَ. طَلاحاً): ١-گەنبوو/ خراپبوو/ بەدکار بوو ٢-پەکیکەوت/ سەقەتبوو.
(ألطالِح (فا) (ج) طالِحون وطُلَّح): ١-بێکەڵك/ بێکارە ٢-گەن.
٣-(طَلِحَ- تِ الإبلُ طَلَحاً): حوشترەکە بە خواردنی دارگەون ژانیکرد.
(ألطَلْح والواحِدَةُ طَلْحَة) (ن): دارگەون. دارێکی گەورەیە گەومن دەگرێت دڕکاوییە گەونەکەی چاکە حوشتر لەسەر ئەو دارە دەلەوەرێت.
(ألطَلْح): مۆز.
(مَكانٌ طِلْحٌ (م) طَلِحَة): شوێنێکەداری گەومنی زۆر لێیە.
(ألطِلاح) (ن): درەختی گەومن.
٤-(طَلَّحَ- على فُلان): پێپلێداگرت/ زۆری لێکرد.
٥-(ألطَلْح الواحِدَةُ طَلْحَة): هەڵاڵەدانی دارخورما یان هەڵاڵە کە تۆوی نێری

دارخورمایە.
(ألطِلْح (ح): گەنە.
(ألطَلَح): خۆشگوزەرانیی.
("هو في طَلحٍ"): ئەو خۆشگوزەرانە.
(ألطَليح) (ح): گەنەوزچ.
(ألطَلْحِيَّـة) (ج) طَلاحِـيّ) (آرامية): پەرە کاغەزێك.
طَرحِيَّة (عامية): پەرەکاغەزێك.
(ألمُطَلِح- في المـال): زۆردارو چنگیر لە دارادا دەستنووقاو.
(-في الكلام): لە قسەدا بوختانکەر/ قسەچن.
طلـخ: ١-(طَلَخَ-الشـيءَ طَلْخاً): شـتەکەی رەشکرد.
(طَلَخَ- الكتابَةَ): نوسینەکەی تێکدا.
(فُلاناً بالقَذِرِ): پیسـایی لە فیسار هەڵسوو/ پیسیکرد.
(ألطَلْخ): ئاوی پیس/ بۆگەناو.
٢-(إطَّلَخَ- الدَمعُ): ١-ئەسـرین/ فرمێسکەکە بە چاودا هاتەخوارێ ٢-بڵاوبووەوە.
٣-(ألطَلْخاء): ئافرەتی گەوج.
٤-(إطْلَخَمَّ-الرَجُلُ): فیزینواند/ لووتبەرزیی کرد.
(أُمورٌ مُطَلخمّات): کاری سەختو نالەبار.
طلـس: ١-(طَلَسَ- البَصَرُ طَلْسـاً): چاوەکە پووکایەوە/ نابینابوو.
(طَلَسَ- الكِتابَةَ): نووسـینەکەی سڕییەوە/ کوژاندیەوە.
(طَلَسَهُ بالدِهان ونَحْوَهُ) (عامية سريانية): بە بۆیە سڕییەوەو بۆیەی تێهەڵسوو.
(طُلِسَ-بِهِ في السجن): فڕێدرایە بەندیخانەوە.
(طَلَّسَ-الكِتابَةَ): نووسینەکەی سڕییەوە.
(تَطَلَّسَ- الكتابُ): نووسـینەکە سـڕرایەوەو نەما.
(إنْطَلَسَ-الأمـرُ): کارەکـە (شـاردرایەوە/ ونبوو).
(إطْلَنْسى- العَرَقُ إطْلِنساءً): ئارەق بە هەموو لەشەکەیدا هاتەخوارێ.
(ألطِلْس (ج) أطْلاس): لاپەڕەیەکی سڕراوە.
(الطلاَّسَـة): تەختەسـڕ/ پـەڕۆی سـڕینی تەختەرەشەکەو کوژانەوەی نووسینەکە.
(ألطَليس): کوێر/ نابینا.
٢-(طَلِسَ وطَلُسَ. طَلَسـاً وطُلْسَةً): دێزێکی مەیلەو رەش.
(أطْلَس (ج) طُلْس): دێزێك بە سـەر رەشدا بڕوانێت.
(ألطِلْس): تەیلەسانی رەش.
(ألطِلْـس (ج) أطْـلاس): بەرگـی چڵکنـی رەشـداگەڕاو. لەبـەر بۆزیـی (بـە گـورك چوێنراوە).
(ألطُلْسَة (مص) (ج) طُلَس): ١-دێزی مەیلەو رەش ٢-هەوری تەنك.
(ألأطْلَـس): ١-گورگـی تووکومەڕیـوی دێـزی

مەیلـەوڕەش ٢-بەرگـی دڕاو ٣-چڵکنو پیس ٤-دز (کە بە گورگی تووکوەریو) چوێنراوە.

٣-(تَطَلَّسَ وتُطَيلَسَ- الرَجُلُ): تەیلەسـانی لەبەرکرد.

(اَلطَيلَس (ج) طَيالِس والطَيْلَسان والطَيْلِسان والطَيْلُسـان (ج) طَيالِـس وطَيالِسَـة): پۆشاکێکی سـەوزە شـێخو زانایان دەیپۆشن ئەمەیـش پۆشـاکی عەجەمەو هـی عەرەب نییە.

(اَلأَطْلَـس): بـەرگـێکـە لـە ئـاوریـشـم دروستکراوە.

٤-(طَلْسَـمَ- عَـنِ القِتـالِ): خۆی لە شـەڕ دزییەوە ترساو هەڵات.

(-الرَجُلُ): سەریداخسـتو گـرژو مۆنبوو/ خۆی ناشیرینکرد.

(-السـاحِرُ): جادووگەرەکە/ ئەفسوونبازەکە ئەفسوونو جادووینووسیو جادویکرد.

(اَلطِلَسـم (ج) طَلاسِـم والطِلَّسـم (ج) طِلَّسْـمات) (یونانیة): هێڵو نووسینێکە کە ئەفسـوونبازەکە دەیکێشـێتو دەینووسـێت دەڵێـت: گوایـا هەمـوو ئـازارو وەیـەك دووردەخاتەوەو لە خراپەکارێك دەیپارێزێت.

طلـع: ١-(طَلَـعَ- الكَوكَـبُ ونَحـوهُ طُلُوعاً ومَطْلَعـاً ومَطْلِعـاً): هەسـارەکە یـان هیتر هەڵهاتو دەرکەوت/ هاتەدەرێ.

(طَلَـعَ وطَلِـعَ و طَلُـعَ- النَّخـلُ. طُلُوعاً): دارخورماکە تۆودانی دەرکرد.

(أَطْلَـعَ- الكَوْكَـبُ): هەسـارەکە هـەڵات/ دەرکەوت.

(-الفَجـرَ): ڕوانییـە سـپێدەییەیان کاتـی دەرکەوتنی.

(-النَّبـاتُ): ڕووەکەکـە سـەری دەرهێنـاو دەرکەوت.

(-النَّخلُ): دارخورماکە تۆودانەکەی دەرکرد.

(-الشَجَرُ): درەختەکە گەڵایدەرکرد/ گەڵایگرت.

(-تِ النَخلَةُ): دارخورماکە باڵایکرد.

(-الرَجُلُ): ڕشایەوە.

(تَطَلَّـعَ- هُ): تەماشـای قـەدو باڵایکـرد/ پێیداهەڵیڕوانی.

(إِطَّلَعَ-الفَجرَ): ڕوانییە سـپێدەییەیان کاتی دەرکەوتنی/ دەرکەوتنی خواست.

(إِسْتَطْلَعَ-هُ): ١-داوای دەرکەوتنیکرد ٢-هەواڵی کاروباری پرسی.

(اَلطَلْع- مِنَ النَّخل) (ز): ١-شـتێکە وەك دوو تاکـی پێـڵاو یەکیانگرتووەو تـۆوی تێدایە/ تۆودانی دارخورما ٢-بەری خورمای سـەرەتا دەرکەوتوو ٣-هەڵاڵە/ تۆزێکی زەردە تۆوی نێری ڕووەکە. کە لە تۆودانی دارخورمایشدایە.

(اَلطَلْعَـة): ١-جارێـك هەڵاتـن/ دەرکەوتـن ٢-سـەردەرهێنانو هاتنـەدەرەوە ٣-بینـینو سەرنجدان ٤-ڕوخسار/دیمەن.

(إِمْـرَأَةٌ طُلَعَـة): ئافرەتێـك زۆر بڕوانێتـە

ئەملاولا.
(«نَفْــسٌ طُلَعَــةٌ»): دەروونێــك زۆر ڕوو لە حەزو ئارەزوویبێت.
(اَلطُّلَعاء والطَولَع): ئێلنجدانو ڕشانەوە.
(اَلطَّليعَة- مِنَ الجَيش (ج) طلائِع): پێشەنگی سوپا/ سوسەکەری سوپا/ دەیدەوانی سوپا.
(اَلطالِع) (فا): ١-دەرهاتوو.
٢-الهِلال: هەیڤ/ داسەمانگ.
٣-(الفجر الكاذِب): سپێدەدرۆزنە.
(اَلطالِــع (ج) طوالِع عند أصحــاب الفَأْل): شــانس بەخت لــەلای ئەوانەی بە هەســارە دەرچــوون بەختدەگرنــەوە بەختەوەربێت یان بەدبەختبێت/ بیشانسبێت بێبەختبێت/ چارەرەشبێت.
(اَلطَلُوع= الطالِع): شانس/ بەخت.
(اَلطُلُوع (ج) طُلُوعــات (عامية): دوومەڵی گەورەی لەش.
(اَلمَطْلَــع (مــص) (ج) مَطالِــع): ١-ســەرەتا ٢-شوێنەدەرکەوتنو هەڵاتنگەی هەسارەکان.
(-عِنــدَ الزَّجّالــين): ســەرەتای گۆرانیــی (زەجەل).
(مَطْلَع) (مو): سەرەتای پارچە مۆسیقایەك.
(مَطلَع القَصيدَة): ســەربەندی هەڵبەســت/ یەکەمدێری هەڵبەست.
(اَلمَطلِــع (مــص) (ج) مَطالِــع) (فــك): هەڵاتنگەی هەسارەکان.

٢-(طَلَــعَ وطَلِــعَ – الجَبَلَ. طُلوعاً): ســەر (چیاکە/ شاخەکە) کەوت.
(طَلَّعَ- الكَيْلَ): پێوەرەکەی پڕکرد.
(أَطْلَعَ- الرامي): تیری تیرهاوێژەکە سەریکرد/ بەسەر نیشانەکەدا ڕۆیشت.
(-علــى الشــيءِ): ١-لــە بەرزییەوە بەســەر شتەکەدا ڕوانی ٢-سەرپەرشتیکرد.
(تَطَلَّعَ- المِكيالُ): پێوەرەکە پڕبوو.
(-الماءُ مِنَ الإناءِ): ئاو لە قاپەکەوە سەریکردو ڕژا.
(-الرَجُلَ): گەیشتە پیاوەکەو پێشیدایەوە.
(اَلطَلْع): پڕ/ هەند/ چەند.
(اَلجَيْــشُ طَلْعُ أَلفٍ): ســوپاکە بــڕی هەزار کەسن.
(اَلطَلْع والطِلْع): ڕوانگە/ شــوێنێك کە بەرز بێتو بەسەردا بڕوانێت.
(اَلطِلاع- مِنَ الإِناء (ج) طُلْع): پڕی قاپ.
(طِلاعُ الشيءِ): هێندەی شتەکە.
(هذا طِلاعُ هذا"): ئەمە هێندەی ئەومیە.
(عَينٌ طِلاعٌ): چاوێکی پڕ لە فرمێسك.
(قَدَحٌ طِلاعٌ): پیاڵەی پڕ.
(اَلطَلّاعُ): زۆر (دەرکەوتوو/ سەرکەوتوو).
(«هُوَ طَــلاعُ الثَّنايا والأَنْجُــدِ»): ئەو خۆی دەهاوێتە کاری سەختو زاڵبوو و سەرکەوتووی کاری بەرزو گرانە یان خاوەنئەزموونەو چاك تەگبیردەکات.

(أَلمَطْلَـع والمَطْلِـع (ج) مَطالِـع): ١-پەیژە/ پلیکانــە/ پێپیلکــە ٢-ئەوەی کە بەســەریدا دەروانرێت ٣-سەرەتا.

(أَلمُطَّلِع):١-ئاگادار/ تێگەیو ٢-بەهێز/ بەتوانای دەستبالاو بەرز/ بەزەبرو زەنگ.

٢-(طَلَـعَ وطَلِـعَ – علــى الأَمــرِ طلوعاً): بەکارەکەیزانی/ ئاگاداری کارەکە بوو.

(طالَـعَ- ەُ مُطالَعَــةً وطِلاعــاً): زۆرو چاك سەرنجی لێداو لێیتێگەیشت.

(-الكِتابَ): كتێبەكەی خوێندەوە.

(-ەُ بالأَمــرِ): كارەكــەی خســتە بــەردەمو لێیئاگاداركرد.

(«طالِعْنــي كُلَّ وَقــتٍ بِكُتُبكَ»): هەمیشــە نامەكانتم بۆ بنێرەو پیشانم بدەو.

(أَطْلَعَ-ەُ طِلعَ أَمرِهِ):كارەكەی بۆ ڕوونكردەوەو تێیگەیاند/ بۆیدەرخستو یەكالاكردەوە.

(-على سِــرِّهِ): نهێنییەكەی بۆ دەرخســتو گەیاندێ.

(تَطَلَّعَ-ەُ): پێیزانی/ ئاگاداریبوو.

(إِطَّلَــعَ- الأَمــرَ وعليه): بــە كارەكەیزانیو لێیئاگادار بوو.

(إِطَّلَــعَ وطِلْــعَ- العَدُوَّ): بە نیــازی دوژمنی زانی/ زانی چی لە ژێر سەریاندایە.

(إِسْــتَطلَعَ- ەُ): لە ڕاســتیو نیــازو كارەكەی ئەوی پرسی/ لێیپرسی.

(-رَأيَ فُلان واسْتَطلَعَ-ەُ رَأيَهُ):(ڕای/ بۆچوونی ئەوی وەرگرت/ ڕاوێژی پێكرد.

(أَلطِلَــع): نیــاز پێزانــین/ لێئاگاداربــوون/ لێتێگەیشتن.

("أَطْلِع طِلعَ العَدُوِّ"): لە نیازی دوژمن بگە.

(أَلطَليعَــةَ- مِــنَ الجَيــش (ج) طلائِــع) (ا ع): دیدەوانی ســوپا/ پێشــڕەوی لەشكر (تا بزانــن دوژمــن لە چیدایە) (بە تــاكو كۆ وا دەوترێت).

(مَطْلَعُ الأَمرِ): سەرەتای كار. بنچینەو شوێنی لێدەركەوتنی كارو ڕووی تێكردنی كارو نیاز.

٤-(طَلَعَ- عَلَيهِم. طُلوعــاً ومَطْلَعاً ومَطْلِعاً) (ضد): ١-بۆ لایان هات ٢-لێیان دووركەوتەوە.

(طَلَعَ- عَنْهُم): لێیــان دووركەوتەوەو لەبەر چاویان ونبوو.

(طَلَــعَ وطَلِعَ البِــلادَ. طُلوعــاً): ڕوویكردە شارەكە/ نیازی (شارەكەیكرد/ ولاتەكەیكرد).

(-المَكانَ): گەیشتە شوێنەكە.

(-مِــنَ البِــلادِ): لــە ولاتەكە یان شــارەكە دەرچوو.

(أَطْلَعَ-عليه مَعروفــاً): چاكەیەكی لەگەلْدا كرد.

(-على فلان): لە ناكاو هاتە لایو گەیشتێ.

(إِطَّلَــعَ- عَلَينا): لە پڕێكا/ لــە ناكاودا هاتە لامان.

(أَلطَلْع والطِلْع): كەنار/ لا.

(أَلمُطَّلَع) (مفع): ١-هاتگە ٢-بەرزە شــوێن كە

لێوەی دەڕوانرێتە خوارەوە یان شـوێنی لێوە ئاگاداربوون ٣-شوێنی لێوەدەرچوون.

٥-(أَلطِلع) (ح): مار.

الملحق:

طلـع: (أَلُمطالَعَـة): خوێندنـەوە بـە نیازو ئامانجـی ڕۆشـنبیریی‌و وەرگرتنی زانسـت‌و زانیاری.

(«أَلُمطالَعَـة لَـذَّةٌ وفائِـدَة»): خوێندنـەوە خۆشیشەو سوودیشە.

(أَلُمطالَعَـة في إصطِلاح الحاكِـم): تێڕوانین لـە زاراوەکانـی دادگـادا: لێکۆڵینـەوەو خوێندنەوەیەکی یاساییە.

(«مُطالَعَةُ مُفَوَّض الحکومَة»): خوێندنەوەو تێڕوانین‌و پێداچوونەوەی نوێنەرو ڕێپێدراوی میری.

---

طلف: ١-(طَلَفَ-عَلَیهِ): لێیپتر کرد.

(أَلطَلف): (لێپتری/ لێزۆربوونی) شتێك.

٢-(أَطْلَـفَ-هُ کـذا): ئەوەی بۆ خستەسـەرو پێیبەخشی.

(أَلطَلَـف): ١-بەخشـین ٢ سـووکە شـتێك/ کەمەکێك.

(أَلطَلیف): وەرگیراو.

٣-(أَطْلَـفَ- الـدَمَ): بە ناهەق/ بـە خۆڕایی خوێنیڕشت.

(أَلطَلَف والطَلْف): بە خۆڕایی خوێنڕشـتن/ بە فیڕۆ بردنی خوێن.

("ذَهَبَ دَمُهُ طَلَفاً"): خوێنی بە فیڕۆ ڕۆیشت/ بە نارەوا ڕۆیشت.

(أَلطَلیـف): ١-بـە فـیڕۆ بردن/ بـە ناهەق ٢-نارەوا/ نەشیاو.

طلق: ١-(طَلَقَ-الشيءَ فُلاناً طَلْقاً): شتەکەی بە فیسار دا.

(طَلَقَ وأَطْلَقَ-یَدَهُ بِخَیر): دەستی بە کارێکی چاك/ خێر کرایەوە، کارێکی باشی ئەنجامدا.

(رَجُلٌ طَلْقُ الیَدَین): پیاوێکی دەسـتوالآیە/ خێرخوازە/ بەخشندەیە.

٢-(طَلَقَ-تِ المَرأَةُ مِن زَوجِها): لە مێردەکەی دەستبەردار بوو/ تەلآقی خۆی وەرگرت.

(طالِـق (ج) طُلَّـق وطالِقَـةُ (ج) طَوالِق): ئافرەتی دەستبەردارکراو/ تەلآقدراو.

(طَلَقَ-تِ الناقَةُ): مێحوشـترەکە (پەتەکەی بەرەلآ بوو/ لە پەت بەربوو).

(طَلِقَ. طَلَقاً): دوورکەوتەوە.

(طَلَّقَ- قَومَهُ): خوێشـگەلی بەجێهێشـت‌و لێیان جیابووەوە.

(-المَـرأَةَ زَوجُهـا): پیاوەکە دەسـتبەرداری ژنەکەیبوو/ تەلآقیدا.

(أَطْلَقَ- المَرأَةَ): ژنەکەی تەلآقدا.

(-المَواشِـيَ): ئاژەڵەکەی بـۆ لەوەڕگا بەرەلآ کرد.

(-الأَسیرَ): دیلەکەی ڕەها کرد/ ئازاد کرد.

(-في کَلامِهِ): زمانی بەر بوو و بێسـەرو بەر

قسەیکردو بە گشتی قسەیکرد.

(«أَطْلَقَ رِجلَهُ»): پێی لێهەڵبڕی/ پێی پێدانا/ خێرا ڕۆیشت.

(«أَطْلَقَ الدواءُ بَطنَهُ»): دەرمانەکە ڕەوانیکرد.

(«أَطْلَقَ خَيْلَهُ في الحَلَبَةِ»): ئەسپەکەی ڕەها کرد بە هەوەسی خۆی لە گۆڕەپانەکەدا بڕوات.

(تَطَلَّقَ-تِ الخَيلُ): ئەسپەکان تەواوو بێجڵەو ڕەها بوون و بەرەو ئامانج غاریانکرد.

(إنْطَلَقَ): دەرچوو/ ڕۆیشت/ دەرپەڕی.

(أُنْطُلِقَ-بِهِ): دەرپەڕێنرا/ هەڵگیرا/ برا.

(إسْتَطْلَقَ- البَطنُ) (طب): سکەکە چوو/ شۆڕبوو.

(-الظَبيُ): ئاسکەکە بۆیدەرچوو/ تیژو خێرا تێتەقان.

(-الأَمرَ): پەلەی لە کارەکەدا کرد.

(أَلطَلْقُ (ج) أَطْلاق): ١-ریخۆڵەکان ٢-(ح)ئاسك.

(الطَلْقُ والطُلُقُ والطَلِقُ والطَليقُ): بەرەڵا/ ڕەها/ ئازاد/ سەربەست.

(«حُبِسَ طَلْقاً وطُلُقاً»): بەند کرا بەبێ کۆت و پێوەند.

(فَرَسٌ طَلْقُ اليَدِ"): چارەوێیەك کە دەستی بێپێوەند بێت.

(أَلطِلْقُ): ١-نەبەستراوە/ ئازاد ٢-حەڵاڵێکی تەواو.

(أَلطَلْقُ (مص) (ج) أَطْلاق): سووڕێکی پێشبڕکێی ئەسپ.

(علی ألإطلاق): بە گشتیو بەبێ جیاوازی تێکرا.

(أَلطَلاَّق والمِطلاق والمِطْليق): ١-زۆر ڕەهاکار/ بەرەڵاکار ٢-زۆر تەڵاقدان/ زۆر دەستبەرداركردن.

(أَلْمُطَلَّق): ١-ڕەهاکراو ٢-دەستبەرکراو/ تەڵاقدراو.

(أَلْمُطَلَّق- مِنَ الخَيل): ئەسپێك کە کۆت بە قاچیەوە نەبێت/ بەرەڵاکراو.

(مُطْلَقاً): ١-بە هیچ جۆرێك بە جۆرێکی گشتیو بێجیایی ٢-هەرگیزاوهەرگیز.

٢-(طَلَقَ-اللسانُ طُلُوقاً وطُلُوقَةً): زمانی پاراوو ڕەوان و خۆشگوفتار.

(إنْطَلَقَ-لِسانُهُ): زمانی لە قسەکردندا پاراوو ڕەوانبوو/ قسەزانبوو/ زمانی بەربوو.

(طَلْقُ وطِلْقُ اللِّسان): زمانپاراوو قسە ڕەوان.

(«لِسانُهُ طَلْقٌ اللِّسانِ»): زمانپاراوو قسە ڕەوان.

(«لِسانُهُ طُلُقٌ وطِلَقٌ وطَليقٌ»): زمانی پاراوو ڕەوان و قسەزانبوو.

٤-(طَلُقَ-الرَجُل. طُلُوقَةً وطَلاقَةً): ڕووخۆش/ ڕوو گەشاوەو کراوە بوو.

(تَطَلَّقَ وَجْهُهُ): ڕووی گەشایەوە/ کرایەوە.

(إنْطَلَقَ- وَجْهُهُ): ڕووی کرایەوە/ ڕووی خۆشبوو.

(-ت نَفسُهُ لِلأَمرِ): دڵو دەروونی بۆ کارەکە

کرایەوەو پێیخۆشبوو.

(إطَّلَــقَ): ڕووی کرایــەوە، دڵــی کرایــەوە/ شادبوو.

(رَجُــلٌ طَلْــقُ الوَجهِ): پیاوێکــی ڕووخۆش دەمبەپێکەنین/ دەمبەخەندە.

(يومٌ طَلْــقٌ): ڕۆژێکی فێنك نە گەرمبێت نە سارد.

(رَجُلٌ طِلْقٌ وطُلُقٌ وطَلِــقٌ وطَلِيقٌ الوَجهِ): پیاوێکی هەمیشــە دەمبەخەندەو پێکەنین/ ڕوو گەشاوە.

٥-(طلِــقَ-تِ المَــرأةُ. طَلْقــاً): ژنەکــە ژانی منداڵبوون گرتی.

(مَطْلُوقة): ژنی لە سەر ژانی منداڵبوون.

(الطَلْق (مص) (ج) أطْلاق): ژانی منداڵبوون.

٦-(طَلَّــقَ وأطْلَقَ- النَخلَــةَ): (هەلاڵە/ تۆوی نێر)ی بەسەر دارخورماکەدا کرد/ چاکیکرد.

٧-(الطِلْــق): ١-بەش/ بەرکــەوت ٢-پێوەندی چەرمین.

٣-(الطَلْــق): تالك بۆدرەو کلێکی ســپییە لە مادەی مەگنیزیۆم‌و سلیکەتی ئاوی پێکهاتووە بۆ ئارایشــت‌و دەرمان‌و بۆیەو دروســتکردنی فەخفوری‌و لاستیك‌و کاغەز بەکاردەهێنرێت. ئەوروپاییەکان پێیدەڵێن (تەلك).

(الطَلَــق (ج) أطْلاق): ١-پەتــی توند بادراوو قایم ٢-پێوەندی چەرمین ٣-بەش.

(«أصَبتُ مِن مالِهِ طَلَقاً»): بەشێکی سامان‌و ماڵەکەیم بەرکەوت.

(الطُلَقاء): ئەوانەی بە زۆر موسڵمانکران.

(المُطْلَق) (مو): لە زێدان بێ ئەوەی پەنجەکان بنوشتێنرێتەوە.

الملحق:

طلــق: (المُطْلَقِيَّــة): ڕژێمێکــی ڕامیارییــە دەســەڵاتی فەرمانڕەوا تیایــدا ڕەهایە، هیچ شتێك‌و یاسایەك نایبەستێتەوە.

---

طلــم: ١-(طَلَــمَ وطَلَّــمَ- الخُبــزَةَ طَلْماً): گونکــی هەویرەکەی بەدەســت یان بە تیرۆك پانکردەوە.

(طَلَّمَ- الخُبزَةَ): گونکی نانەکەی پانکردەوە.

(-العَــرَقَ عَن جبينِــهِ): ئارەقی ناوچەوانی سری.

(الطُلُم): پنەکەنانی لەسەر دەکەنەوە.

(الطُلْمَةُ (ج) طُلَم): نانێك.

(طُلْمِيَّــة وطُلْمُوسَــة) (عامية ســريانية): نان.

(المِطْلَمَة): تیرۆك کە نانی پێدەکەنەوە.

(الشَوبك) (عامية): تیرۆك.

٢-(الطَلَم): چڵکی دان.

٣-(طَلْمَــسَ): ناوچەوانــی بەیەکــداداو گرژ بوو.

(-الكِتابَ): نووسینەکەی سرییەوە.

(إطْلَمَسَ-اللَّيلُ): شەو زۆر تاریکبوو.

(الطِلْمِســاء): ١-تاریکیی ٢-زەوییەکی بێ ئاڵاو

منارەو نیشانە ٣-تەنكە هەور.

طله: (طَلَهَ- الرَجُلُ فِي البلادِ طَلْهاً): پیاوەكە كەوتــە ولأتەكــەوە یــان شــارەكەوەو تیایدا سوورایەوە.

(إطَّلَـهَ. إطِّلاهــاً): تەماشــایكردو لێــی ئاگاداربوو.

(ألطُلَه): هەوری تەنك.

(ألطُلْهَةُ): ماوەی سامانو دارا/ ماڵی ماوە.

طــلا: ١-(طَــلا-ەُ طَلْــواً): ڤاچیبەســتەوە بەندیكردو پێوەندیكرد.

(طَلى-ەُ طَلیاً): پێوەندیكردو بەندیكرد.

(أطْلى-تِ الوَحْشِیَّةُ): زیندەوەرە كێویلەكە/ درندەكە بەچكەیبوو.

(ألطَــلا والطَلْــو (ج) أطْلاء وطِــلاء وطُلِيّ وطِلیــان وطُلیــان): ١-كارمامــز ســاتی لــە دایكبوونی ٢-هەموو شتێكی بچووك.

(الطِلْوَة): بەچكە درندەو كێویلەی بچووك.

٢-(طَلا- الرَجُلُ. طَــلاوَةً): خاوەخاویكرد/ سستیكرد.

٣-(إطْلَوْلى. إطْلیلاءً): ئاخاوتنەكەی چاكبوو.

(ألطُلْــوَةُ): ســپێدەی بەیــان/ رووناكیــی رۆژبوونەوە.

(ألطُلاوَة والطَلاوَة والطِلاوَة): ١-ڤەشەنجیو جوانییو دڵخۆشیی.

(«هــذا كَلامُ ماعلیــه طــلاوَة»): ئەمــە ئاخاوتنێكە نە جوانییو نەخۆشــیی تێدایە

٢-ئەفسون/ جادوو/ تەلیسم/ سیحر.

٤-(ألطِلْو) (ح): گورگ.

(ألطُلاوَة): بۆیەو ئەوەی لە شت هەڵدەسووڕێت.

(ألطَلاوَة والطِلاوَة): ١-پاشــماوەی خواردنی نــاودەم ٢-توێژاڵێكی تەنكی ســەر شــیر یان ماستو خوێنی مەیو.

طَلَى: ١-(طَلَى- البَعیرَ القَطْرانَ أو بِالقَطْرانِ طَلیاً): ڤەترانی لە حوشترەكە هەڵسوو.

(طَلِــيَ- فُوهُ طَلىً): دانەكانی بەڵغێكی گرت. زەردیانگرت.

(طَلَّى- البَعیرَ القَطرانَ. تَطلیَةً): ڤەترانی لە حوشترەكە هەڵسوو.

(-اللَّیلُ الآفاقَ): شەو ئاسۆكانی داپۆشی.

(تَطَلَّــى واطَّلــى- بالقَطرانِ): بــە ڤەتران پیسیو/ ڤەترانی تێهەڵسوورا.

(ألطَلى (ج) أطلاء): ڤەتران تێهەڵسووراو بە ڤەتران (لەكەدراو/ چەوركراو).

(ألطُلاء): توێژاڵی خوێن.

(ألطِلاء): ١-ڤەتران ٢-شیلەی ترێ/ گوشراوی تــرێ/ ئاوی تــرێ بكوڵێنرێت تــا دوو بەش لە سێبەشــی بــڕوات لەوانەیە بــە مەیش وا بوترێــت، ئەمە بــەوە چوێنــراوە كە بۆیەی حوشتری پێدەكەن.

(ألطِلاء والطلایَة): بۆیــەو بۆیاخو هەرچی شتی پێچەورو بۆیە بكرێتو تێهەڵسووڕێت.

(ألطِليّ والطِلْیان): بەڵغی دان كە ڕەنگی زەردە.

٢-(طَلى- الشـيءَ. طَلْياً): شـتەکەی گیردا/ بەندکرد/ گلیدایەوە.

(طَلّـى- فُلانـاً تَطلِيَةً): فیسـاری (خسـتە بەندیخانەوە/ بەندکرد).

(ألطِـلاء): پەتێکـە قاچـی کارمامـزی پێدەبەسترێت.

(ألطَلى (ج) أطْلاء): کارمامز.

(ألطَلِيّ (ج) طُليان): بەرخ/ بەرخۆلە (بۆیە وای پێدەڵێن چونکە تا چەند رۆژێك بە پەت دەیبەستنەوە).

(ألمُطَلّى): بەندکراوێك کە ئومێدی بەربوونی نەبێت.

٣-(طَلِـيَ- لِسـانُهُ طَلىً): زمانی قورسـبوو قسەی بۆنەکرا.

أطلـى: ملـی لەبـەر بێهێـزی یـان شـتیتر لاربووەوە.

(ألطَلـى (ج) أطْـلاء): نەخۆشـیێکی زۆر کە شەنگو پەرێشان.

(ألطُلْيَةُ والطُلاةُ (ج) طُلىً): مل/ گەردن.

(ألمُطَلَّـى): نەخۆشـیێکی نزیـك مـردن/ لە گیانکەنشتەدا بێت.

٤-(طَلّى- تَطْلِيَةً): گۆرانی (چری/ وت).

(تَطَلّـى): کەوتـە گۆرانـیو هەڵپەریـنو رابواردن.

(ألطَلى): ئارەزو/ حەز.

("قَضى طَلاهُ"): ئارەزووەکەی تەختکرد/ بە ئارەزووەکەی گەیشت.

(ألطِلَى): ئارەزووچێژو لەزەت/ خۆشیی.

٥-(طَلّى- فُلاناً. تَطْلِيَـةً): تێر جنێویکرد/ جنێوی پێدا.

٦-(ألطَلى (ج) أطلاء): کەسەکە.

(ألطُلّى): شۆربای شیر.

(ألمِطْلى والمِطلاء (ج) مَطالٍ): ئاومرۆگەیەکی تەسك/ شیوەڵۆکە.

طمّ: ١-(طَمَّ- الإناء طَمّاً وطُموماً): دەفرەکەی پرکرد.

(-الماءُ): ئاوەکە (سەریکرد/ دایپۆشی).

(-الشيءُ): شتەکە زۆر بوو/ لێشاو بوو.

(-الأمرُ): کارەکە گەورە بوو لەدەستدەرچوو.

(-البئْـرَ. طَمّـاً): بیرەکـەی تەختکـردو دایپۆشی.

(ألطِمّ): ١-ژمارەیەکـی بێئەندازەو زۆر ٢-ئاو ٣-دەریا.

(ألطَمَّة): پزیسکی ژێر خۆڵەمێش/ پزیشکی ناو خۆڵەمێش.

(ألطُمَّة- مِنَ النـاس): کۆمەڵە خەڵکێك یان کۆمەڵێ خەڵك.

(طُمَّةُ القَوم): کۆمەڵگای خوێشان.

(طَميمُ النـاسِ): خەڵکێکـی زۆری تێکەڵو هەمەچیزە.

(ألطامَّة): ١-(وەی/ بەڵا/ چورتوم)ێکی بێوێنە ٢-رۆژی حەشـرەو زیندووبوونەوە کە هەموو

شتێك دەشارێتەوەو دادەپۆشێت.

٢-(طَمَّ- الشَعَر. طَمّاً وطُمُوماً): قژەكەی بری یان لە بنیدەرهێنا.

(أَطَمَّ واسْتَطَمَّ- الشَعَرُ): كاتی هەڵپاچینو برینی قژەكە هات.

٣-(طَمَّ- الفَرَسُ. طَمّاً وطَميماً): ئەسپەكە كەوتە ڕەوتێكی نەرم.

(أَلطِمّ): چارەوێی ڕەسەن.

(فَرَسٌ طَمُومٌ): چارەوێیەكی خێرا چابوك/ توندڕەو.

(أَلطَميم) (مص): ١-ڕەوتی نەرم ٢-چارەوێی ڕەسەن.

(ألأطاميم): چوارپەل.

٤-(طَمَّ وطَمَّمَ وتَطَمَّمَ- الطائِرُ. طَمّاً وطُموماً): باڵندەكە نیشتە سەر درەختەكەو بەسەر چڵەكەوە نیشتەوە.

٥-(أَلطِمّ): ١-سەرسوڕمان/ بەلاوە سەیربوون ٢-سەیرو سەمەرە/ سەرسوڕمێن.

٦-(طَمْطَمَ): لە نێرینەی ناوەڕاستی دەریاكەدا مەلەیكرد.

(أَلطَمْطام): (ناوەڕاستی/ نێرینەی) دەریا.

(أَلطَمْطِم والطِمْطِمِيّ و الطُمْطُمانِيّ): كەسێكە كە باش زمانی پاكنەبێتو وشەی بێگانەی تێدابێت.

(أَلطماطِم أو البَنادورة) (ن): تەماتە كە لە كۆمەڵەی باینجانەو لە (بیرۆ)وە بلاوبۆتەوە لە ئەورووپاو ئەمەریكاو وڵاتی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەچێنرێت. بە كاڵیو كوڵاوی دەخورێت.

(رُب البَنادورَة): دۆشاوی تەماتە.

طمأ: (طَمْأَنَ): دڵنیابوو.

طمث: ١-(طَمَثَ- الشيءَ طَمْثاً): دەستی لێكوتا/ دەستی بەریكەوت/ دەستی لێدا.

٢-(طَمَثَ وطَمُثَ-تِ المَرأَةُ طَمْثاً): ئافرەتەكە كەوتە (بێنوێژیەوە/ حەیزەوە).

(طامِث): ئافرەتی (بێنوێژ/ لە حەیزدابوو).

(أَلطمث) (مص): ١-پیسیو بۆگەنی ٢-خوێن ٣-گومان.

("ما بِفُلانٍ طَمْث ريبَةٍ"): فیسار پیسیو خراپیی گومانی نییە.

طمح: ١-(طَمَحَ- بَصَرُهُ إِلَيه. طَمْحاً وطِماحاً و طُمُوحاً): ١-چاوی هەڵبڕیو تیژو توند تەماشایكرد ٢-چاوی تێبڕی بە تەمایبوو/ ئاواتی بۆ خواست.

(-بأَنْفِهِ): لووتی بەرزكردەوە/ فیزی نواند.

(طَمَّحَ-الفَرَسُ): ئەسپەكە هەستایە سەر پاشوو.

(-بالشيءِ في الهَواءِ): شتەكەی بە ئاسماندا هەڵدا.

(أَطْمَحَ- بَصَرَهُ إِلَيهِ): چاوی بۆ هەڵبڕیو بە ئاواتی خواست.

(أَلطِماح) (مص): فیزو شانازیكردن.

(اَلطَمَّاح):١-دووربين٢-چاوبرسىو تێرنەخۆر/ بە هيچ دانەكەوتوو.
(بَحرٌ طَمُوحُ المَوج): دەريايەكى(شەپۆلهەستاو/ شەپۆلدەر).
٢-(طَمَحَ-بِـهِ. طَمْحاً وطِماحـاً وطُمُوحاً): بردى.
(-في الطَلَب): ئاواتى زۆرى خواست/ خوازيارى زۆر بوو/ زۆر خۆشهيوابوو.
(طَمُوح): ئاوات/ خۆشهيوايى.
(-تِ الدابَّـةُ. طِماحـاً و طُموحاً): ولاخەكە سەركێشييكردو سەريهەڵگرت.
(-تِ المَـرْأةُ على زَوجِها): ژنەكە لە قسـەى مێردەكەى چووە دەرێ/ لێى ياخيبوو.
(طامِـح (ج) طَوامِـح): ژنـى (لـە مێـرد سەرپێچيكەر/ ياخى).
(طَمْحات وطَمَحات- الدَهرِ): ڕۆژانى (تووشو سەختى ڕۆژگار)/ تاڵيىو ڕەشى ڕۆژگار.
«طمخ»: (طَمَخَ-بأنْفِهِ طَمْخاً): لووتبەرزيى نواند/ بە دەعيەو فيز بوو.
طمر: ١-(طَمَرَ- المَطْمُـورَةَ طَمْراً): عەمارى ژێر زەمينەكەى پڕكرد.
(-الشيءَ. طَمْراً): شتەكەى. بە خاك سپاردو خستە ژێر گڵەومو شارديەوە.
(-طُموراً): چووە ژێر زەوييەوە.
(طَمَّـرَ- الشـيءَ): شـتەكەى پێچايـەومو ژێرخاكيخست.
(-البَيتَ): پـەردەى خانووەكـەى دادايەوەو شارديەوە.
(الطامِـر (فا)):١-شـاردراوە ٢-بەژێر خاكەوە بوو.
(«هُوَ طامِرُ بن طامِر»): ئەو كەسە نەخۆىو نە باوكى ناناسن/ ئەوان نەناسن.
(اَلطُمُرّ): نەزانين/ تێنەگەيشتن.
(المَطْمُورَة (ج) مَطامير):١-چاڵى ژێرزەمينى دەغڵودانو شـتيتر كە تيايدا دەشـاردرێتەوە ٢-زيندان بۆ بەندكردن لە ژێرزەميندا.
٢-(طَمَرَ. طَمْراً وطُموراً و طِماراً وطَمَراناً): لە سەرەوە بازديدايە خوارەوە يان بازديدا.
(إطَّمَـرَ- علـى فَرَسِـهِ): لە پشـتەوە خۆى هەڵدايە سەرچارەوێكەو سواريبوو.
(اَلطِمْـر والطِمِـرّ (م) طِمِـرَّة والطِمْـرِر والطُمْـرُور والطِمْرير): چارەوێى ڕەسـەنى چوارپەل درێژ/ لۆقدرێژ.
٣-(طَمَرَ وطَمِـرَ- الجُرْحُ طَمْـراً وطَمَراً): برينەكە هەڵاوسا.
(-تِ اليَدُ): دەستەكە هەويكرد.
(طُمِرَ- في ضِرسِهِ): ژانى دانى لێورووژا.
٤-(اَلطِمـر (ج) أطمـار):١-پۆشـاكى كـۆن ٢-كەسێكى ڕەجاڵ كە هيچ شتێكى نەبێت.
(«لاحَـتِ الشَّـمسُ في الأطْمـارِ»): خۆرەكە زەردبوو ڕووناكيەكەى كزبوو.
(اَلطامِر (ج) طوامِر (ح): كێچ.

(طُمُــرَّةُ الشَــباب): (هەرِەتــى/ ســەرەتاى/ هەرزەكاريى/ لاويى.

(ألطامُور والطُومــار (ج) طَوامير): پەڕەى نووسين/ تۆمار.

(«كَتَبَ في الطُومار أو الطَوامير»): تۆماريكرد/ له پەرِەكەدا نووسى.

(أَلمِطْمَر) (ب): (گوشى/ پەتى) بەنايى.

(أَلمِطْمــار = المِطْمَــر): ١-پەتــى بەنايــى ٢-شرمپۆش.

("هو علــى مطمــارِ أَبيه"): له سروشــتو رەوشتو شــێوەدا (چۆتەوە ســەر باوكى/ له باوكى دەچێت).

طمس: ١-(طَمَسَ طُموساً): دووركەوتەوە بە قووتدا چوو.

(«لاأدري أيــنَ طَمسَ»): نازانــم (بە كوێدا چوو/ چۆن رەشراهات).

(طَمَسَ- بِعَينِهِ): چاوى برِييە دوورو روانى.

٢-(طَمَــسَ. طَمْســاً وطُمُوســاً): فەوتــا/ لەناوچوو/ پۆرتكا.

(-النَّجمُ أَو البَصَرُ): ئەستێرەكە يان چاوەكە روناكيى برا/ كوێر بووەوە.

(-الشَيءَ): شــتەكەى ١-(فەوتاند/ لەناوبرد) ٢-مراندى ٣-دايپۆشى ٤-شوێنەوارى برِى.

(طَمَــسَ- الغَيــمُ النجــومَ): هەورەكــە ئەستێرەكانى شاردەوەو رووناكيى برِين.

(تَطَمَّسَ وانْطَمَسَ): شوێنەوارى برِاو فەوتا.

(رُبُوعٌ طِماسٌ): ناوچەيەكى فەوتاو.

(الطَميــس والمَطْمُــوس): چــاو پــووكاوە/ كوێربوو/ نابينا.

٣-(طَمَــسَ- الشــيءَ: طَماسَــةً): شــتەكەى هەڵسەنگاندو خەملاندى.

طمع: (طَمِعَ- في الشيءِ وبهِ. طَمَعاً و طَماعاً و طَماعِيَــةً): چــاو له دووى شــتەكە بوو/ مرخى لێخۆشكرد/ چاوچنۆكيبوو/ چلێسانە چاوى تێبرِى و بۆى سووتا.

(طامِعٌ طِمعٌ و طُمُــعٌ (ج) طَمِعُون وطُمَعاء وأَطمــاع وطَمَاعَى): چاولــەدوو/ چاوچنۆك مرخلێخۆشــكەر/ تەماعــكار چاوتێــبرِى بۆ سووتاو.

(طَمُــعَ. طَماعَــةً): زۆر بــە تەماعبــووە/ چاوتێبرِێكى زۆر بۆسووتاو بوو/ زۆر چاولەدوو بوو/ چاوچنۆك بوو.

(طَمَّعَ-هُ): خستيە (تەماعكردن/ چاوتێبرِين و بۆسووتان)/ چاوچنۆكيكرد.

("أَطْمَــعَ-هُ): فێــرى تەماعيكــرد/ چاوچنۆكيكــرد/ تەماعى نايەبەر/ تووشــى چاوچنۆكييكرد.

(تَطَمَّــعَ): چاوچنۆكيى گرتــى/ مرخى لەو شتە خۆشكرد/ تەماعگرتى.

(ألطَّمَع (مص) (ج) أطماع): ١-چاوچنۆكيى/ تــەمــاع/ چــاوتــێـبرِيــن و حــەزلــێـكــردن/ چــاولــەدوويــى/ چــلــێـسيــى/ تــەمــاعــكاريــى

٢-ئازووخەی سەرباز.
(اَلطَماعَة): مرخ لێخۆشـکردنو دڵتێچوون/ چاوچنۆکییەکی زۆر.
(اَلطَمَّـاع والمِطْمـاع): زۆر (چاوچنـۆك/ تەماعكار)/ بە هیچ دانەكەوتوو.
(اَلمَطْمَـع (ج) مَطامِـع): ئـەوەی چـاوی تێدەبڕرێـتو حـەزی لێدەكرێـت/ ئـەوەی چاوچنۆك بە تاسـەوە حەزی دەستگیربوونی دەكات.
(اَلمِطْمَعَة): چاوچنۆكیبزوێن/ تەماعبزوێن/ مرخبزوێن.
طمـغ: (طَمِغَ-تْ عَینُهُ طَمَغـاً): چاوی زۆر ریپۆقیكرد/ ریپۆقی زۆر بوو.
طمـل: ١-(طَمَـلَ- الخَبَّازُ الخُبـزَ. طَمْلاً): نانكەرەكە بە تیرۆك نانەكەی پانكردەوە.
(اَلطَمْل) (مص): هەویر.
(خُبزٌ طَمیلٌ): نانێكی بە تیرۆك پانكراوە.
(اَلمِطْمَلَة): تیرۆك.
(اَلشوبك) (عامیة): تیرۆك.
٢-(طَمَلَ- الثَوْبَ. طَمْـلاً): جلەكەی (تەواو رەنگكرد/ تێرڕەنگكرد/ تۆخكرد).
(-الدَّمُ السَـهْمَ وغَیرَهُ): خوێنەكە تیرەكە یان شتیتری خوێناویكرد.
(طَمِلَ وطُمِلَ طَمَلاً): لەكەدار بوو بە خوێن یان ڕۆن یان قیرو شتیتر/ (خوێناوی/ ڕۆناوی/ قیراوی) بوو یان لەكەی شتیتریگرت.

(طَمِیل): خوێناوی، ڕۆناوی/ چەور/ قیراوی، نەوتاوی.
(أَطْمَلَ- الكِتابَ): نووسینەكەی سڕییەوە.
(اَلطِمْـل (ج) طُمُـول): ١-سەرسـەریو بێئابڕوییەك كە كۆڵـە هیچ نەكات/ چەرداوە ڕوویەك گوێ بە هیچ نەدات.
٢-بەدزمان ٣-پۆشاكی ڕەش ٤-هەژاری ڕەجاڵی پەرپـووتو پەرێشـانو قەلأفەت ناشـیرین ٥-گەردانە ٦-جلی (دڕاو/ شڕو وڕ).
(اَلطِمْل والطَمْلَة والطُمْلَة والطَمَلَة): ١-ناوی (لێڵ/ لیخن) ٢-قوڕە ڕەش.
(الطامِـل) (فـا): سەرسـەری داوێنپیـسو بێئابڕوو كە بە تەنگ هیچەوە نایەت.
(اَلطُمُول): سەرسەریو بەرەڵاو بێئابڕوو.
(اَلطُمولَـة): بەرەڵایـیو داوێنپیسـیو سەرسەرێتی/ بێئابڕوویی.
(الطَمیل): ١-ناوی (لینخن/ لێڵ): ٢-ملوانكە، گەردانـە (بۆیـە وا ناونـراوە چونكـە بۆنی تێهەڵدەسوورێت).
(سَهْمٌ طَمیل): تیری خوێناوی.
٣-(طَمَـلَ- الرَّاعي الإبلَ طَمْلاً): شـوانەكە حوشترەكانی ڕاڤراند/ توند لێیخوڕین.
٤-(إنْطَمَـلَ- الرَجُل): لە دزیندا بەشـداریی دزانیكرد/ پاشدز بوو.
٥-(اَلطَمْل): هەموو خەڵكان/ بوونەوەر.
اَلطِمْل (ج) طُمُول: گەوج.

(اَلطَميــل): ١-گۆشــەگیر/ کەمدەرکەوتــوو ٢-حەسیر ٣-نووکی پانی نێزە ٤-(ح) کار.

طمن: ١-(طَمْأَنَ وطَأْمَــنَ- ظَهْرَهُ. طَمْأَنَةً): پشتی نەواندو چەماندەوە.

(تَطَمْــأَنَ): نــەوی/ نزمبــووەوە/ نیشــت/ داکەوت.

(إطْمَــأَنَّ. إطْمِئنانــاً وطُمَأْنينَــةً): نــەوی/ نزمبووەوە/ داکەوت/ نیشت.

(اَلْمُطْمَئِــن- مِــنَ الأَرض): زەویــی تەختو نیشتوو/ نزم.

٢-(طَمْأَنَ وطَأْمَنَ- الشَيءَ. طَمْأَنَةً): شتەکەی ئارامکرد/ وەستانی/ بێچرکەیکرد.

(«طَمَّنَهُ»): (عامية): چرکەی بری.

(إطْمَأَنَّ-إلَيــهِ إطْمِئنانــاً وطُمَأْنينَــةً): ١-لێیدڵنیابوو ٢-پشتی پێبەستو دڵی سرەوت.

(«إطْمَأَنَّ عَمَّا كانَ يَفعَلُهُ»): لێ دڵنیا لێیگەڕا چی دەکات بیکات.

(اَلطَمْــن (ج) طُمُون والمُطمَئِن): ســرەوت/ دڵنیا/ دڵئاسوودە/ دڵئارام.

طَما: (طَمَا- الماءُ طُمُوّاً): ئاوەکە سەرکەوتو رووبارەکەی پڕکرد.

(-البَحْرُ): دەریاکە پڕئاو بوو.

(-النَبــتُ): ڕووەکەکــە، گیاکــە بالآیکــرد/ درێژبوو.

(-هِمَّتُهُ): تەواو سوورخواستبوو.

(-بِــهِ الهَمُّ أَوِ الخَوفُ): پــەژارەو مەراق یان ترس سواریبوو زێفی لێسەند.

(طَمی- المــاءُ والبَحرُ والنَّبتُ طَمْياً): ئاوەکە لێوڕێژ بــوو. دەریاکە پڕئاوبــوو. ڕووەکەکە بالآیکرد، درێژ بوو.

طَنَّ: ١-(طَــنَّ وطَنَّنَ- الذُبــابُ أَوِ الناقُوسُ وشُــبهُ ذلــك. طَنّــاً وطَنينــاً): مێشــەکە. مێشو مەگەزەکــە ویزەویزیکــرد زەنگەکە دەرەنگەیهاتو شتیتریش دەنگی لێوەهات.

(أَطَــنَّ-هُ): ویزەویــزی پێخســت/ دەنگــی پێپەیداکرد یان دەرەنگەی لێوەهات.

(-الساقَ): لاقەکە قرتەی برینەوەی هات.

(اَلطَنَّان):دەنگدەرەوە/ویزەویزو وژەوژکەرێکی زۆر.

("لِفُــلان ذِكــرٌ طَنَّــانٌ") فیســار ناودێرەو ناوەکەی دەنگدەداتەوە یــان دەنگیداوەتەوە/ بەناوبانگە.

(«تِلْكَ قصيدَةٌ طَنَّانَة»):ئەوە هەڵبەستێکە لە هەموو شوێنێك دەنگیداوەتەوەو بەناوبانگە.

(اَلطَنَّانَــة) (ح): جۆرە مێرووییەکە لە هەنگ دەچێت تووکنو بریســکەدارە ڕەنگیان زۆرە جۆراوجۆرنو بە پێی پۆلیان لە کاتی فڕیندا فنگەفنگێکیــان لێوە دێت. سووداریشــن بۆ تۆورشتنی هەلآلە بەسەر گوڵدا. کەڵکدارە.

٢-(طَنَّ- فُلانٌ طَنّاً وطَنيناً): مرد.

٣-(الطُنّ): ١-گورزە قامیش.

٢-(ج طِنان وأَطْنان): جەستەی مرۆڤو هیتر

٣-سەنگێکە قورساییەکەی هەزار کیلۆگرامە.

(اَلطُنَّة): چلە قامیشێك.

(اَلطُنِـيّ- مِـنَ الرجـال): پیـاوی کەتـەو زەبەلاح.

٤-(طَنطَـنَ- الجَـرَسُ والطَسْـتُ والذُبابُ ونَحوهـا طَنطَنَـةً): زەنگەکەو تەشـتەکەو مێشەکەو شتی لەو بابەتە دەنگی هات/ دەنگی لێوەهات.

طنأ: ١-(طَنَأ وطَنِئ. طَنْأً وطَنَأً): شەرمیکرد/ شەرمگرتی.

٢-(أَطْنَـأَ): لایدایـە لای ماڵێـك یـان خۆی بەسـەر گۆلێکداداو ئاویخـواردەوە یان خۆی بەسـەر فەرشـێکداداو لە تەمەڵیدا لێیدرێژ بوو نوست.

(اَلطِنْء): ١-خودانە دەسـت هەوەس و ئارەزوو ٢-رووکردنە داوێنپیسی و حەزبازیی ٣-هەوار/ ماڵ ٤-فەرش و رایەخ.

٣-(أَطْنَأَ): گیانی دەرنەبرد/ مرد.

("حَيَّةٌ لاتُطنِئ"): مارێکە بە هەرکەسێکەوە بدات گیان دەرنابات دەستبەجێ دەمرێت.

(اَلطِنّ): گیانکەنشت/ دواهەناسە.

(«رَمى فلانٌ في طِنئِه»): مرد.

٤-(الطِـنّ): ١-خۆڵەمێشـی (سـاردەوەبوو/ دامرکاو) ٢-باخچە ٣-هەتەرمەند.

("فُلان بَعيدُ الهِمَّة"): فیسار زۆر هەتەرمەندە ٤-گومان.

طنب: ١-(طَنِبَ- الرُمـحُ طَنَباً): (نێزەکە/ رمەکە) خواربووەوە.

(-الفَـرَسُ): پشـتو هـەردوو قاچـی بـە خۆخاوکردنەوە درێژبوون.

(أَطْنَـب (م) طَنبـاء): چارەوێـی بەخـۆ خاوکردنەوە پشتو لاق درێژ بوو.

٢-(طَنَّبَ-الخَيمَةَ): دەوارەکەی بە تەناف/ بە گوریس قایمکرد.

(-الـسَـقـاءَ): مـەشـکـەکـەی (بـۆنـدا/ بۆنخۆشکرد).

(-بالمَـكانِ): لـە شـوێنەکەدا دەواریهەڵـدا/ جێگیربوو.

(طانَـبَ القَـومَ): تەناف دەوارەکـەی بە پاڵ تەناف دەواری خوێشـگەلەوە بـوو/ دەوار بە دەوارەوە بوون.

(تَطانَـبَ- القَومُ): دەواریـان بە پاڵ دەواری یەکـەوە بـوو/ تەنـاف دەوارەکانیـان بەلای یەکەوە بوو.

(اَلطُنُـب (ج) أطنـاب وطِنبَـة): ١-تەناف/ گوریس کە دەواری پـێ قایمدەکرێت ٢-(ع ا) چەقـە دەماری لەش و ماسـولکە ٣-(ز) رەگی درەخت.

(«مَدَّتِ الشَمسُ أَطْنابَها»): خۆرهەڵات.

(«تَقَبَّضَت أطنابَها»): خۆرئاوابوو.

(اَلطُنُب والإِطنابَة (ج) أَطانيب): قایشـێکە بە ژێی کەوانەوە دەبەسترێت.

(اَلْمَطْنَــب (ج) مَطانِب): ١-نێوانی شــان‌و مل ٢-قەڵاندۆشکان/ سەرشان.

٣-(طَنَّبَ-الذِئبُ): گورگەکە لووراندی.

٤-(أَطْنَــبَ-تِ الإبلُ): حوشــترەکان (یەك لە دوای یەك ڕۆیشتن/ قەتارمیانبەست).

(خَیلٌ أطانیب): کۆمەڵە ئەسپی قەتارەبەستوو/ یەك شوێنیەککەوتوو.

(جَیشٌ مِطنابٌ): سوپایەکی بێشوماری یەك لە دوای یەك.

٥-(أَطْنَبَ- فِي الوَصْفِ أَوِ العَدوِ): لەپێداهەڵدان‌و بە شاخ‌و باڵدا هەڵدان یان لە دوژمنکاریی داشتن‌و بەسەرو پۆتەڵاکهاتندا زیادرەویکرد.

(«أَطْنَبَ الشّــاعِرُ فِي الكَلامِ»): هۆزانڤانەکە/ شــاعیرەکە لــە پێداهەڵــدان یــان داشــتندا ڕەوانبێژانەو زمانپاراوانە هاتەدەست.

(-تِ الریــحُ): با تونــد هەڵیکردو تۆزی زۆر هەستاند.

(اَلْمُطْنِب) (فا): دەهۆڵکوت/ کەسێکە/ یەکێکە بە هەموو کەسێکدا هەڵدەدات.

٦-(اَلطُنبور والطِنبار (ج) طَنابیر (فارسیة) (مــو): ئامێرێکی مۆســیقایە ملــی درێژەو ژێکانی مسن/ تەمووره.

٧-(طَنْبَلَ- الرَجُــلُ. طَنْبَلَةً): کابرا ژێر بوو دایە گەوجیی.

(اَلطَنْبَل): (تەمەڵێکی/ تەوەزەلێکی) لەشقورسی گەوج.

(اَلطَنْبَلَةُ) (مص): خراپی بەدخوازیی.

(«كان بَینَهُــم طَنْبَلَــةٌ»): بەدخوازییان لە نێواندا بوو.

الملحق:

طنب: (اَلإِطناب): زیادرەوی‌و زۆرپێوەنان.

(اَلإِطْنــاب فِي المَــدح): هەڵنانێکــی زۆر لــە ئەندازە بەدەر.

(اَلإِطْناب): درێژە بە قســەدان‌و زۆر لەســەر ڕۆیشتن.

(إِطْنابٌ فِي البَیان): وشــەی زۆر کە واتایەکی کەمبدەن/ وشەی زۆر کە زیادبێت‌و پێویست بە بوونی نەکات.

---

طنــح: (الطَنجَــراة) (ترکیــة): مەنجەڵی مسین.

(اَلطِنْجیر): تیان/ دەفرێکە کە حەڵواو شــتی وەهای تێدا دەکرێت.

(اَلطَنجَــراة): زیرەکــردوو یــان بەدزمــان/ بەدخواز (ئیدیۆمە).

طنــخ: (طَنِــخَ. طَنَخــاً): ١-زۆری خــواردو چەوریی سەر دڵی گرت ٢-چەوریی.

(طَنِخ وطانِخ): قەڵەوو دڵبەزگرتوو.

(-ت نَفسُهُ): دەروونی ناپاك‌و پیس بوو.

(-طَنَّخَ وأَطْنَخَ-ه): تڵخەی پێکرد.

(الطِنــخ): بەشێك.

(«مَــرَّ طِنــخٌ مِنَ اللَّیلِ»): بەشــێکی شــەو ڕۆیشت.

طنز: (طَنَزَ-بِهِ طَنْزاً): گاڵتەی پێکرد.
(تَطانَــزَ- القَــومُ): خوێشــگەل گاڵتەیــان بەیەککرد.
(ألطَنّاز): گاڵتەباز/ گاڵتەچی.
طنــط: (ألطُنْطُلَةُ) (عند العامــة): زمانە بچکۆلە ڕاستییەکەیش (ألطُلاطِلَة)یە.
طنف: ١-(طَنِفَ.طَنَفاً): گومانبارکرا.
(طَنَّفَ- هُ): گومانباریکرد.
٢-(طَـنِـفَ. طَـنـافَـةً وطُـنُـوفَـةً وَطَـنـفـاً): دەروونــپــیــسوو/ دەروونـــی بـۆگـەنـبـوو/ نیازخراپبوو.
(طَنِفٌ): دەروونبۆگەنو بەدنیاز.
(طَنَّفَ- نَفسَــهُ إلى كذا): نیازی بۆ ئەو شتە خراپبوو/ چاوی چنۆکی لەو شتە بری.
٣-(طَنَّفَ- الجِدارَ): ١-درکو چڵ داڵی خستە ســەر دیوارەکە ٢-کلاوی بــۆ دیوارەکە کرد/ گوێسوانەی بۆ کرد.
(تَطَنَّفَ- القَومَ): هاتەلای خوێشگەل.
(ألطَنْــف والطُنْف والطَنَــف والطُنُف (ج) طُنــوفَ وأطْنــافِ): (کلاوەی/ چەتــری) سەردەرگا ٢-گوێسوانە یان کلاوەی سەردیوارو ئەوەی لە خانووەکە دەردەچێت ٣-لووتی شاخ کە دەردەچێت.
(ألمُنطِــف): ١-کەســێکە کــە خانووەکــەی گوێسوانەیان تەپڵەکی هەبێت، سەر دەرگاکەی تەپڵەکی هەبێت ٢-کەســێك لەسەر لووتکەی شــاخ یــان سەرگوێســوانەو ســەر تەپڵەکی دیوارەکەی سەرکەوێتو وەستابێت.
٤-(طَنْفَسَ): ١- بەدڕەوشــتبوو/ بەدخوو بوو ٢-جلی زۆری لەبەرکرد.
(ألطِنْفِس): خراپی ناشیرینی دزێو.
(ألطُنْفُسَــةُ الطَنْفَسَــةُ والطِنفِسَــةُ (ج) طَنافِس): ١-ڕایەخ، فەرش ٢-حەسیر ٣-پۆشاك/ جل (فارسية).
طنو: (الطُنْو): داوێنپیسیی.
(ألطِنّو): فەرش/ ڕایەخ.
طنــی: ١-(طَنِــيَ وأطنى طَنىً): ســپڵی یان سییەکەی بە پەراسوو یان تەنشتیەوە نووسا.
(طَنٍ وطَنىً): کەســێکە سپڵی یان سییەکەی بەلایەکیەوە یان پەراسوویەوە لکابێت.
٢-(طَنِــيَ- اللّديغُ مِن لَــدغ العَقْرَب): دوو پشکپێوە دراوەکە خۆشبووەوە/ چاکبووەوە.
(طَنيِّ- فُلاناً): چاری نەخۆشییەکەیکرد.
(أطنى- هُ المَرَضُ): نەخۆشییەکە بە ئاستەم گیانی تێدا هێشت.
(ألطَنى): نەخۆشیی/ بیماریی.
٣-(طَنِيَ وأطْنى في فُجورِهِ أو فَسادِهِ طَنىً): لەســەر داوێنپیســیو بەدڕەوشــتی ســوورو (سەرومڕ بوو/ بەردەوامبوو).
(ألـطِـنْـيُ): داوێـنـپـیـسـیـو بـۆگـەنـیـو بەدڕەوشتیی.
(ألطّانــي (فــا) (ج) طُنــاة): داوێنپیــس/

زیناکەر/ شەروالپیس.
٤-(اَلطَنی): گوناهبارکــردن/ گومانبارکردن
٢ خۆڵەمێشی دامرکاو.
طهر: ١-(طَهَرَ وطَهُرَ طُهْراً وطَهُوراً وطَهارَةً): خاوێنبوو/ پاکبوو.
(طاهِر (ج) أطْهار وطَهِر (ج) طَهِرُون وطَهِير (ج) طَهاری): پوخت/ پاك/ خاوێن.
("رَجُلٌ طاهِرُ الثِياب"): پیاوێکی ١-داوێنپاکە ٢-دەستپاکە.
(طَــهَّــرَ-هُ): وایــکــرد کــە دەســتــپــاك‌و داوێنپاکبێت.
(-الشيءَ بِالماءِ): بە ئاو (شتەکەی پاککردەوە/ شتی).
(تَطَهَّرَ واطَّهَرَ) ١-لە داوێنپیسی‌و خراپەکاریی خۆی (پاراســت/ دوورەپەرێزگــرت) ٢-خۆی پاککردەوە، خۆیشت.
(اَلطُهر): پاکیی‌و بێنوێژنەبوونی ئافرەت.
(اَلطُهْــرَةُ): ١-پوختیــی‌و تەمیزیــی/ پاکیی ٢-بەئاو خۆشتن/ خۆپاککردنەوە.
(الأَطْهــار): ڕۆژانی پاکیــی‌و بێنوێژنەبوونی ئافرەت.
(اَلطَهُــور) (مــص): ئــەوەی کە خــۆی پێ پاکدەکرێتەوە.
(اَلمَطْهَــر): شــوێنی پاککردنــەوەی گیانــی پیاوچاکان پاش مردن‌و بــۆ ماوەیەکی کەم‌و دیاریکراو سزا دەدرێن.

(اَلمَطْهَرَةُ والمِطْهَــرَةُ (ج) مَطاهِر): ١-هەموو قاپێــك کە خۆی تێــدا پاکبکرێتەوە ٢ خانوو یان شــوێنێك کــە خۆی تێــدا پاکبکرێتەوە/ گەرماو سەرشۆرك.
(اَلســواك مُطَهِّــرَةٌ لِلفَــم): ســیواك دەم پاکەرەوەیە.
(اَلمُطَهِّــرَة): ئامێری پاککردنــەوەی بەرگ‌و کەلوپەلی نەخــۆش. پاکژکردنی هەموو ئەو شــتانەی بۆ ئەوەی ئەو میکرۆبانە تەشــەنە نەکەن‌و نەخۆشییەکە بڵاونەبێتەوە.
٢-(طَهَرَ-هُ. طَهْراً): دووریخستەوە.
الملحق:
طهــر: (اَلتَطهير) (مص): شــتن‌و پیســیی لابردن‌و لێکردنەوە.
(«تَطْهير المِياه»): ئاوپاکژکردن.
(اَلتطهــير): لە هەمــوو خراپەو پیســییەك دەروون پاککردنەوە.
(اَلتَطهير): خەتەنەکردن لای موسوڵمانەکان.
(-طــب): پاکژکــردن بــە هــۆی دەرمانــی پاکژکەرەوەو فەوتاندنی میکرۆب.
(تَطهــير الجــرح): پاکژکردنــی بریــن‌و پاککردنەوەی.
(اَلتَطهير- في السياسة والإدارة): لە ڕامیاریی‌و بەڕێوەبەرێتیــدا ئەوەیــە کــە گەندەڵیــی‌و هــۆکاری‌و پیاوانــی گەنــدەڵ نەهێڵرێــن‌و پاکبکرێنەوە.

طهس: (طَهَسَ- في الأرض): بەناو زەویدا چوو/ ڕۆچوو.

طهش: (طَهَشَ- العَمَلَ طَهْشاً): كارەكەی (گەنكرد/ تێكدا/ خراپكرد).

طهف: ١-(أطْهَفَ- السقاءُ): كوندەكە شلبوو/ نەرمبوو/ خاوبوو.

("زَبدَةُ طَهْفَة"): كەرەیەكی خاو/ نەرم.

٢-(أطْهَفَ-في الكَلام): لە قسەكانیدا خاوبوو پاشان گورجبوو.

٣-(أطْهَفَ لِفُلانٍ مِن مالِهِ طِهْفَةً): پارچەیەكی داراییەكەی خۆی دایە فیسار.

(الطِهْفَة- مِنَ الشيء): پارچەیەكی شتەكە.

(الطُهافَة): پەرچەم.

٤-(الطَهَف): بەش/ بەركەوت.

(الطَهاف- مِنَ السَّحاب): هەوری (بەرز/ بڵند).

طهق: (طَهَقَ. طَهْقاً): خێرا ڕۆیشت/ توند تێیتەقان.

طهل: (طَهَلَ وطَهِلَ وتَطَهَّلَ- الماءُ. طَهْلاً وطَهْلاً): ئاوەكە بۆگەنبوو/ خراپبوو.

(طاهِل وطَهِل): ئاوی بۆگەن/ گەراوە.

(أطهَلَتِ الأرضُ): زەویەكە گەندەگیایەكی دەركرد.

(الطُهْلَة): ١-پاشماوەی شت ٢-گەندە گیا/ گیایەكی كەمو كورت.

طهم: (طَهَمَ-الشيءُ): شتەكە زلبوو/ قمبە بوو.

(-مِنهُ): سڵی لێكردەوە/ لێی ترساو لێی دووركەوتەوە.

(-الطَعامَ): خواردنەكەی (لا ناخۆشبوو/ لەبەرچاوكەوت)/ دڵی لە خواردنەكە هەڵكەنرا.

ألمُطَهَّم: ١-قەڵەو ٢-لەشباریك ٣-هەموو شتێكی تەوا جوانو شێوە ڕێكوپێك.

(جَوادٌ مُطَهَّمٌ): چارەوێیەكی زۆر جوانو لەش ڕێكوپێك.

طها: ١-(طَها. طَهواً): بە ناخی زەویدا چوو.

٢-(طَها ويَطْهى- اللَّحْمَ طَهْواً وطُهُوّاً وطُهيّاً وطَهايَةً): گۆشتەكەی لێنا یان گۆشتەكەی برژاند.

(أطهى. إطْهاءً): لە كارەكەیدا، لە پیشەكەیدا كارامەو شارەزا بوو/ تیایدا وەستابوو.

الطَهو (مص): كار.

("كان طَهْوي كذا"): كارەكەم یان پیشەكەم ئەوە بوو.

(ألطُهى): چێشت/ خواردنی لێنراو/ شێو.

(ألطاهي (فا) (ج) طُهاة وطُهِيّ (م) طاهِيَة (ج) طَواهٍ وطاهِيات): ١-چێشتكەر/ ئاشپەز ٢-كەبابچی ٣-نانەوا.

(الطِهايَة): پیشەی چێشتكەریی وكەبابچێتیی و نانەوایی.

٣-(ألطَهي): وردەكا.

(ألطُهى): گوناه و تاوان.

(أَلطَهيُ):١-كوتان/ ليّدانيّكى توند ٢-تەمنكە هەور.

(أَلطُهاوَة):سەرتويّژى شيرو ماست يان قەتماغەى خويّن.

(أَلطَهاءَة):هەورى بەرز/ بلّند.

طاء: (طاءَ. طَوْءاً):هاتوچۆيكرد/ هاتو رۆيشت.

(-فِي الأَرضِ):لە رۆيشتنەكەيدا دووركەوتەوە/ دوور رۆيشت.

(تَطاءَ-تِ الأَسعارُ. تَطايُؤاً):نرخەكان بەرزبوونەوە/ شت گرانبوو.

(أَلطاءَةُ):١-لەومرگادا دووركەوتنەوە ٢-قورە رەش.

(أَلطوئِيّ):دەنگو ئاوەدانى.

(«مابالدار طوئِيّ»):خانووەكە ئاوەدان نييە/ كەسى تيّدا نييە.

طوب: (أَلطوب):خشتى سوور.

طوبَة:يەكدانەخشتى سوور.

(أَلطوّاب):خشتكەر/ خشتساز.

٢-(الطّوبوغرافيا (يونانية):نيشانەكردنى زەوىو ويّنەكيّشانىو لە هەموو روويەكەوە دەربخريّت كە چۆنەو چى تيّدايەو بەرزىو نزمىو باريتى.

الملحق:

طوب: (الطّوباويّ):١-ئەو كەسە يەكە كلّيسەى كاتۆليكى پىّ لە پيرۆزيى دەنيّت بەبىّ ئەوەى ريّزليّنانى لە هيچ كلّيسەيەكدا جاربدات.

٢-(أَلطوباويَّة):لە كاربەدەستيىو بەريّوەبردندا يان لە ژياندا حەزبكريّت بگەنە ئاواتيّكو بيرو بروايەك كە ناتوانريّت بهيّنريّتەدى.

---

طاحَ: (طاحَ. طَوحاً):١-ونبوو ريّى ليّهەلّە بوو/ سەرى ليّتيّكچوو ٢-نزيكى مردنبووەوە.

(-السَّهْمُ):تيرەكە دەرپەرىو نەيپيّكا.

(طَوَّحَ- هُ. تَطويحاً): پەرەوازەيكردو دووريخستەوە.

(-الشيءَ):شتەكەى ونكرد.

(-بِهِ):١-خستيە مەترسييەوە/ ناچارى كارو ريّى ترسناكيكرد ٢-بە حەوادا هەلّيداو بردى.

(«طَوَّحَت بِهِ طَوائِحُ الزَمَن»):قەوماوو كارەساتى رۆژگار بەرزەبرى خۆيخستو هەلّيداو تووريدا.

(طَيَّحَ- الشيءَ. تَطييحاً):شتەكەى ونكرد.

(طاوَحَ-هُ بِكَذا. مُطاوَحَةً):هەردووكيان ئەو شتەيان گرتە يەكترى.

(أَطاحَ-ه):١-مراندىو لەناويبرد ٢-فەوتاندى.

(-الشَعَرَ):قژەكەى وەراند.

(تَطَوَّحَ-فِي البلادِ):خۆى هاويشتە ولاّتەكەوەو تيايدا كەوتە گەران.

(-فِي البِئر):كەوتە چالاّوەكەوە.

(«نامَ على مَطِيَتهِ يَتَطَوَّحُ»): بەسەر

کەرەکەیەوە نوستو بەملاولادا دەکەوت.

(تَطاوَحَ- القَومُ فُلاناً بالأَمرِ أَو بالضَرب. تَطاوُحاً): خوێشگەل گەلەکۆمەکییان لە فیسار کردو کەوتنە شەڕو ناکۆکیو لێدانی.

(-ت بهِ النَّوی): گرفتارییو تووشبوون پەرەوازەو ئاوارەیکرد.

(اَلطَوَح): دوور.

("نِیَّةٌ طَوَحٌ"): نیازێکی دوور.

(اَلطَوائِح): پەرکەرەکان/ هاوێژراوەکان.

(اَلمُطاوِح والواحدة مطاحَة): ١-فەوتان لەناوچوون ٢-فەوتگە/ شوێنی مەترسی/ هەڵەمووت.

(اَلمِطْواح): داردەست.

طاخ: (طاخَ-ُ. طَوْخاً): بێناموسیی دەربارە کرد چ بە زمان چ بە کردەوەو لەکەداریکردو ئابرووییبرد.

طَوَّخ: لەکەدارکەری ئەمو ئەو بە زمان یان کردەوە.

طاد: ١-(طادَ. طَوداً): بنجبەستبوو/ چەسپیوو.

(اَلطَوْد (مص) (ج) أَطْواد وطِوَدَة): ١-کێوی مەزن ٢ بان.

(اَلمُنْطاد (ج) مَناطید): بە پێی پێوەریش (مطاوِد)ە بەرزایی/ بەرز/ بڵند.

(«بِناءُ مُنطار»): خانەیەکی بەرز/ بینایەکی بڵند.

٢-(طَوَّدَ- فِي البِلادِ): بە وڵاتەکەدا خولایەوە/ گەڕا.

(-بهِ): ناچاریکرد/: زۆری لێکرد بە بەبیابانێکی فەوتگەدا بڕوات.

(تَطَوَّدَ- فِي البلادِ): بە وڵاتەکەدا خولیخواردو گەڕا/ سوورایەوە.

(إِنْطادَ): (بە هەوادا/ بە ئاسماندا) چوو.

(أَلتَطْواد= التَطْواف): سووڕانەوە/ گەڕان/ خولخواردن.

(أَلمَطادَة): بیابانێکی وشکی بەرفراوانی دوور.

(أَلمَطاوِد): جێی مەترسی/ شوێنانی مەترسیدار.

(اَلمُنْطاد (ج) مَناطِید (والقیاس مَطاوِد): باڵۆن.

طار: ١-(طارَ- بفُلان. طَوراً و طَوَراناً): لە فیسار نزیکبووەوە.

(أَلطَوْر (مص) (ج) أَطوار): ١-ئەوەی بەرامبەر شتەکە بوو یان لە تەنیشتیەوە بوو/ نزیکیبوو ٢-هێندە/ ڕادە. ئەندازە/ سنوور.

(«عَدا طَورَهُ») و «جاوز طَورَهُ»): لە ئەندازەی خۆی دەرچوو ڕەتبوو.

(أَلطُور): ١-حەوشەی خانوو ٢-شتێك لە ئەندازەو سنووری خۆی بێت یان بەرامبەری بێت.

(أَلطَوار): بە ئەندازەی شتەکە بێت یان بەرامبەریبێت/ ڕێکیبێت.

(«هــذه الدار على طَوار داري»): ئەم خانوە دیــواری بە خانووەکــەی منەوەیــە/ لە پاڵ ئەودایە ڕێکی ئەوە.
(ألطَوار والطِوار): حەوشەی خانوو.
(طــارَةُ المنخَلِ والصَحيــح الإطار): کەمەی بێژنگ/ کەڵەی هێڵەك و بێژنگ.
(«بَلَــغ فُلان في العِلم أطْوَرَيْه»): فیســار لە زانســتدا گەیشــتۆتە ئەوپەڕی واتــا هەردوو سەری سەرەتایی و بنەتای.
٢-(ألطَــور (ج) أطوار): ١-چۆنیەتی و ڕەوالەت ٢-بار ٣-جۆر.
(«النــاسُ أطــوارٌ»): خەڵــك جۆراوجۆرن و هەریەکە بە شێوەیەکەو لەسەر باریکە.
«أتيتُهُ طَــوراً بَعد طورٍ»: جار لە دوای جار هاتمە لای.
(ألطُور): شاخ/ چیا/ کەژ/ کێو.
(ألطُوريُ): سەیرو سەمەرە.
(ألطُوريُّ والطُورانِيُّ): مەلی دەشــت و کێوو مرۆڤی ناشارستانی/ کێویلە.
("مابالدارِ طُــوريُّ أو طورانِيُّ"): خانووەکە کەسی تێدا نییە.
(ألطارُ والطارَةُ) (مو) (عامية): تار.
(لَقِــيَ مِنـــهُ الأطْوَرَيــن): لێــوەی تووشــی (چورتومێکی/ بەڵایەکی) قورسبوو.
٣-(الطوربيــل= الطوربيــد) (ايطاليــة): تۆربید گولله هاوێژراوێکی لوولەکیی شێوەیە کــە پڕکراوە لە مادەی تەقینــەوە بە دیواری پاپــۆڕەوە دەنرێــت و تیایــدا دەتەقێتــەوەو پاپۆڕەکە نوقومدەکات.
الملحق:
طور: (طَــوَّرَ- الشــيءَ): شــتەکەی گۆڕی و گەشەی پێکرد/ پەرەی پێسەند / پەرەی پێدا ٢-لــە بارێکەوە (خســتیە/ بردیە) بارێکیتری باشتر.
(«طَوَّرَ المُجتَمَعَ»): کۆمەڵگاکەی بەرەوپێشەوە بردو بەرەو باشتر برد.
(تَطَــوُّر): لە بارێکــەوە بۆ بارێکیــتر گۆڕرا. وردە وردەو/ بــە شــێنەیی لــە بارێکە چووە بارێکیتر.
(«تَطَوَّرَ المَــرَض»): نەخۆشــییەکە گۆڕانی بەسەردا هات.
(«تَطَــوَّرَ المَوقِــف»): هەڵوێســتەکە گۆڕانی بەسەردا هات و وەکو خۆی نەما. لە ڕەوشێکەوە بۆ بارێکیتر بەرزبووەوەو گەشەیکرد.
تَقَدَّمَ: پێشــکەوت. ("تَطَــوَّرَتِ الجراحَةُ"): نەشــتەرگەریی گۆڕانی بەسەردا هات و بەرەو پێشەوە چوو.
(ألتَطَوُّر): گۆڕان/ لــە بارێکەوە بۆ بارێکیتر چوون/ گۆڕانێکی شــێنەیی لە ڕەوشێکەوە بۆ ڕەوشێکیتر.
(«تَطَوُّرُ الوَرَم»): گۆڕرانی سەر لوو و بەرەو خراپچوونی.

("تَطَوُّرُ الأَحداث"): وەرگەڕانی ڕووداوەکانو گۆڕانی.

(التَطَوُّر): سەرکەوتنو بەرەو پێشچوون.

(التَّقَدُّم): پێشکەوتن. (اَلتَطوُّر الإجتماعي): بەرەوپێشچوونو گەشەکردنی کۆمەڵایەتی.

(تَطَوُّر الجراحة): پێشکەوتنو بەرەوپێشچوونی نەشتەرگەریی.

(اَلتَّطَوُّر- في علم الأحياء): گۆڕان لە زانستی زیندەوەردا: گۆڕانی زیندەوەر بەرەو باشی یان خراپی بە درێژایی سەدە مێژوویەکان.

(اَلتَطَوُّرِيَّة): بیردۆزێکی فەلسەفی یان زانستیە کە ڕوودانی گۆڕان لەناو زیندەوەرەکاندا دیاریدەکاتو ئەو گۆڕانە ڕووندەکاتەوە بەناوبانگترین زانایانو دیارترینیانی لامارکو داروینە.

---

طاس: ١-(طاسَ- الوَجهُ طَوساً): ڕووەکە لووسبوو/ جوانبوو.

(طَوَّسَ-هُ): جوانیکردو ڕازاندیەوە.

(-المُصَوِّرُ): وێنەکێشەکە وێنەی تاوسی کێشا.

(تَطَوَّسَ-تِ المَرأَةُ): ژنەکە خۆی وەك تاوس ڕازاندەوەو ئارایشتیکرد.

(-لِلحَمامَة): نێرە کۆترەکە بۆ مێکەی خۆی فشکردەوەو بە دەوریدا هات.

(اَلطَوس) (مص): هەیف.

(اَلطاؤُوس والطاووس (ج) أطواس وطَواويس) (ح): تاوس/ باڵندەیەکی شێوە جوانەو دەنگبەرزە لە کۆمەڵەی مریشکە. شوێنی سەرەتای هیندستانو مالیزە ملێکی درێژو سەرێکی بچوکی هەیە کە کڵاوێکی جوانی پێوەیە.

(طُوَيس): تاوسۆك/ تاوسی بچووك.

٢-(طاسَ- الشَيءَ طَوساً): شتەکەی ژێرپێنا/ پێی پێدانا.

٣-(طَوَّسَ-بِهِ): بردی.

٤-(الطاس (ج) طاسات): جامی پێخواردنەوە.

(الطُوس): دەرمانێکە سك دەچێنێت.

طوش: (طَوَّشَ- الرَجُلُ): وامدارەکەی/ خاوەنقەرزەکەی خایانو دەستیدەستیی پێکرد.

(-الذَكَرَ): نێرەکەی (خەساند/ یەختەکرد).

(اَلطواشيّ (ج) طَواشِيَة (فارسية): خەساو.

طاع: (طاعَ- لِفُلان. طَوْعاً): ملی بۆ فیساردا/ گوێرایەڵییکرد/ بەگوێیکرد.

(طائِع (ج) طُوَّع وطائِعون): ملدەر/ گوێرایەڵ/ گوێدەر.

(«أَمَرَهُ فَأَطاعَ»): فەرمانیدایە ئەویش بە گوێیکرد.

(«لِسانُهُ لايَطوعُ بكذا»): ئەوەی بە زماندا بە دەمدا نایەت.

(«طاعَ لَهُ المَرْتَعُ»): لەوەڕگاکە بۆ ئاژەڵەکەی خۆشبوو و کەی بیەوێت ئاژەڵەکەی تێدەکات.

(طَوَّعَ-هُ): وايلێكرد (ملبدان) گوێڕایەڵبێت.
(-ت لَهُ نَفسُـهُ كذا): دەروونی ڕێی ئەوەیدا ئەو كارە بكاتو بۆی ئاسان كرد.
(طـاوَعَ-هُ في الأمـر وعَلَيـهِ): بـۆ كارەكە لەگەڵیدا ڕێككەوتو ملیدا.
(«طـاوَعَ لَـهُ المُـرادُ»): ئامانجەكـەی/ خواسـتەكەی بـە سـووكیی بۆ هاتـە دیو ئاسـانبوو. ئامانجەكـەی/ خواسـتەكەی بە سووكیی بۆ هاتە دیو ئاسانبوو.
(أَطـاعَ-هُ. إطاعَةً وطاعَـةً): گوێڕایەڵیبوو/ ملی بۆ دا/ فەرمانییكرد/ بەگوێیكرد.
(أطاعَ-هُ وأطـاعَ- لَهُ المَرعـى): لەوەرگا كە فراوانبـوو و توانـیو بـۆی لـوا ئاژەڵەكەی بلەوەڕێنێت.
(تَطَـوَّعَ): ملدانیـی نوانـد/ گوێڕایەڵیـی پیشاندا.
(«تَطوَّعَ في الجُندِيَّة»): خۆیكردە سـەرباز/ ئەركی سەربازیی گرتە ئەستۆی خۆی.
(-بالشَـيءِ وللشيءِ): ئەنجامدانی ئەو شتەی (گرتە/ خستە) ئەسـتۆی خۆی توانای خۆی بۆ تەرخانكرد.
(إنْـطـاعَ- لَـهُ إنـطـيـاعـاً): ملـی بـۆدا/ گوێڕایەڵیكرد/ نافەرمانیی نەكرد.
(إستَطاعَ- الأمرَ. إستِطاعَةً): توانای كردنو ئەنجامدانی كارەكەیبوو.
(إسـتَطاعَ- يَستَطيعُ إسـطاعَ يَسطيعُ): (بە فریدانی ت) كە: تواناو هێزو گوریبوو.
(أَلطَواعَـةُ): ملـدان/ گوێڕایەڵبـوون بـە فەرمانكردن.
(أَلطَواعِيَةُ): ملدان/ گوێڕایەڵیی.
(«فُلان حسن الطَواعِيَةِ»): فیسار گوێدێرێكی باشە/ تەواو ملدەرە.
(أَلطاع والطَوْع والطَيِّع): گوێدێر/ گوێڕایەڵ/ ملدەر.
(«هـو طوعُ يَدِكَ»): ئـەو جڵەوگیری تۆیە/ گوێڕایەڵی تۆیە/ گوێدێرە.
(«فَرَسٌ طوعُ العَنانِ»): چارەوێیەكی نەرمەو زوو دێتە جڵەو.
(«عَمَلَهُ طَوعاً»): خۆبەخش كارەكەیكرد.
(أَلمِطـواع والمِطواعَة= المُطيـع): گوێڕایەڵ/ ملدەر/ گوێدێر.
٢-(أَطـاعَ- الشَـجَرُ): درەختەكـە بەرەكەی گەیاند.
٣-(تَطَوَّعَ- بالشَيءِ): شتەكەی بەخشی.
(أَلتَطَوُّع والطُوَّع): خۆبەخش/ كەسێكە جگە لە ئەركی سەرشـانیو فەرزەكان كاری چاكو خێرخوازیی دەكات.
(أَلمُطَوِّعَةُ): كەسانێكن كە بۆ جیهاد دەروونو خۆبەختن.
الملحق:
طوع: (أَلمُطاوَعَة): گۆڕانی لە باری درێژیی یان قەبارە یان شـێوەی تەنێك لەژێر كارتێكردنی

هێزێکـدا، ئەگەر ئەو هێزی کارتێکردنەیشـی لەسەر لاچێت هەر ناگەڕێتەوە دۆخی جارانی.

طاف: ١-(طـاف- بالمَـكانِ وحَولَـهُ. طَوْفاً وطَوافـاً وطَوَفانـاً): خولی شـوێنەکەیدا/ سـووڕی شـوێنەکەیدا بە دەوری شوێنەکەدا سووڕایەوە.

(-في البلاد): بە وڵاتەکەدا (گەڕا/ سووڕایەوە)/ گەشتیکرد.

(-بـهِ الخَيالُ. طَوْفـاً): هاتـە خەونیەوە/ خەونی پێوەبینی.

(طَوَّفَ. تَطْويفاً وتَطْوافاً): تیایدا سووڕایەوە.

(-في البِـلادِ): بە شـارەکەدا یـان وڵاتەکەدا (گەڕا/ سووڕایەوە)/ پیادا ڕۆیشت.

(-بالشَـيءِ وحَولَهُ): زۆر خولی شـتەکەیدا/ بەدەوریدا زۆر سووڕایەوە.

(-النـاسُ أَوِ الجرادُ): مرۆڤ یان کولله ڕووی زەوییان پڕکردو وەك لێشاو دایانپۆشی.

(اطافَ- بِالشَّيءِ): ١-لە شتەکە گەیشتو چووە بنجو بناوانیەوە ٢-لە شتەکە نزیکبووەوە.

(-بِهِ): بە شەو بۆ لای بۆی چوو.

(-عليه): ١-بەشەو چووە لای ٢-خولیدا.

(تَطَـوَّفَ بالشَـيءِ وحَولَـهُ): زۆر خولـی ئەملاولای شتەکەیدا.

(إِسْتَطافَ- ه إستِطافَةً): تیایدا سووڕایەوە.

(- بالشَيءِ وحَولَهُ): زۆر بەملاولایدا سووڕایەوە.

(أَلطَـوْفُ): ١-سـەرئاو کەوتـوو ٢-قەیاخ کە پێـی دەپەڕنەوە/ کەڵـەك چەند کوندەیەکە بادەدرێـتو بەیەکـەوە دەبەسـترێتو بـە تەختەو دارەوە پێکەوە قایمدەکرێن/ لەسەری چەسـپدەکرێن دەبێتـە هۆ بـۆ گوێزانەوەو پەڕینەوە (لە ڕووبارو چەمی گەورەدا)

٣-(- (ج) أَطواف): حەسـحەس/ پاسـەوانی شـەو/ ئێشکگرانی شـەو کە دەگەڕێنو پاسی گەڕەكو خەڵکدەکەن/ شەوگەڕ ٤-دیوار.

(أَلأَطواف الضَّرفِيَّـة) (ا ع): توورەکە کە لە لاستیك دروستدەکرێت.

(أَلطَّـاف): فرە چەرخـدەر/ زۆر گـەڕۆك/ گەڕیدە/ کەسێکە زۆر بێتو بچێت.

(أَلطُوفان): ١-لافاوی خنکێنەر ٢-شەوەزەنگ/ شـەوی زۆر تاریکی ئەموسـتەچاو ٣-مردنی خێرای بە کۆمەڵ وەك پەتا خەڵك ڕابماڵێتو بکوژێت.

الطوفان (-مِن كُلِّ شيءٍ): هەموو شتێکی بە لێشاو.

(أَلطائِف) (فا): حەسـحەس/ پاسەوانی شەو کـە بە شـەو دەگەڕێـتو پارێزگاریی خەڵك دەکات/ شەوگەڕ.

(الطائِفَةُ (ج) طائِفات وطَوائِف): مێی وشەی (الطائف).

(أَلطَوَّاف): ١-کەسـێکە کـە زۆر بێو بچێت/ چەرچـی ٢-نۆکـەر/ خزمەتـکار ٣-خـاوەن کەڵكو خاوەن قەیاخ ٤-کەسـێکە کە کەڵەكو

قەياخ دروستبكات.

(أَلطَوَّافَة): مەشــخەڵ/ چراوگ کە شــەو بە ڕووناکییەکەی دەگەڕێن.

(أَلمطاف): جێگەڕان.

٢-(الطائفَة (ج) طائِفات وطَوائِف): ١-بەرە/ تايەفە/ تيرە/ فاميليا ٢-پارچەشت ٣-ئەوانەی يەکران يان يەکرێڕەون‌و لە خەڵکيتر جيان.

الملحق:

طوف: (الطائِفِي): تيرەگەريی‌و ڕێڕەو گەری ئاينيی.

(مدرسة طائِفِيَّة): قوتابخانەی تيرەگەريی.

(خلاف طائِفِي): ناکۆکيی ڕێڕەوگەريی.

(الطائِفِيّ): دەمارگيريی بۆ ڕێڕەوە ئاينيەکەی يان بۆ تيرەکەی.

(أَلطائِفِيَّــة): ڕەوشــێکی کۆمەڵايەتيــی‌و راميارييــە لەســەر بنچينــەی تيرەگــەری‌و ڕێڕەوگەريی وەستاوە.

(أَلتَّعَصُّــب لِطائِفَة دينيــة): دەمارگيريی بۆ ڕێڕەوێکی ئاينی.

(نَبْــذُ الطائِفيَّــة): واز لــە تيرەگــەری‌و ڕێڕەوگەريهێنان.

---

طاق: ١-(طاقَ- الشيءَ طَوقاً وطاقَةً): توانای بەســەر ئەو شتەدا هەبوو/ توانای ئەو شتەی هەبوو.

(طَوَّقَ-هُ الشــيءَ): ئەنجامدانی شتەکەی بەو سپارد.

(أَطاقَ –الشيءَ): شتەکە لە وزەی ئەودا بوو/ توانای بەسەريدا شکا.

(-على الشيءِ): توانای بەسەر شتەکەدا شکا/ شتەکە لە وزەی ئەودا بوو.

(أَلطاقَة): وزە/ توانای بەسەر شتدا شکان.

(لاتُحَمِّلنــا مــالا طاقَةَ لَنا بــِه"): بارێکمان بەســەردا مەدە کە پێمان هەڵنەســتێت‌و لە وزەی ئێمەدا نەبێت.

(أَلطاقَة): قايميی‌و تينی دەزوو و شــتی لەو بابەتــە يان گورزە گيــاو چەپکەگوڵ‌و کلافە دەزوو، چنگە مووو قژو باوەشە گيا.

(أَلطاقَة الكهربائية): وزەی کارەبا.

(طاقَة جســم ما): ئەو وزەو توانايەی کە لە تەنێکــدا هەيەو دەتوانێت کارێکی پێ ئەنجام بدات. ئەو وزە کارەبايەی کە لە بەندێکدايە.

(طاقة نواة الذَرّه): وزەی ناوکە ئەتۆميی.

(أَلطَوق): توانای کردنی شتێك.

(«هذا في طوقــي»): ئەمە لــە توانای مندا هەيەو دەتوانم ئەنجامی بدەم.

٢-(طَوَّقَ-هُ الطَوقَ): (گەردنلغ/ گەدنبەند)ی کردە ملی.

(«طَوَّقَهُ بالسَّيف أَو غَيرِه»): بە شمشێر يان شتيتر گەمارۆيدا.

(تَطَوَّقَ): گەردنبەندی کردە مل.

(-تِ الحَيَّــةُ): مارەکــە خــۆی گرمۆڵە کرد/ پەپکەيخوارد.

(إِطَّوَّقَ): گەردنبەندی کردە مل.

(أَلطاق (ج) طاقات وطيقان) (ب) (فارسية): تاقی پەنجەرەو بنمیچو پردی کەوانەیی.

(أَلطَّاقَــة) (عاميــة): پەنجــەرەی دیــواری خانوو.

(طائِق كُلِّ شَيءٍ): هەموو شتێکی بازنەیی کە دەوری شتێك بدات.

(أَلطَوق (ج) أَطواق): ١-گەردنبەند ٢-گەردن/ مل ٣-هەر شتێك خولی شتێکبدات.

(أَلْمُطَوَّقَة): ١-کۆتری گەردن بەچەمەرە قومری ٢-سوراحیی گەورەی گەردن بە چەمەرە.

٢-(الطاق): کراسی بێیەخە.

(أَلطاق والطائِق): تاوێرێکی لووتدەرپەڕیوی شاخ.

طال: ١-(طــالَ. طُــولاً): درێژ بوو/ کشــا/ درێژەیکێشا.

(طَوَّلَ-هُ): درێژیکرد/ درێژەی پێدا.

(-لَهُ): لەسەر ڕێوەستا/ مۆڵەتیدایە.

(-لِلدابَةِ): پەتــی وڵاخەکەی لە لەوەرگاکەدا شلکرد.

(طاوَلَ-هُ. مُطاوَلَــةً): ١-خایاندی/ ئەمرۆ بە سبەیی پێکرد/ دەستیدەســتیی پێکرد ٢-لەو درێژتر بوو.

(أَطــالَ-هُ إِطالَةً): ١-درێژەی پێــدا ٢-درێژی کردەوە.

(-تِ المَرأَةُ): ژنەکە منداڵی درێژ درێژیبوو.

(أَطْوَلَ-هُ إِطْوالاً): درێژتریکرد.

(تَطاوَلَ): ١-درێژیی خۆی پیشاندا ٢-بە پێوە خۆی درێژکرد تا لە دوورەوە شت ببینێت.

(-عليه العُمــرُ): تەمەنی درێژ بوو/ زۆر بە ساڵدا چوو.

(إِسْــتَطال. إِسْــتِطالَةً): درێژ بوو/ درێژەی کێشا.

(أَلطُــوْل (مــص) (ج) أَطْــوال): ١-درێژیی/ پێچەوانەی پانیی ٢-دژی کورتیی ٣-درێژییو دووریی شوێنێکی سەر زەوی (فك): ئەو گۆشە دوانییەیە کە لە نێوان حاســتی ناوەڕاســتی ڕۆژدا کە خۆر لە ناوەڕاســتی ئاسماندا دەبێت لە شوێنێکداو حاستی ناوەراستە بنەڕەتیەکەی نیــوەڕۆدا. ئەمڕۆ درێژیــی ڕۆژ لای ئێمە لە خۆرهــەڵاتو خۆرئاوای گرینتیــش بەرچاو دەگیرێت کە (٣٥ ٢٨ ١٠,٥ج)یە

(الطول السماوي لِكوكَب ما (فك): درێژییو دووری ئاسمانیی هەسارەیەك: ئەو گۆشەیەیە کە لە نێــوان ڕووی دوو بازنەی گەورەی گۆی ئاسمانییو کە ســتوونیی دەبن لەسەر ڕووی گەردوونی کولوەکان دروستدەبێت کە یەکێکیان بە هەســارەکەدا تێدەپەڕێــتو دووەمیان بە خاڵی فێنکیی بەهاردا ڕەتدەبێت.

(أَلطَــوال الطِــوَال والطَيل والطِيــال): بە درێژایی ڕۆژگار/ هەتاهەتایە.

(«لا أَفْعَلــه طَــوالَ الدَّهر»): بــە درێژایی

(رۆژگـــار/ هەتا هەتايـــە) ئـــەو كارە ناكەم/ هەرگيزاوهەرگيز ئەو كارە ناكەم.

(أَلطُوَّال) (ح): لۆقنەبالّنـــدە كە بالّندەيەكى ئاوييە.

(أَلطُوال (م) طُوالَة): درێژ.

أَلطُوَّال: زۆر درێژ.

(أَلطويل (ج) طِوال وطِيال (م) طَويلَة (ج) طَويلات): بالآبەرز/ بەبالاّ/ هەلّكشاو/ درێژ.

("فلان طَويل الباع"): فيسار ١-بەدەستو دلّە/ جوامێرە ٢-بە دەسەلاّتە/ دەسترۆيشتووە.

(«قَصــيرُ البـــاع»): ١-بێتوانا/ بێدەســەلاّتە ٢ چرووك يان دەست نەرۆيشتووە.

(أَلطيْلَة): ١-تەمەن.

("أَطــالَ اللهُ طيْلَتَهُ"): خـــودا تەمەنى درێژ كرد يان درێژ بكات ٢-درێژايى رۆژگار.

(أَلأَطْــوَل (ج) أَطاوِل (م) طُولَى (ج) طُوَل): درێژترو درێژترين.

(أَلسَبْع والطُوَل): حەوت سوورەتە درێژەكەى قورئان.

(أَلطاولة) (ايطالية): مێز كە لە دار بێت.

(أَلِطْوَل (ج) مَطاوِل): هەوسار/ رەشمە.

٢-(طالَ- عَلَيهِ. طُولاً): ١-ســەريكەوت ٢-لەو بەرزو بالاّتر بوو/ پلەوپايەى لەو بەرزتر بوو ٣-دەستگيرۆييكرد/ يارمەتيدا.

(طاوَلَ-هُ مُطاوَلَـــةً): لەو بە بالاّتر بوو/ لەو بەرزتر بوو.

(تَطَوَّلَ-عليه تَطَوُّلاً): ياريدەيدا يان منەتى بەسەردا كرد/ چاكەكەى بە چاويدا دايەوە.

تَطــاوَلَ: ١-خـــۆى بـــاداو فيـــزى نوانـــد/ لووتبەرزييكـــرد ٢-دەســـتدرێژييكرد ٣ ملـــى درێژ كردو خۆى هەلّبڕى شتێك ببينێت.

(تَطاوَلا): پێشبڕكێيانكرد.

(إِسْــتَطال. إِسْــتِطالَةً): درێـــژ بـــوو/ خۆى راكێشا.

(-عَلَيهِ): چاكەى لەگەلّدا كردو دەستيگرت.

(-على عِرضِهِ): نامووســـيبرد/ ئابڕوويبردو نامووسى شكاند.

("إِسْــتَطالُوا على القَوم"): دەستدرێژييەكى وايـــان كـــردە ســـەر خوێشـــگەل چەنديـــان لێكوژرابوو زياتريان لێكوشتن.

(أَلطَــوْل): ١-توانـــا/ دەســـەلاّت ٢-بـــوون، دەولّەمەنديى ٣-چاكە ٤-بەخشين.

(أَلطائِــل والطائِلَـــة (ج) طَوائِـــل): ١-توانا/ دەســـەلاّت ٢-دەولّەمەنديى/ بـــوون ٣-چاكە ٤-كەلّكو سوود.

(«هذا أَمـــرٌ لا طائِلَ فيـــهِ»): ئەمە كارێكە بێكەلّكە.

(«ماهو بطائِلٍ أَو هو غيرُ طائِلٍ»): زۆر نزمە زۆر نابووتو پووچەكە (نێرو مێ تيايدا وەك يەكە).

(بَينَهُم طائِلَـــةٌ): دوژمنايەتيان لـــە نێواندا هەيە.

(ألطُولَى): بارى پايەبەرزى.

طــوى: ١-(طَوَى- الثــوبَ طَيّــاً): جلەكەى پێچايەوە/ نوشتانيەوە.

(-اللهُ عُمْــرَهُ): خــودا تەمەنــى پێچايەوە/ مراندى.

("طُوِيَ فُلانٌ وهو مَنشورٌ"): فيسار مرد ناوو پاشماوەيەكى باشى بۆ خۆى بەجێهێشت.

(-البلادَ): شارەكە يان ولاَتەكەى بڕىو پيايدا گەڕا.

(-البئــرَ): (چالاوەكــەى/ بيرەكەى) بە بەرد هەڵچنى.

(تَطَــوَّى-تِ الحَيَّةُ): مارەكــە پەيكەيخوارد/ خۆى گرموڵە كرد.

(إنْطَوى): پێچرايەوە/ لوولدرا/ گرموڵە بوو.

(-القَومُ عَلَيه): خوێشــگەل چواردەوريانــدا/ گەمارۆياندا/ لێى كۆبوونەوە.

(إطَّوى): پێچرايەوە/ لوولدرا يان قەدكرا.

(ألطَّوَى والطِوى): شتى قەدكراو/ نوشتاوە..

(ألطَوَى): كوندەى ئاو.

(ألطِيَّــة): قــەد/ پێچ نوشــتە/ پێــچ/ توێ ٢-كەنارولا.

(«لَقَيتُهُ بطَيَّاتِ العراق»): لەملاولاو كەنارى عيراقدا پێيگەيشتم.

(ألطَــوِي (ج) أطواء): ١-(گورزەيەك/ قوڵێك) گەنم ٢-كاتژمێرێكى شەو.

(ألطَوِيّ والطَوِيَّة): (بيرى/ چالاوى) سەرگيراو/ داپۆشراو.

(ألأطْواء واحِدُها طوى): بڕگەى كلكى كوللە كە وەك گرێ وايە.

(ألمَطــوى (ج) مطاوي الأمعــاء أو الحيَّة أو الثَــوب): پێچى ڕيخۆڵە يــان مار يان لۆچى/ قەدى كراسو جل

٢-الموسى (عامية): گوێزان.

(ألمِطوى): هەڵپێچ/ تەشى.

٢-(طوى- كَشْــحَهُ على الأمــرِ طَيّاً): نيازى كارەكەى شاردەوە.

(«طوى كَشــحَهُ عَني»): لێــم لووتەلا بوو و لێم دووركەوتەوەو تۆرا.

(طــوى- الحَديــث): قســەكەى پەنهانكرد/ نەيدركاند/ شارديەوە.

(ألطَيّ) (مص): پێچانەوەو توێنان.

(طَيُّ الشــيءِ): توێى شــتەكە/ ناو شــتەكە/ لۆچى شتەكە.

(«ألغَــيّ في طــي قَلبِهِ»): نيــازى خراپى لە توێى دڵدايە.

(ألطِيَّــة): ١-نياز/ ئــارەزووى دڵ ٢-ويژدانو خواست.

(«مَضى لِطِيَّتِهِ»): بەرەو نيازو خواستى دڵى ڕۆيشتو لە كۆششدا بوو.

(ألطَويَّة): ويژدانو نياز.

(فلان حَســنُ الطَويَّة): فيســار بە ويژدانو نيازپاكە.

٣-(طَوى-الرَجُـلُ. طَيّاً): بــه ئارەزوو خۆی برسیکرد.

(-السيرُ فُلاناً): ڕۆیشتنی زۆر چرووساندیو لاوازیکرد.

(طَويَ وأطوى. طَوىً): برسیبوو.

(طَيَّان وطَوٍ وطاوٍ (م) طَيّاً وطَويَةً وطاوِيَةً): برسی.

(ألطَوى): برسێتیی.

(طاوِ البَطن): سکتێقوپاو.

٤-(ألطايَةُ (ج) طايات): سەربان.

(ألطِوايَة): تاوە (سريانية).

الملحق:

طــوي. المطــواة: چەقۆیەکــی بچکۆڵــە کە ئەنوشتێتە دەستکەکەیەوە.

طــاب: ١-(طــابَ. طيبــاً وطابــاً وطيبَــةً وتَطْياباً): خۆش‌و شیرین‌و جوان‌و چاکبوو.

(-الشــيءَ): شــتەکەی خۆش‌و شــیرینکرد/ جوان‌و چاکیکرد.

(-تِ النَفسُ بِكَذا): دەروون بەوە گەشایەوەو خۆشیی تێکەوت.

(- عيشُهُ): ژیانی خۆش‌و تێرو تەسەلبوو.

(-تِ الأَرضُ): زەویەکــە ســەوز بــوو/ پــڕ گیابوو.

(طَيَّبَ- خاطِرَهُ): دڵنەواییکرد/ دڵی هێنایەوە جێ‌و ستارەو ئارامی بە دڵیدا.

(-الشَــيءِ): ١-شتەکەی بە خۆشــی‌و بەچێژ زانی یان شــتەکەی چێژ خۆشکرد ٢-شتەکەی بۆنخۆشکرد/ بۆنی خۆشی پێداکرد.

(طايَبَ-هُ. مُطايَبَةً): گەمەو قسـەی خۆشی لەگەڵدا کرد/ سوعبەتی لەگەڵدا کرد.

(أَطابَ. إطابَةً): قسەی شیرین‌و خۆشیکرد.

(-الشيءَ): شتەکەی خۆشکردو چاکیکرد.

(أَطْيَبَ-الشيءَ إطياباً): شتەکەی بە خۆش‌و شیرین‌و چاکزانی.

(تَطَيَّبَ- بالطيبِ): بۆنی خۆشی لە خۆیدا/ خۆی بۆنخۆشکرد.

(إسْــتَطابَ- القَومَ. إســتِطابَةً): داوای ئاوی شیرینی لێکردن.

(إستَطابَ واسْــتَطْيَبَ- الشَــيءَ إسْتِيطاباً): شتەکەی بە باش یان شیرین‌و خۆشزانی.

(ألطــاب) (مص): خــۆش/ بەچێژ ٢-شــیرین ٣-چاك/ باش ٤-حەڵاڵ ٥-باشترین شت ٦-بۆنخۆش.

(ألطّابَة): مەی.

(ألأَطيَــب (ج) أطايــب (م) طُوبــى (ج) طُوبيات): باشترین/ شیرینترین/ خۆشترین.

(ألأَطايب- مِنَ الشَيء): هەڵبژاردەی شت.

(ألطُوبى): ١-کەیفخۆشی‌و بەختیاری/ شادیی ٢-بێر/ فەڕ/ خێر.

(«طوبى لَــكَ وطوباكَ»): خۆشــی‌و ژیانی بەختەوەریت بۆ ببێت.

(ألطَيب) (مص): ١-باشــترینی هەموو شتێك ٢-حەڵاڵ/ شیاو/ ڕەوا.

(«هــذا طيبٌ لَــكَ»): ئەمە بۆ تۆ (شــیاوە/ حەڵاڵە/ ڕەوایە).
(الطیب (ج) أطیاب وطُیُوب): هەموو شتێکی بۆنخۆش/ هەموو بۆنێکی خۆش.
(أَلطَیبَةُ) (مص): ١-حەڵاڵ/ شیاو/ ڕەوا.
(طیبَةُ الخَمرِ): پاکترین‌و سافترین مەی.
("فَعَلــتُ ذلِــك بِطیبَةٍ"): ئــەوەم بێ زۆری خەڵك‌و بە دڵی خۆم کردووەمە.
(أَلطُیَّــاب): زۆر (چاك/ باش) زۆر خۆش زۆر جوان.
(أَلطَیِّــب (م) طَیِّبَــة (ج) طَیِّبات وطُوْبى): (کە ئەمەی دواوەیان کۆیەکی دەگمەنە).
١-سینەســاف/ دڵباش/ دڵگــەورە/ دڵپاك/ بە ســۆز/ پێچەوانەی دڵپیس‌و ناچاك ٢-حەڵاڵ/ شــیاو/ ڕەوا.١-سینەســاف/ دڵباش/ دڵگەورە/ دڵپاك/ بە سۆز/ پێچەوانەی دڵپیس‌و ناچاك ٢-حەڵاڵ/ شیاو/ ڕەوا.
(«كَلِمَةٌ طَیِّبَةٌ»): وشــەیەکی خۆشــی باشی پاکی لە دڵی سافەوە هاتوو.
(بَلْدَةٌ طَیِّبَةٌ): وڵاتێکی خۆشــی ئاسوودەو پڕ خێروبێر.
(أَلمَطایِب- مِنَ الشيء): ناوێزەو هەڵبژاردەی شت.
(شَــرابٌ مُـطَـیَّـبَـةٌ): خـواردنـەوەیـەکـی/ شەربەتێکی دەروون فێنککەرەوەو خۆشیدەر.
٢-(طــابَ- عَنِ الشــيءَ نَفســاً. طِیْباً وطاباً وطیْبَةً وتَطْیاباً): دڵی لە شــتەکە هەڵکەنراو وازی لێهێنا/ بەرەڵایکرد.
٢-(أَلطابَة) (ترکیة): تۆپی یاریپێکردن.
(أَلطّابیَّــة عِنــدَ المُوازَنَــة (ایطالیــة): تەپلــە لای مەوارینــەکان خێرخوازەکانیــان لەسەریدەکەن.
طاح: (طاحَ. طَیْحاً= طاحَ. طَوْحاً): ١-فەوتاو/ ونبوو/ ڕێیهەڵەکرد.
(طَیَّــحَ-ەُ): گومڕایکــرد/ ڕێیلێهەڵەکــرد/ ونیکرد.
(-الشيءَ): شتەکەی ونکرد.
(أَطاحَ-ەُ): فەوتاندی/ مراندی.
(تَطایَحَ- الشيءُ): شــتەکە پەراگەندە بوو و بە ئاسماندا چوو.
(أَلطَیْحَــةُ): جارێك فەوتان. جارێك ونبوون. جارێك پەراگەندەبوون.
(أَصابَتْهُم طَیْحَةٌ): تووشی کاروبارێکبوون لە یەکیکردن/ لێکیجیاکردن.
("طَوَّحَتْهُــم طَیْحاتٌ"): فەوماوی ســەخت لەناویبردن/ فەوتاندنی.
طــاخ: ١-(طــاخَ. طَیْخاً): ١-بە شــتی پیس‌و ناشــیرین لەکەدار بوو ٢-بە بەدکاریی‌و کاری نارەواوە گلاو خەریکبوو.
(-الأمرَ): کارەکەی گەنکرد.
(-ەُ): شتی ناشیرینی دایە پاڵ‌و لەکەداریکرد.
(طَیَّــخَ- أصحابَــهُ): جنێــوی بە دۆســتو

هاوڕێکانیداو پێی لەسەر ئەوە داگرت.

(-ه): بە شتی ناشیرین و پیس لەکەداریکرد.

(تَطَيَّـخَ): لەکەداری شـتی ناشـیرین و دزێو بوو.

(الطيخةُ): ناشووب.

٢-(طاخَ. طَيخـاً): لووتبەرزییکـرد/ فیزی نواند/ ترزلییکرد.

٣-(الطَيخَةُ والطائِـخُ والطَيَّاخُ): گەوجێکی بێفەر.

طـار: ١-(طارَ. طَيْراً وطَيَرانـاً وطَيْرُورَةً): فری/ سووکەڵە بوو خێرایکرد.

(-الطائِـرُ): باڵندەکـە (باڵیگـرت و فـری/ لەشەقەیباڵیدا).

(-بِكَذا): بەوە فری یان بەوە پێشکەوت.

(-إلى كـذا): خێـرا/ گـورج بـۆ لای ئـەوە ڕۆیشت.

(«طارَ طائِرُهُ»): تووڕە بوو/ تووکەسەر بوو.

(طَيَّرَ نَومَهُ): خەوەکەیزڕاند/ خەوەکەی لە چاو فراند.

(-هُ وطَيَّرَ-بِهِ): هەڵیفراند.

(طايَرَ وأطارَ-هُ. مُطايَرَةً وإطارَةً): وایلێکرد بفرێت/ فراندی.

(تَطَيَّرَ واطَّيَّرَ-بالشَّـيءِ ومِنهُ): لە شـتەکە ڕەشبینبوو/ بە بەدوومی دانا.

(اِسْـتَطارَ- الطَـيرَ. اِسْـتِطاراً): باڵندەکەی هەڵفراند.

(-السَّـيفَ- السَّـيفَ): چابووکانـە/ خێـرا شمشێرەکەی هەڵکێشا.

(أُسْـتُطِيرَ): ١-فرێنـراو بـرا وەکـو باڵنـدە هەڵیگرتبێت ٢-تۆقێنرا.

(-الفرسُ): چارەوێکە خێرایکرد، تاویدا.

(الطائِـر (فـا) (ج) طَيْر وطُيُـور أطْيار): باڵندە/ پەلەوەر/ مەل هەمـوو زیندەوەرێکی باڵدار.

(«هوَ مَيْمونُ الطائِر»): چارە پیرۆزە.

(«سِـر على الطَّائِرِ المَيمون»): بە خۆشـی بڕۆیت بە گوزارکار دەوترێت (نزابۆکردنە).

(«هـو سـاكِنُ الطائِـر»): ئەو سـەرمەندو هێمن و سەنگینە.

(«طارَ طائِرُ فلان») ئەگەر تووڕە بێت: تووکە سەر بوو. ئەگەر خێرا بڕوات: باڵیگرت.

(الطائِـر): ١-ئـەوەی پێی گەشـبینبیت یان ڕەشـبینبیت ٢-شـانس/ بەخـت/ ناوچەوان ٣-ڕۆژیی مرۆڤ.

(الطائِرَةُ (ج) طائِرات): فڕۆکە.

(طائِرَة رُكاب): فڕۆکەی سەرنشین کە خەڵك لـە وڵاتێك یان لە شـارێکەوە بـۆ یەکێکیتر دەگوێزێتەوە.

(طائِـرَة حَربِيَّة): فڕۆکـەی جەنگ کە زۆر جۆری هەیە.

(طائِرَةُ الطَرَّاد): فڕۆکـە ڕاونێن کە دوژمن ڕاودەنێت.

(الطائِرَة النَفّاثة): فرۆكەی گڕدەر.
(الطائِـرَة النافورية): فرۆكـەی خۆپاڵ كە فرۆكەیەكی خێرایە.
(الطائــرة القانِصَــة): فرۆكــەی ڕاوكاری فرۆكەی دوژمن.
(طائِـرَةُ الإنْقِضــاض): فرۆكــەی داهاتــن. كــە بەســەر ســوپای دوژمنــدا دێــتو ئاگر بارانیدەكات.
(القَلعَة الطائِرَة): فرۆكــەی بۆمباهاوێژ كە فرۆكەیەكــی زۆر گەورەیەو بۆردومانی وڵاتی دوژمندەكات.
(ألطَيْر) (مص): باڵندە/ مەل، پەلەوەر. كۆی وشەی باڵندەیە بە تاكیش دەوترێت.
(«كَأَنَّ على رؤوسِـهِم الطَيرُ»): دەڵێی سایمە لێیــداون. واتا لە ترســاندا كپو كــڕ (ئەمە لەوەوە هاتووە قەلەڕەشــكە بەســەر ســەری حوشترەوە دەنیشــێتەوە گەنەو سجی لەسەر دەكاتەوەو دەیڕژێرێت حوشترە هیچ ناجووڵێت نەوەكا قەلەكە هەڵفرێت).
(«لاطَيرَ إلا طَير الله»): تەنها فەرمان فەرمانی خودا هەیە.
(ألطِيَرَةُ والطِيَرَةُ): ئەوەی كە ڕەشبینی لێوە ببینرێت.
(ألطَيْرَةُ والطَيْرُورَة): هەڵەشەییو جرپنی.
(«إياكَ وطَيْرات الشباب»): ئاگات لە هەڵەشەییو جرپنیو سەرچڵیی هەرزەكاریبێت.

(ألطَيَران) (مــص): فڕین بە باڵ جووڵاندن لە هەوادا.
(ألطَيَــران الحَربــي): هێزی ئاســمانیی كە سەرپەرشــتی كاروبــاری فرۆكەكانی جەنگ دەكات.
(ألطَيَــران المدنــي): بەڕێوەبــەری فرۆكــە سەرنشــینەكان. كە سەرپەرشــتی ئەو جۆرە فرۆكانە دەكات.
(مصلحة الطــيران): بەڕێوەبەرایەتیی فڕین كە بە تەنــگ كاروباری فڕیــنو فرۆكەوە دێتو سەرپەرشتیدەكات.
(ألطَيّار (ج) طَيارون): فرۆكەوان.
(ألطيار- مِنَ الخَيل): ئەسپی بوێرو تیژڕەو.
(ألطُوَيْر): باڵندۆكە.
(ألطَيّارَة): ١-مێی وشەی (الطَيّار): فرۆكەوانی ژن ٢-سەرنشینگەی ئاسمانیی.
(ألمُطار- مِنَ الخَيل): ئەســپی ئازای تیژڕەوو بوێر.
(ألمَطار): فرۆكەخانە.
(أرضٌ مَطارَة): زەوییەك باڵندەی زۆر بێت.
٢-(طــارَ- صَيتُهُ. طَيراً وطَيَراناً وطيرورَة): ناوو ناوبانگی بڵاوبووەوە.
(طَيَّرَ وأطارَ- المالَ): داراكەی بەشكرد.
(تَــطــايَــر): پــــەرشو بـــڵاوبـــووەوە/ پەراگەندەبوو.
(-السَّحابُ في السَّــماءِ): هەور گشت ئاسمانی

گرتەوەو داپۆشی.

(إنطارَ-الشيءُ): شتەكە قڵیشا/ شەقیبرد.

(إسْــتَطارَ- الشــيءُ. إسْــتِطارَةً): ١-شــتەكە پەخشبوو/ بڵاوبوەوە ٢-جیاوبڵاوبووەوە.

(-الحائِــطُ): دیوارەكــە (درزی تێبــوو/ شەقیبرد).

(أُستُطيرَ- الصَدعُ في الحائِطِ): درزی دیوارەكە (دەرگەوت/ دەمیكردەوە).

(ألطَيّار): بڵاو بوو.

(أَلْمُطَيَّــر) (مفع): ١-بە ئاســماندا/ بە هەوادا بڵاوكــراوو فڕێنراو ٢-شــكاوی درز (تێكراو/ تێبوو).

(أَلْمُسْــتَطير) (فا): شــەوقدەرو ڕووناكیدەر/ شەوقپەخش.

("صُبح مُسْتَطير"): بەیانی ڕووناكیبەخش.

(برق مستطير): هەورەبروسكەی ڕووناكیدەر/ شەوقدەر.

(شــيبٌ مســتطير): ســپێتیی ســەرو ڕیشی تەشەنەكردوو/ بڵاوبوو.

(ألشَرّ المُسْتَطير): خراپەی تەشەنەكردوو.

٣-(طارَ- الشَــعَرُ. طَيراً وطَيَراناً وطَيرورَةً): قژەكە درێژ بوو/ هەستا/ بەرزبووەوە.

(تَطايَرَ- الشيءُ): شتەكە درێژ بوو/ هەستا.

٤-(الطائِر) (فك): ١-هەسارە ٢-مێشك.

(ألطَيّــار): ١-زمانــەی تــرازوو ٢-(تــرازوو/ شایەن)ی زێڕو زیوو پارە.

(أَلْمُطَيَّر): جۆرە بەرگێكە.

طاس: (طاسَ- الشــيءُ طَيْســاً): شتەكە بە لێشاو بوو/ زۆر زۆر بوو.

(ألطَيْس): ١-ژمارەی زۆری شــت ٢-خۆڵ/ گڵ ٣-هەموو بوونەوەرێكی وەچەزۆر وەك ماسیو مێرووله.

طاش: (طاشَ. طَيشــاً): ١-هەڵەشــەییكرد/ هەرزەییكرد ٢-ئاوەز سووكبوو/ بێئەقڵیكرد.

(-السَــهْمَ عَنِ الغَرَضِ): تیرەكــە دەرپەڕیو نەیپێكا/ لایدا.

(طائش): ١-تیری نەپێك ٢-مرۆڤی (هەڵەشە/ هەرزە/ جرپن/ ئاوەز سووك).

(أطاشَ- السَّــهْمَ عَنِ الغَــرَضِ): تیرەكەی لە نیشانەكە لادا.

(ألطَيّاش): ١-مێشكسووك/ هەڵەشە/ بێهۆشو كەمتەرخەم ٢-هەرزە.

(ألطَيْشــان): هەڵەشــەییو كەمتەرخەمیی/ بەدەربەســەوە نەهاتن ٢-بێهۆشی ٣-بە هەڵە بۆچوونو لێلادان.

طاع: (طاعَ. طَيعاً): ملیدا/ گوێڕایەڵییكرد.

طيع: ملدان/ گوێدێر بوون.

طاف: (طــافَ- الخَيــالُ. طَيْفــاً ومَطافاً): تارمایی یان ئەندێشــەی شتێك كە لە خەودا ببینرێت.

(طَيَّفَ وأطافَ وتَطَيَّفَ. تَطْييفاً وإطافَةً وتَطَيُّفاً): زۆر بە دەوریدا (سووڕایەوە/ گریخوارد).

(ألطيــف) (مــص): ١-ئەندێشــەو تارماییو وێنەی شــت کە لە خەوندا دێت ٢-توورەبوون ٣-شــێتیی/ دێوانەبــوون ٤-(ف)شــەبەنگ: وێنەیەکە بــە تێپەڕبوونی رووناکیی ســپی بە ناوێزەیەکدا رووناکییەکە شــیدەبێتەوەو دەبێتــە چەند رەنگێكو بــە پێی ریزبوونی: سوورو پرتەقالییو زەردو سەوزو شینو شینی چوتییو وەنەوشەیی. ئەگەر رووناکییەکە لە گازێکەوە پەیدا بووبێت وەك هایدرۆجین ئەو کاتە ئاوێزەکە لە چەند هێڵێك پەیدادەبێت بە پێی سروشتی گازەکە شوێنەکەی دەزانرێت.

طام: (طــامَ. طَیْماً): کارەکەی دروســتبوو/ چاکبوو.

(-اللهُ فُلانــاً علی الخَیرِ): خودا فیســاری بە چاکییو لەسەر چاکە بەدیهێناوە.

(ألطِیماء): سروشتو شێوە بەدیهێنان.

طــان: ١-(طانَ وطَیَّــنَ- الحائِــطَ. طَیْناً): دیوارەکەی بە قوڕ سواغدا.

(-الکِتابَ): نووسینەکەی مۆر کرد.

(-هُ اللهُ علی الخَیرِ): خودا بە باشــیو لەسەر چاکە بەدیهێنا.

(تَطَیَّــنَ): ١-بــە قوڕ ســواغدرا ٢-بە باشــی بەدیهێنرا ٣-قوڕاوییبوو.

(ألطــین): قوڕ یان گەچی گیراوەو شــتی لەو بابەتە کە دیوارو شوێنی پێسواغدەدرێت.

(ألطینَــةُ= الطین): ١-قوڕ. گەچی ئاوکراو کە ســواغی پێدەدرێت ٢-خۆڕسكو دروستبوونی زگماکیی.

(«هو یابِسُ الطینَةِ»): ئەو مرۆڤێکی وشكو رەقە.

(«لَــهُ طینَــةٌ طَیِّبَةٌ»): سروشــتێکی نەرمو گونجاوییهەیە.

(مَــکانٌ طــانٌ): شــوێنێکی قوڕینــە/ قوڕی زۆرە.

(ألطِیانَةُ): قوڕەکاریی.

(ألطَیَّان): قوڕەکار.

٢-(ألطَیُّــون أَو الطُبَّــاق) (ن): گیایەکــە لــەو رووەکانەیــە کە گوڵەکــەی لوولەییە لە وڵاتەکانی دەریای ناوەڕاســتدا زۆرە گوڵەکەی زەردو کەمەکێــك لینجــەو بۆندارە کەســکی لێدروســتدەکەنو کێچــی پێدەکــوژن یــان راودەنێن.




ظ: (الظــاء): حەڤدەهەمــین پیتــی ئەلفـو بێــی عەرەبییەو لە ژمێــرەی کۆی پیتەکاندا (٤٠٠)ە.

ظأب: ١-(ظَأَبَ. ظَأْباً): ژنی هێنا.

(ظــاءَبَ-ەُ مُظاءَبَــةً): خوشــکی ژنەکــەی ئەوی هێنا/ ژنخوشــکی ئــەوی هێنا، بوو بە ئاوەڵزاوای.

("تَزَوَّجــا بالمُظاءبــة"): بوونــە ئاوەڵزاوای یەکتری.

(ألظــأب (مــص) (ج) ظُــؤوب وأَظــؤُب"): ئاوەڵزاوا.

٢-(ظَأَبَ. ظَأْباً): ستەمیکرد/ زۆرداریکرد.

٣-(ظَأَبَ. ظَأْباً): گۆرانیوت.

(-التَیسُ): سابرێنەکە بارانی/ مرقاندی.

ظأر: (ظَأَرَ- الناقة أو المرأةَ علی ولد غیرها): مێحوشترە ســۆزی بەچکەی حوشــترێکیتردا ژنەکەش سۆزی بە منداڵی یەکێکیتردا.

(ظــأَرَت واظــأَرت): لەگەڵیــا میهرەبانبوو/ بەسۆز بوو.

(ظُؤُور وظُؤُورة (ج) أطآر و ظُؤار): بە سۆز/ میهرەبان بۆ بەچکە. بۆ زارۆڵە.

(-ەُ الی کذا): بەلای ئەودا لایدا/ ســۆزی بۆی جووڵا.

(-علی عدُوّە): بۆ دوژمنەکەی وەرگەڕایەوەو پەلاماریدایەوە.

(-ەُ علــی کــذا): بــۆ ســەر ئــەو ڕووی پێوەرگێڕایەوە.

(ظــاءَر- الناقــة أو المرأة علی ولــد غیرها مُظاءَرةً): مێحوشترەکە یان ژنەکەی وا لێکرد کە ســۆزبدات بە بەچکەی هی یەکێکیتر یان منداڵی یەکێکیتر.

(- ەُ علی الأمر): بۆ کارەکە تێزیکردو ڕایکێشا بۆ کارەکە یان بە زۆر پێیکرد/ ناچاریکرد کە بیکات.

(-هُ على كذا): ویستی ئەو بۆ لای ئەو بزواندو سۆزی بۆی جوولاند.

(-اتِ المـــرأةُ): ژنەکە منداڵێکـی گرتە خۆی بەخێوی بکاتو شیری بداتێ.

(-الرَجُلُ): پیاوەکە بۆ منداڵەکەی دایەنێکی ڕاگرت.

(أظـــأرَ- الناقـــةَ أو المـــرْأةَ على وَلَـــدِ غيرِها إظآراً): وای لە مێحوشـــترەکە یان ژنەکە کرد کە شیر بە بەچکەکەیان بە منداڵی یەکێکیتر بدات/ سۆزی بۆ جووڵاند.

(أظْأرَ-هُ على كذا): سۆزی بۆ ئەوە جووڵاند/ ڕووی پێکردە لای ئەوەوە.

(إظَّـــأرَ لِوَلَـــدِهِ ظِئـــراً): بـــۆ منداڵەکـــەی دایەنێکیگرت.

(الظِئْـــر (ج) أظؤُر وأظْـــآر وظُؤُور وظُؤُورَة وظُؤَار): ١ میهرەبانی/ سۆز بەرامبەر بەچکە یان منداڵی یەکێکیتر ٢-دایەن.

(ظِئْـــرُ القَصْـــرِ): کونجێکـــی کۆشـــکەکە. گۆشەیەکی کۆشکەکە.

(الظِئـــرَة): کۆڵەکـــە یـــان فیلپایەیـــەك کە دیوارێك ڕابگرێت.

(الظُؤْرَة): ١ دایەن ٢-شیرپێدەر.

ظأم: (ظاءَم- هُ: مُظاءَمَةً و تظاءَما تَظاؤُماً): بوون بـــە ئاوەڵزاوای یەکتری/ خوشـــکی ژنی یەکتریان هێنا.

(ألظأم= سِلفُ الرَجُل): ئاوەڵزاوای پیاوەکە.

ظبـــو: (الظُبَة (ج)( ظُبـــات وظُبىً وظُبُون وظِبـــون وأظْبٍ): تیژیی دەمی شمشـــێر یان نووکی نێزەو شتیتری لەو بابەتانە.

(ظبَة) لە بنچینەدا (ظُبُـــو) بووە. واوەکەی فرێدراوەو کراوە بە (ە).

ظبى: ١-(أظبَى- المَكانُ): شـــوێنەکە ئاســـکی زۆر بوو.

(ألظَبْي (ج) ظِبـــاء وأظْبٍ وظُبِيّ وظَبَيات) (ح): ئاسك (بە نێرو مێ دەوترێت).

(بـــهِ داءُ الظَبـــي): دەردی ئاســـکی هەیـــە واتـــا تەندروســـتە چونکـــە ئاســـك هەرگیز نەخۆشناکەوێت تەنها کاتی مردنی نەبێت.

(ألظَبْيَة (ج) ظِباء وظَبَيات (ح): ١-ئاسکەمێ ٢-(ح) مەڕ/ پـــەز ٣-(ح)مانگـــا/ چێڵ ٤-کچی گەنـــج/ لاو ٥-هەمانەیەکی تووکنی پێســـتی ئاسك.

(أرضٌ مَظبَئَةٌ): زەوییەك/ خاکێك (ئاســـکی زۆر بێت/ لانەی ئاسکان بێت).

٢-(الظَبْيَةُ): پێچی دۆڵ.

(ظرّ): ١-"ظَرَّ. مَظَرَّةٌ): بەردە دەمتیژەکەی شکاند.

(-الناقـــةَ): بـــە بەردێکی چەقۆیـــی دەمتیژ مێحشوترەکەی سەربڕی.

(أظَـــرَّ): لە شـــوێنێکدا کەوت کـــە پڕبوو لە بـــەردە دەمتیژەکان/ بـــەردە چەقۆ کە وەك بەردە ئەستێ وایە.

(-المَكانُ): بەردە چەقۆ/ بەردە ئەســتێی زۆر بوو.

(ألظِرّ والظُــرَرُ والظُرَرَةُ (ج) ظُرَّان وظِرّان وظِرار وأظِرَّة): ١-بەرد یان بەردێکی دەمتیژ کــە وەك چەقــۆ وابێــت ٢-بەردە ئەســتێ. ئــەو بەردە ئەســتێیەیە کە لــە چاخە هەرە کۆنەکاندا وەك نێزەو تەشــویّو تەورو ئا لەو شێوانە دروســتدەکراو بەکاریان دەهێنا ئەمە پێــش ئەوەی کــە کانزاکان بدۆزنــەوەو لێی دروستبکەن.

(ألطُور الظِرِّي أو الظِرَّانِي): چاخی بەردینو بەردەئەســتی کــە ئامێرەکانیــان لــە بەردە ئەستێ دروستدەکرد.

(أرضٌ ظَريــرٌ ومَظَرَّةٌ): خاکێکی پڕ بەردەی ئەستێ.

(المَظَرَّة (ج) مَظارّ): بەردەئەستێ کە ئاگری پێدەکرێتەوە.

٢-(ألظَريــر (ج) ظِــرار وأظِــرَّة وظُرَّان): زانستییەك کە ڕانوما بکات.

ظرب: (ظَرِبَ- بِكَــذا. ظَرَباً): بەوەوە (لکا/ نووسا).

(ألظَــرِب (ج) ظِــراب وأظْــرُب): ١-نووکی دەرپەڕیوو تیژی بەرد ٢-گردۆڵکە.

(الظَــرِبُ- مِــنَ الرجــال): گردەپیاوێکــی ئەستوور.

(الظربــان والظربِاء (ج) ظَرابيّ وظَرابين) (ح): بۆگەنکە. گیاندارێکە هێندەی پشیلەیەکە بۆرەقنەیەو مەیلەو ڕەشــە. بۆگەنێکی پیسی لێدەردەچێت.

(ألظَربــان الأَمريكــي) (ح): بۆگەنکــەی ئەمەریکی لە کوندا دەژی لە ســمۆرەو مشکی خورما دەچێت. بۆگەنێکی پیسی هەیە.

("فَســابَينَهُم الظَربــان"): بۆگەنگەتســی پێداکــردن. واتا لــە یەك پچــڕانو پەرش‌و بڵاوبوونەوە.

(ألظِربــاء (ج) ألظِربى الظِرباء) (الأَظْرَب): چــوار دانــی کاکیلەیە لــە پشــتەوەیە پاش بلووغبوونو تەواو گەورەبوون دەردێن.

(أَظْــرابُ اللِّجــام): گرێــی ئاســنی لغاو کە دەکەوێتە دەمی ئەسپەوە.

ظــرف: ١-(ظَــرُفَ. ظَرْفــاً وظَرافَــةً): ١ (چەلەنگ/ شــۆخو شــەنگ) بوو ٢-ناسك‌و بەویل‌و ڕێکپۆش‌و زیرەکبوو.

(ظَريف (ج) ظُرَفاء وظِراف وظُرُف وظُرُوف وظَريفــون (م) ظَريفَــةُ (ج) ظَريفــات وظَرائف): چەلەنگ/ شــۆخو شەنگ، ناسك‌و بەوێڵ‌و زیرەك‌و ڕێکپۆش.

(ظَرَفَ-هُ. ظَرْفــاً وظَرافَةً): لەو شــۆخترو ناسکترو بەوێڵترو زیرەکترو جوانپۆشتر بوو.

(أَظْــرَف): منداڵــی زیرەك‌و قۆزو ناســك‌و بەوێڵیبوو.

(تَظَــرَّفَ وتَظارَفَ): خۆی بەوێڵ‌و ناســك‌و

زيرەك‌و شۆخ (نواند/ پيشاندا).

(إسْـتَظرَفَ): شـۆخ‌و ناسـكي‌و ريكپۆشـى خواست/ وريايى‌و زيرەكى‌و ناسكى خواست.

-هُ: بە شۆخ‌و ناسك‌و زيرەك‌و بەويْلى دانا يان زانى.

اَلظَـرف (مـص): ١-ناسـكى‌و بەويْليـى ٢-ريكپۆشيى‌و شۆخيى/ چەلەنگيى ٣-كارامەيى‌و ليْزانى‌و زيرەكيى.

(اَلظُراف والظُـرّاف (ج) ظُرَفاء وظُرّافون=

اَلظَريـف): ١-ناسـك‌و بەويْـل‌و زيـرەك ٢-چەلەنگ‌و ريكپۆش ٣-كارامەو ليْزان.

٢-(أظْرَفَ- المَتاعَ): (كالاكان/ كەلوپەلەكان)ى خسـتە دەفـرەوە. هـۆرەوە/ توورەكـەوە/ شتگريْكەوە.

(اَلظَـرْف): مەشـكە، جەوەنگـە، هيـزە (عامية)

(اَلظَـرف (ج) ظـرُوف): رۆژو دەم‌و كات‌و سـەردەم‌و ژيْروبن‌و سەرو تيْدابوونى شويْن‌و كات.

(ظُـروف الزَمـان): كات‌و دەمـى كاريْـك‌و رووداويْك.

(ظـرْف المَـكان): شـويْن‌و جيْـى كاريْـك‌و رووداويْك.

(هو نَقِيُّ الظَرْفِ): ئەو دەست‌و دلْپاكە.

(رأيْتُهُ بظَرْفِهِ): راست خۆيەتى.

(اَلمَظْـروف) (مفـع): ئـەوەى دەخريْتـە شتگريْكەوە.

("بَعَثْتُ بالرَسـائِل مَظروفَةً"): نامەكانم لە بەرگەنامەدا بۆ نارد.

ظـرن: (ألظـرّان): بـەردى دەمتيـژ/ بەردەئەستێ.

ظرى: (ظَـرى- الماءُ. ظَرياً): ئاوەكە كشـا/ رۆيشت.

(ظَـرِيَ- الغُـلامُ. ظَـرىً): ميْردمندالەكە ناسك‌و زيرەك‌و بەويْلبوو.

(إظْرَورَى إظْريـراءً): سكى هەلاوسا.

(ألظاري) (فا): گازگر.

(ألظَرْوَرى): ناسك‌و بەويْل/ ژيرو زيرەك.

ظعـن: (ظَعَـنَ. ظَعْنـاً و ظَعَنـاً و ظُعُوناً ومَظعَناً): گوريْزيكردو كۆچيكرد.

("ظَعَنوا عَن ديارهم"): لە شـارەكەيان يان ولاتەكەيان باريانكرد/ كۆچيانكرد.

(أظْعَـنَ-هُ): بـارى پيْكرد/ كۆچـى پيْكرد/ خستيە ريْ.

(إظَّعَـنَ- الهَـودَجَ): گوريسـيْك/ پەتيْك كە كەژاوەكەى پى ببەستريْت.

الظِعان: سوارى كەژاوەكە بوو.

(ألظَعُـون) = الظِعان. (ألظَعُـون والظَعُونَة (ج) ظُعُن): حوشتريْك كە بارى پيْبكيْشريْت/ حوشترى باريى.

(ألظَعينَة (ج) ظَعائِن وظُعْن وظُعُن و (حجـ) أظْعـان وظُعُنات): ١-كەژاوە ٢ ژن يان ئافرەت

کــه له کەژاوەدا بێت. یــان دەوترێت: (هؤلاء ظَعَائِنُهُ): ئەوانە ژنانی ئەون.

(اَلمِظْعَــان- مِنَ الخَيــلِ والنُوق): ئەســپو مێحوشتری خۆشڕەوت.

ظفــر: ١-(ظَفَــرَ-هُ. ظَفْــراً): ١-بــه نینۆك خاشــاکی دەموچاوی هێنایە خوارێ/ نینۆکی له رووی چەقاند ٢-نینۆکی شکاند.

(ظَفِرَ. ظَفَراً): سیچکەسڵاوە له چاویهات.

(مَظْفُور): سیچکەسڵاوە له چاو هاتوو.

(-ت عَينُهُ): چاوی سیچکەسڵاوەی لێهات.

(عَــينٌ ظَفِــرَة): چاوێکــی سیچکەســڵاوە لێهاتوو.

(ظَفَّرَ-الشيءَ): نینۆکی له شتەکه چەقاند.

(-الجِلْدَ): پێســتەکەی هەڵگلۆفتو شــێلای/ دەستی پێداهێنا.

(-الثوبَ): مادەیەکی بۆنخۆشــی بە جلەکەدا کرد.

(أَظْفَــرَ- فُلانــاً): نینۆکی له رووی فیســار چەقاند.

(اَلظُفْــر= الظَفَرَ): سیچکەســڵاوە که لەچاو دەردێت.

(اَلظِفْر والظُفُر (ج) أَظْفار و (جج) أَظافِير) (ع ا): نینۆك/ ناخوون.

("مابَقِي في الدار ظُفْرٌ"): ماڵەکە کەسی تێدا نەماوە.

("رَأَيتُهُ بِظُفرِه"): ڕاستەوڕاست خۆیمەی.

("قَلَّمَ أَظفارَهُ عَن أَذى الناس"): نینۆکیکرد تا سزای خەڵك نەدات.

("كَسَــرَ أَظفارَهُ في فُلان"): چنگی له فیســار گیرکردو واتا له پاشمله به خراپه باسیکرد.

(اَلأَظفار): ١-مادەیەکی بۆنخۆشه (تاکی نییه) ٢-ناوی کۆمەڵە هەسارەیەکن.

٣-(أَظفار الثوب): قەدی جلی قەدکراو.

(اَلظَفَرَة): تانەی سەر چاو که سپییەو ڕەقه.

(اَلأَظْفَر): نینۆك پانو درێژ.

٢-(ظَفِــرَ واظَّفَــرَ المَطْلوبَ وبِــهِ وعَلَيهِ): به خواســتی خۆی گەیشت/ دەســتگیریبوو/ بەمرازی خۆی گەیشت، سەرکەوتو بردیەوە، زاڵبوو.

ظَفَّــرَ-هُ: ١-دۆعــای ســەرکەوتنی بــۆ کــرد ٢-بەسەر دوژمنەکەیدا زاڵیکرد.

(ظَفَّــرَ-هُ و أَظْفَــرَ- هُ بِعَــدُوِهِ): بەســەر دوژمنەکەیدا (زاڵیکرد/ سەریخست).

(تَظافَــرَ- القَــومُ): خوێشــگەل کۆمەکــی یەکتریانکردو پشتی یەکتریانگرت.

اَلظَفِــر والظَفِــير والظِفِّــير): هەمیشــه سەرکەوتوو/ کەسێکه دەست بداته هەرکارێك تیایدا سەرکەوتوو بێت.

(اَلظَّافِر (ج) ظَفَرَة): دەستباڵا/ سەرکەوتوو.

اَلمُظَفَّر والمِظفار: هەمیشه سەرکەوتوو.

ظــلَ: ١-(ظَلَّ- يَفعَــلُ كذا ظَــلاً وظُلولاً): سەرومر خەریکی ئەو کارە بوو.

(ظَلَلْتُ وظَلْتُ وظِلْتُ): مامەوە/ بێپشوو خەریکبووم، یەکبینە بووم.
(ظَلَّ- الیَوم ظِلالَةً): ئەمرۆ سێبەر بوو.
(-الشيءُ): شتەکە مایەوەو درێژەی کێشا.
(ظَلَّلَ-ه): خستیە ژێر سایەی خۆیەوە. سێبەری بۆ کرد.
(أَظَلَّ الیومُ): ئەمرۆ سێبەر بوو.
(-ه): ١-سێبەری لەسەر کرد ٢-خستیە پەناو پارێزگاریی خۆی/ خستیە بنباڵی خۆیەوە. خستیە ژێر سایەی خۆیەوە.
(أَظَلَّ- الأَمْرُ فُلاناً): کارەکە فیساریگرتەوەو لێی نزیکبووەوە.
("أظَلَّكَ الشَهْرُ): مانگ لێت نزیکبووەوە.
(تَظَلَّلَ-بالشَّجَرَةِ): چووە (ژێر/ بەر) سێبەری درەختەکە/ لەژێر سێبەری درەختەکەدا دانیشت.
(إِسْتَظَلَّ بالظِلِّ): خۆی کوتایە سێبەرەکەو لە بەریدا دانیشت.
(-الکَرْمُ): لقو پۆپی دارمێوەکە بەیەکداچوو.
-مِنَ الشيءِ: لەژێر سایەی شتەکەدا دانیشت.
(-تِ الشَمسُ): خۆرەکە لە هەورەکەدا خۆی شاردەوە.
(أَلظِلّ): ١-نگینو سەربەرزییو دەسەڵات ٢-پەنا/ ژێرسایە.
("هو في ظِلِّهِ): ئەو لەژێر سایەی ئەودایە ٣-خۆشگوزەرانیی.
(أَلظِل (ج) ظِلال وأَظلال وظُلُول): سایە/ سێبەر/ سایە.
(-مِنَ القَیْظ): قرچەی گەرما.
(-مِنَ اللَّیل): سەرەتای یان تاریکیی شەو.
("مَشَیتُ علی ظِلِّي أَو انتَعَلْتُ ظِلِّي"): رۆیشتم نیوەرۆم لێداهاتو سێبەرم نەماو کەوتە بەرپێم.
بَقِيَ عِندي ظِلُّ النَهار: درێژایی رۆژم ما.
(ملاعِبُ ظِلِّهِ أَو خاطِفُ ظِلِّهِ) (ح): باڵندەیەکە دەڵێن گوایا ماسیگرەیە ئەگەر سێبەری خۆی لە ئاوەکەدا دی پەماریدەدات بیگرێت.
(أَلظَلل): ئاوی ژێر درەخت کە هەتاوی بەرناکەوێت/ ئاوی بەر سێبەر/ ئاوی (نسێ/ نسرم).
(أَلظُلَّةُ (ج) ظُلَل وظِلال): تەسکە چەتر، چەرداخ، کەپر، سابات. هەر شتێك سێبەری هەبێتو خۆتی لە بندا لە گەرماو سەرما بپارێزێتو وەك سێبەری درەخت.
(أَلظَلَّةُ): ١-جارێك خۆپەنادانە بەر سێبەر ٢-نیشتەنیبوونو مانەوە لە شوێنێکدا.
(أَلظِلَّةُ والظَلال والظِلالَة): سێبەربەخش وەك هەورو درەختو شتیتر.
(أَلظِلال): سێبەربەخش.
(ظِلالُ البَحر): شەپۆلی دەریا چونکە

بەرزدەبێت و سێبەر بۆ پاپۆڕو سەرنشینەکەی دەکات.

(اَلظَلیل): ١-سێبەردار ٢-هەمیشە سێبەر.

("ظِلٌّ ظَلیل): سێبەرێکی هەمیشەیی یان سێبەرێکی تەواو/ نسێ/ نسرم.

(اَلظَلیلَة): ١-مێی وشەی (الظَلیل) ٢-باخچەو مێرغوزاری پڕدرەخت ٣-زەلکاوی دامێنی دۆڵ.

(اَلمِظَلَّة والمَظَلَّة (ج) مَظَال): ١-ئەوەی سێبەر بدات ٢-دەواری گەورە ٣-چەتر.

(اَلمِظَلَّة والمَظَلَّة (ج) مَظَلات): پەڕەشۆت.

(عیدُالمَظال): جەژنی کەپرەشینەی جوولەکە. چەند رۆژێك لەو کەپرەدا دەمێننەوە کە بۆ ئەو بۆنەیە دروستیدەکەن یادگاری دەرچوونیانە لە کۆیلەیەتیی ناو میسر.

(اَلمَظَلّي (ج) اَلمَظَلّیون) (ا ع): پەڕەشۆتەوان. ئەوانەن کە بە پەڕەشۆت لە فڕۆکەوە خۆیان بەردەدەنە خوارەوە.

(یَومُ مُظِل): رۆژێکی سێبەر/ بێهەتاو.

٢-(ظَلَّلَ- بِالسَّوطِ): بۆترساندن بە قامچی ئاماژەیکرد.

٣-(إِسْتَظَلَّ-تِ العُیُونُ): چاوەکان بە قووڵدا چوون.

٤-(اَلظِلّ-مِنَ الثَوبِ): کۆکی درووماني کراسەکە.

(ظِلُّ الشَبابِ أَوِ الشتاءِ): سەرەتای لاوی یان سەرەتای زستان.

("فُلان یُباری ظِلَّ رَأْسِهِ"): فیسار لووتبەرزەو بەفیزە.

ظلع: ١-(ظَلَعَ- البَعیرُ. ظَلْعاً): حوشترەکە بە لەنگەلەنگ رۆیشت.

(ظالِع): حوشتری لەنگ.

(اَلظَلْع) (مص): خەوش/ کەموکووڕی.

("أَرْبَع علی ظَلْعِكَ"): تۆ بێتوانایت واز لەو کارە بهێنە کە دەرەقەتی نایەیت/ کە توانات نییە لەسەر دەرپێکەی خۆت دانیشەرەوە.

("لایَربَع علی ظَلعِكَ مَن لَیسَ یُحزِنُهُ أَمْرَك"): ئەوەی خەمت نەخوات بەدەربەستەوە نایەت.

(اَلظَلَع): شەلیی/ لەنگیی و گێڕیی.

(اَلظالِع) (فا) (بۆ مێ و نێر (ج) ظُلَّع: خوار/ لار/ لەنگ.

(اَلظُلاع) (طب): شەلکە کە تووشی پێی ولاخ دەبێت ولاخەکە نە هی رۆیشتنەو نە هی ماندووبوونە.

٢-(ظَلَعَ-ت بِهِم الأَرضُ ظَلْعاً): زەوییان لێتەنگبوو لەبەر زۆرییان جێییان نەبووەوە.

٣-(اَلظالِع) (بۆ مێ و نێر) (ج) ظُلَّع): گومانبار.

(ظالِعَة): ئافرەتی گومانبار.

ظلف: ١-(ظَلَفَ. ظَلْفاً): سمی تووشبوو/ سمەکە دەردیگرت یان شتی بەرکەوت.

(-القَـوْمَ. ظَلْفـاً): شـوێنپێی خوێشـگەلی هەڵگرت/ دوایانکەوت.

(-أثَـرَ-هُ): شـوێنپێی خۆی ونکـرد تا دوای نەکەون.

(ظُلِفَ- الرَجُـلُ): پیاوەکەیان بە زەوییەکدا بـرد شـوێنپێی نەبێت تا نەزانن لـە کوێیە براوە.

(ظَلِفَ-تِ الأرضُ) ظَلَفاً): زەویەکە بەردەڵانیی بوو. شوێنپێ تیایدا دیارنەبوو.

(-تْ مَعيشَـةُ فُـلانٍ): گوزەرانـی فیسـار سەختبوو.

(ظالَـفَ- أثَـرَهُ. مُظالَفَـةً): شـوێنپێی‌و شوێنەواری خۆی ونکرد تا دووی نەکەون.

(تَظَلَّـفَ واظَّلَـفَ): کەوتـە زەوییەکـی بەردەڵانییەوە.

(ألظِلْف (ج) ظُلُوف وأظْلاف): سـمی ئاژەڵ ئەوانـەی کاوێژدەکەن وەك مانگاو حوشـترو ئاسك‌و مەڕو بزن.

("جاؤُوا على ظِلْفِهِ"): شوێنپێیان هەڵگرت‌و بەدوایدا هاتن.

(ألظِلْـف): نەبوونیـی‌و سـەختیی ژیـان‌و گوزەران.

(ألظَلَف): زەویی ڕەقەن‌و بەردەڵانیی.

(أرضٌ ظَلْفَـةٌ وظِلفَـةٌ وظَلَفَـةٌ): زەویـی بەردەڵانیی.

(ألظَليف (ج) ظُلُف وظُلُف): ١-نەبوو/ نەدارا/ کەمدەست/ گوزەرانتاڵ ٢-زەبوون‌و سەرشۆڕ/ کەساس ٣-کاری سەخت‌و گران.

(ألأُظْلُوفَـة (ج) أظاليف): زەویی پڕ لە تیژە بەرد.

٢-(ظَلَفَ- نَفْسَـهُ عَنِ الشي ظَلْفاً): خۆی لە شـتەکە (لادا/ دوورخستەوە) توخنی شتەکە نەکەوت.

(ظَلِفَ-ت نَفْسُهُ عَن كذا. ظَلَفاً): دڵی نەچووە سەر ئەو شتەو وازی لێهێنا.

(ظَلَّفَ-هُ عَن كذا): لەو شتەی دوورخستەوە.

(أظْلَفَ-هُ): دووریخستەوە/ لایدا.

(رَجُلٌ ظَلِفُ النَفس): پیاوێکی دەروون بەرزو پاکە/ دوورە لە شتی نزمییەوە.

(رَجُـلٌ ظَليفُ النفـس): پیاوێکی دەرونپاك‌و سەربڵند/ دوور لە بەدکارییەوەو دەروونبەرزە.

٣-(ظَلَّفَ-على كذا): لەوەی زیاترکرد.

٤-(ألظَلْـف): ١-بـەرەڵا/ فیـڕۆ/ ڕێ پێدراو ٢-نارەوا/ نەشیاو/ نادروست.

(ذَهَبَ دَمُهُ ظَلْفاً): خوێنەکەی بە نارەواو بە خۆڕایی ڕۆیشت/ بە فیڕۆ ڕۆیشت.

(ألظَلَف): شوێنێکی بەرزی دوور لە ئاوو لە قوڕ.

(ذَهَبَ دَمُهُ ظَلَفاً): خوێنەکەی بە نارەواو بە فیڕۆ ڕۆیشت.

(أخَذَ-هُ بِظَلَفِهِ): هیچی لێ نەهێشتەوە.

(ألظَلِف): شوێنێکی بەرزی دوور لە ئاوو قوڕو قوراو.

(اَلظَّلِفَةُ): بنەرەت و هەموو شتەکە.
("أَخَذَه بِظَلِفَتِهِ"): هیچی لێنەهێشتەوە.
(اَلظَّلِيف): نارەواو فیرۆ/ خۆڕایی.
("ذَهَبَ دَمُهُ ظَلِيفاً"): خوێنەکەی بە نارەواو بە فیرۆ ڕۆیشت.
("أَخَذَهُ بِظَلِيفِهِ وبِظَلِيفَتِهِ"): هیچی لێ نەهێشتەوەو هەمووی برد.
(اَلظَّلْفَاء): تاوێرێکی زلە کە بە زەویەوە نووسابێت و تەختببێت و درێژبووبێت.
ظلم: ١-(ظَلَمَ-ه. ظُلْماً وظَلْماً و مَظلِمَةً): زۆرداریی بەرامبەرکرد/ ستەمی لێکرد.
("ظَلَمَ الراعي لِرَعِيَّتِهِ"): ستەمی شوان و بەخێوکەرو بەڕێوەبەری بەرامبەر ئەوانەی لەژێر ڕکێفیدان و بەڕێوەیاندەبات.
(ظَلَمَ-ه حَقَّهُ): لە مافەکەی (لادا/ بڕی)/ کەمیدایە.
(ظَلَّمَ-ه): بە زۆرداریی دانا/ بە ستەمیدانا.
(-ه الحاكِمُ): دادوەر دادی زۆر لێکراوەکەیداو یارمەتیداو مافەکەی لە زۆردارەکەی بۆ سەندەوە.
(أَظْلَمَ- الرَّجُلُ): ١-بە تاریکی ڕۆیشت ٢-زۆرو ستەمیکرد.
(تَظَلَّمَ- مِنهُ): سکاڵای لەدەست زۆرداریەکەی کرد/ لە ستەمەکەیکرد.
(-ه حَقَّهُ): لە مافەکەی خواردو کەمیدایە.
(-الرَّجُلُ): لەژێر باری ستەمدا ئارامیگرت و بەرگەیگرت.
(تَظالَمَ- القَوْمُ): ستەمیان لە یەککرد.
(إِظَّلَمَ وانظَلَمَ): ئارامی لە بەر باری ستەمدا گرت.
(اَلظُّلْم): ١-ماق ئەمو ئەو خواردن ٢-ستەمکردن/ ستەم/ زۆرداریی.
(اَلظُّلامَة والمَظْلَمَة (ج) مَظالِم): ١-زۆرو ستەمێك کە لە کەسێك کرابێت ٢-شتێك بە زۆرداریی لە کەسێك سەندرابێت.
(اَلظالِم (ج) ظالِمون وظَلَمَة وظُلاَّم) (فا): زۆردار/ ستەمکار.
(اَلظِلام= الظُّلْم): زۆرداریی/ ستەم/ ستەمکاریی.
("نَظَرَ إِلَيَّ ظِلاماً"): زۆردارانەو بەبێزەوە تەماشایکردم.
(اَلظَّلاَّمَ الظِلِّيم والظَّلُوم): زۆردارێکی سەرسەخت/ کەسێکە ستەمکاریی زۆربێت.
(اَلظَّلِيم (ج) ظِلْمان وظُلْمان وأَظْلِمَة= المظلوم): ١-زۆرلێکراو/ ستەمدیدە ٢-مافخوراو.
(اَلظَّلِيمَة): زەوتکراو/ بەزۆربراو.
٢-(ظَلَمَ. ظُلْماً وظَلْماً ومَظلِمَةً): شتێك بخەیتە شوێنێکەوە کە جێی خۆی نەبێت.
("مَن اسْتَرعى الذِئبَ فقد ظَلَمَ): هەرکەسێك گورگ بکات بە شوان ئەوە ستەمیکردووەو شتی لە شوێنی خۆی دانەناوە.

پەکی خۆی خست.

(إسْـتَعْجَزَ-هُ): بـە بێدەسـەڵاتو بێتوانـاو بێهێزی بینی.

(ألعاجـز (ج) عواجـز (فـا)): ١-پەککەوتە/ بێهێز/ بێتوانا/ بێدەسەڵات ٢-پیر.

(إمرَأةٌ عاجز= عاجزَة): ژنێکی پەککەوتە.

(ثَوبٌ عاجز): جلێکی کورت.

(رَجُـلٌ عَجُزٌ وعَجِزٌ= عاجِـز): پەککەوتە/ بێهێز.

(ألعَجوز (ج) عُجُـز وعَجائز): ١-ئافرەتێکی/ ژنێکـی بەسـاڵداچوو/ پیرێـژن ٢-مەی/ کە کۆندەبێت.

(رَجُلٌ عَجوزٌ): پیاوێکی پیری بەساڵداچوو.

(ألمُعجِزَة (ج) مُعْجِزات): پەرجوو/ کارێکە کە نائاساییەو لە توانای مرۆڤدا نییە بیکات یان بیهێنێتەدی.

(ألمِعجاز): کەفتەکار/ پەککەوتەی هەمیشەیی.

٢-(أعْجَـزَ- فِي الـكَلام): نەسـتەقانە دوا/ پرماناترینو بەباشـترین شێوە ئاخاوتنەکەی دەربری.

٣-(تَعَجَّزَ- البعيرَ): سواری کەفەڵی حوشترەکە بوو.

(ألعَجْز والعُجْز والعِجْز والعَجُز والعَجِز (ج) أعجاز): دواوەی/ پاشـەوەی هەموو شـتێكو تەنێك.

(رِكِـبَ أعجـاز الإبِـل): سـواری پاشـووی حوشـترەکە بـوو واتـا تووشـی زەبوونییو نارەحەتییو سەرشۆڕیبوو.

(عَجْـزُ بَيتِ الشِـعر): بەشـی دوەمی دێرە هەڵبەستەکە.

(أعجاز النَخل): بنی دار خورماکە.

(ألعُجْزَةُ والعِجزَةُ): پاشەبەرە.

(«هو عُجْزَةُ أبيهِ وعِجْزَتُهُ»): ئەو دوا منداڵی باوکیەتی/ ئەو پاشەبەرەیە.

(«وُلِـدَ لِعِجْـزَةٍ»): منداڵـی پیریـی دایكو باوکیەتی.

(ألعِجـاز والعِجـازَة): پارچەیەکە دەسـکی شمشێری پێ قایمدەکرێت.

(ألأعْجَز): کەفەڵگەورە، پاشینزل.

(كيسٌ أعْجَز): توورەکەیەکی پری هەڵاوساو.

(ألعَجْزاء): مێی وشەی (ألعْجَز).

(أيام العَجوز): برجی پیرێژن کە حەوت رۆژی دوایی زسـتانە چوار رۆژی دوایی رەشەمێیەو سـێ رۆژیشـی دەکەوێتـە سـەرەتای مانگی نەورۆزەوە (ئازارەوە).

(ألمُستَقْرَضات) (عامية): برجیٍ پیرێژن.

٤-(العَجْز (ج) (أعجاز): شمشێر.

بَناتُ العَجْز: تیرەکان.

(ألعَجزاء): لی کەڵەکەبوو.

(ألعَجوز): ١-وەی ٢-پاپـۆر ٣-رێگە ٤-مەنجەڵ ٥-کـەوان ٦-ئاگـر ٧-مـەرگ ٨-(ن)دارخورما ٩-(ح)مێحوشتر ١٠-ژن یان پیاوی بەساڵداچوو.

(اَلمِعْجاز): رێگە.
(اَلمعجوز): هەراسانكراو بەوەی زۆری لەگەڵ بڵێن و بۆ شتێك/ پرسەبابەتێك پێی لێدابگرن.
عجس: (عَجَسَ-هُ. عَن حاجَتِهِ): نەیهێشت دەستی بگاتە پێداویستیەكەی/ دەستی نایەبەری.
(تَعَجَّسَ): دواكەوت.
(-بالقَوم): خوێشكەلی دواخست.
(-هُ): راكەی پووچكردەوە بەلاوازیدانا.
(-هُ عَن حاجَتِهِ): دەستی نایەبەری و نەیهێشت پێداویستیەكەی بۆ بێت/ نەیدایە.
٢-(عَجَسَ- على الشيءِ عَجْساً): توند چنگی لە شتەكە گیركرد.
(اَلعُجْس والعَجْس والعِجْس): دەسكی كەوان.
(اَلعُجْسَةُ): ١-تاریكیی شەو ٢-كاتژمێرێكی شەو.
٣-(تَعَجَّسَ- الأَمرَ): دوای كارەكە كەوت و سۆراغیكرد.
(اَلعَجوس): ١-هەورێكی قورس، پڕ ئاو ٢-بارانی داكردوو.
عجف: ١-(عَجَفَ. عُجوفاً): دەستی لە خواردنەكە هەڵگرت/ تۆرا.
(-نَفْسَهُ عَنِ الطَّعامِ. عَجْفاً وعُجوفاً): لە خواردنەكە كشایەوە تا ئەوەی لەگەڵیدایە تێر بخوات.
(-عَن فُلانٍ. عَجْفاً وعُجوفاً): خۆی لێلاداو دوورخستەوە.
(عَجَّفَ- نَفسَهُ عَنِ الطعام): دەستی لە خواردنەكە هەڵگرت.
(-الرَّجُلُ): تێری نەخوارد.
٢-(عَجَفَ- على المَريضِ عَجْفاً وعُجُوفاً وعَجَّفَ نَفسَهُ على المريض): لە تیماركردنی نەخۆشەكەدا دانی بە خۆیداگرت/ ئارامیگرت.
(-نَفْسَهُ على فُلان): لە دەستدرێژی و خراپەی كابرادا بەرامبەری دانی بە خۆیدا گرت.
(أَعْجَفَ- بِنَفسِهِ على المَريضِ): لە دەرمانكردنی نەخۆشەكەدا (بە ئارامبوو/ خۆیگرت).
٣-(عَجَفَ- الدابَّةَ. عَجْفاً وعُجُوفاً): وڵاخەكەی لاوازكرد.
(عَجِفَ وعَجُفَ. عَجَفاً): لاواز بوو قەڵەوییەكەی نەما/ داماڵرا.
(عِجف وأَعْجَف (م) عَجِف وعَجْفاء (ج) عِجاف): لاواز/ لەڕ.
(-تِ البِلادُ): وڵاتەكە وشكەڕۆی گەیشتێ/ بارانی لێنەباری.
(نَزَلوا في بِلادٍ عِجافٍ): چوونە وڵاتێكی بێباران و وشكەوە.
(أَعْجَفَ- القَومُ): ئاژەڵەكانیان لاواز بوو.

(-الدابَّةَ): ولاخەكەی لاواز كرد.

(ألعجـاف): كۆی وشـەی (ألعَجفاء)ە بە پێی پێوەر نییە.

(ألعَجيف (ج) عَجفى): لاوازكراو.

(ألتَعَجُّـف): ڕەنجـدانو خۆڕەتانـدنو بەدگوزەرانیی.

٤-(ألعِجاف): ١-گوژاڵك ٢-ڕۆژگار.

عجـل: ١-(عَجِـلَ. عَجَلاً وعَجَلَـةً): ١-گوڕی بەستەوە/ بەگوڕ بوو ٢-پەلەیكرد.

(عَجِلَ بِهِ إلَيهِ): بۆ لای پەلەیلێكرد.

(-الأمرَ): لە كارەكـەدا خاوەخاوی بەو كردو خۆی پێشخست.

(عَجَّلَ): گوڕجبوو/ خێرایكرد.

(-هُ): ١-پێشیكەوت ٢-هانەهانیدا/ تیژیكرد.

(-لَهُ مِنَ الثَّمَنِ كذا): پێشـەكیی شـتێكی لە نرخەكەیدایە.

(-اللَّحْمَ): بە پەلە گۆشتەكەی لێنا/ كوڵاند.

(عاجَلَ-هُ بِذَنْبِهِ مُعاجَلَةً): هەر زوو سـزای گوناهەكەیداو لێینەوەستا.

(-هُ بضَربِهِ): لە لێداندا پێشدەستیكرد.

(أعْجَلَ- هُ): ١-پێشیكەوت ٢-هانیدا.

(-الشيءَ): شتەكەی بە پەلە خوارد.

(-تِ الناقَـةُ): مێحوشـترەكە بەچكەكەی بە نەبەكامی فرێدا.

(تَعَجَّلَ- فِي الأمرِ): پەلەی لە كارەكەدا كرد.

(-الأمرَ): خێـرا ئەنجامدانی كارەكەی گرتە ئەستۆ.

(إسْـتَعجَلَ-هُ): ١-هانیـداو فەرمانیدایـە زوو كارەكـە ئەنجام بـدات ٢-پێشـیكەوتو بۆڕیدایەوە.

(ألعِجلَةُ (ج) عِجَل وعِجال): چەرخ/ پێچكە/ هەر ئامێرێك خولی تەوەرەی هەبێت.

(ألعُجْـل والعُجْلَـةُ والعُجالَـةُ): ١-تـاودان/ پەلەكردن/ هەر شتێك بە پەلە ئەنجامبدرێت ٢-خواردنی ئامادەكراو ٣-خواردنی ئامادەكراوی میوان.

(العَجَلَـةُ (ج) عَجَـلٌ عِجـال وأَعْجـال): ١-خێرایی/ گوڕجیی/ پەلە/ ئازاكردن/ تاودان/ گوڕسەندن ٢-سووكیی ٣-ئامێری بارهەڵگرتن/ چەرخبار ٤-پێچكە/ ڕەورەوە.

(العاجِـل والعَجِـل والعَجُـل): ١-پەلەكەر/ چابوك/ گوڕجوگۆڵ ٢-ئێسـتا/ دەسـتوبرد/ زووكردن.

(العاجِلَةُ): ١-مێی وشەی (العاجل) ٢-جیهان/ دنیا.

(العَجْـلان (م) عَجلى (ج) عَجـالى وعُجالَى وعِجال والعَجيـل (ج) عِجـال): پەلەكەر/ گوڕج/ خێرا.

(ألعَجُـول): ١-مـەرگ/ مـردن ٢-ئافرەتـی شـپرزە كە لـە ترسـاندا هەر بێـتو بچێت ٣-جەرگسووتاو.

(العَجُول (ج) عُجُل): بزێو/ بەپەلە.

(اَلعَجول والعَجَّال): زۆر بەپەلە.

(اَلعُجَيْلَـة والعُجَيْلـى والعُجَّيلـى): (خێرا/ بەپەلە) ڕۆیشتن.

(سارَ العُجَيلى): بەپەلە ڕۆیشت. پێچەوانەی (لەسەرخۆ/ هێواش) ڕۆیشت.

(اَلمِعْجـال (ج) مَعاجيل- المُعْجـل والمُعَجَّل): پەلەکردوو/ خێراکردوو/ پێشکەوتوو.

(إمْرَأةٌ معجالٌ): ژنێکە پێش کاتی منداڵبوون منداڵەکەی دەبێت.

(معاجيلُ الطُرُق): قەدبڕی ڕێگاکان، لاڕێ.

(اَلمِعْجَل): ئامێری گورجیپێو.

(طريق مُسْـتَعْجَلَة): ڕێگـای قەدبڕ/ کورتە ڕێگا.

(«أَخَـذَ مثسْـتَعْجَلَةً مِن الطريـق»): ڕێی قەدبڕیگرت.

(«هـذه مُسـتَعْجَلاتُ الطريـق»): ئەمانە قەدبڕەکانـی ڕێگەکەیـە کە نزیـكو کورتی دەکاتەوە.

(القادوميـة) (عاميـة): کورتکـەرەوەو نزیککەرەوەی ڕێگە.

٢-(أَلعِجـل (ج) عُجُول وعِجَلَة وعِجال (ح): گوێرەکە.

(اَلعِجلَـةُ (ح) عِجَل وعِجـال) (ح) گوێرەکە مێچکە.

(اَلعَجَلَةُ (ج) عَجَـل وعِجال وأَعجال): قوڕو قوڕە ڕەش.

(أَلعِجَّـول (ج) عَجاجيـل (ح): گوێرەکـە/ گۆلك.

عجم: ١-(عَجَمَ العُودَ. عَجماً وعُجوماً): دانی بە چیلکەکەدا نا تا بزانێت ڕەقە یان نەرمە.

(-السَّـيفَ): شمشـێرەکەی بۆ تاقیکردنەوە هەڵسووراند.

(-الشيءَ): شتەکەی تاقیکردەوە.

(عاجِـم (ج) عُجَّـمَ): ئەزموونگـەر/ تاقیکەرەوە.

(-تْهُ الأُمورُ): کارو ڕۆژان بە ئەزموونیانکرد/ قاڵیانکرد.

(«ماعَجَمَتْـهُ عيني مُنذُ كذا»): لەو دەمەوە چاوم بەرچاوی نەکەوتووە.

(عاجَمَ-هُ): تاقیکردەوە.

(«عاجَمْتُ الأُمُـورَ وعاجَمَتني»): کارەکانم تاقیکـردەوەو ئەویـش تاقیکردمـەوەو دەریهێنامو قاڵیکردم.

(اَلعَجْمَةُ (ج) عَجَمات): جارێك تاقیکردنەوە/ ئەزموونێك.

(العَواجم): دانەکان.

(عاجِمَة): دانێك.

(رَجُلٌ صُلْبُ المُعْجَم): پیاوێکە. تاقیکردنەوەی گرانە.

٢-(عَجَـمَ- الكِتـابَ أَو الحَـرفَ. عَجْمـاً): نووسـینەکە یـا کتێبەکـە یـان پیتکـەی پنتدارکرد/ پنتی خستە سەر.

(عَجَّـمَ وأعْجَمَ- الكِتابَ) (ضـد): نادياريى نووسينەكەى لابرد بەوەى پنتى خستە سەروو سەروبۆرى بۆ كرد يان لێكيدايەوە ٢-كتێبەكە يان نوســراوەكەى بێپنتو سەروبۆر نووسىو وانەبوو باش بخوێنرێتەوەو تێبيگەن.

(المُعْجَـم): ١-چاوگى ميميــە ٢-فەرهەنگ (لە بنچينەدا لە روونكردنەوەو لێكدانەوەى وشەو ئاخاوتنو نوسراوەوە هاتووە).

(حروفُ المُعْجَم): ئەلفو بێى عەرەبى.

٣-(عَجَـمَ- الكِتابَ. عَجْماً): لە خوێندنەوەى كتێبەكــەدا بــاش پيتەكانــى نەخوێندەوەو دەرنەهێنا.

(عَجُمَ. عُجْمَةً): زمانەكەى پاك نەبوو.

(أعْجَم (م) عَجماء (ج) عُجْم عَجَّمَ- الكِتابَ): كەســێكە زمانەكەى پاك نەبێــت كتێبەكەى نــارەوان خوێنــدەوە، بــە پێــى ســەروبۆر نەيخوێندەوە. (ضد): كتێبەكەى بە رەوانيىو بە پێى سەروبۆر خوێندەوە.

(أعْجَـمَ- الكِتــابَ) (ضـد): ١-كتێبەكــەى نارەوان خوێندەوە (ضد) ٢-كتێبەكەى رەوان خوێندەوە.

(-الكَلامَ): ئاخاوتنەكەى نارەوانكرد.

(-البابَ): دەرگاكەى داخست.

(تَعاجَمَ- الرَجُلُ): خۆى گۆرىو زمانى خۆى نارەوانكرد.

(-القَومُ): خۆيان شاردەوەو ونكرد.

(إنْعَجَــمَ- عليــه الــكلامُ): دەمــى تێكەڵو پێكەڵبوو، قسەى بۆ نەهات.

(إسْــتَعْجَمَ): قســەى بۆ نەكــراو نەيتوانىو بێدەنگبوو.

(-القِراءَةَ): نەيتوانى بخوێنێەوە.

(-عليــه الكَلامُ): ئاخاوتنەكــەى لاگران بوو تێينەگەيشت. ناروونبوو.

(ألعُجم): ناعەرەبى.

(العَجَم): ١-لاوەى عەرەب/ ئەوەى كە عەرەب نەبێت بۆيە وا ناونراون بۆ عەرەب زمانەكەيان بێگانەيەو تێيناگەن ٢ فارس ٣-وڵاتى فارس.

(ألأعجام= العَجَم): لاوەى عەرەب.

(ألعُجمَــةُ والعِجمَــةُ): نادياريــى/ ئاڵۆزيى/ لێليى ٢-ناروونىو ئاڵۆزيى ئاخاوتن وابێت كە تێينەگەن.

(ألأعْجَــم (ج) أعْجَمون وأعاجِم): كەســێك كە عــەرەب نەبێتو بە عەرەبييەكى ناتەواو قســەبكات ٢-عەرەبێــك كــە ئاخاوتنەكــەى ناروونو ناتــەواو بێت گەرچــى بە عەرەبى بدوێت ٣-لاڵ.

(ألعَجمــاء (ج) عَجمــاوات): ١-مێى وشــەى (ألأعْجَم): ٢-چوارپێ.

(ألأعْجَمــي والعَجَمِيّ): ئــەوەى كە رەگەزى عەرەب نەبێت يان سەر بە ناعەرەب بێت.

(بابٌ مُعْجَم): دەرگايەكى داخراو.

٤-(ألعَجْم والعُجْم): بنى كلك/ كلێنچك.

(ألعَجَم والعُجام): ناوكه خورما.
(عَجْمَــة وعُجامَــة): ناوكــه خورمايەك ٢- هەرچی لەناو میوەو شتێكدا بێت كە ئەو شتە بخورێت وەك ناوكی مێوژ.
(ألعَجْمَةُ (ج) عَجَمات): تاوێری سەخت.
(ألعُجْمَــةُ والعِجْمَــةُ): لــی كەڵەكەبــووی بەیەكداچوو.
(ألعَجَمَةُ): دارخورمايەك كە لە ناوكە خورما دەرهاتبێت.
(ألعَجمــاء): خاكــە لمێــك كــە درەختــی تێدانەبێت.
(ألعَجّام) (ح): شەمشەمەكوێرەی گەورە.
عجن: ١-(عَجَــنَ- الدَقيقَ عَجْناً): ئاردەكەی كرد بە هەويرو شێلای.
(تَعَجَّنَ- الشيءُ): شتەكە بوو بە هەوير.
(إعْتَجَنَ- الدَقيقَ): ئاردەكەی كرد بە هەويرو شێلای.
(-فُلانٌ): هەويری دەســتگيربوو يان كڕی يان پەيداكرد.
(العَجين (ج) عُجُن): هەوير.
(ألعَجينَة): گونكە هەويرێك.
ألمِعْجَــن والمِعْجَنَة: تەشــتی هەوير شــێلان/ ئەوەی هەويری تێدا دەشێلرێت.
٢-(عَجَنَ- على العَصا. عَجْناً): خۆی بەسەر گۆچانەكەدا دا.
(-الرَجُــلُ): لەبــەر پيريی يان لەشقورســی دەستی دادا ئەوسا هەستا.
(عاجِن (ج) عُجْن): بۆ هەستان دەستداداوێك كە لەبەر پيريی يان قورسيی لەشی بێت.
(«فُلان عجن وخبزٌ): پيرو پەككەوتە بوو.
(أعْجَــنَ- الرَجُــلُ): پير بوو بەدەســتدادان هەستا.
(ألعَجّان): هەوير شێلی چاك.
(أالعَجين (ج) عُجُن): شلەپەتەو نامەرد.
(ألعُجُــن): ژنو پيــاوی شــلەپەتە بوودەڵەو نامەرد.
(ألعجينَة): نامەرد.
٣-(عَجِــنَ-تِ الناقَــةُ): مێحوشــترەكە زۆر قەڵەوو خرتبوو.
(ألعَجِــن (م) عَجِنَة مِنَ الجمال): حوشــتری زۆر قەڵەوو بەزدارو تێكمسراو.
(ألعَجْناء): ئەوپەڕی قەڵــەوی/ لە قەڵەويدا دراو.
٤-(عاجِنَةُ- المَكانِ): ناوەڕاستی شوێنەكە.
ألعِجان: ١-بن/ قنگ ٢-مل.
(ألعَجّان): گەوج.
(ألعَجناء): مێحوشتری كەمشير.
(ألعَجينَة): ١-گەوج ٢-كۆمەڵە خەڵك.
الملحق:
عجن: (ألمَعجــون (ج) مَعاجين): هەويرەك تێكەڵەيەكە كە وەك هەوير شلە لە پزيشكيداو لەخۆ جوانكردنداو لە پيشەســازيداو گەلێك

بواریتردا بەکاردێت.

(معجون الأسنان): هەویرەکی دان: هەویرەکێکی کیمیاییە بۆ پاککردنەوەی دانە.

---

عجا: ١-(عَجا-تِ الأُمّ الوَلَدَ): دایکەکە درەنگ شیری بە کۆرپەکەیداو لە کاتی خۆیدا نەیدایە ٢-ماستیدایە.

(-هُ اللبنُ): ماستیدایە یان شیریدایە.

(عَجا وعاجى- الوَلَدَ): ١-شیری ژنێکیتری دایە ٢-شیری نەدایەو خواردنیتری دایە.

(عَجِيَ- الصَبيُ عَجىً): بە شتیتر خلافاندیو شیری نەدایە.

(ألعُجاوَة والعِجاوَة والعُجْوَة): شیرێکە لە بری شیری دایکی بە منداڵە هەتیوەکە دەدرێت.

(ألعَجِيّ (م) عَجِيَّة عَجايا): بەچکەی بێدایکی حوشترو کورپەی بێدایك بە شیریتر بەخێودەکرێت.

(ألعُجِيّ (م) عُجِيَّة (ج) عُجايا وعَجايا): منداڵێك کە لە شیر بڕرابێەوەو بەشتیتر بەخێوبکرێت.

٢-(عَجا- البَعيرُ. عَجْواً): حوشترەکە یاخیبوو دەمی کەفیچەندو دڕ بوو.

(-فُلانٌ فاهُ): فیسار دەمیکردەوە.

(عَجا وعَجّى- وَجهَهُ): ڕووی وەرگێڕاو خواریکردەوە.

٣-(ألعَجْوَة والعُجاوَة): خورما بە ناوکەکەیەوە.

(عَجْوَة) (عامية): ناوکەخورما.

(عجى عجى-تِ المرأةُ صَبيَّها. عَجياً): شیری بە منداڵەکەیدا.

ألعَجايَة والعُجايَة (ج) عُجىً وعُجِيّ وعَجايا: ١-دەنکەخورما بە ناوکەکەیەوە ٢-هەموو دەمارێك کە لەلای مەچەکی ولاخەکەوە بێت.

عدّ: ١-(عَدَّ- الشيءَ عَدّاً وتَعْداداً): ١-شتەکەی ئامارکرد/ ژمارد ٢-وایزانی/ وایدانا/ قەبلاندی.

(«عددتُ زَيداً صادقاً»): زەیدم (بە ڕاستگۆ زانی/ لەقەڵەمدا).

(عَدَّدَ- المَيتَ): چاکەو پیاوەتیی مردووەکەی ژماردو پێداهەڵدا.

(-الشيءَ): ١-شتەکەی ژمارد ٢-بە ژماردە داینا.

(عادَّ- الشيءُ القَومَ. عِداداً ومُعادَّةً): شتەکەیان بەیەکسانی لە نێوان خۆیاندا بەشکردو بەشیکردن.

(تَعَدَّدَ وتَعادَّ): ژمارەیان زۆرتر بوو.

(«هُم يَتَعَدَّدونَ ويَتَعادونَ على الألف»): ئەوان لە هەزار کەس زۆرترن.

(إعْتَدَّ): ژمێرراوەو چەند دانەیەکە.

(«هذا شيءُ لايُعْتَدُّ بِهِ»): ئەمە شتێکە هێندە نییەو بەتەنگیەوە نایەن/ ئاوڕی

لێنادرێتەوە.
(«إعْتَدَّ الأمرَ تجارَةً»): کارەکەی بە بازرگانیی زانیو وای بۆ چوو.
(«إعْتَدَ بنَفسِهِ»): پشتی بە خۆی بەست.
ألعَدَد (ج) أعداد: ١ـ ژماردن/ سەرژمێرکردن/ ئامار/ ژمارە.
(ألمَعْدُود): ژمێردراو.
(ألعَدَد- مِنَ الإنسـان): تەمەنی ژمێردراوی مرۆڤ.
(ألعَدَدُ الصَحيح) (ع ح): ژمارەی تەواو وەك ١، ٢، ٣ وشـەی (العـدد) واتا ژمـارەی تەواو هەروەها بە واتای (یەکە) دێت.
(ثلاثَة مِنَ العدد): سێ/ ژمارە سێ/ ژمارەی تەواو، دەشوترێت: (ألعَدَدَ الزَوْج أو المُزدَوَج): ئەومیە کە بەسـەر (٢)دا دابەشبێتو هیچی نەمێنێتەوە. وەك ٤، ١٢.
(ألعَـدَد المُفْـرَد أو الفـردی): ئەومیـە کـە پێچەوانـەی ژمـارەی تـەواو بێـت بە دابەشکردنەکە بەسەر (٢)دا بیمێنیتەوە.
(ألعَدَد الأوَّليّ أو الأوَل أو ألأصْلي): ئەومیە کە هەر بەسەر خۆیدا بەسەر یەکدا دابەش ببێت وك (١١) (١٣).
(ألعدد الكَسريّ أو الكَسر): بەشێکی یەکە یان چەند بەشێکی یەکەکەیە وەك $\frac{1}{2}$ ، $\frac{7}{4}$
(ألعدد الموجب): ژمارەیەکە نیشـانەی کۆی (+) لەبەردەمدا بێت.
(العـدد السـالِب أو السَـلْبي): ئەومیـە کە نیشانەی (-) لە پێشەوە بێت.
(العـدد التَخَيُّلي أو الوهمـي) (ع ج): عدد مثـل ب+ ج ن حيث (ب ج) جبريان و (ن) جـذر (-١ التوبيعي): ژمـارەی خەیاڵی یان نادیـار. ژمارەیەکـە. وەك (ب+ ج ن) کاتێك (ب ج) جەبـری دەبـن و (ن) ڕەگی دوجای (-١) دەبێت.
(العـدد قيمة العـدد المطلقة أوالحسـابية: قيمته مجرداً من الاشارة مثل، ٤ في + ٤ أو - ٤): بایەخی ڕووتی ژمارەکە یان بە ژمێرەیی: بایەخـی ڕووتیەتی کە بەبێ نیشـانە دەبێت وەك ٤ لە (+٤) دا یان لە (-٤)دا.
(ألعددان المتناظران أو المتقابلان (ع ج) هما عددان لهما قيمة حسابية واحدة ويختلفان بالاشـارة (+٥) و (-٥): دوو ژمارەی هاوجێ یان بەرامبەر (ع ج): ئـەو دوو ژمارەیەن کە یـەك بایەخی نرخـی ژمارەییـان هەیەو لە نیشانەدا جیان وەك (+٥) و (-٥).
(العـددان الاوليان فيمـا بينهما: ليس لهما قاسم صحيح مشـترك مثل (٤) و (٩): دوو ژمـارەی سـەرەتایی ئـەو دوو ژمارەیـان کە بەرکەوتەیەکی تەواوی هاوبەشیان نییە وەك (٤) و (٩).
(ألأعداد المتباينة عند العرب لايعدُها معاً كسرٌ أو صحيح والا فهي مشتركة): ژمارە جیاوازەکان

لای عـــەرەب پێکەوە ناژمێردرێـــن کەرتبن یان ژمارەی تەواوبن ئەگینا هاوبەش دەبن.

الاعداد الموجهة او الجبرية: اعداد حســابية مســبوقة باحــدى الاشــارتين (+) أو (-) ويضم اليها الصفر): ژمارە ئاراستەکراوەکان یان جەبرییەکان ژمارەییەکن کە (+) یان (-) یان لە پێشــەوەیەو سفریشیان دەخرێتە پاڵ. ســفریش یەکێکە لەو ژمارانــە. واتە ئەڵێین ∓ صفر بەبێ ∓.

العد (ج) أعداد: ناوێکی هەمیشەیی ٢-زۆریی شت.

(«هذا بَرْضٌ مِن عِــدٌ): ئەمە کەمەکێکە لە شتێکی زۆر.

(العِدَّة (ج) عِدَد): کۆمەڵ.

(«عندي عِدَّةُ كُتُب»): کۆمەڵە پەرتووکێکم هەیە/ چەند کتێبێکم هەیە.

(عِــدَّةُ المَــرأة): ڕۆژانــی خەفەتــی ژن بــۆ مێردکردنەکەی.

(العِداد): ١-ژماردە ٢-بەخشــین ٣-دەمی مردن ٤-ڕۆژی زیندووبوونــەوە/ ڕۆژی حەشــر ٥-نیمچە شێتیی.

(العِداد- مِن الوَجع): نەخۆشیو ئازارێك كە لە نەخۆشەکە نەبێتەوەو ناوبەناو لە کاتێکی دیاریدا سەری لێهەڵبدات.

(«بِــهِ مَــرضٌ عِــداد»): نەخۆشییەکەی بەریدەداتو لە کاتێکی دیاریدا لێیهەڵدەداتەوە.

(«هو في عِدادِهِم»): ئەو یەکێکە لەوان.

(العَــدَّاد): پێــوەر/ ژمێربــەر. ئامێرێکە بۆ پێوانــی مــاوەی ڕۆیشــتووی ئۆتۆمۆبیل. بۆ ژماردەی کارەبای کارکــراو یان ئاوی کارکراو پێشی دەوترێت سەعات یان پێوەر.

(ألعَدَّان والعِدَّان) (ج) عَددين): ١-سەردەمی شتو هەرەتی یان باشترین سەردەمو هەرەتیو سەرەتای.

(«كانَ ذلــك في عَــدَّان الشَــباب»): ئەوە لە هەرەتی لاویدا بوو.

(«على عَدَّان ملكه»): لە سەردەمو هەرەتو کاتی دەســەڵاتیدا بوو ٢-سەرەی ئاوداشتن یان بارانبارین (سريانيه).

(ألعَــدَدِيّ): ١-ژمارەیــی ٢-ئەوەی بــە ژمارە بفرۆشرێت.

(ألعَديــد (ج) عَدائِــد): ١-ژمارەیەکــی زۆر/ گەلێك ژمارە ٢ ژمارە.

(«ماكْثَرَ عَدَيدُهم»): ئای كە ژمارەیان زۆرە ٣-ژمێردراو ٤-بەش.

(«هــذه الدراهِمَ عَديدُ هــذِهِ»): ئەم پارانە هێندەی ئەوەیە.

(ألعَديــدُ- مِــنَ القَــوم): ژمارەیەکــی نــاو خوێشگەل.

(ألعَدائِد): میراتو ماڵی دابەشكراو.

(العَديدَة): ١-مێی وشــەی (العديد) ٢ بەش/ بەرکەوت.

(أَيــامٌ عَديدَة) (ج) عدائِد): ڕۆژانێكی دیارو ژمێردراو/ چەند ڕۆژێك.

٢-(عَــدَّدَ- المــالَ): داراو ســامانی بــۆ ڕۆژی تەنگانە پاشەكەوتكردو كۆكردەوە.

(أَعَــدَّهُ لأَمــرِ): بــۆ كارێــك ئامادەیكــردو ڕێكیخست.

(إِسْتَعَدَّ للأمر): بۆ كارەكە خۆی ئامادە كرد.

(أَلعُــدَّة (ج) عُــدَد): ١-ئامادەبــوون/ خۆسازكردن.

(«كونــوا على عُــدَّة»): ١-ئامادەبــن ٢-ئەو چەكو ئازووخــەو داراییەی بــۆ لێقەومان/ ڕۆژانی ڕەش ئامادەتكردووە.

(«أَخَــذَ للأَمرِ عُدَّتَهُ»): بــۆ كارەكە هەموو پێویستیەكی داناو ئامادە كرد.

(عُدَّةُ الفَرَس): كەلوپەلی چارەوێ وەك زینو جل.

(عُدَّةُ البَنَّاء والنَجّــارِ وغيرِهِما): كەلوپەلو پێویستی خانەسازو دارداشو هیتر.

(أَلمُعِــدّ): ئامادەباش/ خۆســازدەر كە هەموو پێویستیەكی ئامادەكردبێت.

٣-(عــادَّ-ه. عِــداداً ومُعــادَّةً): لەجەنگــدا بەرەنگاریبوو.

(أَلعِدّ (ج) أَعداد): هاوكووف/ هاوتا/ هاوشان/ چونیەك.

(أَلعَديد (ج) عَدائِــد): ١-هاوكووف/ هاوتا ٢-چونیەك/ وەكیەك/ هاوشان.

العَدائِد: چونیەكەكان/: هاوشانەكانی یەكتر.

٤-(أَلعُدّ): زیپكەی دەموچاو.

(أَلعِدّ (ج) أَعداد): (بیرێكی/ چاڵاوێكی) كۆنی ئاودار.

العِداد- مِنَ القَوس: گڤەی ژێ كاتێك تیرەكەی دەردەچێت.

الملحق:

عدّ: (ألإعدادِيّ): ئامادەیی.

(عَمَلٌ تَحْضيرِيّ): كردەیەكی ئامادەكاری.

(أَلتَعليــم التَحْضــيري في بعــض البلدان): قۆناغێكــی ئامــادەكاری خوێندنە لــە نێوان سەرەتاییو ناوەندیدا.

(أَلتِّعْداد): سەرژمێرییو ئامار.

(تَعْداد الأَصناف): ژمارەدەی جۆرەكان.

(تَعداد السكان): سەرژمێری دانیشتوان كە لە ماوەی دیاریكراودا دەیكەن بۆ زانینی ژمارەی دانیشتوان.

(أَلمُعَدَّات): ناوێكی گشــتیی كەلوپەلو ئامێرو پێداویستیو شتیترە.

(مُعَدَّاتٌ حَربِيَّة): هەموو پێداویستیەكی جەنگ.

---

عدر: ١-(عَدَرَ. عَدراً وعُدْرَةً): زاتیكرد/ وێرای.

٢-(عَــدِرَ واعْتَدَرَ المَكانُ. عَدَراً): شــوێنەكە ئاودار بوو/ ئاوی زۆر بوو/ ئاوەزێبوو.

(-المَطَرُ): دایرشتە باران.

(أَلعَدْر والعُدْر): لێزمە باران/ شەســتەباران/ ڕەهێڵە.

٣-(العادِر): ١-درۆزن ٢-كەوتوو/ لەدەستچوو.

(ألعَدَّار): دەرياوان.

عدس: ١-(عَدَسَ-ُ عَدْسا): كارگوزارییكرد.

(-المَواشِيَ): ئاژەڵەكانی لەوەراند.

٢-(عَدَسَ- الشـيءَ. عَدْساً): شـتەكەی نایە ژێرپێو توند شێلای.

(-فِي الأَرْضِ عَدْساً وعَدَساناً وعِداساً وعُدُوساً): ڕۆیشت.

(«عَدَسَـت بِـهِ المَنِيَّةُ»): مـەرگ بردیەوە/ مرد.

(عـادَسَ- الرَّجُلُ): كابرا بێوچان ڕۆیشـتو نەوەستا.

٣-(عُدِسَ) (طب): تووشی زیپكە بوو.

(مَعدوس): زیپكاوی/ زیپكەلێهاتوو.

(ألعَدَس) (ن): نیسك.

(ألعَدَسَـة): دەنكـە نیسـكێك. ڕووەكێكـی گیاییـە لەبەر تۆوە وردە خۆراكبەخشـەكەی دەرویەنرێت، بنكەی سەرەتایی بوونی ئاسیایەو لە زۆر شـوێندا بلاوە، لاسـكەكەیو پەلی بۆ ئالفی ئاژەڵ بەكاردێت.

(عَدَسُ الماءِ) (ن): نیسكەئاویی (ن) ڕووەكێكی گیاییە گوڵبەدەرەوەی بەسەر ئاوەوەیە ئەگەر زۆر بێـت زۆرێكـی ڕووی زەلـكاوەكان یـان دەریاچەكان دادەپۆشێت.

(ألعَدَسة): زیپكە كە وەك دەنكە نیسكە.

٤-(عَدَسْ): دەنگێكە ئێستری پێ دەردەكرێت: شەوە.

(عَدَس): ئێستر.

(ألعَدَسَـة أو العَدَسِـيَّة) (ف): هاوێنـە/ یـان هاوێنەیـی/ وردبین/ گەردبیـن پارچە كریسـتاڵێكە یان لە مادەیەكیـتری ڕوون كە لـە زۆر كاتـدا دوو ڕووی گۆیی یان ڕوویەكی گۆییو ڕوویەكی تەختـی دەبێت بۆ بینینو لە دروسـتكردنی ئامێـری فۆتۆگرافی وردبین بەكاردێتو هاوێنپەرتو هاوێنكۆ دەبێت.

عـدف: ١-(عَدَفَ وتَعَدَّفَ عَدْفاً): كەمەكێكی خوارد.

(«ماعَدَفتَ وما تَعَدَّفتُ»): دەمم لە خواردن نەداوە نە كەمو نە زۆر.

(ألعَـدْف (ج) عُدُف): بەخشـینێكی كەم یان ئالیكێكی كەم.

(«ماذقنا عَدْفـاً وعَدَفاً وعُدافاً وعَدُوفَةً»): تامـی نەخـواردنو نەخواردنەوەمـان نەكردووە.

(ألعَدُوف): كەمەكە ئالیكێك.

٢-(إعْتَدَفَ- الثَوبَ): پارچەیەكی لە كراسەكە برد.

(ألعِدْف): ١-كۆمەڵە خەڵكێك/ دەستەخەڵكێك ٢-بەشێكی شەو.

(ألعِدفَة (ج) عِدَف): ١-پارچەیەكی شـتەكە ٢-كۆمەڵە خەڵكێك.

(ألعَدَفَـةُ (ج) عَدَف): بنكـی درەخت كە لە

زەویدایە.

(اَلعَیْدَف): پارچەیەکی شتەکە.

عدق: (عَدَقَ وعَدِقَ وعَـدَّقَ وأَعْدَقَ- يَدَهُ. عَدْقاً وعَدَقاً): دەستی بەملاولای چاڵاوەکەدا یان گۆلەکـەدا گێڕا وەك شـتێکی بوێتو بۆ شتێك بگەڕێت.

(-بِظَنِّهِ): بیری بۆ شتێك چوو، ڕای بۆ لایەك کە تەواو لێی عایەن نەبوو چوو وەك شتێکی بوێت.

(العَدَقَـةُ والعَـوْدَق والعَوْدَقَـةُ (ج) عَدَق): چنگاڵێکـی سـێپەل کـە دۆلکەی لـە چاڵاو پێدەردەهێنرێت.

عدك: (عَدَكَ- الصُوفَ عَدْكاً): بە شوڵکەکە خورییەکەی شیکردەوە.

(اَلمِعْدَكة): شوڵکی خوری شیکردنەوە.

عدل: ١-(عَدَلَ- السَهْمَ ونَحْوَهُ. عَدْلاً): تیرەکە یا هیتری ڕاستکردەوە/ ڕێکیخست.

(-فُلاناً بِفُلانٍ): یەکسـانیکردن/ وەك یەکی لێکردن/ فیساری بە فیسار یەکسان کرد.

(-فُلاناً): هاوکێشـەی فیسـار بوو/ وەك ئەو بوو.

(-بِرَبِّـهِ): هاوبەشـی بـۆ خـودای خـۆی پەیداکرد.

(-هُ فِي المَحْمَـلِ عُدُولاً): لـە کەژاوەکەدا یان بەسـتەکەکەدا بـوو بـە هاوتـایو لەگەڵیدا سواربوو.

(«مايَعْدِلُـكَ عِندي شـيءٌ»): لای من هیچ هاوتای تۆ نییەو ناگاتە تۆ.

(عَـدَلَ. عَـدْلاً وعَدالَـةً وعُدُولَـةً ومَعْدَلَةً ومَعدِلَةً): دادوەر بوو/ بەداد بوو/ دادپەروەر بوو.

(عـادِل (ج) عُـدُول): بـەداد/ دادپەروەر/ ڕاستخواز/ بەویژدان.

(عَـدُلَ. عَدالَةً): دادپەروەر بوو/ ڕاسـتخواز بوو/ دادگر بوو.

(عَدَّلَ- الشِـعْرَ): هەڵبەسـتەکەی کێشـدارو ڕاستکرد.

(-المَتاعَ): کەلوپەلەکەی کرد بە دوو تابار.

(«شَرِبَ حَتى عَدَّلَ»): هێندەی خواردەوە تا ورگی وەك لنگەباری لێهات.

(عادَلَ- هُ. عِدالاً ومُعادَلَةً): هاوتای ئەو بوو/ وەك ئەوی لێکرد.

(-هُ فِي المَحْمَـلِ): لـە کەژاوەکـەدا یـان بەسـتەکەکەدا هاوتای لنگەباریبوو لەگەڵیدا سواربوو.

(-بَين شَـيئَيْن): دوو شتەکەی هێندەی یەك لێکرد.

(«عادَلَ بَين الأمرَين»): دوو کارەکەی بەراورد کردو هەڵسەنگاندنو سەرنجی لێدان.

(أَعْـدَلَ الشَـيءَ): شـتەکە ڕاسـتکردەوەو ڕێکیخست.

(إِعْتَدَلَ): ١-ڕێكو ڕاستبوو ٢-مامناوەندیبوو.

(العادِل (فا) (ج) عُدُول): هاوبەش بۆ خودا پەیداکەر.

(ألعَــدْل) (مــص): ١-داد/ دادپەروەریــی/ راســتیی‌و دروســتیی ٢-دادپەروەر/ راســت‌و بەویژدان.

(رَجُلٌ عَــدْلٌ وامْرأةٌ عَــدْلٌ وعَدْلَةٌ ورجالٌ عَدلٌ): بە دادا/ دادپەروەر/ راســت‌و رەوان/ راست‌و دروست.

(«رَجُــلان عَــدْلان ورجال عُــدُول»): دوو پیاوی بەدادو پیاوانی بەداد.

(ألــعَــدْل): ١-پــێــوەر/ پــێوانــە ٢-پــاداشــت ٣-بەرامبەری ٤-مامناوەندی ٥-راست‌و دروستیی.

(ألعَدْل (ج) أعْدال): هاووێنە/ وەکو.

(ألعِــدْل (ج) عُــدُول وأعْــدال): ١-هاووێنە/ وەکو هاوشێوە/ لەو چوو ٢-نرخ.

(«خذ عِدلَه كذا وكذا»): نرخەکەی ئەوەندەو ئەوەندە وەربگرە ٢-جەواڵ تای خەرار کە دوو تان‌و هاوتا دەبن.

(ألعَدَل: وەك یەکێکردنی دوو تاکەو بە قەدەر یەککردنیان.

(ألعَــدِل= العــادِل): ١-دادگــەر/ دادپــەروەر ٢-پەیداکەری هاوبەش بۆ خودا.

(ألعَديل (ج) عُدَلاء): ١-هاوسەنگ/ هاووێنە/ وەکــو ئــەو ٢-هاوتــای یەکــتر لە کــەژاوەو باروبنەدا/ باروبەستەکدا.

(ألإعتِــدال الربيعي والخَريفــي): وەکیەك وەستانی شەوو رۆژ لە بەهارو پایزدا.

(نَقطــه الإعتِــدال الربيعــي والخريفي): پنتی تێدا یەکســانبوونی شەوو رۆژ ئەو دوو پنتەن کە لــە لێکدانی گەردوونی برجەکان‌و هێڵــی ناوەندی ئاســمانیی پەیدادەبێت خۆر لە سەرەتای بەهاردا یەکەمین پنت دەبڕێت‌و لە ســەرەتای پایزدا دووهەمین پنت دەبڕێت ئەوسا شەوو رۆژ لە هەموو ولاتاندا وەکیەکی لێدێت.

(مُبادَرَةُ الإعتدالَيْن): سەرەتای وەکیەکبوون (فك): پێشکەوتنی دەمی یەکبوونەکە سالانە (٢٠) خولــەك ئەویش بە هــۆی گوێزانەوەی دوو پنتــی یەکســانبوون بە بــڕی ٥٠ چرکە لەسەر گەردوونی برجەکە.

(المعادَلة (ع ج) مجموعة عبارتين لاتساويان الا اذا ابدلت فيهمــا المجاهيل بقيم محددة وتسمى هذه القيم جذور المعادلة او جوابها او حلها ويســمى كل مــن العبارتين طرف المعادلــة او جانبها او عضوهــا او عديلها): (س + ٤ = س-١): هاوکێشــە (ع ج)دوو دەستەواژەن یەکسان نابن ئەو کاتە نەبێت کە نەزانراوەکانیان بە بایەخی/ نرخی/ سنووردار نەگۆڕێتەوە بەو بایەخانەش دەوترێت رەگی هاوکێشە یان وەلامەکەی یان شیتەڵەکەی. بە دوو دەســتەواژەکەش دەوترێــت لاکانی بری وەك (س+ ع= س-١) (المعادلة غير المعيَّنة او

السـيالة: اذا كان عدد جذورها غير متناهٍ): هاوكێشـه دیارینەکـراوەکان ئەوانـەن کـە ڕەگەکانیان دیارینەکرابێت‌و بێکۆتابن.

المعادلة المستحيلة او المحالة: اذا لم يكن لها جذر: هاوكێشەی ستەم: ئەوەیە کە ڕەگی نەبێت.

(المعادلة الحرفية) اذا ضمت حروفا معلومه الى جانـب المجاهيـل (٤ ب + س = ٢س+) وفي هـذه الحال فانها تتحـول الى متطابقه اذا عوض عن المجاهيل بالجذور): هاوكێشە پیتەییـەکان ئەوانـەن کـە هێمـای زانراوو نەزانراوی تێدابێت (٤ ب +س= دس +٤) لەم بارەدا دەبێتە هاوئەنجام ئەگەر نەزانراوەکان بە ڕەگەکان بگۆڕن.

(المعادلـة العددية اذا لم تضم الا اعدادا الى جانب المجاهيل): ئەوانەیە کە تەنها ژمارە لە پاڵ نەزانراوەکانـدا هەبێت وەك (٤ س+ س+ ٢س=٤).

(المعـادلات المتكافئـة: لها جـذور واحدة): هاوكێشە هاوواتاکان ئەوانەن کە یەك ڕەگیان هەبێت.

(مجموعـة المعادلات): المعـادلات يطلب لها جذور تحققها جميعا: کۆمەڵەی هاوكێشەکان کـە داوای ئەو ڕەگانەیان بـۆ دەکەن کە پێی پاساوی هەموویان پێدەدرێت.

(مُعـدلاتُ البَيـتِ): گۆشـەو سـووچەکانی خانووەکە.

٢-(عَـدَلَ- الطريقُ عَـدلاً): ڕێگەکە پێچی کردەوە.

(-عَنِ الطَريقِ. عَدلاً وعُدولاً): لە ڕێگەکە لایدا.

(-إليهِ عُدولاً): گەڕایەوە بۆ لای.

(عَدِلَ. عَدَلاً): زۆرداریی‌کرد/ ستەمیکرد.

(عادَلَ- الشيءُ. عِدالاً و معادَلَةً): شتکە خوار بووەوە/ کەچبووە.

(-في الأمـرِ): لـە کارەکـەدا شـڵەژاو بـۆی ئەنجامنەدرا.

(إنْعَدَلَ- عَنِ الطريقِ): لە ڕێگەکە لایدا.

(ألعَدْلُ): نیاز/ ئامانج لە کاردا.

(ألعِدال): لادان/ کەچبوون.

(«قَطَعَ العِدالَ في أمرِهِ»): بڕیاری هەتەربوونی تەواوی کارەکەیداو وازی لە ڕاڕایی هێنا.

(ألمَعْـدِل والمَعْـدُول): لێوە ڕۆیشـتن‌و لێوەی لادان.

(ما لَـهُ مَعدِلٌ أو مَعدولٌ عَـن كذا): لێوەی لانادات/ لەوە لانادات.

(أخَذَ مَعدِلَ الباطِلِ): لایدایە ڕێگەی ناڕەواو خوار/ ڕێگەی ناڕەواو خواریگرت.

٢-(عَدُلَ- الشاهِدَ): شـایەتەکەی بە ڕاستگۆ دانا.

(ألعَدَلَـةُ والعُدَلَـةُ): ئەوانەی کە شـایەتیی شایەت بە ڕاست دادەنێن.

(ألعُدَلَة): کەسـێکی بەڕاستدانەری شایەتیی شایەت (ج) (ألعَدلَة).

الملحق:

عدل: (ألتَعدِيل) (مص): گۆڕین و ڕاستکردنەوەو ڕێکخستنی شتێك بەبێ ئەوەی دەستکاریی سروشت و کورۆکی شتەکە بکرێت.

(«تَعديل مَشروع»): گۆڕانکاریی لە پرۆژەیەکدا.

(أَدْخَلَ تعديلاتٍ على النَصِّ): گۆڕانکاریی لە دەقەکەدا کرد.

(ألتَغيير بالتَصحيح): گۆڕانکاری ڕاستکردنەوە.

(«تَعديل حُكْمٌ قَضائِيّ»): گۆڕینی بڕیارێکی دادوەریی.

(«تَعديل القانون أو الدستور»): بە هۆی دەسەڵاتی ڤانووندانانەوە گۆڕانکاریی لە یاساو دەستووردا بکرێت.

(«تَعديل الوزارة»): گۆڕینی وەزارەت بە لابردنی چەند وەزیرێکەوە یان سەرلەنوێ وەزارەتی تازە دابنرێتەوە.

(المُعْتَدِل): ١-مامناوەندی/ ناوەندی دوو ڕەوش.

(«قامَةٌ مُعْتَدِلَة»): بەژنێکی مامناوەندی

٢-دوور لە تیژو زیادەڕەویی.

(«مُعْتَدِلٌ في رَغباتِهِ»): حەزو ئارەزووەکانی (مامناوەندییە/ لەسەرخۆیە).

(«سِعرٌ مُعتَدِل»): نرخێکی مامناوەندی نە هەرزان و نەگران.

(«المنطقة المُعْتَدِلَة في الجغرافيا»): ناوچەیەکی ئاووهەوا مامناوەندی نە زۆر ساردەو نە زۆر گەرمە/ فێنك.

(ألمُعَدَّل) (ع ح): تێکرا/ ئەنجامی دابەشکردنی کۆی چەند ژمارەیەك بەسەر ژمارەی ژمارەکاندا.

(مُعَدَّل عَلامات التلميذ): تێکڕایی نمرەی ڤوتابییەك.

(ألمُعَدَّل): ڕێژەی دیاریکراوی بایەخێکی زانراو.

(مُعَدَّل النَّجاح في الإمتحان): ڕێژەی دەرچوون لە تاڤیکردنەوەدا.

---

عدم: (عَدِمَ- المالَ. عُدْماً وعَدَماً): داراکەی لەدەستچوو.

(«مايَعْدَمُني هذا الأمرَ»): ئەو کارەم لەدەست ناچێت و نافەوتێت.

(عَدُمَ. عَدامَةً): گەوجبوو.

(عَدامَة): گەوجیی.

(أَعْدَمَ- الرَجُلُ. إعداماً): هەژار کەوت/ هیچی نەما.

(مُعْدِم وعَديم): هەژار نەدارا/ نەبوو/ کەوتوو.

(أَعْدَمَ-هُ الشيءَ): شتەکەی لەدەستدا.

(-فُلاناً): دەستی نایە بەر فیسار/ بەری لێگرت.

(-أَعدَمني الشيءُ): شتەکەم نەدۆزییەوە.

(العُدْم والعُدُم): لەدەستچوون‌و ونکردن.

(ألعَدَم): ١-نەبوون ٢-ونکردن/ لەدەستدان.

(ألعَدِم): هەژار/ نەبوو/ نەدارا.

(ألعَديم (ج) عُدَماء): ١-هەژار/ نەدارا ٢-گەوج ٣-شێت/ دێوانە ٤-نەبوو/ کەوتوو.

(«هو عَديمُ النَظير»): ئەو بێوێنەیە.

(ألمَعْـــدوم) (مفـــع): ١-نەبـــوو ٢-لەناوچوو ٣-نابووت.

(ألمَعْـــدوم أَو المُنْعَـــدِم): (ع ح): ئـــەوەی کـــە بەرامبەر سفرە.

الملحق:

عدم: (ألإعدام) (مص): کوشـــتن‌و مردن/ لە سێدارەدان/ لە قەنارەدان.

(«حُكِـــمَ على المجرم بالاعدام»): ســـزای لە سێدارەدان بەسەر تاوانبارەکەدا درا.

(تَنفيذ الحُكْمِ بالموتِ): بەجێهێنانی فەرمانی لەسێدارەدان‌و خنکاندن.

(جَـــرى الإعـــدامُ في ســـاحة الســـجن): لەســـێدارەدان‌و خنکاندنەکـــە لە حەوشـــەی بەندیخانەکەدا کرا/ بەجێهێنرا.

(عُقوبَـــة الإعدام): ســـزای لە قەنـــارەدان‌و خنکاندنی تاوانبار.

(إلغـــاء عُقوبَـــةُ الإعدام): هەڵگرتنی ســـزای لەسێدارەدان‌و خنکاندن.

---

عدن: ١-(عَدَنَ- بالمَـــكان عَدْناً وعُدوناً): لە شوێنەکەدا نیشتەجێبوو.

(-البَلَدَ): شـــارەکەی یان وڵاتەکـــەی کرد بە نیشتمانی خۆی.

(-الحَجَرَ. عَدْناً): بەردەکەی هەڵکەند.

(عَدَّنَ- الأَرضَ بالمِعْدَن): زەوییەکەی بە پاچ هەڵکەند.

(أَلعَدْن): ١-نیتشەجێبوون ٢-بە نیشتمانکردنی شوێنێك.

(جَنَّةُ عَدَن): بەهەشتی عەدەن ئەو شوێنەیە کە خودا ئادەمی تێدا دانا.

(جَـــنَّـــاتُ عَـــدْنٍ): بـــەهـــەشـــتـــەکـــانـــن بۆ نـــیـــشـــتـــەجـــێـــبـــوونـــی نـــەمـــریـــی (لـــە بە نیشتمانکردنەوە هاتووە).

(عَدَن): ناوی شوێنێکە لە وڵاتی عەرەبدا.

(ألعَدَنِيّ): ١-خەڵکی عەدەن ٢-رەوشتبەرز.

(ألمَعْدِن (ج) مَعادِن): کانی هەموو شتێك کە جەرگەو کانگای ئەو شتە بێت.

(فُـــلان مَعدِنُ الخَيرِ والكَرم): فیســـار کانگاو سەرچاوەی چاکەو جوامێرییەو بەخشینە.

(ألمَعْدِن): کانی زێڕو زیوو ئاســـن‌و شـــتی لەو بابەتەیـــە. کیمیاییـــەکان تەنە ســـادەکانیان بەدوو کوتەوە کردووە: کانـــزاکان وەك زێڕو زیـــوو جیوە.. نیمچە کانـــزاکان وەك گۆگردو هایدرۆجین بـــەڵام ئەم جۆرە دابەشـــکردنە زۆرجـــار گراندەبێـــت، چونکـــە تـــەن هەیە نیشـــانەی هـــەردوو جۆرەکـــەی هەیـــە لـــە نیشانەکانی کانزاکان ئەوەیە کە گەیەنەرێکی

باشــی گەرمیی‌و کارەبایە کاتێــك كە لەگەڵ ئۆکســجیندا یەکدەگرێــت بــە لایەنــی کەم ئۆکسیدێکی تفت دەدات بەلاّم نیمچە کانزاکان گەرمــی‌و کارەبا ناگەیەنن‌و زۆریشــیان گازن ئەوانەی کە ڕەقیشــن بریقەدار نین. بەشــی زۆری گــیراوە ئاوییەکــەی ئۆکســیدی ترش دروست ناکات.

(اَلمِعْــدَن): پیــك یــان نوێــڵ کــە بــەردی پێدەردەهێنرێت‌و پێی دەشکێنرێت.

(اَلْمُعَــدِّن) (فــا): کانــزادۆز کەســێکە بەرد دەردەهێنێــت بــۆ زێــڕو زیــوو شــتیترو دەیشکێنێت.

(اَلتَعْدِیــن) (ك): کانزاگەریــی/ زانســتی‌و پیشــەی کانزادەرهێنــان‌و پاککردنــەوەو بەکارهێنانیەتی.

٢-(عَــدَنَ- الأَرضَ- عَــدْنــاً): زەویــەکــەی پەینکرد.

(عَــدَّنَ- الأَرضَ): زەویەکــەی پەینکــرد. پەینرێژ کرد.

٣-(عَدَّنَ- الشارِبُ): سمێڵەکە پڕ بوو.

٤-(العَدان) ١-کەناری/ ڕۆخی (دەریا) ٢-لێواری ڕوبار.

اَلعَدانَة (ج) عَدانات: کۆمەڵە/ دەستە/ تاقم/ تیپ.

(«أَتانا عَداناتٌ»): دەستە خەڵکمان هاتە لا.

(اَلعَدینَــةُ): پینــەی بنــی دۆلکە کــە کونی تێبووبێت.

(اَلعیدانه (ج) عیدان): دارخورمای بەرزز.

عدا: ١-(عَــدا. عَدْواً وعَدَواناً وعُدُوًّا وتَعْداءً وعَداً): خێرا ڕۆیشت‌و ڕایکرد.

(-عَلَیــهِ. عَــدْواً وعُدْواناً): لێــی ڕاپەڕی/ پەلاماریدا/ هەڵمەتیدایە سەر.

(عــادی- بَــین الصَیدَین. عِــداءً ومُعاداةً): بەتیرێك دوو نێچیری پێکا یەك لە دوای یەك بوو.

(أَعدی- الرَجُلَ): کابرای خستە ڕاکردن.

(تَعــادی- القَــومُ): خوێشــگەل پێشــبڕکێی ڕاکردنیانکرد.

(-تِ النَوائِــبُ): وەی، یــەك لــە دوای یــەك هات.

(إِسْتَعدی- الفَرَسَ): غاری بە ئەسپەکە دا.

(اَلعادِیَةُ (ج) عَوادٍ): ١-خوێشگەل پەلەیانە بۆ جەنگ/ خێرا دەکەن ٢-سوارەی پەلاماردەر.

(العَداء والعِــداء): دەرچوونێك‌و ڕاکردنێك/ تاودانێك/ دەرپەڕینێك.

(«عَــدا الفَرَسُ عِــداءً أَو عَــداءً واحداً»): ئەســپەکە دەرپەڕینێك دەرپەڕی‌و غاریکرد/ سوورێك.

(اَلعَدَّاء): ١-توند ڕاکردووی چاك ٢-تیژ غار.

(اَلعَــدْوَة): ١-جارێــك ڕاکــردن ٢-غــاردان/ تاودان.

(اَلعدَّاء): تیژ ڕاکردوو.

(العَـدِيّ): تاقمى خوێشـكەل پەلەى چوونە جەنگيانە.

٢-(عَـدا- فُلاناً عَنِ الأَمر عَـدواً وعُدْواناً): كابراى لە كارەكە لاداو خەريكيكرد.

(-الأَمرَ وعَنِ الأَمـرِ): وازى لە كارەكە هێناو لێيگەڕا.

(-عَلَيـهِ) عَـدْواً وعُـدُوّاً وعَـداءً وعُدْواناً وعِدْواناً): زۆردارىى بەرامبەر كرد/ سـتەمى دەربارە كرد/ دەستدرێژيى لێكرد.

عَـدا: جگە لـە/ بێجگـە/ نەبێت (وشـەى «جياكردنەوەيە/ هەڵاواردنە»).

(«جـاءَ القَـومُ عـدا زَيْـداً وعـدا زيدٍ»): خوێشكەل هاتن جگە لە زەيد/ زەيد نەبێت.

(«ماعَدا زَيداً»): زەيد نەبێت.

(عَـدِيَ- لِفُلان. عَداً): رقى لە فيسـار بوو/ حەزى لە چارەى نەكرد.

(عُدِيَ- على فُلان): زۆرو سـتەم لە فيسـار كراو ماڵەكەيان (تالأنكرد/ دزييان).

(عَـدَّى- الشـيءَ): رێگـەى شـتەكەيداو جێبەجێيكرد.

(-عَـنِ الأَمـرِ): كـارەكـەى وازلـێـهـێـناو بەجێيهێشت.

(«عَدِّ عَمّا تَرى»): چاوپۆشـيى لەوە بكە كە دەيبينيت.

(-فُلاناً عَنِ الأَمرِ): وازى پێلێهێنا/ فيسـارى لە كارەكە دوورخستەوە.

(-الفِعْلَ): كارەكەى كرد بە كارى تێپەڕ.

(عادى- الشـيءَ): عِداءً ومُعاداةً: شـتەكەى دوورخستەوە.

(-فُلانـاً): بەگژيدا چـوو بوو بـە ناحەزو دوژمنى.

(أعدى- الأَمـرَ): بۆ ئەو كارە وازى لە كاريتر هێنا.

(-عَلَيهِ): دەسـتدرێژيى كردە سەر/ ستەمى دەربارە كرد/ زۆردارىى بەرامبەر كرد.

(-فِي كَلامِهِ): قسەى نارەواو دوژمنانەيكرد.

(-هُ شَـرّاً): خراپـەو بەديـى پێگەيانـدو تووشكرد.

(-هُ مِـن عِلَّـةٍ أَو خُلُـقٍ): دەردەكەى خۆى يا رەوشـتە ناشـيرينەكەى خـۆى پێگەياندو تووشيكرد.

(«قَريـنُ السـوءِ يُعْدي قَرينَـهُ»): هاورێى خراپ رەوشـتى ناشيرينى خۆى بە هاورێكەى دەگەيەنێت.

(تَعَـدَّى- الشـيءَ): لـە شـتەكە (ڕەتبـوو/ تێپەڕى).

(-الشـيءَ الى آخـر): لە شـتەكە ڕەتبوو بۆ شتێكيتر چوو.

(-الفِعْلُ): كردارەكە كردارى تێپەڕ بوو.

(-عَلَيهِ): زۆردارىى بەرامبەر كرد.

(تَعادى- الرَجُلُ): كابرا دووركەوتەوە.

(-المَـكانُ): شـوێنەكە تەختنەبـوو بەرزىو

نزميی و هەبوو.
(-القَومُ): خوێنشــگەلە دوژمنایەتییان لەگەڵ یەکدا کرد.
(-مابَینَهُم): ناتەباو نارێکبوون لەناو یەکدا.
(إعتَــدی- الحَقَّ وعَنِ الحَقِّ وفَوقَ الحَقِّ): لە هەق و راستیی لایداو دوورکەوتەوە.
(-علــی فُــلان): دەســتدرێژیی کردە ســەر فیسار/ ستەمی لێکرد.
(ألعــادِي (فــا) عُــداة): دەســتدرێژیکەر ٢-زۆردار ٣-دوژمن/ ناحەز ٤-لە سنوور دەرچوو ٥-بەدزییەوە شتبەر/ دز ٦-شێر.
(عادی العَــوادي): کاری زۆر گرنــگ و ئالۆز کــە هەمــوو کارێکیــترت لــە بیردەباتــەوەو لێدوورتدەخاتەوە.
(ألعادِیَةُ (ج) عَوادٍ): ١-مێی وشــەی (العادي) ٢-دووریــی ٣-کارو رەتبلاویــی کــە لە شــت دوورتبخاتەوە ٤-دەمارگیریی و توورەبوون.
(عادِیَةُ السُمِّ): زیانی ژەهر.
(«رَفَعْــتُ عَنْــكَ عادِیَةُ فُــلان»): خراپەو ستەمی فیسار کەسم لەسەر لابردیت.
(عَوادی الدَهْر): کێشەو گرفتاریی رۆژگار.
(«صَرَفْتــهُ عَــن کــذا عــوادٍ»): تەگەرەو گیروگرفــت رێــی نەنجامدانو رێــی ئەوەی لێگرت.
(ألعَداء) (مص): کارو ســەرقاڵیی لەو شــتە دوورتدەخاتەوە ٢-دووریی.

(ألعَــداوة): دوژمنایەتیو ناحەزیی و لەیەکتر پچڕان.
(ألعَدُوّ (ج) أعداء و (جــج) أعادٍ): دوژمن/ ناحەز/ قینەلێکێش/ نادۆست.
(ألعُدْوَة): شوێنی دوورەدەست.
(ألعُدَواء): ١-دووریی ٢-کارو ســەرقاڵیی کە لە شتەکەت بکات/ دەستگیراویی و رەتیلاوبوون.
(عُدَواءُ الشَّوق): گرفتاریی حەزو تاسەی دڵ.
(عُدَواءُ الشُــغل): رەتبلاویی و دەستگیراویی کار/ فرمان.
(طالَت عُدَواؤُهُم): دووریــی و لێکجیاییان و لێکپچڕانیان درێژەی کێشا.
(ألعُدْوان): زۆرداریی و ستەمی ئاشکرا.
(«لاعُــدوان عَلَيَّ»): هیچ رێگەو بیانوویەکم لەسەر نییە.
(ألعَدْوَی): ١-گەندەڵیی/ گەنیی ٢-تەنینەوەی دەردو نەخۆشیی وەك گەریی لە یەکێکەوە بە یەکێکیتر بگات کە تەندروستبێت.
(ألعِــدَی): ١-لەیەکپچــڕاوەکان/ لەیــەك دوورکەوتــووەکان ٢-ئاوارەکان/ نەناســەکان/ نامۆکان ٣-کۆی دوژمن واتا دوژمنەکان.
(ألعُدَی): دوژمنەکان.
(ألمَعْدَی): لێلادان/ وازلێهێنان.
(«مالي عَن فُلان مَعْدَی»): لە فیســارکەس وازناهێنمو بەلای کەسیتردا لانادەم.
(ألمَعْدِيّ): زۆرلێکراو/ ستەملێکراو.

٣-(أَعدى فُلاناً على فُلان): پشـتی فیساری گرت لەسـەری کـردەوە/ بەهێزیکـرد دژی ئەویترو سەریخست.

(إسْـتَعْدى- الرَجُلَ): هانای بۆ پیاوەکە بردو پشتگیری‌و کۆمەکی لێخواست سەریبخات.

٤-(عَداءُ الوادي): ناو دۆڵەکە.

(ألعِداء والعِدْو): بەردێکی تەنکی بچووك کە شتی پێ دادەپۆشرێت.

(ألعَـدْوَةُ والعَـدْوَةُ والعِـدْوَةُ (ج) عِـداء وعَدَوات): ١-شـوێنی بەرز/ هەڵەت‌و بەرزیی ٢-کەناری چەم‌و تەنشتی‌و ڕۆخانە، تەنیشت‌و کەناری دۆڵ.

(ألعُدْواء): زەویی وشکی ڕەقەن.

(ألعِدى): ١-ڕۆخی ڕوبـار ٢-بەردێکی بچووك کە شتی پێدادەپۆشرێت.

(ألعِدى والعَدى (ج) أعداء): کەنار/ لا.

(ألعُدى): شوێنە بەرزەکان.

(عَدِيّ): خێڵ.

عذب: ١-(عَذَبَ. عَذباً): لە تینواندا وازی لە خواردن هێناو خواردنی پێنەخورا.

(عَـذوب وعـاذِب): تینوویەکـی وەهـا کە خواردنی پێنەخورێت.

(-ەُ): دەستی نایە بەری نەیهێشت.

(-عَنْهُ): دەستی لێهەڵگرت/ وازی هێنا.

(عَذَّبَ-ەُ): ئەشکەنجەیدا/ ئازاریدا.

(-ەُ عَـنِ الشَـيءِ): بەری شـتەکەی لێگرت/ نەیهێشـت دەستی بگاتە شتەکە/ دەستی نایە بەری.

(-الشَيءَ): شتەکەی بەندکرد.

(أَعْـذَبَ- عَنْـهُ): وازی لێهێنـاو دەسـتی لێهەڵگرت.

(-ەُ عَـنِ الأمـرِ): ڕێـی کارەکـەی لێگرت/ نەیهێشت بگاتە کارەکە.

(«أَعْـذِبْ نفسَـكَ عَـن كذا»): خـۆت لەوە تەریکبکەو دوورخەرەوە.

(إسْـتَعْذَبَ عَن كذا): وازی لـەوە هێناو لێی دوورکەوتەوە.

(العاذِب- مِنَ الدَّوابّ (ج) عُذوب): چوارپێی وەسـتاو کـە نە بخـوات‌و نـە بخواتـەوە/ مانگرتوو.

(ألعَـذاب (ج) أَعْذِبَـة): هەرچـی بۆ مرۆڤ گرانبێت‌و ڕێگر بێت نەهێڵێت بە ئامانجەکەی بگات.

(ألعَذوب- مِن الدَّواب): چوارپێیەك کە لەبەر تینوێتی خواردن نەخوات‌و بۆی نەخورێت.

٢-(عَذَبَ وعَذَّبَ- السَـوْط عَذْباً): دەسـکی خستە قامچیەکەوە.

(إعْتَـذَبَ): دوو لکی بۆ مێزەرەکەی، سـەرو بەستەکەی لە پشتەوە بەردایەوە.

(ألعَـذَب الواحِدَةُ عَذَبَة): ١-دەسـکی قامچی ٢-ئەو پەتەی ترازووی پێبـەرز دەکرێتەوە/ هەڵدەبڕێـت ٣-پـەل‌و پـۆی درەخـت

٤-كەنـــاری/ ئەمــلاولای هەمـــوو شـــتێك
٥-لای مێزەرو سەروبەســـت كە بەســـەر شاندا شۆڕدەبێتەوە.
٢-(عَـــذِبَ- المـــاءُ. عَذَباً): ئاوەكـــە قەوزەی سەركەوت.
(عَذِب): ئاوی قەوزە سەركەوتوو.
(أَعْذَبَ- الماءَ): ئاوەكەی لە قەوزەی ســـەری و پیسی پاككردەوە.
(ألعَذَب) (مص) الواحِـــدَةُ (عَذَبَة): ڕیپۆقی چاو.
(ألعَذَبة (ج) عَذَبات): ڕیپۆقی چاو.
(ألعَذْبَةُ والعَذِبَة): قەوزەی سەرئاو.
٤-(عَـــذُبَ واعْـــذَوْذَبَ الشَـــرابُ. عُذوبَـــة): شەربەتەكە شیرین و خۆشبوو.
(أَعْذَبَ): ئاوی خۆشی دەستكەوت خواردەوە.
(-القَومُ): ئاوەكەیان خۆشبوو.
(-اللهُ الماءَ): خودا ئاوەكەی خۆشكرد.
(إسْـــتَعْذَبَ): داوای ئاوی خۆشیكرد یان ئاوی خۆشی خواردەوە.
(«خَرَج يَسْـــتَعْذِبُ المـــاءَ»): بۆ ئاوی خۆش و شیرین گەڕا.
(-الشَـــيءَ): شتەكەی خۆش هاتەبەردەم/ لای خۆشبوو.
(العَذْب): خواردن و خواردنەوەی خۆش.
(ماءٌ عَذبٌ): ئاوێكی خۆش و شیرین.
٥-(العاذِب (ج) عُذُوب والعَذُوب): كەســـێكە كە پەردەو پەردەوان لە نێوان ئەوو ئاسماندا نییە.

عـــذج: (عَـــذَجَ- المـــاءَ. عَذْجـــاً): ئاوەكەی خواردەوە/ نۆشكرد.
(-فُلاناً): جنێوی پێدا.
(ألمِعْذَج): ١-دڵپیس ٢- بەدرەوشـــت/ بەدخوو ٣-بەتەشەرو توانج.

عـــذر: ١-(عَـــذَرَ- هُ أو علـــى أو في ماصَنَع. عُذْراً وعُـــذُراً وعُذْرى ومَعْـــذُرَةً ومَعْذِرَةً): گوناهبارییەكـــەی یـــان سەرزەنشـــتیەكەی لەســـەر لابردو بەخشـــی/ عوزرخوارییەكەی لێوەرگرت و بەخشی.
(عَذَّرَ): بیانووەكەی لێوەرنەگرت و نەیبەخشی/ پۆزشـــەكەی لێوەرنەگرت تا بیانووی ڕاســـتی نەهێنا.
(-هُ): زۆر بە خۆیدا چووەوەو پۆزشـــی زۆری بۆ كرد/ عوزرخوایی زۆری هێنایەوە.
(عاذَرَ. مُعاذَرَةً): بیانووی بەدەســـتەوە نەداو پۆزشی بۆ نەهاتەوە.
(أَعْـــذَرَ-هُ في أو على ماصَنَعَ): لێیخۆشـــبوو لەوەی یان لەسەر ئەوەی كردبووی.
(-الرَجُـــلُ): پۆزشـــی هێنایـــەوە/ بیانـــوو و عوزرخوایی هێنایەوە.
(-مِن نَفْسِهِ): بیانوویەكی هێنایەوە كە پێی ببیەخشن.
(أَعْذَرَ): بەدادو ئینسافبوو.

(«أَعْــذَرَ مَن اَنْــذَرَ»): هەر كەســێك ورياى كرديتــەوەو بــۆ شــتێك ئاگاداريكرديت ئيتر گلەيى لەسەر ئەو نييە.

(تَعَــذَّرَ- الرَجُــلُ): داكۆكــى لەخۆيكــرد/ بەرگريى لەخۆيكرد.

(-فُلانٌ مِنَ الذَّنــب): خۆى بە بێگوناه داناو زانى/ فيسار لە گوناهەكە خۆى بێبەرى كرد.

(إعْتَذَرَ عَن ومِن فِعْلِهِ): بەرگريى لەخۆيكردو بيانووى پاكيى خۆيشى پيشاندا.

(-عَن فُلان): پۆزشــى بۆ فيســار هێنايەوەو داوايكرد ببەخشرێت.

(-الرَجُلُ): پياوەكە بيانووى هەبوو بەرگرى لەخۆيكرد.

(-إليهِ): پۆزشى بۆ هێنايەوە.

(إسْــتَعذَرَ- إليــهِ): پۆزشــى بــۆ هێنايەوەو بيانووى پيشاندا.

(ألعُذر (ج) أعذار): بيانوو كە داواى بەخشينى پێبكرێت.

(ألعِذْرَةُ (ج) عِــذَر والعُذْرى): بيانويەك كە پۆزشى پێبهێنرێتەوە.

(ألعَذيــر (ج) عُــذُر (م) عَذيــرَة): بيانوو هێنەرەوەو خاوەن پۆزش.

(العاذِر): پۆزشهێنەرەوە.

(ألمَعْــذَرَة والمَعْــذُرَة والمَعْــذِرَة (ج) مَعــاذِر والمِعْــذار (ج) مَعاذير): بيانوو پاســاوێك كە پۆزشتى پێ بكەيت.

٢-(عَذَرَ- الفَــرَسَ بالعِذارِ عَــذْراً وعُذْراً): سەركەلەى ئەسپەكەيبەست.

(عَذَّرَ- الغُــلامُ): مێردمنداڵەكە گەندەمووى ريشى لاى گوێيەوە لێروا.

(أعْذَرَ- الفرَسَ): ســەركەلەى لە ئەســپەكە بەستو لێيتوندكرد.

(ألعــاذور (ج) عَواذير): نيشــانەيەكە وەك هێڵ.

(ألعِذار (ج) عُذُر): ١-ئــەوەى لە لغاوەكەيەو بەلاى رووى ئەسپەكەدا دێتە خوارێ ٢-ريشى لاجانگ كە بەرامبەر بە گوێيە ٣-ئەو تووكەى لەلاجانگدا دەروێت ٤-رووەمەت ٥-شەرم/ شكۆ.

(«خَلَعَ عِذارَهُ»): شەرمو شكۆى فرێدا.

(«هــوَ خَليعُ العِــذار»): ئەو لــە جڵەو بەر بووە/ ئابروو تكاوە دواى ئارەزووو كەوتووەو وەك ولاخى بێجڵــەوى لێهاتووەو گوێ ناداتە هيچ.

(«لَوى عِذارَهُ عَنهُ»): لێى ياخى بوو.

(ألعِذارُ- مِنَ النَّصل): هەردوو دەمى ســەرى نێزەكە.

(ألعُــذرَةُ): ١-شــتێكە/ نيشــانەيەكە بــە ناوچەوانى ئەســپەوە هەڵدەواسرێت كاتێ بۆ پێشــبڕكێى غاركردن دەبرێــت/ چاوەزارێكە ٢-چەپكەموويەكــى ناوچــەوان/ پەرچــەم ٣-تووكى سەرشانى چارەوێ ٤-ناوچەوانى ئەسپ.

٣-(عَــذَرَ- الصَبيَّ العاذُورُ عَــذْراً وعُذُوراً):

منداڵەکە تووشــی هەڵاوســانی ئاڵــوو بوو/ قورگی هاتەوەیەك.
(عُذِرَ- الصَبيُّ): تووشی ئاڵوو بوو.
(أَعْذَرَ- هُ في ظَهرِهِ): بە پشتیدا کێشاو ئازاری پێگەیاند.
(«ضَرَبَــهُ حَتى اَعْذَرَ مَتنَهُ»): هێندەی لێدا تا دڵی ئاویخواردەوە.
(-بِــفُــلانٍ): جـێـبرینـێـکی لـە لـەشـیـدا بەجێهێشت.
(«ضُرِبَ فُلانٌ فَأُعْذِرَ): لە قیساریان هێندە دا نزیکی مردنیان خستەوە.
(ألعاذِر) (فا): شوێنبرین.
(ألعــاذور (ج) عَواذیر والعُــذْرَة (ج) عُذَر) (طب): ئاڵووکەوتن/ هەڵاوسانی ئاڵوو.
(ألعَذیرَة): جێبرین.
٤-(عَذَرَ وأَعْــذَرَ- الغُلامَ عَــذْراً): کوڕەکەی خەتەنە کرد.
(ألعِذار): خواردن کە بۆ خەتەنەسووران یان خانەسازیی دەکرێت.
(ألعُذرَةُ (ج) عُذَر): پێستی چووکی منداڵ.
(ألإعــذار) (مــص): خواردنێکــە کــە بــە بۆنەیەکی خۆشەوە دەکرێت.
(ألعَذیرَة): خواردنێکە بۆ هاوڕێو کەســوکار دەکرێت بە بۆنەی دەســکەوتو قازانجێکەوە دەکرێت.
٥-(عَــذَرَ. عَذْراً وعُــذراً): گوناه و خەوشو کەموکووری زۆر بوو.
(أعْذَرَ): گوناهی زۆر بوو.
٦-(عَذَّرَ- فِي الأَمرِ): پشــتی لە کارەکە ســارد بووەوەو سستی تێدا کرد کە لەوە پێش کاری باش تێدا دەکرد.
(أعْذَرَ- في الأمــرِ): کەموکوڕیی لە کارەکەدا کرد، بــەڵام زۆر نا ئــەو وایدەزانــی کە زۆر کەموکوورە.
(تَعَذَّرَ- عَنِ الأمرِ): لە کارەکەدا دواکەوت.
(-عَلَيهِ الأمرُ): ١-کارەکەی بۆ گرانبوو و بۆی راست نەبووەوە ٢-نەیکردو نەیبردەسەر.
(ألعُــذْرَةُ): ١-پــەردەی کچێنیــی کچ ٢-حەز/ دڵداریی.
(ألعُــذري): ئــەوەی کــە بە بێ دەســکاریو بەکارهێنان وەك خۆی مابێتەوە.
(ألعَــذراء (ج) ألعُــذاری والعَــذْراوات): ١-کوننەکراو بە کچێنی ماوە ٢-دوڕی کوننەکراو ٣-نازناوی حەزرەتی مریەم.
٧-(عَذَّرَ- الــدارَ): خانووەکــەی تەختکردو شوێنەواری بری.
(تَعــذَّرَ واعْتَذَرَ- الرســمُ): شــوێنەوارەکە لەبەرچاو نەماو سڕرایەوە.
٨-(أَعْــذَرَ-تِ الــدّارُ): خانووەکــە پــڕ لــە پیساییبوو.
(تَعذَّرَ- الشيءُ): گواویبوو.
(ألعاذِرَةُ): پیسایی/ گوو.

(اَلعَذِرَةُ (ج) عَذِرات): ١-پیسـایی/ گوو ٢-زۆر پیسیی ناو خواردن ٣-حەوشەی خانوو.

٩-(تَعَذَّرَ): هەڵات.

١٠-(اَلعُذْر (ج) أَعْذار): زاڵبوون/ سەرکەوتن.

(«لِمَن العُذْرُ»): سەرکەوتن بۆ کێیە؟

(العُذرَةُ (ج) عُذَر): ئەستێرەیەکە کاتێك کە هەڵدێت گەرما تاودەستێنێت.

(اَلعَذیـر (ج) عُذُر (م) عَذیرَة): پشـتگیر/ پاڵپشت/ سەرخەر.

عـنف: ١-(عَـنَفَ- مِـن الطَّعـامِ. عَنْفاً): کەمەکە خواردنێکی خوارد.

(تَعَـنَّفَ الطَّعـامَ): خواردنەکـەی خـوارد/ چەشەیکرد.

(«ماذُقْتُ عَنْفاً ولا عَنُوفاً ولا عُنافاً»): هیچ شتێکم نەچەشتووە.

٢-(اَلعُذافِرَة (ج) عَذافِرَة): حوشـتری توندو قایم.

(اَلعَذَوْفَر): حوشتری توندو قایم.

عـذق: ١-(عَـذَقَ- فُلانـاً بِشَـرٍّ. عَذقـاً): خراپیکرد/ خراپەی دایە پاڵ فیسـارو مۆری خراپەی پێوەنا.

(-ه إِلى كَذا): خراپەی دایە پاڵ ئەوە/ بردیەوە سەر ئەوە.

(عَذَقَ وأَعْذَقَ- الشـاةَ): مەڕەکەی بە خوری یان شتێکیتر نیشانە کرد.

(إِعْتَذَقَ- هُ بِكَذا): بەوە تایبەتمەندیکرد.

(اَلعَذْقَةُ والعِذْقَةُ): نیشـانەیە بە خوری یان شتیتر مەڕی پێ نیشانە دەکرێت کە لە ڕەنگی مەڕەکە نەبێت.

٢-(عَذَقَ وعَذَّقَ- النَخْلَةَ. عَذقاً): دارخورماکەی هەڵپاچی.

(إِعْتَـذَقَ): دوو لکی مێژەرەکەی لە پشـتەوە بەردایەوە.

(اَلعِذْق): ١-هەمو لقێك کە پەلیتری لێبێتەوە ٢-سەرومریی/ نگینی.

(«في بني فُلان عِذقٌ كَهْلٌ»): لە فیسـار بەرە ئیختیارێکی سەرومری تێدایە (لە بنچینەدا لە بەوێڵیەوە هاتووە کە پێبگات بۆ سەرومریی، کۆن بە نموونە کراوەو هێنراوەتەوە.

(اَلعِذْق (ج) عُذوق وأَعذاق) (ن): گوڵەهێشوو وەك گوڵـی هەرمـێ کە لە ڕێکـی یەکن و لە دانگێکدان.

(اَلعاذِق (فا) (ج) عاذِقون وعُذّاق): هەڵپاچی پەلـی دارخورمـا/ پەلەکانـی دەبڕێـتو سەرپەرشتیدەکاتو ڕێکیدەکاتو بەتەنگیەوە دێت/ خورماوان.

٤-(اَلعَذِق): زیرەکی بە دەمو زمان/ قسەزان.

(طیبٌ عِذقٌ): بۆنێکی خۆش.

عـذل: ١-(عَـذَلَ وعَـذَّلَ-هُ عَـذْلاً): سەرزەنشتیکرد پێداهەڵشاخا/ لۆمەیکرد.

(عـاذِل (ج) عُذَّل وعُـذّال وعَذَلَة وعاذِلون (م) عاذِلَة (ج) عَواذِل وعاذِلات): لوومەکار/

سەرزەنشتکەر/ پێداهەڵشاخێن.
(تَعذَّل وإعْتَذَلَ):١-سەرزەنشتی خۆیکرد/ لۆمەی خۆیکرد ٢-قایلبوو بە سەرزەنشتکردنەکەی.
(تَعاذَلَ- القَومُ): سەرزەنشتی یەکتریانکرد.
(ألعَـذْل والعَـذَل والتَعْذال): سەرزەنشـت/ لۆمە.
(ألعُذَلَةُ والعَـذَّال والعَذُول): کەسـێکە زۆر سەرزەنشـت بـکات/ لۆمەی ئـەمو ئەو زۆر بکات.
(ألعَذّالـةُ): ١-مێی وشـەی (ألعَـذّال) ٢-فرە لۆمەکەر/ زۆر سەرزەنشتکەر.
(ألمُعَذَّل) (مفع): سەرزەنشـتکراوێك لەسـەر ئـەوەی کە زۆر بەخشـندە بێتو شـتی لەو بابەتە.
٢-(إعْتَذَلَ- اليَومُ): ئەمرۆ گەرما تاویسەند.
(أيـامٌ عُـذُلٌ أو مُعْتَـذِلاتٌ): ڕۆژانێکی زۆر گەرم.
٣-(إعْتَذَلَ- الرَجُلُ على الشيءِ): خواستیاری ئەو شتە بوو.
٤-(ألعَذَّالَة): بن/ قنگ.
٥-(عَذْلَجَ السَقاءَ): کوندەکەی پڕکرد.
(-الوَلَدَ وغَيرَهُ): خواردنی باشی بە کوڕەکەو هیتریشی دا.
(عَيشٌ عِذْلاج): ژیانێکی نەرمی تێروتەسەل/ خۆشگوزەرانیی.
(ألعُذْلوج): منداڵێ: خواردنی باشی بدرێتێ.
(ألمَعَذلَـج (م) مُعَذْلِجَـة): تێکسـمڕاوی لەشجوان.
عذم: (عَـذَمَ- الفَرَسُ. عَذمـاً): چارەوێکە گازیگرت.
(عَذِمَ-هُ عَذْماً): جنێوی پێدا.
(ألعَذُوم (ج) عُذُم): زۆرگازگر.
٢-(عَـذَمَ- الرَجُـلُ. عَذْمـاً): بەرگریـی لەخۆیکرد.
(أعْـذَمَ- هُ عَـن نَفسِـهِ): لە خـۆی (دوور خستەوە/ لادا).
٣-(عَذَمَ- هُ عَذماً): سەرزەنشتیکرد.
(ألـعَـذُوم) (ج) عُـذُم والـعَـذَّام): زۆر سەرزەنشتکەر.
(ألعَذيمـة (ج) عَذائِـم): لۆمەکـردن/ سەرزەنشتکردن.
٤-(العَذيمَـة (ج) عَذائِـم): دارخورمایـەك بەرمەکەی بێناوکە.
عـذا: (عَـذا يَعْذُو وعَـذِيَ يَعْـذى و عَذُوَ و مَعـذو- المـكانُ وعَذْواً وعَـذىً وعَذاوَةً):
١-شـوێنەکە خۆشـبوو ٢-لە ئاوو هەڵمو بۆق دوور بوو/ ئاوو هەوای خۆشبوو.
إسْـتَعذى- المَكانَ: شـوێنەکەی لا خۆشبوو/ پەسندیکرد/ بەدڵیبوو.
(أرضٌ عاذِيَـةٌ وعَذِيَـةٌ وعَذِيَّـةٌ وعَـذاة): خاکێکی/ زەوییەکی خۆش و باش.
(ألعِذْيُ (ج) أعذا): کشتی دێمی/ کشتوکاڵێك

کە بە باران بکرێت.
عرّ: ١-(عَرَّ وعُرَّ- الجَمَلَ عَرّاً): حوشترەکە گەڕ بوو.
(عَرٌّ وأعَرُّ وعارٌّ ومَعرُورٌ): حوشتری گەڕ.
(عَرَّ-ە عَرّاً): پێیناخۆشبوو/ پێیخراپبوو.
(-ە بِشَرٍّ): تووشی خراپەو بەدیکرد (لە بنچینەدا لە گەڕییەوە هاتووە واتا گرفتاری بەدیی خۆیکرد).
(عارَّ-ە مُعارَّةً وعِراراً): شەڕی لەگەڵدا کردو ئازاریدا.
(إسْتَعَرَّهُم الجَرِبُ): گەڕییان لەناودا بڵاوبووەوە.
(العارُور والعارُورَة): ١-پیاوی چەپەڵی چارەڕەش ٢-ئەوەی کە دەچێتە ناو خوێشکەلەوەو خراپی دەباتە ناویانەوەو تێیاندەسوێت «هەڵدەسوێت».
(العَرّ): ١-گەڕ، تووشی گەڕیی بووە ٢-گەڕیی ٣-خەوش/ لەکە/ ناتەواویی ٤-خراپە/ بەدیی.
(العُرّ): گەڕیی.
(العَرَّةُ): ١-جارێك تووشبوونی گەڕیی ٢-خەسڵەتی ناشیرین ٣-خەوش ٤-سەختیی جەنگ.
(العُرَّةُ): ١-گەڕیی ٢-گرفتارییەکی ناخۆش ٣-تاوان.
(العُرار): گوناه و تاوانو سووچ.
(العَرار): سزاو تۆڵە سەندن.
(العَرارَة): ١-بەدڕەوشتیی ٢-تەنگیی و سەختیی.

(العَرَ والعُرُور): گەڕیی.
(الأعَرّ (م) عَرّاء (ج) عُرّ): گەڕترینی ناو خەڵك و هی حوشترەکان.
(المَعَرَّة): ١-بەدیی ٢-گوناه ٣-ئەشکەنجە/ ئازار ٤-تاوان ٥-ئەنگیی/ ئابرووچوون/ شوورەیی ٦-کاری زشت/ ناشیرین.
(المَعَرَّة) (فك): ٥-کۆهەسارەیەکە پڕ لە ئەستێرە (بۆیە وا ناونراوە بە گەڕیی لەشی مرۆڤیان چواندووە ٧-توندوتیژیی و سەختیی جەنگ ٨-جنێو ٩-سزا.
(مَعَرَّةُ الجَيش): سوپا بەسەر کشتی لایەکدا بدات بێپرس و پێزانینی خاوەنی بیخۆن.
٢-(عَرَّ-ە. عَرّاً): بۆ باربوو هاتە لای بێنەوەی بە سواڵ هاتبێت.
(إعْتَرَّ-ە واعْتَرَّ- بِە. إعْتِراراً): بۆ چاکەو یارمەتی هاتە لای بێسواڵ.
(المُعْتَر): ١-کەسێکە چاکەو یارمەتی بخوازێت/ دەرۆزەکەر نەبێت/ سواڵکەر نەبێت ٢-دەستکورت/ هەژار/ نەبوو.
٣-(عَرَّ- الأرضَ. عَرّاً): زەویەکەی پەینرێژکرد.
(عَرَّرَ- الأرضَ): زەویەکەی پەینرێژ کرد.
(أعَرَّ-تِ الدارُ): خانووەکە پڕ لە خۆڵو خاشاکبوو.
(العُرّ): ریقنەی پەلەوەر/ باڵندە.
(العُرَّةُ): ١-خۆڵو خاشاك ٢-ریقنەی باڵندە ٣-پشقل.

٤-(عَرَّ وعــارَّ- الظَليمُ عِراراً ومُعارَّةً): نێره وشترمرخەکە زریکاندی.
٥-(تَعــارَّ): بــە دەم قســەکردنەوە لــە خەو راپەری.
(اَلعُرَّةُ): تووشبوونی شێتیی.
(«بِهِ عُرَّة»): شێتیی لەگەڵدایە.
٦-(العارُور والعارُورَة): حوشتری بێکۆپارە.
(اَلعَرّ): کۆرپەی زوو لەشیر براوە.
(اَلعَرَّةُ): مێی وشەی (العَرّ).
(اَلعُرّ): مێردمنداڵ.
(اَلعُــرَّةُ): ١-کەنیــزەك ٢-چەوریــی/ بــەزی کۆپارە.
(اَلعَرَّاء): کەنیزەك.
(اَلعَرار): (الواحِدَةُ. عَــرارَة): ١-بەهاراتێکی نەرمــی زەردی بۆنخــۆش، زەردەچــەوە ٢-(ن)نێرگزی دەشتەکی.
(أَلــعَــرارَة) (ح): ١-کوڵلــە ٢-پایەبڵندیی ٣-دڵناسوودەیی.
(اَلعَرير): کەســێکی نەناس یان ئاخاوتنێکی نەبیستراو/ بەرگوێ نەکەوتوو.
(اَلمَعَرَّة): ١-ڕەنگگۆڕینی ڕوو کاتی تووڕەبوون ٢-شار یان وڵات.
٧-(عَرْعَــرَ- القارورَة) (ضد):١-ســوراحییە ملدارەکەی سەرنایەوە ٢-دەمی سوراحییەکەی (هەڵپچڕی/ کردەوە).
(-العَينَ): چاوەکەی دەرهێنا.

(اَلعَرْعَرَةُ (ج) عَراعِر): ســەری ســوراحیی ملباریك/ تەپەدۆری سەری.
(اَلعُرْعُــرَةُ (ج) عَراعِر): تەپەدۆری ســەری سوراحی.
(عُرعُرَةُ الجَبَلِ): پۆپەی شاخ.
٨-(اَلعُرْعُر): بەدخوویی بەدرەفتاریی.
(«رَكِبَ عُرْعُرَهُ»): بەدرەوشــتبوو/ بەدخوو بوو.
(اَلعَرْعَــر) (ن): عەرعــەر/ هەوریــس/ هەڤریسك/ هاڤریست درەختێکە لە کۆمەڵەی ســەرو (گەڵاکــەی وەك برژانــگ وایــە). لە ئەوروپــا، بەرەکەی بــۆ خۆشــکردنی بۆنی خواردنەوە/ مەی بەکاردێت (عەرعەری کادی) واتا درکاوی لە خۆرهەڵاتدا بلاوە شلە ڕۆنێکی ڕەش لە دارەکەی دەگیرێت کە بۆ چارەکردنی نەخۆشییە پێستیەکان بەکاردێت.
(اَلعُراعِر (ج) عَراعِر):١-خانەدان/ وەجاخزادە ٢-گەورە.
(-مِنَ الإبِلِ): حوشتری قەڵەو.
عرب: ١-(عَرَبَ الطَعامَ عَرْباً): خواردنەکەی خوارد.
٢-(عَرُبَ: عُروبَةً وعُروبِيَّةً وعَرابَةً و عَرَباً وعُرُوباً):١-بە عەرەبیەکی ناتەواو دواو گوێی نەدایە دەنگەکان ٢-عەرەبییەکی ڕەوانبوو.
(عَــرِبَ- الرَجُــلُ عَرَبــاً): زمانــی ڕەوانبــوو ڕاستبووەوە کە لەوەپێش زمانەکە ناتەواو بوو.

(عَرَّبَ- المَنطِقَ): گوفتەکەی ئاواز ڕەوانکرد/ بێهەڵە کرد.

(-الکِتابَ ونَحْوَهُ): پەڕاوەکەی لە زمانێکیترەوە (کرد بە عەرەبی/ وەریگێڕایە سەر زمانی عەرەبی).

(-عَنهُ لِسانُهُ): زمانی لەوەدا پاراوو ڕەوانبوو.

(-عَن صاحِبِهِ): لەسەر دۆستەکەی/ هاورێکەیکردەوەو لەبری ئەو قسەیکردو بەڵگەی هێنایەوە.

(-بِحُجَّتِهِ): بەڵگەو بیانووی خۆی ڕەوانو باش دەربڕی.

(-الرَجُلُ): چارەوێیەکی ڕەسەنی عەرەبیی پەیداکرد.

(-الإسمَ والأعْجَميّ): ناوە بێگانەکەی کرد بە ناوی عەرەبی.

(أعْرَبَ کَلامَهُ): ئاخاوتنەکەی باشو ڕەوان دەربڕی بەپێی ڕێزمان دەریبڕی.

(-الشيءَ): شتەکەی دەرخست/ ڕوونکردەوە.

(-عَن حاجتِهِ): بە ڕەوانیی پێداویستیەکەی دەربڕیو وت.

(-بالکَلام): قسەکەی باشو ڕەوان دەربڕی.

(-بِحُجَّتِهِ): ڕەوانو باش بەڵگەکەی دەربڕیو دەرخست.

(-الکَلِمَةَ): وشەکەی باش شیتەڵکردو دەریخست.

(-الفَرَسَ العَرَبيَّ): بە حیلەی چارەوێکەدا زانی کە چارەوێی عەرەبیی ڕەسەنە یان نا.

(-الإسمَ الأعْجَميَّ): ناوە بێگانەکەی کرد بە عەرەبی.

(-الرَجُلُ): ١-پیاوەکە بوو بە خاوەنی ئەسپێکی عەرەبیی یان حوشترێکی عەرەبی ٢-لە قسەدا بە پێی ڕێزمان دواو هەڵەی نەکرد.

(تَعَرَّبَ): ١-وەك عەرەب ڕەفتارو ڕەوشتیکرد وەك عەرەبی لێهات ٢-لە بیاباندا نیشتەنیبوو بوو بە عەرەبی کۆچەری.

(إسْتَعْرَبَ): خۆی کرد بە عەرەب گەرچی عەرەبیش نەبوو.

(ألعُرْب والعَرَب (ج) أعْرُب وعُرُوب): عەرەب نەتەوەیەکن نیشتمانەکەیان نیوەدورگەی خۆرهەڵاتی دەریای سوورە ئەوانەی بە ڕەگەز عەرەبن پێچەوانەی عەجەمن کە عەرەب نین وەك تورکو فارس.. هتد.

(ألعَرَبُ العَرْباء والعارِبَة والعَرِبَة والعَرَبيَّة): عەرەبی (قوح): ڕەسەن، پوخت، پاڵاوتەو بە ڕەگەز عەرەب وشەی (العَرَب) مێیە بە لێکدانەوەی ئەوەی کە تایەفەیەکن.

(ألعَرَبُ المُتَعَرِّبَة والمُسْتَعْرِبَة): ئەو عەرەبانەن کە بە ڕەگەز عەرەب نەبوونو خۆیانکردووە بە عەرەب.

(عَرَبٌ ذَربٌ): عەرەبییەکی ڕەوان.

(خَیلٌ أو إبِلٌ عِرابٌ وأعْرُبٌ): ئەسپ یان

(-إِلى فُلانٍ): پەنایبردە بەر فیسار/ خۆیدایە پاڵی.
(أَعْصَمَ- مِنَ الشَرِّ): خۆی لە خراپەو بەدیی پەناگرتو پاراست.
(-بِهِ): ١-گرتـیو بەرینەدا/ پێوەی بەند بوو ٢-پەنای بۆ بردو خۆیدایە پاڵی.
(-بالفَرَسِ): دەسـتی بە یاڵـی چارمۆیکەوە گرت.
(-القِربَـةَ): پەتـی پێهەڵگرتنی لە کوندەکە بەست.
(إِعْتَصَـمَ- بِهِ): ١-خۆیدایـە پاڵیو پەنای بۆ برد ٢-چنگی لێگیرکردو گرتی.
(-باللهِ): پەنایبردە بەر خودا کە تووشی گوناه و خراپە نەبێت.
(-باللهِ مِن الشَـّرِ والمكـروه): پەنایبردە بەر خودا کە تووشـی خراپەو ناهەمواریی‌و وەی نەبێت.
(إِنْعَصَـمَ): پەنـادراو/ پارێـزراو/ بەهاناوە هاتوو.
(«عَصَمْتُهُ فَانعَصَمَ»): پەنامداو پارێزرا.
(إِسْـتَعْصَمَ): بۆ ئەوە گەڕاو داوای ئەومیکرد کە پەنایبداتو بیپارێزێت.
(-بِهِ): پەنای بۆ بردو بەرینەدا.
(-مِـنَ الشَـرِّ والمكروه): لە ترسـی خراپەو بەدیی‌و وەی پەنایبرد.
(العاصِمَـة (ج) عَواصِم): پایتەخت. بنکەی ولات.
(أَلعِصـام (ج) أَعْصِمَـة وعُصُـم وعِصام): پەیمان (خوازمیە).
(-مِـنَ القِربَـة): پەتێکـە بـە کونـدەوە دەبەسترێت پێی هەڵدەگیرێت.
(أَلعِصام- مِن الوعاء): دەسـکی قاپ کە پێی هەڵدەواسرێت.
(أَلعِصامي): عیسامی. ئەوەی سەر بە عیسامە یان وەك عیسامە.
(عصام): پەردەداری نعمان بووە.
(عِصامي): کەسێکە خۆی خۆی پێبگەیەنێت‌و گەورە بـکات نەك بـە هـۆی باووباپیریەوە گەورە بێت.
(«كُـن عِصامِيّـاً لاعِظامِيّـاً»): خۆت خۆت گـەورەو خاوەنشـکۆ بکـە نـەك بـە هۆی باووباپیرتەوە کە بوون بە ئێسقان.
(أَلعِصْمَة): ١-نەهێشتن/ ڕێنەدان. توانای خۆ لە گوناەو خراپە پاراستن.
(«صاحِبَـةُ العِصْمَـة»): تازەگەرییـەکان بـە ئافرەتـی گـەورەی پایـە بڵنـد دەڵێن/ فیسارەخان.
(أَلعِصْمَـة (ج) عِصَـم وأَعْصَـم وعِصَمَة و (جج) أَعْصام): گەردانە.
(أَلعَصَمَةُ): ١-گەردانە.
(أَعصام الكِلاب): تەوقی ملی سەگان.
(أَلمِعْصَم) (ج) (ع ا): مەچەك (شوێنی بازن).

(أَحاطَ بِهِ إحاطة السوار بالمعصَم): گەمارۆیدا وەك چۆن بازن لە مەچەك دەکرێت.

(اَلْمُعْتَصَم): ١-پەنا/ پەناگا ٢-سپێر/ سەنگەر/ شـوێنی خۆ بۆسـەدانو شـاردنەوە لە کاتی شەردا بۆ هێرشبردن یان بەرگریی.

٣-(عَصِـمَ- الظَبي): ئاسـکەکە دەسـتێکی یـان هەردووکی سـپێتی تێدابـوو ئەوتیری دەستەکەی یان سوور یان رەشبوو.

(أَعْصَـم (م) عَصمـاء (ج) عُصْم): ئاسـکی دەست پەڵەی سپیدار.

(اَلعَصَمَةُ): ١-گەردانـە/ گەردنبەند ٢-تەوقی ملی سەگ.

٤-(اَلعُصُـم والعُصُـم): ١-پاشـماوەی هەموو شـتێك ٢-شوێنکاری هەموو شـتێك وەك هی رەنگ یان قەتران یان شتیتر.

(اَلعِصام (ج) أَعْصِمَة وعُصْم وعِصام): ١-کلی چاو ٢-سەری نوکی کلك.

(اَلعَصُـوم والعَیصُـوم): (بـۆ نێـرو مـێ) زۆرخۆر.

(اَلعَصیـم): ١-ئـارەق/ خوەی ٢-پاشـماوەی هەموو شـتێك ٣-شوێنکاری هەموو شتێك هی رەنگو خەنەو قەترانو شتی لەو بابەتانە.

عَصـا: ١-(عَصا- الرَجُـلَ. عَصْواً): بەدار لە پیاوەکەیدا.

(-القَـومَ): بۆ چاکە یان خراپە خوێشـگەلی کۆکردەوە.

(عَصِيَ. عَصاً): دارەکەی بە دەستەوە گرت.

(-بالسَیفِ): وەك چۆن بەدار لێدەدرێت وەها بە شمشێر لێیدا.

(عَصَّى- فُلاناً. اَلعَصا تَعْصِیَةً): داردەستەکەی دایە دەست.

(عاصـى-هُ مُعاصاةً. فَعَصاهُ): شـەرەداریان کردو بەسەریدا زاڵبوو.

(أَعْصى- الكَرْمُ إعصـاءً): مێوەکە پەلەکانی دەرچوو و هاویشت بەرینەگرت.

(إعتَصـى- الشـيءَ): شـتەکەی کـرد بـە داردەست.

(-عَلَیهِ): خۆی بەسەردا دا.

(-بالسَّیفِ): بە شمشێر لێیدا وەك چۆن بەدار لێدەدرێت.

(العَصـا) (مص): ١-کۆبوونـەوەو یەکگرتنو پێکەوە راهاتن ٢-کۆمەڵ.

(«شَـقَّ العَصـا»): لەگـەڵ کۆمەڵەکـەی ناکۆکبوو.

(اَلعَصا (ج) عُصِيّ وعِصِيّ وأَعْصى وأَعْصاء): (مێیە) داردەست/ چێو ئەوەی کە پێیدەڕۆنو خۆیانی بەسەردا دەدەن/ گاڵۆك/ گۆچان.

(عَصَـوان): دوو داردەسـت (دەڵێـن بۆیە وا ناونراوە چونکە پەنجەکانی دەسـت لەسەری کۆدەبنەوە لـە (عَصَوتُ القَـومَ اذا جَمعهُم علی الخیر أو الشَّر): خوێشگەلم لەسەر چاکە یان خراپە کۆکردەوە.

(«إنْشَقَّت عَصا القَومِ»): خوێشگەل ناکۆکییان تێکەوت.
(«قَرَعَ لَهُ العَصا»): وریایکردەوە.
(«قَشَرَ لَهُ العَصا»): ئەوەی لە دڵیدا بوو بۆی دەربڕی.
(«قَرَعَهُ بَعَصا المَلاَمَةِ»): دایە بەر تەشەرو تیرو توانج.
(«أَلقى المُسافِرُ العَصا»): گوزارکارەکە گەیشتەجێ.
(«أَلقى عَصا التَرحالِ»): لە شوێنێکدا باریخست هەواری هەڵداو دانیشت.
(«أَلناسُ عبيدُ العصا»): خەڵك کۆیلەی دارن واتا لەوانە دەترسن کە ئازاریان پێدەگەیەنن (ئێمە دەڵێین شەق دەزانێت قۆناغ لە کوێیە).
(فلان ليّن العَصا): فیسار زمانشیرینەو دەزانێت چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکدا بکات.
(«صُلبُ العَصا»): رەفتار رەقە.
(أَلعَصا): ئێسقانی قاچ کە بە جێو چوێنراوە.
(أَلعُصَيَّةُ): داروچکە/ جێوچکە/ چیلکە.
٢-(عَصا- الجَرحَ. عَصْواً): برینەکەی بەست.
٣-(العصا): زمان.
عصا: ١-(عَصى- سَيِّدَهُ عَصْياً ومَعْصِيَةً): سەرپێچی لە گەورەو ئاغاکەیکرد/ یاخیبوو نافەرمانییکردو کەللەرەقیی لەگەڵدا کرد.
(عاصٍ (ج) عُصَاةٌ وعاصُون): یاخیو نافەرمان/ چەتە.
(-العِرقُ): خوێنی بەربووی دەمارەکە نەوەستایەوە.
(عاصى-هُ مُعاصاةً): لێی یاخیبوو.
(تَعَصى- عليه تَعَصِّياً): لێی یاخیبوو.
(-الأَمرُ): کارەکە نائاسانبوو/ لەدەست دەرچوو/ پێچی تێکەوت.
(إعتصى-تِ النَواةُ إعتِصاءً): ناوکی رووەکەکە سەخت بوو.
(إسْتَعصى- سَيِّدَهُ): لە ئاغاکەی هەڵگەڕایەوە/ سەرپێچیکرد/ یاخیبوو.
(-الشيءُ عَلَيهِ): شتەکەی لێ چووە بەست/ لێگرانبوو وەکو لێی یاخیبووبێت.
(ألعِصْيان): یاخیبوون/ لاساریی/ ملنەدان/ نافەرمانیی/ بەلەسەبوون/ سەرپێچیکردن.
(أَلعَصِيّ (ج) عَصِيُّون وأَعْصِياء والعَصَّاء (ج) عَصَّاؤون = العاصي): یاخی/ نافەرمان/ بەلەسە/ سەرپێچیکەر/ ملنەدەر/ چەتە.
(أَلمَعْصِيَةُ (ج) المَعاصِي): گوناهکردن/ گوناه/ لەرەتدەرچوون/ هەڵەنگووتن/ لادان/ پێهەلەنگووتن.
٢-(عصى-الطائِرُ. عَصْياً ومَعْصِيَةً): باڵندەکە فڕی.

عــض: ١-(عَضَّ-ہُ. عَضّــاً وعضيضاً): گازی لێگرت.

(«عَضَّ بــهِ وعَضَ عَلَيهِ»): گــازی لێگرت/ دانی پێدانا/ قەپی پێداکرد.

(-ہُ الزمانُ): رۆژگار سەختیی لەگەڵدا کرد/ لەگەڵیدا خراپبوو.

(عَضَّضَ): گازی زۆری لێگرت/ بە قایم گازی لێگرت.

(عــاضَّ-تِ الــدَوابُّ. مُعاضَــةً وعِضاضاً): چوارپێکان شەرەگازیان کرد.

(أَعَضَّ-ہُ الشيءَ): گازی پێ لە شتەکە گرت.

(تَعاضَّا): هەریەکەیان گازی لەویتر گرت.

(أَلعُضّ): ١-جۆ ٢-گەنم ٣-سێپەرە ٤-پووش و پەلاش/ گیای وشك ٥-درکەزێ.

(أَلعِضّ (ج) أَعْضاض وعُضوض): ١-بەدرەوشت/ بەدخوو ٢-در ٣-مرۆڤی دەروونپیس.

(- (ج) أَعضاض): درکەزێ.

(أَلعَضّــاض): ١-ئــەوەی بــە دان دەخورێت و دەجوورێت.

(«لــم يَــذُقْ عَضاضــاً»): هیچــی بــەردان نەکەوتــووە/ هیچــی نەخــواردووە/ چێژی هیچی نەکردووە ٢-درەختی ئەستوور.

(أَلعِضاض): گەستن.

(«هو عِضــاضُ عَيــشٍ»): ئەو بە کێشــەو بــە ئارامــە لــە رەنجدانــداو لــە تەنگانەو سەغڵەتیدا.

(أَلعَضَّاض والعَضُوض): زۆر گازگر.

(أَلعَضيض) (مص): گازی توند.

٢-(عَضَّ-الشيءَ. عَضّاً وعَضيضاً): شتەکەی توند گرت و بەرینەدا/ پێوەی چەسپبوو.

(أَلعِــضّ (ج) أَعْضــاض وعُضُــوض): ١-زۆر بــە هێــزو تونــد/ پتــەو ٢-زۆرزان و زرنــگ ٣-هاوکــووف/ هاوتــا ٤-رژد/ چرووك ٥-سەرپەرشتیاری داراو هەڵسووڕێنی.

(«إنَّهُ عِضُّ مالٍ»): ئەو هەڵســووڕێنی چاکی دارایە.

(أَلعَضيض): هاوسەر/ هاوڕێ/ پێکەوەبەند.

٣-(أَعَضَّ-تِ البِئرُ): چاڵاوەکە/ بیرەکە ئاوی زۆر بوو.

(بِئرٌ عَضُوض): چاڵاوێکی فرەئاو.

٤-(العُضاض والعُضَّاض): رەقیی لووت.

عضب: ١-(عَضَبَ-ہُ عَضْباً): بری/ لەتیکرد.

(-ہُ المَــرَضُ): نەخۆشــیی گولۆڵەیکــرد/ جووڵەیبڕی.

(-ہُ عَنِ الأمرِ): لەکاریخست.

(-عَنهُ): گەڕایەوە.

(عَضِــبَ وأَعْضَبَ- الناقَــةَ ونَحوَها): گوێی مێحوشــترەکە یــان هیــتری هەڵتلیشــاند/ هەڵدڕی.

(عَضِــبَ- الكَبْــشُ ونَحْــوَہُ): بەرانەکە یان هیتری وا، گوێ هەڵتلیشاو بوو.

(عَضُبَ. عُضُوباً وعُضُوبَةً): گوێی هەڵتلیشا/

دابرا.
(عاضَبَ-هُ مُعاضَبَةً): بەری لێگرتو گێرایەوە/ پاراستی.
(إنْعَضَبَ- القَرْنُ): (قۆچەکە/ شاخەکە) قرتا.
(ألعَضْب) (مص): ١-قرتان ٢-شمشێری برەرو تیژ.
(«سَیفٌ عَضْبٌ»): شمشێری برەر.
(ألأعْضَب (م) عَضْباء (ج) عُضْب): ١-گوێ هەڵقڵیشاو ٢-شاخ/ قۆچشکاو/ قرتاو ٣-کەسێکی بێبرا ٤-کەسێکی بێپشتیوان.
(ألمَعْضُوب): ١-کەنەفتی تێکچوو/ شێت کە جووڵەی برابێت ٢-بێتواناو بێهێز.
(«إنَّهُ لَمَعْضوبُ اللِّسان): لاڵە پەتەیە قسەی بۆ ناکرێت.
٢-(عَضَبَ-هُ بِالرمحِ. عَضباً): نێزەی پێداکرد.
(-هُ بالعَصا): بەدار لێیدا/ دارکاریکرد.
٣-(عضَبَ-هُ بِلسانِهِ): جنێوی پێدا/ بەزمان شتی.
(ألعَضْب): پیاوی قسە توندو رەق.
(ألعَضّاب): ١-جنێوفرۆشت/ زمانپیس٢-قسەرەق و توندو تیژ/ رقئەستوور.
٤-(عَضْبَرَ- الكَلْبُ عَضْبَرةً): سەگەکە زۆر در بوو هەڵمەتیدا/ پەلاماریدا.
(ألعِضْبارَة): ١-بەردی دەستار یان ئاش

٢-تاوێرێکە سپیکەرەوەی جل جلەکەی بەسەردا دەدات.
عضد: ١-(عَضَدَ-هُ. عَضْداً): بە بازوویدا کێشا.
(-هُ): یارمەتیدا/ کۆمەکیکردو سەریخست/ دەستی دایە باڵی.
(عَضِدَوعُضِدَ. عَضَداً): هاواری بازوویکرد/ بازووی دەردیگرتو ژانی لێپەیدابوو.
(عَضِد (م) عَضِدَة): کەسێکە بازووی تووشی دەردو ژان بووبێت.
(عاضَدَ-هُ. مُعاضَدَةً): کۆمەکیکرد/ یاریدەیداو پشتیگرت/ سەریخست.
(«عاضِدني علی فُلانٍ»): بەسەر فیساردا سەرمبخەو پشتیوانیم بکە.
(تَعَضَّدَ-هُ): لە ئامێزیگرت.
(تَعاضَدوا): باوەشیان بەیەکداکرد/ کۆمەکی یەکتریانکردو لەسەریەکیان کردەوەو یەکتریان سەرخست.
(إعْتَضَدَ-هُ): لەئامێزیگرت.
(-بِهِ): کۆمەکی لەو وەرگرت/ پەنای بۆ ئەو بردو بەهێز بوو.
(ألعَضْد (مص) (ج) أعْضاد): پشتیوان/ یاریدەدەرو سەرخەر/ زاڵکردوو.
(ألعُضُد والعَضِد (ج) أعْضاد وأعْضُد (ع ا): ئەستووریی قۆڵ کە لە ئانیشکەوە تا سەرشانە/ بازوو ئەستوور.

(اَلعَضُد (ج) اَعْضاد واَعْضُد (ع ا): بازوو.

(«فَتَّ فِي عَضُدِهِ»): بازووی خاوکردەوە. واتا: یارو دۆستەکانی لێکردو بلاویکردنەوە.

(فُلانٌ عَضُدي): ئەو بازووی منە/ پاریەدەرو پشتیوانو جێی بڕوای منە (چونکە مرۆڤ بە بازووی بەهێزە).

(عَضُدُ واَعْضادُ کُلِّ شـــيءٍ): هەر شـــتێك کە شـــتێکیتر قایم بـکات وەك دیـواری چاڵاوو پەرژین کە لە بەردەمی گۆلدا هەڵدەسێنرێت بە تەنەکە بێت یان شتیتر.

(اَلعَضَـــد): هێـــز/ توانـــا ٢-بازوو ئەســـتوور ٣-دەردێکە دەداتە بازووی حوشتر.

٤-(عَضَدُ کُلِّ شـــيءٍ): هەر شتێك وەك دیوار بە دەوری شـــتێکدا دروستبکرێت یان تەنەکە کە بە دەوری دەمی بیردا دەچەقێنرێت.

(اَلعِضاد): ١-بازوبەند ٢-نیشانە کە بە بازووی حوشترەوە دەبێت ٤-بازن.

(اَلعِضادَة): یاوەر.

(«فُلان عِضادَةُ فُلان»): فیسار یاوەری فیسار کەســـە. هەمیشـــە لەگەڵیدایە یارمەتیدەدات لێی جیانابێتەوە.

(عِضادَتا الباب): هەردوو لاشیپانی دەرگاکە.

(اَلعَضـــادِيّ والعُضـــادي): خـــاوەن بـــازووی ئەستوورو بەهێز.

(اَلأَعْضَـــد): ١-بـــازوو باریـــك ٢-ئـــەوەی کـــە بازوویەکی لەویتر کورتترە.

(اَلمِعْضاد): بازووبەند (چونکە لەســـەر بازوو دەبێت).

(اَلمِعْضَدَةُ): توورەکەی پارە/ جزدان.

٢-(عَضَدَ- الشَجَرَةَ. عَضْداً): درەختەکەی بە تەوراس بڕییەوە.

(اَلعَضَـــد) (مص): درەختـــی هەڵپاچراو یان بڕراوە.

(اَلعِضاد): تەوراس.

(اَلعَضيد (ج) عِضْـــدان): پەلوپۆی درەختی هەڵپاچراو.

(اَلمِعْضَد (ج) مَعاضِد): تەوراس کە درەختی پێهەڵدەپاچرێت.

(اَلمِعْضاد): ١-تەوراس ٢-کێردی گەورەی قەساب کە ئێسقانی پێدەشکێنێت.

٣-(عَضَـــدَ- الشَـــجَرَةَ. عَضْـــداً): گـــەڵای درەختەکەی بۆ حوشترەکان هەڵوەراند.

(اِسْـــتَعْضَدَ- الشَـــجَرَةَ): بەری درەختەکەی چنی.

(اَلعَضَد): گەڵای هەڵوەریو بۆ حوشـــترەکانو ئاژەڵەکان.

٤-(عَضَـــدَ واَعْضَـــدَ- السَـــهْمُ): تیرەکـــە لە هەڵدانیدا بەلای ڕاست یان چەپدا ڕۆیشت.

٥-(العَضُد (ج) اَعْضاد): لا/ کەنار.

(عَضُدُ الطريق): کەناری ڕێگاکە.

اَلعَضاد: پیاوو ژنی کورتەبنە/ کورتەبالا.

(اَلعِضادَة- مِنَ الطريقِ): کەناری ڕێگا.

(اَلعَضيد (ج) عِضدان): ڕیزی دارخورما.
(اَلعَواضِـد): ڕیـزی دارخورمـای ڕوواوی ئەمبەرو ئەوبەری ڕووبار.
عضـر: ١-(العَضْـرَس والعُضـارِس (ج) عَضارِس): ١-سـەرما ٢-بەفر ٣-ئاوی شیرینی سارد ٤-کەرەکێویی.
٢-(العُضْـرُط (ج) عَضـارِط و عَضارِطَة): کەسێکی بە نانەسکی بەکرێگیراو.
(اَلعُضْرُط العِضْرِط): بەدزمان/ ناپاك.
(قَومٌ عَضارِيـط): هەرچـیو پەرچی، دزو سواڵکەرو هەژار.
عضل: ١-(عَضَـلَ- عَلَيهِ. عَضْـلاً): تەنگی پێهەڵچنیو ڕێگەی لێگرت.
(-بِهِ الأَمرُ): کارەکەی لێ سەختو گرانبوو/ لێچووە بەست.
(عَضَـلَ وعَضِلَ- المَرْأَةَ عَنِ الـزَّواجِ. عَضْلاً وعِضْلاً وعِضْلاناً): ڕێی شووکردنی لە ژنەکە گرت/ نەیهێشت شووبکات.
(عَضَّلَ- عَلَيهِ): تەنگی پێهەڵچنیو نەیهێشت بکاتە ئەوەی دەیەوێت/ لێیقەدەغە کرد.
(-المَرأَةَ عَنِ الزواجِ): نەیهێشـت ژنەکە مێرد بکا.
(-المَكانُ): شوێنەکە تەسکبوو.
(«عَضَّلَـتِ الأَرضُ بِأَهْلِهـا»): زەویەکە جێی خەڵکەکەی تێدا نەبووەوە/ تەسکبوو/ لەبەر زۆرییان جێیان نەبووەوە.
(-تِ المَرأَةُ أَوِ الدجاجَةُ وغيرُهُما مِن الحَيَوان بِوَلَدِها): ژنەکـە منداڵبوونەکـەی گرانبوو ومریشـکەکە هێلکەکردنەکەی زەحمەت بوو زیندەوەرەکان زانیان گرانبوو.
(مُعَضِّل): زانلێگرانبوو.
(أَعْضَلَ الأَمرُ): کارەکە گرانبوو چاری نەبوو/ نەکرا.
(-تِ المَـرأَةُ ونَحوَهـا مِـنَ الحَيَـوان): بـە منداڵبوونەوە یان زانەوە جەری.
مُعْضِـل ومُعْضِلَـة (ج) مَعاضيـل: ژنـی بـە منداڵبوونـەوە یـان زیندەوەرەکـە بـە بەچکەکەیەوە جەریوە.
(أَعْضَلَ-بِهِ الأَمْرُ): کارەکەی لێ بەگیر وەستاو بەرامبەری دەستەوسان بوو.
(-الأَمرُ فُلاناً): کارەکە فیسـاری شەکەتکردو بۆینەکرا.
(-الـدّاءُ الأَطِبـاءَ): دەردەکە پزیشـکەکانی دەستەوسانکردو شەکەتیکردن.
(تَعَضَّلَ- الداءُ الأَطِباءَ): دەردەکە پزیشکەکانی شەکەت کرد.
(العِضْل): پیاوی زۆرزانو بەتەڵەکەو فێڵ.
(اَلعُضْلَـةُ (ج) عُضْل وعُضَـل): زۆرزانو بە فێڵو فەرەج.
(العُضَال): سەختو بەگیر.
(داءُ عُضَال): دەردێکی گرانی بێچارە.
(داءٌ مُعْضِـل): دەردێکـی سـەختی بێچارەو

دەرمان.
(اَلْمُعْضِلَـة (ج) مُعضِـلات): ١-مێـی وشـەی
(اَلْمُعْضِل) ٢-پرسـە بابەتێکی دژواری بێسەرو
دەرو پڕ دەردیسەریی ٣-پلانێکی دەرمەتەسك.
(اَلْمُعْضَلات): گیروگرفتی سەخت.
(اَلْمُعْضِّلَـة): کێشـەی سـەخت/ گیروگرفتی
دژوارو دەروو تەسك/ پلانی دەروو تەسك.
٢-(عَضَـلَ- الرَجُـلَ. عَضْـلاً): کێشـای بە
ماسولکەکەیدا.
(عَضِـلَ. عَضَـلاً): ١-ماسـولکەی زۆر بـوو
٢-ماسولکەی پووزی قاچی گەورە بوو.
(عَضِل وعَضُل): ماسولکە ئەستوور.
(أَلعَضَلَةُ (ج) عَضَل و عَضَلات والعَضيلَةُ (ج)
عَضائِل) (ع ا): ماسولکە/ هەموو دەمارێك کە
گۆشتی توندی پێوە بێت/ ماینچە/ پاڵانچە.
٣-(عَضَلَ وعَضِلَ- الرَجُـلَ. عَضْلاً وعِضْلاً
وعِضْلاناً): پیاوەکەی بێژن کرد.
٤-(العِضْل): زۆر ناشیرین.
(العَضَل (ج) عِضلان): مشـکێکی گەورەی/
رزق/ رسق/ جرج.
(أَلعَضَلَة) (ن): درەختێکە وەك ژاڵەیە.
(أَلْمُعْضِل): زۆر ناشیرین.
عضم: (العَضْم (ج) عُضْم وأَعْضِمَة): شـەن
کە شەنی پێدەکەن.
(- (ج) عِضام): دەسکی کەوان.
عضه: ١-(عَضَـهَ. عَضْهاً وعَضَهـاً وعِضْهَةً
وعَضيهَـةً): ١-درۆیکـرد ٢-دووزمانییکـرد/
بوختانیکرد ٣-جادوویکرد.
(-الرَجُـلَ. عَضْهـاً): ١-ڕووبـەڕوو ئاشـکرا
جنێوی پێـدا ٢-بوختانی بـە پیاوەکە کردو
تاوانباریکرد.
(عَضِهَ وأَعْضَهَ. عَضَهـاً): درۆو بوختانی بۆ
هەڵبەستو خراپەی دایەپاڵ.
(أَلعاضِـه) (فـا): ١-جادووگەر/ تەلیسـمباز
٢-بوختانکەرو درۆهەڵبەست.
(العاضِهَـة): مێی وشـەی (أَلعاضِه) ٢-درۆو
بوختان.
(أَلعِضَه (ج) عِضُون):١-درۆ ٢-جادوو/ سیحر/
تەلیسم (بۆیە وا ناونراوە چونکە درۆیەو چاو
بەستەیەو هیچی ڕاست نییە).
(أَلعَضيهَـة (مـص) (ج) عَضائِه): بوختان/
قسەی درۆی هەڵبەستراو قسەی ناشیرین.
٢-(عَضَهَ- البَعيرُ. عَضْهاً): حوشـترەکە دارە
دڕکەیخوارد.
(أَلعِضـاة الواحِـدَةُ عِضاهَـة وعِضَة) (ن):
دارەدڕکە/ هەموو دارێکی گەورەی دڕکاوی.
(أَلعِضاهيّ والعِضَهِيّ والعَضَوِيّ- مِنَ الإبِل):
حوشـترانێك کە دارە دڕکە دەخۆنو لەسەری
دەلەوەڕێن.
(مَكانٌ عَضِهٌ): شـوێنێك کە دارە دڕکەی زۆر
لێبێت.
(أَرضٌ عَضِيهَةٌ): خاکێکی پڕ لە دارە دڕکە.

٢-(حَيَّــةٌ عاضِهــةٌ وعاضِــهُ (ج) عَواضِه): ماری کوشـــنده هەرکه پێوەیدا دەســـتبەجێ پێوەدراوەکە دەمرێت.

عضا: ١-(عَضا- الشــيءَ. عَضْواً):شــتەکەی بلاوکردەوە.

(-الشاةَ):مەڕەکەی بڕییەوە.

(عَضَّــى- الشــيءَ. تَعْضِيَــةً): شــتەکەی جیاجیاکردەوە.

(-الشّاةَ):مەڕەکەی بڕییەوە.

(-القَومَ):خوێشــگەلی (تاکــە تاکە کرد یان دەستەدەستە کرد).

(ألعُضْــو والعِضو (ج) أَعْضــاء):١-ئەندامی لەش ٢-ئەندامێکی کۆمەڵەیــەك یان پارتێك یان تیپێك.

(ألعِضَة (ج) عِضــوان):تیپ ٢-پارچەیەك و بەشێك.

٢-(العِضَة (ج) عِضوان):درۆ.

(رَجُــلٌ عــاضٍ):پیاوێکی بــووەی نانبدەی پۆشتەکەری خەڵکی.

عطّ: ١-(عَطَّ وعَطَّط واعْتَطَ- الثوبَ. عَطّاً): جلەکــەی حەماشــایی دادری/ بێدیاریکردنی شوێنی دادڕینی جلەکەی دایدڕی.

(ثَوبٌ عَطيط):بەرگێکی دادڕاو.

(تَعَطَّطَ- الثَوبُ):جلەکە دادڕدادڕ بوو.

(إنْعَــطَّ- العــودُ):چێوەکە چەمییــەوە بێ قلیشێکی دیار.

(-الثَوبُ):جلەکە دادرا.

٢-(عَطَّ وعَطَّط واعْتَطَّ- الرَجُلَ إلى الأَرضِ عَطّاً):پیاوەکەی دایبەزەویداو بەزاندی.

(ألعَطــاط):١-ئــازاو نەبــەرد/ دلێرێکــی چاونەترس/ قارەمان ٢-(ح)شێر.

٣-(ألأَعَطّ):درێژ.

٤-(عَطْعَطَ- القَومُ. عَطعَطَةً):لە کاتی شەڕدا یــان کاتیتر دەنگــی خوێشــگەل بەرزبووەوە بەیەکداچــوو کردیــان بــە هــاتو هــاوارو غەڵبەغەڵب.

(-الكلامَ):قسەکەی تێکەڵو پێکەڵکرد.

عطب: ١-(عَطِــبَ- القُطنُ عطباً وعُطوباً): لۆکەکە نەرمبوو.

(إعْتَطَبَ- النارَ):ئاگرەکەی بە پەڕۆشڕەیەك برد.

(العُطْب والعُطُب):لۆکە.

(«أجِدُ ريحَ عُطْبَةٍ»):بۆنی بۆسۆی پەڕۆ یان لۆکە دەکەم.

٢-(عَطِبَ واعْتَطَبَ- عَطَباً):فەوتا.

(-الفَرَسُ ونَحوُهُ):چارەوێکە یان لەو بابەتە شکستیهێنا/ پەکیکەوت/ خراپبوو.

(أَعْطَبَ-هُ):فەوتاندی/ پەکیخست/ لەناویبرد.

(ألمُعْطَــب (ج) مَعاطِب):شــوێنی (فەوتان/ شکستهێنان/ لەناوچوون).

٣-(عَطِبَ واعْتَطَبَ-عَلَيهِ عَطَباً):توندو زۆر لێی تووڕە بوو/ لێیگەرمبوو.

٤-(عَطَّبَ- الشَرابَ): شەربەتەکەی بۆندا، تا بۆنی خۆشبێت‌و خۆشبێت.

٥-(عَطَّـبَ- الکَـرْمُ): مێوەکـە گۆپکـەی بەرسیلەی دەرکرد.

٦-(اَلمُعطِب): هەژار/ نەدارا.

٧-(اَلعُطْبُل والعُطْبُول): ئاسکی گەردنبەرز/ ملدرێژ.

(اَلعُطْبُل والعُطْبُول والعُطْبُولَة والعَیْطَبول (ج) عَطابِل وعَطابیل): ژنی جوانی گەنجی گەردنبەرز.

عطـر: ١-(عَطِرَ. عَطَراً): بۆنی خۆشـی لە خۆیدا: خۆی بۆنخۆشکرد.

(عَطِر): بۆنخۆش.

(عَطَّرَ- هُ): بۆنخۆشیکرد.

(تَعَطَّرَ واسْتَعْطَرَ): خۆی بۆنخۆشکرد.

(اَلعِطْر (ج) عُطُور): ١-عەتر/ هەموو بۆنێکی خۆش ٢-(ن)گوڵە عەتر.

(«لاعِطْرَ بَعدَ عَروس»): لە بووك بۆنخۆشتر نییە.

(اَلعاطِـر (ج) عُطُر): بۆنباز/ کەسـێکە زۆر حەز لە بەکارهێنانی بۆنی خۆش بکات.

(عطار): ١-بۆنفرۆش ٢-بۆنباز.

(العِطـارَة): عەتـاری/ بۆنفرۆشـیی/ داوودەرمانفرۆش.

(اَلمِعْطار والمِعْطیر): (بۆ نێرو مێ) کەسـێکە بۆن زۆر بەکاربهێنێت.

٢-(تَعَطَّـرَ-تِ البِنـتُ): کچەکـە لای دایك‌و باوکی مایەوەو شووینەکرد.

٣-(عَطـارد) (فـك): ئەسـتێرەی زاوە. لـە ئەسێرە گەڕۆکەکانەو لە هەموو یان نزیکتری خۆرە.

عطس: ١-(عَطَسَ. عَطْساً وعُطاساً): پژمی.

(عَطَسَ فُلان وعَطَسَت بِهِ اللُجَمُ»): مرد.

(عَطَّسَ-هُ): پژماندی.

(اَلعاطُوس): پژمەهێن/ پژمێن/ بڕنووتی.

(عَطوس) (عامیة): پژمەهێن.

(اَلعَطْسَـةُ): پژمە/ هەوا لە لووتەوە بە گوڕو بە دەنگەوە دێتە دەرێ.

(«هو عَطْسَةُ فُلان»): ئەو لەش‌و لارو شێوەو ڕەوشتی کوتومت دەڵێی ئەوەو لەو دەچێت.

(اَلمَعْطَس والمَعْطِـس (ج) مَعاطِس): لووت/ کەپوو.

(«أرغِمَتِ المعاطِـسُ»): لووتیان بە ناحەزان شۆڕکرد/ داخست).

٢-(عَطَـسَ- الصُبحُ. عَطسـاً وعُطاسـاً): شەبەقیداو ڕووناکبوومەوە/ بەیانیدا.

(اَلعاطِس): بەیان.

٣-(اَلعاطِس): ئاسکی بەرەو ڕوو هاتوو.

(اَلعاطـوُس) (ح): چوارپێیەکـە کـە بـە بەدوومی دابنێن.

عطش: (عَطِشَ. عَطَشاً): تینووی بوو.

(-إلَیهِ): تاسەیکرد/ تینوویبوو.

(عَطْشان (ج) عِطاش وعَطْشى وعَطاشى (م) عَطْشى وعَطْشانَة (ج) عِطاش): ١-تاسەکردوو ٢-تینوو ٣-ئارەزوومەند/ تامەزرۆ.

(عَطَّشَ-هُ): تینویکرد.

(عاطَشْتُهُ فَعَطَشْتُهُ): ١-تاسەی یەکترمانکرد من لەو بە تاسەترو بۆی تینوتر بووم ٢-لە تینویەتیدا بۆربۆرێنم لەگەڵ کردو لێم بردەوە.

(مَعطوش): تاسە بۆکراو.

(أَعْطَشَ-هُ): تینویکرد.

(-الرَجلُ): ئاژەڵەکەی تینویانبوو.

(تَعَطَّشَ): خۆی بەتینوو پیشاندا.

(أَلعَطِش والعَطُش (م) عَطِشَــة وعَطُشَــة): تینوو یان تاسەکردوو/ تامەزرۆ.

(أَلعُطاش) (طب): دەردی تینوێتی نەشکان/ کەسێکە تێرئاو نابێت.

(أَلمَعطَش (ج) مَعاطِش): دەمی تینوێتیی.

(أَلمَعْطَشَةُ (ج) مَعاطِش): زەوی وشکی بێئاو.

(أَلمِعْطاش): زۆر تینوو (بۆ نێرو مێ).

عطف: ١-(عَطَفَ- إلَيــهِ. عَطْفاً وعُطوفاً): بەلایدا لایدا/ بەلایدا وەرگەڕا پێچیکردەوە.

(-عَلَيهِ): دڵی بۆی سووتا/ بەزەیی پێداهاتەوە/ میهرەبانیی لەگەڵدا کرد/ لاواندی.

(-عَنهُ): خۆی لێلادا/ بەجێهێشت.

(هُ عَنِ الأَمر): لە کارەکە لایدا.

(-كَلِمَــةً على أُخرى): بە ئامرازی پەیوەندی وشەیەکی بە وشەیەکیترەوە بەند کرد.

(-العَنانَ): جڵەوەکەی ڕاکێشا.

(-الوسادَةَ): سەرینەکەی نوشتانەوە.

(-الشيءَ): لاریکردەوەو نوشتانیەوە.

(عَطِفَ عَطَفاً): کەچبوو.

عَطَّفَ (الوسادة): سەرینەکەی نوشتانەوە.

(-الشيءَ): شتەکەی لارکردەوەو نوشتانیەوە.

(تَعَطَّفَ): (خوار/ لار) بووەوەو نوشــتایەوە/ پێچپێچخوارد.

(-الثَــوبَ وبِالثَــوبِ): جلەکــەی لەخۆیەوە پێچا.

(تَعاطَــفَ في مَشــيَتِهِ): ســەری بــاداو بــە لەنجەولار ڕۆیشت/ بەلارەوە لارەوە ڕۆیشت.

(إنْعَطَــفَ): چەمییــەوە/ نوشــتایەوە/ خواربووەوە/ لاربووەوە.

(أَلعاطِــف (فــا) (ج) عُطُــف وعَطَفَــة): ١-میهرەبــان ٢-چەمــاو ٣-لێفە یــان بەرگێکە لەناوقــەد بــەرەو خــوارەوە دادەپۆشــێت ٤-شەشەمین ئەسپی پێشبڕکێ.

(العاطِف عنــد النحاة): پیتی پەیوەســتیی وەك (واو).

(أَلعاطِفَــةُ (ج) عاطِفــات وعَواطِف): مێی وشــەی (العاطِــف): ســۆز/ میهرەبانیــیو بەزەیی.

(أَلعَطْف) (مص): خواربوونەوە/ نوشتانەوە/ چەمانەوە.

(أَلعِطــف (ج) أَعْطاف وعِطــاف وعُطوف):

بنباخەڵ/ بنهەنگڵ.
(-مِن كُلِّ شيءٍ): تەنشتی هەموو شتێك.
(عِطْفُ القَوسِ): چەمینەوەی هەردوو سەری کەوان.
(عِطفـا- الرَجُلِ): هەردوو (تەنشــتی/ لای) پیاو.
(ثَنــى عَنّي عِطْفَهُ): پشــتی تێکردمو ڕووی لێوەرگێڕام/ لێم لووتەلا بوو.
(«هو يَنظُرُ في عِطْفَيْهِ»): بە سەرسامییەوە تەماشای ئەملاولای خۆیکرد.
(«مَرَّ ثانِيَ عِطْفِهِ»): ملی باداو بە فیزەوە/ بە لووتبەرزییەوە ڕووی وەرگێڕا.
(تَنَحَّ عَن عِطفِ الطريقِ): لە پێچی ڕێگەکە لابدە.
(ألعَطف) (مص) الواحِدَةُ عَطْفَة):١-درێژیی برژانگ ٢ (ن)ڕووەکێك خۆی لە درەختێکەوە (لوولبدات/ بئاڵێنێت) ٣-لاولاو.
(ألعِطفَةُ): ١ لالێکردنەوەو میهرەبانییکردن/ لاواندن/ ســۆزدان ٢ تەرزی مێو کە چنگ لە شتێ گیردەکات.
(ألعِطاف (ج) عُطُــف وأَعْطِفَة):١-عەبا یان جبــە (بۆیە وا ناونــراوە چونکە هەردوو لای شــانو مل دادەپۆشــێت) ٢-هەرچی لە خۆوە بپێچرێت ٣-شمشێر.
(قَوسٌ عَطفی): کەوانێکی چەماوە.
(ألعَطوف والعاطُــوف (ج) عَواطِف): تەڵەی گۆچانــە/ تەڵەیەکە دارێکی ســەرچەماوەی تێدایە.
(ألعَطيف (ج) عَطائِف): کەوان.
(ألمَعْطِــف (ج) مَعاطِــف):١-مــل/ گــەردن ٢-پاڵتۆ/ قاپووت / جرتە/ ســاقۆ کە بەســەر جلدا لەبەردەکرێت.
(ألمِعْطَف (ج) مَعاطِف): شمشێر.
(مُنعَطَف الوادي ومُنعَصِفُهُ): پێچو پلووچی دۆڵ/ دەرە.
٢-(عَطَــفَ-تِ الناقَــةُ على وَلَدِهــا. عَطْفاً وعُطُوفاً): مێحوشترەکە سۆزی بۆ بەچکەکەی جووڵاو شیری بۆ دادا.
(-اللهُ قَلْبَهُ وبِقَلْبِهِ): خودا بەزەیىو ســۆزی خستە دڵیەوە.
(عَطَّــفَ- الناقَــةَ علــى وَلَدِهــا): ســۆزی مێحوشترەکەی بۆ بەچکەکەی جووڵاند.
(تَعَطَّفَ-عليه): دڵی بۆی ســووتاو نەرمبوو/ بەزەیی پێداهاتەوە میهرەبان بوو.
(تَعاطَــفَ- القَومُ): لەگەڵ یەکــدا میهرەبان بوون/ دڵیان لەســەر یەك بــوو/ لەگەڵ یەك دڵنەرم بوون.
(إسْــتَعطَفَ-هُ): لێی پاڕایــەوەو میهرەبانیی ئەوی خواست/ بەزەیی ئەوی جووڵاند.
(ألعاطِفَة (ج) عاطِفات وعَواطِف): بەزەیی/ سۆز/ میهرەبانیی.
(ألعَطوف (ج) عُطُف): بەســۆز/ میهرەبان/

دڵنەرم/ بەبەزەیی و بەخشندە.

(إمْــرَأةٌ عَطــوفٌ): ئافرەتێکــی دڵســۆزی مێردەکــەی و بەســۆز لەگــەڵ مێــردو منداڵەکانیدا.

(العَطیــف- مِــنَ النِّســاء): ژنــی بەســۆزو خۆشەویست بەرامبەر مێردو منداڵەکانی.

عطل: ١-(عَطَلَ-تِ المَرْأةُ. عَطَلاً و عُطولاً): ئافرەتە کە بێخشڵ بوو.

(عاطِــل وعاطِلَــة وعُطُــل (ج) عاطِــلات وعِواطِل وعُطَّل وأعْطال): ئافرەتی بێخشڵ/ خشڵی لەخۆنەدابێت.

(عَطَــلَ- الأَجیــرُ عَطالَــةً): کرێکارەکــە/ کارکردەکە/ بەکرێگیراوەکە دەستی لە کارەکە هەڵگرت/ وازی لە کارەکە هێنا.

(عَطِلَ-تِ المَرأةُ. عَطَلاً وعُطُولاً): بێخشڵبوو/ خشڵی لەخۆی نەدا.

(-الرَّجُلُ مِنَ المالِ أو الأَدَبِ): پیاوەکە نەدارا بوو/ بێماڵبوو یان بێڕەوشت بوو.

(-القَوسُ مِن الوَتَر): کەوانەکە بێژێ بوو.

(-الفَــرسُ مِن الرسَــنِ): چارەوێکــە بێلغاو بوو.

(عاطِل وعُطْل وعُطُل (ج) أعْطال): مرۆڤی بێــداراو ڕەوشــت یــان کەوانــی بێــژێ یان چارەوێی بێلغاو.

(عَطَّــلَ- الشَــیءَ):١-شــتەکەی پەکخســت/ ســەقەتیکرد ٢-شــتەکەی پشتگوێخســتو بەتەنگیەوە نەهات.

(-المَــرأةَ): خشــڵی لــە ژنەکــە کــردەوە/ ڕووتیکرد.

(-القَوسَ): ژێکەی لە کەوانەکە کردەوە.

-الإِبِــلَ: حوشــترەکانی بێشــوانکردو بەرەڵایکردن.

(تِ- الإِبِــلُ): حوشــترەکان بێشــوان و بەرەڵا لەوەڕان.

(-البِئــرَ): ئاوی لــە چاڵاوەکــە دەرنەهێناو لێگەڕاو بەرەڵایکرد.

عــاطــل: هــەر شتێك كە بــەرەڵا بكرێتو ســەرپــەرشــتــی نــەكــرێــتو نــەپــارێــزرێــت بەرەڵایە.

(«عُطِّلَــتِ الحُــدُودُ أَو الثُغــورُ): ســنوور بەرەڵابووەو بێپارێزەر.

(عُطِّلَتِ المَــزارِعُ»): کێڵگەکان بەرەڵان کەس نایانپارێزێــتەوە نەدەکێڵرێن و نە دەکرێن بە هیچ و نە ئاودەدرێن.

(-الرَعِیَّــةُ): میللەت بەرەڵا بــوو بێگەورەو سەرپەرشتیار.

(ألقَــومُ مُعَطَّلون)میللــەت بێخــاوەن و بەڕێوەبەر، بەرەڵایە.

(تَعَطَّــلَ): پەکیکــەوتو بێــکار مایــەوە/ دەستبەتاڵبوو/ بێئیشبوو.

(تَعَطَّــلَ واسْــتَعْطَلَ-تِ المَــرأةُ): ژنەکــە بێخشڵبوو/ ڕووتبوو.

(رَجُـلٌ عاطِـلٌ (م) عاطِلَـةٌ): ١-بێـكار/ دەستبەتاڵ/ بێئیش ٢-نەدارایە یان بێرەوشتە یان بێوێڵە.

(«رَجُـلٌ عاطِـلٌ»): پیاوێکی بەدرەوشـتە (عامیە).

(«إمْـرَأةٌ عاطِلَةٌ»): ژنێکی سۆزانی/ قەحبە (عامیە).

(اَلعُطَلَةُ): پشوو/ بێکاریی/ بێکار دانیشتن.

(اَلعَطْلاء- مِنَ النِّساء): ژنێك خشڵی لە خۆی نەدابێت.

(اَلعطالَـة أَو القُصُـور خاصَّةً في الأَجسـام): پەککەوتـن یان کەموکورتیـی بە تایبەتی لە لەش. لەشـی ئەگەر هێزێك نەبێت بارەکەی پێبگۆرێت هەروا دەمێنێتەوە. بزوان بێت یان سرەوت بێت.

(اَلتَعطیـل): ١-لەکارخسـتن/ پەکخسـتن ٢-بێکاریی.

(مَذهَب التَعْطیـل): ڕێرەوی لەکارخسـتن ڕێـرەوی ئەوانەیـە کە پێ لە سـیفەتەکانی خودا نانێن/ پێ لەسەر بوونی خودا نانێن.

(اَلمِعطال- مِنَ النساء): ئافرەتانێکن کە بەوە ڕاهاتوون خشڵ لە خۆیان نەدەن.

(اَلمُعَطِّلَـة): خاوەنـبڕوای لەبارخسـتنی سیفەتەکانی خودا/ خوانەناسەکان.

٢-(اَلعَطَل (ج) أَعْطال): ١-مل ٢-کەس.

(«ماأَحْسَـنَ عَطَلَهُ»): ئای کە بەژنی جوانە/ کە کەسێکی بالآجوانە.

(اَلعَطیل): چووزێکە بە کیسە تۆوی دراخورما نێرەکەوەیە.

(اَلـعَـیْـطَـل= الـعَـطـیـل) ٢-گـەردنـبـەرزی گەردنجوان.

عطم: (إعْتَطَمَ- الرَجُلُ): فەوتا/ مرد.

(عاطِـم وعَطیـم (ج) عُطُـم): فەوتــاو/ مردوو.

(اَلعُطْم): خوریی شیکراوە.

عطـن: ١-(عَطَنَ- البَعیرُ عَطْنـاً وعُطُوناً): پاش ئەوەی حوشترەکە ئاویخواردەو پشوویدا تا جارێکیتر ببرێتەوە سەرئاو.

(-البَعیرُ): تێرئاو کراو پاشان یخدرا.

(عاطِـن): حوشـتری تێرئـاوو یخبـوو (ج) عُطّان وعُطـون وعَطَنَـة (م) عاطِنَة (ج) عاطِنات وعَواطِن وعُطُون. (عَطَّنَ- الإبلَ): حوشـترەکەی پشوودا پاش ئەوەی تێرئاو بوو بۆ ئەوەی جارێکیتر ئاوبخواتەوە.

(ـتِ الإبلُ): تێرئاو بوو پاشان یخبوو.

(-لِلإبـل): پەچەیەکی لە نزیك ئاوەکەوە بۆ حوشترەکان کرد.

(أَعْطَـنَ الإبـلَ): پـاش ئاوخواردنـەوەی حوشـترەکان پشـووی پێدان تا جارێکیتر ئاو بخۆنەوە.

(اَلعَطـن (مـص) والمَعْطِـن والمَعْطَـن (ج) مَعاطِن): شـوێنی یخبوونی حوشترو پەچەی

مەرو ئاژەڵ لە نزیك ئاوەكە.
٢-(عَطِنَ- الجِلْدَ. عَطْناً): پێستەكەی خستە دەرمانی خۆشەكردنی.
(ألجِلدُ عَطين ومَعْطُون): پێستی ناو دەرمانی خۆشەكردن.
(عَطِـنَ- الجِلْـدُ عَطْناً): پێســتەكە خرایە خۆشكردنەوەو لێیگەڕانو بۆگەنبوو.
(عَطِــن): پێســتەی ئامادەی خۆشــەكردنو بۆگەنكردوو.
(عَطَّـنَ- الجلـدَ): پێســتەكەی خســتە ناو دەرمانــی خۆشــەكردنەوەو بەجێهێڵــرا تــا بخوسێتو بۆگەن بێت.
ألعِطان: درەمانی خۆشــەكردن یان خوێ كە پێســتەكەی تێدەخرێــت تا بۆگــەن بكاتو نەرمبێتەوە بخووسێتو تووكەكە هەڵبدات.
(رَجُلٌ عطينٌ وعَطينَــةٌ): پیاوێكی بۆگەن/ بۆگەنگرتوو.
عطا: ١-(عَطا- الشَيءَ وإلَيهِ عَطْواً): شتەكەی دایە دەست.
(ــ إلَيهِ يَدَهُ): دەستی بۆ بەرزكردەوە.
(عاطى- الرجُلَ الشــيءَ. عطــاءً ومُعاطاةً): شتەكەی دایە دەست.
(أعطى- هُ الشــيءَ. إعْطاءً): شــتەكەی دایە دەست پیاوەكە.
(-البَعيرُ أو أعطى البَعيرُ بيَدِهِ): حوشــترەكە ملیدا.

(تَعَطَّــى- الأمْــرَ تَعَطِّياً): كارەكــەی گرتە ئەستۆ/ كارەكەی بەدەستەوە گرتو كردی.
(تَعَطَّــى): داوای بەخششــیكرد/ داوای كۆمەكیكرد.
(تَعاطى- الشــيءَ. تَعاطِياً): شــتەكەی گرتە دەست.
(-الأمــرَ): كارەكەی كــرد یــان تێیهەڵچوو/ ئەنجامیدا.
(-الرَجُلُ): لەســەر نووكی پێ بۆشتەكە چوو هەردوو دەستی بۆ شتكە بەرزكردەوە بیبات.
(إسْتَعْطى إسْتِعْطاءً): دەرۆزەیكرد/ سواڵیكرد/ شتیخواست.
(ألعَطا والعَطاء (ج) أعطِيَة و (جج) أعْطيات والعَطِيَّة (ج) عطایــا وعَطِيَّات): ئەوەی كە دەبەخشرێت/ بەخشش.
(ألعَطــاءَة والعَطاوَة): بەخشــش/ ئەوەی كە دەبەخشرێت.
(«ماأعطاهُ للمال»): ئای كە پارەو ماڵبەخشە/ كە بەخشندەیە.
(ألمُعْطــاء (ج) مَعاطٍ ومَعاطِــيّ): (بۆ نێرو مێیە) بەخشــندەیەكی گەورەیە/ دڵفراوانە/ سەخییە.
٢-(عَطّى- الرَجُلَ. تَعْطِيَةً): بە ئینســافەوە رەفتاری لەگەڵدا كردو كارگوزارییكرد.
(عاطــى-هُ عَطاءً ومُعاطــاةً): خزمەتیكردو لەگەڵیدا بە ئینسافبوو.

٢-(عَطَّى- الرَجُلَ تَعْطِيَةً): پەلەی لێکرد.
(تَعَطَّى. تَعَطِّياً): پەلەیکرد/ گورجبوو.
عظ: ١-(عَظَّ-هُ بِالأَرضِ عَظّاً): نووساندی بە زەویەکەوە.
(-تْـهُ الحَـربُ): شـەڕ (تەختیکـرد/ پەرێشانیکرد).
(عـاظَّ-هُ مُعاظَّةً وعِظاظـاً): ١-گرفتاریکرد ٢-پێوەی لکاو بوو بە دوژمنێکی سەرسەختی.
(-القَومُ): خوێشگەل لە جەنگەکەدا توندوتیژ بوون/ گەرمبوون.
(ألعَظَّةُ): توندوتیژیی لە جەنگدا.
٢-(عَظْعَظَ- السَّـهْمُ): تیرەکە لەرەلەریکردو خواربوووەوە.
(-الجَبـانُ): زیرەکردووەکـە پشـتی کـردە دوژمنو شەڕی نەکرد.
(-في الجَبَـلِ): سـەرکەوتە سـەر کەژەکـە/ شاخەکە.
عَظَـب: ١-(عَظَبَ- الطائِرُ عَظْباً): باڵندەکە بنکلکی خێرا خێرا جووڵاند.
٢-(عَظَـبَ- جِلـدُهُ. عَظْبـاً وعُظُوبـاً): پێستەکەی وشکبووەوە.
(ألعاظِب والعَظِب): ئەوەی لە چۆڵو بیاباندا لە شوێنی بێئاودا دابەزێو هەڵبدات.
٣-(عَظَبَ- على العَمَلِ. عَظْباً وعُظُوباً): بە کارەکەوە بەند بوو ئارامی لەسەر گرت.
(-تْ يَدُهُ): لە کارەکەدا دەسـتی ئەسـتوورو ڕەقبوو.
عَظِبَ- على العَمَلِ: بە کارەکەوە بەند بوو و ئارامی لەسەر گرت.
(عَظَّبَ-ه عَن بُغْيَتِهِ): خایاندی نەیهێشت بگاتە خواستەکەی/ خایاندیو لە ئامانجەکەی لایدا.
(-هُ على الشَّـيءِ): مەشـقی لەسـەر شتەکە پێکردو ئارامی پێگرت.
٤-(عَظِبَ- عَظَباً): قەڵەو بوو.
(عَظُوب): قەڵەو.
٥-(عِظيَـبٌ – الخُلُـق): بەدخـوو/ ڕەفتار ناشیرین.
عظر: (عَظِرَ- الإناءَ. عَظْراً): قاپەکەی پڕکرد.
(أعْظَرَ-هُ الشَرابُ): (شەربەتەکە/ خواردنەوەکە) گەدەی قورسکرد.
(ألعِظارَة): گەدە قورسبوونی خواردنەوە.
ألعِظار: گەدە پڕبوونی خواردنەوەی زۆر.
(ألعَظُـور (ج) عُظُر): گەدە هەسـتاوو پڕی خواردنەوە.
عظل: ١-(عَظَلَ وعَظِـلَ تعاظَلَ واعتَظَلَ-تِ الكِلابُ أوِ الجَرادُ. عَظْلاً): سـەگەکان یان کوللەکان سواری یەکتر بوون.
(-تِ القَـومُ عَلَيـهِ): کەڵەکەتریێیان لەسـەر کرد/ نیشتنە سەری لێیبدەن.
(عاظَلَ- الشيءَ): سواری شتەکە بوو.
(-في الكَلامِ): قسەکەی بەسەریەکدادا/ تێکەڵو پێکەڵیکردو جوویەوە/ چەندبارەیکردەوە.

(-الشـاعِرُ في القافيَـةِ): سـەرواى دێـرە هەڵبەسـتەکەی بەدوایەوە بەست، شێوەیەك کە واتایەکی جیای نەبێت بەو تەواوی بکات.
(-بالـكَلام): ئاخاوتنەکەی بـۆ خاوەنەکەی گێڕایەوە.
(تَعَظَّـلَ- في أثَـرِهِ): دوایکـەوت/ بەدوایدا چوو.
(-القَـومُ عَلَيـهِ): گەلەکۆمەکێیـان لێکرد/ لێیبدەن.
(ألعاظِل والعاظِلَة والعَظْلـى- مِنَ الجراد): کوللەی لەسەریەك کەڵەکە بوو.
٢-(تَعَظْلَمَ- اللَّيلُ): شەو بوو بە شەوەزەنگ/ زۆر تاریکبوو.
(ألعَظْلَمَة): تاریکیی.
عظم: ١-(عَظُمَ- عِظَماً وعَظامَة): مەزنبوو/ گەورە بوو.
(عَظيـم (ج) عُظَمـاء وعِظـام وعُظُـم): مەزنبوو/ گەورە بوو/ مەزن/ گەورە.
(-الأمرُ عَلَيـهِ): کارەکەی لێ گـرانو دژوار بوو.
(عَظَّمَ-هُ): مەزنیکـرد/ بە گەورەی دانا/ بە گەورەیگرت/ پایەداریکرد.
(أعْظَـمَ- الأمـرُ): کارەکـە گـەورە بـوو/ گرنگبوو.
(-الشَيءَ): ١-شتەکەی زلکردو گرنگیکرد ٢-بە گەورەو گرنگی داناو زانی.
(تَعَظَّمَ): لووتبەرزیی نواند/ خۆی بە گەورە دانا.
(تَعاظَـمَ): فیـزی نوانـد خۆی بـە گەورە پیشاندا.
(-هُ الأمرُ): کارەکەی لێگرانو قورسبوو.
(«هُوَ أمرٌ لايَتعاظَمُهُ شـيءٌ»): کارێکە هیچ شتێك لە گەورەییدا نایگاتێ.
(إسْتَعْظَمَ): لووتبەرزییکرد/ خۆی بە گەورە دانا.
(-الأمرَ): کارەکەی زۆر بە گرانو گەورە هاتە بەرچاو/ زلیکرد.
(-الشَيءَ): بەشی زۆربەی شتەکەیبرد.
(عَظْمُ الشَيءِ (ج) أعْظام): زۆربەی شتەکە/ بەشی هەرە زۆری.
(ألعُظم): ١-زۆریی ٢-گەورەیی.
(عُظْمُ الشَيء (ج) أعْظام): بەشی هەرە زۆری شتەکە.
(ألعِظَم والعِظَم): گەورەیی/ گەپیی.
(عَظَمُ- الطَريق): ناوەراستی رێگەکە.
(العُظـام والعُظّام (م) عُظامَـة وعُظّامَة): مەزن/ گەورە.
(ألعِظامَة والعُظمَة والإعْظامَة): سمتگەورەکەر/ شـتێکە وەك سـەرینۆکێك، ژن سمتی خۆی پێ گەورە دەکات.
(ألعُظّامَة): سمتگەورەکەر/ ئەو سەرینۆکەیە کە سمت گەورە دەکات.

(اَلعُظَّامَة والعَظَمَة والعَظَمُوت): ١-لووتبەرزیی/ خۆپەسەندیی/ فیزو دەعیە ٢-شانازیی ٣ پوختە/ هەڵبژێردراو/ ناوێزە.

(عَظَمـاتُ القَوم): گـەورە پیاوانی نەتەوە/ سەروەرانی خوێشگەل.

(اَلعَظيمَـة (ج) عَظائِـم): ١-مێـی وشـەی (العَظيـم) ٢-كۆسـتی گـەورە/ بەدبەختیی گەورەو گران.

(عَظائِمُ الله): كارانی مەزنی خوداوەند.

(مُعْظَمُ- الشـيء (ج) مَعاظِم): بەشی هەرە زۆری شتەكە.

(«إن لِفُـلان مَعاظِـمَ واجِبَـة المراعاة»): فیسار كەس زۆر ماف گەورەی هەیە پێویستە لەبەرچاو بگیرێت.

(اَلْمُعْظَمَـة): كۆسـتی گەورەو گـران/ وەیی سەخت.

٢-(عَظَـمَ- الكَلْـبَ. عَظْماً): ئێسـقانی بە سەگەكەدا بیخوات.

(-الرَجُـلَ. عَظِمَةً): كێشـای بە ئێسـقانی پیاوەكەدا.

(عَظَـمَ- الشـاةَ):مەڕە سـەربڕاوەكەی پارچەپارچە كردو ئێسقانەكانی شكاند.

(أَعْظَـمَ- الكَلْـبَ): ئێسـقانی دەرخـواردی سەگەكە دا.

(اَلعَظْم (مص) (ج) أَعْظُم وعِظام وعِظامَة): ئێسك/ ئێسقان كە گۆشتی پێوە بەندە.

(اَلعَظْمَة) (مص): ئێسقانێك.

(اَلعَظَمَـةُ- مِـنَ السـاعِد أَو اللسـان (ج) عَظَمات): ئەو بەشە باسـكە یان زمانەی كە ئەستوور بێت.

(اَلعَظْمِي) (ح): كۆترێكی سپیواشت..

٣-(إِسْتَعْظَمَ- الأَمرَ): حاشای لە كارەكە كرد/ پێیلێنەنا/ نەچووە ژێری.

عظـا: (عَظا- فُلانـاً. عَظـواً): ١-خەفەتیدا بـە فیسـارو خراپـەی دەربـارە كـرد/ دڵی تەنگكرد ٢-لە پاشـملە بە خراپە ناوی هێنا/ غەیبەتیكرد ٣-لە چاكە (دووریخستەوە/ لایدا) ٤-ژەهرخواردیكرد.

عظی: (عَظَـی- فُلانـاً عَظیـاً): خراپەی دەربارە كرد.

(اَلعِظـاءَة والعَظاءَة والعَظايَة والعِظايَة (ج) عَظـاء وعِظـاء وعَظايا وعَظايـات) (ح): مارمێلكـە كـە زۆر جۆری هەیـە لەوانەیش شـەوگەرد، گیاندارێكی خشۆكن لووسن خێرا دەڕۆن و دەوەستن.

(السَّقّایة): مارمێلكەو شێوەكانی (عامیە).

عـف: ١-(عَفَّ. عَفّاً وعِفَّةً وعفافاً وعَفافَةً): لـە كارو كـردەوەی خـراپ و حـەرام (خۆی بەدوورگرت/ خۆی لێپاراست).

عَفیـفٌ وعَـفٌ (ج) أَعِفَّة وأَعِفَّـاء وعُفُون وهي عَفیفَة وعَفَّـة (ج) عَفیفات وعَفائِف وعَفّات): پاك/ خاوێن/ پارێزگار/ لە خراپەو

حەرام بەدوور/ داوێنپاك.
(- عَن كَذا): خۆی لەوە پاراستو بەدوورگرت.
(أَعَفَّ- اللهُ فُلاناً): خودا فیساری بە پاكیی ڕاگرت.
(تَعَفَّفَ= عَفَّ): ١-خۆی بە پاكیی ڕاگرتو لە حەرامو خراپە دوورخستەوە ٢-خۆی بە پاكو خاوێن پیشانداو نواند.
(-عَن كَذا): خۆی لەوە پاراستو سڵی لێكردەوە.
(إعْتَفَّ واسْتَعَفَّ- عَن الخَبيثِ): لە حەرامو گەنو بێزراو خۆی بەدوورگرتو سڵی لێكردەوە.
(-البَعيرُ اليَبيسَ): حوشترەكە پووشەو شكەكەی بە زمان لەسەر گڵەكە هەڵگرتو پاكیكردەوە.
(العِفَّة) (مص): داوێنپاكیی/ لە حەزی ئارەزوومەندیی دووركەوتنەوە/ پاكیی ٢-دەستپاكیی ٤-خاوێنیو لەشپاكیی.
٢-(تَعَفَّفَ): دواچۆڕی شیرەكەی خواردەوە كە لە گواندا بوو.
(تَعافَّ- الناقَة): بۆ جاری دووەم مێ حوشترەكەی دۆشییەوە.
(العُفَّة والعُفافَة): ئەو شیرەی كە لە گواندا پاش دۆشین دەمێنێتەوە.
(«سَأَلَهُ فَما أَعطاهُ إلاّ عُفافَةً»): داوای شتی لێكرد تەنها چۆرە شیرێكیدایە.
(تَعافَّ- المَريضُ): نەخۆشەكە دەرمانی خۆیكرد/ چارەسەری خۆیكرد.
(العِفاف): دەرمان.
٤-(العِفّان) («جاءَ على عِفّانِ ذلك»): لە دەمو كاتی ئەوەداو خۆیدا هات.
عفت: (عَفَتَ- الشيءَ. عَفتاً): شتەكەی پێچداو شكاندی.
(-كَلامَهُ وفي كَلامِهِ): ئاخاوتنەكەی بە زمانێكی ڕەوانو ڕاست نەكرد بە شكستە زمان كردی.
(عَفّات): زمان شكستە.
عفج: (عَفَجَ-هُ بالعَصا): بەدار لێیدا.
(العَفْج والعِفْج والعَفَج والعَفِج (ج) أعْفاج وعِفَجَة): ڕیخۆڵە باریكە كە دوای گەدە خواردنی بۆ دەچێت.
(المِعْفَجَة والمِعْفاج): ١-دار/ داردەست ٢-گەلاگوتك كە بۆ جلشتن بەكاری دەهێنن.
(المِخباط) (عامية): گەلاكوتك.
عفد: (عَفَدَ. عَفْداً وعَفَداناً): قاچی جووتكردو بازدیدا.
(إعْتَفَدَ): دەرگای لەسەر خۆی داخست تا لە برساندا بمرێتو دەرۆزە/ سواڵ نەكات.
عفر: ١-(عَفَرَ-هُ في التُرابِ عَفْراً): لە خۆڵدا تلاندیەوەو خستیە خۆڵەكەوەو تێیهەڵسوو.
(-الشيءَ): كێشای بە زەویدا.

(عَفِـرَ واسْـتَعْفَرَ. عَفَـراً): ١-ڕەنگخاکیبوو ٢-(خۆڵی/ خاکی) لەسەر نیشت.

(أَعْفَر): خۆڵاوی.

(عَفَّرَ-هُ في التُّـراب): لە خۆڵیەوە داو خۆڵی تێهەڵسوو.

(«قَد عُفِّرَ وأُرغِمَ»): زەبونو سەرشـۆڕ کرا/ لە خۆڵدا گەوزاندیان.

(-تِ المَـرأَةُ في الفِطام): ژنەکە خۆڵی لە گۆی مەمکیەوە دا بۆ ئەوەی منداڵەکەی نەیخوات‌و لەشیر ببڕێتەوە.

(تَعَفَّرَ وانعَفَرَ- في التُرابِ): لە خۆڵدا گەوزا/ خۆی خۆڵاویکرد.

(-الشيءُ): شتەکەی خۆڵاویبوو.

(إعْتَفَرَ- الشيءُ): شتەکەی خۆڵاویبوو.

(-الـثَـوبَ): بـەرگـەکـەی خـۆڵاویـکـرد/ لەخۆڵیهەڵکێشا.

(-الرَجُلَ): پیاوەکەی بە زەویدادا.

(العَفْر والعَفَر) مصدران (أَعفار): ١-سەرەوەی گڵ ٢-لە خۆڵدا گەوزان یان خۆڵاویکردن.

(أَلعِفر والعُفْر) (ح): ١-یەکانە (نێرەی بەراز) ٢-(ح)هەموو بەرازێك.

(أَلعُفْرَةُ): ڕەنگخاکیی ڕەنگگەردیی.

(ألأَعْفَر) (ح): جۆرە ئاسکێکە کە لە هەموان خێرایی کەمترە.

(أَلعَفْراء (ج) عُفْر): مێی وشەی(الأَعْفَر)

(أَلعَفـير والمَعْفُور): لە خۆڵ هەڵکێشـراو/ لە خۆڵدا گەوزێنراو.

٢-(عَفَّرَ- الشيءَ): شتەکەی سپیکردەوە.

(تَعافَرَ- الثَريدُ): تریتەکە سپیبوو.

(أَلعَفْراء): زەویی سپی.

(-مِـنَ لَيالـي القَمَر): شـەوانی سـیازدەی مانگەشەو.

٣-(عَفَّرَ- اللَّحمَ): گۆشـتەکەی لەسـەر لەو لەبەرخۆر وشککردەوە.

(عُفْـرَةُ و عُفُرَّةُ وعَفَـرَّةُ- الحَرِّ): ئەوپەڕی تیژیی گەرما.

(أَلعَفـير): گۆشـتی وشـککراوەی سـەر لی بەرهەتاو.

٤-(عَفَّرَ- الكَرْمَ ونَحْوَهُ): مێوەکە یان شـتی لـەو بابەتەی جـاری دووەم ڕنییەوەو هیچی پێوە نەهێشت.

(أَلعَفارَة) (عامية): میوەی پاشماوەی ڕنراو.

(أَلعَفَّار): دوارنینی ترێ‌و میوەیتر.

(أَلمُعافِر): کەسـێکە کـە لەگـەڵ هاوڕێیاندا دەروات کە شتێکی بدەنێ‌و چاکەیەکی لەگەڵدا بکەن.

٥-(إعْتَفَـرَ- الرَجُلَ): لـە پیاوەکە ڕاپەڕی‌و سواری سەریبوو دایبەزەویدا.

(-فُلانٌ): بەتواناو بەهێز بوو/ دەسـەڵاتدار بوو.

(-هُ الأَسَدُ): شێرەکە خواردی.

(أَلعُفْر): ١-ئازا/ دلێر ٢-ڕەق‌و توندوتیژ.

(اَلعِفْر= العُفْر): پیس‌و ناپاك.
(رَجُلٌ عِفرٌ): پیسه پیاو.
(رَجُلٌ عِفِــرٌ وعِفِرًى وعُفارِيَــة): پیاوێکی (ناپاك/ بۆگەن/ نالەبار/ تەڵەکەباز).
(اَلعُفْرَة والعَفْرَة- مِنَ الديك): پەڕی پشتملی کەڵەشێر.
(-مِنَ الإنسان): تووکی تەوقەسەری مرۆڤ.
(-مِنَ الأسَد): تووکی ملی شێر.
(اَلعَفــارَة): ناپاکیی‌و بۆگەنیــی‌و نالەباریی‌و تەڵەکەبازیی.
(اَلعِفريَّــة): زۆرزانێکی تەڵەکەباز/ بە پێچ‌و پەناو ناراست ٢-ناپاکێکی بۆگەن.
(اَلعِفريــة والعِفْراة- مِنَ الديك): پەڕی ملی کەڵەشێر.
(-مِنَ الإنسان): تووکی پشتملی مرۆڤ.
(«جاء نافِشــاً عِفرِيَتَهُ»): هات تووکەســەر بوو/ تووڕە بوو/ خۆی فشکردبووەوە.
(اَلعِفِرِّين): ١-پیاوی تەواوی بەهێز ٢-کاربردەو کارسازی زۆرزان.
(عِفِرِّينُ): لانە شێر.
(لَيثُ عِفِرِّين): شێری لانە.
٦-(اَلعُفْر): دووریی‌و سەردەمێکی درێژ.
(اَلعُفُرَّة): خەڵکی هەرچی‌و پەرچی.
(عَفُرَّةُ- البَرد): ئەوپەڕی سۆڵەو سەرما.
(اَلعَفَار الواحِدَةُ عَفارَة): ١-ئارد، دەرمانی/ نانی بۆنخۆشــکردنی تێکەڵنەکرێت ٢-(ن) دارێکە پەلەپیتکەی تفەنگی لێدروستدەکرێت.
(اَلعَفَّار): هەڵاڵەوەشێنی دارخورما.
(خُبزٌ عَفيرٌ): نانی بێدەرمانی نان.
(اَلعَفيرَة): گووخلێنکەی ڤالۆنچە ڕەشە.
٧-(تَعَفْرَتَ): بــوو بە دێو/ خۆیکرد بە دێو/ کەڵەکبازو زۆرزانبوو.
(اَلعِفريــت (ج) عَفاريــت (م) عِفريتَــة): ١-کەڵەکبــازی زۆرزانــی ناپــاك/ دێوڕەفتــار ٢-شەیتان جنۆکە. کاربردەو زۆرزان کەڵەکباز چ مرۆڤ چ جنۆکەو شەیتانبێت.
٨-(عَفْرَسَ-هُ): دایبەزەویداو سواری سەریبوو بەزاندی.
(اَلعِفرس والعِفْريس والعِفْراس والعُفرُوس والعَفَرْنَس) (ح): شێر.
(اَلعَفاريس) (ح): وشترمرخەکان.
عفس: (عَفَــسَ-هُ عَفسـاً): ١ دایبەزەویداو ســواریبوو ٢-بــە خۆڵەکەیــەوە نووســاند ٣-ڕایکێشاو بە زۆر بەکێشیکردە سەرزەوی.
(-هُ برجلِهِ): دواوەی دایە بەرشەق.
(عافَــسَ-هُ): ١-زۆرانبازیــی لەگەڵــدا کــرد ٢-چارەسەریکرد.
(«بــاتَ يُعافِسُ الأمــورَ»): مایەوە خەریکی چارەسەری کارەکانبوو.
(تَعافَــسَ واعْتَفَــسَ- القَــومُ): خوێشــگەل کەوتنە زۆرانبازیی‌و تل بەیەکدان‌و ململانێ.
٢-(عَفَسَ-هُ عَن حاجَتِهِ. عَفْساً): دەستی بە

رویەوە ناو داواکەی (شکاند/ نەدایە).
(-الماشِـيَةَ): ئاژەڵەکـەی بێناڵـەو لـەوەڕ بەندکرد.
٢-(إنْعَفَسَ- فِي التُّرابِ): لەخۆڵەوە چوو.
(-فِي المـاءِ): چـووە ناو ئاوەکـەوە/ خۆی بە ئاوەکەدا کردو خۆی نوقومکرد.
(ألعِفاس): گەندەڵیی.
عفش: (عَفَشَ- الشـيءَ عَفْشـاً): شتەکەی کۆکردەوە.
(ألعَفْـش) (مـص) (عند العامة): شـڕکەو پڕکەی ماڵ.
(شـيءٌ عَفْشٌ نَفْشٌ): شتێکە شڕکەو پڕکەی بێکەڵکی ماڵ/ شتی بێکەڵك.
(ألعُفاشَة): خەڵکی بێفەڕو بێکەڵك.
(ألأَعْفَش= الأَعْفَش= الأَعْمَش): چاوکز.
عفـص: ١-(عَفَصَ-ە. عَفْصـاً): هەڵیکەند/ لەبنیدەرهێنا.
(-حَقَّهُ مِنهُ): مافەکەی لێسەندەوە.
٢-(عَفَصَ- الرَجُـلَ. عَفْصاً): لە زۆرانەکەدا شلکوتی گیانیکردو پەرێشانیکرد.
(عافَصَ-ەُ): زۆرانی لەگەڵدا گرت.
٣-(عَفَصَ-ە. عَفْصاً): نوشتانیەوەو لوولیدا.
(عَفَـصَ وأَعْفَـصَ- القـارورَةَ): سـەری سوراحییەکەی بە چەرمێك نایەوەو توندیکرد یان سەری قەپاتکرد.
(ألعِفاص): چەرمێکە سـەری سوراحییەکەی پێ قەپاتدەکرێت یان سـەری پێ دەنرێتەوە/ دەمەوانە/ دەمەڵبێن/ تۆپەوانە/ قەپاخ.
٤-(عَفَّصَ- الثَـوبَ): بەرگەکـەی بە مازوو ڕەنگکرد.
(أعْفَصَ- الحِبرَ): مازوویکردە مەرەکەبەکەوە.
(ألعَفْص الواحِـدَةَ عَفْصَة): مازوو. بە هۆی جـۆرە مۆریچەیەکـەوە دەرپۆقینێـك لـە درەختی بەڕوو یان لە داریتڕدا پەیدادەبێتو مۆریچەکـە گەرای خۆی تێـدا دادەنێت ئەوە گەورە دەبێـتو دەبێتە مـازوو. لەو مازووە ڕەنگو مەرەکەبی لێدروستدەکرێت.
(ألعَفْــص) (ن): دارمازوو. درەختێکە لە زۆر لاوە هەیە لە لوبنانو سوریەو ئەو ناوچانەی دەوروپشـتیان، لە کۆمەڵەی بەڕووە جۆرێکە لە درەختی بەڕوو.
(ألعَفصِيَّة) (ن): سەرووە مازوو درەختێکەن لە سـەروو دەچێت لە کۆمەڵـەی کاژە جوانە بـۆ ڕازاندنەوەو زوو گـەورە دەبێت زۆرجار دەکرێتە پەرژینو دەروێنرێت.
٥-(العَفِص): تفتو تاڵ.
(العُفوصَة): تفتو تاڵیی کە قووتدان لەگەڵیدا گراندەبێت.
عفـط: ١-(عَفَطَ-تِ العَنـزُ عَفْطاً وعَفيطاً وعَفطاناً): بزنەکە تری.
(-تِ الضَـأنُ): مەڕەکان پژمـینو ئەوەی لە لوتیاندا بوو دەریانپەڕاند.

(-الرَّاعِـي عَفْطـاً): شـوانەکە بەلێو جرتی لێدا.

(-بِغَنَمِهِ): وەك جرتلێدان شوانەکە دەنگی لە مەڕەکانکرد.

(العافِط (فا) والعَفِط): جرتلێدەر.

(العافِطَة): ١-مێی وشەی العافِط ٢-مەڕ.

(«مالَـهُ عافِطَـةُ ولا نافِطَة»): نـە مەڕی هەیەو نە بزن واتا: هیچی نییە.

٢-(عَفَـطَ- فُـلانٌ بِكَلامِـهِ. عَفْطـاً): لە قسەکردندا زمانی گرتی/ لاڵەپەتە بوو.

(ألعَفّـاط والعِفاطِيّ والعِفْطِـيّ): لاڵەپەتە/ زمانقورس یان یەکێك زمانەکەی پاك نەبێتو ئەو زمانە باش نەزانێت.

٣-(الأعْفَط): گەوج.

عفق: (عَفَـقَ- الرَجُل. عَفْقـاً): ١-پیاوەکە ونبوو/ دیارنەما ٢-خێرا بۆیدەرچوو.

(إنْعَفَـقَ- في حاجَتِهِ): بۆ پێداویسـتیەکەی چابوکانە بۆیچوو پەلەیکرد.

٢-(عَفَـقَ- الرَجُـلُ. عَفْقـاً): ١-بێهـوودەو پێویست هەر لە هاتوچۆدا بوو ٢-سەرخەوێکی شـکاندو هەسـتا پاشـان نوسـتەوە/ خەوی پچڕپچڕیکرد.

(عافَقَ- هُ مُعافَقَةً وعِفاقاً): فێڵی لێکرد/ لە خشتەیبرد/ هەڵیخەڵەتاند.

(-الذِئْـبُ الغَنَمَ): گورگەکە بە ناو مەڕەکاندا تەراتێنیکردو پەرشو بڵاویکردنەوە.

(أعْفَقَ): بێهودە هەر لە هاتوچۆدا بوو.

(رَجُـلٌ مِعْفاق الزِيـارَة): کابرایەکە هەر لە سەرداندایە هەر دێتو دەچێت.

٣-(عَفَـقَ-هُ عَنِ الأمرِ عَفْقـاً): لە کارەکەی لایداو نەیهێشت بیکات.

(-عَلَيهِ الصَيْدَ): نێچیرەکەی لێلاداو پێچی پێکردەوە.

(عَفَّقَ الغَنَمَ بَعْضَهـا عَن بَعْضٍ): کردنیەوە بە ناویەکدا پێچی پێکردنەوە.

(إعْتَفَقَ- الأسَدُ فَرِيسَتَهُ): شێرەکە پێچی بۆ نێچیرەکەی کردەوە.

(ألمُنعَفِـق): لـە ناوەکـە دوورەوە کەوتـوو/ لادەر.

٤-(عَفَقَ-هُ بِالسَوطِ): بە قامچی زۆری لێدا.

(-تِ الريـحُ الشَـيءَ): باکـە شـتەکەی زۆر شەکاندەوەو لێیدا.

(إعْتَفَـقَ- القَـومُ بِالسُـيوفِ): بە شمشـێر بەربوونە یەکتری/ لەیەکیاندا.

٥-(عَفَقَ- الحِمارُ. عَفْقاً): کەرەکە تڕی.

(ألعَفّاقَة): فوون/ بن.

٦-(عَفَقَ- الشيءَ. عَفقاً): شتەکەی کۆکردەوە.

(تَعَفَّـقَ- بِهِ): پەنای بۆ بـرد/ خۆی کوتایە پاڵی.

٧-(عَفَـقَ- العَمَـلَ. عَفْقـاً): کارەکەی باش دانەمەزراند.

عفك: (عَفَكَ- الكَلامَ. عَفْكاً): ناخاوتنەکەی

باش هەڵنەسەنگاندو ئامادە نەکرد.

(عَفِكَ. عَفَكاً وعَفْكاً): زۆر گەوجبوو.

(أَعْفَـك وعَفِـك وعَفيك (م) عَفْـكاء (ج) عُفْك): گەوجێکی تەواو گەوج.

(الأَعْفَك): نالەبار.

عفـن: ١-(عَفَنَ- اللَّحْمَ عَفناً): گۆشـتەکەی بۆگەنکرد.

(عَفِـنَ وتَعَفَّنَ- الشـيءُ. عَفَنـاً وعُفونَةً): ١-شـتەکە گەنـی/ بۆگەنبـوو/ بۆنیگـرت ٢-کەڕوویکرد.

(-اللَّحْمُ): گۆشتەکە بۆگەنبوو/ بۆنیکرد.

(عَفِن ومَعْفُون ومُعَفَّنٌ مُتَعَفِّنُ): بۆگەنبوو/ بۆنکردوو/ کەڕووگرتوو.

(عَفَّنَ- اللَّحْمَ): گۆشتەکەی بۆگەنکرد.

(«عَفَّـنَ الطَّعـامُ») (عامیـة): خواردنەکە ترشا/ تێکچوو/ بۆنیکرد.

(أَعْفَـنَ- الشـيءَ): شـتەکەی بـە بۆگـەن هاتەبەرچاوو زانی.

(ألعَفَن والعُفونَة):کەڕوو/ کەڕوویەکە بە چاو نابینرێت لەسـەر مادە ئەندامییەکان دەڕێ‌و گەشـەدەکات‌و بۆگەنیـدەکات لە سـەرەتای جەنگـی دووەمـدا مادەیەکیـان لێدەرهێنـا کـە میکرۆبـی نەخۆشـییەکانی دەفەوتاند لـەو کەڕوانـە پەنسـلین‌و کلۆرۆمایسـین‌و ستروپتۆمایسینیان لێدەرهێنا.

(ألأَمـراض العَفِنـة) (طـب): نەخۆشـییە بۆگەنـەکان ئەو نەخۆشـیانەن کـە بە هۆی میکرۆبەوە بڵاودەبنەوەو تەشەنە دەکەن.

٢-(عَفَـنَ- في الجَبَلِ عَفْناً): بە شـاخەکەدا سەرکەوت.

عفـا: ١-(عَفا- عَنـهُ ولَهُ ذَنْبَـهُ وعفا عَن ذَنْبِهِ): گوناهبار بوو لێیبورد/ لێیخۆشـبوو. لە گوناهەکەی خۆشبوو سزاینەدا.

(-اللهُ عَنه): خـودا لێیخۆشـبوو/ لێیبوردو گوناهەکانی سڕیەوە.

(-عَنِ الشيءِ): وازی لە شتەکە هێنا/ بەلایدا نەچوو.

(-عَنِ الحَقِّ): چاوپۆشـیی لـە مافەکە کرد/ دەستی لە مافەکە بەردا.

(- الصوفَ): خوریەکەی بڕییەوە.

(-تِ الريـحُ الأَثَـرَ أَوِ المَنـزِلَ): باکـە شـوێنەوارەکەی نەهێشـت‌و هەوارەکـەی/ ماڵەکەی تەفروتووناکرد/ نەیهێشت.

(-الأَثَـرُ أَو المَنـزِلُ. عَفْواً وَعفـاءً وعُفُوّاً): شـوێنەوارەکە یان ماڵەکە/ هەوارەکە لەگەڵ خاکدا تەختبوو نەما.

(-أَثَرُ فلان): شـوێنەواری فیسـار بڕا. واتا: مرد/ فەوتا.

(عَفَّى-تِ الريحُ المَنـزِل): باکە خانووەکەی تەختکردو شوێنەواری بڕی.

(-تِ العِلَّـةُ صاحِبَهـا): دەردەکـە دەرد گرتووەکەی فەوتاند.

(-على ماكانَ مِنــهُ):كاره خراپەكانى خۆى راستكردەوە.

(عافى- اللهُ فُلانــًا. مُعافاةً وعِفاءً وعافِيَةً): خودا نەخۆشيەكەى لەسەر لابردو چورتومو گرفتارى لێدرووخستەوە.

(أَعْـفــى- اللهُ فُـلانــاً. إعْـفــاءً): خـودا تەندروستيكرد/ خۆشيكردەوە.

(-المَـريــضُ):نـەخـۆشـەكـە خـۆشـبـووەوە/ چاكبووەوە.

(-هُ مِــن الأمــرِ):ئەنجامدانــى كارەكــە يا شتەكەى لێنەويست. لەسەرى لايبرد.

(-زَيداً بحَقِّهِ):مافەكەى زەيدى دايەوە.

(تَعَفَّى. تَعَفِّياً):فەوتاو نەما/ لەناوچوو.

(تَعافى. تَعافياً): خۆشـبووەوە/ تەندروست بووەوە.

(-الشــيءَ): شتەكەى بەجێهێشـت/ وازى لە شتەكە هێنا.

(إعْتَفى-تِ الإبِلُ اليَبيسَ):حوشترەكان بە لێو پووشەكانيان بە پوختى هەڵگرتو ماشيەوە.

(إسْــتَعْفى- تِ الإبِلُ اليَبيسَ):حوشــترەكان گيا وشكەكانيان بە پاكيى لە بن دەركێشا.

(-الرَجُل مُكَلِّفَهُ): لە راســپێرەكەى خواست كە لە ئەنجامدانى كارەكە بيبەخشێت.

(«إسْــتَعْفى مِنَ الخُروج فَأَعْفاهُ»):داوايكرد كــە وازى لێبهێنــن، ئيتر لێيگــەڕان/ وازيان لێهێنا.

(أَلعَفاء) (مص):١-خــۆڵ/ خاك/ گڵ ٢-باران ٣-شــوێنەوار بران‌و فەوتانى هەر شتێك بێت ٤-برانــى شــوێنەوارى شــارو دێو ئاوايــى ٥-مردن/ فەوتان.

(أَلعَفْــو) (مــص):خاكێكــى ئاوانەكــراوەو بێشوێنەوارى ئاوەدانى.

(أَلعَــافِي (فــا) (ج) عُفِــيّ):١-لێخۆشــبوو/ لێبوردوو ٢-پاشــماوەى فەوتــاوو تەختبوو/ شوێنەوارو كەلاوە.

(أَلعافيَــةُ (مــص) (ج) عافيــات وعَوافٍ): ١-تەندروستيى ٢-تەندروستبوون/ خۆشبوون.

(أَلعَفُــوُّ): ١-لەشســاغ/ تەندروســت ٢-زۆر (لێبوردوو/ لێخۆشبوو).

(«رجُلٌ عَفُــوٌّ عَنِ الذَّنــب»):پياوێكى زۆر لێبوردووە/ لە گوناح بوردووە.

(أَلعَفْوَة):خوێنوەرگرتن/ خوێنبايى.

٢-(عَفا- الشيءَ. عَفْواً):شتەكەى (زۆر كرد/ مشە كرد).

(-عليه في العِلْم):لە زانستدا لەو زانستتر بوو.

(-الشيءُ):شتەكە (زۆر بوو/ درێژەى كێشا).

(-تِ الأَرضُ):گيــاو رووەك رووى زەويەكەى داپۆشى.

(-عَفا وعَفى. يَعْفي الشَعَرَ. عَفياً):وازى لە قژەكە هێنا تا زۆر درێژ بوو.

(عَفَّى. تَعْفِيَةً):قژى زۆرو درێژ بوو.

(أَعْفــى- الشَــعَرَ إعفاءً):لە قژەكــە گەڕا تا

زۆرو درێژ بوو.
(«أَحْفــوا الشَــوارِبَ وأَعفــوا اللحــى»): سمێڵەکانتان بتاشنو ریشەکانتان بەربدەنەوە درێژ بێت.
(-الرَجُلُ): زۆر داراو دەوڵەمەند بوو.
(ألعِفــاء): ١-قــژی هەســتاوو درێــژ بوو ٢-پەری وشــترمرخ کاتێك زۆر دەبێت ٣-تووکی حوشتر.
(ألعافي (ج) عُفِيّ): قژ درێژ.
(ألعِفْوَة والعُفْوَة): قژی سەری پیاو.
٣-(عَفا- فُلاناً. عَفواً): چووە لای فیســار کە خێرێکی/ چاکەیەکی لێ دەستگیر بێت/ داوای چاکەیەکی لێکرد.
(أعفى- الرَجُلَ. إعفاءً): خێری دایە پیاوەکە/ پێیبەخشی.
(-الرَجُلُ): زیادەی سامانەکەی خۆی بەخشی یان خەرجکرد.
(إعْتَفــى- فُلانــاً إعْتِفاءً): هاتــە لای داوای چاکەیەکی لێکرد/ چاکەی لێخواست.
(ألعــافي (ج) عُفاة وعُفِــيّ وعافِيَة): هەموو داواکاری چاکەو خێرێك یان رۆژییەك.
(«كَثُرَت على الكَريم عافِيَتُهُ»): بەخشندەکە/ خێرخوازەکە ئەوانەی دەرۆزەیان لێدەکرد یان داوای خێرو چاکەیان لێدەکرد زۆر بوون.
(ألعافي): ١-ئــەوەی لە مەنجەڵە خوازراوەکەدا دەهێڵرێتــەوە وەك کرێو مزەی خواســتنی مەنجەڵەکە ٢-پێشەنگی کاروان یان سووسەکەر بۆ سوپا بۆ زانینی هەواڵی دوژمن ٣-قژ درێژو قژ زۆر ٤-میوان ٥-لێبوردوو.
(ألعافِيَــةُ (ج) عافِيــات وعَــوافٍ): هەمــو رۆژیویستێك/ رۆژی خوازێك.
(ألعَفْــو) (مــص): ١-چاکە/ خێــر/ پیاوەتی ٢-ناوێزەی شــت/ چاکترینو نایابترینی شتو خۆشترینی شت.
(-مِــنَ المــال): دارایــەك/ پارەیــەك کە لە خەرجــیو پێویســتی خــۆی پــتر دەبێتو دەیبەخشێتو پێوەی دیار نابێت.
(«أَعْطَيتُهُ عَفواً»): بێداواکردن پێمبەخشی.
(«فَعَلَــهُ عَفواً»): هەر لە خۆیــەوە بە دڵیدا هاتو ئەویکرد.
(ألعَفْــوَةُ و العُفْوَةُ): چەوریو کەف ســەری مەنجەڵو چێشت.
(ألعِفْوَةُ): ١-چەوریو کەف سەری مەنجەڵ.
(عِفْوَةُ الشيءِ): پوختەو ناوێزەی شت.
(عِفْــوَةُ الطَعــام والشــراب): هەڵبــژاردەو خۆشترین خواردنو خواردنەوە.
(ألعُفاوَة): ١-ئەوەی لە مەنجەڵە خوازراوەکەدا دەبرێت بــۆ خاوەن مەنجەڵەکــە ٢-چەوریی سەری مەنجەڵ.
(ألعِفــاوَة): ســەرچەورەکەی چێشــتەکە کە بــۆ کەســێك دەبرێت کــە رێــزی هەبێتو خۆشەویست بێت.

(ألعِفـاوَة والعَفـاوَة): چەوریـی سـەری مەنجەڵەکە.

(ألعَفوِيَّــة): کردنـی کارێك لە خـۆوە بەبێ پێوتن.

(ألمُعفيّ): کەسـێکە کـە هاورێیەتیت بکاتو هیچی لێتنەوێت/ چاوەڕێی هیچت نەبێت.

٤-(ألعَفاء): تانەی سەرچاو.

(ألعَفـا والعَفْــو والعِفْو والعُفْــو (ج) عِفاء وعَفْوَة) (ح): جاشەکەر.

(ألعَفْوَة (ج) عَفْو) (ح): جاشولکە مێچکە.

عقّ: (عَقَّ- الثوبَ. عَقّــاً): جلەکەی دادڕی/ هەڵتلیشاند.

(-تِ الريحُ المزنَ): باکە بارانی بە هەورەکەدا کرد وەك دابدڕێت/ بیقلیشێنێت.

(-تِ الدلوُ): دۆلکەکە/ سـەتڵەکە بە پڕیی لە بیرەکە هاتەدەرەوە.

(-الوَلَـدُ والِـدَهُ. عُقوقاً ومَعَقَّـةً): کوڕەکە سـپڵە دەرچوو. لە باوکی یاخیبــوو بەزەیی پێدانەهاتــەوەو چاکــەی لەگــەڵ نەکردو بە چاوی سووك تەماشایکرد.

(عَـقٌّ وعاقّ (ج) عَقَقَــة وأَعِقَّة): فرزەندی سپڵەو بێنەمەك کە لە دایكو باوك یاخیبێتو بە تەنگیانەوە نەیەت.

(عاقَّ- أَباهُ مُعاقَّةً): لە باوکی یاخیبوو/ لاسار بوو لەگەڵیدا نەگونجا/ سپڵە بوو.

(أَعَقَّ- فُلانٌ): فیسار لاساریکردو نافەرمانیکرد/ یاخیبوو/ سپڵەییکرد.

(-الكَرْمُ): مێوەکە لە بنەوە بەچەیدەرکرد.

(إنْعَقَّ): دووکەرتبوو/ لەتبوو.

(-الوادي): دۆڵەکە قووڵبوو.

(-الـغُــبـارُ): تـۆزەکـە هـەسـتـاو بـەری ئاسمانیکرد.

(-البَــرْقُ): برووسـکەکە لەنــاو هەورەکەوە دەرچوو/ هەورەکەیبڕی.

(إعْتَقَّ): هەڵقلیشا/ لەتبوو.

(السَّيفَ): شمشێرەکەی هەڵکێشا.

(ألعــاقّ (ج) عاقُّــون وعَقَقَــة وأَعِقَّــة (م) عاقَّــة (ج) عُواق وعاقَّات): ســەرپێچیکەرو نافەرمانــی دایكو بــاوك/ ســپڵە بەرامبەر دایكو باوك/ بەدنمەك.

(ألعِقَّــةُ (ج) عِقَق): مــووی هەموو کۆرپەو بەچکەیەکــی تــازەزاو (چونکــە پێســتەکە دەدرێنێتو دەردێت).

(ألعَقيق): مــووی هەموو تازە بوویەك کە لە سکی دایکیدا ئەو مووەی دەرکردبوو.

(- (ج) أَعِقَّــة): دۆڵو دەرەو هەمــوو چەمو شیوێکی کۆن کە لافاو دایدڕیبێت.

(ألعَقيقَــةُ): ١-مــووی هەمــوو تازەبوویەك ٢-ڕووبار ٣-مــەڕ کە بۆ حەوتەی تازەبوویەك سەردەبڕێت، کاتێك سەری دەتاشن.

(عِقانُ الكَرْمِ أَو النَخيل): بەچەی دەرهاتووی بن مێو یان دارخورما.

٢-(عَقَّ-تِ الفَرَسُ عُقَقـاً وعَقاقاً وعِقاقاً): مایینەکە ئاوسبوو.
(أُعَقَّ-تِ الفَرَسُ): مایینەکە ئاوسبوو.
(عَقُوق): مایینی ئاوس.
(ألعَقـوق مِـنَ الخَيلِ (ج) عُقـق و (جج) عِقاق): مایینی ئاوس یان مایینی نەزۆك.
٣-(إنْعَقَّ-تِ العُقْدَةُ): گرێکە توند بوو/ بووە بە گرێکوێرە.
٤-(إعْتَـقَّ- المُعْتَـذِرُ): عوزرخواهێنەرەکـە تەواو لە خـۆی بـووەوە/ عوزرخوایی زۆری هێنایەوە.
٥-(ألعَقّ والعَقَّةُ- مِن الماءِ): ئاوی تاڵ.
(ألعَقيق الواحِدَةُ عَقيقَة): یاقووتی سوور.
(ألعَقيقَةُ): ١ تووێشـەبەرە/ تووێشوودان ٢-ئەو تیرەی کـە لە پێـش ئیسـلامدا عەرەبەکان پێیانـدەوت تیری پاکانەکـردنو عوزرخوایی تیرەکە دەگیرایە ئاسـمان ئەگەر بە خوێنەوە بهاتایـە خـوارەوە ئـەوە دەبـوو خوێـن بە خوێنبێـت/ لـە بـری کوژراوەکـە بکوژەکە بکوژرایەتەوە ئەگەر تیرەکە بە پاکی بهاتایەتە خوارەوە ئەوە لە بری خوێن دەدراو ئاشـتیی دەگـیراو دەکراو دەسـت بەریشـدا دەهات کە ئەوە نیشانەی ئاشتییو ئاشتبوونەوە بوو.
٦-(عَقْعَـقَ- الطائِـرُ بِصَوتِـهِ. عَقعَقَـةً): باڵندەکە لەسەریەك دەیخوێند.
(ألعَقعَق) (ح): قەلەباچکە یان قەلەڕەشکە.

(ألقَعْـق) (عامية): قەلەباچکـە عەرەب بە بەدوومیان دادەنا.
عقب: (عَقَبَ- الرَجُلَ أَو مكانَ الرَجُلِ. عَقْباً وعُقُوباً): شوێنپێی پیاوەکەی هەڵگرت/ دوای پیاوەکە کەوت/ دوای ئەو هات یان سـۆراغی شوێنەکەیکرد.
(«عَقَبَ الشـيبُ»): سەرسـپێتی دوای سەر ڕەشی هات.
(عَقَّبَ-ه): بە دوای ئەودا هات یان دوایکەوت ٢-شتێکی لە دوای ئەو هێنا.
(عَقَّـبَ- في الأمرِ): بە گەرمییو دیسـانەوە دوای داخوازییەکەی کەوت.
(-الصَّـلاةَ): دوای نوێـژ بۆ نـزاو پاڕانەوە دانیشت یان بۆ پرسە بابەتێك.
(-الشَّـيبُ): سەرسـپێتیی دوای سـەر ڕەشی هات.
(-الحاكِـمُ على حُكـمِ سَـلَفِهِ): دادوەرەکە بڕیارێکـی جیـای لـە بڕیـاری دادوەری پێشوویدا.
(«عَقَّبَ على كَلامِهِ تَعقيباً»): تێهەڵکێشـی ئاخاوتنەکەیکرد سـا یا بەرپەرچیدایەوە یان پشتگیریکرد یان وەڵامیدایەوە.
(عاقَبَ-هُ مُعاقَبَةً): بە دوایدا هات/ دوای ئەو هات.
(-هُ في الراحِلَةِ): بە نۆرەو یەك لە دوای یەك سواربوون.

ڕوويانـــدا هيچ شــوێنێك ناهێڵنەوەو خويان وەك كوێر لە هيچ لايەك لانادەن).

(اَلعَمِيَّة والعَمايَة والعَماءَة): ١-خۆدانە دەست هەواو هەوەس‌و گومڕابــوون ٢-كەللەڕەقيى/ لاساريى.

(اَلعُمِيَّــة): ١-شــوێن هەواو هەوەســكەوتن‌و گومڕابوون ٢-كەللەڕەقيكردن/ لاساريى.

(اَلعِمِيَّــة): ١-گومڕابوون لە ڕێـــلادان ٢-فيز/ ترزلى/ غەڕابوون/ لەخۆبايبوون.

(اَلمَعْمِيَــة (ج) المَعامــي): شــوێنى نەزانراو/ نەدۆزراوە.

(اَلمُعَمَّــى (مفع) مِن الــكَلام): ئاخاوتنى واتا ون/ مەتەڵ/ ناديار.

٢-(إعْتَمــى- الشــيءَ. إعتِمــاءً): شــتەكەى هەڵبژاردو بۆيچوو/ نيازيبوو.

عن: (عَــنْ): ١-پيتــى لادانە لــە عەرەبيداو بەم واتايانە دێــت: (اَلمُجاوَزَة): ١-لێتێپەڕين‌و خۆلادان.

(«تَرَحَّل عن مَكانٍ فيه ضَيْم»): لە شوێنێك تێپەڕەو بڕۆ كە زۆرداريى تێدابێت.

٢-(اَلبَــدَل): لەبــرى: لاتَجْــزى نَفــسٌ عَن نَفسٍ شَــيْئاً): كەسێك لە برى كەسێكيتر سزا وەرناگرێت.

٣-(اَلتَعليل): هۆپيشاندان.

(«مافَعَلَ إلاَّ عَن إضطِرارٍ»): ئەوەى نەدەكرد لە ناچاريدا نەبێت.

٤-(بَعد): پاش/ لە پاش.

(عَن قَليلٍ ترى): پاش تۆزێكيتر دەيبينيت.

٥-(الأَستِعلاء= مِن): لە

أَحْبَبــتُ الإحســانَ إلى الفُقَــراء عَــن كَثْرَةِ الصلاة): خێركردنم بە هــەژاران لە نوێژى زۆرم پێخۆشتر بوو.

٦-(مرادِفَة)الباء): هاو واتاى (ب).

(«مايَنطِــق عَــن الهــوى»): بە ئــارەزوو و هەوەس نافەرموێت.

٢-(عَن اسم بِمَعْنى جانِب ويَدخُلها حينَئِذٍ حرف جــر مِن): پيتــى (جَــر) (عن) كە (مِن)ى چووە سەر بە واتاى لە تەنشت دێت.

(جَلَس مِن عَن يَســار الخَليفة): لە تەنشتى چەپى خەليفەوە دانيشت.

عَنّ: ١-(عَنَّ- لَهُ الشيءُ عَنّاً وعَنناً وعُنُوناً): شتێك هاتە بەردەمى‌و ڕێى لێگرت.

(-عَنَّ الشيءَ): خۆى لە شتەكە لادا/ ڕووى لە شتەكە وەرگێڕا.

(-فُلاناً): جنێوى بە فيساردا.

(-اللجامَ): قايشى بۆ لغاوەكە كرد/ هەوسارى بۆ كرد/ جڵەوى بۆ كرد.

(-الفَــرَسَ): هەوســارەكەى/ جڵەوەكــەى ئەسپەكەى ڕاكێشاو ڕايگرت.

(عَنَّنَ اللجامَ): قايش‌و هەوســارى بۆ لغاوەكە كرد، جڵەوى بۆ كرد.

(عانَّ-هُ مُعانَّةً وعِناناً): بەرهەڵستيكرد.

(أَعَنَّ- اللِّجامَ):(هەوساری/ جڵەوی/ ڕەشمەی) بۆ لغاوەکە کرد.
(-الفَـرَسَ): چارەوێکـەی بـە هەوسـارەکە ڕاگرت.
(إعْتَنَّ- لَهُ الشَـيءُ): شتەکەی بۆ دەرکەوت و بەری ڕێگەی لێگرت.
(ألعــان) (فــا):١-(پــەت/ گوریــس)ی درێژ ٢-هەوری بەری ئاسمان گرتوو.
(ألعانَّة):١-مێی وشەی (ألعان) ٢-هەور.
(ألعَنَن): دەرکەوتن و بەرلێگرتن.
(ألعُنَّــةُ (ج) عُنَــن): ١-پــەت/ گوریــس ٢-گەوڕی حوشــتر و ئەسپ کە بە تەختەو دار دروستبکرێت.
(ألعَنان): هەور.
(عَنانُ — الدارِ): تەنشتی خانوو.
(العَنانَةُ): هەور.
(عَنــانُ السَّــماءِ): قووڵایــی ئاســمان/ گەر تەماشای بکەیت.
(ألعِنان) (مص): دەرکەوتن.
(- (ج) أعِنَّــة وعُنُن): قایشــی لغاو/ جڵەو/ هەوســار (بۆیە وا ناونــراوە چونکە نایەڵێت ولاخەکە سەرپێچی بکات):
(«ذَلَّ عِنانُهُ»): ملیدا/ سەری شۆڕکرد.
(«هُما يَجرِيانِ في عَنانٍ»): بە پێی جڵەوێك دەڕۆن واتــا لە چاکەو پیاوەتی یان شــتیتردا یەکسانن.

(هوَ قَصيرُ العنان): کەمچاکەیە/ کەمفەڕە.
(«رَجُـلٌ طَويـلُ العِنــان»): پیاوێکــە خێرەومەندەو خانەدان و جوامێرە.
(«رَجُلٌ أبيُّ العَنان»): پیاوێکی فیرسچمەیە/ لاسارە/ ملنەدەرە.
(«إمْتَلأَ عِنانُهُ»): ئەوپەڕی ڕەنجیدا.
(«جرى الفَرَسُ عِناناً»): ئەسپەکە سووڕێك غاریکرد.
(«كَبــا الفَرَسُ في عِنانِهِ»): لە ســوورەکەیدا هەڵنووت و دواکەوت.
(«أرْخِ مِن عِنانِهِ»): جڵەوی بۆ شلبکە.
(شِرکَةُ العِنانِ): هاوبەشییەکی دووکەسە کە لەسەر ئەوە ڕێکبکەون کە هەریەکەیان شتێك لە داراکەی بخاتە هاوبەشییەوەو داراکەیتریان بۆ خۆیان بمێنێتەوە.
(«عَناناكَ أن تَفعَلَ كذا»): ئەوپەڕی کۆشش و ڕەنج و ئامانجت ئەوە بێت کە ئەوە بکەیت.
(ألعَنَّان): هەمیشە پێشکەوتوو.
(ألأعْنان): ئەملاولای درەخت.
(أعْنانُ السماءِ): ئەملاولای ئاسمان.
(ألمِعَنّ (م) مِعَنَّة):١-هەڵمەتە کاسە/ کەسێکە کە لــە خۆیەوەو لــە شــتێکدا هەڵبداتێ کە پەیوەندیی بەوەوە نەبێت ٢-وتاربێژ.
(ألمَعْنون): شێت/ تێکچوو.
٢-(عَنَّ وعَنَّنَ- الكِتابَ. عَنّاً وعَنَناً وعُنُوناً): پێشەکیی کتێبەکەی نووسی.

(«عَنَّيتُ الكتابَ»): ناونیشانم بۆ کتێبەکەی نووسی.
٣-(اَلعُنَّة (ج) عُنَن): سێپا کە مەنجەڵی لەسەر دادەنێن/ ئەوەی مەنجەڵی لەسەر دادەنێن.
٤-(عَنْعَنَ. عَنْعَنَةً): لە قسەکەیدا (ئە) بە (ع) دەردەبڕێت. ئەم جۆرە گۆڕینی دەنگی پیتە لە (بنی تَميم) دا هەبوو دەیانوت: (يُعجِبُني عَن تَفعل) لە بری (أَن تَفعَل) لە هی ڕەشە خەڵکەکەیشدا هەیە دەڵێن: (عَنَّ المريضُ) لە بری: (أَنَّ المريضُ): واتە نەخۆشەکە ناڵاندی أَلعَنين= الأَنين: ناڵە.
(-عَنْعَنَ- الراوي): گێڕەرەوەکە لە گێڕانەوەی قسەکاندا دەڵێت: (روى فُلانُ عن فلان عَن فُلان عن فُلان): فیسار کەس لەوەوە لەوەوە لەوەوە. واتا (عَن) زۆر دەڵێتەوە.
عنب: ١-(عَنَّبَ- الكَرْمُ): مێوەکە ترێیگرت.
(العِنَب) (ز): بەری مێو کە پێگەیشت یان سپی یان ڕەش یان ئاڵ دەبێت کە بە تەڕی دەخورێت یان دەکرێت بە شەراب و ترشیات و هەندێك مرەباو یان وشکدەکرێتەوە دەبێتە مێژو دەخورێت.
(عِنَبُ الثَعْلَب) (ن): ڕەزلە.
(عِنَبُ الحَيَّةِ): تری مارانە: ڕووەکێکی گیاییە لە شوێنە بەیارەکاندا دەڕوێت و لەناو دارستاندا گوڵەکەی شێوە هێشووە سپیی مەیلەو سەوزەو کەڵکی پزیشکیی هەیە.

(عِنَبُ الدُب): تری ورچە ڕووەکێکە لە ناوچە شۆرەکاتەکاندا دەڕوێت مازوو دەگرێت بۆ خۆشکردنی پێستەو دژی سکچوون بەکاردێت بەرەکەی ڕەشە یان سوورە لە تری دەچێت و ورچ دەیخوات.
(اَلعِنَبِيَّة) (ز): ترێۆکە بەرێکی گۆشتینە دەم ناکاتەوە ناوکی گەورەی تێدا نییە تۆوی وردی تێدایە وەك تری و کشمیش.
(اَلعِنَبِيَّة) (ن): تریی شینکە دەوەنێکە بەرەکەی وەك دەنکە ترێیەکی بچووك وایە ڕەنگەکەی ڕەش و مەیلەو شینەو تامی خۆشە لە بێشەڵانەکانی ئەورووپاو ئەمەریکادا هەیە لە وڵاتانی ناوەندو دەریای سپی ناوەڕاستدا نییە.
(اَلعُنَّاب: الواحِدَةُ عُنَّابَة): درەختێکە درکاوی لە کۆمەڵەی گوێژە بەرەکەی وەك هی زەیتونە باشترینیان سوورە شیرینەکەیەتی. دەخورێت و بۆ دەرمانیش بەکاردێت لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا دەچێنرێت و لە دەرەوەی خۆرهەڵاتیش دەروێنرێت.
(اَلعَنَّاب): ترێفرۆش.
٢-(اَلعُناب والأَعْنَب): لووتزل/ لووتن.
٣-(عَنْبَرَ- الشيءَ): بە عەنبەر بۆنی شتەکەی خۆشکرد.
(اَلعَنْبَر): ١-بۆنێکی خۆشە/ شابۆن ٢-(ن) زەعفەران.

(أَلعَنْبَــر (ج) عَنابِر): ١ـعەمــاری دانەوێڵە ٢ـ(ح) نەهەنگێکــە کە درێژییەکەی لەوانەیە بگاتە (٦٠) پێو سەری زۆر گەورەیەو دانداره بە پێچەوانەی نەهەنگی (بال)ە.

(عَنبرُ الشتاءِ وعَنَبَرتُهُ): ئەوپەڕی سەختیی و سۆڵەی زستان.

(أَلعَنْبَــرِيُّ): خواردنەوەی/ شــەربەتی بۆنی خۆشدراو/ عەنبەراوی.

عنــت: ١-(عَنِتَ. عَنَتــاً): ١ـکەوتە تەنگانەو نارەحەتییــەوە/ تووشــی گێرمــەو کێشــمە بــوو ٢-(گرفتــاری/ گیرۆدەی) ســەختیبوو/ فەوتانبوو.

(عَنَّــتَ-هُ): ناچــارو گــیرۆدەی کارێکــی وا گرانیکــرد کــە پێیهەڵنەســتێت و بەرگــەی نەگرێت.

(-فِي الجَبَلِ): سەرکەوتە سەر شاخەکە.

(أَعْنَتَ- الراكِبُ الدابَّةَ): ســوارەکە وا خراپ وڵاخەکەی شەکەتکرد کە بەرگەی نەگرێت.

(-الرَجُلَ): پیاوەکەی بــە فەتارمتێکی وادادا کە بەرگەی نەگرێت و بە فەوتانیدا.

(تَعَنَّــتَ-هُ): ١ـتووشــی ئازاریکــرد/ ســزای پێنۆشی ٢ ویستی زەبوون و پەرێشانی بکات.

(-الرَجُــلَ وعَلَيــهِ فِي السُّـؤال): ویســتی بە پرســیاری گــران گێــژی بکات و ســەری لێبسێنێت.

(أَلعَنُوت): گردێك كە سەرکەوتنی گرانبێت.

(أَلْمُتَعَنِّت): ڕقاوی/ لاسار/ ڤیرسیچمە.

(إرضاءُ المُتَعَنِّت صَعــبٌ): قایلکردنی مرۆڤی ڕقاوی/ ڤیرسیچمە، گرانە.

٢-(عَنِتَ. عَنَتاً): تووشی گوناهبوو.

(-الشيءُ): شتەکە (گەنبوو/ تێکچوو).

(-العَظمُ): ئێسقانە پەیوەتسبووەکە دووبارە شلبوو شکایەوە.

(عَنِــت): ئێســقانی پەیوەســتبووی دووبارە شکاوە.

(عَنَّتَ- الشــيءُ العَظْمَ المَجبورَ): شتەکە بەر ئێسقانە پەیوەستەکە کەوت و شکاندیەوە.

(أَعْنَــتَ- الجابِرُ الكَسِــيرَ): ئێســکگرەوەکە نەیتوانــی بــاش ئێســقانەکە بگرێتــەوەو پەیوەست بکاتەوە ئێسقانەکە خراپتر بوو.

٣-(عَنْتَرَ. عَنْتَرَةً): لە جەنگدا ئازا بوو.

(-هُ بالرمح): نێزەی پێداکرد.

(-العُنتُرُ): مێشە سەوزەکە ویزەویزیکرد.

(أَلعَنْتَــر والعُنْتُر والعُنْتَــر) (ح): مێش یان مێشی سەوز.

(عَنتَرَة) (ح): مێشێکی سەوز.

(عَنتَرَةُ العبســی): پاڵەوانی پێش ئیســلام بە ناوی ئەو مێشــەوە ناونــراوەو یەکێکە لە خاوەن (مُعَلَّقات) و کراوە بە نموونەی هێزو ئازایەتی و ڕەوشتبەرزیی.

عنث: (أَلعَنَثَــةُ والعُنْثَةُ والعِنْثَةُ (ج) عِناث والعَنْثُوَةُ والعُنثُوَةُ (ج) أَلعَنائِي): گیای وشکی

ڕەشەوەبوو بە تایبەتی ڕزیوو کۆن.

عنــج: ١-(عَنَجَ وعَنَّــجَ- الشــيءَ. عَنْجاً): شتەکەی ڕاکێشا/ بەکێشکرد.

(-الدَلــوَ): دۆلکەکەی بە پەتێــك لە بنیەوە قایمکرد.

(ألعِنــاج (ج) أعْنِجَــة وعُنُــج): ١-ئــازاری بربرشــەی پشــت ٢-پەتێکە بە بنیو دامێنی دۆلکە گەورەکەوە قایم دەکرێت.

٢-(عَنْجَرَ. عَنجَرَةً): لچو لێوی هەڵگێڕایەوەو هاواریکرد/ دەنگی پێکرد.

عنــد: ١-(عَنَــدَ- عَــن أصْحابهِ عُنُــوداً): لــە گوزەرەکــەدا هاوڕێکانــی بەجێهێشــتو ڕێیەکیتری گرتەبەر یان لێیان دواکەوت.

(عَنَــدَ وعَنِــدَ وعَنُــدَ- عَــنِ الطَريــقِ أو القَصــدِ. عُنُوداً): لە ڕێگەکــە یان نیازەکەی پێچیکردەوە/ لایدا.

(-الرَجُلُ): لە ڕاستیو هەق لایدا هەرچەندە دەیشیزانی کامەیە.

(عَنيد (ج) عُنُد): لە ڕاستیو هەق لادەر.

(-العِــرقُ): خوێنــی دەمــاری بەربــوو نەوەستایەوە.

(عانَدَ-هُ. مُعانَدَةً وعِناداً): ڕقەرەبەرایەتیی لەگەڵدا کردو لێیجیابووەوەو بەرهەڵستییکرد.

(أعْنَدَ- فُلاناً): بەرهەڵستی فیساریکرد.

(-العِرقُ): دەمارەکە خوێنی لەبەر ڕۆیشــتو نەگیرسایەوە.یەوە.

(تعانَــدَ- القَــومُ): سەرســەختیان لەگــەڵ یەککردو بەرهەڵستیی یەکیانکرد.

(إسْتَعْنَدَ- الفَرسُ): ئەسپەکە سەرکێشیکردو جڵەوگیر نەبوو سوارەکەی هەڵگرت.

(-هُ القَيءُ): هێڵنجو ڕشــانەوە بەسەریدا زاڵ بوو و ڕشایەوە.

(ألعانِــد (فــا) (ج) عُنَّد وعَوانِد): لاســار/ قیرسیچمە/ سەرسەخت/ لە ئامانج لادەر.

(دَمٌ عانِد): خوێنێکی نەوەستاو.

(«طَعَنَــهُ طَعْناً عانِداً»): بەڕاســتو چەپدا پیایدا کردو لێیدا.

(ألعُنْد والعِنْد والعَنْد): لا/ کەنار.

(ألعَنَد): تەنشت.

(«هــوَ يَمشــي وسَــطاً لا عَنَــداً»): ئەو لە ناوەڕاســتەوە دەڕوات نــەك لە (تەنشــتەوە/ لەلاوە).

(ألعِنادِيُّ): شــوێنکەوتووی ڕێڕەوی عِنادِي/ سەهەندەیی.

(ألعِنادِيَّــة أو المِثالِيَّــة): ســەهەندەیی/ سەرســەختیی/ ڕێڕەوی ئەوانەیە کە بڕوایان بــە ڕاســتیی شــتەکان نییــەو دەڵێــن ئەوە ســەوداو ئەندێشــەو خەیاڵــنو وەك نیگارو وێنەی ســەرئاونو زانیاری هی بەرچاوگرتنە (ئایدیالیسمە)/ هێنانە بەرچاوە.

(ألعَنُــود (ج) عُنُد): لــە ئامانجو نیازلادەر/ لاسار/ قیرسیچمە.

(سَحابَةٌ عَنودٌ): هەورێکە لاسارە لە باران بارین ناوەستێتو لاناچێت.

(عَقَبَةٌ عَنُود): (کۆسپێکی/ ناستەنگێکی/ تەگەرەیەکی) سەخت.

(رَجُلٌ عَنُود): پیاوێکی سەهەندەیە/ لاسارە/ قیرسیچمەیە/ سەرسەختە/ کارکردەیە بە تەنیا، نایەوێت کەسی لەگەڵدا بێت.

٢-(عانَدَ- الشيءَ. مُعانَدَةً وعِناداً): بە شتەکەوە لکاو لێینەبووەوە.

(-الرَّجُلَ): وەك پیاوەکەیکرد.

(إسْتَعْنَدَ- فُلاناً): نیازی فیساریکرد.

٣-(عِنْدَ): ١-(بۆ شوێن) لەلا/ لا.

(وَقَفتُ عِندَ البابِ): (لای/ لەلای) دەرگاوە وەستام ٢-(بۆ کات): لە کات.

(سافرتُ عِنْدَ مَغيب الشمس): لە کاتی خۆرئاوابووندا گوزارەکرد (هەمیشە بۆ ئاوڵفرمانو کاتە یان (مِن)ی دەچێتە پێش.

(«أتَيتُ مِن عِندِهِ»): لەلای ئەوەوە هاتم. ڕەشە خەڵکەکە دەڵێن: («ذَهَبتُ إلى عِندِهِ»): ڕاستیەکەی نەوەیە بڵێیت.

(ذَهَبتُ إلَيهِ): چووم بۆ لای.

(ألعِنْد): دڵو شتی بەجێ.

٤-(عَنْدَرَ- المَطَرُ): باران توندیکرد.

٥-(عَنْدَلَ- الهَزارُ. عَنْدَلَةً): بلبلەکە خوێندی.

(العَندَليب (ج) عَنادِل) (ح): بلبل بالندەیەکی بچووکی دەنگخۆشە.

٦-(العَنْدَم= دَمُ الأخَوَين= ألبَقَم): درەختی ئەژدیها درەختێکی درکاوییە لە دارەکەی ڕەنگدەگیرێت.

عنز: ١-(عَنَزَ-ەُ عَنْزاً): بە نەقیزە تێوەیژەند/ نەقیزەی پێداکرد.

(ألعَنَزَةُ (ج) عَنَز وعَنَزات): نەقیزە. داردەستێکە بزمارێك بە خوارەوەکەیەتی.

(عَنَزَةُ الفَأس): دەمی تەور.

(ألعَنُوز والعَنيز): تووشبووی (وەیەك/ بەلایەك).

٢-(عَنَزَ واعْتَنَزَ واسْتَعْنَزَ- عَنهُ. عَنْزاً): خۆی لێلاداو بەلایەکدا داپەری.

(أعْنَزَ- الشيءَ): شتەکەی (خوارکردەوە/ لارکردەوە/ لادا).

(تَعَنَّزَ): لە خەڵك دوورکەوتەوەو تەریکبوو.

٣-(ألعَنْز (ج) عِناز و أعْنُز وعُنُوز) (ح): ١-بزن ٢-(ح)مێچێرگو مێواشە و مێناسكو بزنەکێویی.

(ألعَنْزَةُ) (ح): بزن.

٤-(ألعَنزُوقَةُ) (عند العامة): چەرخوفەلەك/ جۆلانە/ دیلانێ.

عنس: ١-عَنَسَ- العُودَ عَنساً): چێوەکەی نوشتانەوەو خواریکردەوە.

(أعْنَسَ- الشيءَ): شتەکەی گۆڕی.

(«فُلان لَم تَعْنُسْ أو لَم تَعْنِس السِنُّ وَجْهَهُ»): فیسار تەمەن بە ڕوویەوە دیار نییەو نەیگۆڕیوە.

(-الشيبُ وَجْهَهُ): پیرێتی ڕووی تێکداو پێوەی دیاره/ ڕووی گۆڕیوه.

٢-(عَنَسَ-تِ الجارِيَةُ عُنُوساً وعِناساً): کچەکه به کچێنیی له ماڵی باوکیدا مایەوەو شووینەکرد.

(عانِس (ج) عَوانِس وعُنْس وعُنَّس وعُنُوس): کچی شووینەکردوو/ قەیره کچ.

(عَنَسَ- الرَجُلُ): پیاوەکه پیر بوو ژنی نەهێنا/ بەڕەبەنیی مایەوه.

(عانِس): پیاوی ڕەبەن.

(عَنِسَ-تِ الجارِيَةُ- عُنُوساً وعِناساً): کچەکه هەر شووینەکرد.

(عَنَّسَ- تِ الجارِيَةُ): کچەکه بوو به قەیره کچو هەر شووینەکرد.

(عَنَّسَ- الجارِيَةَ أَهْلُها): کەسوکاری کچەکه کچەکەیان به کچیی هێشتەوەو بەشوویان نەدا.

(مُعَنَّسَة (ج) مُعَنَّسات ومَعانِس): کچی بەشووندراو قەیرەکچ.

(عُنِّسَ وأَعْنَسَ-تِ الجارِيَةُ): کچەکه به مێرد نەدراو به کچیی هێڵرایەوه.

٣-(عَنِسَ- عَنَساً): هەر ساته ساتێك تەماشای ئاوێنەی کرد.

(ألعِناس (ج) عُنُس): ئاوێنه.

٤-(ألعَنس (ج) عِناس وعُنُوس) (ح): ١-داڵ ٢-مێحوشتری بەهێز.

عنش: (عَنَشَ- العُودَ. عَنْشاً): چێوەکەی چەماندەوه.

(-الرَجُلَ): پیاوەکەی هەراسانکردو تووڕەیکرد.

(عانَشَ-هُ مُعانَشَةً وعِناشاً): ١-له جەنگدا دەستیکردە ملیو باوەشی پێداکرد ٢-شانازیان به یەك کرد.

(تَعَنَّشَ- المالَ): به هەموو جۆرێكو له هەموو لایەك سامانی گردکردەوه/ پێکیەوەنا.

(تَعانَشا): دەستیانکردە ملی یەك.

(إعْتَنَشَ-هُ): ١-له جەنگدا باوەشی پێداکردو دەستی کردە ملی ٢-ستەمی لێکرد.

(ألأَعْنَش): مرۆڤی شەشپەنجه.

عنص: ١-(العُنْصُر والعُنْصَر (ج) عَناصِر): ١-توخم/ ڕەگەز/ نەژاد/ ڕەسەن/ بنەڕەت/ ڕیشه/ بنەچه.

(«أَنَهُ لَكَريمُ العُنصُر»): نەژادپاکەو به ڕەسەنه ٢-خانەدانییو گەورەیی باووباپیر ٣-پەرۆشخواستیی ٤-پێداویستی ٥-زۆرزانو بەفرتو فێڵ ٦-ماده ٧-تەنی ساده.

(العُنْصُر الكهربائي) (ف): ئەندامی کارەبایی (شانه یان پیل) دینەمۆیەکی کارەباییه که تەزووەکەی له کارلێکردنی کیمیاییەوه سەرچاوه دەگرێت وەك ئەوانەی بەکاردێت له لایتی کارەبایی دەستو ڕادیۆی ترانستەرو کاتژمێرو موبایل.

(العناصر عند القدماء كانت اربعة) توخمەکان

لەلای پێشــینان چواربوون: ئاگرو هەواو ئاوو خــاك/ خــۆڵ دەیشــوترێت (اَلأسْطقسّــات) و(العُنصُريّ): مادەبنچینەییەکان بنەچەیی/ توخمی/ ریشەیی.

(جِسمٌ عُنْصُري): تەنێکی سادە.

(العُنصُريّ): رەگەزپەرست/ رەگەزخواز.

(اَلعُنْصُرِيَّة): رەگەزخوازیی/ رەگەزپەرستیی/ (راسیسم).

(عیــدُ العَنْصَــرَة): جەژنــی یــادی چوونی گیانــی پــیرۆز بۆ نــاو لاشــەی قوتابیەکانی حەزرەتی عیســا کــە پاش پەنجــا رۆژ دوای جەژنی قوربانــی گاورەکان دەبێــت ٢.لەلای جوولەکەکان جەژنی یادگاری هاتنەخوارەوەی شــەرعەتی ئاینی جوولەکە لە توری ســینادا (وشــەکە جوولەکانەیە واتاکــەی کۆبوونەوە یان ئەنجومەن دەگەیەنێت).

٢-(اَلعُنصَل) (ن): پیازە مارانە/ قورالە جۆرە گوڵێکە لە کۆمەڵــەی زەمبەقە. لە ئەوروپاو ئاســیاو ئەفەریقادا دەروێت لەوانە عونسولی دەریایی کە پیازەکانی هەڵاوســاوە گوڵەکانی ســپییە لە وڵاتانی لێواری دەریای ناوەراستو خوارووی ئەفەریقــادا زۆرە. هەندێك کەڵکی پزیشکیی هەیە.

٣-(اَلعَنْصُوَة والعِنصُوَة والعُنْصُوَة والعِنصِيَة والعِنصاة (ج) عَناص): ئەوەی کەمو بڵاوبێت. لە گیاو تووکی ســەرو شتیتر کە بڵاوبێت واتا تەنکبێت.

عنــظ: ١-(العُنْظُب والعُنْظُبــان والعُنْظُوب والأُنثى عُنْظوبَة): جۆرە کوللەیەك.

٢-(عَنظــی- بِه): ١.گاڵتەی پێکرد ٢.قســەی ناشیرینی پێوتو جنێوی پێدا.

(اَلعُنْظُــوان): ١.دەمپیســی/ جنێوفــرۆش/ سەرسەریو داوێنپیس ٢-(ن)ترشۆکە.

(اَلعُنْظُوانَة (ج) عُنْظُوانات واحِدَةُ العُنْظُوان) (ح): کوللەی مێ.

(اَلعِنْظِیان): زمانپیسی بەدرەوشت/ سەرسەری.

عنــف: (عَنُــفَ- بِالرَّجُــلِ وعَلَیــهِ. عَنْفاً وعَنافَةً): بەزەیی پێدانەهاتــەوەو لەگەڵیدا (توندوتیژ بوو/ رەقبوو).

(عَنیــف): توندوتیــژ رەقو بێبەزەیی (ج) (عُنُف).

(عَنَّــفَ- هُ): ١.رەقو بێبەرزییانــە لەگەڵیدا جووڵایەوە ٢.خراپ سەرزەنشتیکرد ٣.تەشەری لێداو گلەیی لێکرد.

(أَعْنَفَ- الأَمرَ): کارەکەی سەرســەختانەو بە رقەوە کرد.

(-هُ): توندوتیژ لەگەڵیدا جووڵایەوە.

(إعْتَنَــفَ- الأمــرَ): توندوتیژ دەســتی دایە کارەکە.

(اَلعُنْــف والعَنْف والعِنْــف): ١.زەبروزەنگ/ بێبەزەیــی ٢.توندوتیژیــی ٣.ســەختییو دڵرەقی/ شێتگیریی.

(ألأَعْنَف): ١-توندوتيژتر ٢-دڵرەقتر. بێبەزەییتر.
(عُنْفُوان الشَّباب وعُنْفُوَّه): هەرەتی لاویی‌و هێزو گوڕی.
(عُنْفُوان الخَمر): تیژیی مەی‌و گەرمیی گرتنی.
(ألجِنسُ العَنيف): ڕەگەزی توندوتیژ/ ئیدیۆمە بۆ ڕەگەزی پیاو (بەرامبەرەکەی).
(الجنس اللَّطيف): (ئیدیۆمە بۆ ڕەگەزی ژن).
(ألمَعْنَفَة): هۆکاری توندو تیژیی‌و ڕەقیی‌و بێبەزەیی.
٢-(إعْتَنَفَ- الشيءَ): گەرم‌و گوڕ دەستی بە کارەکە کرد.
(ألعَنْفَةُ والعُنُفَةُ): سەرەتاو گەرم‌و گوڕیی دەستپێکردن.
٣-(إعْتَنَفَ- المَجلِسَ): لە کۆڕەکە لایداو بۆ شوێنێکیتر چوو.
٤-(تَعَنفَصَ): ١-چەرداوەریی/ بێحەیایی‌و لەخۆباییبوونی نواندو جرپنیکرد ٢-خۆی هەڵکێشاو شتی وایوت کە نەیبوو.
(عَنْفَصَ) (عامية): فشوهوریکردو خۆی نواند/ خۆی بە زل پیشاندا.
(مُعَنفِص) (عامية): فشەکەری خۆبەزلزان.
٥-(ألعَنْفَقَةُ (ج) عَنافِق): گەندەمووی نێوان لێوو چەناگە.
عُنق: ١-(عَنِقَ- عَنَقاً): ملی درێژ بوو.

(أَعْنَق): ملدرێژ.
(عَنَّقَ-هُ): ملیگرت.
(-طَلعُ النَخل): تۆودانی خورماکە درێژ بوو.
(- عَلَيه): بەسەردا ڕۆیشت‌و سەریکەوت.
(عانَقَ-هُ مُعانَقَةً وعِناقاً): دەستی کردە ملی‌و باوەشی پێداکردو بە سنگی خۆیەوەینووساند.
(أعْنَقَ الكَلْبَ): ملوانکەیەکی کردە ملی سەگەکەوە.
(-الزَرعُ): کشتەکە باڵایکردو گوڵی دەرکرد.
(تَعَنَّقَ- اليَربُوعُ): گۆڕهەڵکەنەکە ملی بە کونەکەیدا کرد.
(تَعانَقَ- الرَجُلانِ): دووپیاوەکە دەستیان کردە ملی یەکتری.
(إعْتَنَقَ-الشيءَ): ١-بەتوندیی‌و ڕاستیی شتەکەیگرت ٢ دەستی دایە شتەکە.
(-الرَجُلانِ): دەستیاندایە گەردنی یەکتری لە شەڕدا یان لە هەڵوێست‌و کاتیتردا.
(ألعُنُق (ج) أعْناق= العُنْق) (ع ا): (نێرە دەیشکرێت بە مێ) مل/ گەردن.
(«كانَ ذلِكَ على عُنُقِ الدَهْرِ»): ئەوە لە کۆندا بوو.
(«لَهُ عُنُقٌ في الخَيرِ»): لە چاکەو خێردا دەستپێشکەریی هەیە.
(«هُم عُنُقٌ إليكَ»)ملیان بۆ لات درێژ کردووەو بەلای تۆدان‌و گوێدەگرن‌و چاوەڕێن‌و

گوێرایەڵن.
أَلعُنُـــق( - مِـــنَ النَباتِ): ملـی ڕووەك كە لە نێوان قەدو ڕەگدایە.
(عُنُقُ كُلِّ شَيءٍ): سەرەتای/ پێشەكیی هەموو شتێك.
(«ماتَ فُلانٌ في عُنُقِ الصَيفِ»): لە سەرەتای هاویندا مرد.
(«وقد أَخَــذَ بِعُنقِ السِــتين»): پێی ناوەتە تەمەنی شەستەوە.
(أَلعُنُق): سەرۆكەكان.
(أَلعانِقاء): كونی گۆڕهەڵكەنە گەر ترسا ملی پێدا دەكات.
(أَلعِناقِيَّة) (ن): ژاڵۆك ڕووەكێكە لە كۆمەڵەی ژاڵــە گوڵەكەی جوانــەو بنیەكــن. جۆرێكی دەروێنرێــت كە كەپرۆكــە دەكات و گوڵەكەی گەورەو شــینە جۆرێكیتری گوڵی ســپیی و ئاڵ دەگرێت.
(«الأَعْنَق): ملدرێژ.
(أَلعَنْقاء (ج) عُنْق): ١-مێی وشــەی (ألأَعْنَق) ٢-سەری گرد.
(هَضَبَةُ عَنْقاء): بانێكی درێژی بەرز.
(أَلعُنَيْــق): ١-ملۆكــە/ بچووككــراوەی مــل ٢-چلۆكەیەك كە گوڵی پێوە بێت.
(العَنيق): ١-مل ٢-دەستلەملكەر.
(أَلمِعْنــاق (ج) مَعانيــق): چارەوێی ملچاك و جوان.

(أَلمُعْنِق (ج) مَعانيق): زەویی سەختی بەرز.
(رَجُــلٌ مُعْنِــق): پیاوێكــی گەردنبــەرز/ ملدرێژ.
(أَلمَعْنَقَةُ): ملوانكە/ گەردانە.
٢-(عانَــقَ-تِ الإِبِــلُ مُعانَقَــةً وعِناقــاً): حوشــترەكانیان ملیــان درێژكــردو خێــرا ڕۆیشتن/ خێرایانكرد.
(أَعْنَــقَ-تِ الدابَّــةُ): وڵاخەكــە كەوتە غارو هەنگاوی بڵاویناو تەكانیدا.
(-النَّجمُ): ئەستێرەكە ونبوو/ ئاوابوو.
(-تِ البِــلادُ): وڵاتەكە پەلیهاویشــت و دوور بوو.
(أَلعَنَــق) (مــص): ملدرێژكــردن واتا خێرا ڕۆیشتن و غاركردن.
(أَلمُعْنِق (ج) مَعانيــق): پەلەكار/ خێراكەر/ غاردەر.
(أَلمِعْنــاق (ج) مَعانيق): چارەوێی ملگرتووی ملجوان و خێرا لە غاردا.
٣-(أَعْنَــقَ-تِ الريحُ): با گەردو تۆزی هەڵداو بڵاوكردەوە.
٤-(أَلعُنُق): كۆمەڵ.
(العَنــاق): نەهامەتــیو ســەرگەردانییو سەرنەكەوتن ٢-وەی/ چورتوم/ لێقەومان.
(- (ج) أَعْنُــق وعُنُــوق) (ح): كارە مــێ كە ساڵێكی تەواو نەكردبێت/ گیسكە مێ.
(عَناقُ الأَرض) (ح): پشیلە كێوی زیندەوەرێكە

لـە كۆمەڵەی پشـیلەیە کەمێك لە پشـیلەی ماڵی گەورەتــرە دوو چەپکە تووکی ڕەش بە گوێچکەکانیەوەیەو درندەیەکی ڕاوکەرە.

(العَناقة): نەهامەتیوسەغڵەتیوسەرنەکەوتنو داماویی.

(العَنقاء): زۆرزانو بەفروفێڵ.

(عَنْقاءُ مُغْرِبِ والعَنْقاءُ المُغْــرِبُ والمُغْرِبَةُ): سیمرخ. باڵندەیەکی ئەفسانەییە بۆ فەوتانو نەمانی شتێكو پووچبوونەوەی دەوترێت.

(«حَلَّقَت بِهِ فِي الجَوِ عَنْقاءُ مُغرِب»): سیمرخ بە ئاسماندا بردی. واتا فەوتاو نەما.

٥-(عَنْقَشَ- بالشــيءِ): خۆی بە شــتەکەوە هەڵواسیو پێوەی بەند بوو/ لکا.

(تَعَنْقَشَ- بِهِ): خۆی بۆ لوولداو پێوەی توند بوو.

عنــك: ١-(عَنَكَ- الرَمــلُ عُنْــكاً وعُنوكاً): لمەکــە بەیەکداچوو لــوولو بەرزبووەوە ڕێی بۆچوونی نەما.

(عَنيــك (ج) عُنْــك): لمــی بەیەکداچــووی گردبووی بێدەرو.

(عَنَــكَ البــابَ): دەرگاکــەی داخســت/ کۆڵۆمکرد.

(-الرَجُلُ): سەری خۆی هەڵگرتو ڕۆیشت.

(عَنَّــكَ-هُ): لەگەڵیــدا توندوتیژیــی نواندو تووشی چەرمەسەرێیکرد ئەمە لەوەوە هاتووە کە حوشتر لە لمدا بچەقێتو تووشی نارەحەتی ببێتو دەرنەیەت.

(أَعْنَــكَ- الرَجُــل): کەوتــە لمێکــی زۆرو کەڵەکبووەوەو چەقی.

(-البابَ): دەرگاکەی داخست.

(تَعَنَّــكَ- الرَملُ): لمەکە پێچپێچخواردو کەڵەکە بوو بەرزبووەوەو ڕێی تێچوونی نەبوو.

(إِعْتَنَــكَ- البَعيرُ): حوشــترەکە کەوتە گێژە لمەوەو دەرچوونی نەبوو.

٢-(عَنَكَ- الفَرَسُ عُنْكاً وعُنُوكاً): چارەوێکە پەلاماریداو دووبارە گەڕایەوە سەریو هێرشی بردەوە سەر.

٣-(العَنْكَبــوت (ج) عَناكِب عَنكَبُوتات)(ح): جاڵجاڵۆکــە بەلیکە لینجەکــەی تەون دەکات بــۆ ئــەوەی مێشــومەگەزی پێــوە بلکێتو بیانگرێت.

(أَلعَنْكَــب (ج) عَناكِب وعَناكيب) (ح): نێرە جاڵجاڵۆکە.

(أَلعَنْكَبَــةُ والعَنْكَباة العَنْبــاةُ (ج)( عَناكِب وعَناكيب) (ح): مێجاڵجاڵۆکە.

(أَلعَنكَبوتيــات) (ح): بــەرە جاڵجاڵۆکەکان: تاقمــە زیندەوەرێکن وەك جاڵجاڵۆکەو گەنەو سڕو دووپشكو ئا لەوجۆرانەیە.

عنم: (عَنَّمَ- البَنانَ): پەنجەکانی یان سەری پەنجەکانی ڕەنگکرد.

(أَعْنَمَ-تِ الماشِيَةُ): ئاژەڵەکە لەسەر ڕوومکی (عَنَم) لەوەڕا.

(أَلعَنَـم الواحـدُ عَنَمَـة) (ن): ڕووەكێكـی مشەخۆرە بەرێکی سوور دەگرێت بە پەنجەی بۆیەكـراو دەچوێنرێـت ٢ـتـەرزی مێـو کە چڵەکان هەڵدەواسێت.
(أَلعَنَميُّ): قڵیشی لێوی مرۆڤ.
عنـا: ١-(عَنا- لَهُ. عَناءً وعُنُوّاً): سـەری بۆ شـۆڕکرد/ خـۆی بەدەسـتەوە دا/ زەبوونی دەستیبوو.
(عانٍ وعَنِي (م) عانِيَة وعَنِيَّة): سەرشـۆڕو زەبوون/ ملكەچو كەساس.
(عَنا- عَنوَةً): ١-شتەكەی بە زۆرو دەگەنگ برد ٢-بە ئاشتیو نەرمییو ڕێکەوتن شتەکەیبرد.
(عَنا وعَنِيَ- في القَوم. عَناً): بوو بە دیل بە ناویاندا.
(عـانٍ (ج) عُنـاة (م) عانِيَـة (ج) عانیات وعَوانٍ): دیل.
(عَنَّى- الرَجُلَ تَعْنِيَةً): پیاوەکەی بەند کرد.
(أَعنـى- الرَجُـلَ. إِعْناءً): ملی بـە پیاوەکە شۆڕکردو کەساسیکرد.
٢-(عَنـاـهُ الأَمـرُ. عَنـاءً وعُنُـوّاً): كارەكە مەراقی پێیپەیداکردو لای گرنگبوو.
(-الأَمـرُ عَلَيـهِ): كارەكـەی لێـدژوارو سەختبوو.
(-تِ الأُمورُ بِفُلان): كارەکان لەسـەر فیسـار کەڵەکە بوو/ بەسەریدا داباری.
٣-(عَنـا- الشـيءَ. عَناءً وعُنُواً): شـتەكەی دەرخستو پیشاندا.
(-تِ الأَرضُ بِالنَّباتِ): زەویەكە گیای دەرکردو سەوز بوو.
(«لَم تَعْنُ بِلادُنا بِشَيءٍ»): وڵاتەکەمان هیچی سەوز نەکرد.
(أَعْنى-تِ الأَرضُ النَبـاتَ. إِعناءً): زەویەكە گیاو ڕووەکی دەرکردو لێڕوا.
٤-(عَنـا- الكِتـابَ. عَنْـواً): ناونیشـانی بۆ کتێبەکە نووسی/ ناونیشانی بۆ دیاریکرد/ بۆ دانا.
٥-(أَلعاني): ئاو یان خوێنی لەبەر ڕۆیشتو.
(أَلعِنْـو والعَنـا (ج) أَعْنـاء): لا/ کەنـارو تەنشت.
(«جاءَنا أَعناءٌ مِن الناس»): لەملاو لەولاوە خەڵكو هۆزێکی زۆرمان بۆ هات.
٦-(عَنْـوَنَ- الكتابَ عَنوَنَةً): ناونیشـانی لە کتێبەکە نا.
(عُنوانُ الكتاب وعِنوانُهُ وعُنيانُهُ وعِنْيانُهُ): ١-ناونیشـانو ڕێڕەوو پیشـەکیی (کتیبەکە/ پەرتووکەکە).
(عِنوانُ كُلِّ شيءٍ): ناوونیشانی هەموو شتێك کـە دەرەوەی ناوەوەیـت تێبگەیەنێتو بۆت ڕوونبکاتەوە.
(«الظّاهِر عِنوانُ الباطن»): ڕووی دەرەوەی شت نیشانەی ناوەوەیەتی.
(عِنـوانُ الرسـالَة في إِصْطِـلاح الكتـاب):

ناونیشـانێك کـە لەسـەر نامـە یان پشـتی بەرگەکـەی دەنوسـرێت نـاوی کەسـەکەو نازناوی‌و شوێنی دانیشتنی دەنوسرێت.
عني: ١-(عَنى-تِ الأرضُ بِالنَّباتِ): زەویەکە گیایدەرکرد/ بە گیا داپۆشرا.
٢-(عَنى- بِما قالَهُ كذا عَنْياً وعِنايَةً): ئەوەی کە وتی نیازو مەبەستی ئەو بوو.
(تَعَنَّى- فِي الأمرِ. تَعَنِّياً): مەبەستی ئەو کارە بوو.
(ألمَعْنـى (ج) معـانٍ): ١-مەبەسـتو نیـازی شـتێك ٢-(مَعنـى الكَلِمـةِ): واتای وشـەو چیدەگەیەنێت.
(معنى الكَلام): ناواخن‌و واتای ئاخاوتنەکە/ قسەکە.
(ألمَعاني): ئەو سـیفەت‌و نیشانە باشانەی کە مرۆڤ دەیبێت.
(«فُلان حَسَـنُ المَعاني»): فیسـار سیفەت‌و نیشانەی باشی هەیە.
(ألمُعَنَّى- عند الزَجَّالين): لای لۆتییەکان جۆرە هۆنراوەیەکە دەیڵێن‌و بە تەنگ سەرواوە زۆر دێن‌و گوێ نادەنە ڕاسـتیی زمانەکەو کێشـی هەڵبەستە.
(ألمَعْنَوِيّ): واتایی.
(مَعنـوِيُّ- الكَلامِ ومَعْناتُهُ ومَعْنِيَّتُهُ): واتای ئاخاوتن‌و مەبەستی.
٣-(عَنـى- الأمـرُ لِفُـلان عَنْيـاً): کارەکە قەوماوەکە ئەویگرتەوە/ بەسەریدا هات.
(-الأمرُ فُلاناً. عِنايَةً وعَنايَةً وعُنِيّاً): کارەکە فیسـاری خەریککردو بەتەنگیەوە هات‌و لای گرنگبوو.
(-اللهُ بِهِ عِنايَةً): خودا پاراستی‌و بەتەنگیەوە هات.
(عُنِـيَ- بِالأمرِ. عِنايَةً وعُنِيّاً): بە کارەکەوە خەریك‌و ماندوو بوو بە تەنگیەوە هات.
(عـانٍ وعَـنٍ): سـەرقاڵ‌و مانـدوو بـە تەنگەوەهاتووی کار.
(عَنَّـى وأعْنـى- الرَجُـلَ تَعْنِيَـةً وإعْناءً): پیاوەکەی چەوسـاندەوەو کارێکی بەسەردا دا کە ماندووی بکات.
(عَنِيَ- عَناءً): تێهەڵچوو شەکەتبوو.
(عَنِيَ وعَنى- بِالأمرِ): بە کارەکەوە خەریك‌و ماندوو بوو.
(عـانٍ وعَـنٍ): خـەریـك‌و مـانـدوو/ بەتەنگەوەهاتوو.
(عانى-تِ الهُمـومُ فُلاناً مُعانـاةً): پەژارەو مەراق دایبەسەر فیسارداو گینگڵیدا.
(مُعانـاة): گینگڵـدان/ ڕەنجـدان‌و پێـوە خرمیکبوون.
(عانى- الشَـيءَ): بەدەست شتەکەوە تووشی نارەحەتیبـوو ئارامیگـرت‌و بـە ئەنجامـی گەیاند.
(-الـرَجُـلُ مـالَـهُ): داراو سـامـانـەکـەی

هەڵسووراندو سەرپەرشتیکرد.
(-ە): لەگەڵیدا هەڵیکردو هەڵیسووراند.
(تَعَنَّى. تَعَنِّياً): زۆر ماندوو بوو.
(-الأمرَ): سەختیی و رەنجی کارەکەی چەشت و خۆی لە بەردا راگرت/ بە تەنگیەوە هات.
(-تِ الحُمَّى فُلاناً): تاکە، بۆیگەڕایەوە.
(إعْتَنى- الأمرُ. إعتِناءً): کارەکە هاتە بەردەم/ هاتە پێشەوە.
(-بِالأمرِ): بەتەنگ کارەکەوە هات و بەدەربەسیەوە بوو.
(ألعَني (م) عَنِيَة): (بەتەنگەوە/ بەدەربەسەوە) هاتوو.
العَنِيَّةُ والعَناءُ والعَنا): رەنجدان و ماندووبوون/ کۆشش و شەکەت بوو.
(ألعَنايَة والعِنايَة): (بە تەنگەوە/ بەدەربەسەوە) هاتن/ پێوە خەریکبوون.
(هو بِهِ أعنى): ئەو باشتر خۆی لەگەڵیدا ماندوو دەکات و بە تەنگەوە دێت.
(ألمُعَنَّى): کارێکی سەخت و گران کە راسپێردرابێت بیکات.
٤-(عَنى- فيه الأكلُ. عَنْياً): خواردنەکەی پێکەوت و سوودی لێوەرگرت.
(عَنِيَ- الأكْلُ فيه عَنَىً): خواردنەکە کەڵکیدایەو پێیکەوت.
٥-(عَنَّى وأعْنى- الكِتابَ. تَعْنِيَةً وإعْناءً): ناونیشانی بۆ کتێبەکە دانا.

(«ما أعْنى شيئاً»): سوودێکی نەبەخشی.
(ألعُنيان= العِنوان): ناونیشان.
الملحق:
عني: (المَعْنَويَّات): ورە/ باری دەروونیی.
(مَعْنَويات الجنود): ورەی سەربازەکان.

---

عهد: ١-(عَهِدَ- الأمرَ عَهْداً): بە کارەکەیزانی/ کارەکەی زانی.
(-الشيءَ): شتەکەی پاراست و سەرپەرشتیکرد/ بەتەنگیەوە هات/ زوو زوو بەسەریکردەوە.
(-اللهَ): خودای بە تاک و تەنها زانی/ ناسی.
(-فُلانٌ وعْدَهُ): فیسار پەیمانەکەی پاراست و بردە سەر.
(-إلى فُلانٍ): فیساری راسپاردو بۆ شتێک مەرجی لەگەڵدا کرد.
(-إلَيهِ في كذا): ئەوەی کردە قەبەڵی و رایسپارد کە بە تەنگیەوە بێت.
(عاهَدَهُ): پەیمانی لەگەڵدا بەست/ بەڵێنیدایە/ گریبەستیانکرد.
(أعْهَدَ- فُلاناً مِن كذا): فیساری لەوە دڵنیا کرد/ دەستەبەری پاراستنیبوو یان ئەوەی لەسەر لابرد یان دەستەبەریبوو.
(أُعْهِدُكَ مِن هذا الأمرِ): بۆ ئەو کارە من دەستەبەرتدەبم.
(تَعَهَّدَ واعْتَهَدَ- الشيءَ): ١-گفتی پاراستن و چاودێریداو دەستەبەری ئەوە بوو ٢-بەڵێنی پاراستن و چاودێریکردنی شتەکەی

تازەکردەوە.
(-أَمْلاكَهُ): سەردانی موڵکەکەیکردو سەرپەرشتی کردو چاکسازییکرد.
(تَعاهَــدَ القَومُ): خوێشــگەل لەگــەڵ یەکدا پەیمانیانبەستو بەڵێنیان بەیەکتریدا.
(-الشيءَ): شتەکەی گرتە ئەستۆی خۆی.
(-أَملاكَــهُ): هاتــە ســەر موڵکەکانــیو سەرپەرشتیکردنو چاکسازیکردن.
(إسْــتَعْهَدَ فُــلانٌ مِن صاحِبِــهِ): بەڵێنی لە هاوڕێکەی سەندو مەرجی لەگەڵدا کردو پێی مۆرکرد.
(-فُلاناً مِن نَفسِهِ): فیساری لەدەستدرێژیی خۆی دڵنیا کردو گفتی ئەوەیدایە.
(أَلعَهــد (مــص) (ج) عُهُــود): ١-ئەمــەك ٢-دەستەبەریی ٣-دڵنیایی/ پاراستن/ ئاسایش/ دەســتەبەربوون ٤-خۆشەویستیو دۆستایەتی ٥-ڕاســپاردە/ وەســیێت ٦-پەیمان ٧-سوێند کە پیاو بیخوات.
(«عَلَــيَّ عَهــدُ اللهِ لَأَفْعَلَنَّ كذا»): ســوێندم بە خــودا دەبێت هەر ئەوە بکــەم ٨-فەرمان. کەسەرداری وڵات بۆ کاربەدەستی ناوچەیکانی دەنارد کــە دادوەر بن ئەوســایش پێیدەوترا (فرمان) ٩-سەرچاوەی دەستەبەریو پەیمانی شتێك.
(«عهدي بِهِ أَنَهُ كَريمٌ»): وەك من بیناســم هەمیشە ئەو بەخشندە بووە.

(«هــو قريب العَهد بِكَذا»): لەوەدا تازەیە چ لە ڕووی شارەزاییەوە یان ڕەوشو باریەوە.
(«كان ذلك فِي أَو على عَهدِ فُلان»): ئەوە لە سەرینەی فیسار یان ســەردەمو چاخی ئەودا بوو.
(أَلعَهْدُ القَديم): تەورات.
(أَلعَهْدُ الجَديد): ئینجیل.
(وَلِيُّ العَهْد): جێنشینی شا پاش مردنی شا.
(أَلعَهِد): ١-کەسێك دۆستپەیمانبێت کاری وڵات بگرێتە دەســتو باش بەرێوەی ببات و بیکات ٢-کەســێك کە کاروبار بگرێتە ئەستۆیو باش سەرپەرشتیبکات.
(أَلعُهْدَة): ١-بەرپرسیو دەستەبەرییو دڵنیایی/ لەئەستۆگرتنی شتێك بۆ چاکسازییکردنی.
(«لــي في الأمرِ عُهْــدَةٌ»): بــۆ چاککردنەوە بەسەر کارەکەدا دەچمەوە.
(أَلعِهدان): لە ئەستۆگرتنو دەستەبەریی.
(أَلعَهيد): ١-پەیمانبەست/ بەڵێندەر ٢-پەیمان لەگەڵدا بەسراو ٣-کۆن.
(قَريةٌ عَهيدَة): دێیەکی زۆر کۆنە سەردەمێکی زۆری بەسەردا تێپەریوە.
(أَلمَعْهَد (ج) مَعاهِد): پەیمانگە ٢-شوێنێکە کە تیادا بوونی شتەکە ئاسای بێت ٣-شوێنێکە کە هێشتا خوێشگەل هەر بۆیدەچنەوە.
(أَلمَعْهود) (مفع): ناسراو/ دیارو لەبەرچاو.
٢-(عَهِــدَ- فُلانــاً بِمــكانِ كذا عَهــداً): لەو

شوێنەدا فیساری پێگەیشت.
(ألـعَـهْـد (ج) عُـهُـود) (مـص): دەمـی بەیەكگەیشتن‌و یەكناسین.
(«عَهدي بِـهِ قَريـبٌ»): زۆر دەمێك نییە/ بەیەكگەیشتووین‌و ناسیومە.
(«متـى عَهـدُكَ بِفُـلان»): لـە كەیـەوە ئەوتدیوەو دەیناسی.
٣-(عُهِدَ- المَكانُ): شـوێنەكە یەكەمین بارانی بەهاری لێدا.
(ألعَهْدُ والعَهْدَة والعِهْدَة (ج) عِهاد والعِهادَة): یەكەمین بارانی بەهار.
٤-(ألعُهدَةُ): لاوازیی لە نووسـیندا/ ناشیرین نووسین یان كەمئاوەزیی.
(«في خَطِّهِ عُهْدَةٌ»): ناشـیرین دەنووسـێت/ خەتەكەی ناخۆشە.
الملحق:
عهـد: ألتَعَهُّد: بەسـەركردنەوەو پاراسـتن ٢-خۆبەستنەوە بەگفت‌و بەڵێنێك/ بەڵێندان.
(«ألتَعَهُّـد بِـرَد مبلغ مِن المـال»): بەڵێنی دانەوەی پارەیەك ٢-خۆپێوەبەستن.
(«تَعَهُّـدات الطُـرُق»): بەڵێنـی ڕێگەوبان دروستكردن یان چاككردن.
(ألمُعاهَدَة) (مص): (ڕێكەوتننامە/ پەیمان)ی نێـوان دوو میریی یان پتر بۆ كاری بازرگانیی یان كاری ڕامیاریی‌و شتیتر.
(ألمُتَعَهِّد): ١-دەسـتەبەری ڕێكەوتن‌و بەڵێن/ بەڵێندەر یان پارێزەری پەیمانێك كە دابێتی ٢-خۆبەسـتنەوە بـە بەڵێـن‌و گفتێـك كـە دابێتی.

---

عهر: (عَهَرَ وعَهِرَ- وعُهُوراً وعَهارَةً وعُهُورَةً وعَهَراً عَهراً المرأة): زینای لەگەڵ ژنەكە كرد/ داوێنپیسیی لەگەڵدا كرد/ گای.
(عاهِـر (ج) عُهّـار): پیـاوی (زینـاكار/ داوێنپیس/ شەروالپیس).
هـيَ: (عاهـر (ج) عِواهِـر): ئافرەتـی (داوێنپیس/ خراپە) قەحبە.
(عاهَرَ-هـا عِهـاراً): زینای لەگـەڵ ژنەكەدا كرد/ دەستی لەگەڵدا تێكەڵكرد.
(ألعَهر): زیناكار/ خراپە/ ئافرەتی (قەحبە/ سۆزانی)/ پیاوی داوێنپیس.
عهل: (ألعاهِل (ج) عَواهِل): ١-قەراڵ/ شـای شاهان ٢-ئافرەتی بێمێرد.
عهن: ١-(عَهَنَ- بِالمَكانِ عَهْناً): لە شوێنەكەدا نیشتەنیبوو.
(-مِنَ المَكانِ) (ضد): ١-لە شـوێنەكە دەرچوو ٢-دەرنەچوو مایەوە.
(عَهَنَ- الشيءُ): شتەكە مایەوەو بنجبەستبوو.
(عَهِـنَ- الشـيءُ عَهَنـاً): شـتەكە (بـوو/ ئامادەبوو).
(ألعاهِن): ١-بنجبەست ٢-ئامادە.
(«مالٌ عاهِـن»): دارایەكی (هەبوو/ ئامادە/ چەسپیو).

(«هو عِهْنُ مـالٍ»): ئەو باش هەڵسوڕێنو پارێزەری دارایە.
٢-(عَهَـنَ- في العَمَـلِ. عَنْهاً): لـە کارەکەدا کۆششی باشیکرد/ بۆ کارەکە لێبرا.
(-لِفُلانٍ مُرادَهُ): پەلـەی لەجێبەجێکردنی (مەرامەکەی/ مەبەسەکەی) فیساردا کرد.
(عَهِنَ- لَهُ كذا عَهَناً): ئەوەی زوو بۆ ڕاپەڕاند/ پەلەی بۆ لێکرد.
(ألعاهِن): چابووك/ پەلەکار/ زوو ڕاپەڕێن.
٣-(عَهَنَ- الى فُلان عَهْناً): فیسـاری ڕاسپارد/ کردیە ئەستۆی ئەوەوە.
٤-(عَهَـنَ-ت جرائِـدُ النَخلِ عُهونـاً): پەلە دارخورماکان وشکبوون.
(ألعاهِنَـة (ج) العَواهِـن): پەلـە ڕووتـە وشکبووەکانی دارخورما.
(«رمى الـكَلامَ على عَواهِنِهِ»): قسـەکەی کردو هاویشـتی بێگوێدانە باشییو خراپییو ڕاستییو هەڵەی.
٥-(عَهَـنَ- القَضيـبُ. عَهْنـاً): چیلکەکـە/ چێوەکە چەمایەوە خەریکبوو بشکێت.
(ألعُهْنَـةُ): چەمانـەوەی چیلکەو نزیکبوونی شکانەوەی.
(ألعاهِن) (فا): ١-هەژار/ نەدار/ نەبوو ٢-خاوو خلیچك/ شلە پەتە ٣ تەمەڵ/ تەوەزەل.
٦-(ألعِهْـن (ج) عُهُـون): خـوری یـان ئەو خورییەی کە ڕەنگکرابێت.

(ألعِهْنَـةُ): ١-پارچـە/ تۆپەڵـە) خورییـەك ٢-(ن)درەختێکە گوڵی سوور دەگرێت.
عاث: (عاثَ- فُلاناً عَن كذا. عَوْثاً): فیساری لەو شتە وا لادا تا سەری سورماند.
(عَـوَّثَ-هُ): ڕێـی لێگـرتو دوایخسـت یان دڵـی لـە کارەکـە/ شـتەکە سـاردکردەوە/ پەشیمانیکردەوە.
(-فُلاناً عَن كذا): فیسـاری لەوە لاداو سەری لێتێکداو حەپەساندی.
(تَعَوَّثَ): سەرسامبوو/ حەپەسا.
(ألمَعَاث): ١-ڕێڕەو ڕێباز: بواری فراوان.
(إنَّ لي عَـن هذا الأمرِ لَمَعاثـاً): لەم کارەدا بواری ئەوەم هەیە وازی لێبهێنم.
عـاج: ١-(عاجَ- بالمَكانِ.. عَوْجاً ومَعاجاً): لە شوێنەکەدا نیشتەجێبوو.
(-فُلانالً بالمَكانِ): فیسـاری لە شـوێنەکەدا نیشتەجێکرد.
(-السائِرُ): ڕۆشتووەکە/ ڕێبوارەکە وەستا.
(ألمَعاج) (مص): جێنیشتەنی.
٢-(عاجَ- إلى أو على المَكان. عَوْجاً ومَعاجاً): پێچی بۆ شوێنەکە کردەوە/ لایدایە شوێنە.
(-فُلانٌ عَمَّا عَزَمَ عَلَيهِ): لەوە پاشگەز بووەوە کە نیازی بوو، وازی لێهێنا.
(-البَعيرَ): بە ڕەشـمەکە سەری حوشترەکەی وەرگێرا.
(«مـا أعْـوَجُ بِكَلامِـهِ»): بـە قسـەکەیدا

لاناكەمەوە/ گوێ نادەمە قسەكەی.
(عاجَ- إلَيهِ): لایدایە لای ئەو.
(عَـوِجَ العُودُ ونَحْوُهُ عَوَجـاً): چیلكەكە یان هیتر خواربووەوە/ چەمییەوە.
(-الإنســانُ): مرۆڤەكــە خــوارو خێچ بوو/ بەدرەوشتبوو.
(أعْـوَج): مرۆڤێكی خوارو خێــچ/ ناتەواو/ بەدرەوشت.
(عَوَّجَ- العُودَ. تَعْويجـاً ونَحوَهُ): چێوەكەی (نوشتانەوە/ خواركردەوە).
(ألعُودُ المُعَوَّج): چەوێلی (خوار/ كەچ/ لار).
(عَـوَّجَ الناقَــةَ): ســەری مێحوشــترەكەی وەرگێرا.
(-هُ عَنِ الشيءِ): لە شتەكەی لاداو وەریگێرا/ لێیدوورخستەوە.
(تَعَوَّجَ واعْوَجَّ- العــودُ تَعَوُّجاً وإعوجاجاً): چێوەكە چەمییەوە/ خواربووەوە.
(-الشيءُ): شتەكە خواربووەوە/ لاربوو.
(إنْعاجَ- عَلَيــهِ إنْعياجاً): بەلای ئەودا لایدا/ خواربووەوە/ پێچیكردەوە.
(ألعِوَج): ١-پێچكردنەوە ٢-چەوتیی/ خواریی/ لاریی/ خواربوونەوەو ناراستیی.
(ألعَوجاء (ج) عُوْج): ١-مێی وشەی (ألأعْوَج) ٢-كەوان ٣-حوشــتری تێقوپاو كە لە برسانداو لە لەریدا خواروگێر بووە.
(ألمَعَاج): شوێنی بۆ پێچكردنەوە.

٣-(عَوَّجَ- العَصا ونَحْوَها. تَعويجاً): عاجی لە داردەستەكە گرت.
(ألعَصـا. معوَّجَــةٌ): داردەســتێك كە عاجی (خرابێتە سەر/ پێوە كرابێت).
(ألعاج): شفرەی فیل.
(ألعاجَة): پارچە شفرەیەكی فیل.
(ألعَــوَّاج): خــاوەن شــفرە. یان فرۆشــیاری شفرەی فیل.
عــود: ١-(عادَ-هُ. عَـوْداً): دەســتی پێوەنا/ گێرایەوە.
(-الســائِلَ): دەرۆزەكەرەكــەی گێرایــەوەو دەستی پێوەنا.
٢-(عادَ-فُلانــاً بِالمَعــرُوفِ عَــوداً): چاكەی لەگەڵدا كرد.
(-هُ): كردی (بە نەریت/ بە خوو).
(-لِكَــذا أَو إلى كذا. عَوْداً وعَــوْدَةً ومَعاداً): ١-گەڕایــەوە ســەرئەوە/ بۆ ئــەوە ٢-دووبارە هاتەوە سەر ئەوەی وازی لێهێنابوو.
(«عاد عَلَــيَّ مِن فُلان مكــروهٌ»): دووبارە خراپە لە لایەن فیسارەوە رووی تێكردمەوە.
(-الشَــيءَ عَوْداً وعياداً): دووبارە دەستی بە شتەكە كردەوە.
(-الأَمرُ كذا): كارەكە وا بووەوە: وایلێهاتەوە.
(عادَ= صــارَ من أخَــوات كانَ للدلاكة على الانتقــال من حــالٍ الی حال): بــۆ گۆڕینو گوێزانەوەیە.

(«عاد فُلانٌ شَيخاً»): فيسار پیر بوو.

(-المَريضَ عَوْداً وعياداً وعيادَةً وعُوادَةً): سەری لە نەخۆشەکەدا/ دیدەنیی نەخۆشەکەیکرد.

(عائِد (ج) عُوَّاد وعُوْد وعَوْد وهي عائِدَة (ج) عُوَّاد): دیدەنیکەری نەخۆش/ سەردەری نەخۆش.

(اَلمَريضُ مَعُودٌ ومُعْوُود): نەخۆشەکە دیدەنیکراو سەردرا.

(عَوَّدَ فُلاناً كذا): فیساری بەوە ڕاهێناو پێیکرد بە نەریت/ خووی بەوەوە پێگرت.

(عَيَّدَ تَعييداً): جەژنیکرد.

(عاوَدَ- الرَّجُلَ. مُعاوَدَةً وعِواداً): پیاوەکە گەڕایەوە بۆ ئەوەی کە لەسەریبوو وازی لێهێنابوو.

(-الشيءَ): شتەکەیکرد بە (نەریت/ خوو).

(«عاوَدَتْهُ الحُمَّى»): تاکە، بۆی گەڕایەوە.

(«عاوَدَهُ بِالمَسألَةِ»): پرسیارەکەی چەند بارە لێکردەوە.

(عايَدَ-هُ): جەژنە پیرۆزەی لێکرد.

(أَعادَ- الأَمرَ أَو الكَلامَ إِعادَةً): کارەکە یان قسەکەی دووبارە کردەوە.

(-الشَيءَ إِلَى مَكانِهِ): شتەکەی بۆ شوێنەکەی خۆی گێڕایەوە/ بردیەوە شوێنەکەی خۆی.

(-الشَيءَ): شتەکەی کرد بە نەریتو تابوشتی لەگەڵدا بوو چونکە نەریتیبوو.

(«فُلان مايُعيدُ ومايُبْدي»): فیسار نە هیچ دەکاتو نە هیچ دەردەخات واتە بێدەسەڵاتو بێبڕشتە.

(تَعَوَّدَ- الشيءَ تَعَوُّداً): بە شتەکە ڕاهاتو کردی بە نەریت.

(-المَريضَ): سەری نەخۆشەکەیدا.

(تَعاوَدَ- القَومُ فِي الحَربِ): لە جەنگدا هەر دەستەیەك بۆ لای هاوڕێی خۆی گەڕایەوە.

(إِسْتَعادَ- هُ. إِستِعادَةً): داوای لێکرد کە بگەڕێتەوە/ گەڕاندیەوە/ گێڕایەوە.

(-الشيءَ): شتەکە بۆ خۆی کرد بە نەریت.

(-الشَيءَ فُلاناً ومِن فُلانٍ): داوای لە فیسار کرد کە شتەکە بگێڕێتەوە.

(العائِدَة (ج) عَوائِد): ١-چاکەو پەیوەندی دۆستایەتیو سۆز ٢-کەڵكو قازانج.

العائِدَةُ (ج) عُوَّد وعَوائِد وعائِدات): مێی وشەی (العائِد).

(العَوْد) (مص): ١-گەڕانەوە ٢-ڕێگەی کۆن.

(«رَجَعَ عَوْداً على بَدءٍ أَو رَجَعَ عودَهُ على بَدْئِهِ»): چۆن هاتبوو وا گەڕایەوە یان لە کوێوە هاتبوو وا گەڕایەوە بۆ ئەوێ.

(أَلعَواد): ١-کردەوەی چاکە/ خێر ٢-سۆزو ڕووی (شیرین/ خۆش)/ لاواندن/ میهرەبانیی.

(«إِنَّ لَكَ عِندَنا عَواداً وعُوداً و عِواداً حَسَناً»): لای ئێمە نازت هەیە چیت بوێت بۆت ئامادەیەو دەتدرێتێ.

(ألعُـوادَة) (مـص): خواردنێك كـه جارێك لێیخورابێتو بهێنرێتەوە.
(«لَكَ العُوادَة»): بۆتهەیە دووبارە بێیتەوە.
(«لَكَ العُوْدُ والعَـودَة»): بۆتهەیە بۆ كارەكە بگەڕێیتەوەو دوبارەیكەیتەوە.
(ألعيْد): ئەوەی كـه بۆتە نەریت بۆ مرۆڤو پێی ڕاهاتووە وەك نەخۆشیو پەژارەو مەراقو خەفەتو ئا لەو بابەتانە.
(ألعيـد) كـه لـه بنچیـەدا (عِـوْد)ە (ج) (أعياد)ە: ١-كەش ٢-جەژن/ هەموو ڕۆژێك كە كۆبوونەوەیەك یـان بۆنەیەكی یادكردنەوەی پیاوچاكێـك یان فەوماوێك كـە گرنگبێت وا وتراوە: بۆیە پێی دەڵێن (عید) چونكە هەموو ساڵێك خۆشیو شادییەكی تازە دەهێنێت.
(ألعـادَة (ج) عادَات وعـاد وعيْد وعَوائِد): داب/ نەریـت/ خـوو. گوایـا (عوائِد) كۆی (عائِد)یە.
(ألعـادِيّ (ج) عاديات): ئاسـایی/ كارێك كە مـرۆڤ كردبێتی بـه نەریتو خـووی پێوە گرتبێت.
(ألأعْوَد): بەكەڵكتر/ بەسوودتر.
(«هذا أعْوَدُ عَلَيكَ»): ئەمە بۆت (بەكەڵكترە/ بەسوودترە).
(ألمَعـاد) (مـص): ١-سـەرچاوەو چارەنووس ٢-ڕۆژی دواییو زیندووبوونەوە ٣-بەهەشـت ٤-حەج.

(ألمَعاد والمَعادَة (ج) مَعاوِد): ١-پرسـە كە بۆی دەچنو دەچنەوە ٢ شیوەن/ كۆتەڵ/ شەپۆڕ/ شین.
(المُعيـد) (فـا): ١-كارامەو شـارەزا ٢-خاوەن ئەزمـوونو كارزان/ كاركـردەو شـارەزا ٣-كەسێكە كە چەند جار لە داگیركردندا بووە كەسێكە كە چەندبارە كارێكی كردبێت.
(«فَرَسٌ مُبـدِيٌ مُعيد»): چارەوێیەكی ڕامو ڕاهێنراوو ملدەر.
(ألمُعاوِد) (فا): ١-چەند پاتكەرەوە ٢-سـەرومر كاركردە ٣-لـەكاردا كارامەو لێزان ٤-قارەمان/ پاڵەوان.
٢-(عَوَّدَ- البَعيرُ): حوشترەكە پیر بوو.
(-الرَجُلُ): بەتەمەنبوو.
(ألعَـوْد (ج) عِوَدَة): حوشـترو مـەری پیر/ بەتەمەن.
٤-(عـادٌ): پیاوێكی كۆنو پێشـینی عەرەب ٢-هۆزێكی كۆنە بەو ناوەوە عاد ناونراوە.
(«ماأدري أيُّ عـادَ هُوَ»): نازانم چ زەلامێكە چ دروستكراوێكە.
(العادِيّ (ج) عادِيات): ١-پاشـماوەی میللەتە هەرە كۆنەكان (بە ناوی عادەوە ئەومیانوتووە) ٢-شتی دێرین/ كۆن.
(ألعُـوْد (ج) عَيْدان وأعْـواد وأعْوُد): ١-دارو تەختـە ٢-لق/ چڵو چێـو/ پەل پاش ئەوەی دەبڕرێتەوە ٣-جۆرە بۆنێكی خۆشـە بە هەڵم

دەکرێــت‌و بۆنــە خۆشــەکەی بڵاودەبێتەوە ٤ ئێسقانێکە لە بنی زماندایە ٥-(مۆسیقا).

عــود (عُــودُ الصَّليــب) (ن) = الفاوانيــا: گیایەکە یان دەومنێکە گوڵێکی گەورەی ســپی یــان ئەرخەوانــی دەگرێت بــۆ ڕازاندنەوەی باخچەکان بەکاردێــت ڕەگەکەی بۆ دەرمانی کۆڵنجی منداڵان بەکاردێت.

(عُودُ القَرْح وعُودُ الإنجبار) (ن): دوو جۆرە ڕووەکن.

(ألعَوَّاد) (مو): عوودژەن.

(ألمُتَعَيِّــد): ١-تــوورە بــوو/ ڕقهەســتاو ٢- ستەمکارێکی گەورە/ زۆر زۆردار.

الملحق:

عود: (ألعادِيَّات): کۆنینە. شتی هونەریی زۆر کۆن یان کەلوپەلی کۆنی ناوماڵ.

(تاجِــرُ عادِيــات): بازرگــان‌و فرۆشــیاری کۆنینەو کەلوپەلی کۆنی ناو ماڵ.

(ألعِيادَة): سەردان/ دیدەنیکردن.

(«عِيادَةُ المَريض»): سەردانی نەخۆش.

(عِيــادَة الطبيب): دیدەنگەی پزیشــکی کە تیایدا پزیشك تەماشای نەخۆشدەکات.

---

عــاذ: (عــاذَ- بِفُلانٍ مِن كذا عَــوذاً وعِياذاً ومَعاذاً ومَعــاذَةً): لەتاو ئەوە (پەنایبردە بەر فیســار/ هانایبردە بەر ئەو/ خــۆی دایە پاڵ ئەو).

(«أعوذُ باللهِ مِنَ الشَّــيطانِ الرجيم»): لەتاو شەیتان هاناو پەنا دەبەمە بەر خودا.

(عاذَ- بالشيءِ): ئەو شتەی (بەخۆ وەرگرت/ کردی بە نەریتی).

(عَــوَّذَ- الرَّجُــلَ تَعويــذاً): نوشــتەی بــە پیاوەکەوە کرد تا بیپارێزێت.

(عَوَّذَ وأعاذَ-الرَّجُلَ. إعاذَةً وأعْوَذَ-ه أعواذاً): دۆعای پاراســتنی بۆ کردو پێی وت دەتخەمە پەنای خوداو خودا بتپارێزێت.

(«تَعَــوَّذَ واســتَعاذَ باللهِ فَأعــاذَهُ وعَوَّذَهُ»): پەنایــبردە بەر خــوداو خودایش پاراســتی‌و پەنایداو سەریخست.

(تَعَوَّذَ واسْتَعاذَ- بِفُلان من كذا): لەتاو ئەوە خۆی دایە پاڵ فیســار/ پەنای بۆبرد/ هانای بۆ برد.

(تَعاوَذَ- القَومُ): خوێشــگەل پشتیان بەیەك بەستوو پەنایان بۆ یەکتر برد.

(ألعائِــذ (ج) عُــوَّذ): پەنابــەر/ هانابــەر/ خۆخستنەرەپاڵ.

(ألعائِذ (ج) عُوْذ وعُوذان و (حجج) عُوْذات): بەچکــەی تــازە بــووی حوشــترو کارمامزو جوانووی تازەبوو. کــە بەچکەکانیان پەنا بۆ دایکەکانیان دەبەن‌و خۆیان دەدەنە پاڵیان.

(ألعائِذَةُ (ج) عَوائِذ وعائِذات): مێی وشــەی (العائِذ).

(ألعَوائِــذ) (فك): ناوی چوار هەســارەیە لە ناوەڕاستیاندا هەسارەی (رُبَع)ە.

(ألعَوذ): هانا/ پەنابردن/ پەنا.

(«عَوذٌ بـــالله مِنْكَ»): لە خراپــەت پەنا بە خودا دەگرم/ پەنا بە خودا لە خراپەت.

(ألعَــوَذ): ١-پەنا/ هانـــا/ پەناگـــا ٢-بێزران/ ڕقلێبــوون ٣-گـــەڵای ومریــوی درەخـــت ٤-خەڵکانێکی ڕسواو سووك.

(ألعَواذ): ڕقلێبوون/ چارەنەویستن.

(«ماتركــتُ فُلاناً إلاّ عَواذاً مِنهُ»): فیســارم بۆیـــە جێهێشـــت چونكـــە حەزم لـــە چارەی نەبوو.

(ألعُــوذَةُ (ج) عُوَذ والتَعويـــذ (ج) تَعاويذ): نوشـــتە/ چـــاوەزار/ جـــادوو. دەنوســـرێتو دەكرێت بەو كەسەدا گوایا لە جنۆكەو شێتیو شەیتانو چاوی پیس دەیپارێزێت.

(ألعِياذ): پەناگا/ پەنا.

(«ألعياذُ باللهِ منكَ»): پەنا بەخودا لێت.

(ألمَعاذ) (مص): ١-پەناگرتـــن ٢-پەنا/ پەناگا ٣-نوشتەو چاوەزار.

(«مَعـــاذَ الله ومَعاذَ وَجـــهِ الله= أعوذُ باللهِ أو بِوَجـــهِ الله»): پەنا بەخودا دەگرم یان پەنا بە ڕووی پاكی خودا دەگرم.

(ألمَعاذَة (ج) مَعاذات= العُـــوْذَة): پەناگرتن/ پەنا بۆبردن.

(مَعاذَةَ اللهِ ومَعاذَةَ وجهِ اللهِ): پەنا بە خوداو پەنا بە ڕووی پاكی خودا.

(ألمُعَوَّذ): ١-شـــوێنی گەردانەی مل ٢-لەوەڕگای حوشتر كە لە دەوروبەری خانووەكاندا بێت.

(ألمُعَـــوَّذ والمُعَـــوِّذ والعُـــوَّذ): گیـــای بندڕكو بندرەخـــتو بنبەرد كە شـــاررابێتەوە. وەكو پەنایبردبێت.

عور: ١-(عارَ-ُه. عَوراً): كوێریكرد.

(عَوِرَ. عَوَراً): چاوێكی كوێر بوو.

(-تِ العَينُ): چاوەكە كوێر بوو.

(أعْـــوَر وهي عَـــوْراء (ج) عُور وعـــوْران): چاوێكی كوێرە.

(عَوَّرَ-هُ): چاوێكی كوێر كرد.

(-عَلَيهِ أمْرَهُ): كارەكەی لێ ناشیرینكرد.

(-عَـــن فُـــلان): بەدرۆیخســـتەوەو وەڵامـــی دایەوە.

(عـــاوَرَ- الشَـــمْسَ. مُعـــاوَرَةً): چاودێریـــی خۆرەكەیكرد.

(أعْوَرَ-هُ. إعواراً): چاوێكی كوێر كرد.

(إعْوَرَّ): چاوێكی نابینا بوو.

(إعْوَرَّ وإعْوارَّ-تِ العَينُ): چاوەكە كوێر بوو/ نابینا بوو.

(إسْـــتَعْوَرَ- الرَجُـــلُ): تاكبـــووەوە/ یەكچاو بووەوە.

(ألعائِـــر) (فـــا): ١-كەســـێكە چـــاوی ڕیپۆقی هەبێت ٢-وەردێنە/ تەراخومە ٣-ڕیپۆقی چاو ٤-هەرچی چاو كزبكاتو گلی پێبهێنێت.

(العائر- مِنَ السِهام أوِ الحِجارَة): تیرو بەردی (وێڵ/ لابەلا) كە هاوێژەكەی نەزانرێت.

(العائِرَةُ (ج) عَوائِر): ١-مێی وشەی (العائِر) ٢-زۆریی/ فرە.

(«لَهُ مِــن المال عائِرَةُ عَينَــين»): دارایەکی ئێجگار زۆری هەیە وەکو چاوی پڕبکاتەوە بە شێوەیەك نابینای بکات.

(عَينٌ عائِرَةٌ): چاوێکی ڕیپۆقاوی.

(العَور (م) عَورَة): ١-بەدڕەوشت ٢-بەدڕەفتار.

(ألأَعْــوَر (م) عَــوراء (ح) عُــوْر وعُــوْران وعِيران): یەکچاو.

(ألأَعْــوَر (ج) أعــاوِر) (ح): ١-قەلەڕەشــکە (بەوەی کە قەلە ڕەشــکە شوومەو کوێریشیان بە شــووم/ بــە بــەدووم داناوە بۆیــە وایان ناونــاوە) ٢-کەســێکە کە بــرای دایکوباوکیی نەبێــت ٣-خراپی هەموو شــتێك ٤-بوودەڵەی زیرەکردووی بێمێشك کە نەرانوما دەکاتو نە دەچێتە سەر ڕێو بێفەرە ٥ ڕانومایەکی نەزان کە ڕانومایيەکەی ناتەواو بێت ٦-ڕێگەیەك کە نیشــانەو بەیداخی لەســەر نەبێت وەك ئەو بەیداخە چاوی ڕێگەکە بێت.

(كَلِمَةٌ عَوراء): وشــەیەکی ناشیرین وەك چاو کوێر بکات.

(ألعُــوّار (ج) عَواويــر): ١-ڕیپۆقــی چــاو ٢-کەســێکە کــە بەلــەدی ڕێگەیــەك نەبێت ٣-بوودەڵەی زیرەکردوو.

(ألعُوَيْر) (ح): قەلەڕەشکە.

(رَجُلٌ مُعْوِر): ڕەفتار ناشیرین.

٢-(عارَ- عَينَ المــاءِ أَو الركِيَّة):کانیەکە یان چاڵاوەکەی کوێر کردەوەو پڕکردەوەو بە گڵ دایپۆشی.

(-ت عَــينُ المــاءِ أَو الركِيَّــةُ): کانییەکــە کوێربــووەوەو چاڵاوەکە پڕبــووەوەو ئاویان برا.

(-الشيءَ): شتەکەی فەوتاندو لەناوبرد.

(عَوَّرَ- عَينَ البِئرِ): چاڵاوەکەی پڕکردەوە تا ئاوی لێبڕا.

(أَعــارَ- عَــينَ المــاءِ أَو الركِيَّــة): کانیەکەو چاڵاوەکەی بە گڵ بەرگرتو داپۆشی تا ئاویان لێبڕا.

(ألأَعْــوَر (ج) أَعــاوِر): کتێب یان نوســراوی سڕراوە.

(فَلاةٌ عَوراء): بیابانێکی بێئاو.

(ألَمعانــي العُــوْر): واتــای نادیــارو وردو تەمومژاوی (لە کوێرکردنەوەی ســەرچاوەی چاڵاوەوە هاتووە).

٣-(عَوَّرَ- المَكاييلَ): (سەنگەکانی/ پێوەرەکانی) خەملاندو هەڵسەنگاند.

(عــاوَرَ وعايَــرَ- المَكايــلَ): ســەنگەکانی هەڵسەنگاند/ خەملاند.

٤-(عَــوَّرَ-هُ عَــنِ الأمرِ): لــە کارەکەی لاداو دووریخستەوە.

(-فُلاناً): دەســتی بــە ڕووی فیســارەوە ناو پێداویستیەکەی نەدایە.

٥-(أَعْوَرَ- الشيءُ. إعْوِراراً): ١-شتەكە دەركەوت ٢-ئەندامی شەرمی دەركەوت.

(-الفـارِسُ): سـوارەكە شـوێنێكی زرێكەی ناتـەواو بوو كە لەوانە بوو نێزەو شمشـێری لێوەی بەركەوێت.

(-الرَّجُلُ): گومانی پەیداكرد/ دلێ پیسكرد.

(أَلعَورَةَ (ج) عَوْرات وعَوَرات): ١-كەلەبەرێكو ناتەواوییەكی سنووری ولاتو هیتر كە مەترسی هەبێتو سلی لێبكرێتەوە ٢-هەموو حەشارگەو پەناگایەك كە خۆی تێدا بشـاررێتەوە ٣-گشت كارێك كە شـەرمی لێبكرێت ٤-هەموو شتێكو ئەندامێـك كە مرۆڤ شـەرمی دەرخسـتنی لێبكات.

(أَلعَورَةُ مِن الجبال): تلیشو درزی شاخ.

(أَلعَوار والعِوار والعُوار): ١-خەوشو ناتەواویی.

(«سِلعَةٌ ذات عَوارٍ»): (كالایەكی/ كەلوپەلێكی) خەوشدار ٢-پینەو دراویی بەرگ/ جل.

(أَلعَوارِيَّةُ )(ت): كەلوپەلێك كە ئاوی دەریای بەركەوتبێتو نرخەكەی شكابێت.

(شـيءٌ عَوِرٌ): شـتێكی ڕووت/ نەپارێزراو/ بێبەرگو پارێز.

(أَلمُعْور – مِنَ الأَمْكِنَة): شوێنی ترسناك.

(شـيءٌ مُعْـوِرٌ): شـتێك كـە نەپارێزرێت/ ڕووتبێت.

٦-(أَعارَ- الشـيءَ ومِنَ الشيءِ): شتەكەی بە ڕووتی دایە.

(عاوَرَ-هُ الشيءَ مُعاوَرَةً): ١-ئەو چی لە شتەكە كرد ئەمیش وای لە شـتەكە كرد ٢-بەڕووتیی دایە.

(تَعَوَّرَ- القَومُ الشَـيءَ): شتەكە یان، بەسەرە بەیەكداو دەستاودەستیان پێكردو كەڵكیان لە شتەكە بینی.

(-أَلعارِيَةَ): خواستی.

(تَعاوَرَ وإعتَوَرَ- القَومُ الشـيءَ): شـتەكەیان بەسـەرە بەیەكداو دەستاودەسـتیان پێكردو كەڵكیان لە شتەكە بینی.

(«تَعـاوَرَتِ الرياح رسـمَ الـدارِ»): با هەر جارەی لە لایەكەوە هەڵیدەكردە سەر كەلاوەی خانووەكە.

(إستَعارَ- الشـيءَ مِن فُلانٍ واسـتَعارَ فُلاناً الشيءَ): شتەكەی لە فیسار خواست.

(«أَرى الدَّهـرَ يَسْـتَعيرُ ثيابـي»): ئەبینم ڕۆژگـار بەرگم دەخوازێـت/ ڕووتمدەكاتەوە (ئەمـە پیرێـك دەیڵێـت كە ترسـی مردنی لێنیشتبێت).

(أَلعارَةَ والعارِيَةُ والعارِيَّةُ (ج) عَوارٍ وعَوارِيّ): ١-خواسـتن/ شـتی خوازراو كە بە مەرجێك بیهێنیتەوە ٢-ئەو شـتانەی خوێشـگەل لەناو خۆیاندا بەكاریدەهێننو بەیەكی دەدەن.

٧-(أَلعَـورَةُ- مِـنَ الشَّـمس (ج) عَـوْرات وعَوَرات): خۆرهەڵاتو خۆرئاوای خۆر.

(أَلعَوائِر- مِنَ الجَراد): كۆمەڵە كوللەی جیاجیا.

(ألعُوَّار (ج) عَواوير) (ح): پەڕەسێلکە.

(ألعيران): کۆمەڵە کوللەی جیاو بڵاو.

(ألمُعـــار): چارەوێی لاوازو تێقوپاو یان تووکی کلك هەڵکێشراو.

عـــاز: ١-(عازَ- الشـــيءُ فُلاناً عَوْزاً): فیســـار شتێکی دەویستو دەستینەدەکەوت.

(عَوِزَ- الشـــيءُ. عَـــوَزاً): شـــتەکە نەبووبوو دەستگیر نەبوو کە تۆ پێویستت بوو.

(-الأمرُ): کارەکە چووە بەست دەستنەکەوت/ نەبوو بوو.

(عَـــوِزٌ وعائِزٌ وأعْوَزٌ): دەســـتکورت/ نەبوو/ نەدار/ هەژار.

(أعْوَزَ- الرَجُـــلُ): (هەژار/ نەبـــوو/ نەدار/ دەستەنگ) بوو و بەد گوزەران بوو.

(مُعْـــوِز ومُعْـــوَز): نـــەدار/ نەبـــوو/ هەژار/ دەستەنگ.

(أعْوَزَ- الشـــيءُ): شـــتەکە خۆشەویستبوو و چنگنەکەوت/ گرانبوو.

(-الدَهرُ فُلاناً): ڕۆژگار فیساری هەژارکرد.

(-هُ المَطْلوبُ): ئەوەی دەیویستو پێویستیبوو لێی چووە بەست دەستگیربوونی گرانبوو.

(أعْوَزَني الشـــيءُ): شتەکەم پێویستبوو بەڵام دەستمنەکەوت.

(إعْوَزَ. إعْوِزازاً): ڕەوشو گوزەرانی تێکچوو.

(ألعَـــوَز): نەبوونیی/ هەژاریی/ دەســـتکورتیی/ نەداریی/ تەنگەتاوبوون/ تەنگانە/ کەمدەستیی.

(ألمِعْوَز والمِعْوَزَةُ (ج) مَعاوِز ومَعاوِزَة): بەرگی شڕو دڕاو (چونکە بەرگی هەژارانە).

٢-(إعْوَزَّ. إعْوِزازاً): فێڵیکرد.

٣-(ألعَوز): بۆڵە تری.

(عَوْزَة): بۆڵەترێیەك.

(ألمِعْـــوَز ومَعـــاوِزَة): بەرگی ســـەربەرگ کە پێیدەپارێزیت.

عاسَ: (عَوْساً وعَوَساناً): بە شەو گەڕا.

(-الذِئْبُ. عَوْساً وعِياسَةً): گورگەکە بە شەو بۆ شتێك گەڕا کە بیخوات.

(العاس): پاسەوانی شەو.

٢-(عـــاسَ- على عيالِهِ عَوســـاً وعَوَســـاناً): ڕەنجی بۆ خێزانەکەیدا.

(-عيالَهُ): خواردنی دەرخواردی خێزانەکەیدا.

(-مَعيشَتَهُ. عَوساً): بژێویی/ گوزەرانی خۆی باشکرد.

(العَوَّاس): ڕەنجدەرێکی چابوك.

٣-(عاسَ- الشيءَ. عَوساً): شتەکەی وەسفکرد/ نیشانەکانی هەڵدا.

٤-(عَـــوِسَ): ڕوومەتی گردبـــوومەوە چاڵ بوو ئەمە بە زۆریی لە پێکەنیندا دەردەکەوێت.

(أعْـــوَس): ڕوومـــەت خڕبـــوو و چاڵبوو بە تایبەتی کاتی پێکەنین.

٥-(ألعُوْس) (ح): بەرانی سپی.

(«کَبشٌ عُوسِيٌ»): بەرانە سپی.

(ألعُوَيْسَه أو العُوَيســـية) (عامية): چەقۆی

بچووکی گیرفان.

عــاص: ١-(عــاصَ وعَوِصَ الشــيءُ. عياصاً وعَوَصاً): شتەکە گیر بوو/ تێیگیرا/ تێچەقی.

(-الكَلامُ): تێگەیشتنی ئاخاوتنەکە گرانبوو/ بە پێچ و پەنا بوو/ تەمومژاوی بوو.

(عَوِّصَ): لە قسـەو کـرداردا (ناراسـتبوو/ خواروخێچبوو/ بەپێچ و پەنا بوو).

(-الشــاعِرُ أَو الخَطيــبُ): شــاعیرەکە یــان وتاربێژەکــە شــتێکی وت کــە لێــی تێنەدەگەیشتن.

(أَعْوَصَ عَوَصاً و عَياصــاً والقياسُ إعواصاً بخَصْمِهِ وعلى خَصْمِهِ): ناحەزەکەی خستە گێــژەوە بــە بەڵگــەو بیانوویەکــی وەها کە نەتوانێت ڕووبەڕووی بوەستێتەوە.

(-في الكَلام): قسـەکەی بە پێچوپەنا کرد کە لێی تێنەدەگەیشتن.

(إعْتاصَ- الأَمــرُ عَلَيهِ إعْتاصــاً): کارەکەی لــێ گرانبــوو لێــی چووە بەسـت/ سـەری لێدەرنەکرت/ ڕاستی بۆ ساغ نەبووەوە.

(العائِــص والعَوْص والعَيْصاء): سـەختیی و دژواریی/ نەبوونیی/ پێداویستیی.

(ألعَوَص): دەستکورتیی و نەدارایی/ تەنگانە/ بێتوانایی.

(ألأَعــوَص (م) عَوصاء): ١-ناڕوون ٢-قســەی سەیروسەمەرەو بە پێچوپەنا.

(ألعَوصــاء): ١-مێــی وشــەی (الأَعْــوَص) ٢-تەنگانەو نەبوونیی.

(كَلِمَةُ عَوصاء): وشەیەکی نادیار/ نهێن.

(ألعَويص): نالەبار/ گیر/ سەخت.

(ألعَويص (م) العَويصَة – مِنَ الأُمُور):١-کاری گران/ دژوار/ گیر ٢-بەپێچ و پەنا/ نارەحەت.

(-مِــنَ الــكَلام): قســەیەك کــە گــران لێی تێبگەن.

(-مِــنَ الدواهي): قەوماوی ســەخت و وەبی گران.

٢-(عاوَصَ-ەُ مُعاوَصَــةً): ململانێی لەگەڵدا کرد/ زۆرانی لەگەڵدا گرت.

(ألعَوْص):١-هێز ٢-جمە/ بزوە/ جووڵە.

(ألعَويص):١-هێز ٢-جووڵە/ بزوە.

٣-العَوْص والعَويص: دەروون.

عاض: (عــاضَ وعَوَّضَ وعــاوَضَ وأَعاضَ- فلاناً وعياضــاً وإعاضَةً): (لە بری نەوە/ لە جیاتی ئــەوە)ی دایە/ قەرەبووی بۆ کردەوە/ هۆی بۆ کردەوە.

(تَعَــوَّضَ- مِنــهُ): لــە باتی، شــتی وەرگرت قەرەبووی وەرگرت.

(إعْتــاضَ- فُلانــاً): داوای قەرەبوویکــرد لە فیسار.

(-مِنــهُ): قەرەبــووی لێوەرگــرت (لە باتی/ لەبری) وەرگرت.

(إسْتَعاضَ- فُلاناً): داوای قەرەبووی لە فیسار کرد.

(عَوْضُ. عَوْضَ. عَوْضِ): ١-هەرگیزاوهەرگیز.
(«لاأفارِقُكَ عَوْضُ»): هەرگیزاوهەرگیز لێت جیانابمەوە.
(«مارَأیتُ مِثلَهُ عَـوضُ»): هەرگیز یەکێکی وەکو ئەوم نەدیوە.
(«لا أفـعَـلُـهُ عَــوْضَ الـعـائِـضـین»): هەرگیزاوهەرگیز ئەوە ناکەم.
(ألعِوَض (ج) أعـواض والعائِض والمُعوضَة): لە جیاتی/ لەبری/ لە جێی.
الملحق:
عــوض: (التَّعویض): لە بری دان/ قەرەبوو/ بۆ بژاردن.
(«تَعْویض الخَسارَة»): زیان بژاردن.
(ألتَّعویــض (ج) تَعویضات): ئەوەی لە بری زیان دەدرێت/ زیان بژاردن.
(دُفِعَ لَهُ تَعویضٌ عَن نَزْعِ المُلكیة): قەرەبووی ئەو موڵك و ماڵەی دەســتی بەسەردا دەگرن و لێیدەستێنن پێدرا.
(ألتَعویض): ئــەو پارەیەی بــە کارمەندێك بــە کرێکارێــك دەدرێت کاتێك لــە کارەکەی دەریدەکــەن یان خانەنشــین دەبێــت لەبەر گەیشتنی بە تەمەنی خانەنشینی.
(«تَعویضاتُ الصرف»): قەرەبووی لەکاربوون. یان پارەیەکی تر کە سەربارەی مووچەو کرێ بێت بە کەسێك دەدرێــت کە کاری زۆرتری پێبکرێت یان هی بارێکی تایبەتی بێت.

(«تَعویــض إنتقــال»): قەرەبــوو و پارەی گواستنەوەی کەسێك.
(«تَـعـویـض الـعـائـلـي»): قـەرەبـووکـردنـی خێزان.

---

عاف: ١-(عــافَ- الطائِــرُ یَعــوفُ. عَوفاً): باڵندەکە بەسەر شــتەکەوە یان ئاوەکەوە یان کەلاکەکــەوە گرێخــوارد/ چەرخەلەیکــردو ویستی بۆی دابپەرێتە خوارێ.
(تَعَوَّفَ- الأَسَــدُ): شــێرەکە بە شەو خۆی بۆ نێچیرەکە نایەوەو گرتی و خواردی.
(ألعَــوْف): ١-(ح) الأَسَــد (چونکــە بەشــەو خــۆی دەنێتــەوە ٢-گــورگ ٣-ڕەنجــدەر بۆ خێزانەکەی.
(ألعُــواف والعُوافَة): ١-ئەوەی شــێر بەشــەو دەیگرێت و دەیخوات ٢-تالآنیی و دەستکەوت.
٢-(ألعاف): ئاسان.
(ألعَــوْف): ١-بارو گوزەران و سروشــت ٢ (ح) کەڵەشــێر ٣-مەلێکــە ٤-ڕەنجــدان و بەخــت ٥-میوان.
(أبُو عَوْف) (ح): نێرە کوللە.
(أُمّ عَوف) (ح): مێکوللە.
عوق: ١-(عاقَ وعَــوَّقَ وأعاقَ واعتاقَ-هُ عَن كذا. عَوْقاً وإعاقَةً واعتیاقاً): ڕێی ئەو شتەی لێگرت و تەگەرەی خســتە بەری دوایخســت و نەیهێشت بیگاتێ و ساردیکردەوە.
(تَعَوَّق): کۆسپ/ تەگەرە هاتەرێی دوایخست و

(-مِنَ الإنسان): (شەرمی/ درزی) پێش‌و پاشی مرۆڤ.

(فَرجُ الوادي):ناوسکی دۆڵ.

(-الطَريق):ناوەراستی ڕێگا.

(أَلفَرْج والفُروج):کەوانێك لە ژێکەیەوە دووربێت.

(الفُرجَة (ج) فُرَج): دەروو/ دەلاقە/ کەلەبەر/ کەلێن/ هەموو بۆشاییەکی نێوان دوو شت.

(أَلفَرّوج (ج) فراريج):١-کراسی منداڵی بچووك ٢-دەوارێك/ خێوەتێك قلیشێکی لە پشتەوە بۆ کرابێت.

(أَلفَريج):دەرکەوتووی دیار.

(قَوسٌ فَريج):کەوانێك ژێکەی دووربێت.

(أَلتِفْرِجَة (ج) تَفارِج):بۆشایی نێوان دوو پەنجە یان دوو ستوون.

(تِفراج (ج) تَفاريج): ١-بۆشایی ناو موحاجەرە یان نێوان پلەی پەیژە ٢ بۆشایی نێوان پەنجەکانی یان قلیشی نێوان پارچەکانی (پۆشاك/ کراس).

(أَلمُفَرَّج):١-شانە ٢-کەسێك کە ئانیشکی زۆر لە بنباخەڵیەوە دووربێت.

٢-(فَرَجَ-اللهُ الغَمَّ عَنهُ فَرْجاً):خودا پەژارەی (لە دڵ دەرکرد/ لە کۆڵکردەوە/ ڕەواندیەوە).

(فَرَجَ- اللهُ الغَمَّ عَنهُ): خودا (جەخاری/ خەفەتی) لە دڵ دەرکردو لەسەر لابردو ڕەواندیەوە.

(-هُ على شيءٍ غريبٍ لَمْ يَرَهُ مِن قَبل): شتێکی سەیری پیشاندا کە لەوەپێش نەیدیبوو (مولّدة سريانية الاصل).

(أَفْرَجَ الغُبارُ):تۆزەکە/ گەردەکە ڕەوییەوەو لاچوو.

(القَومُ عَنِ المَكانِ):خوێشکەل لێیلاچوون بە جێیانهێشت.

(تَفَرَّجَ- الغَمُّ):خەمەکە/ خەفەتەکە/ داخەکە لە دڵ ڕەوییەوە.

(-القَومُ عَنِ القَتيلِ):وازیان لە کوژراوەکە هێناو لێیدوورکەوتنەوە.

(تَفَرَّجَ- الغَمُّ):داخەکە لە دڵ دەرچوو.

(إنْفَرَجَ الغَمُّ): (داخەکە/ پەژارەکە) ڕەوییەوە.

(-الرَجُلُ مِن ضَيْقِهِ):پیاوەکە لە تەنگانەکەی ڕزگاریبوو.

(أَلفَرْج والفُرُج والفِرج والفُرَجَةُ من الرجال):پیاوانێك کە نهێنیی نەپارێزن‌و لایان نەمێنێتەوە.

(أَلفَرَج= الإنْفِراج):دەروو/ لە تەنگانە ڕزگاربوون.

(أَلفُرجَةُ):لە تەنگانەو پەژارەو ناهەمواریی ڕزگاربوون/ دەروولێبوونەوە.

(-عِندَ المُوَلّدين): لای تازەگەرییەکان پیشانگایە کە شتی تازەو سەیری تێدا

پیشـاندەدەن (ئـەو تەماشـاکردنە دەبێتـە خەمرەوێنو مەراق لە دڵ دەرکردن).
(اَلفَرجَـة والفِرجَـة): لە پـەژارەو مەراق رزگاربـوون/ دڵکرانـەوە/ لەتەنگانـە رزگاربوون.
(اَلتِفرجَـة والتِفْراجَـة (ج) تَفاريـج): بوودەڵەی زۆر ترسنۆك.
(المُفْـرَج): ١-کوژراوێکی نـاو بیابان کە کەس نەزانێت کێ کوشـتوویەتی ٢-کەسێکە نەداراو بێکەسو خزمو خێڵو بێوەچەو زارۆڵە.
٣-(أفْـرَجَ- تِ الدجاجَـةُ): مریشـکەکە جووچکدار بوو.
(مُفْرج): مریشکی جووچکدار/ جووچکەلەبەر.
(اَلفَـرُّوج والفُـرُّوج (ج) فَراريـج) (ح): جووچکی مریشك.
(فَرُّوجَـة): جووچکێـك بـە تایبەتـی هـی مریشك.
٤-(اَلفِرْجار): پەرگاڵ.
(خَـطٌّ فِرجـارِيّ) (فارسـية): هێڵێکی یان نووسینێکی خڕ.
٥-(جَـنَّ- الدابَّـةَ. فَرجَـنَ): وڵاخەکـەی رنەککردو تۆزو خۆڵی لێکردەوە.
(اَلفِرجَـون= المَحَسَّـة): رِنـەك (معرب عن برجين الفارسية).
الملحق:
فـرج: اَلمنفَرِجَـة: اَلزَّاوِيَـة المُنْفَرِجَة (هـ): گۆشـەی کـراوە کـە لـە گۆشـەی وەسـتاو گەورەترە.
فـرح: ١-(فَرِحَ- بِالشـيءِ فَرَحـاً): دڵی بە شتەکە کرایەوە/ بە شـتەکە دڵی (خۆشبوو/ کەیفخۆشبوو).
(فارِح وفَرِح): کەیفخۆشبوو، هەوس پێهەستاو/ کەیفخۆش.
(فَرَّحَ-هُ): دڵخۆشیکرد/ شادیکرد/ دڵیکردەوە.
(أفْرَحَ-هُ): دڵخۆشیکرد.
(اَلفَرَح): خۆشـیی/ دڵخۆشـیی/ شادمانیی/ پێخۆشحاڵیی.
(الفُرحَة والفَرحَة): ١-دڵخۆشکەر/ شادیبەخش ٢-مژدانـەی خۆشـیی. (اَلحُـوان والبُشـارَه) (عاميه): مژدانە.
(اَلفَرْحَـان (م) فَرحـى وفَرحانَـة) (ج) فَرحـى وفَراحـى والفَـرُوح (ج) فُـرُح): دڵخۆش کەیفخۆش/ بەکەیف/ پێخۆشـحاڵ/ کەیفخۆش/ دڵشاد/ گوشاد.
(اَلمِفراح): زۆر (دڵخۆش/ دڵکراوەو شـاد) (بۆ نێرو مێ).
(اَلمَفْـروح): دڵخۆشـبوو/ پێگوشـاد بـوو/ دڵپێکراوە ٢-کەیفخۆش/ دڵخۆش/ شاد.
٢-(أفْـرَحَ-هُ الدَيـنُ): (وام/ قـەرز)ی بەسەرەوە بوو باری گرانکرد ٢-خەفەتیدایە/ دڵیتەنگکرد.
(«أفْرَحَتنـي الدنيـا ثُـمَّ أفْرَحَتنـي»):

جیهان خۆشـیدامیو دڵی گوشاد کردم پاشان داخیدامێ.
(المُفْرَح) (مفع): هەژاری نەبوو/ نەدارا.
٣-(المُفــرَح): کەسـێکە نەزانرێت ڕەسـەنی کێیە.
فــرخ: ١-(فَــرخَ- إلى الأرض فَرَخـاً): بەزەویەکەوە نووسا.
(-الرَجُلُ): تۆقینەکەی لەسەر چوو.
(فَــرَّخَ-تِ البَیضَــةُ): هێلکەکـە ترەکـیو جووچکەکەی دەرهات.
(-تِ الطائِــرَةُ): باڵندەکــە جووچکەکانـی هەڵهێناو بوو بە خاوەن جووچك.
(مُفَرِّخ): هەڵهێنی هێلکەکانی/ جوجکدار.
(فَرَّخَ- القَومُ): خوێشــگەل بێتواناو زەبوون بوونو تۆقین وەك جووجەڵە.
(-الشَجَرُ): درەختەکە بێچوولەی دەرکرد.
(فَرَّخَ- الرَّوعُ): ترسو تۆقینەکە ڕەوییەوە.
(أفرَخَ- تِ البَیضَة والطائِرَةُ): هێلکە ترووکاو باڵندەکە جووچکەکەی هەڵهێنا.
(أفرِخ- رَوعَكَ): ترسەکەت لە مێشك دەرکە/ مەترسە.
(-الأَمــرُ): کارەکە ڕوونبووەوە کە لەوە پێش ئاڵۆز بوو گومان لە ئەنجامەکەیدەکرا.
(«أَفْرَخَ القَومُ بَیْضَتَهُم»): خوێشگەل ڕوویان ڕوونبــووەوە پــاش ئەوەی هەواڵی خۆشــیان بیست.

(إسْــتَفْرَخَ- الحَمامَ): کۆتری بۆ بێچووکردن ڕاگرت.
(-الحَمــامُ): کۆترەکــە بەچکــەی هەڵهێناو بەچکەی پەیداکرد.
(أَلفَــرْخ (ج) فِراخ وأَفْراخ وأَفْــرُخ وأَفْرِخَة وفِرْخان وفُــرُوخ) (ح): ١-بێچووی باڵندە ٢-بێچوولــەی ڕووەكو زیندەوەر/ تەرزی تازەی درەخت.
(-مِــنَ الشَــجَرِ): بێچوولــەی درەخت کە لە بنیەوە دەردەچێت.
(-الرجــلُ): پیــاوی سەرشــۆڕی زەبوونــی دەرکراوی داماو.
(فَرْخُ الرَأْسِ): مێشك.
(أَلفَرخَةُ (ج) فِراخ (ح): مێی وشەی (أَلفَرْخ): جووجەڵە مێچکە.
(أَلمَفْرَخ (ج) مَفارِخ): هەڵهێنگە.
٢-(أَلفَرخَةُ): سەرە نێزەی پان.
فرد: ١-(فَرَدَ. فَرُوداً): تاکێکبوو/ یەکێکبوو.
(-عَــنِ الشَــيءِ): لە شــتەکە جیابــووەوەو تەریکبوو/ تاکبووەوە.
(فَرِدَ وفَرُدَ. فُرُوداً): تاکبوو/ یەکێکبوو.
(-بالأَمــرِ): کارەکــەی بە تەنیــا گرتو هەر خۆی ئەنجامیدا.
(فَــرَّدَ): ١-فێری شــەرعبوو و کاری پێکرد ٢-گۆشــەگیر بوو/ لــە خەڵــك دوورکەوتەوە/ کەنارگیر بوو.

(-برَأيِهِ): ڕا هەر ڕای خۆی بوو/ هی کەسی وەرنەگرتو بە هی کەس کارینەکرد.

(أفْرَدَ- الشيءَ): شتەکەی لاخست/ جیایکردەوە/ تاکیکردەوە.

(-تِ الأُنثى): مێکە زاو یەکێکیبوو.

(مَفرد): تاکزا.

(-بالإمرِ): کارەکەی بە تەنیا گرتە دەستو ئەنجامدا.

(-إلَيهِ رَسولاً): فرستادەیەکی بۆ تەرخانکردو بە پێویستیەوە بۆی نارد.

(تَفـرَّدَ- بالأمـرِ): ١-کارەکـەی بـە تەنیـا گرتەدەستو خۆی کردی ٢-لە کارەکەدا تەنها کەس بوو کە کەس نەیدەگەیشتێ.

(إنْفَرَدَ): تاکبووەوە.

(-بالأمرِ): ١-لە کارەکەدا بە تەنها بوو و هەر خۆی ئەنجامیدا ٢-لە کارەکەدا تاکە کەسبوو کە کەس نەیگاتێو بێوێنە بێت.

(إسْتَفْرَدَ-هُ): ١ بە تەنیا دی/ بە تەنیا لەگەڵیدا بـوو ٢-لەنـاو هاوڕێکانیـدا جیایکـردەوەو هەڵیبـژارد ٣-بـە تەنیـاو لـەلاوە لەگەڵیدا یەکیگرت/ ویسـتی هەر بە تەنیـا ببیینێت ٤-تاکیکردەوەو کەسـیتری نەگرتو کەسی لە وێنەی ئەوی نەویست.

(-بالأمرِ): کارەکەی بە تەنیا گرتو ئەنجامدا.

(ألفـارِد) (فـا): ١ تاکەوەبـوو ٢-هەڵبژاردە/ ناوێزە.

(ألفارِدَة (ج) فَوارِد): ١-مێی وشـەی (الفارِد) ٢-ئـەو مـەڕەی جیاکراوەتـەوەو لـە ماڵەوە هێڵراوەتەوە.

(ناقَـةُ فـارِدَة): مێحوشـترێك بـە تەنیـا بلەوەڕێنرێتو بە تەنها لە لەوەڕگاکەدا بێت/ تاکەوەبوو.

(ألفَـرْد (ج) فِراد): ١-تاك/ یەك/ کەسـێك/ تەنها/ تەنیا ٢-نیوەی جووت = تاك.

٣-(ج) (أفـراد وفُـرادى): تەنهـاو تـاك/ بێوێنە.

(ألفَـرد (ج) فُـرودَة وفُـرُود) (عامیـة): دەمانچە.

(ألفَرد (ج) أفراد): لایەکی ڕیش.

(ألفَرْد): تاکە پێڵاوێك کە پارچەی لێنەدرابێت.

(«هذا شـيءُ فَـردٌ»): ئەمە شـتێکە تاکە/ بێوێنەیە/ ناوێزەیە.

(أفرادُ الناس): گەورەپیاوانی خەڵك.

(أفْـرادُ النُجُوم وفُرُودُها): ئەسـتێرەی تاکە تاکەو لەملاولای ئاسـمان کە دوورەپەرێزنو لاکەوتەن.

(ألفَرَد والفَرد): تاك/ یەك/ بێوێنە.

(«هذا سَيفٌ فَرَدٌ وفَرِدٌ»): ئەمە شمشێرێکە تاکەو بێوێنەیە.

(«شـيءٌ فَردٌ وفَرِدٌ وفَرُدٌ وفُرُدٌ»): شـتێکی (تاكو بێوێنە/ تاقانە).

(ألفَرْدَةُ (ج) فَرْدات وأفراد وفَرَد): مێی وشەی

(الفَرد) و (عند المَكاري: نصف الحملِ): لای کاروانچیەکان تای بارێکە/ نیوەی بارێکە.
(- مِنَ البِضاعَة) (ت): فەردە شـتێکی کاڵای بازرگانەکان.
(اَلفُرْدَة): کەسێکە بە تاكو تەنیا بڕوات.
(اَلفَردانُ (م) فَرْدی): تاك/ یەکێك.
(«شيءٌ فَرْدان»): شتێکی تاکەوەبوو/ تاك.
(«لَقَيتُــهُ فَرْدَين»): بە تەنیا پێکەوە بووین هــەر هەردووکمانبوویــن کەســمان لەگەڵدا نەبوو.
(«جــاؤُوا فُــرادَ وفُــرَاداً وفَــرْدی وفِــراداً وفُرادَی»): تاکە تاکە/ یەك یەك هاتن.
(فَــرَدَ وفَرِدَ وفَرِيد وفَــرْدان): تاك/ تەنها/ یەك.
(اَلفَرَّاد): فرۆشیاری شتی گرانبەها/ دەگمەن.
(اَلفَردِيّ): تاکەیی/ تاکرەو.
اَلفَردِيَّة: ڕێڕەوی ئەوانەیە کە دەڵێن تاك لە کۆمەڵ تاکبێتەوەو گۆشەگیر بێت/ تاکڕەویی. (اَندیفیدیوبالیسم).
اَلفَــرود- مِــنَ الأَشــیاء: شــتی تــاك تاکە/ جیاجیا.
ناقَةٌ فَرُودٌ: مێحوشــترێك کە لە لەوەڕگاکەدا بە تەنیا بلەوەڕێتو تاکبووبێتەوە.
(اَلفَريــد (ج) فرائِــد): ١-تــاك ٢-تەنیــا ٢-تاکێك/ تەنهایەك کە لە وێنەی نەبێت ٣-مووروو لــە ملوانکەدا کــە دەنکی مــرواریو زێڕ لە یەك جیادەکاتەوەو دەکەوێتە نێوانیانەوە ٤-دوڕ ئەگەر بهۆنرێتەوەو شتێك بخرێتە نێوان دەنکەکانیەوە ٥-گەوهەری گرانبەها.
(«أَتی بالفَرائِد»): شتێکی وتووە گرانبەهایە وشــەی دانســقەو جــوان لــە ڕووی ڕەوانیی زمانەکەیــەوەو بــە نرخیــی گفتەکەیەوەو زمانپاراویی‌و پوختیی عەرەبییەکەیەوە.
(اَلمُفْــرَد): تاك (مفع) یــەك بەرامبەرەکەی (اَلجَمْع): کۆ.
(اَلارقام المُفْــرَدَة) (ع ح): ژمارە تاکەکان کە جووتنین وەك: یەك. سێ. پێنج.. هتد.
(اَلمُفَــرَّد- مِنَ الذَّهَب): دەنکی هۆنراوەی زێڕ کە لە یەك جیاکرابێتەوە.
(اَلفَريدَة (ج) فَرائِد): ١-تاکی وشەی (اَلفَريد) ٢-گرێــی پێــش دواگرێــی بڕبــڕەی پشــت ٣-گەوهەری گرانبەها.
(اَلمُفَرِّد) (فا): تاکەوەبوو/ تاك.
(«راكِبٌ مُفَرِّد»): تاکە سوارە کە بە تەنهایەو خۆیو حوشترەکەی یان ئەسپەکەیەتی.
٢-(اَلفارِد والفَرَد) (ح): گا.
(اَلمَفْرَد (ح): گاکێویی.
٣-(فَــرْدَسَ- هُ فَردَسَــةً): کوتای بە زەویداو پشتی لە زەویدا.
٤-(اَلفَرْدَسَــةُ): ١-فراوانیی ٢-دەوڵەمەندیی‌و دەستڕۆیویی.
اَلفِــرْدَوس (ج) فراديس: ١-باخو بێســتانو

بەهەشــت ٢-لالەزار یان باخچە ٣-ســەوزایی (دەکرێتە مێو نێر).

(فِردَوس النَّعیم): ئەو بەهەشتەی کە خودا ئادەمو حەوای تێدا دانا تا گوناهەکەیانکرد.

(ألمُفَرْدِس): سنگفراوان.

(صَدرٌ مُفَرْدَس): سنگێکی فراوان.

(کَــرْمٌ مُفَــرْدَس): مێوێکی پەلهاویشــتووی کەپرکردوو.

فــرز: ١-(فَرَزَ- الشــيءَ مِن غَــيرِهِ. فَرْزاً): شــتەکەی لە هیتر جیاکردەوە/ خستیە لاوە/ نێوانی خستنو لایدا.

(فَــرَّزَ- عَلَــيَّ بِرَأیِهِ تَفْــرَزَةً): ڕاکەی خۆی بەسەرمدا سەپاند.

(فارَزَ- شَریکَهُ): لە هاوبەشەکەی جیابووەوەو لێپچڕا.

(أفْرَزَ-الشــيءَ عَن غَیرِهِ): شتەکەی لەوانیتر جیاکردەوەو لایدا.

(أفْــرَزَ- فُلاناً بِشَــيءٍ): شــتێکی تایبەت بە فیسار کردو بە تەنها بۆ ئەوی تەرخانکرد.

(تَفــارَزَ- الشَــریکان الشَــرِکَةَ): کۆمپانیــا هاوبەشیەکەیان هەڵوەشاند.

(إفتَــرَزَ- الأمرَ): کارەکــەی بڕییەوەو خۆی بڕیاریدا.

(«إفتَــرَزَ أمــرَهُ دُونَ أهــلَ بَیتِــهِ»): خۆی بــە تەنها بڕیــاری کارەکەیدا بێئــەوەی ڕای خێزانەکەی وەرگرێت.

(ألفَــرْز) (مــص): ١-جیاکردنــەوەو لە یەك هەڵوەشاندن ٢-دەرە/ دەرووی نێوان دوو شاخ ٣-نشێویی نێوان دوو بەرزایی/ دووگرد.

(ألفِرْز (ج) أفْراز وفُرُوز): ١-ڕێگای نێوان گرد ٢-بەشی جیاکراوە بۆ خاوەنەکەی.

(ألفَرزَة): قڵیشێك لە زەوییەکی ڕەقەندا.

(ألفِرْزَة): پارچەیەکی جیاکراوە.

(ألفُرزَة): ١-ســەرمیەك و هەڵێك ٢-ڕێگەی ناو گردان/ چەند گردێك.

(ألفارِز) (فا): جیاکەرەوە.

(«کَلامٌ فــارِز»): ئاخاوتنێکــی ڕوونو دیارو ئاشکرا.

(لِســانٌ فارِزٌ): زمانێکی بڕیــاردەرو کۆتایی پێهێن.

(الفارِزة): ١-وێرگول/ چوکڵە ٢-مێی وشــەی (الفارز) ٣-ڕێگەی ناو لم.

(الإفْریز- مِنَ الحائط (ج) أفاریز= (طَنْفَة) (فارســیة): ســەردیوار/ کۆرنیشــی دیوار/ دیوارپارێز.

٢-(أفْــرَزَ- الصَیــدُ الصائِــدَ): نێچیرەکە لە قەمچــدا بوو/ پارێــزی بــە ڕاوکەرەکەدا لە نزیکەوە بیپێکێت.

٣-(ألفَــرْزَدق): کۆڵــوی نــان کــە بکەوێتە تەنوورەوە.

(فَرْزَدَقَــة): پارچــە کۆڵوویەکــی نانێك کە بکەوێتە تەنوورەوە.

(فَرَزْدَق): ناوی شاعیرێکی عەرەبە.
فُرَیْدِق وفُرَیْزد (ج) فَــرازِق: کۆلووکەیەك (پێومرەکەی) (فَــرازد)ە ٢-قەراغو لەتەنان/ کۆلووی نان ٣-نان ٤-پارچە هەویر.
٤-(تَفَرْزَعَ- الکَلأُ): گیاکە پەلەپەلە بوو.
(ألفُرْزُع): پەموانە/ تۆوی لۆکە.
(ألفُرْزُعَةُ (ج) فَرازِع): پەلەگیا/ پارچە گیا.
(ألفُــرزُع): ١-پەلەیەکی گیــا/ لەومر ٢-دەنکە پەموانەیەك.
٥-(فَرْزَلَ-هُ فَرْزَلَةً): بەستیەوە/ کۆتیکرد.
(ألفِــرزل): ١ قەید: گاز/ کەتکەری ئاســن کە ئاسنگەر ئاسنەکەی پێ کەرتدەکات/ دەبرێت.
(الفُرْزُل): پیاوی کەتە/ زەبەلاح/ چەتەوڵ.
٦-(تَفَرْزَنَ- البَیدَقُ): سەربازی/ شەترەنجەکە بوو بە شا.
(ألفِــرزان (ج) فَرازیــن): شــا، لــە یاریــی شەترەنجدا.
الملحق:
فــرز: (ألمَفْرَزَة (ج) مَفــارز) (ا ع): کۆمەڵە کەســێکن کە کارێکی تایبەتییان پێدەسپێرن جێبەجێیبکەن.
(«مَفرَزَة تنظیم المُرور»): کۆمەڵە پۆلیسێکی هاتوچــۆن کاری رێکخســتنی هاتوچۆیــان پێدەسپێرن.
(ألمَفرَزَ الصِحیَّة»): کۆمەڵە تەندروستکارێکن کە کارێکی تەندروستییان پێدەسپێرن.

فرس: ١-(فَرَسَ- الأَسَــدُ فَریْسَــتَهُ فَرْساً): ١-شــێرەکە نێچیرەکەیگــرت ٢-ملــی قرتاندو شکاند.
(-الذبیحَة): ئاژەڵەکەی سەربڕیو مۆخەکەی بڕی یان سەری لە لەشی جیاکردەوە.
(فَرَّس-هُ الشيءَ): شتەکەی خستە بەرچاوی بۆ ئەوەی بیگرێتو بیخوات.
(أفْــرَسَ- الرَاعــي): شــوانەکە بێئاگابــوو گورگەکە مەڕێکی لێفراند.
(-فُلانٌ الأَسَدَ حِمارَهُ»): فیسار کەرەکەی بە شێرخواردوو داو خۆی رزگارکرد.
(إفْتَرَسَ- الأَســدُ فَریسَــتَهُ): ١-شێرەکە ملی نێچیرەکەی شکاند ٢-راوی نێچیرەکەیکرد.
(ألفَرْسَةُ): جارێك ڕاوکردنی نێچیرو گرتنی/ ملشکاندنی نێچیر.
(ألفَرسَةُ والفِرسَــةُ) (طب): برینێك کە لە ملدا دەردێتو دەیخواتەوەو باریکیدەکات.
(أَبــو فِــراس والفَــرَّاس) (ح) ألأَسَــد. (أبو فارس) (عامیة): شێر.
(ألـفِـرنـاس (ج) فَــرانِـسَــة): ١-(ح)شــێــر ٢-ملئەستوور.
ألفِرْناس (ج) فَرانِسَــة= ١-شــێر ٢-زۆر ئازاو توندوتیژ.
(ألفَریس (ج) فَرْسى): کوژراو.
(«ثَــورٌ فَریسٌ وبَقَــرٌ فَریــسٌ»): گایەکی کوژراو/ مانگایەکی کوژراو.

(أَلفَريسَةُ): ١-مێی وشەی (أَلفَريس) ٢-نێچیر کە شێرو درندەیتر راویدەکات‌و دەیخوات.
(أَلُفروس): تووشبووی برینی مل.
٢-(فَرَسَ- بِالعَينِ فِراسَةً): چاوی تێبری‌و بە دڵ‌و بــە دیمەنیا زانی چی (لە مێشــکیدایە/ چی لە دڵدایە).
(تَفرَّسَ-فیــه): تێــر ســەرنجیدایەو چــاوی تێبری.
(-فیــه الخَـیرَ): خێــر/ بێــر/ چاکــەی لەناوچەوانیدا خوێندەوەو لێی چاوەرێکرد.
(أَلفارس) (فا): زاناو پێزان.
(«هــو فــارسٌ بِالأَمــرِ»): ئەو بــە کارەکە دەزانێت‌و هەستی پێدەکات.
(الأَفْرَس): کەســێکە راســت‌و تەواو بە چاوو دڵ، مێشــك دەخوێنێتەوە/ بە ســەرنج چاك دەرك بە شت دەکات.
(الفَرَّاس): زۆر زیرەك‌و بلیمەت کە بە چاوو دڵ، مێشك دەخوێنێتەوە.
٣-(فَــرَسَ- الشــيءَ. فَرْســاً): شــتەکەی جیاکردەوەو بڵاوکردەوە.
(فَرَّسَ- السَّــطْحَ): سەربانەکەی گڵە سپیکرد بۆ ئەوەی دڵۆپە نەکات (عامیە سریانیە).
(أَفْــرَسَ- عَــن بَقِيَّةِ مــالٍ): ماڵەکەی بردو شتێکی لێ بەجێهێشت.
(الفَــرْس): گڵــە ســپی کــە بەســەربانەوە دەگرێــت‌و دەگێررێت بۆ ئەوەی ســەربانەکە دڵۆپە نەکات (عامیە).
٤-(فَرُسَ. فَراسَــةً وفُروسَــةً وفُرُوسِــيَّةً): وڵاخدارییکــرد/ لــە بەخێوکردن‌و ســواریی چارەوێدا شارەزا بوو و سوارچاکبوو.
(تَفَــرَّسَ- الرَجُــلُ): خۆی بە ســوارچاك‌و شارەزای بەخێوکردنی چارەوێ پیشاندا.
(«فُلانٌ ليس بفارِس ولكنَّهُ يَتَفَرَّسُ»): فیسار سوارچاکنییە، بەڵام خۆی وا دەنوێنێت.
(أَلفــارس) (فــا): ١-ســوار (ج) فُرســان وفَوارِس): ١-چارەوێسوار ٢-خاوەن (چارەوێ/ ئەسپ/ ماین).
(أَلفَرَس) (ح): ئەســپ‌و مایــن/ چارەوێ. بە ماینیش دەڵێن (حِجر) و لەوانەیشە پێیبڵێن (فَرَسَــة) (ج) (فَرَس) (ثَلاثَة أَفراس): سێ ئەســپ (ثَلاثَةُ أَفراس): ســێ ماین (حج)»: فُرُوس).
(«هُمــا كَفَرَســي رهــان»): ئــەو دوانە بۆ ئامانجێــك تێدەکۆشــن وەك یــەك هەڵپــە دەکــەن‌و وەك یەك چاکن. وەك دوو ئەســپی پێشبرکێ کە لە دانگێکدابن.
(فَرَسُ البَحرِ): ئەســپی دەریا/ زیندەوەرێکی دەریایــی لەشــگەورەی ســەرزلی کلککورت‌و پەلکورتــە پێیشــی دەوترێت (فَــرَسُ النَّهر وجاموس البَحر): واتا ئەسپی رووبارو گامێشی دەریا.
(الفُرَيس): چارەوێی بچووك.

٥-(الفِــرس) (ن)= البَــروَق): ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی (زەمەق) گوڵەکەی ســپی یان زەرد یان مێخەکییە.

(الفُرْس): فارسەکان.

١-(فارس): ١-فارسەکان ٢-وڵاتی فارس.

(ألفارسيّ): خەڵکی فارس: فارسییەك.

(ألفارسيَّة): زمانی فارسی.

(ألفِرْناس (ج) فَرانِسَة): سەرۆکی بازرگانەکان.

(ألفَريــس): ئەڵقەیەکــە دەخرێتە ســەری پەتێکو پێوەی دەبەسترێت.

(ألفَرِّيسِــيّ (ج) ألفَرِّيســيين): کۆمەڵــە جوولەکەیەکــن کە زۆر بە ئاینی جوولەکەوە بەندنو توندڕەون بە ڕێڕەوو دیوی دەرەوەی ئاینەکــەوەن لەوانــەن کە ســزای حەزرەتی عیسایانداوە.

٦-(فَــرسَــخَ الـشــيءُ فَــرسَـخَــةً): شتەکە فراوانبوو.

(ألفَرسَخ (ج) فَراسِخ): ١-کاتێکی دوورو درێژ ٢-دەروو.

(فَرسَــخُ الطَريــق) (فارســية): قۆناغێك/ فرسەقێك ڕێگا کە نزیکەی سێ میلی هاشمییە دەوترێت (١٢) دوازدە هەزار گەزەکە نزیکەی هەشت کیلۆمەترمیە.

(سَــراويلُ مُفَرْسَــخَة): شــەرواڵی پانوپۆڕ/ فشوفۆڵ/ دەڵب.

٧-(فَرسَــخَ- البَــرْدُ أَو المَرَضُ. فَرسَــخَةً): ســەرماکە تەشــقی شــکا. یان نەخۆشییەکە سووکیکرد/ سووکبوو.

(تَفَرْسَــخَ وافْرَنْسَــخَ- البَــرِدُ أَو المَــرَضُ): ســەرماکە تەشقیشــکا یــان نەخۆشــییەکە سووکبوو بەرەو کزبوون چوو.

(-الهَــمُّ عَنهُ): مەراقەکــە (بەریداو لە دڵیدا ڕەوییەوە).

(ألفَرسَــخ (ج) فَراسِــخ): ١-حەوانــەوە/ حەسانەوە ٢-کشو بێدەنگیی ٣-شتێکی زۆری هەمیشەیی و نەبڕاوە.

٨-(ألفِرسِن (ج) فَراسِــن) (مؤنثة): نووکی سمی حوشتر.

(رَجُلٌ مُفَرْسَــن الوَجه): پیاوێکی دەموچاو گۆشتن.

الملحق:

فرس: (ألفِراســة): زانینی ڕەوشتو نیشانو سیفەتی کەسەکە بە، ڕوو و سەرو شێوەیدا.

(ألفُرُوسِيَّة): سوارچاکیی ( «کانت الفُروسِيَّة احــدى هواياتِه»): ســواریو ســوارچاکیی یەکێکبوو لە مەراقەکانو هەوەسبازییەکەی.

(«فَن رکوب الخَيل»): هونەری ئەسپسواریی/ سوارچاکیی.

(«تَعَلُّم الفروسِــيَّة»): فێربوونی ســواریو سوارچاکیی.

(صِفَةُ الفارس ورتبتُهُ): نیشــانەو سیفەتی سوارەکەو پلەکەی.

(«كانت الفُروسِيَّة تُمْنَحُ في حَفلَةٍ خاصَة»): نیشانەی سوارچاکیی لە ئاهەنگێکی تایبەتیدا دەبەخشرا بەوانەی کە سوارچاکبوون. نیشانەی سوارچاکیی ئازایەتیو مەردایەتیو خانەدانییو ڕەسەنیی بوو.

(«هذا عَمَلٌ مِن أعمال الفروسِيَّة»): ئەمە کردەوەیە لە کردەوەکانی سوارچاکیی.

(ألفُروسِيَّة): سوارچاکی: دامەزراوێکی سەربازیی شێوە ئاینییبوو لە سەدەکانی ناوەراستدا پەیدابوو و دامەزرا بە تایبەتی لە فەرەنساو ئیسپانیاداو تایبەتبوو بە چینی خانەدانەوە. ئەندامەکانیش لە ئاهەنگێکی سەربازییو ئاییندا وەردەگیران.

(ألفَرِّيسِيُّون مفردها فَرِّيسِيّ): دەستە جوولەکەیەکبوون لە سەردەمی مەککابیەکان پێکهێران ئەویش بۆ بەرگریی لە شەریعەتی جوولەکەو پاکراگرتنی بەلام بە تێپەڕینی کاتو سەردەم بە توێکڵی دینەکەوە نەوەك کورۆکیەوە خۆیان بەستەوە. لەبەر ئەوە حەزرەتی مەسیح زۆر سەرزەنشتیکردن سەرزەنشتی لووتبەرزیو رووپامایییان لەبەرئەوە لە پێشەوەی ئەوانەدا بوون کە بەربەرەکانێی حەزرەتی عیسایان دەکردو بەرەنگاری دەبوون.

---

فرش: ١-(فَرَشَ- الشيءَ. فَرْشاً وفِراشاً): شتەکەی ڕاخست.

(-فُلاناً. أمراً): بۆ فیسار شتەکەی خستە (ڕوو/ بەرچاو) و دەریخست.

(وَمِن أمثال المُوَلَّدين. فَرَشْتُهُ دُخلَةَ أمْري أو فرَشْتُ لَهُ دُخلَةَ أمري»): لە پەندەکانی تازەگەرەکان: دڵی خۆم بۆ یەکالا کردەوەو ڕاستیی کارەکەو ناوەرۆکیم بۆ دەرخست.

(فَرَشَ- الأمرَ): کارەکەی بلاوکردەوو جاردا.

(-النَباتُ فَرْشاً): ڕووەکەکە خۆی بە زەویەکەدا بلاوکردەوەو ڕاکێشا.

(فَرَّشَ- الطائِرُ): باڵندەکە بەسەر شتەکەوە کەوتە باڵەفرەو نەکەوتە سەری.

(-فُلاناً بِساطاً): بۆ فیسار فەرشێکی داخست.

(-الدارَ): خانووەکەی بەردڕێژ کرد، کاشیرێژکردو تەنەکەو خشتی ڕاخست.

(-الزَرعُ): کشتەکە خۆی بلاوکردەوەو پەلو گەلای خۆی کێشا.

(أفْرَشَ-هُ بساطاً): فەرشێکی بۆ ڕاخست.

(-الشاةَ للذَبحِ): مەڕەکەی بە زەویدا دا سەریبرێت.

(-الشَجَرُ): درەختەکە لقەکانی درێژبوو/ پەلی بە هەموو لایەکدا هاویشت.

(أفْرَشَ- الرُجلُ): بوو بە خاوەن فەرش.

(-المَكانُ): شوێنەکە قومی وشکەوەبووی زۆر تێدابوو.

(تَفَرَّشَ- الطائِرُ): باڵندەکە بەسەر شتەکەوە

کەوتە باڵەفرەو نەنیشتەسەری.

(إفْتَرَشَ- الشيءُ): شتەکە (کرایەوە/ بڵاوبووەوە).

(-ذراعَيهِ): هەردوو باڵی بەسەر زەویەکەدا بڵاوکردەوە.

(-الرَجُلَ): پیاوەکەی دا بە زەویداو پانیکردەوە.

(-الشيءَ): شتەکەی ژێر پێنا/ ڕاخست.

(-الطَريقَ): بە ڕێگەکەدا ڕۆیشت.

(-إثرَ فُلانٍ): شوێنپێی فیساری هەڵگرت/ دوایکەوت.

(-عِرضَهُ): نامووسی پایەماڵکردو دەستی بۆ نامووسی درێژکرد.

(-المالَ): دەستی بەسەردا گرتو زەوتیکرد/ بردی/ تاڵانیکرد.

(اَلفَرْش) (مص) ١-ڕاخستن ٢-ڕایەخی ناوماڵو فەرش ٣-شوێنێك ڕووەكو گیا دایپۆشیبێت ٤-دەشتو دەرێکی بەرفراوان ٥-کشتوکاڵێك کە سێپەلە بووبێت ٦-درەختو دارو حوشتری بچووك (ئەم وشەیە تاکی نییە) ٧-مانگاو مەڕ کە تەنها بە کەڵکی سەربڕینبێت.

(اَلفَرْشَةُ): ١-جارێك ڕاخستن ٢-ئەوەی کە ڕادەخرێت بۆ ئەوەی لە سەری بنوون (عامیە)/ نوێنی نووستن (عامية).

(اَلفِرْشَةُ): چۆنیەتی ڕاخستن.

(«هوَ حَسَنُ الفِرشَة»): ئەو شێوەی جوانە.

(اَلفِراش (ج) أفْرِشَة وفُرُوش): ١-نوێنی نوستن ٢-هێلانەی باڵندە.

(اَلفَراش): لیتەی وشکەوەبوو بەسەر زەویدا/ قومی وشکەوەبوو.

(-مِنَ الرجال): هەڵەشە/ جرپنو سووکەڵە.

(اَلفَراشَة (ج) فَراش) (ح): پەپوولە. جاری وا هەیە باڵەکانی ڕەنگیندەبێتو وەك هەموو مۆریچەیەکیتر باریدەی تۆو گرتنی گوڵەکان دەدات.

(الفَراشَة): پیاوی مێشکپووتو سووك.

(ماهو إلاَّ فراشَةٌ): پیاوێکە بوودەڵەو بێدەسەڵات وەك پەپوولەیە، بۆ سووکی وای پێدەڵێن.

(اَلفَرَّاش): زۆر ڕایەخ داخەر.

(اَلفَريش- مِن النبات) (ج) فَرائِش: ڕووەکێك کە بە زەویدا خۆی ڕابکێشێت/ ڕووەکی خشۆك کە ڕاست هەڵنەسێت.

(اَلمَفرَش): نوێنی ڕاخراوو هی نوستن.

(اَلمِفْرَشَةُ (ج) مَفارِش): سەرزین/ سەرکورتان.

(اَلمُفَرَّش) (مفع): تەختی لەسەر دانیشتن/ شوێنی ڕاخراو.

(«جَمَلٌ مُفَرَّش»): حوشترێکی پشت تەخت/ بێکۆپارە.

٢-(فَرَشَ- الرَجُلُ. فَرْشاً وفِراشاً): درۆیکرد.

(أفْرَشَ- الرَجُلَ): لە پاشملە بە خراپە

باسيكردو قسەی ناشيرينی پێوت.

(أَلفَرْش):درۆ.

٣-(فَرَشَ- عَنهُ. فَرْشاً وفِراشاً)خوازياريبووو خۆی بۆ ئامادەكرد.

٤-(أَفْرَشَ- عَنهُ):وازی لیهێناو لێیدووركەوتەوە.

(-عَنـــهُ المَـوتُ):مـــەرگ بەريداو لەســـەری لاچوو.

٥-(أَفْرَشَ- السَّيفَ):شمشێرەكەی تەنككرد.

(إفْتَرَشَ-تِ الشَــجَّةُ الدماغ):پێداكێشانەكە ئێسكی سەری قرنجاند بێئەوەی وردی بكات.

(الفَرَاش):دوو پارچە ئاســـنەكە بە قايشو ئاسنی لغاوەكەوە بەندن.

(أَلفَرَاشـَـةُ):١-هەمــوو ئێســـقانێكی تەنكو ئاسنێكی تەنك ٢-ئێسكی دەفەی شان.

٣-(فَراش الدِماغ):هەشــت ئێسقانی تەنكی كاسەیسەر كە مێشكی تێدايە.

فَراشة:دانەيەك لە ئێسكی سەر.

٤-(- مِنَ القفل):ئەومیە دەچێتە قفلەكەوە (لەبەر تەنكيی وايپێوتراوە).

٦-(الفَراش):دوو دەماری سەوزی ژێرزمانە.

(-مِـــنَ النَبيـــذ)بلقی ســـەر رووی مەی كە دەمێنێتەوە بەسەريەوە.

(فَـــراشُ الطَّاحُـــون عُنْـــدَ الطَحَّانَة)تۆپی پەرەكـــەی ئاشـــی ئـــاو كە ئـــاو لێيـــدەداتو بەرداشەكە دەگێرێت.

(فَراشُ السَفينَة)پەروانەی پاپۆر. ئامێرێكە پاڵ بە پاپۆرەكەوە دەنێتو بۆ پێشەوەيدەباتو پێشی دەڵێن («دَفّاش»).

(أَلفِراش (ج) أَفْرِشــه وفُرُش):بنی زمان لە دەمدا.

(أَلفَراشَة):ناوی كەم/ چۆرەناو.

(أَلفُرْشَــةُ والفِرشـــايَة (ج) فَـــراش)فڵچە. فڵچـــەی جل يان دانو شـــتيتر (لە برُوسِ) فەرەنسييەوە كراوە بە عەرەبیو وەرگيراوە.

(أَلفَريش (ج) فَرائِش):ماينی تازەزاو.

٧-(فَرْشَـــحَ وفَرْشَـــحی فَرشَـــحَةً):١-قاچی بڵاوكـــردەوە ٢-خاو بەچۆكـــدا هاتو ئەژنۆی خستە سەرزەوی ٣-بازدی كورت كورتيدا.

(أَلفِرشـــاح):١-ســـمی پان/ كراوە ٢-ئافرەتی ناشيرينی رەزا قورسی زلە ٣-هەوری بێباران.

٨-(فَرْشَـــخَ- الرَجُـــلُ. فَرْشَـــخَةً): قاچـــی بڵاوكردەوە.

أَلفَرشَخَة:فراوانی/ بڵاويی.

الملحق:

فرش: (أَلفِراشَة)پيشەی ئەوانەيە كە لە ماڵو ميوانخانەكانـــدا نوێندادەخەنو هەڵيدەگرنو خەريكی ئەو جۆرە كارانە دەبن.

فرص: ١-(فَرَصَ- الشـــيءَ. فَرْصاً)شتەكەی (لەتكرد/ بری).

(-الجلدَ)پێستەكەی هەڵهێنايەوە/ هەڵدری.

(فَرَّصَ- أَسْفَلَ النَعلِ)خوارەوەی پێڵاوەكەی بە ئاسنەكە نەخشاند.

(اَلفُرْصَةُ والفَرْصَــةُ والفِرصَةُ):پارچەیەك لۆكە یان خوری.

(اَلمَفْــرَص (ج) مَفــارِص والمِفْــراص (ج) مَفاريص):ئامێری لەتكردنی ئاسن یان زیو.

٢-(فَــرَصَ- الفُرْصَــةَ فَرصــاً): هەلــی (بەدەستهێنا/ دەستگیر بوو).

(فارَصَ- هُ فِي الشـــيءِ):لە شـــتەكەدا سەرەی لەگەڵدا كرد.

(أفْرَصَ- الفُرصَةُ):هەلی بەدەستهێنا.

(-تْهُ الفُرصَةَ)هەلەكە(تواناو دەسكەوتیدایە/ كەڵكی پێگەیاند).

(تَفَــرَصَ- الفُرصَةَ):هەلەكەی قۆســتەوەو كەڵكی لێبینی.

(تَفارَصَ- القَومُ البِئرَ):خوێشــگەل بۆ ئاوی بیرەكە سەرەیانگرت.

(إفْتَــرَصَ- الفُرصَــةَ):كەڵكی لــە هەلەكە وەرگرت.

(الفُرصَةُ (ج) فُرَص)١-هەل/ دەرفەت/ كاتی هاتووی گونجاوو لەدەست نەدراو/ سەرە.

(إنْتَهَزَ- الفُرصَةَ»):هەلەكەی لەدەست نەدا/ كەڵكی لە هەلەكە بینی ٢-سەرە، نۆبە.

(«جــاءَت فرصَتُكَ مِنَ السَــقيِ»)سَــەرەی ئاوبردنت هاتووە.

(الفُرصَةُ-فِي المَدارِس)پشوو لەقوتابخانەكاندا یان پشووی هاوینی قوتابخانە.

(اَلفَريص)سەرەگر/ نۆبەكەر.

(«هــو فَريصــي»):ئــەو ســەرەم لەگەڵدا دەگرێت.

(الفَريصَــةُ (ج) فَريص وفَرائِص):ســەرە، نۆبە.

٣-(فَرَصَ- الرَجُلَ فَرْصاً):كێشــای بە ســەر سنگ یان ناوشانی پیاوەكەدا.

(فُــرِصَ فَرَصاً وفَرْصاً):هاواری ماســولكەی ناوشانو سنگیكرد.

(اَلفَريص الواحِــدَةُ فَريصَة):دەماری لامل كە لە تووڕەبووندا هەڵدەستێت.

(اَلفَرِيْصَة (ج) فَريص وفَرائِص):ماسولكەو گۆشتی شــانو تەنشــتو یان نێوان مەمكو شان. كاتی ترسو تۆقین دەكەوێتە لەرزین.

(«اِرْتَعَــدَتَ فَريصَتُــهُ»):كەوتــە لەرزینو ترسێكی زۆر دایگرت/ تۆقی.

(«هــو ضَخِمُ الفَريصَــةِ»)ئەو بە جەرگەو ئازایە.

٤-(اَلفِرْصــاد):١-بۆیــەی ســوور ٢-(ن) توو ٣-بەری درەختی توو.

(اَلفِرْصــاد والفَرْصِــد والفِرْصيد):(تۆوی/ ناوكی) ترێ.

فرض: ١-(فَرَضَ – الخَشَــبَةَ وفيها فَرْضاً): دارەكەی قڵیشاند درزی تێكرد.

(فَرَّضَ- الخَشَبَةَ):قڵیشاندی/ درزی تێكرد.

(إفْتَــرَضَ- القَــومُ): قڕیانهــات/ هەمــوو فەوتان.

(ألفَرْض) (مص): ١-قلّيشان.

٢-(الفَرض- مِنَ القَوسِ (ج) فِراض): شويّنى ژێى كەوان.

(أَلفُرْض): قلّيش/ درز يان برە.

(أَلفُرضَةُ (ج) فُـرَض وفِراض): گريّژنەى دەرگا. كە لەسەرى دەسووريّتەوە.

(-مِنَ النَّهرِ): ئاوەريّژەى رووبار/ دەمى روبار كە ليّـوەى ئاودەبەنو ليّـوەى پاپۆر دەچيّتە رووبارەكەوە.

(-مِنَ البَحرِ): لەنگەرگاى پاپۆرو ئەسكەلەى سەردەريا.

(-مِـنَ القَـوس): كونــى دابراوى ئەمســەرو ئەوسەرى كەمان كە ژێكەى پيّوە قايمدەكريّت.

(-مِـنَ الـدَّواة): مەرەكەبـدان/ شـويّنى مەرەكەبەكە.

(فُرْضَةُ الجَبَلَ): ليّژگەى ناوەراستو تەنشتى شاخ.

(ألفِراض): دەمى روبار.

(أَلمِفراض والمِفْرَض): ئاسـنيّكە قلّيشـى پىّ لەشتدەكريّت يان برەى پيّدەكريّت.

(أَلمَفروض): برراوە/ سنوور بۆ دانراو.

٢-(فَرَضَ- الأمرَ. فَرْضاً): كارەكەى دياريكردو سەپاندى/ كردى بە ئەرك/ بە پيّويست.

(-لَهُ): كاتى بۆ دياريكرد.

(-لِفُلانٍ كذا): ئەوەى كرد بە ئەركو پيّويست بەسەرشانى فيسارەوە.

(-لَـهُ كذا في الديــوان): ناوى لـــە دەفتەرى ديواندا نووسىو رۆژيى بۆ دياريكرد.

(-اللهُ الأحكامَ على عِبادِهِ): خوداوەند ئەركو پيّويستى سەرشانى بەندەكانى دياريكرد.

(-تِ البَقَرَةُ. فُرُوضاً فَراضَةً): مانگاكە كەوتە سالّەوە/ پيربوو.

(فارِض): مانگاى پير.

(البقــرة الفارِض لاتُؤْخَذ مِــن صاحِبِها في الــزكاةِ): لە زەكاتــدا نابيّت مانگــاى پير بە زەكات بدريّت.

(فَرُضَ فَراضَةً): بوو بە زاناى دەستوورەكانى ئاينو ئەوەى كە خودا كردوويەتى بە ئەركى سەرشانى كۆيلەكانى خۆى.

(-تِ البَقَــرَةُ. فُروضاً فَراضَةً): مانگا كە پير بوو نابيّت بدريّت بە زەكات.

(فَــرَّضَ- الأمْرَ): كارەكەى كــرد بە ئەركو پيّويست.

(أَفْرَضَ- لِفلانٍ كذا): ئەوەى بۆ فيســار كرد بە پيّويستو ئەرك.

(-تِ الماشـيَةُ): ئاژەلّەكــە هيّندە زۆر بوو كە دەبيّت زەكاتى ليّبدريّت.

(-فُلاناً شَيئاً): شتيّكى بە فيساردا.

(إفْتَــرَضَ- اللهُ الأحكامَ علــى عِبادِه): خودا ياســاو ئەركــى لەســەر بەندەكانــى داناوەو پيّويستە پەيرەوى بكريّت.

(-الجُندُ): ســەربازەكان ئەوەيان وەرگرت كە

دەیاندرێتێ.

(اَلفَرْض (ج) فُرُوض وفِراض): ١-دەستووری ئیسلامەتی ٢-فەرمانێك كە خودا بۆ بەندەكانی دانابێتو پێویستی پەیڕەوكردنی كردبێت ٣-ئەو موچەیەی كە دیاریكرابێت ٤-ئەوەی بە سەربازەكان دەدرێت ٥-ئەو سەربازانەی موچە وەردەگرن ٦-ئەوەی كە كردبێتت بە ئەرك بەسەر شانتەوە ٧-ئەو ئەركانەی كە بە قوتابیان دەدرێت جێبەجێی بكەن وەك مەشقی بیریكاریو دارشتنو شتی لەو بابەتانە.

(كِتابُ الفَرض – عند النَصاری): كتێبێكی دیانەكانە كە نوێژو دۆعای تێدایە كە دەبێت لە كاتی دیاریكراوی خۆیدا جێبەجێی بكەن.

(اَلفارِض (ج) فُرَّض (م) فارِضَة (ج) فارِضات وفَوارِض): كۆن.

(اَلفارِض والفَریض والفَرضِيّ والفَرَّاض): زاناو شارەزای یاساو ئەركە ئاینیەكان.

(الفَریضَة (ج) فَرائِض): ١-فەرزەكان/ ئەركە پێویستەكان ٢-زەكاتو خێرێك كە پێویستكرابێت بدرێت ٣-بەشی دیاریكراوی زەكات كە دەبێت بدرێت.

(عِلمُ الفَرائِض): زانستیی دابەشكردنی میرات بەسەر ئەوانەدا كە بەریاندەكەوێت.

(اَصحابُ الفَرائِض): ئەو میراتگرانەی كە بەشێكی دیاریكراویان دەكەوێتە میراتەكەوە.

(«فُلان اَفْرَضُ الناس»): فیسار شارەزاترینی هەموو كەسێكە لە دابەشكردنی میراتداو بە پێی دەستووری خوداو زانستیی (فەرائض)دا.

(اَلمَفْرُوض): ١-ئەو فەرمانو ئەركانەی خودا خستویەتیە سەر گەردنی بەندەكانی ٢-دیاریكراو/ سنووردار.

٣-(فَرَضَ- الأمرَ فَرْضاً): كارەكەی بەرسەرنجداو بە چاو، بە بۆچوونو لێكدانەوەی خۆی خەملاندی/ قەبلاندی/ وایدانا.

(اَلفَرْض) (ع ح): گریمان/ لە كارێكی بیركاریدا بۆ ئەنجامدانێك بەكاردەهێنرێت.

(اَلفَرْضِیَّة والمَفرُوض) (ع ح): گریمان/ وایدادەنێین/ لە پرسیارێكی بیركاریدا دیاریكراو دەخوازرێ كە ئەنجامێك بە بەڵگە دەربهێنرێت ئەوە خواستو ئەنجام دەبێت.

(الإفتِراض- عند المنطقین): ڕێگەیەكە لای گفتەخوازەكان بۆ پێچەوانەی ئەو كێشانەی كە هەیەو بە بەڵگە بیسەلمێنێت كە ئەوە ڕاستە وایە یان وا نییە.

٤-(اَلفِراض): پۆشاك/ بەرگ.

(اَلفارِض (ج) فُرَّض (م) فارِضَة (ج) فارِضات وفَوارِض): كەتە/ قەبە/ زۆر زل.

فرط: ١-(فَرَطَ. فُرُوطاً): پێشكەوتو كەوتە بەرەوە.

(-ەُ فَرْطاً): بەزاندی/ بەسەریدا (زاڵبوو/

سەرکەوت).

(-علی فلانٍ): ١-ستەمی لە فیسار کرد ٢-پەلەی کردو دەستدرێژیی لێکرد.

(-وَلَداً): منداڵێکی بە بچووکیی مرد.

(-مِنهُ قَــولٌ): بێئاگایانەو بــێ بیرکردنەوە قسەیەکی لە دەم دەرپەڕی.

(-إلَیهِ رَسولاً): بە پەلە ڕاسپاردەیەکی ناردە لای/ فرستادەیەکی خێرای ناردە لای.

(-القومَ. فَرْطــاً وفَراطَةً): بۆ ئاو یان لەوەڕ پێش خوێشگەلکەوت.

(فارِط (ج) فارِطون و فُرَّاط): پێشکەوتووی هەموان بۆ سەر ئاوو بۆ لەوەڕ.

(فَرَّطَ-هُ): ئەوی بەجێهێشتو پێشیکەوت.

(-إلَیهِ رسولاً): فرستادەیەکی بۆ نارد.

(فــارَطَ-هُ. فِراطــاً ومُفارَطَةً): پێشــبڕکێی لەگەڵدا کردو پێشیکەوت.

(أفْرَطَ): پەلەی لە کارەکەدا کرد.

(-رَسولاً): فرستادەیەکی بۆ نارد.

(-فُلانٌ وَلَداً): منداڵێکی بە بچووکیی مرد.

(-بیَــدِهِ إلی الـسَّــیفِ لیسـتَلَّهُ): پەلامــاری شمشێرەکەیدا هەڵیبکێشێت.

(تَفَرَّطَ- الفَــرَسُ الخَیلَ): ماینەکە لە غاردا پێش ئەسپەکان کەوت.

(تَفارَطَ): پێشکەوتو پەلەیکرد.

(-القَومُ): خوێشگەل پێشبڕکێیانکرد.

(-تــهُ الهُمومُ): پــەژارەو مەراق بەســەریدا داباری.

(اِفْتَــرَطَ- إلَیــهِ فِي الأَمــرِ): لــە کارەکــەدا پێشیکەوتو بەری لێگرت.

(-وَلَداً): زارۆڵەیەکی بە منداڵیی مرد.

(الفُــرْط (ج) أفــراط الصَّباح): ســپێدەی بەیان.

(الفَرَط): پێشــکەوتەی هەموان بۆ ســەر ئاو (تاكو کۆی وەك یەکە).

(«رَجُلٌ فَرَطٌ»): پیاوێکی پێشکەوتە.

(«قومٌ فَرَطٌ»): خوێشگەلێکی پێشکەوتە.

(«أنا فَرطُكُم الی الحَوض»): من پێشکەوتەتانم بۆ سەر گۆلەکە/ حەوزەکە.

(الفَــرَط): ١-پەلە/ گورجکــردن/ چابوکیی ٢-ئەو پاداشتەی کە لە پێشەوە بۆتدانراوە.

(«اللهُــمَّ اجْعَلْهُ لَنا فَرَطــاً»): خودا بیکە بە پاداشتی پێشــەکیی بۆمان بەشکو وەریبگرین (ئەمــە نزایەکە بــۆ منداڵێك کــە بمرێت و پێنەگەیشتبێت).

(سَــبَقَهُ فَــرَطٌ کَثــیرٌ): زارۆڵەیەکــی زۆری لــە پێــش ئــەودا بــە بچووکی مــردووە کە پێنەگەیشتبوون.

(الفُــرُط): ماینێکی گورج کــە پێش هەموو ئەسپەکان بکەوێت.

(الفَرطَةُ والفُرطَةُ): دەرچوون/ دەرپەڕینو پێشکەوتن.

(هــو ذو فُرطَةٍ فِي البِلادِ): ئــەو گوزاری لە

ولاتدا زۆره/ خاونگوزاری زۆره.
(اَلفُراطَةُ والمـاءُ الفِراطُ): ئاوی هاوبەش کە هیـچ چەند ئاوایی یـان گەرەکێکە کێ پێش هەموان چووە سەری سەرەی ئەو دەبێت.
(«بِئـرٌ فراطَة»): چالاوێکی هاوبەش کە کێ ئازابێت و زوو بچێتە سەر ئەو سەرەیدەبێت.
٢-(فَـرَطَ- في الأمـرِ. فَرْطاً): لـە کارەکەدا کەمتەرخەمییکـرد/ کەموکوورییکـرد تا لە دەستیداو فەوتا/ نەما.
(-مِنهُ شيءٌ): شتێکی لەدەستچوو/ نەماو لێی ونبوو.
(فَرَّط- في الشـيءِ): لە شـتەکەدا کەموکووری کردو بێدەسەلاتیی نواند.
(-الشَّيءَ وفي الشـيءِ): ١-شتەکەی لەدەستداو لێـی ونبـوو ٢-پـەرش و بلاویکـردەوەو لەناویبرد.
(«فَـرْطُ الأشـجار» (عامية- سـريانية): درەختـی بلاوبـلاو وەك زەیتـوون و گوێزو بادام و لەو جۆرانە.
(-عَنهُ): لێیگەڕا/ وازی لێهێنا.
(-اللهُ عَنـهُ مايَكْـرَهُ): خـودا ئـەوەی کـە پێیناخۆش بوو لێیلاداو لەکۆڵیکردەوە.
(أفْرَطَ-الأمرَ): کارەکەی فەرامۆشکردو وازی لێهێنا.
(-الشيءَ): ١-شتەکەی بیرچـوووەوە ٢-لێیگەڕا/ وازی لێهێنا.

(«ماأفْـرَط مِنهُـم أحَـداً»): کەسـیانی بەجێنەهێشت و لەبیر نەچوو.
(تَفَرَّطَ-الشـيءُ): شـتەکە باوی نەما/ کاتی تێپەری.
(تَفارَطَ- الشيءُ): شتەکە کاتی دواکەوت.
(«تفارَطـتِ الصـلاةُ عَـن وَقْتِهـا»): کاتی نوێژەکە دواکەوت و بەسەرچوو.
إفْتَرَطَ: دەمەکەی تێپەری و بەسەرچوو.
(«فُلان لا يُفْتَـرَطُ إحسانُهُ»): فیسار چاکەی بەسەرناچێت و کۆتایی نایەت.
(إنْفَرَطَ): هەڵوەشایەوە، لێکترازاو لێکبووەوە.
(ألفَرْط): دەم/ حەل/ کات.
(«أتَيْتُهُ فَرْطاً»): پاش دەمێك/ چەند ڕۆژێك هاتمـەلای (لە پازدە ڕۆژ زۆرتر و لە سـێ ڕۆژ کەمتر نابێت.
(«لا ألقاهُ إلاّ في الفَرطِ»): نایبینم/ پێیناگەم تەنها لەناو چەند ڕۆژێکدا جارێك نەبێت.
(ألفُراطَة- عند العامَّة): پارەی وردە/ دراوی وردە/ بچـووك (هەموو وشـەکە لـە بلاویی درەختەوە هاتووە).
(ألفَرَط): کارێك کە خاوەنەکەی لە دەسـتی بدات و بە تەنگیەوە نەیەت.
(ألفُرُط): کاری (وازلێهێنـراو/ بەجێهێڵراو) بەرەلاکراو.
٢-(فَرَطَ- عَلَيه في القَولِ فَرْطاً): قسەی زۆر پێوت.

(-علـى فُلانٍ): سـزاو ئـازاری فیسـاری دا/ دەستدرێژیکردە سەر.
(فَـرَّطَ-هُ): لـە ئەندازەبـەدەر هەڵینـا یان داشۆریکرد، زەمیکرد.
(أفْـرَطَ): لـە ڕووی تەواویـی‌و زۆرییـەوە زیادڕەوییکرد.
(-الإناءَ): قاپەکەی پڕکردو سەرڕێژکرد.
(-على الرَجُلِ): هێندەی بە کۆڵی پیاوەکەدا دا کە نەیتوانێت.
(ألفَـرْط (مـص) (ج) أفْـرُط وأفـراط): زیادڕەویی/ لە ئەندازەبەدەر ڕۆیشتن.
(ألفُـرُط): ١ دەسـت (بەفڕیـی/ بلاویـی) ٢-زۆرداریی‌و دەستدرێژیی.
(ألأمرُ الفُرُط): کاری لە ئەندازەبەدەر.
٤-(فارَطَ-هُ. فِراطاً ومُفارَطَةً): ڕێکەوتیکرد.
٥-(ألفَرْط (ج) أفْرُط وأفْراط): ١-سەری گرد یان لووتکەی شـاخێکی بچووک ٢-بەیداخێك کە چەقێنرابێت بۆ ڕێدەرکردنی خەڵك.
(ألفُرْط): قەدپاڵی شاخ.
(مَفارِط البِلادِ): کەناری وڵات.
٦-(فَرْطَحَ-الشـيءَ. فَرطَحَـةً): شـتەکەی پانکرد.
(رَأْسُ فِرطاح ومُفَرْطَح): سەرێکی پان.
٧-(فَرطَـسَ- الخِنْزِيـرُ): بەرازەکـە لۆزی درێژکرد.
(ألفِرطاس): پان.

(فُرطُوسَـةُ الخنزير (ج) فَراطيس): لۆزی بەراز.
(ألفِرطِيسَةُ): پەرەکەی لووت.
(فِرطيسَةُ الخِنْزِيرِ (ج) فَراطيس): (لووت/ لۆز)ی بەراز.
فرع: ١-(فَـرَعَ- الجَبَـلَ. فَرْعـاً وفُروعاً): سـەرکەوتە سـەر کێوەکـە/ بـە کێوەکـەدا هەڵزنا.
(-القَومَ): بە هۆی خانەدانییەوە یان جوانییەوە لە خوێشگەل بەرزترو لەپێشتر بوو.
(-رَأسَهُ بالعَصا): داری لێراستکردەوەو کێشای بەسەریدا.
(فَرَّعَ- فِي الجَبَلِ): سەرکەوتە سەر شاخەکە.
(أفْـرَعَ- الشـيءُ): شـتەکە درێژ بـووەوەو بەرزبووەوە/ سەرکەوت.
(تَفَرَّعَ-الشيءَ): سەر شتەکە کەوت.
(-القَومَ): ١-بـالای خوێشـگەلبوو بەزاندنی ٢-پـڕ جنێـوی ناشـیرینی کـردن/ بەجنێو سواری سەریانبوو.
(ألفَـرْع (مص) مِن كُلِّ شـيءٍ (ج) فُرُوع): پۆپەو سـەرەوەی هەموو شتێك ٢-لق‌و پۆپی ئەو شتە وەك لق‌و پۆپی درەخت.
(فَرْعُ- القَوم): خانەدان‌و پیاوماقوڵی نەتەوەو خوێش.
(فَرعُ الأُذنِ): بەشی سەرەوەی گوێ.
(ألفَرعَةُ (ج) فِراع): ١-بەشـی سـەرووی ڕێ

٢-(پۆپەی/ سەری) شاخ.
(ألفارِع) (فا):١-بڵندو بەرزتر ٢-چاك، جوان.
(«جبَلٌ فارِع»): کێوێکی درێژترو بڵندتر لە دەوروپشتی.
(ألفارِعَةُ (ج) فَوارِع): مێی وشەی (الفارِع).
(فارِعَةُ الجَبَلِ): سەرەوەی شاخەکە.
(فارِعَةُ الطريقِ وفرعاؤُهُ): بەشی سەرەوەی رێگەکەو چوار رێیانەکەی.
(ألمُفرِع): هەموو شتێکی درێژ.
(«فلان مُفرِعُ الكَتفِ»): فیسار ناوشان، پانە یان بەرزە.
٢-(فَرَعَ- الــوادِيَ. فَرْعاً وفُروعاً): داپەڕییە دۆڵەکە.
(فَرَّعَ- مِنَ الجَبَلِ): لە کەژەکەوە/ شاخەکەوە داپەڕییە خوارێ/ هاتە خوارێ.
(أفرَعَ. مِنَ الجبل): لــە کەژەکەوە داپەڕییە خوارێ.
(-بِالقَومِ): لایدایە لای خوێشگەل.
الفارِع: داپەڕیو/ دابەزیو/ خوارەوە/ هاتوو/ لادەر.
٣-(فَرَعَ- الفَرَسَ باللجــامِ. فَرعاً وفُروعاً): چارەوێکەی لغاوکێشکردو رایگرت.
(«هذا أوَّلُ صَيدٍ فَرَعَــهُ»): ئەمە یەکەمین نێچیرە کە بیکوژێتو خوێنی برێژێت.
(أفْــرَعَ-تِ الإبِــلُ): حوشــترەکە زاو یەکەم بەچکەیبوو/ نۆبەرەیبوو.

(-الفَرَعَــةُ): نۆبــەرەی حوشــترەکە یان هی مەرەکەی سەربڕی.
(اللجامُ الفَــرَسَ): لغاوەکە دەمی چارەوێکەی هێنایە خوێن.
(-تِ الضَبعُ الغَنَمَ أو في الغَنَم): کەمتیارەکە رانە مەرەکەی تێکداو کوشتنی.
(أُفْرِعَ- بِفُلانٍ): فیسار دەستگیرکراو کوژرا.
(إفْتَرَعَ- البِكْــرَ): کچێنیەکەی (دڕی/ برد)/ بێبنیکرد.
(إسْتَفْرَعَ- الرَجُلُ): پیاوەکە بەچکە حوشترە نۆبەرەکە یان نۆبەرەی مەرەکەی سەربڕی.
(ألفَرَع الواحِدَةُ فَرَعَة): نۆبەرەی حوشتر یان مەر.
٤-(فَــرَعَ- الأرضَ فَرْعــاً وفُروعــاً): بــە (خاکەکەدا/ زەویەکەدا) گەڕا.
(فَرَّعَ- في الأرضِ): بە زەمینەکەدا گەڕانیکرد.
(أفْــرَعَ- حاجَتَــهُ أو سَــفَرَهُ): دەســتی بە نیازەکەی یان گوزارەکەیکرد.
(-الأمرَ): دەستی بە کارەکە کرد.
(-الأرضَ): بە زەویەکەدا گەڕانیکرد/ سووڕایەوە.
(-القَــومُ مِــن سَــفَرِهِم): خوێشــگەل لــە گوزارەکەیانــدا پێــش دەمــی هاتنــەوە یان گەڕانەوە.
(إسْتَفْرَعَ- الشيءَ): دەستی بە شتەکە کرد.
٥-(فَرَعَ- بَينَ القَومِ. فَرْعاً وفُروعاً): تەبایی و ئاشتیی خستە نێوانیانەوە.

(أَلمِفْرَع (ج) مَفارِع): تەباكارو ئاشتیكەرەوەی خەڵك: چاكەكارانی ناو خەڵك.

٦-(فَرِعَ- فَرَعاً): قژی زۆر بوو.

أَفْــرَع (م) فَرْعاء (ج) فُرُع: قژن. كەسێكە قژی زۆر بێت.

(فَــرَّعَ- بَينَهُم): لێكیكــردن/ ناتەبایكردن/ لەیەكی پچڕاندن.

(-المَسائِلَ مِن هذا الأَصلِ): پرسە بابەتەكانی كــرد بــە لكــی ئــەم ســەرچاوەیەو لەمــی دەرهێنان.

(تَفَرَّعَ-تِ الأَغْصانُ): لقی زۆر لە درەختەكە بووەوە.

(-تِ المَسائِلُ): پرســەبابەتەكانی زۆر بوون‌و لە سەرچاوەكەوە پەیدابوون‌و دەرهاتن.

(-الشيءُ مِنَ الشيءِ): لە شتەكە لكی شتیتری لێبــووەوە/ یان ئەو شــتە بوو بــە بنچینەی ئەویتر.

(أَلفَرْع (ج) فِراع): جۆگەلەی ئاو كە لە ئاوە سەرەكییەكەوە هەڵدەگیرێت.

(- (ج) فُروع): سامان‌و دارایەكی بێشومار.

(-فِي المَســائِل العِلمِيَّة): لە زانســتیدا ئەوەی كــە لەســەر زانســتیتر، كــە بنچینەیەتــی هەڵسێنرابێت‌و ئەوە بوو بێت بە پێوەری لكە زانسیەكان.

(فَرعُ المَرأَة): قژی ژن.

(«ضَرَبَهُ علــى فرعَى أَلیَتِهِ»): كێشــای بە هــەردوو بەری ســمتیدا كــە لە دانیشــتندا بەرزەوی دەكەوێت.

٧-(فــارَعَ-هُ): دڵنیایكــردو لــە بــری ئــەو بەرگریكردو ئەركەكەی گرتە ئەستۆی خۆی.

(أَفْرَعَ- أَهْلَهُ): دەستەبەری ژیانی خێزانەكەی بوو/ خێزانەكەی بەخێوكرد.

٨-(أَلفَرْع) (ح): ئەسپێ.

(فَرْعَة) (م): ئەسپێیەك.

(أَلفَرَع. الواحِدَةُ . فَرَعَة): ١-(ح) ئەسپێیەك ٢-بەش.

(«تَراضَوا بِالفَرَع»): بە بەش قایلبوون.

(أَلفَرَّاعَة) (عامية): تەور.

٩-(فَرعَنَ- الرَجُلُ. فَرعَنَةً): ١-فیزی نواند/ ترزلییكــرد ٢-(فێڵبــاز/ زۆرزان/ تەڵەكەباز) بوو لە (فیرعەون) وەرگیراوە.

(تَفَرْعَــنَ): كــرداری فیرعەونانــەی نواندو رەوشتی ئەوی پەیرەو كرد.

(-النَّباتُ): رووەكەكە بالآیكردو بەهێز بوو.

(-فُــلانٌ عَلَینــا): بــوو بــە فیرعــەون بەسەرمانەوەو كەوتە زۆرو ستەم لێمان.

(أَلفَرعَنَــة): زۆرزانیــی/ تەڵەكەبازیــی‌و بەدرەفتاریی.

(أَلفَرعَنَة -عند العَامة): هەوەسهەستان‌و با تێچوون.

(«فُلان مُفَرْعِن»): كەوتۆتە هەلەكەســەماو بای تێچووە.

(فِرعَـون وفُرْعُـون وفُرْعَـون): هەمـوو زۆردارێکی یاخی.
(-ج) فَراعِنَة): نازناوی هەموو شایەکی کۆنی میسر بوو.
فرغ: ١-(فَـرَغَ- وفَرِغَ- مِنَ العَمَـلِ. فَراغاً وفُرُوغاً): لـە کارەکە بووەوە یـان کارەکەی تەواوکرد.
(-لَهُ وإلَيهِ): نیازی لای ئەویکرد/ رووی کردە لای ئەو.
(-الرَّجُلُ فُرُوغاً): مرد (چونکە لەشی گیانی تێدا نەما).
(-الظَّـرفُ): دەفرەکـە چۆڵبوو/ بۆشـبوو/ بەتاڵبوو.
(-فُلانٌ مِنَ الشيءِ): فیسار لە شتەکە بووەوەو تەواویکرد.
(فَرَّغَ وأفـرَغَ- الإناءَ): قاپەکەی بۆشـکرد/ بەتاڵکرد.
(تَفَرَّغَ): دەسـتی لە ئیش هەڵگرت/ دەسـت بەتاڵبوو.
(-لِلأَمْـرِ): خۆی بـۆ کارەکـە تەرخانکردو کۆششی تەواوی تێداکرد.
(ألفَرْغ (ج) فُرُوغ): زەویی وشكو بێرووەكو بێپیت.
(ألفِرْغ: الفَراغ): بۆشایی.
الفَرِغ: بۆش/ چۆڵ/ بەتاڵ.
(ألفِراغ (ج) أفْرِغَة): لەنگە/ تای بار/ لایەکی باری چوارپێ.
(ألأَفْرَغ (م) فَرغاء): چۆڵ/ بۆش/ بەتاڵ.
(إنْفِـراغ جِسْـمٌ مُكَهْـرَبٍ أو مركم) (ف): خاڵیبوونـەوەی تەنێکـی بارگـاوی یـان پاترییـەك (ف) بریتییـە لـە نەمانی بارگە کارەباییەکەیان (ف) (مرور تيار كهربائي في غاز مخفف): رۆیشـتنی تەوژمێکی کارەبا بە گازێکی سووکدا.
(حَلَقَةٌ مُفْرَغَة): سوورێکی داخراوی ناوبۆش/ بازنەی بەتاڵ.
٢-(فَرَغَ- دَمُهُ. فُروغاً): خوێنەکەی بە فیڕۆ رۆیشتو کەس تۆڵەی نەسەندەوە.
(-عَلَيهِ الماءَ. فَرْغاً): ئاوی بەسەردا کرد.
(فَـرُغَ-تِ الطَعْنَةُ فَراغَةً): شـوێن تیغەکە (فراوانبوو/ دەمیکردەوە).
(فَريغَة): برینی گەورەو دەمکراوە.
(-فَرَغَ- عليهِ الماءَ): ئاوی بەسەردا کرد.
(-الماءُ فَراغاً): ئاوەکە رژا/ رۆبوو.
(فَرَّغَ- الماءَ): ئاوەکەی رۆکرد.
(-الدِماءَ): خوێنێکی زۆری رشت.
(«فَـرَّغَ اللهُ عليـه الصَبرَ»): (خـودا ئارامی خستە دڵیەوە/ ستارەی دڵیدا).
(أفْرَغَ- الماءَ): ئاوەکەی رۆکرد.
(-الدِماءَ): خوێنێکی رشت.
(-الذَهَبَ ونَحْوَهُ): زێڕەکەو شتی لەو بابەتەی دارشتە قاڵبەوە.

(اَلفَرْغ (ج) فُرُوغ): لێواری قاپ كه ئاوی لێوه رۆدەكرێت.
(«هذه طَعْنَةُ ذات فَـرْغٍ»): ئەمە برینێكە/ جێی تیغێكە فراوانە، خوێنی لێدەرژێت.
(«ذَهَبَ دَمُهُ فَرْغـاً أو فِرغاً»): خوێنەكەی بە فیرۆ رۆیشـتو تۆڵەی نەسـەندراو داوای خوێنەكەی نەكرا.
(اَلفِراغ (ج) أفْرِغَة): ١-لێوی دۆلكەكە كە ئاوی لێوە رۆدەكرێت ٢-قاپ/ دەفر ٣-پیاڵەی/ جامی زل ٤-تیری پان ٥-چوارپێی هەنگاو بلاو.
(«رَجُلٌ فِراغٌ»): پیاوێكی خێراو بەهەنگاو/ هەنگاو گەورە.
(اَلفَریـغ (ج) فِراغ): ١-پـان ٢-زەویی تەخت وەك رێگە بێت ٣-وڵاخی هەنگاو گەورە.
(رَجُلٌ فریغٌ): زمانتیژ.
(طَریقٌ فَریغ): رێیەكی پان.
(اَلفَریغَةُ): ١-مێی وشە (الفَریغ)٢-جەوەندەیەك كە ئاو زۆر بگرێت.
(ضَربةٌ فَریغٌ وفَریغَةٌ): لێدانێك كە ببێتە هۆی برینێكی كراوەی فراوان كە خوێنی لێچۆڕێت.
(طَعْنَةٌ فَرغاء): تیغ پێداكردنێكی فراوانبرین/ برینفراوان.
(اَلفَرْغان): (دەفری/ قاپی) فراوان.
(درهَمٌ مُفْرَغٌ ومُفَرَّغٌ): دراوێك دارێژرابێت لـە قاڵبێـكا كـە هی خـۆی نەبێـتو باش دەرنەچێت/ ساختە بێت.

(فَرَسٌ. مُسْتَفْرِغٌ): چارەوێیەكی زۆر تیژڕەو.
٣-(فَرُغَ- فَراغَةً): دڵخوربوو و تۆقی.
(الملحق:
فــرغ: ١-(الفَراغ): ١-بۆشـایی/ بۆشـبوون/ چۆڵی/ بەتاڵیی.
(«فَراغُ إناءٍ»): بۆشیی قاپێك.
٢-(فُسْـحَةٌ لاشـيءَ فيها): پانتاییەك هیچی تێدا نەبێت.
(سَدَّ فَراغاً): بۆشاییەكی پڕكردەوە.
(«سـاعاتُ الفَــراغ): كاتژمێرێكـی زۆری دەستبەتاڵیی/ بێكاریی ٣-(مُتَّسَعٌ مِنَ الوَقت لا إنشِغال فيه): ماوەیەكی باش كە دەست بە هیچەوە گیرنەبێـت ٤-(«اَلنَّقصُ في حالَةِ وَضعٍ»): كەمو كورتیی بارێكو رەوشێك.
(«كانــوا يَحتاجــون الى عَرَبــاتٍ وأَسْـلِحَةٍ فَمَلِـيءَ هــذا الفَــراغ»): پێویسـتیان بـە ئۆتومبیلو چـەك هەبوو ئەو كەموكورییانە پڕكرانــەوە/ نەهێڵران ٥-(اَلشُـعُور بالغِياب والنَّقص أو الحِرمان): هەسـت بە ونبوونو لەبەرچاونەبـوونو كەمیـی یان بێكەسـیو داماویی.
(«تَـرَكَ مَوتُـه فَراغـاً كَبـيراً): مردنـی ئـەو بۆشـاییەكی گـەورەی دروسـتكردو بەجێیهێشت.
(الفراغ) (ف) (المكان الخالي مِن الأَجسـام): شوێنێكی بۆش كە هیچ تەنێكی تێدانەبێت.

فرف: (أَلفَرْفَح): زەویی (خز/ لووس).
أَلفَرفَحَةُ) (عند العامّة): بووژانەوە.
(«فَرفَــحَ فُــلانٌ فَهــوَ مُفَرفِــح»): فیســار بووژایەوە ئەو بووژاوەو بەخوداهاتووە.
(أَلفَرْفحين) (ن) (آرامية): پەڵپینە.
٢-(فَرْفَــطَ- الشــيء) (عنــد العامــة): پەرتپەرتیکرد/ لەتوکوتیکرد.
(فَرفَطَة) (ســريانية): پارچــەی بچووك/ لەتێکی بچووك.
فرق: ١-(ف) فَــرقَ- بَينَهُما فَرقاً وفُرْقاناً): لە یەکی جیاکردنەوە/ لە یەکی دابرین.
(-البَحرَ): دەریاکەی شەقکرد/ لەتکرد.
(-الشَعرَ): قژەکەی داهێناو بەریدایەوە.
(-لَــهُ الطّريــقَ. فُروقــاً): ڕێگەکــەی بــۆ دەرکەوت.
(-الأمــرُ لِفــلان): کارەکــە بــۆ فیســار ڕوونبووەوە.
(-لَهُ عَنِ الشــيءِ): شتەکەی بۆ ڕوونکردەوەو دیارکرد/ دەرخست.
(-تِ الناقَــةُ): مێحوشــترەکە ژانــی لێهاتو خەریکبوو دەزا.
(فَرَّقَ- الشيءَ. تَفْريقاً وتَفْرِقَةً): ١-شتەکەی پەرش‌و بڵاوکردەوە ٢-شــتەکەی دابەشکردو بڵاوکردەوە.
(-شَــعْرَهُ بِالمشطِ): قژەکەی (بە شانە داهێنا شانەکرد).

(فــارَقَ-هُ فِراقاً ومُفارَقَــةً): لێجودابووەوەو لێبوو، لێدوورکەوتەوە.
(أَفْرَقَ- غَنَمَــهُ): مەڕەکانی ســەرمڕۆ کردو ونکرد.
(-المَريــضُ مِــن مَرَضِــهِ): نەخۆشــەکە خۆشبووەوەو ڕزگاریبوو.
(تَفَرَّقَ وتَفارَقَ وافْتَــرَقَ. تَفَرُقاً وتِفِرّاقاً): بڵاوبوونــەوەو لێکجیابوونــەوەو لەیــەك پچران.
(«تَفَرَّقَــت بِهِمُ الطُــرُقُ»): هەریەکەیان بە ڕێگەیەکدا چوون‌و لەیەك ترازان.
إنْفَرَقَ- عَنهُم: لێیان جیابووەوە.
(-لَهُ الطَريقُ): ڕێگەکەی بۆ دەرکەوت.
(أَلفــارِق) (فــا) (ج) فُــرّاق (م) فارِقَة (ج) فَــوارِق وفارِقات): ١-هەرچــی ڕەواو ناڕەوا/ ڕاســتی‌و ناراســتیی/ هەق‌و ناهــەق لەیەك جیاکاتەوە ٢-پەڵە هەورێکی جیا/ تەنیا.
(أَلفارِق (ج) فَوارِق وفُــرَّق وفُرُق وفُرّاق): مێحوشترێك کە ژانی بۆ هاتبێت‌و خەریکبێت بزێ‌و تەریکبووبێتەوە/جیابووبێتەوە.
(أَلفــارُوق): ١-(جیاکــەرەوەی/ هەڵاوێردی کاروبار ٢-نازنــاوی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتابە.
(أَلفُرْق): ١-تەورات ٢-قورئان.
(أَلفَرْق) (مص): هێڵی قژی سەر.
(أَلفِــرْق): ١-بەشــی جیــای هەموو شــتێك

٢-كووزی هەموو شتێك كە كووزكووز كرابێت ٣-دەستە منداڵ ٤-ڕانە مەڕێکی یان گاگەلێکی یان ڕەوە ئاسکێکی گەورەو زۆر.

(فِـرقُ النَّحـلِ) (ح): کـوورەی هەنـگ کە کرێکارو نێـرەکان لە شـاکەیان کۆدەبنەوەو کوورەکەیان لەبـەر زۆرییـانو پەیدابوونی شـایتر جیادەبنـەوەو لـە شـوێنێك کووره دەبەستن/ کوورەیەکیتر پێکەوە دەنێن.

(ألفَرَق): بۆشایی نێوان دوو دانی پێشەوە.

(- (ج) أفْراق وأفْرُق): ١-جیایی/ جیاوازیی/ دابڕان ٢-ڕۆژبوونەوە/ بەیاندان.

(-في الخَیل): گێڕیی ئەسـپ/ لایەکی کولۆتی نیشتبێتە سەر لاکەیتری کە ئەوە بۆی شتێکی دزێوە.

(نَبتٌ فَـرِقٌ): ڕووەکی: گیـای بڵاو بڵاو کە زەوییەکەی دانەپۆشیبێت یان وردبێت.

(ألفِرقَـة (ج) فِرَق): (دەسـتەیەك/ تیپێك) خەڵك/ کۆمەڵە خەڵکێك.

(ألفُرقـان) (مص): ١ هـۆی (جیاکردنەوەی ڕەواو نـاڕەوا/ هـەقو ناهـەق/ ڕاسـتیو ناڕاستیی) ٢-سەلماندن ٣-سەرکەوتن/ زاڵبوون ٤-ڕۆژ یان بەیان/ سپێدەی بەیان ٥ تەورات ٦-قورئان.

(ألفَریق (ج) أفرِقاء وأفرِقَة وفُرُوق): ١-کەلە خەڵکێك یان کۆمەڵە خەڵکێك کە لە دەسـتە زۆرتر بن ٢-ڕانە ئاژەڵ.

(فَریقُ الخَیل): ئەسـپێك کە پێشـبڕکێکەی بردبێتەوە یان بیباتەوە.

(نِیَّةٌ فَریقٌ): نیازو خواسـتی شلو ناتەواوو کە کار بە ئەنجام نەگەیەنێت.

(ألفَریقَةُ): کۆمەڵە مەڕێك بە شەو لە ڕانەکە جیابێتەوەو بڕبدات.

(ألأفْرَق (م) فَرقاء (ج) فُرْق): کەسـێکە کە ڕیشی پەرشو بڵاوبێت یان قژی پێشی سەری بڵاوبێت یان دانەکانی شاشبن.

(ذو الفَرَق): ترسو تۆقیو لەگەڵدا بوو.

(دیـكٌ أفْـرَق): کەڵەشـێرێك پۆپنەکـەی بڕگەبڕگەو توێ توێ بێت.

(تَیـسٌ أفْـرَق): سـابڕێنێکی شـاخبڵاو/ قۆچبڵاو.

(«ضَمَّ تَفاریقَ مَتاعِهِ»): کەلوپەلە بڵاوەکەی کۆکردەوەو لەیەکدا.

(أخَـذَ حَقَّـهُ تَفاریـقَ): مافەکـەی پارچە پارچەو بە چەند جارێك وەرگرتەوە نەك بە جارێك.

(ألمَفرِق والمَفْرَق- مِنَ الطَّریق (ج) مَفارِق): دووڕێیان.

(-مِنَ الشَّعَر): شـوێنی کەلاو جیابوونەوەی قژ/ بەملاولادا کەوتنی قژ.

(وَقَفَهُ علی مَفارِقِ الحَدیثِ): لەو شـوێنەدا قسـەکەی پێبڕی کە ئاخاوتنەکـە دەرکەوت چیدەگەیەنێت.

٢-(فَـرَقَ- الطائِـرُ. فَرقـاً): پەلەوەرەکـە ریقنەیکرد.

(أفْرَقَ- الطائِرُ): پەلەوەرەکە ریقنەیکرد.

(-الطائِرَ): ریقنەی بە باڵندەکە کرد.

٣-(فَرِقَ- مِنهُ فَرَقاً): لێیتۆقی.

(فَرَّقَ- الرَجُلَ تَفريقاً وتَفرِقَةً): پیاوەکەی ترساند/ تۆقاند.

(اَلفَرَق (مص) (ج) أفْراق وأفْرُق): تۆقین.

(اَلفَرُق والفَرِق والفارُوق والفَرُوق والفَرُّوق (م) فَرِقَة وفَرُقَة): زارەترەکبوو/ زراوچوو/ زیرەکردوو.

(اَلفَروقَةُ والفَرُّوقَـة والفارُوقَة): (بۆ نێرو مێ): زارەترەکبوو/ زیرەکردوو.

٤-(فَـرِقَ- الرَجُـلُ. فَرَقـاً): کەوتـە نـاو شەپۆلەوە.

(اَلفِرْق): شەپۆل.

٥-(اَلفُرْق): دەفرێکە پێی (دەپێورێت/ پێوانە دەکرێت).

(اَلفَرْق) (ن): کەتان.

(اَلفِرْق): بان.

(فَـروق): نازنـاوی قوسـتەنتەنییەیە/ ئەستەموڵە.

(اَلفَريقَةُ) (ط): پەلوولە خواردنێکە بۆ ژنی زەیستان دەکرێت.

٦-(اَلفَرْقَـد) (فك): ئەسـتێرەیەکە نزیکی جەمسـەری باکـوورەو رێـی پێدەردەکـەن لـە پاڵیدا یەکێکیـتر هەیە لەو شـارراوەترە پێیاندەڵێن.

(فَرْقَدان): ئەستێرەی دوو براله/ جووتکەی هەنجیران. دوو ئەستێرەی گەشن لەسەر رووی ورچی بچکۆلەوەن.

(اَلفَرقَـد- مِـنَ الأرض): زەویـی تەختـی رەقەن.

(- (ج) فَراقِد) (ح): (بەچکەی/ گوێرەکەی) مانگا کێوی.

٧-(فَرقَعَ. فَرقَعَةً وفِرقاعـاً): ١-تیژ غاریدا ٢-تری.

(فِرقاع): ترپو/ ترکەن یـان تیژ غارکردو/ راکردوو.

(فَرقَعَ- الأَصابِعَ): پەنجەکانی تەقاند.

(-فُلاناً): ملی فیساری بادا.

(فَـرْقَـعَ الـفِـرقـيعَـةَ) (عـنـد الـعـامـة): دەمەرقاچانەکەی تەقاند.

(تَفَرْقَعَ): تەقییەوە.

(إفْرَنْقَعَ): تەقییەوە.

(اَلفِرقَيْعَـة (ج) فِرقَيْعـات): ١-دەمەرقاچان ٢-فیشەکە شێتە (عامیە).

٨-(إفْرَنْقَعَ- عَنـهُ): لێیدوورکەوتەوەو وازی لێهێنا.

الملحق:

فرق: (اَلتَفريق): جیاکردنەوەی/ لەیەککردن/ لەیەکپچراندن.

(«أَلتَفريـــق بَــينَ الزَوجَــين»): لەیــەك جیاكردنەوەی ژن‌و مێرد.

(«أَلتَفريق بَــينَ العَناصِر»): جیاكردنەوەی توخمەكان لە یەكتری.

(أَلتَفريق= التَّميز): جیایی. جیاكردنەوە.

(«دونَ تَفْريــقٍ بَينَ الطوائِف والأَجناس»): بێجیاوازیی لە نێوان بەرەكان‌و رەگەزەكاندا.

(أَلتَفريق): دابەشكردن‌و جیاكردنەوە بە پێی جۆرە رێكخستنێك.

(«تَفريق حُروف الطَبْــع»): جیاكردنەوەو دابەشكردنی پیتەكانی چاپ.

(أَلتَفريق): پەرەوازەكردن‌و بڵاوەپێكردن.

(«تَفريــق المُتَظاهِريــن»): بڵاوەپێكردن‌و راوەدوونانی خۆپیشاندەرەكان.

(أَلمُفتَرَق): جیارێیان/ چواررێیان.

(«عِندَ مُفتَرَقِ الطُرُقِ»): لەچواررێیانەكەدا.

الملحق:

(فرقع): (أَلمُفَرقَعات): مادە تەقەمەنییەكان.

فــرك: ١-(فَرَكَ الثَــوبَ. فَــرْكاً): جلەكەی هەڵگلۆفت یان پرواند.

(-الشَــيءَ عَــنِ الثَــوب): شــتەكەی كــە بە جلەكەوە بوو پرواندی تا لێبووەوە.

(-الجَوزَ ونَحوَهُ): گوێزەكەو شتی لەو بابەتەی كران تا توێكڵەكەی لێببێتەوەو پاكبكرێت.

(فَرَّكَ- هُ): زۆر پرواندنی یان كراندی.

(أَفْرَكَ السُــنبُلُ): گوڵە گەنمەكە وایلێهات كە بپروێت‌و بخورێت.

(تَفَرَّكَ و انْفَرَكَ): هەڵپروا/ پاككرا/ كرێنرا/ هەڵگلۆفرا.

(إسْــتَفْرَكَ- الحَبُّ في السُنْبُلَةِ): دەنكی گوڵە گەنمەكە قەڵەوو پتەو بوو.

(أَلفَرك): پاككراو/ توێكڵلێكراوە.

لَــوزٌ فَــرِكٌ: بادامێك كە ئاســان توێكڵەكەی لێبكرێتەوە.

(أَلفَريك): ١-گەنمی هەڵپروێنراو ٢-خواردنێك بە گەنمی هەڵپرواوو رۆن دروستكرابێت.

(أَلفَريكيَّــة) (ط): خواردنێكــە لــە گەنمی هەڵپرواو دروستدەكرێت.

(أَلمُفَرَّكَــة) (ط): خواردنیــی جۆراوجۆرە لە شــتی پاككــراوە وەك هی هێلكــەی پاككراوو وردكراو.

(أَلمَفروك- مِنَ الثياب): بەرگێك تەواو رەنگی كرابێت.

(أَلمَفْرُوكة) (ط): حەڵوایەكە لە ئاردی سپی‌و رۆن‌و شەكر دوستدەكرێت سەرەكەی فستق‌و گوێزو بادامی سوورەوەكراوەی پێدادەكرێت.

(«أَلقَمْلَــة المفروكــه»): نەســپێی فلیقــاو، نموونەیە بۆ كەسێكی بۆدەڵەی ملشۆڕ كە زوو خۆی بەدەستەوە بدات (عامیە).

٢-(فَرِكَ-هُ. فَــرْكاً وفِركاً وفُرُكاً ورفِركاناً): رقی لێبوو/ حــەزی لە چارەی نەكرد (دەڵێن ئەوە تایبەتییە بە ژن‌و مێرد).

(فارَكَ-هُ مُفارَكَةً): لێیتۆرا.

(ألفِرْك): ١-رقلێبوونەوە بە جۆرێکی گشتی. حەز لە چارەنەکردن ٢-حەز لە چارەنەکردنی یەکتری ژنو مێرو ناکۆکبوونیان.

(إمْـرَأةٌ فارِكٌ) (فـا) (ج) فَـوارِك): ژنێکە کـە رقی لە مێردەکەیبێـت/ حەز لە چارەی نەکات.

(ألمُفَـرَّك): ١-بێزراو/ حەز لـە چارەنەکراو/ ڕەزاتاڵ ٢-لێتۆراو بەجێهێڵراو/ بێزراو.

٣-(فَـرِكَ-تِ الأُذُنُ فَـرَكاً): بێخـی گوێکـە شلبوو.

(فَرِكَة وفَرِكاء): گوێی بێخ شل.

(تَفَـرَّكَ): شـلو شـێواو ڕۆیشـتو لـە قسەکردنیشدا خاوخلیچك دواو بوو.

(إنْفَـرَكَ مِنكَـبُ فُلان»): جومگەی شـانی ترازا/ شانی لە قۆڵی جیابووەوە.

(ألمَفْرُوك (مفع)- مِنَ الإبِل): حوشـترێك کە سەری شانی دەرچووبێتو درزی تێبووبێت.

فرم: ١-(فَرَمَ- التَبغَ واللّحم فَرَماً): توتنەکە یان گۆشـتەکەی وردورد جنی/ گۆشـتەکەی قیمەکرد.

(فَرَّمَ- الوَلَـدُ) (عامية): منداڵەکە دانەکانی گۆڕران.

(أفْرَمَ- الإناءَ): قاپەکەی پڕکرد.

(ألفَرْمَـةُ (ج) فَرامـات) (عاميـة): کوتی بچووکی گۆشـت یان پارچـەی وردی توونتنو شتیر.

(ألأفْرَم): دان وردو خاشبوو.

٢-(ألفَرامِـل): وشـەیەکی ئینگلیزییـە. پێشیدەڵێن: (فَرَان (ج) فَرَانات) کە ئەمەیش فەرەنسییە ئامێرێکە کە بە هۆیەوە دەتوانرێت ئوتومبیلو شـتی لەو بابەتە هێواشبکرێتەوە یان بوەستێنرێت/ ئیستۆپ.

٣-(ألفَرَمـان (ج) فَرامـين (فارسـية): فەرمانو بڕیاری سـوڵتانە کـە بۆ والییەکان دەردەکرێت.

فـرن: ١-(ألفُرن (ج) أفران) (لاتينية): فڕن کە بۆ نانکردنو شتیر دروستکراوە/ کوورە/ نانەواخانە/ سەموونخانە.

(ألفَرَّان): ١-خاوەنفڕن ٢-نانکەر/ نانەوا.

(ألفارِنَة): نانەوای ژن/ ژنە نانکەر.

(ألفُرْنِيّ الواحِدَةُ فُرنِيَّة): ١-کولێرە/ لەواشە/ خەپلە ٢-پیاوی قەبەو ئەستوور.

٢-(ألفِرنْـد (ج) فَرانِـد): ١-دەمنکـە هەنـار ٢-شمشێر ٣-بریقو باقی دەمی شمشێر.

(سَيفٌ فِرند): شمشـێرێکی ناوێزە/ بێوێنە ٤-جۆرە بەرگێکە (لە بڕندی فارسییەوە کراوە بە عەرەبی).

(ألإفرِند) (ج) إفْرِندات): بریقو باقی دەمی شمشێرو نیگاری.

٣-(تَفَرْنَسَ- الرَجُلُ): بوو بە فەرەنسی یان وەك فەرەنسی ڕەفتاریکردو خووی ئەوانیگرت.

(مُتَفَرْنِس (ج) مُتَفَرْنِسون): به فەرەنسیبوو یان رەفتار فەرەنسی.

٤-(ألفَرَنْك (ج) فَرَنْكات): دراوی فەرەنك كە هی چەند ولاتێكە.

فره: ١-(فَرِهَ. فَرهاً): كەیفخۆش‌و جابووكبوو كەوتە هەلەكەسەما.

(فَـرِه): كەیفخـۆش‌و سـەركێش‌و جـرت‌و فرتكەر.

(فَرُهَ فَراهَةً وفُروهَةً وفَراهِيَةً): ١-شـارەزاو كارامـەو چابوكبوو ٢-گورجوگـۆڵ‌و چالاك‌و سووكەڵە بوو.

(فـارِه): چابـوك‌و شـارەزاو كارامـە/ كار راپەڕێن.

(أفْـرَهَ- الرَجُـلُ): شـاگردێكی مێرمنداڵی چابوكی سووكەڵەی وریای ڕاگرت.

(إسْـتَنفَرَه الدوابَ): بە تەنـگ چوارپێكەوە هات‌و خزمەتیكرد.

(ألفـارِهُ): ١-كارزان‌و كارامـە ٢-چابوك‌و كار راپەڕێن ٣-جوان‌و شێوە شیرین.

(ألفارِهَـةُ (ج) فَوارِهُ وفُرُهُ): ١-مێی وشـەی (ألفاره) ٢-كەنیزەكی جوانی ناسك‌و گەنج.

(ألفَراهَـةُ والفَراهِيَّة والفُروهَـة): لێزان‌و كارامە لە شـتدا ٢-ناسـكیی‌و جوانیی‌و شێوە شیرینی.

(ألأفْرَه): ١-زۆر شارەزاو كارامە دیار ٢-ناسك‌و گەنج‌و شێوە شیرین دیار.

٢-(ألفاره): زۆرخۆر.

(رَجُلٌ فارِهٌ وجارِيَةُ فـارِهٌ (ج) فُرَّهٌ وفُرَّهَةٌ وفَرَهَـةٌ وفُرْهَةٌ وفُـرُوهٌ): پیاوێكی زۆرخۆر كەنیزەكێكی زۆرخۆر.

٣-(فَرْهَدَ): هەڵاوسا.

(-ت نَفسُهُ): دەروونی تەنگبوو.

(تَفَرْهَـدَ- الغُـلامُ): مێردمنداڵەكـە قەڵەو بوو.

(الفُرهُـدْ والفَرهَـد): مێردمنداڵی قەڵەوو لەشجوان.

(الفُرهُود= الفُرهُـد): مێردمنداڵی قەڵەوی لەشجوان.

(- (ج) فَراهيـد) (ح): ١-بەرخ ٢-كاری بزنە كێویی.

فـرو: ١-(فَـرَى- الجُبَّةَ. تَفرِيَـةً): فەرووی بەجبەكەوە نا.

(إفْتَـرى- الفَـروَة): فـەرووی (لەبەركرد/ پۆشی).

(ألفَرْو (ج) فِراء): بەرگێكە وەك جبە ناوەكەی پێستی هەندێك زیندەوەری تێدەگیرێت وەك هی كەروێشك‌و سمۆرەو هیتر.

(ألفَروَة): ١-پێستی سەر بە قژەوە.

(«ضَرَبَهُ على أُمِّ فَروَتِهِ»): كێشای بە تەوقی سەریدا ٢-پەچەی نافرەت ٣-تاج ٤-فەرەنجی/ كەپەنگ كە لە تووكی حوشتر دروستدەكرێت ٥-دارایی‌و سامان/ دەوڵەمەندیی ٦-كیسەیەكە

دەرۆزەکــەر خێرەکــەی کــە وەریدەگرێــت تێیدەکات.
(اَلفَروَةُ (ج) فِراء): فەروو.
(اَلفَرَّاء): فەروو دروستکەر.
٢-(فَروَز. فَروَزَةً): مرد.
فري: ١-(فَرى- الأَرضَ فَرياً): بە زەویەکەدا ڕۆیشتو بڕی.
(-البَــرقُ): هەورە برســوکەکە لە ئاســماندا شەوقیدایەوە.
(فَــرَى وفَــرَّى- الشَــيءَ): شــتەکەی بڕیو هەڵیهێنایەوە/ هەڵیدڕی/ یەکالایکردەوە.
(أَفرَى- الشَــيءَ): ١-شتەکەی بڕیو هەڵیدڕی ٢-شتەکەی چاککردەوە.
(تَفَــرَّى وانفَــرى. تَفَرِّياً وانفِراءً): شــەقو پەقبوو/ شەقارشەقار بوو یان هەڵدرا.
(«تَفَــرَّتِ الأَرضُ بِالعُيــونِ»): زەویەکــە قڵیشــایەوەو کانییەکــی زۆری لێهەڵقوڵــی/ لێدەرپەڕی.
(اَلفَــرِيّ (م) فَرِيَّة): قڵیشــاو/ شــەقبردوو/ هەڵهاتوو.
(اَلفَــرِيّ والفَرِيَّــةُ): دۆلکەی گــەورە (وەك شەقیبردبێتو کانیاوی لێدەرپەڕیبێت.
(«اَلفَرِيَّــةَ الفَرِيَّــةُ»): خێرا خێــرا/ گورج گورج.
٢-(فَرى- عَلَيهِ الكَــذِبَ فَرْياً): بوختانی بۆ کرد/ درۆی بۆ هەڵبەست.

(-المَزادَةَ): کوندەی دروستکرد.
(إِفتَرى- عَلَيــهِ الكَذِبَ إِفتِراءً): بوختانی بۆ کرد/ درۆی بۆ هەڵبەست.
(اَلفِرْيَــةُ): جاریــك بوختان (بــۆ کردن/ بۆ هەڵبەستن)/ درۆ بۆهەڵبەستن.
(اَلفِريَةُ (ج) فِرىً): بوختان/ درۆی هەڵبەستراو.
(اَلفَرِيُّ): کاری ساختەو درۆی هەڵبەستراو.
(«هــذا أَفرى الفِــرى»): ئەمــە گەورەترین (درۆیەو درۆی هەڵبەستراوە/ بوختانە).
٣-(فَرِيَ. فَرىً): حەپەساو سەرسامبوو.
(اَلفَرا): سەیرو سەمەرە/ سەیرلێهاتن.
(اَلفَرِي): شتی: سەیرو سەرسوڕمێن.
(«فُــلان يَفــرِي الفَــرِيَّ»): فیســار لــە کارەکەیدا شتی سەرسوڕمێن دێنێتە کایەوەو پیشاندەدات.
(«لَقَــد جُئتَ شَــيئاً فَرِيّــاً»): بە ڕاســتی شــتێکی وات هێناوەتە کایەوە کە ســەر لێی سووردەمێنێتو بڕوای پێناکرێت.
٤-(أَفرى- فُلاناً): سەرزەنشتیکرد.
٥-(اَلفَرا): زێرەکردوو/ زۆر ترسنۆك.
(اَلفِرْيَةُ): دەنگە دەنگو ژاوەژاو/ هاتوهاوار.
اَلفِريَةُ (ج) فِرى): جێنێودانو قسەپێوتن.
فزّ: ١-(فَزَّ- الظَبيُ فَزّاً): ئاسکەکە ڕاچڵەکیو تۆقی.
(-هُ): ڕۆحیبردو دڵــی ڕاچڵەکاند/ تۆقاندی، شڵەژاندی/ وەرسیکرد.

(-هُ عَن مَكانِهِ): تۆقاندیو شـپرزەیكردو له شوێنەكەی دەریپەڕاند.

(-فُلانٌ) (عند العامة): ڕاچڵەكی/ هەڵسڵەمییەوە.

(فَـزَّ. فَـزازَةً وفُـزُوزَةً): شـپرزە بـووو ئاگریگرت.

(أفَزَّ-هُ): ١-تۆقاندی ٢-شپرزەیكردو نارەحەتیكرد.

(إسْـتَفَزَّ-هُ): ١-وروژانـدیو ڕاپەڕانـد/ نائارامیكرد ٢-شپرزەیكرد ٣-له (خانووەكەی/ شوێنەكەی) دەریپەڕاندو نائارامیكرد.

(-هُ الخَوفُ): ترس ڕاپەڕاندو ئامادەیكرد.

(-هُ مِـنَ الشـيءِ): لـه شـتەكەی دەركردە دەرەوە.

(ألفَزّ (مص) (ج) أفْزاز): ١-پیاوی سووكەڵەو گورج ٢-(ح) گوێرەكەی مانگا كێوی.

(ألفَزَّة): ڕاچڵەكـینو ڕاپەڕین/ وروژاندنو هەراسان.

(«قَعَدَ مُسْتَفِزّاً»): بە سڵو وریاییەوە نائارام دانیشت.

٢-(فَـزَّ-هُ فَـزّاً): لە خشـتەیبرد/ فریویداو بەسەریدا زاڵبوو. .

(إفْتَزَّ- علیه): بەسەریدا (سەركەوت/ زاڵبوو).

(تَفـازَّ- الرجلانِ): شـەڕە شمشـێریانكردو بەیەكیاندادا/ شـەڕیان لەگەڵ یەكتری كرد/ بەیەكدا هەڵیژان/ یەخەی یەكتریان گرت.

(إسْتَفَزَّ-هُ): كوشتي.

٣-(فَزَّ. فَزّاً): تاكبووەوە.

(- عَنهُ): لێیكەنارگیر بوو/ خۆی لێكێشایەوە.

٤-(فَزَّ- الجرحُ. فزیزاً): برینەكە چی تێدابوو لە بەری ڕۆیشت.

(فزر: ١-(فَزَرَ-هُ فَزْراً): ١-قڵیشاندی/ قاشیكرد ٢-لە یەكی هەڵوشاندو شكاندی.

(-هُ بالعَصـا): بـه داردەسـت كێشـای بـه پشتیدا.

(-الشَـيءَ مِنَ الشيءِ): شتەكەی لە شتەكەیتر جیاكردەوە.

(-فُزُوراً): شتەكە قڵیشیبرد/ شەقیبرد.

(فَزَّرَ وأفْزَرَ الشيءَ): شتەكەی وردوخاشكرد.

(تَفَـزَّزَ وانْفَـزَزَ): شـەقیبردو پارچەپارچە بوو.

(-الثَوبُ): بەرگەكە/ جلەكە درا.

(ألفِـزْر): ١-ڕەوە مەڕ دەڵێـن: لە نێوان دە تا چل سـەر بێت ٢-لوویەكی چەوریيە لەسەرو نەڕنۆوە دەردەچێت.

ألفَزَر: درزو قڵیش (وەكو كۆی وشـەیفیزرَة بێت).

(ألفُزُور): درزو قڵیش.

(ألفَزرَة (ج) فُزَر): شەقامو ڕێی فراوان.

(ألفازر) (فا): ڕێی فراوانو درێژ.

(ألفازِرَة): ١-مێی وشەی(الفازر) ٢-ڕێگەیەك بەناو لمدا بڕوات وەكو قڵیشی زەویبێت وایە.

٢-(فَزِرَ. فَزَراً): لە پشتدا یان سنگیدا گرێیەك دەركەوتو دەرهات.

(أَفْزَر): سنگ یان پشت گرێداوی.

(ألفَزراء (ج) فُزر): مێی وشەی (الأفْزَر).

(ألمَفْزور) (مفع): ١ـکەسێکە گرێ لە پشتی یان سنگی دەرهاتبێت ٢ـقەموور.

٣-(ألفِزر) (ح): ١ـکار/ کارژۆلە ٢ـبەچکە بەور ٣ـنەژاد/ ڕەسەن/ ڕیشە.

(ألفازر) (ح): مێروولەیەکی ڕەشەو سووریشیی تێدایە.

(ألفَزارَة) (ح): مێپڵنگ.

(ألفَزراء (ج) فُزْر): ١ـلەشتۆکمەو قەڵەو ٢ـمێیەك کە خەریکی پێگەیشتنبێت.

فزع: (فَزَعَ- مِنهُ فَزعاً وفِزعاً): لێتۆقی/ ترسا.

(فَزِعَ. فَزَعاً): تۆقیو ترسا.

(أفْزَعَ-هُ) (ضد): ١ـتۆقاندیو ترساندی ٢ـتۆقینەکەی ڕەواندەوەو ترسەکەی لەسەر لابرد.

(أفْزَعَ- عَنهُ): لێتۆقینەکەی لە دڵ دەرکرد.

(ألفزع) (ص): تۆقین.

(ألفَزعَةُ): ئەو کەسەی کە خەڵك لێیبتۆقێت.

(ألفُزْعَةُ): کەسێکە کە لە خەڵك زۆر بتۆقێتو بترسێت.

(ألفازِع (ج) فَزَعَة والفَزع والمُفازِع): تۆقیو/ ترساو.

(ألفَزَّاعَة): ١ـزۆر بتۆقێتو بترسێت ٢ـئەوەی کە خەڵك زۆر بتۆقێنێت ٣ـداهۆڵ کە لە کێڵگەدا دەچەقێنرێت بۆ ترساندنی باڵندەو درندە.

(فِزِّیعَة) (عامیة): داهۆڵ.

(ألمُفَزَّع) (ضد): ١ـزیرەکردو/ زۆر ترسنۆك ٢ـدلێر/ ئازا/ نەترس.

٢-(فَزِعَ- إلَیهِ. فَزَعاً): ١ـهانای بۆ برد ٢ـپەنای بۆ برد.

(-الرَجُلَ): بە هانای پیاوەکەوە چوو و سەریخستو پشتیگرت.

(أفْزَعَ- القَومَ): بە هاواری خوێشگەلەوە چوو.

(ألفَزَع): هاوار بۆ بردن/ هەنا بۆ بردن.

(ألفازع (ج) فَزَعَة والفَزع والمُفازِع): هانابەر/ پەنابەر/ دادو فریادکەر.

(ألمَفْزَع والمَفْزَعَة): پەنا/ فریادڕەس/ داڵدە/ بەهاناوە چوو.

(«فُلانٌ مَفْزَعٌ أو مَفْزَعَةٌ للناس»): فیسار (فریادڕەسی/ بەفریاکەوتەی) خەڵکە/ داڵدەو پەنای خەڵکە (هەردوو وشەکە بۆ تاكو کۆ نێرو مێیە).

٣-فَزِعَ- مِن نَومِهِ فَزَعاً): لە خەو ڕاپەڕی.

(-لِمَجیءِ فُلان. فَزْعاً): ڕاپەڕیو ئامادەی هاتنی فیسار بوو.

(أفْزَعَ- هُ مِنَ النَّوم): لە خەو ڕایپەڕاند.

فسّ: (ألفَسْفَس والفَسْفَاس (ج) فَسافِس

وفَسافيس): ١-گەوج ٢ (ن) گیابۆگەنە.

(ألفَسافِس) (ح): قالۆنچە.

(ألفِسْفِسَـــة) (ن) = الفِصْفِصَــة): وێنجـە/ رووەکێکە چوارپێ دەیخوات‌و حەزی لێدەکات.

الفَسْفُوسَـــة (عنـد العامــة): زیپکەیەکـی بچووکە لە پێست دێت.

(ألفُسَيفِسـاء): پارچەی بچووکـی ڕەنگینی مەرمـەڕو هیـتر‌ەو دەدرێنـە دەم یـەك‌و شـێوەی هەمەجـۆرو وێنـەی جۆراوجۆری لێدەردەهێنرێـت لەوانەیـە ناوەکـەی لـە (فِسفِسە) موە هاتبێت کە وێنجەیەکە شێوەی زۆری دەچێتــەوە ســەر ئــەو لــە بچووکی‌و شێوەیدا (یان ئەمە کراوە بە عەرەبی).

فسأ: ١-(فَسَأَ-ەُ): بەداردەست لێیدا.

(فَسَـــأَ وفَسَّـــأَ- الثَوبَ. تَفسـیئاً وتَفسِئَةً): جلەکەی (دراند/ هەڵدڕی).

(تَفَسَّأَ-ەُ): بەدار لێیدا.

(-الثَوبُ): جلەکە شـەق‌و پەقبوو/ درا/ شڕو وڕ بوو.

٢-(فَسَـأَ-ەُ عَن كَذا): ڕێی ئــەوەی لێگرت‌و نەیهێشت.

٣-٠فَسِيءَ. فَسَأً): سنگی دەرپـەڕی‌و پشتی بە ناودا چوو ٢-بەرموسڵدانی بەرز بوومەوە.

(أفْسَـأ (م) فَسْآء): ســنگ دەرپەڕیــوی پشت بەناوداچووی بەرموسڵدان هەستاو.

(تَفاسَأَ- الرَجُلُ. تَفاسُؤاً): پشت‌و سێبەندەی دەرپەڕاند.

٤-(تَفَسَّـــأَ- المــرضُ فیهم): نەخۆشـــیيەکە تێیاندا بڵاوبووەوە.

فســت: ١-(ألفُستُق والفُسْـــتَق (ن) (مُعَرَّبَة عَن بِسْـتَة الفارسـية): بسـتە. درەختێکی بەرداره پەلوپۆهاوێژە لە کۆمەڵەی قەزوانەو لەوە دەچێت لە تورکستانەوە هاتبێت. لەبەر خۆشـــیی بەرەکــەی دەروێنرێــت لــە وڵاتە عەرەبییەکانــدا لــە مێژە بۆنــی دەکرێت‌و هەیە.

(فُسْتُقُ العَبِيد) (ن): بستەی زەوی (لە زەویدا دەچێنرێت بۆیە وا ناونراوە لە شـــارەزووری ئێمەدا هەیە). لە بەرازیلەوە هاتووە لە وڵاتە جەمســەرییەکاندا بە تایبەتی لە ئەفەریقادا زۆر دەچێنرێــت. بــەری زۆر دەگرێت‌و زۆر خۆشدەخورێت‌و شلەڕۆنی لێدەردەهێنرێت.

ألفُسْـتُقي: ئــەوەی ڕەنگــی فســتقییە کــە سەوزێکی زۆر کاڵە.

٢-(ألفُسْـــتان (ج) فَســاتين والفُسْطان (ج) فَساطين) (فارسية): عەزیزیی ژنانە کە وەك دیزداشەی پیاوانەیە.

فسج: (فَسَّـــجَ): گەڵی بڵاوکردەوە بۆ ئەوەی میزبکات.

(أفْسَجَ- عَنهُ): وازی لێهێنا.

فسح: ١-(فَسَحَ- فَسْحاً): هەنگاوی گەورەمینا.

(-لَـــهُ في المَجلِــسِ. فَســحاً وفُسُــوحاً): لــە

ئەنجومەنەکەدا (جێگەی بۆ کردەوە/ ڕێیدا).
(فَسُحَ- المَكانُ. فَساحَةً): شوێنەکە فراوانتر بوو.
(فَسيح وفُسَاح وفُسُح وفُسْحُم): (میمەکە بۆ زیادرەوی خراوەتە سەری) فراوان/ بەربەرەڵا/ کراوە/ وراق.
(فَسَّحَ- المَكانَ): شوێنەکەی فراوانتر کرد/ والاتر کرد.
(-لَه فِي المَجلِس): لە ئەنجومەنەکەدا (جێیکردەوە/ ڕێگەیدا).
(أَفْسَحَ- المَكانُ): شوێنەکە فراوانبوو بەربەرەڵا.
(تَفَسَّحَ): فراوانبوو.
(-لَهُ): جێگەکەی بۆ والا کردو جێیکردەوە.
(-القَومُ فِي المَجلِسِ وتَفاسَحوا): خوێشگەل لە ئەنجومەنەکەدا بلاو دانیشتن‌و جێیان کردەوە.
(إِنْفَسَحَ- صَدْرُهُ): دڵی کرایەوە.
(-المَكانُ): شوێنەکە فراوانبوو/ بەربلاو بوو.
(-طَرْفُهُ): بەری دیدەی بەرەڵا بوو/ هیچ شتێك بەری چاوی نەگرت.
(الفُسْحَةُ (ج) فُسَح): ١-فراوانیی ٢-بۆشایی/ پانتایی نێوان خانووەکان ٣-فراوانیی‌و بەربەرەڵایی.
(الفَيْسَحى): هەنگاوی بلاویی.
(«هو يَمشي الفَيسَحى»): ئەو بە هەنگاوی بلاو دەڕوات.

٢-(فَسَخَ- لَهُ فِي السَفَرِ فَسْحاً): بۆی نووسی کە ڕێی پێدەدات گوزار بکات.
(أَلفَسْح) (مص): ١-نیمچە ڕێپێدانی گوزار کردن/ سەفەرکردن ٢-پەساپۆرت/ گوزارنامە.
فسخ: ١-(فَسَخَ. فَسْخاً): تێنەگەیشتوو بوو/ نەزان‌و کەودەنبوو.
(-رَأيَ فُلان): ڕای فیساری (بە خراپ دانا/ نابووتکرد).
(-الرأيُ): ڕاکە/ خراپبوو.
-الأَمرَ أَوِ العَقدَ: کارەکەیان (ڕێکەوتنەکەی/ گرێبەستەکەی) هەڵوەشاندەوە.
(فَسَخَ- الرَأيُ. فَسَخاً): ڕاکە خراپ‌و ناتەواو بوو.
(فاسَخَ- هُ العَقدَ أَوِ البَيعَ وتَفاسَخا العَقدَ أَوِ البَيعَ): لەسەر هەڵوەشاندنەوەی (گرێبەستەکە/ ڕێکەوتنەکە/ سەواکە/ کڕین‌و فرۆشتنەکە) ڕێککەوتن.
(«تَفاسَخَتِ الأَقاويل»): وتەوواتەکان هەریەکە بە شێوەیەکبوون‌و دژ بە یەك بوون.
(إِنْفَسَخَ العَزمُ أَوِ العَقدُ): سوورخواستییەکە یان ڕێکەوتنەکە نەماو پووچەڵبووەوە.
(أَلفَسْخ والفَسيخ): ١-کەمئاوەز یان لەشپووچەڵ‌و لاواز ٢-کەسێك کە بێکارەو نەتوانێت ئەوەی پێویستیەتی پەیدایبکات یان کارەکەی بۆ چارەسەر نەکرێت ٣-کەسێکی بێبڕشت‌و بێوەرە کە لە تەنگانەدا

زوو برووخێت.
(اَلفَسْخَة): جارێك كەوتننە بێورمیی‌و بێبرشتیەوە ٢-جارێك هەڵومشانەوەی رێكەوتن‌و كار ٣-جارێك پووچەڵبوونەوەی را.
(رَجُلٌ فَسْخَةٌ): پیاوی كەمئاومزو كەودەن یان لاوازو بێتوانا.
٢-(فَسَخَ- العُودَ أو المَفْصَلَ. فَسْخاً): چێومكەی لە جێی خۆی ترازاند یان جومگەكەی لە جێبرد.
(- الثَوبَ عَنهُ): جلەكەی لەبەر داكەندو فرێدا.
(-الشَيءَ): شتەكەی (لێهەڵومشاند/ جیاكردەوە).
(فَسَّخَ- هُ): تەواو (هەڵیومشاند/ جیایكردەوە).
(تَفَسَّخَ): ١-پارچەپارچە بوو ٢ رزی/ پۆرتكا.
(-الشَعَرُ عَنِ الجلدِ): تووكەكە لە پێستەكە هەڵومری (ئەمە تایەبتە بە مردوو).
(اَلفَسْخ عِندَ غُلاة أصحاب التَناسُخ): لێبوونەوە، لەلای ئەوانەی كە زیادرمون لە بڕوای تەنگوێزانەوەی گیاندا ئەومیە كە گیانی مرۆڤی مردوو دەچێتە مۆریچەیشەوە تا دەڵێن دەشچێتە شتی بێگیانیشەوە وەك بەردو كانزاو راخەریشەوە.
(اَلفَسْخَة): پارچەیەكی ومریوو/ لێومبووی شتێك).
(اَلفسیخ) (ط): ماسیی (خوێكراو/: سوێركراو).
٣-(أفْسَخَ- الكِتابَ): نامەكەی (بیرچوو/ فەرامۆشكرد).
فسد: (فَسَدَ وفَسُدَ فَساداً وفُسُوداً): گەنبوو/ خراپبوو/ بۆگەنبوو/ بەدبوو/ گەنی.
(فَسد (ج) فَسدى وفاسِد): گەن/ بۆگەن/ خراپ/ بەد/ تێكچوو.
(فَسَّدَ- هُ وأفْسَدَ-هُ): تێكیدا/ گەنیكرد/ خراپیكرد/ بەدیكرد.
(فاسَدَ- القَومَ): بەدیی لەگەڵ خوێشگەلدا كرد ئەوانیش خراپەیان دەرباره كرد.
(اَلفَساد) (مص): ١-بەرەڵایی‌و رابواردن/ بەدرەوشتیی ٢-بە زۆر ماڵی خەڵك خواردن‌و بردن ٣-بۆگەنبوون/ گەنبوون/ دارزان.
(اَلمَفْسَدَة (ج) مَفاسِد): هۆی خراپبوون/ مایەی گەندەڵیی‌و تێكچوون/ هۆكاری رزین‌و بۆگەنبوون.
فسر: (فَسَرَ- الأمْرَ. فَسْراً): كارەكەی لێكدایەومو روونیكردەوە.
(-المُغَطّى): (شاردراوەكەی/ داپۆشراوەكەی) ئاشكراكرد/ پەردەی لەسەر شاردراوەكە لابرد.
(-الطَبيبُ. فَسْراً وتَفسِرَةً): پزیشكەكە تەماشای میزی نەخۆشەكەیكرد تا بە هۆیەوە بزانێت دەردەكەی چییە.
(فَسَّرَهُ): روونیكردەومو دەریخست/ دیاریكرد.
(تَفَسَّرَ واسْتَفْسَرَ- فُلاناً عَنِ الأمرِ واسْتَفْسَرَهُ الأمرَ): لە فیساری خواست/ داوایكرد كە

کارەکەی بۆ ڕوونبکاتەوەو تێیبگەیەنێت.
(ألتَفْسِـرَةُ) (مص):١-هەر شـتێك كە بێتە هۆی ڕوونكردنەوەو دەرخسـتنی شـتێكیتر، میـزی نەخۆش كە بە هۆیەوە نەخۆشـیەكە دەدۆزرێتـەوە ٢-ئـەو قاپـەی كـە میـزی نەخۆشـەكەی تێدایـەو پیشـانی پزیشـك دەدرێت، پێیشی دەڵێن (دَلیل)، بەڵگە.
(تَفسـیرَةُ الشـيء): هـەر شـتێك كـە هۆی ڕوونكردنەوەو بە ئەنجامگەیاندنی شتێكبێت.
(ألتَفسیر (مص) (ج) تَفاسیر)١-ڕوونكردنەوەو لێكدانەوەی شتێك ٢-دەرخستن‌و ئاشكراكردن ٣-تێگەیاندن ٤-ڕاڤەكردن/ لێكدانەوەی باس‌و واتا/ بۆچوون.
(حَرفا التَفسـیر): دوو پیتـی لێكدانەوە كە دوانن:
١-أي: (واتا). كە شتی نادیاری پێ لێكدەدرێتەوە وەك «هذا عَسْجَد»: واتا ئەمە زێڕە.
٢-وأن: (كە). بۆ لێكدانەوەی واتای قسەكەیە وەك: («نادَیتُكَ أن تَفْعَلْ كذا»): بانگمكردیت كە ئەو كارە بە ئەنجام بگەیەنیت.
فسط: ١-(ألفُسَّاط والفِسْطاط (ج) فَساطیط): چادر/ ڕەشماڵ/ دەوار/ خێوەت.
(ألفُسْطاط (ج) فَسـاطیط): ١-دەوار ٢-ناوی كۆنی میسرە.
(ألفَسیط): پارچەی نینۆك.
(فَسیطَة): پارچەیەكی نینۆك.

٢-(ألفُسْطان)/ عەزیزیی ژنانە.
فسـق: ١-(فَسَقَ وفَسُقَ. فِسْـقاً و فُسُوقاً):١-گومڕابـوو/ یاخیبـوو/ لە ڕێی ڕاسـت‌و ڕەوا لایدا ٢-داوێنپیسیی‌و بێناموسییكرد.
(فاسِق (ج) فَسَـقَة وفُسَّـاق وفاسِقُون (م) فاسِـقَةُ (ج) فاسِـقات وفَواسِـق):١-گومڕا/ یاخی لە ڕێی ڕاسـت‌و هـەق لادەر/ بێبڕوا ٢-پیاوی داوێنپیس/ پاشڵپیس/ خراپەكار/ ژنی سۆزانی/ زیناكار.
(فَسَـقَ وفَسُقَ وانفَسَقَ- الرَطبُ عَن قَشرِهِ): فەریكە خورماكە لە توێكڵەكەی بووەوە.
(فَسَّـقَ-هُ): ١-بەگومـڕاو چەوتـی دانا ٢-بە داوێنپیس‌و خراپەكاری دانا.
(-القاضيُ الشـاهِدَ): دادوەر شایەتەكەی بە درۆزن‌و ناڕاست دانا.
(ألفَسَق والفَسَّاق والفِسِّیق): هەمیشە گومڕا/ خراپەكار/ شەڕواڵپیس یان بە زۆریی وابێت.
(«یافَسَـق»): هەی گومڕا. هەی شەڕواڵپیس. هەی خوارو خێچ.
(فَسَّـاق): بـۆ بانگكردنـی ژنـی سـۆزانی بەكاردێت‌و دەوترێت: یا فَساقِ أي یا فاسِقَة: هەی (سۆزانی/ قەحبە/ خراپە).
(ألفُوَیْسِـقَة): بـۆ ١-بچووككردنەوەی وشـەی (فاسِـقَة)یە. قەحبۆكـە ٢-مشـك (گوایا لە كونەكـەی هاتووتـە دەرەوەو بـەرەو ڕووی خەڵكی ڕۆیشتووە.

٢-(اَلفِسْـقِيَّة (ج) فَسـاقِيّ): ١-گۆل/ حەوز ٢-شوێنی دەستوێژشتن (لاتینیه).

اَلفاسِقِيَّة: جۆره/ سەروبەستێکه.

(تَعَمَّـمَ فُـلانُ الفاسِـقيَّة): بـەو شـێوەیه سەروبەستی بەست/ ئەو جۆره مێزەرییبەست.

فسل: (فَسَلَ- الصَبِيَّ. فَسْلاً): منداڵەکەی له شیر بڕییەوه.

(أَفْسَـلَ وافتَسَـلَ- الفَسِـيلَةَ): (برالەکەی/ خەڵفەکەی) لـه دارەکه کـردەوەو دەرهێناو رواندنی.

(اَلفَسْـل (مص) (ج) أَفْسُـل وفُسُول وفِسال وفُسْل وفُسُولَة وفُسَـلاء وأفسال): براله یان چڵێك یـان پارچـەی چڵێك لـه درەختەکه بکرێتەوەو بروێنرێت/ قەڵەم بکرێت.

اَلفَسـالة- مِـنَ الحَديـد ونَحـوَهُ: برشـتی ئاسن‌و شـتی وەها که دەکوترێت له ئاسنەکه دەبێتەوه.

(اَلفَسـيلَة (ج) فَسـيل وفَسـائِل و (جـج) فُسـلان): ١ (برالـه/ خەڵفـی) دارخورمـاو درەختیتر که له بنی درەختەکه دەکرێتەوەو دەروێنرێـت ٢-هەمـوو چڵێـك قەڵەمێك له درەختەکه بکرێتەو بروێنرێت/ بچەقێنرێت تا ببێته دارێکیتر.

٢-(فَسِـلَ وفَسُلَ وفُسِـلَ فَسـالَةً وفُسُولَةً): (بێکاره/ هیچ لەباردانەبوو) و بێورەو ڕسـوا بوو.

(اَلفَسْـل (ج) أَفْسُل وفُسُـول وفِسال وفُسْل وفُسُـولَة وفُسَلاء وأَفسال): مرۆڤی بوودەڵه/ بێبرشتی نامەردو بێوره.

(اَلفِسْل): گەوج.

(اَلفُسُـولَة) (فـص): لـه کاردا (سسـتی/ خاووخلیچکی).

(اَلمَفسُـول): بوودەڵـەی بێتوانـا/ بێـورەو بێپیاوەتیی.

٣-(فَسَّـلَ وأَفْسَـلَ- دراهِمَـهُ ومَتاعَـهُ): دراوەکەی/ پارەکەی ساختەکردو بێبەهایکردو دەغەڵیی له کەلوپەلەکەدا کردو شکاندی.

(اَلفَسْـل (ج) أَفْسُل وفُسُـول و فِسال وفَسْل وفُسُولة وفُسَـلاء وأَفْسـال): هەموو شتێکی خەوشدارو بێکەڵك/ بێبایەخ/ ساختەتیاکراو.

(دَرهَمُ فَسْلٌ ودَراهِمَ وفُسُول): پارەی قەڵب/ بێنـرخ/ ساختە.

(اَلمَفْسُـول): ١-قەڵبکراو ٢-ڕسواو سووککراو/ ساختەتیاکراو.

فسو: (فَسا. فَسْواً وفُساءً): تسی/ تسیکەند.

(تَفاسى): خەریکی تسینبوو.

(اَلفُساء) (مص): تس.

(اَلفَسْوَة (ج) فَسَوات): تسێك/ تسینێك.

(فَسَواتُ الضَباع) (ن): جۆره دومەڵانێکه.

(الفاسِيَةُ والفاسِياء (ج) فَواس) (ح): قالۆنچه (لەبەر بۆگەنەکەی وایپێدەڵێن).

(اَلفَسُوّ والفَسّاء): تسکەن.

(أَلمَفْسَى): شوێنی تس/ کۆم/ قنگ.

فســی: (أَلفیســیولوجیا أو الفیزیولوجیا): زانستی کاری ئەندامەکانی لەش.

فــشَ: (فَــشَّ. فَشّــاً): ١-قرقێنەیدایــەوە ٢-فوویەکی سووکیکرد.

(-الوَطْبَ): مەشــکەکە ١-هەرچــی (بایەکی/ فوویەکــی) تێدابــوو کــە خــۆی تێیکردبوو دەریکرد بەوەی دەمەبەســتراوەکەی کردەوە ٢-هەرچــی کەرەیەکــی تێدابــوو دەریکــردە دەرەوە.

(-الناقَةَ): مێحوشترەکەی خێرا دۆشی.

(-بَین القَوم): دووزمانیی لە نێوانیاندا کرد.

(-خُلقَهُ في فلان) (عامیة): داخی دڵی خۆی بەو ڕشت کە داخی خەڵکیتر بوو.

(-قَلْبَــهُ) (عامیة): ڕقو سەرزەنشــتی دڵی بەرامبەر دەربڕی.

(فُشَّ- السَــقاءُ): دەمی جەوەندەکە کرایەوە فشبووەوە/ باکەی لێدەرچوو.

(إِنْفَشَّ- اللَّبَنُ): شیرەکە ڕژا.

(-تِ الریحُ): کە دەســت لە مووشەدەمەکەو شتی وا درا باکەی لێدەرچوو.

(أَلفَشُوش): ئەو مەشکەیەی کە دەیدەڵێنێت.

(فشــیش الأفعــی): خشــەی مــار (دەنگــی پێستەکەی کە بەسەر وشکانیدا بڕوات).

٢-(فَشَ- البابَ): دەرگاکەی بە فیڵو بێکلیل کردەوە.

٣-(فَشَّ- الوَرَمُ. فَشّاً) (عامیة): ئاوساوییەکە (نیشتەوە/ فشبووەوە).

(إِنْفَــشَ- الجــرحُ): ئاوســاویی برینەکــە ڕەوییەوەو نیشتەوە.

(-الرَجُــلُ عَــنِ الأَمرِ): پیاوەکــە لە کارەکە ساردبووەوەو تابوشتی نەما.

(-ت عِلَّةُ فلان): گرفتەکەی چارەســەر بوو/ دەردەکەی لەسەر لاچوو.

(أَلفَشّ (مص) والفَشُوش): گەوجی ڕاپووچ/ ڕا لاواز.

(أَلفاشُوش): ڕاپووچو هیچ لەباردا نەبوو.

٤-(أَلفَش والفَشُوش):١-فشەکەرو خۆهەڵکێش ٢-(بەرگی/ پۆشاکی) ئەستوور.

٣-(ن) (الخَــرُوب): ســەرپنج/ حەچەچمە. درختێکــی هەمیشــە ســەوزە نزیکــەی ١٧ مەتر بەرز دەبێتەوە بەرەکەی لە فاســۆلیای ســەوز دەچێــت درێــژو شــیرینە دۆشــاوی لێدروســتدەکرێتو بەرەکــەی بــۆ ئالیــك بەکاردێت ٤-زەلکاو.

(أَلفَشّاش): زۆر فشەکەر.

(رَجُلٌ مُنْفَشُ المِنْخَرَین): پیاوێکە کوڵەکەی لووتی کورتەو کونەلووتەکانی فشن.

٥-(فَشْــفَش):١-ڕا پووچەڵە بوو ٢-فشەکەرەو شتی خەڵکی دەکات بە هی خۆی.

(فَشفاش): فشەکەر/ خۆهەڵترێن/ ڕاپووچەڵ.

(فَشْفَش ببَولِهِ): میزەکەی هەڵدا.

(ألفَشْــفاش- مِنَ النوق): مێحوشــترێك كه شیرەكەی له دۆشیندا خوشەبیێت.

(ألفَشفاشة): نەرمەلیقه.

(تخرَّج الزُبْدَةُ فَشفاشَة): كەرەكە بە نەرمەو شلی هاتەدەرێ.

فشج: (فَشَجَ وفَشَّجَ وتَفَشَّجَ وانْفَشَجَ- الرجُلُ أو البَعــيرُ): پیاوەكــە یان حوشــترەكە گەڵی بلاوكردەوە میزبكات.

فشــخ: (فَشَــخَ-هُ. فَشْخاً): ١-ســتەمی لێكرد ٢-بەڕوومەتیدا كێشا/ زللەیەكی لێدا.

(-فِي اللّعِب): گزیكــردو درۆی لە یارییەكەدا كرد.

(«فَشَــخَ علیه») (عامیــة): نایەڕێر خۆیو زۆرداریی بەرامبەر كرد.

(فَشَخ) (سریانیة): هەنگاوێكی گەورەینا.

(فَشَّــخَ- الرَجُــلُ): پیاوەكــە جومگەكانــی خاوبوونەوە.

فشــط: (إنْفَشَطَ- العُودُ): چیلكەكە بە تەڕی شكا.

(ألتَفشــیط) (عنــد العامــة): لــە هیچــە شانازیكردنو خۆهەڵكێشان/ خۆفشكردنەوە.

(«فَشَّــطَ فلانٌ») (ســریانیة): شــانازی بە شتێكەوە كرد كە نەیبوو.

فشع: (فَشَــعَ-تِ الذُرَّة. فَشْــعاً): ئەملاولای گەنمەشامییەكە وشكبوو.

(الفُشــاع والفَشّــاع (ن): جۆرە ڕووەكێكە لە كۆمەڵەی زەمەق بە شێوەی دەومنە هەندێك جۆری لە ولاتانی لێواری دەریای ناوەڕاســتدا هەیەو هەندێكیشــی لە ئەمەریكادا هەیە لە ڕەگەكەی هەندێك دەرمان دەگیرێت.

فشــغ: ١-(فَشَــغَ-هُ. فَشْــغاً): ســەریكەوتو دایپۆشی.

(-الشيءُ): شتەكە فراوانو بلاوبووەوە.

(-هُ بالسَّــوط): قامچــی لــێ بەرزكــردەوەو پیایداكێشا.

(فاشِغ (م) فاشِغَة): قامچیوەشێن.

(فَشَّغَ= فَشَغ): سەریكەوتو دایپۆشی.

(-هُ النَومُ): خەو (بردیەوە/ دایبەزەویدا).

(أفشَغَ-هُ بالسَوطِ): دایە بەر قامچی.

(تَفَشَّغَ-هُ): بەسەریدا زاڵبوو و سواریبوو.

(-البُیوتَ): خۆی بە نــاو خانووەكاندا كردو خۆی ونكرد.

(-الرَجُلُ): ١-تەمەڵییكرد ٢-زبرترین بەرگی خۆی لەبەركرد.

(-تِ الغُرَّةُ): پەڵە سپیەكەی سەروچاویگرتو بلاوبووەو تا چاویشی گرتەوە.

(-الشَیبُ فیه وتَفَشَّغَهُ): سپێتی قژیو پیریی دەركەوتو بلاوبووەوەو زۆر بوو.

(إنْفَشَغَ): زۆر بوو و دەركەوت.

(-الشيءُ): فراوانبوو.

(ألفَشغَةُ): ١-جارێك بلاوبوونەوەو دەركەوتن ٢-كورۆكــی قامیش كــە وەكو لۆكــە وایە ٣-

پوختەو کورۆکی هەموو شتێك.
(ناصِيَةٌ فاشِـغَة وفَشْـغاء): پەڵەی سـپی کە بــە کەللەدا بڵاوبێتەوەو تــا لای چاویش بگرێتەوە.
(اَلأَفْشَــغ (م) فَشْغاء (ج) فُشْغ): بەرانێك کە (شاخەکانی/ قۆچەکانی) هەرمیکە بەلایەکدا رۆشتبێت.
(رجلٌ أَفْشَــغُ الأَسنان): پیاوێکی (دان خوارو خێچ/ دان بڵاو/ دان شاش).
(اَلفشاغ): تەمەڵیی/ تەوەزەلیی.
(اَلفُشــاغ والفُشَّاغ) (ن): رووەکێکی بێگەلایە لە درەختەوە دەئاڵێــتو پیایدا هەڵدەزنێتو درەختەکە دەخنکێنێتو تێکیدەدات.
٢-(اَلمِفْشَــغ): کەسـێکە کە خراپە دەربارەی دۆستەکەی بکات.
(اَلمِفشغ): منەتکارێکی کەمفەڕ/ کەمخێر.
فشــق: (فَشَــقَ- الشــيءَ. فَشْــقاً): شتەکەی شکاند.
(فَشِقَ. فَشَقاً): زۆر بەرچاوتەنگ/ چاوبرسی بوو ئەمەی هەڵدەگرتو ئــەوەی دادەنایەوە. رارابوو لەوانە بوو کە هیچی بۆ نەبێت.
(-الظَبيُ): ئاسکەکە دوو شاخەکەی بڵاوبوو.
(أَفْشَق (م) فَشقاء): ئاسکی شاخ بڵاو.
(فَشَقَ وفاشَقَ-هُ): ناکاوگیریکرد.
(تَفَشَّــقَ- بِثَــوبٍ): بەرگەکــەی خســتە بنباڵێکیەوەو لاکەیتری بە شانەکەیتریدادا.

(اَلفَشَــق) (مــص): ١-راکــردنو هەڵاتــن ٢-چالاکیی.
فشــك: (اَلفِشــك الواحِدَةُ فِشــكَة): تەرسی ولاخ/ ئەسپ.
فِشکە: تەرسێك (عامیە).
(اَلفَشَك): فیشەك.
(اَلفَشكَة): فیشەکێك (ترکیە).
فشل: ١-(فَشَلَ- لِحْيَتَهُ فَشْلاً): بەدەست ریشی خۆی شانە کردو بڵاوکردەوە/ بژکردەوە.
٢-(فَشِــلَ. فَشَــلاً): لە جەنگدا یــان لە کاتی تەنگانــەدا زیرەکیردو ســستبوو بێتواناییو بێورەیی نواند.
(فَشْــلٌ وفَشِل وفَشيلٌ (ج) فُشْــل وأَفْشال): زیرەکــردوو بێــورەو بێتوانــاو پەککەوتــە تازەگەرییــەکان دەڵێــن: (فَشِــلَ في عَمَلِهِ): ســەرنەکەوت/ شکســتیهێنا/ تێشــکا/ لــە کارەکەیدا/ تێینەهێنا.
(اِنْفَشَلَ): لە شتێکی ناکاو تۆقی.
(-عَلَيهِ): زۆر لێیترساو لێی تۆقی.
(اَلفَشْلَة): لێترسانو لێتۆقین (عامیە).
٣-(فَشَّلَ وتَفَشَّــلَ وافْتَشَلَ-تِ المَرأَةُ): ژنەکە راخەرێکــی وەك فــەرش لەژێــر خۆیداو لە کەژاوەکەدا راخست.
(اَلفِشل (ج) فُشــول والمِفْشَل (ج) مَفاشِل): پــەردەی کەژاوە یان رایەخێــك کە ژن لەژێر خۆیداو لە کەژاوەدا رایدەخات.

٤-(تَفَشَّلَ- الرَجُلُ مِنهُم إمْرَأةً): پیاوەکە ژنێکی لێمارەکردن و لێهێنان.
(ألمِفْشَل): کەسێکە ژنێك بهێنێت کە بێگانە بێت و خزم نەبێت.
٥-(تَفَشَّلَ- الماءُ): ئاوەکە لەبەری ڕۆیشت/ کشا.
(ألتَّفشیل (ج) تَفاشیل): ئەو شیرەی لە گواندا دەمێنێتەوە.
ألمُلْحَق):
(فشل: ألفَشَل) ئائومێدبوون و (سەرنەکەوتن/ تێشکان/ شکستهێنان).
(«فَشَلُ مُحاولَة»): لە کۆششێکدا شکستهێنان/ تێشکان/ سەرنەکەوتن.
(«مُنيَ بالفَشَل»): سەرنەکەوت/ تووشی تێکشانبوو/ نائومێد بوو.
فشن: (ألأفشين (ج) أفاشين) يونانية): لای ڕۆمەکان بەشێکی تایبەتیی نوێژە.
فشو: ١-(فَشا- خَبرُهُ أو فَضلُهُ أو سِرُّهُ. فَشواً وفُشُوّاً وفُشِيّاً): هەواڵی یان چاکەو پیاوەتیی یان نهێنییەکەی بڵاوبووەوە/ جاردرا.
(-تِ الماشيَةُ): ئاژەڵەکە بەرەڵای لەوەڕ بوو.
(-ت أمُورُهم): کاروباریان لە یەك جیابووەوە.
(«فَشَت عليه ضِيْعَتَهُ»): ڕەتی بڵاوبوو/ کاری زۆر بوو نەیدەزانی بە کامیان دەستپێبکات.
(أفْشى- الشيءَ إفْشاءً): شتەکەی جارداو بڵاوکردەوە.
(-سِرَّهُ لِفُلان): نهێنییەکەی خۆی لای فیسار درکاند.
(-الرَجُلُ): ئاژەڵی ناو لەوەڕگای زۆر بوو.
(تَفَشّى- المَرَضُ القَومَ وبِهِم. تَفَشّياً): نەخۆشیی لەناو خوێشگەلدا بڵاوبووەوە.
(-تِ القُرحَةُ): برینەکە تەشەنەیکرد.
(ألفاشي (م) فاشِيَة (ج) فَواشٍ) (فا): ١-بڵاوبوو/ تەشەنەکردو ٢- (الفَواشي) ئاژەڵی بڵاوبوووی ناو لەوەڕگا.
(ألفَشاء): زاوزێکردنی ئاژەڵ و زۆربوونیان.
(ألفَشْيان): بوورانەوە.
٢-(ألفَشوَة) سەبەتولکەیەکە بۆنەکانی ژنی تێدایە.
(ألتَفَشّي عِنْدَ أهلِ العَرَبيَة): قەڵەوکردنی دەنگی پیت لەلای عەرەب لە کاتی دەربریندا.
فصّ: (فَصَّ وافْتَصَّ- كذا مِن كذا. فَصّاً): ئەوەی لەویتر پچڕی و لێیجیاکردەوە.
(أفَصَّ- إليهِ شَيْئاً مِن حَقِّهِ): شتێکی لە (هەقەکەی مافەکەی) خۆی دایەوەو بۆ گێڕایەوە.
(إنْفَصَّ- مِنهُ): لێیجیابووەوە.
(إسْتَفَصَّ- مِنهُ شَيئاً): شتێکی لێ دەرهێنا.
(ألفَصُّ والفِصُّ والفُصُّ (ج) فُصُوص وفِصاص و أفُصّ): ١-کووزەسێرێك ٢-بنچینەی کارو ڕاستیەکەی ٣-جەمسەری بەیەکگەیشتنی هەموو دوو ئێسقانێك ٤ -(عند العامة) جرت.

٢-(فَـصَّ- الجرحُ. فَصيصـاً): ئەو زرچكاوو كێـمو زووخەی لە برینەكـەدا بوو لە بەری ڕۆیشت.

(-العَرَقُ): (ئەرەقەكە/ خوەكە) دەرچوو.

(-فَـصُّ وفِـصُّ وفُـصُّ المـاءِ (ج) فُصُوص وفِصاص وأَفُصّ): بلْقی سەر ئاو.

٣-(فَصَّ الجُندُبُ فَصيصاً): كولله بچووكەكە سركاندی.

(-الوَلَدُ): منداڵەكە نوزاندی/ سووك گریا.

٤-(فَصَّـصَ- الخاتِمَ): بەردێكـی گرانبەهای كرد بە ئەموستیلەكەوە.

(-بعَينِهِ): چاوی بڕییە شتو سەرنجیدا.

(أَلفَـصّ والفِـصّ والفُـصّ (ج) فُصُـوص وفِصاص وأَفُصّ): ئەو بەردە گرانبەهایەی كە دەخرێتە سەر ئەموستیله (ئەمڕۆ پێیدەڵێن)

(قَلْبُ الخاتِم): دڵی ئەموسیتلە.

(أَلفَصّ): ڕەشێنەی چاو یان شینێنەی چاو.

(أَلفَصـاص): ئـەوەی بـەردە گرانبەهـاكان دەخاتە ئەموستیلەوە.

(أَلفَصيص): ناوكە خورمای پاكو لووس وەك چەوركرابێت.

٥-(فَصْفَـصَ- الكَلامَ فَصْفَصَـةً): پەلەی لە قسەكردنەكەدا كردو بەیەكیدا دا.

(-الدابَّةَ): سێپەرەی بە ولاخەكەدا.

(تَفصْفَصَ – القَومُ عَن فُلان): خوێشگەل لە فیسار دووركەوتنەوەو جیابوونەوە/ بڵاوەیان لێكرد.

(أَلفِصفِصَـةُ (ج) فَصافِص) (ن): سـێپەرە گیایەكـە كـە نـاژەڵو وڵاخ باشـیدەخوات، بـە تەڕیـی وایپێدەڵێن خەڵكە ڕەشـۆكەكە پێیدەڵێن(فِصَّة).

(أَلفُصافِص): پیاوی جەربەزەو سوورخواست.

فصـــح: ١-(فَصَـــحَ الصُبـــحُ فُلانـــاً فَصْحاً): بەیانیی لێهەڵاتو ڕووناكییەكەی دایگرت.

(فَصُحَ. فَصاحَةً): زمانپاراوو ڕەوانگۆ بوو.

(فَصيح): زمانڕەوانو زمانزان/ زمانپاراو.

(-الأَعْجَميُ): ناعەرەبێك عەرەبییەكەی ڕەوانو لەدوانەكەیشی/ قسەكەیشی دەگەیشتن.

(أَفْصَـــحَ): ١-بەزمانێكـی ڕەوانو بێگرێ دوا ٢-ڕەوانگۆ بوو ٣-نیازەكەی بە ڕوونیی دەربڕی.

(-الصُبحُ): گزنگیدا.

(-الأَمرُ): كارەكە ڕوونو ئاشكرابوو.

(-عَن كَذا): كورتەو كوڕۆكی ئەوەی دەرخست.

(-عَنِ الشـيءِ): شــتەكەی (ڕوونكــردەوە/ دەرخست).

(-الفرسُ): چارەوێكە جوانو ساف حیلاندی.

(-البَولُ): میزەكە ڕەنگی سافو ڕوونبوو.

(تَفَصَّحَ): زۆر زمانڕەوانو ڕوونبێژ بوو.

(تَفَصَّـحَ وتَفاصَحَ): خۆی بــە زمانڕەوانو زامانپاراو نیشاندا.

(يَومٌ فِصْحٌ): ڕۆژێكی (سایەقە/ ساماڵ).

(أَلفَصاحَة) (مص): زمانپاراویی/ ڕوونبێژیی/ زمانڕەوانییو بێگرێگۆیی.

(«رَجُـلٌ فَصيـــح» (وكِلمَـــةٌ فَصيحَة وكَلامٌ فَصيح»): پیاوێکی زمانرەوانو زمانپاراو.
(كلمةٌ فَصيحَة): وشەیەکی ڕەوانی دیار.
(كلامٌ فَصيح): ئاخاوتنێکی ڕەوانی بێگرێی.
(ألفَصيح (ج) فُصُــح وفُصَحاء وفِصاح (م) فَصيحَة (ج) فِصــاح وفَصائِح وفَصيحات): زمانپاراوو ڕەوانبێژ.
(أَلْمُفصِح): ئاشکراو دیار/ ڕوون.
(يَــومٌ مُفصِح): ڕۆژێکی ڕوونـــاكو بێهەور/ سایەقە/ سامال.
٢-(فَصُحَ- اللبَنُ. فَصاحَةً): شیرەکە سافبوو/ کەفەکەی گیرا.
(لَبَنٌ فَصْحٌ وفَصيحٌ): شیرێکی ساف.
(فَصَّحَ- اللبَنُ): شـــیرەکە ســـافبوو کەفەکەی لەسەر نەما.
(-افْصَـــحَ- اللَبَـــنُ): شـــیرەکە ســـافبوو/ بێکەفبوو.
(-مِن كذا): لەوە ڕزگاربوو لێدەرچوو.
(-النَصـــارى أو اليَهـــودُ): دیانـــەکان یـــان جوولەکـــەکان کەوتنە جەژنی گـــەورەوە یان جەژنی گەورەیانکرد.
(ألفِصْح): لای دیانەکان جەژنی هەستانەوەی حەزرەتی عیسایەو ئەمە جەژنی گەورەیانە.
(فِصـــحُ اليَهودُ): جەژنی یـــادی دەرچوونیان لە میســـر. وشەکە لە (فِســـح)ی عیبرانییەوە وەرگیراوە واتـــا پەڕینـــەوەو دەربازبوون یان ڕزگاربوون.
فصخ: (فَصَخَ- عَنِ الأمرِ. فَصْخاً): خۆی لێ بێئاگاکردو دەیشیزانی.
(-العُـــودَ أو المِفْصَلَ): چلەکـــەی ترازاند یان جومگەکەی لە جێبرد.
(-فُصِـــخَ- فُلانٌ): لە کڕینو فرۆشـــتنەکەدا گزییان لێکردو فێڵیان لێکرد.
(الفَصيخ والفَصيخَةُ والفاصِخَةُ): ڕانادروست/ ڕاچەوتو چەوێڵ ((ة) کە بۆ زیادەڕەوییە).
فصـــد: ١-(فَصَدَ- المَريضَ فَصْـــداً وفِصاداً): دەماری نەخۆشەکەی هەڵدڕی.
(-لَهُ عَطاءً): بەخششێکی بۆ بڕییەوە.
(فَصَدَ وافْتَصَدَ- العِرقَ): دەمارەکەی هەڵدڕی.
(أفْصَـــدَ-تِ الشَـــجَرَة): گـــەڵای درەختەکـــە تەڕەکیو کرایەوەو پەلەکانی قنج بوونەوە.
(تَفَصَّـــدَ- الدَّمُ): خوێنەکـــە بەربوو لەبەری ڕۆیشت.
(«جـــاءَ يَتَفَصَّـــدُ عَرَقـــاً»): هـــات عەرەقی (لێدەچۆڕایەوە/ دەرشت).
(إنْفَصَـــدَ-تِ الشَـــجَرَةُ): گـــەڵای درەختەکە کرایەوە.
(-الدمُ): خوێنەکە لەبەری ڕۆیشت.
(الفَصيـــد= المَفصُـــود): (ڕەگـــی/ دەمـــاری) هەڵدراو.
(أَلْمَفْصَد): نەشتەری دەمارهەڵدڕین.
(ألرِّيشَة) (عامية): نەشتەی دەمارهەڵدڕین.

٢-(فَصَّدَ-الشــيءَ): به ئاوێكی كەم شتەكەی تەركرد.

(الفُصْدَة والفَصيدَة): خورمایەكە بشێلرێتو به خوێن تێكەڵ بكرێت.

(الفصيد) (ط): خوێــن بكرێتە ڕیخۆڵەوەو ببرژێنرێت.

فصــع: ١-(فَصَــعَ- الثَّمْرَةَ. فَصْعــاً): دەنكە خورماكەی بە پەنجە گوشــی تــا توێكڵەكەی لێبێتەوە.

(-الشيءَ): شــتەكەی بە پەنجە هەڵگڵۆفت تا نەرمبێتو دەمبكاتــەوەو ئەوەی كە تیایدایە دەرپەڕێتە دەرەوە.

(-عَمامَتَهُ عَن رأسِــهِ): مێزەرەكەی لەســەر داكەندو سەری ڕووتكرد.

(فَصَّــعَ- الرُطبَةَ): فەریكــە خورماكەی بە پەنجە گوشی تا توێكڵەكەی لێبێتەوە.

(-الشَيءَ مِن كذا): شتەكەی لەوە دەرهێنا.

(إنْفَصَعَ- الشيءُ عَن كذا): شتەكە لەوە هاتە دەرێ.

(إفْتَصَعَ- حَقَّهُ مِنهُ): بەزۆر مافەكەی خۆی (لێسەندەوە/ لەژێر چنگ دەرهێنا).

(الَفصْعان): هەمیشە سەر ڕووت.

(فَصَعَ وفَصَّــعَ- لَهُ بِكَذا فَصْعــاً): بەوەندە دایە.

٢-)(الفَصْعاء) (ح): مشك.

فصــف: (الفُصْفور) (ك): تەنێكی ســادەیە، هەیەتــی ســپییە كــە زۆر ژەهــردارەو زوو گردەگرێتو دەســووتێت هەیشــیەتی سوورە كــە بە پێچەوانــەی ئەویترەومیە. فۆســفۆر بۆ ژیان زۆر پێویســتە دەچێتە دروستبوونی ئێســقانەوەو بە شــێوەی ئاوێتەیە هەندێكی وەك پەین بەكاردەهێنرێت.

فصل: ١-(فَصَلَ- الشــيءَ فَصْلاً): ١-شتەكەی لەتكردو جیایكردەوە ٢-پارچەپارچەیكردو لە یەكی جیاكردنەوە.

(«فَصل الخُصومات»): (ناكۆكیی/ ناحەزیو دوژمنایەتــی) نەهێڵان/ بڕیــاری كۆتایی بە ناكۆكیو دوژمنایەتیهێنان.

(فَصَلَ- بَينَهُما): لە یەكی جیاكردنەوە.

(-الوَلَــدَ عِــنَ الرضاع): منداڵەكەی لەشــیر بڕییەوە.

(-الرَجُلُ عَــن البَلَدِ. فُصُــولاً): پیاوەكە لە شارەكە، لە وڵاتەكە دەرچوو.

(-الكَرْمُ): مێوەكە دەنكە دەنكە بەرسـیلەی وردیگرت.

(فَصَّلَ- الكَلامَ): ئاخاوتنەكەی (دەرخســت/ ڕوونكردەوە) ئاخاوتنەكەی یەكالاكردەوە.

(-الشــيءَ): شــتەكەی بەشبەشــكرد یــان پارچەپارچە كردو جیایكردنەوە.

(-الثَــوبَ): جلەكەی بــە بەژنی خاوەنەكەی بڕیو بۆ دروون بڕیو پارچە پارچەیكرد.

(-القَصّــابُ الشــاةَ): قەســابەكە مــەڕە

سەربڕاوەکەی کوتەکوتە کرد.
(-العِقـدَ): ملوانکەکـەی هۆنییـەوەو نێوان دوو مـووروو مووروویەکی لـە ڕەنگێکی تری خستە نێوانیانەوە یان بەردێکی/ گەوهەرێکی بەنرخی خستە نێوانەوە.
(فاصَلَ- شَـريكَهُ): خۆی لە هاوبەشـەکەی جیاکردەوە.
(«فاصَلَـهُ في السـعر») (عاميـة): لەسـەر نرخەکە سەودایکرد.
(المُفاصَلَة): سەوداکردنی شت.
(أَفْصَلَ- المولـودُ): کاتی لە شـیر بڕینەوەی هات.
(-المَريضُ) (عامية): نەخۆشەکە مرد.
(تَفَصَّـلَ): بەندبەنـد بوو/ بەشبەشـبوو/ پارچەپارچە بوو.
(تَفاصَل-تِ الأَشياءُ): شتەکان لە یەك ترازان و جیابوونەوە.
(اِنْفَصَـلَ-تِ النَخْلَـةُ عَـن مَوضِعِهـا): دارخورماکەی لە شوێنەکەی خۆی گوێزایەوە.
(-الوَلَـدُ عَنِ الرضـاعِ): منداڵەکە لە شـیر بڕرایەوە.
(اِنْفَصَل): جیابووەوە/ ترازا/ دابڕا.
(-عَنهُ): لێیجیابووەوە/ لێیدابڕا.
(اِسْتَفصَلَ): داوایکرد بە درێژیی باسبکرێت/ دەربخرێت.
(الفَصْل) (مـص): ١-دادوەرییکردن لە نێوان ڕاستیو ناڕاسـتی/ هەقو ناهەقدا کە لەیەك جیابکرێنەوە.
(اَلفَصْـل (ج) فُصُول): جیاکـەرەوەی نێوان دوو شـت/ تیغە/ تەیمان ٣-بەستی نێوان دوو زەویی/ سـنووری نێوانیان ٤-(بـەرە/ لك)ی ڕەچەڵـەك ٥-پێچەوانـەی ڕەچەڵـەك/ بێخ.
(«للنسـب أُصُولٌ وفروع»): بـۆ ڕەچەڵەك دەڵێـن لەو بەرەیەیـە. ڕەچەڵەك بەرەو لکی هەیە ٥-کەشـی سـاڵ کە چوار کەشە بەهارو هاوینو پایزو زستان.
(مِنَ الجَسَد): جومگەی لەش، شوێنی جومگە.
(-مِنَ الكتـاب): بەشـێکی/ کەرتێکی جیای کتێبەکە.
(قَولٌ فَصلٌ): ڕاستییە/ هەقە نەك ناڕاستی.
(يَومُ الفَصل. يَومُ الدين): ڕۆژی لێپرسینەوە/ ڕۆژی حەشر.
(فَصلُ الخِطاب): کۆتایی قسەو بڕیاری دوایی نێوان ڕاستیو ناڕاستی.
٢-(قولُ الخَطيب) (أَما بَعدُ): وتەی وتاربێژ کە دەڵێت: (أما بعد) دوای ئەوە.
(أَلفَصْلَـةُ): جارێك جیاکردنـەوە/ دابڕان ٢- دارخورمای گوێزراوە.
(الفَصْلَة أَو الكأس) (ز): کاسـەگەڵا بەشێکی گوڵە جاری وا هەیە جیایەو دەرکەوتووە وەك هی گوڵەباخ جاری وایش هەیە پێوەنووسـاوە وەك هی مێخەك.

(ألفِصال): له شیر برینەوەی منداڵ.

(ألفَصَّال): کەسێکە کە بۆ پارەو پاداشت بەخەڵکدا هەڵدەدات.

(سَیفٌ فَصَّال): شمشێری برەر/ تیژ.

(ألفاصِل) (فا): بڕیاری کۆتایی پێهێن.

ألفاصِلَة: ١-مێی وشەی (الفاصِل) ٢-جیاکەرەوە/ مووروویەك لە ملوانکەدا کە بکەوێتە نێوان دوو موورووی‌تەرەوە ٣-وێرگول، فاریزە.

(الفاصِلَة الصُغرى في علم العَروض): جیاکەرەوە لە زانستیی کێشی شیعردا، سێ پیتی بزوێندارەو زەنەدارێك بەدوادا دێت وەکو: (ضَرَبَتْ).

(الفاصِلة الكُبرى): جیاکەرەوەی گەورە/ چوار پیتی بزوێنداره زەنەدارێك بە دوایاندا دێت وەك: (ضَرَبَكُم).

(من السجع): لە پەخشاندا لە جێی سەروای شیعرە.

(الفَصیل (ج) فِصال وفُصْلان وفِصْلان): ١-دیوارێکی نزمی بەردەمی شووورای شار ٢-بەچکە حوشتر یان گوێرەکە کە لە شیر برابنەوەو لەدایکیان جیاکرابنەوە.

(الفَصیلَة (ج) فَصائِل): ١-مێی وشەی (الفَصیل) ٢-گوڵمەگۆشتێکی ران یا هی ئەندامی لەش ٣-خێڵ‌و فامیلیای نزیکی پیاوەکە/ کەسی نزیکی.

(«جاؤوا بفَصیلَتِهم»): خێڵکەیان بە گەورەو بچووکیانەوە هاتن.

(الفَصیل (ج) فیاصِل): ١-دادوەر/ قازی ٢-دادوەریی نێوان هەق‌و ناهەق/ ماف‌و ناماف/ ڕاستی‌و ناڕاستیی ٣-ئەوەی شتەکان‌و کارەکان لە یەك جیادەکاتەوە ٤-شمشێری تیژی برەر.

(حُکمٌ فَیصَلٌ): بڕیارێکی کۆتاو پیادەکراو.

(حکومة فیصل): بڕیارێکی کوتاو پیادەکراو.

ضَربَةٌ فَیصَل: لێدانێکە کە دوو هاوتاکە لەیەك بکاتەوە.

(الفَیصَلي): دەمراست/ دادوەر/ قازی.

(المَفْصِل (ج) مَفاصِل): ١-جومگە/ شوێن بەیەکگەیشتنی دوو ئێسقان.

(ألمَفاصِل): ١-بەردی ڕێزکراو/ بەردڕێژکراو ٢-لەو بەردی چین بە چینی نێوان دوو (کێو/ شاخ) کە کانیاوی لێدەردەچێت ئاوەکەی ڕوون‌و ساف دەبێت.

(داءُ المَفاصِل) (طب): دەردە جومگە/ ئازاری جومگە.

(ألمِفْصَل): زمان.

(ألمِفصال): کەسێکە کە نەریتی جیاکردنەوە بێت.

(ألمُفَصَّلَة في اصطلاح النجارین): ئینجامە.

(ألإنفِصالِيّ): ١-کەسێکە کە جیاوازیی لە ئاین یان دەوڵەتەکەی خۆی بوێت‌و

جیابێتەوە/ سەربەخۆیی خواز/ جیاییخواز ٢-کەسێکە کە جیاخوازی تاقمەکەی بێت و بیەوێت وازیان لێبهێنێت. (سیباراتیست)

(الإنفصالیَّة): ڕەوشی جیاخوازیی ٢-حەز لە جیابوونەوەکردن. (سێباراتیسم): داوای سەربەخۆییکردن.

٢-(الفاصولیَة والفَصُولیا أَو اللوبیا) (ن): فاسۆلیا لەئەمەریکاوە لە سەدەی شازدەهەمدا هێنراوەتە جیهانی کۆنەوە.

الملحق:

فصل: (ألَمفصَلیّات): لقێکە لە زیندەوەرە بێبڕبڕاگەکان کە قاچیان جومگەدارە، وەك تویکلّدارەکان و جاڵجاڵۆکەکان.

فصم: ١-(فَصَمَ. الدمْلَج ونَحْوَهُ. فَصْماً): بازنەکەی شکاند بێئەوەی پارچەپارچە بێت و لێکبترازێت.

(تَفَصَّمَ وانْفَصَمَ): ١-شکا بێئەوەی لە یەك بترازێت ٢-درزیدا.

(ألفَصیم والأَفْصَم): لێکترازاو/ پچڕاو.

٢-(فَصَمَ- الشيءَ فَصْماً): شتەکەی (بڕی/ پچڕاند).

(فَصِمَ- البَیتُ): خانووەکە ڕووخا/ تەپی/ ڕما.

(أَفْصَمَ- عَنهُ المَطَرُ أَو الحُمَی): بارانەکەی لێبڕا یان تاکەی وەستاو نەما.

(تَفَصَّمَ وانْفَصَمَ): بڕا/ نەما.

(الفَصیم والأَفْصَم): لێبڕاو/ وەستاو/ پچڕاو.

فصی: ١-(فَصی- الشيءَ مِنَ الشيءِ وعَنهُ): شتەکەی لە شتەکەیتر کردەوەو لێیجیاکردەوە.

(فَصَّی- اللَّحْمَ مِن أَوعَن العَظم تَفصیةً): گۆشتەکەی لە ئێسقانەکە کردەوەو دایماڵی.

(فاصی-هُ مُفاصاةً): بەجێیهێشت/ جیابووەوە/ لێجیابووەوە.

(أَفْصی. إِفصاءً): لە چاکەو بێر یان لە خراپە ڕزگاریبوو.

(-عَنَّا المَطَرُ): بارانمان لێبڕا.

(-الصائِدُ): تۆڕی ڕاوچییەکە هیچی (نەگرت/ پێوە نەبوو).

(تَفَصَّی وانفَصَی- الرجُلُ مِنَ الرَجُلِ وعَنهُ. إنْفِصاءً): پیاوەکە لەویتر دوورکەوتەوە/ لەویتر جیابووەوە.

(-مِن أَوعَن الشِدَّة أَو غیرها): لە تەنگانەو تووشییو شتیتر ڕزگاریبوو.

(«تَفَصَّی مِن الدیون»): لە (وام دارِیی/ قەرزدارِیی) ڕزگاریبوو/ وامی لەکۆڵکەوت.

(أَلفَصِیَّة): لە چاکە یان لە خراپە ڕزگاربوون/ فوتاربوون.

(-مابینَ الحَرِّ والبَرد): فێنکی/ نە ساردو نە گەرم.

(«یَومٌ فَصِیَّة»): ڕۆژێکی خۆشی فێنك.

(فُصِیَّة): فێنك.

ويَـوم مُفص وليلَــةٍ فَصيَّة وفُصيَّــة وليلَةُ فُصْيَة): شــەوێکی فێنكو خۆش. نە سارد نە گەرم.

(الفَصِيَّة (ج) فَصايا): لە چاكە يان لە خراپە رزگاربوون.

٢-(تَفَصَّى- الشــيءَ. تَفَصِّيــاً): زۆر بە دوای شتەکەدا گەڕا.

٣-(الفَصى الواحِدَةُ فَصاة): دەنكى مێوژ.

فَصاة: دەنكە مێوژێك.

فضّ: (فَضَّ- الشيءَ. فَضّاً): شتەکەی شکاندو پارچەکانی پەرشو بلاوبوونەوە.

(-القَومَ): خوێشگەلی پەرشوبلاو کردەوە.

(«فَضــىَّ اللهُ جَمْعَهُــم وفَضْفَضَــتُ حَلَقَــةَ القَــوم»): خــودا کۆمەڵەکەیانــی پــەرشو بلاوکــردەوە منیش زنجــیرەی یەکگرتنیانم پچڕی.

(-خَتْــمَ البابِ والخَتْمَ عَــنِ الكتابِ): مۆری دەرگاکەی شکاندو مۆری نوسراوەکەی شکاندو لێکردەوەو کردیەوەو هەڵیپچڕی.

(-الشيءَ على القَوم): شتەکەی جیاکردەوەو بەسەر خوێشگەلدا دابەشیکرد.

(-مابَينَهُما): لە یەکی پچڕاندنو جیایکردنەوە.

(-اللُؤلُؤَ): مرواریەکەی کونکرد.

(-الدموعَ): فرمێسکیرشت.

(-اللهُ فاهُ): خودا دەمــی جۆڵکردو دانەکانی هەڵوەراند/ خست.

(«لافُضَ فوك»): نزایە بۆ یەکێکە کە قسەی باش بکات: دەمت خۆشبێت/ دەمخۆش.

(فَضَّضَ-الشــيءَ): زیوی گرتە شتەکە. زیوی تێهەڵسوو.

(أَفَضَّ- العَطاءَ): بەخششێکی زۆری بەخشی.

(تَفَضَّضَ): بلاوبووەوە.

(إفْتَضَ- الماءَ): ئاوەکەی چۆڕچۆڕو وردەوردە ڕۆکرد.

(إنفَضَّ): ١-شکا ٢-بلاوبووەوە.

(-تِ الدموعُ): ئەســرین/ فرمێسك داباری/ هاتەخوارێ.

(ألفَضّ) (مص): تاكە تاكە خەڵكی بلاوبلاو.

(«في المدينَــةِ فَــضٌ»): لە شــارەکەدا چەند کەسێکی بلاوی بلاوی تێدابوو.

(تَمْرُ فَضٌ): خورمای دانەدانەی لە یەك جیا.

(الفاضَّةُ (ج) فَواضّ): ١-مێی وشەی (الفاضّ) ٢-چورتوم/ وەی.

الفَضَض: ١-ئاوی پرژاو کە خۆی پێبشــۆرێت ٢-هەموو شتێك کە پەرشو بلاوبێت.

(«خَــرَجَ فَضَــضٌ مِنَ النــاس»): خەڵکێکی زۆری پەرشو بلاو هاتنەدەرێ.

(ألفِضَّــة) (ك): زیو کــە توخمێکی بەنرخە ســکەی پــێ لێدەدرێــتو خشــڵو قاپــی پێدروستدەکرێت.

(الفِضَّةُ والفَضَّةُ): زەوییەك تاوێرێکی زۆری بەسەردا بلاوبووبێتەوەو نیشتبنە سەریەك.

(«طاروا فُضاضاً): هەریەکە بەلایەکدا فڕین یان پەڕین.

(ألفَضيض الفُضاض والفِضاض والفُضاضَة): ئەو لە تانەی لە شـتە شکاوەکە بڵاودەبنەوەو دەپەڕێن.

(الفَضيض= الفَضض): ١-ئاوی ڕژاوی شتن ٢-هەموو شـتێك کە بڵاوبێتەوە ٣-شکاو ٤-ئاوی شیرین یان ڕۆیشتوو.

(ألمِفْضاض والمِفَضّ والمِفَضة): خاکەناز ئەوەی قـوڕی زەویـی پێدەشـکێنرێتو ڕادەدرێتو بڵاودەکرێتەوە.

٢-(فَضفَضَ- الثَـوبُ أو العَيشُ. فَضفَضَةً): بەرگەکە پانوپۆربوو/ فەرەح/ فشو فۆڵبوو/ دەڵبـبـوو یان گوزەرانو ژیانەکە خۆشو تێرو تەسەلبوو/ بەرفراوانبوو.

(-ە): فراوانیکرد.

(الفَضْفــاض): ١-بەرگـی پانوپــۆر/ دەڵب/ فشـوفۆڵ یان ژیانی تێروتەسـەلو خۆش ٢-پیاوی زۆر بەخشندەو دڵفراوان.

(أرضٌ فَضفــاض): زەوییەك ئـاوی باراناوی لەسەر کۆبووبێتەوەو دایپۆشیبێت.

(جاريَةٌ فَضفاضَة): کەنیزەکێکی گوشـتن/ قەڵەوی باڵابەرز.

(دِرعٌ فَضْفاضَة وفَضافِضَة): زرێیەکی پانو پۆر.

(سَـحابَةٌ فَضْفاضَــة وفَضافِضَة): هەورێکی پڕئاوو باران/ باراناوی.

الملحق:

فــض: (الفِضِيَّة): ١-قــاپو قاچاخی زیوینی ماڵ/ ئامێری دەفری لە زیو دروســتکراو یان زیو تێگیراو/ تێهەڵسووراو.

فَضــحَ: ١-(تَفَضَّحَ وانْفَضَــحَ- الرَجُلُ عَرَقاً وبالعَرَق): بنی قژی ئاوی دەرداو تەڕ نەبوو.

(ألفَضيح): ئەرەق/ خوەی/ خوویە.

٢-(تَفَضَّحَ-الشيءُ): فراوانبوو.

(-جَسَدُهُ بالشَّــحْم): گۆشتی لەشی چەوریی زۆر بوو و قڵیشا.

(إنْفَضَحَ-تِ القُرحَةُ): برینەکە/ دووملەکە دەمیکردەوە.

(-الأُفُقُ): ئاسۆکە دەرکەوت.

(-البَدَنُ): لەشەکە زۆر قەڵەو بوو.

(-البَطــنُ): ئەو لایەنانەی ســك کە تەنکەو نەرمە شلبوو.

(-الأمرَ): کارەکە بەربڵاوو فراوانو کز بوو.

فضح: ١-(فَضَحَ-ە): (خراپی/ کەموکووڕی/ خەوش)ی دەرخست.

(-المُعَمّــى): ئــەوە کــە نەزانــراو نێهیبــوو خستیەڕوو/ دەریخست.

(-القَمَرُ النُجومَ): شەوقی مانگ ئەستێرەکانی شاردەوە.

(-الصُبحُ): سپێدەیدا/ ڕۆژبووەوە.

(-الصُبحُ فُلاناً): ڕووناکیی ســپێدە فیساری دەرخست.

(فَضَّـحَ وأَفْضَـحَ- الصُبـحُ):رۆژ بووەوە/ سپێدەیدا.

(فاضَحَ-هُ وتَفاضَحا)هەردووکیان کەموکووڕیی/ خراپە/ خەوشی یەکتریان ئاشکرا کرد.

(إفْتَضَـحَ- الأَمـرُ)کارەکـە رووپامالْبـوو/ دەرکـەوت/ هەمووﻻیـەك پێیزانـیو بەگشتلایەکدا جاڕدرا/ زڕا/ جاڕ درا.

(-الرَجُلُ)کابرا ڕسوابوو هەموو خراپەیەکی ئاشکرا بوو.

(الفاضِح) (فـا):رۆژبوونەوە چونکە هەموو شتێك دەردەخات/ ئاشکرایدەکات.

(أَلفَضاحَة والفُضُوح والفُضُوحَة والفِضاح): (ڕسوایی/ خەوشـیو نەنگیی) خستنە ڕوو/ پاشهەڵماڵین.

(الفَضَّاح):ڕسواکەرێکی تەواو.

(الفَضُوح):١-ڕسواکەر ٢-ڕسواکراو/ ڕسوابوو.

(المَفْضُوح):خەوشـدەرکەوتوو/ ئابڕووچوو/ ناوزڕاو.

(الفَضيح):کەسێکە خراپ ئاژەڵ یان سامانو ماڵ سەرپەرشتیبکاتو هەڵیسووڕێنێت.

(الفَضيحَـة):١-ئافرەتێـك کـە بـە تەنـگ هەڵسـووڕاندنی ئاژەڵەوە یان سامانو ماڵەوە نەیـەت ٢-نەنگیی/ ڕسـوایی/ ئابڕووچوون/ خەوشو لەکـە ٣-دەرکەوتنو ئاشـکرابوونی خراپەو خراپەکاریی یان کەموکووڕیی.

(أَلمَفْضَحَة (ج) مَفاضِـح):مایەی (نەنگیی/ ڕسواییو ئابڕووچوون/ لەکەداریی).

٢-(فَضِحَ. فَضَحاً)شـتەکە ڕەنگی سپاتبوو/ زۆر سپی نەبوو.

٣-(أَفْضَحَ- النَخلُ)بەری دارخورماکە سوور یان زەرد بوو.

الملحق:

فضـح: (إنْفَضَحَ- الرَجُلُ أَو الأَمرُ)ڕەفتاری خراپـی/ کەموکووڕیـی کابرا (ئاشـکرابوو/ پێیزانـرا، نـاوی زڕا/ جاڕدرا/ یـان کارەکە دەرکەوتو پێیزانراو هەواڵیان بڵاوبووەوە.

فضخ: (فَضَخَ- الشـيءَ. فَضْخاً):شـتەکەی شـکاند ئەم شـکاندنەش تەنها بۆ شتێکە کە بۆشبێت وەك کاڵەك کە بۆشە.

(-الرأسَ):سەرەکەی شکاند/ قرنجاند.

(-العَينَ):چاوەکەی هەڵکۆڵی.

(أَفْضَـخَ- العُنقودُ):ترێکە دەمی گوشـینی هات.

(-البُسرَ):فەریکە خورماکەی کرد بە مەی.

(إنْفَضَخَ):١-شکا ٢-فراوانبوو.

(-تِ القُرحَةُ):دوومەڵەکە کرایەوەو گوشرا.

(-تِ الدَلْوُ)ئاوی ناو دۆلکەکە ڕژا سەرەوخوار کرایەوە.

(-زيدُ):زۆر/ توند گریا.

(فَضْخُ- الماءِ):دەرپەڕینی ئاو.

(أَلفَضوخ):شەرابێك بخۆرەکەی مەست کات.

(الفَضيخ):١-ئاوی ترێی گوشـراو ٢-شەرابێك

له خورما دروســتبكريّت ٣-شيريّك ئاوى زوّر تيّبكريّت و زوّر روونبيّت.

(المِفضَخَة (ج) مَفاضِخ): ١-بەرديّكە فەريكە خورماى پيّدەشكيّنن ٢-دۆلكەى فراوان.

فضل: ١-(فَضَلَ وفَضِلَ. فَضْلاً): مايەوە.

(أَفْضَــلَ- مِنَ الشــيءِ): شــتيّكى كەميّكى لە شتەكە هيّشتەوە.

(تَفَضَّــلَ- الرَجُلُ): پياوەكــە بەرگى كار يان بەرگى حەوانەوەى لەبەركرد.

(إسْــتَفضَلَ- مِــنَ الشــيءِ): ١-كەمەكيّكى لە شــتەكە هيّشتەوەو لادا ٢-شــتيّكى زيادەيەكى ليّبەجيّهيّشت و هيّشتەوە.

(ألفَضل (ج) فُضُول): ئــەوەى كە ماوتەوە/ پاشماوە.

(«فِي يَدِهِ فَضْلُ الزمام»): ســەرى جلەوەكەى بەدەستەوەيە.

(ألفَضْــل) (ع ح): پاشــماوەى ئەنجامــى ليّدەركردنى ژمارەيەك لە ژمارەيەكيتر.

(ألفَضْلَــةُ (ج) فَضَلات وفِضــال): جاريّك ١-ليّدەركردن/ جاريّك هيّشــتنەوەى كەمەكيّك لە شــتيّك و ليّلادانى ٢-زيادە يان پاشــماوەى شتيّك ٣-مەى.

(الفُضُل والفِضال): بەرگيّك كە بۆ كار يان بۆ حەسانەوە/ حەوانەوە لەبەر دەكريّت (چونكە لەبەرگيتر كە هى دەرەوەيە جيايە).

(«رَجُلٌ فُضُــلٌ»): پياويّكە بە بەرگى كارەوە يان بە بەرگى حەسانەوەوەيە.

(«إمْرَأةٌ فُضُلٌ»): ژنيّكە بە بەرگى كارەوە يان بەرگى حەوانەوەوەيە.

(ألفُضالَة (ج) فُضَالات): پاشماوە.

(ألفاضِل) (عند العامة): پاشــماوەى شــتيّك پاش ئــەوەى كــە ليّبرۆيشــتووە يــان زۆرى ليّرۆيشتووە.

(الفُضُول): ئەوەى لــە تالانييەكە ماوەتەوەو بەشنەكراوە.

(ألمِفْضَل والمِفْضَلَة (ج) مَفاضِل): بەرگى كار يان حەسانەوەى ناومالّ يان هى نوستن.

٢-(فَضَــلَ وفَضِــل- فَضْــلاً): زۆر بــوو/ زيادبوو.

(أفْضَلَ- عَلَيهِ): ليّيپتر بوو.

(«رأيتُ صَفَّهُــم قد أفْضَلَ علــى صَفِّنا»): ريزەكــەى ئەوانم لە هى خۆمــان (پتر هاتە بەرچاو/ زۆرتر بوو).

(ألفَضل (ج) فُضُول): ١-پتر/ زۆرتر ٢-زۆر.

(«فلان لايَمْلِــكُ دِرهَماً فَضلاً عَن دينارٍ»): فيسار نە درهەميّك و نە ديناريّكى نييە وەك بلّيّين ئەو درهەميّكى نييە چ جاى ديناريّك.

(ألفُضــول): پارەيــەك كە لە پيّويســت پتر بيّت.

(فُضُول البَدَن): ئەوەى كە لە لەش بە شيّوەى سرووشــتى دەردەچيّت و زيــادە دەبيّت وەك ئەرەق و پيســايى و ميزو لە شويّنى تايبەتيى

خۆیەوە دەردەچێت.
(أَلفُضُولِي): کەسێکە خۆی لە کاری ئەم‌و ئەوەوە هەڵقورتێنێت/ خۆتێهەڵقورتێن.
(ألحِشرِيّ (عامية)= الفُضولِي).
(فَواضِلُ المال): دەرامەت‌و قازانجی/ سوودی دارایی‌و سامان.
٣-(فَضَلَ- ـُ فَضْلاً): لەو چاکە خوازتر بوو/ لەو باشتر بوو.
(«فَضَلَ فُلانٍ على غَيرِهِ»): چاکەی فیسار بەسەر خەڵکەوە زۆر بوو/ زۆرتر بوو.
(فَضِلَ وفَضُلَ. فَضلاً): ١-خاوەنچاکە بوو/ چاکەکار بوو ٢-رەوشتبەرز بوو.
(فَضَّلَ-ـُ على غَيرِه) ٤-ئەوی بەسەر خەڵکدادا/ لەخەڵکیتری لە پێشترو باشتر گرت ٢-وایلێکرد لە خەڵکی تر لەپێشترو باشتر بێت.
(فاضَلَ-ـُ. فِضالاً و مُفاضَلَةً): خۆی لەو بە چاکترو لەپێشتر داناو شانازییکرد.
(-بَينَ الشَيئَين): یەکێکیانی لەو دوو شتە لەویتر بە باشتر داناو زانی.
(أَفْضَلَ- عَليهِ): ١-چاکەو پیاوەتیی لەگەڵدا کرد.
(أَفْضَلَ- عليه في الحسب): لەو وەجاخزادەتر بوو/ رەسەنتر بوو.
(تَفَضَّلَ-عليه): ١-چاکەو پیاوەتیی بەرامبەر کرد/ دەستی کۆمەکی بۆ درێژکرد ٢-خۆی لەو باشترو لەپێشتر زانی.

(تَفَضَّلْ): بفەرموو (تازەگەرییەکان بۆ ناسکیی‌و بەشێوی فرمانی داخوازیی بە گوێگرو بەرامبەرەکەیان بۆ بانگکردن‌و دانیشتنیان لەلایان بەکاریدەهێنن یان بۆ بانگکردنی نانخواردن وەك بڵێن: گەورەمان بکەو بفەرمووە لامان).
(تَفاضَلَ- الرَجُلانِ): ئەو دوو پیاوە هەریەکەیان خۆی لەویتر لەپێشترو چاکتر زانی.
(أَلفَضْل (ج) فُضول): چاکە/ فەر/ پیاوەتیی کە لە خۆوەو بێهۆ بکرێت.
(أَلفاضِلُ (فا) (ج) فاضِلُون وفُضَلاء (م) فاضِلَة (ج) فاضِلات وفَواضِل)٢-خاوەنچاکە/ چاکەکار/ خاوەنفەر/ خاوەنپیاوەتی ٢-رەوشتبەرز.
(الفاضِلَة): پایەبەرزیی لە چاکەکاریی‌و پیاوەتییدا لە زانست‌و وێژەو رەفتاردا ٣-بەخشین‌و ناز و بوون.
(أَلفَضَّال): جوامێر/ زۆر بەخشندەو دڵفراوان/ زۆر خاوەن چاکەو پیاوەتیی.
(أَلفَضُول): زۆر بەخشندەو چاکەو پیاوەتیخواز.
(الفَضيل (ج) فُضَلاء): ١-خاوەنچاکە/ جوامێر ٢-خاوەنرەوشتی بەرزو جوان.
(أَلفَضيلَة (ج) فَضائِل): پلەی بەرزی لە چاکیدا.
(«فضيلة الصدق»): نیشانەی/ سیفەتی

راستگۆیی/ شکۆی راستگۆیی.

الفضیلة: پلەی بالآی رەوشتبەرزییو (پیاوەتیی/ جوامێریی) و دوور لە بەدرەوشتییو رەفتار نزمیی. وەك: خۆشەویستییو پاكییو لەخۆبوردنو دڵسۆزی گەلێك نیشانەی چاكیتر.

(اَلأَفْضَل (ج) أَفْضَلُون وأَفاضِل (م) فُضْلى (ج) فُضْلَيات وفُضَل): ١-چاكتر/ باشتر/ جوامێرتر/ بەخشندەتر ٢-بەرەوشتر/ کەسێکە کە زۆرتر نیشانەی چاکەی تێدابێت.

(اَلمِفْضَل): چاکەخواز/ زۆر (رەوشتدار/ بەرەوشت).

(اَلمِفْضال (م) مِفْضالَة): زۆر چاکەخواز/ بەخشندە/ فەرخواز.

(هو مِفْضالٌ على قَومِهِ»): ئەو چاکەو پیاوەتیی زۆری بەسەر خوێشگەلو نەتەوەکەیەوە هەیە.

(اَلمُفَضَّل): خاوەنچاکە/ پیاوەتییزۆر ٢-پەسندتر/ چاکتر یان مرۆڤی لەپێشترو بەرێزتر.

فضو: ١-(فَضا- المَكانُ. فَضاءً وفُضُوًّا): شوێنەکە ١-بەرفراوانبوو/ کراوە بوو ٢-چۆڵەوانییبوو.

فاض: ١-بەرفراوان ٢-چۆڵەوانی.

(فَضا- الشَّجَرُ بالمكانِ فَضواً): درەخت لە شوێنەکەدا زۆر بوو.

(أَفْضى- المَكانُ إِفْضاءً): شوێنەکە (بەرفاروانبوو/ کراوە بوو).

(-الرَّجُلُ): نەدارا بوو/ نەبوو بوو/ هەژارکەوت.

(-المَكانَ): شوێنەکەی کراوەو فراوانکرد.

(-إِلَيهِ): گەیشتێ.

(-إِلَيهِ بِسِرِّهِ): نهێنی خۆی لا درکاندو پێیوت.

(-بِفُلان): فیساری بردە دەشتودەرو هەوای بەرەڵا.

(-بِهِ إِلى كذا): بردیە لای ئەوە/ گەیاندیە ئەوە.

(تَفَضى- لِلأَمرِ): خۆی بۆ کارەکە تەرخانکرد.

(اَلفاضي) (فا): ١-فراوان/ بەربڵاو/ کراوە.

(«مَقامٌ فاضٍ»): شوێنێکی فراوان ٢-چۆڵ ٣-دەرکەوتوو/ دیار/ بەربڵاو.

(الفاضي) (عند العامة): لە کاربووەوە/ لەکار دەستهەڵگرتبوو/ دەستبەتاڵ.

(اَلفَضاوة): دەستبەتاڵی.

(«فَضاوَةُ البال») (عامية): بێخەمو خەیاڵ/ مێشکساف.

(اَلإِناءُ الفاضي) (عامية): دەفری بۆش.

(اَلفَضاء (ج) الأَفضِيَة): ١ زەویی بەرفراوان ٢-مەیدان/ گۆرەپان.

(مَكانٌ فَضاء): شوێنێکی (بەرفراوان/ پانوپۆر).

(اَلفَضاء): ناو کە بەسەر زەویدا بڕواتو بکشێت.

(«إِنَّ أَمْرُهم فَضا بَينَهُم») (عامية):

کارەکەیان بەرەڵایەو بێگەورەن.
٢-(الفَضا): دەنکی مێوژ.
(سَهْمٌ فَضا): تیرێکی تاك و تەنها.
(طَعامٌ فضا): خواردنی تێکەڵ/ ئاوێتە.
فطأ: ١-(فَطَأَ-هُ. فَطْأً): قرنجاندی.
(-بِهِ الأَرضَ): دایبەزەویدا.
(-بِـهِ عَن رأيِـهِ): لـە ڕاکەی لایـداو وازی پێلێهێنا.
(فاطَـأَ- بِـهِ الأَرضَ مُفاطَـأَةً): کێشـای بە زەویدا.
٢-(فَطَأَ- القَومَ. فَطْأً): شـتێکی بەسەریاندا دا کـە پێیان ناخۆشـبوو/ بۆهێنان کە پێیان ناخۆش بوو.
٣-(فَطِيءَ فَطَأً): پشتی بەناودا چوو و سنگی دەرپەڕی.
(أَفْطَـأُ (م) فَطْآء (ج) فُطْء): پشـت بەناودا چووی سنگدەرپەڕیو.
(أَلفُطْأَة): پشت بەناوداچوون و سنگدەرپەڕین.
٤-(أَفْطَـأَ. إِفطـاءً): ١-گوزەرانـی خـۆش و فراوانبوو.
(- فُلاناً): خواردنی دەرخواردا.
٥-(أَفْطَأَ. إِفطاءً): بەدڕەوشـتبوو/ ڕەوشـتی تێکچوو خراپبوو.
٦-(تَفاطَأَ): تەمەڵیکرد.
(-عَنهُ): لێیدواکەوت.
(-عَنِ القَومِ): تێشکاو کشایەوەو وازی لێهێنان کە لەوەپێش هێرشی کردبوونە سەر.
فطـح: ١-(فَطَـحَ وفَطَّح- الشـيءَ. فَطْحاً): شتەکەی پانکرد.
(-العُودَ): چیلکەکەی داداو پانیکرد.
(-هُ بالعَصا): بەداردەستەکەی لێیدا.
(فَطِحَ- رأسُـهُ أَو أَنفُهُ. فَطَحاً): سـەری یان لووتی پانبوو.
(أَفْطَح): سەرپان یان لووتپان.
(رأسٌ مُفَطَّح): سەرێکی پان.
٢-(أَلفِطَحْل (ج) فَطاحِل): لافاوێکی گەورە.
(جَمَلٌ فِطَحْلٌ): حوشترێکی قەبە/ زەبەلاح.
(زَمَـنُ الفِطَحْـلِ): چاخێکـی زۆر کـۆن. دەڵێـن: ڕۆژگارێکە کە مرۆڤ هێشـتا تیایدا دروستنەبووە.
(فَطاحِلُ العُلَماء): زانا هەرە مەزنەکان.
فطر: ١-(فَطَرَ- الشـيءَ. فَطْراً): شـتەکەی قڵیشاند/ ترەکاند.
(-نابُ البَعيرِ): دانی حوشترەکە دەرهات.
(-أُصْبُعَ فُلانٍ): کێشای بە پەنجەیداو خوێنی لێدەرپەڕی.
(-الرجُلُ الشاةَ): پیاوەکە بە سەری پەنجەی مەرەکەی دۆشی.
(فَطُرَ-الشـيءَ): شتەکە قڵەشـت/ قڵیشاند/ لەتکرد.
(تَفَطَّرَ وانفَطَرَ): ترەکیی/ قڵیشا/ شەقیبرد.
(-تِ الأَرض بالنَّباتِ): زەویەکە قڵیشـایەوە

گیای لێهاتە دەرێ.
(-الفَضیبُ): چڵەکە چرۆی تازەی دەرکرد.
(ألفاطِر): ئەوەی دانی دەرکردبێت.
(ألفَطْر): دۆشینی مەڕ یان حوشتر بە سەری پەنجـە (دەرچوونـی شـیرەکە لـە گوانەکە بەدەرچوونی دان چوێنراوە).
(الفَطْر (ج) فُطور): قلیش/ شەقار/ درز.
(الفِطْر): بەرسیلە کە تازە نووکی پەیداکردبێت.
(الفُطْر= (ن) الفِطر فُطرَة): گیایەك کە تازە سەری دەرهێنابێت (ن): قارچك/ کارگ.
الفُطر الزراعي (ن): ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی (غاریقونبتات) ڕەنگی سپییەو مەیلەو بۆرە. بۆنی خۆشە لە شوێنی تایبەتیدا دەچێنرێت و دەخورێت/ کارگی بەرهەمهێنراو.
(سَیفٌ فُطار): شمشێرێك کە دەمەکەی قلیش قلیشبووبێت و نەبڕێت/ کول بێت.
(الفُطـارِيُّ): پیاوێکی بێکەڵك لە شمشـێری نەبڕەوە هاتووە.
(الأُفْطُـور (ج) أفاطیر): قلیش لە دەموچاوو لووتدا.
(الفَطیر): شیری تازە دۆشراو.
أَلمَفْطَرَة (ج) مَفاطِر (ز): کێڵگەی قارچك کە تیایدا دەیچێنن.
٢-(فَطَـرَ- الأَمرَ. فَطْـراً): کارەکەی داهێنا/ یەکەمجار دەستپێیکردو دایمەزراند.
(إفْتَطَر- الأَمرَ): دروستیکرد/ دایهێنا.

(ألفِطْـرَة) (ج) فِطَـر): ١-داهێنـان و یەکەم دامەزراندن و دروستکردن ٢-نیشانەو سیفەتی زکماکیی و خوڕسـکی/ سروشتکرد)ی هەموو شـتێك ٣-نیشانە/ سـیفەتی سروشتی مرۆڤ ٤-ئاین ٥-ڕێڕەوو دەستوری ئاین/ سونەت.
٣-(فَطَـرَ- العَجـینَ. فَطْـراً): هەویرەکەی پێشهەڵاتن کرد بە نان.
(الفَطـیر): ١-هەویـری هەڵنەهاتـوو ٢-کاڵ و کرچ/ نەگەیو/ نەبەکام/ پێنەگەیو.
(«هـذا رأيٌ فَطیر»): ڕایەکـی کاڵ و کرچە/ بێلێکدانەوەو بیرکردنەوەیە.
(عیدُ الفَطیر): جەژنێکی جوولەکەیە.
(عَجینٌ فَطیر): هەویرێکی هەڵنەهاتوو.
(خُبزٌ فَطیر): نانێکی کاڵ.
(ألفَطـیرَة (ج) فَطائِر) (ط): ئیشـی هەویر کە بە هەویری ڕۆن یان شـلەڕۆن و شـتیتری پێهەڵشێلراو دەکرێت وەك کولیچەو گاڵگاڵی و بۆرەك و شتیتر.
٤-(فَطَرَ- الصائِمُ. فَطْـراً وفِطْراً وفُطُوراً): ڕۆژووانەکـە ڕۆژووەکەی شـکاند/ بەربانگی کردەوە.
(فَطَّرَ- الصائِمَ): ١-بەربانگی بەڕۆژووەوانەکە کردەوە ٢-خواردنی بەربانگی دایە.
(أَفْطَر- الصائِمُ): ١-ڕۆژوەوانەکە ڕۆژووەکەی شکاند ٢-دەمی ڕۆژوو شکاندنی هات.
(مُفطِـر (ج) مَفاطِـیر): بەربانگکـەرەوە/

ڕۆژووشكێن.

(«قَومٌ مَفاطير»): خوێشگەلێك كە ڕۆژوویان شـــكاندبێت یـــان دەمـــی بەربانگكردنەوەیان هاتبێت.

(أَفْطَرَ- الصائِـــمُ): ١-ڕۆژووەكەی پێشـــكاند ٢-خواردنی بەربانگیدایە.

(ألفاطِر) (عامیة): بێڕۆژوو.

(الفِطر) (مص) عید الفِطر): جەژنی ڕەمەزان.

(أَلفَطور والفَطُوريّ): خواردنو خواردنەوەی بەربانگ.

أَلفُطور (عامیة): نانی ناشتا نانی بەیانی یان نانی نیوەڕۆژە.

الملحق:

فطر: (الفِطرِیَّـــة): ڕێڕەوێكی فەلســـەفییە لەســـەر ئەو بڕوایە دامـــەزراوە كە هزر خۆی خۆڕسكییەو لەگەڵ ئاوەزی مرۆڤدا هاتووە هی ئەزموونو تاقیكردنەوە نییەو پێشنەوەیە.

---

فطس: ١-(فَطَسَ. فُطُوســـاً): مرداربووەوە/ تۆپی/ مرد.

(فاطِس): مردارەوەبوو/ تۆپیو.

(-فَطســـاً): (عامیە): هەناســـەی بۆ نەدرا بە هۆیەكەوە كە ڕێگەی هەناسەدانی لێگرتبوو.

(فَطَّسَ-ہُ): مراندی/ تۆپاندی/ مرداریكردەوە.

٢-(فَطَسَ- ہُ بِالكَلِمَةِ فَطســـاً): بە قســـەكە جەرگیبڕی/ كوشتی/ هەناسەی لەبەربڕی.

٣-(فَطَـــسَ- الحَدیدَ. فَطْســـاً): ئاســـنەكەی پانكردەوە.

(فَطِسَ. فَطساً): ئێسقانی لووتی پانبووەوە.

(أَفطَس): لووتپانو لووتتەپیو/ كەنۆش.

(أَنفُ أَفْطَس) لووتێك ئێسقانەكەی تەپیوبێت و لووتی پانبووبێتەوە/ كەنۆشبووبێت.

(أَفْطَس (م) فَطْســـاء (ج) فُطس): كەسێكی لووتتەپیو/ كەنۆش.

أَلفَطْسَة: ئێسكی لووت كە بتەپێت.

(أَلفِطّیس (ج) فَطاطیس): پیك/ چەكوشی گەورە.

أَلفَطیسَـــة: ١-بووزی بەراز ٢-لووتو قەپۆزی درنـــدە ٣-لچو لێـــوی مرۆڤ ٤-لـــۆزی ولاخی سمدار.

٤-(أَلفَطْس): بەری مۆرد.

(فَطْسَة): دەنكێك بەری مۆرد.

(أَلفَطْسَة): مووڕووی تەلیسم/ جادوو.

فطم: (فَطَـــمَ- الوَلَدَ. فَطْماً): منداڵەكەی لە شیر بڕییەوە.

(-الحَبْلَ): پەتەكەی پچڕی/ بڕی/ پساند.

(-ہُ عَـــنِ العـــادَةِ): نەریـــتو خووەكەی پێ وازلێهێنا.

(«لأَفْطَمَنَّـــكَ عَمـــا أَنـــتَ عَلَیـــهِ»): دەبێت واتلێبكەم كە واز لەوە بێنیت كە لە سەریت.

(فَطَّمَ الشَّـــجَرُ): درەختەكە (میوەی/ بەری) پێوە نەما.

(-المَوسِمُ) (عامیة): وەرزەكە كۆتاییهات.

(أَفْطَمَ- الرَّضیعُ): ١-كاتی لە شـــیربڕینەوەی

منداڵەکـە هـات ٢-منداڵەکە گەیشـتە کاتی لەشیربڕینەوەی.

(تَفاطَمَ- القَومُ): بەچکەی ئاژەڵەکانیان پاش لە شیر بڕینەوەیان گرانەوە بەر دایکیان.

(إنفَطَمَ): لەشیربڕرایەوە.

(-عَنهُ): وازی لێهێنا.

(ناقة فاطِمٌ وفاطِمَة): مێحوشترێك کە بەچکەکەی لەشیر بڕرابێتەوەو لە دایکی دوورخرابێتەوە.

(ألفِطـام): ١-لەشـیربڕینەوەی منـداڵ یـان بەچکە ٢-کاتی لەشیربڕینەوە.

(فِطـامُ القَـز) (عنـد مُرَبـيَ دودة القَز): خـواردن لـە کرمی ئاوریشـم دەبڕنـەوە تا قۆزاخەکە بە سووری خۆیدا دروستبکات.

(ألفَطيم (ج) فُطُم= المَفطوم): لەشیربڕاوە.

(ألفَطيمـة): مەڕێك کە بەرخەکەی لەشـیر بڕرابێتەوە.

فطن: (فَطَـنَ وفَطُنَ و فَطِـنَ- لِلأَمر وبِهِ وإلَيـهِ. فَطْناً وفِطْناً وفُطْنـاً وفَطَناً وفُطُناً وفِطانَـةً وفُطُونَـةً وفَطانِيَـةً وفِطانِيَةً): ١-تێگەیشـت ٢-پێزانـی/ هەسـتی پێکـرد ٣-تیایدا کارامەو لێزانبوو.

(فَطَّـنَ-هُ بالأَمـرِ ولَـهُ وإلَيـهِ): کارەکەی تێگەیاندو لێئاگادار کرد/ وایلێکرد کە بیری بۆی بچێت.

(-التلميذ): خوێندکارەکەی والێکرد تێبیگاتو وریایکرد.

(فاطَـنَ-هُ بالكلام. مُفاطَنَة): قسـەکەی بۆ وتەوە تا وریاببێت تێبیگات.

(وتَفَطَّـنَ- لِكَلامِـهِ): لـە ئاخاوتنەکـەی گەیشتو بۆیچوو.

(«تَفَطَّنْ لِما أَقولُ لَكَ»): باش لە ئاخاوتنەکەم وریابەو بگە.

(ألفاطِـن والفَطِـن والفَطـين والفَطـون والفَطُن والفَطْن (ج) فُطْنٌ وفُطُن): زرنگ/ هۆشمەند/ وریا/ تێگەیشتوو.

(الفِطنَة (ج) فِطَن): هۆشمەندیی/ وریایی و تێگەیشتن.

(الفُطُونَـة= الفَطِـن): وریاو تێگەیشـتوو/ هۆشمەند.

فطو: (فَطا- الدابَّة. فَطْواً): وڵاخەکەی توند لێخوڕی.

فظ: ١-(فَـظَّ. فَظاظَةً وفِظاظـاً وفَظَظاً): قسـەڕەقبوو/ نەزانـدووبـوو/ دڵڕەقبـوو/ بەدڕەوشتبوو/ درسروشتبوو.

(فَـظَّ وإفتَظَّ. فَظّـاً): ورگی حوشـترەکەی هەڵـدڕیو گوشـیو ئاوەکەی خـواردەوە (لە بیاباندا کە ئاو نییە دەمی حوشـتر دەبەستن بۆ ئـەوەی کاوێژ نەکات تا لـەو تینوێتیەدا، حوشترەکە سـەردەبڕنو ورگەکەی دەگوشنو ئاوەکەی دەخۆنەوە).

(ألفَظ (مص) (ج) أفظاظ): دڕیوشکی نەزاندووە/ بەدخوو/ ڕەوشتو قسەتڕن/ قسەڕەق.

(ألفَظّ (ج) فِظاظ وفُظُوظ): ئاوی ورگی حوشتر که له تینواندا دەیخۆنەوە حوشترەکە سەردەبڕن و ورگەکەی بۆ ئاوەکەی دەگوشن ئەویش لە بیابانەکاندا مرۆڤی درو بەدرەوشت و نەزاندوویان بەو ئاوە چواندووە.

(الفَظّ) (ح): بەرازی ئاوی. جۆرە درندەیەکی ناشیرینە نێرەکانی دوو شەفرەی درێژیان هەیە کە بە کاکیلەی سەرەومیەتی.

فظع: ١-(فَظِعَ- فُلانٌ بالأَمرِ ومِنَ الأَمر. فَظَعاً): فیسار کارەکەی لا زۆر ناشیرین بوو لێیسڵەمییەوە دڵی هەڵینەگرت.

(فَظُعَ- الأَمرُ. فَظاعَةً): دزێویی و سەختی کارەکە لە ئەندازەبەدەر بوو.

(فَظِعٌ وفَظیعٌ): لە ئەندازە بەدەر پیس و ترسناك و تۆقێن.

(فَظَّعَ- الأَمرَ): کارەکەی لە ئەندازە بەدەر ناشیرین و سەخت و پڕمەترسییکرد.

(أَفْظَعَ- الأَمرُ): کارەکە زۆر پیس و پڕ مەترسیبوو.

(-هُ): تووشی گرفتارییەکی سەخت و پیس لە ئەندازە بەدەریکرد.

(-الأَمرَ): کارەکەی بە (خراپ/ پیس و پڕ مەترسی) داناو زانی.

(أُفْظِعَ): کارێکی سەخت و پیس و تۆقێنەری تووشببوو.

(تَفَظَّعَ واستَفظَعَ الأمرَ): کارەکەی زۆر بە سەخت و پڕ مەترسی هاتە بەرچاو.

٢-(فَظِعَ- الإناءُ. فَظَعاً): قاپەکە تەواو پڕبوو.

(ألفظیع): ئاوی شیرین یان خۆش و سازگار.

فظي: (أَفظَى- الرَجُلُ. إفْظاءً): بەدخوو و بەدرەوشتبوو.

فع: (فَعفَعَ- بِالغَنَم فَعْفَعَةً): یخەی لە مەڕەکانکرد.

(فَعْ فَعْ): یخ یخ.

(فَعْفاع وفَعْفَعٌ): یخەکەر.

(تَفَعْفَعَ- الرَجُلُ في أَمرِهِ): پەلەی لە کارەکەیدا کرد.

فعل: ١-(فَعَلَ. فَعْلاً): کردی/ ئیشیکرد/: ئەنجامیدا.

(ألفِعل): کار/ فرمان/ ئیش.

(فَعَّلَ- البَیتَ الشَعرِيَّ): دێڕە هەڵبەستەکەی پارچەپارچە کردو لەگەڵ کێشی گشتیدا لواند.

(إنْفَعَلَ): کرا/ ئەنجامدرا.

إفْتَعَلَ- الشيءَ): شتەکەی داهێنا.

(-الخَطَّ): ساختەی لە نووسینەکەدا کردو لاساییکردەوە.

(«إفْتَعَلَ علیه زَوْراً وكَذِباً»): بە درۆو ساختە کردارێکی دایە پاڵ ئەو.

(ألفِعل (ج) فِعال وأَفْعال و (جج) أَفاعیل): کار/ فرمان/ ئیش.

(أَلفَعْلَة): جارێك كردنی كارێك/ كردارێك.
(«كانَــت مِنــهُ فَعْلَةٌ حَسَــنَة أَو سَــيئَة»): كردارێكی چاكی یان خراپی هەبوو.
(أَلفِعلَةُ): نەریت/ خوو.
(فَعالِ): فرمانــی داخوازییە واتا: بیكە/ ئەو كارە/ فرمانە (بەجێبهێنە/ ئەنجامبدە).
(أَلفَعــال): ١-كاری چــاك ٢-بەخشــندەیی/ جوامێریی ٣-بۆ كاری خراپیش بەكاردێت.
(أَلفِعال): كۆی وشــەی (الفِعــل)ە كارێكە كە دوو یان چەند كەسێك بیكات.
(أَلفاعِــل (ج) فاعِلــون وفَعَلَــة (م) فاعِلَة (ج) فاعِــلات وفَواعِــل) (فــا): كاركــەر/ كارئەنجامدەر/ فرمانكەر.
(أَلفاعِل (ج) فَعَلَة): كرێــكار/ بەكرێگیراوی رۆژانــە كــە بــۆ كشــتوكاڵ یــان كاریــتر بەكرێگیرابێت.
(أَلتَفاعُــل الكیمیــاوي): كارلێكــی كیمیاوی (ك): كار لە یەككردنــی دوو مادە یان زۆرتر كــە دەبێتە هۆی گۆڕینی سروشــتی كیمیاوی مادەكان وەك ئۆكســجین‌و هایدرۆجین كە كار لە یەك دەكەن‌و دەبنە پەیدابوونی ئاو.
(أَلأَفاعیــل والتَفاعیل عنــد العَرُوضیین): نموونەی ئەو بەشــانەن كە شــیعری لێپەیدا دەبێت كە چوارن: فعولن مفاعیلن مُفاعَلَتن وفاعلاتن) ئەمانە سەرەكین‌و پارچەكانیتریان لێوە وەرگیراوە.

(أَلمُفْتَعَل): هەڵبەستراو/ دروستكراو.
(شــعرُ مُفتَعَــلٌ): هەڵبەســتێكەكە هۆنەر/ شاعیر شتی وای تێدا داهێنابێت كە تازەبێت‌و لە هی كەس نەچێت.
(«جاءَ فُلانٌ بِالمُفْتَعَل»): فیسار شتێكی مەزنی ئەنجامداوە/ كارێكی گەورەی كردووە.
٢-(فعالُ الفَأسِ): دەسكی تەشوێ یان تەور.
الملحق:
فعل: (أَلفاعِلِیَّــة): كارگەرێتی/ كاركردەیی/ كارتێكردن/ شتەكە ئەنجامدەربێت‌و كارتێكەر بێت.
(«فاعِلِیَّة وَســیلة»): بەكاریــی/ كاركردەیی هۆكارێــك‌و هۆیــەك. ئــەو نیشــانەیەیە/ ســیفەتەیە كە لــە ئەنجامــی كارتێكردنەكە پەیدا دەبێت.
(أَلنَفــع): ســوود/ كەڵــك. (أَلنَجــوع): كەڵكلێوەرگرتن‌و پێكەوتن.
(«فاعِلِیَّة دَواء»): بە كەڵكبوونی دەرمانێك‌و كاری باش تێكردن/ كاریگەری دەرمانێك.
(الفاعِلِیَّة- في النَّحو): ناوەكە (بكەر بێت).
(«اســم مرفوع علــى الفاعِلِیــة») ناوێكە بكەرەو بۆرداره.
(أَلفَعَّال): زۆر بــەكار/ كاركردە ئەنجامدەری چاك.
(«سُــلْطَةُ فعالَــة»): دەســەڵاتێكی بــەكار/ چابووك‌و كاركردە.

(«إِسْهامٌ فَعّال»): بەشدارییەکی چالاکانەو بە ئەنجامو بەسوود کە کاری چاوەڕێکراوی خۆی ئەنجامبدات.

(«دَواءٌ فعال»): دەرمانێکی بەسوودو کارکردەو بە ئەنجام.

(ألأُفْعولَة (ج) أفاعيل وأُفْعُولات): کارو کردەوەی سەیرو دزێوو نەشیاو بێزراو.

(«فَعَلَ الافاعيل»): ١-کارێکی زۆری دزێوو سەیرو بێزاروە.

(الإنْفِعال): هەژان/ دەروونهەڵچوون/ شپرزەبوون/ گینگڵدان.

(«رَجُلٌ سَريع الإنفعال»): پیاوێکە دەروونی زوو هەڵدەچێتو کاری تێدەکرێت.

(ألإنفعاليَّة): زوو دەروونهەڵچوونو کارتێکردنو هەست ناسکی/ گینگڵدان.

(«هذا دليل على إنفعاليته») ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە زوو کاری تێدەکرێتو دەروونی زوو هەڵدەچێتو شپرزە دەبێت.

(«إنْفِعالية الأَنسجة الحَيَّة»): زوو کارتێکردنی شانە زیندووەکان.

(ألإنفعالي): دەروونناسكو دەروونهەڵچوو و زوو شپرزە بوو.

(حركة إنفِعالِية): بزووتنەوەیەکی دەروونهەژانی/ دەروونهەڵچوونی.

(ألإنفِعالي): ١-کەسێکە زوو تووڕە بێت/ قوشقی/ زوو هەڵچوو ٢-کەسێکە زوو بزوێنرێتو کاری تێبکرێت/ هەست ناسك.

(«رَجُلٌ إنفعالِي»): پیاوێکی هەمیشە دەروونهەڵچووە/ قوشقییە.

(«مِزاج إنفِعالي»): سروشتێکی ناسکی زوو هەژێو زوو هەڵچوو.

(ألمُفاعِلُ الذَرِّي أو النَوَوي): تەنوری ناوکیی/ کارپێکەری ناوکیی دەزگایەکە تیایدا وزەی ناوکیی کە یورانیۆمی تێدابێت دەگۆڕدرێت بە وزەیەك سوودی هەبێت ئەویش بە کەرتبوونی بەردەوامی ناوکی لەکارلێکێکی بەردەوام یان زنجیرەییدا هۆی وەستانو دەستبەسەرداگرتنی بەکاردێنن.

فعم: (فَعَمَ- الإناءَ فَعْماً): قاپەکەی پڕکرد.

(فَعَمَ وفَعِمَ- الرجُلُ): پیاوەکەی پڕکرد/ تووڕە کرد.

(فَعُمَ- الإناءُ أو الساعِد وفَعامَةً وفُعُومَةً): قاپەکە پڕبوو/ بازووەکە ئەستوورو پڕ ماسولکە بوو.

(فَعْمٌ وفَعْمَلٌ): بزيادة اللازم): قاپی پڕ/ بازووی پڕ.

(«هوَ فَعْمُ الأَوصال»): چوارپەل قەوییە.

(فَعَّمَ- الإناءَ): قاپەکەی پڕکرد.

(أَفْعَمَ- الإناءَ): قاپەکەی پڕکرد.

(-المِسْكُ البيتَ): بۆنە خۆشەکەی مسك ماڵەکەی پڕکرد.

(-الرَجُلَ): دڵی پیاوەکەی پڕ لە خۆشیکرد

٢-پیاوەکەی توورە کرد.
(إفْعَوْعَمَ): پڕو سەرڕێژ بوو.
(سَیلٌ مُفعَمٌ): لافاوێکی سەرڕێژو هەستاو.
فعي: ١-(فَعَّی- الجَمَلَ. تَفعِیَةً): حوشترەکەی بە نیشانەی شێوەی مار نیشانەیکرد.
(تَفَعَّی): وەك مار بەوەزمند بوو.
(ألفَاعي): توورەیەك کە دەمی کەفبچێنێت.
(ألفاعیة): ١-مێی وشەی (الفاعي) ٢-ئافرەتی بەدزمانو دووزمان.
(ألأفعـی (ج) أفاعٍ (ح): مـاری پیس/ ماری ژەهـردار زۆر جـۆری هەیـەو هەمـووی ژەهردارن.
(ألأفاعـی) ( ع ا): دەمارێکـی زۆرن لـە دوو شادەماری سووری ناوکەوە دەردەچن.
(ألأُفْعُوان) (ح): نێرە مار.
(أرضٌ مَفْعاةٌ): خاکێکە ماری زۆر بێت.
(ألمُفَعَّـاة): نیشـانەیەك کە لە شـێوەی ماردا بێت.
٢-(ألفاعِیَة): گوڵی خەنە.
(ألأفْعاء): بۆنو بەرامەی خۆش.
فـغ: (فَـغَّ- الطیـبُ فَغَّـةً): بۆنـی خۆش پەخشبوو.
(«فَغَّتْنـي الرائِحَـةُ فَغّـاً»): بۆنـی خۆش دایگرت/ بەسەرمدا هات.
فغر: ١-(فَغَر- فاهُ. فَغْراً): دەمیکردەوە.
(-فُوهُ): دەمیکرایەوە.
(إنْفَغَرَ فوهُ): دەمیکرایەوە.
(-النَوْرُ): گوڵەکە دەمیکردەوە.
(ألفَغْر) (مص): گوڵی دەمکراوە.
(«رجلٌ واسِعُ فَغرِ الفَم»): پیاوێکی دەمپەل، دەمکراوە.
(ألفَغْرَة): جارێك کردنە.
(«وُلِدَ بالفَغْرَةِ»): لە سـەرەتای دەرکەوتنو هەڵاتنی ئەسـتێرەی کـۆ کە لە زسـتاندایە لەدایك بوو.
(ألفُغْرَةُ (ج) فُغَر): دەمی دۆڵەکە.
(ألفاغِرَةُ) (ح): باڵندەیەکە.
(ألمَفغَرَة): ١-دەشـتێکی پانو بەرین ٢-کەورگ لە شاخدا.
٢-(الفاغِرَة): جۆرە بۆنێکی خۆشە.
فغم: (فَغَم- الطیبُ فُلانـاً. فَغْماً وفُغُوماً): بۆنی خۆش کونەلووتی فیساری پڕکرد.
(أفْغَـمَ- المَکانَ): شـوێنەکەی بە بۆنی خۆی پڕکرد.
(_الإناءَ): قاپەکەی پڕکرد.
(-الرَجُلَ): دڵی پیاوەکەی پڕ لە خۆشیکرد.
(إنْفَغَمَ- المَکانُ): شوێنەکە لە بۆن پڕبوو.
(ألفَغَـم) (مـص): ئەو خواردنـەی دەچێتە نێوان دانەکانەوە.
(فَغْمَةُ الطیب): بۆنی عەتر یان شتێك بۆنی عەتری لێبێت.
(ألمَفْغُوم) (مفع): هەڵامەتگرتوو.

(-شـيءٌ مَفْغُـوم): شـتێك بـه بەهـارات بۆندرابێت.
٢-(فَغَـمَ وتَفَغَّمَ- الـوَردُ فُغُومـاً): گوڵەكە گەشایەوە.
(إنْفَغَـمَ وافْتَغَـمَ- الـزكامُ): هەلامەتەكـە بلاوبووەوە.
٣-(فَغَـمَ- وفاغَـمَ- فُلاناً. فَغْمـاً وفُغُوماً): فیساری ماچكرد.
(تَفاغَيا): یەكتریان ماچكرد.
(الفُغْـم والفُغُـم): هەمـوودەم وتراویشـه: چەناگە بە ریشەوە.
٤-(فَغِمَ- بالشـيءِ. فَغَماً): دڵی بە شتەكەوە بەند بوو زۆر پێوە لكاو بە تەنگیەوە هات.
(-بالمَكانِ): لە شوێنەكەدا نیشتەنیبوو تیایدا مایەوە.
(ألفَغِم): سۆزدارو بەتەنگەوەهاتووی شتێك.
(«كَلْبٌ فَغِمٌ على الصَّيدِ»): سەگێكە هەتەرەو سوورە لەسەر گرتنی نێچیرو راو.
(أَلمُفْغَم) (مفع): دڵلێسەنراو/ هۆشلێسەنراوو لێبراو.
(«هو مُفغَمٌ بهِ»): ئەو پێوەی گرفتارەو دڵی لێسەنراوە.
فغو: ١-(فَغا- الأمرُ. فَغواً): كارەكە ئاشكرابوو/ جار بوو.
(أَفْغـى الريحانُ): رێحانەكـە خونچەیكردو هاتە گوڵ.
(-الشـجرُ): پێـش بەرگرتـن گوڵەكـەی گەشایەوە.
(ألفَغو) (مص): بۆنی خۆش.
(فَغوَةُ الطيب): بۆنو بەرامەی عەتر.
(ألفاغِيـة): ١-گوڵی خەنە ٢-چڵی داری خەنە كە سـەرەوخوار دەچەقێنرێـت گوڵدەگرێت بۆنـی لە خەنەكە خۆشـترە ٣-گـوڵ، هەموو ئەوەی بۆنی خۆش دەدات.
٢-(فَغا-الزَرعُ. فَغْواً): كشتەكە وشكیكرد.
(أَفغـى فُـلان): ١-فیسـار هەژار كـەوت كە لەوەپێش دارا بوو ٢-ناشیرینبوو كە لەوەپێش جوانبوو ٣-سـەرپێچیكرد/ نافرمانییكرد كە لەوەپێش فرمانیدەكردو ملیدەدا.
(-هُ): تووڕەیكرد.
فق: ١-(فَقْفَـقَ. فَقْفَقَةً): زۆر هەژار كەوتو رەجاڵبوو.
٢-(فَقفَـقَ- الكَلـبُ. فَقْفَقَةً): سـەگەكە لە ترساندا كەوتە وەڕین.
(-تِ القِدرُ): (عامية سريانية): مەنجەڵەكە كوڵاو بڵقەبڵقیكرد.
(تَفَقْفَـقَ- الرَجُـلُ في كَلامِـهِ): بـە قورگ قسەیكرد.
(فَقْفَقَةُ الماءِ): خورەی رۆكردنی ئاو.
(ألفَقفاقَـة والفَقْفـاق): گەوجـی بە گرمە گرمو شیرەشیركەر.
فقـأ: (فَقَـأَ وفَقّـأَ الدُمَّـلَ فَقْـأً وتَفْقِئَةً):

دومەڵەکەی هەڵدڕیو دەرکرد.

(-العَينَ): ١-چـاوی هەڵکۆڵی/ چاوی دەرهێنا ٢-چاوی کوێرکرد.

(-فُـلانٌ ناظِرَيـهِ): توورەییەکـەی دامرکاندەوە.

(تَفَقَّأ): ١-هەڵکۆڵرا ٢-قڵیشقڵیشبوو/ شەقارشەقار بوو.

(-فُلانٌ شَحْماً): بەزی هێندە گرت پێستەکەی قڵیشا.

(إنْفَقَـأ): ١-هەڵدرا ٢-کوێر بوو ٣-شـەقیبرد/ قڵیشا.

(ألفَقْء (ج) فُقُوء): پێسـتێکی تەنکە لە کاتی بوونی سـاوادا لە عاستی سـەری یان لووتیدا شەقدەبات.

(ألفَقـيء (ج) فُقآن): چاڵە لەبەرد دا یان لە زەویی ڕەقەندا ئاوی تێدا کۆدەبێتەوە.

(ألفُقْأة والفاقِئاء): پێسـتێکی تەنکە لە کاتی بوونی سـاوادا لە حاستی سـەری یان لووتی کۆرپەکەدا شەقدەبات.

فقح: - فَقَحَ وفَقَّحَ- الجَرو فَقْحاً): تووتەڵە سەگەکە چاوی (تروکا/ کردەوە).

(-النَباتُ): ڕووەکەکە شکۆفەیکردو گوڵیگرت.

(تَفقَّـحَ- في الـكَلام أو تَفقَّـحَ عُمومـاً): دەمیکردەوە بدوێ یان هەر دەکیکردەوە.

(ألفَقحَـةُ (ج) فِقاح): نەڵقەی پاشـین کە لە کاتی پێویستدا دەکرێتەوە.

(-مِنَ النَبتِ): گوڵی ڕووەك.

الفَقْحَةُ والفُقاحَة: بەریدەست/ لەپیدەست.

(ألفُقّـاحُ- مِـن كُلِّ نَبـتٍ): گوڵـی هەموو ڕووەکێك.

٢-(تَفَقَّحَ): خۆی بـۆ بەدیی‌و خراپە ئامادە کرد.

(«فُـلان مُتَفَقِّح لِلشَّـرِّ»): فیسـار ئامادەی بەدی‌و خراپەیە.

٣--تَفاقَـحَ- القَـومُ): خوێشـگەل پشـتیان بـە پشـتی یەکـەوە نـا (وەك چـۆن دەڵێن (تَقابَلـوا) یەکتریانـدی و(تَظاهَـروا) خۆ پیاشندانیانکرد.

فقـد: (فَقَـدَ- هُ. فَقْـداً وفِقْدانـاً وفُقْداناً وفُقُـوداً): ونیکـرد/ لەبەرچـاوی نەمـا/ لەدەستیچوو.

(أفْقَـدَ-هُ الشـيءَ): شـتەکەی (لەدەسـتدا/ لێونکرد).

(تَفَقَّدَ-هُ): بۆیگەڕا/ سۆراخیکرد.

(تَفاقَدَ- القَومُ): خوێشگەل لەیەك ونبوون/ یەکتریان ونکرد/ لەیەکتر بزربوون.

(إفْتَقَدَ-ه): ١-ونیکـرد ٢-بۆیگەڕا/ داوایکرد/ سۆاغیکرد/ بەدوایدا وێڵبوو.

(«مـا افتَقَدْتُـهُ مُنـذُ افْتَقَدتُـهُ»): لـەو ڕۆژەوە ونمکـردووە بـۆی نەگـەڕاوم‌و بیرم لێنەکردۆتەوە.

(إسْـتَفقَدَ- المَريـضَ) (عامية): سـەری لە

نەخۆشەکەداو هەواڵی پرسی/ دیداریکرد.
(ألفاقِد): ١-ونکردوو/ لەدەستچوو/ لەدەستداو ٢-ژنی کۆستکەوتوو/ مێرد مردوو یان زارۆڵە مردوو.
الفَقید= المَفقود: مردوو/ ونبوو/ لەدەستچوو.
(«ماتَ غَـیرَ فَقید أو غیر مَفْقُـودٍ»): مرد بینەوەی بەدەربەسـیەوە بێن/ بە تەنگیەوە بێن/ بیریبکەن.
فقر: ١-(فَقَرَ. فَقْراً): هەڵیکەند.
(-الشيءَ): شتەکەی ڕوشاندو کاری تێکرد.
(-عَینَـهُ) (عامیـة): چـاوی (هەڵکۆڵـی/ دەرهێنا).
(فَقَّرَ): هەڵیکەند/ هەڵیکۆڵی.
(-ألفَسیلَةَ): بۆ بێچوولەکە چاڵی هەڵکەند تا تیایدا بینێژێت/ بیروێنێت.
(-الشيءَ): شتەکەی قڵیشاندو کاری تێکرد.
(ألفَقَر (ج) أفْقُر): درزو کونو قڵیش.
ألفُقُـر: ڕیـزە بـیر کە لـە ژێـرەوە بەیەك دەگەیەنرێنو دەبێتە کارێز.
(ألفُقْرَ (ج) الفُقَرْ وفُقُرات): چاڵ.
(ألفِقْرَةُ (ج) فِقَرْ): جۆرە هەڵکەندنێکە.
ذو الفَقـار: نازنـاوی شمشـێرەکەی ئیمامی عەلیە.
(ألفَقـیر (ج) فُقَـر): ١-چاڵێکـە بێچوولەی دارخورمای تێدا دەنێژرێت.
(ألبیش) (عامیة)= الفَقیر: چاڵی بێچوولەی دارخورما ٢-دەمی کارێز/ دەمی جۆگە.
(رَکِیَّـةٌ فقـیرَة): چاڵاوێکـی/ بیرێکـی هەڵکەنراو.
(ألمُفَقَّر- مِنَ السیُوف): شمشێرێك دەمەکەی درزی تێدابێتو بربر بووبێت.
٢-(فَقَرَ- تْـهُ الداهِیَةُ. فَقْـراً): وەیی گران گرفتاریکرد وا وەك بربرەی پشتی بشکێنێت.
(-الخرزَ): مووروومەکەی بۆ هۆنینەوە کونکرد (لە بربرەوە وەرگیراوە).
(فَقِرَ. فَقَراً): هاواری بربرەی پشتیکرد سا یا بە هۆی شکاندنیەوە یان نەخۆشییەوە.
(فَقیر وفَقِر ومَفْقُورٌ): پشتیەشـاو/ کەسێکە ئازاری بربرەی پشتی هەبێت.
(فَقَّرَ-تْـه الداهِیَـةُ): چورتومـی سـەخت بەسەریدا داباری وەکو پشتی بشکێنێت وابوو.
(-الخَرَزَ): مووروومەکەی کونکرد.
(أفْقَـرَ- ظَهـرُ- المُهْـرِ): جوانووەکـە دەمی سواربوونی هات.
(-هُ الصَیـدُ): نێچیرەکە لە تەنشـتەوە خۆی خستە قەمچی ڕاوکەرەکەوە.
(-هُ ظَهرَ مُهْرِه): جوانووەکەی بە خواستن دایە.
(-هُ الأرضَ): زەویەکـەی بەخواسـتن دایـە کشتوکاڵی تێدا بکات.
(الفاقِرَةُ (ج) فَواقِر): چورتوومی سـەختو وەیی گرانی پشتشکێن.
(ألفَقْر (ج) فُقَر): تەنشت/ لا.

(أَلفُقْــرَةُ (ج) فُقَر وفُقُــرات): ١ لێقەومانی گەورە/ بەسەرهاتی سەخت ٢-نزیکیی.

(«هو مِنكَ فُقْرَةٌ»): ئەو لێتەوە نزیکە.

(أَلفَقْــرَةُ (ج) فِقَــر): گرێیەك لــە گرێکانی بڕبڕەی موورەغەی پشت.

(أَلفِقْرَةُ (ج) فِقَر وفِقْرات وفِقَرات): گرێیەك لە گرێکانی بڕبڕەی پشت.

(أَلفِقْــرَةُ (ج) فِقَــر): ١-جوانترێــن دێــڕی هەڵبەســتێك بــە گرێیەکــی بڕبڕەی پشــت چوێنراوە ٢-قســەیەکی خۆش یان جوانترین ڕستەی ئاخاوتنێك کە هەڵبژێررابێت.

(أَلفَقــارَةُ (ج) فَقــار): گرێیەکــی بڕبــڕەی پشت.

(فَقارُ الجَوزاءِ): هەسارەکانی برجی ترازوو.

(أَلفَقاريُّ): بڕبڕەیی.

(أَلفَيْقَر): وەی/ چورتوم/ بەلاّ.

(أَلمُفقِــر): ١-پیــاوی بەهێــزو پشــتقایم ٢-جوانوویەك کاتی سواربوونی هاتبێت.

(أَلمُفَقَّر): بەهێزی پشتقایم.

(رجُلٌ مُفَقَّــرٌ): پیاوی بەتواناو دەســەلاّتی هەموو کارێك کە پێی بسپێردرێت.

٢-(فَقُرَ. فَقارَةً): هــەژارو نەدار بوو/ نەبوو بوو.

(أَفْقَرَ-هُ): هەژاریکرد/ نەدارایکرد.

(تَفاقَــرَ): خۆی نــەدارو هەژار پیشــاندا بە دەمیش وایوت.

(إِفْتَقَــرَ): نــەدار بــوو/ نەبوو بــوو/ هەژار کەوت.

(-إِلَيهِ): پێویســتی بەوە بوو/ نەبووی ئەوە بوو.

(فَقــير (ج) فُقَراء (م) فَقــيرَة (ج) فَقيرات وفَقائِــر وفُقَــراء): هەژار/ نــەدار/ نەبوو/ نەدار/ دەستکورت.

(أَلفَقْــر (ج) فُقُــور ومَفاقِــر): ١-هەژاریی/ نەداریی/ دەستکورتیی/ نەبوونیی ٢-مەراق.

(أَلفُقْــر (ج) فُقَــر): هەژاریــی/ نەدارایی/ نەبوونی.

(أَلفَقير (ج) فُقَراء (م) فَقيرَة (ج) فَقيرات و فَقائِر وفُقَراء): نەبوو/ هەژار/ دەستکورت.

(أَلمُفاقِر): شێوەو جۆری هەژاریی/ جۆرەکانی نەبوونییو نەداریی (ئەم وشــەیە تاکی نییە دەڵێن ئەمە کۆی وشــەی(فَقْر)ە. دەیشــڵێن ئەمە کۆی وشەی(مَفْقَرَة) یە.

٤-(أَلفُقْرَة (ج) فُقَر وفُقُرات): سەری کراس/ ملیوانی کراس.

(أَلفِقْرَةُ (ج) فِقَر): نیشانەیەك کێو بێت یان شتێکیتر بێت.

فقس: ١-(فَقَسَ- البَيضَةَ فَقْساً): ١-هێلکەکەی بەدەست شکاند ٢-لەتیکرد.

(-الطائِــرُ بَيضَتَــهُ): باڵندەکــە هێلکەکەی ترەکاندو بەچکەکەی لێدەرهێنا.

(-البارودَةَ) (عامية): بارووتەکەی تەقاند.

(فَقَّسَ- السـمْنَ فَتَفَقَّسَ): رۆنەکەی خستە سەر ئاگرو قاڵیکردو کەفو پیسیەکەی لێگرت (عامیە).

(تَفَقَّـسَ- وانفَقَـسَ- الشـيءُ): شـتەکە هەڵگەڕایەوە/ ژێرەوژوور بوو.

(تَفاقَسَ الوَلَدانِ): دوو کوڕەکە یاریی هێلکە شـکاندنیانکرد. هەریەکـە هێلکەکـەی بـە هی ئەویتردا کێشـا کـێ هێلکەکەی ئەویتری شـکاندو هینەکەی خۆی نەشکا ئەوە براوەیە هێلکەکەی ئەویتر بۆ خۆی وەردەگرێت.

(اَلْمُفاقَسَة): یاریی شەڕە هێلکە (عامیە).

اَلْمَفْقاس: داری تەڵەکـە بەر باڵندەکە کەوت. کاتێـك داوەکە هەڵدەگەڕێتـەوە باڵندەکە بە تەڵەکەوە دەبێتو دەگیرێت.

٢-(فَقَسَ- الرَجُلَ. فَقْسـاً): پیاوەکەی بە قژ بەکێشکردە خوارێ.

(-الشيءَ): شتەکەی دەرکێشاو برد.

(-هُ عَـنِ الأَمـرِ): بە زۆر لـە کارەکەی لاداو دووریخستەوە.

(-فُقُوساً): راپەڕی.

(تَفاقَـسَ= الرجـلان): دوو پیاوەکە بە قژ یەکتریـان (بۆ زەوی بەکێشـکرد/ ڕاکێشـایە خوارەوە).

(فَقَسَ- الحيـوانَ. فَقْسـاً): زیندەوەرەکەی کوشت.

(-فُقُوساً): لە پڕ مرد.

٤-(فَقَسَ-هُ. فَقْسـاً) (عامية): وایلێکرد کرژ بێت کە لە پێشدا خاوو بوو.

(الفُقاس) (طب): دەمردە جومگە.

٥-(الفَقُّـوس الواحِدَةُ فَقُّوسـةٌ) (ن): جۆرە کاڵەکێکە.

فقش: (فَقَشَ- البَيضَةَ. فَقْشـاً): بەدەسـت هێلکەکەی شکاند.

(شَـجَرُ فاقِش) (عاميـة): درەختێك بەری پێوە نەبێت.

(فَقْشَـةُ الثَوب) (عامية): تلێشـی کراس لە دامێنیداو بستێك بێت بۆ ئاسانکردنی هەنگاو دەکرێت.

فقص: (فَقَصَ وفَقَّصَ البَيضَةَ ونَحوَها فَقْصاً): ١-هێلکەی بەدەست شکاند ٢-دوولەتیکرد.

(فَقيصَة ومَفقوصَة): هێلکەی بەدەست شکاو یان دوولەتکراو.

(تَفَقَّصَ وانْفَقَـصَ-تِ البَيْضَةُ عَنِ الفَرخِ): هێلکەکە تررووکاو جووجکەکەی لێدەرهات.

فقط: (فَقَّطَ- الحسـابَ) (ت): وشەی تەنها یـان هەر ئـەوە یان ئەوەندەو بەسـی لە پاڵ ژمێرەکـەدا نووسـی پـاش دیاریکردنی بڕی پارەکـە لە ترسـی گۆڕیـنو یاریکـردن بە ژمێرەکە.

(فقط): وشەیەکی لێکدراوە لە (ف) و (قط) واتاکەیشی: هەر ئەوەیەو هیچیتر نییە.

(«رَأَيتُهُ مَـرَّةً فقط»): هـەر تەنها جارێك

ديم.

فقع: (فَقَعَ- لَوْنُهُ فَقْعاً وفُقُوعاً): ڕەنگەکەی ســافو ڕوونو پاك یان زەردێكــی زۆر زەرد بوو.

(فَقِعَ فَقَعــاً): زۆر زەرد هەڵگەڕا/ ڕەنگەکەی زۆر تێر بوو ٢-سوور بوو/ سوور هەڵگەڕا.

(فَقَّــعَ- الأَديــمَ): ڕەنگــی چەرمەکــەی سوروکرد.

(تَفاقَعَت-عَينــاهُ): هــەردوو چــاوی ســپی هەڵگەڕا.

(أَلفاقِع) (فا): پاكو ساق هەموو ڕەنگێك بە تایبەتی ڕەنگی زەرد.

(أَلفاقِعَةُ (ج) فَواقِع): مێی وشەی (الفاقِع).

(أَلفَقْــع والفِقْع (ج) أَفْقُــع وفُقُوع وفِقْعَة): دوومەڵانی نەرمی سپی.

(أَلفَقَع): زۆر سپی.

(لَونٌ فُقاعِي): ڕەنگێكی زۆر تێر.

(أَبْيَضُ فُقاعِي): سپییەكی زۆر سپی.

(الأَفْقَع (م) فَقْعاء (ج) فُقْع): زۆر سپی.

(أَلفَقيــع الواحِــدَةُ فَقيعــة (ح): ڕەگــەزە كۆترێكە زۆر سپییە.

(أَلفَقيع): پیاوی سورو.

٢-فَقَعَ- الرَجُلُ. فَقْعاً وفُقُوعاً): لە گەرماندا مرد.

(فَقَعَ- فُــلانٌ) (عامية): لــە داخدا مرد بە ڕاستی بێت یان بە خوازە.

(فَقَعَتْــهُ الفَواقِــعُ فَقعــاً): وەی/ چورتوم/ لەناویبرد/ فەوتاندی.

(فَقَّعَ-هُ فَماتَ فَقعاً- في اصطلاح العامة): بە وتەی ڕەشە خەڵكەكە داخو ناسۆر (فەوتاندی/ كوشــتی/ لەناویبرد) (بە ڕاست یان بە خوازە فەوتاندی).

(أَلفاقِعَةُ (ج) فَواقِع): چورتووم/ وەی/ بەڵا/ ئاپۆرە.

٣-(فَقَــعَ- الغُــلامُ. فَقْعــاً وفُقوعــاً): مێردمنداڵەكە پێگیەشتو بوو بە هەرزەكار.

٤-(فَقَعَ- الشيءَ. فَقْعاً): شتەكەی دزی.

٥-(فَقَعَ- الشــيءُ فَقْعاً) (عامية سريانية): شتەكە شەقیبردو شەقەی لێوەهات.

(فَقَّعَ): پڵتەپڵتێكیكرد/ دەنگێكی لێوەهات كە واتای نەبوو كەسو تێینەگەیشت.

(-أَصابِعَهُ): پەنجەكانی تەقاند.

(-الوَرْدَةَ): گەڵای گوڵەكەی تەقاند. خســتیە سەر دەستێكیو بە بەری دەستەكەیتری پیایدا كێشاو تەقەی لێوەهات.

(إنْفَقَعَ): شەقیبرد/ تەقی.

(فَقْعَ- الذِئبَ) (ن): قارچكە گورگانە: جۆرە قارچكێكــی گەورەی شــێوە خڕەو ســپییەو باریــك زۆر جــۆری هەیە بۆیــە وا ناونراوە چونكە هەر لەگەڵ دەســتتدایە شــەق دەباو تۆزی لێدەبێتەوە.

(أَلفُقّاع): جۆرە خواردنەوەیەكە شــەرابێكە

لـه جـۆ يـان لـه بـەرى درەخـت/ ميوە، دروستدەكريّت (بۆيە وا ناونراوە چونكە كەف بەسەرەوە دەبيّت).
(أَلفُقَّاعِيّ): فرۆشـيارى ئاوى جۆ يان شەرابى جۆو ميوە.
(أَلفَقاقيع): بڵقەكانى سەر ئاو.
(فُقَاعَة): بڵقيّكى سەر ئاو.
٦-(أَفْقَـعَ): ١-هەژاركەوت/ نەبوو بوو/ نەدارا بوو ٢-بارى گوزەران و بژيّويى خراپبوو.
(أَلفَقع): هەژاريى.
٧-(أَلفَقَّاع): زۆربەد/ ناپاك و پيس/ بەدخواز.
(أَلفِقِّيع الواحِدَةُ فِقيعَة) (عامية): هەنجيرى نەگەييو/ كاڵ.
فقـل: (فَقَلَ- البَيدَرَ فَقْـلاً): خەرمانەكەى شەنكرد.
(أَفْقَلَ- المَكانُ): شويّنەكە دەرامەتيدا.
(الفَقل) (مص): دەرامەت/ قازانج/ سوود.
أَلمِفْقَلَة (ج) مَفاقِل: شەن.
فقـم: ١-(فَقَمَ وتَفَقَّـمَ- الرجـلَ أَو الكَلبَ فَقْماً): ريشى كابرا يان لۆزى سەگەكەيگرت.
(فَقِـمَ- الرَجُـلُ. فَقَمـاً وفَقْمـاً): كاكيلەى سـەرەوەى دەرپەڕيبـوو نەدەنيشـتە سـەر كاكيلەى خوارەوە.
(أَفْقَـم (م) فَقْمـاء (ج) فُقْـم): كەسـيّكە كاكيلەكانـى لە ريّكى يەك نەبن و نەنيشـنە سەريەك.
(أَلفَقْـم والفُقْـم): ١-لايەكـى لۆزى سـەگ ٢-كاكيلـە/ چەنە يان كاكيلەيـەك. يان ريش يان لايەكى ريش.
(أَلفُقُم): دەم.
(أَلفُقْمَةُ (ج) فُقْمات وفُقَم) (ح): گويّرەكەى ئاويى لە زيندەوەرە شـيردارەكانە خاوەن دوو سـييە لە دەريا باكوورييەكانـدا دەژى لۆزى لوولەييـە كەڵبەى نييە سـوود لە پيّسـت و رۆنەكەى وەردەگيريّت.
٢-(فَقِمَ- الأَمرُ فَقَماً فَقْماً وفُقُوماً): كارەكە زۆر گرنـگ و ئاڵـۆز بـوو/ خواروخيّچبوو/ لەدەست دەرچوو.
(أَفْقَـم): كارى گرنـگ و ئاڵـۆزو ناراسـت/ لەدەستدەرچوو.
(أَفْقَمَ- الرَجُلُ. فَقَماً وفَقْماً) كابرا چەتوون و شەرەنگيّز بوو لە خۆى بايبوو.
(فَقُـمَ- الأَمرُ فَقامَـةً): كارەكە زۆر خراپ و ئاڵۆزو ناراستبوو/ خوار رۆيشت.
(أَمرٌ أَفْقَم): كارى تيّكچوو ئاڵۆزو ناراست.
(أَفْقَـمَ- الشـيءُ): شـتەكە فراوانبـوو. فراوانبوو.
(تَفاقَـمَ- الأَمرُ): كارەكە ئاڵۆز بوو/ شـيّواو ناراستبوو/ لەدەست دەرچوو/ كار لەكارترازا.
٣-(فَقِمَ- الإناءُ فَقْماً): قاپەكە پڕ بوو.
(«أَكَلَ الرَجُلُ حَتى فَقِمَ»): هەر خواردى تا ئينتەلايكرد/ تلخەيكرد.

(اَلفَقِم): پیاوی تێگەیشــتوو وریا كە بەسەر ناحەزەكانیدا زاڵدەبێت.

فقه: (فَقَهَ- الرَجُلَ فَقْهاً): لە زانستدا بەسەر پیاوەكەدا زاڵبوو/ لەو زاناتر بوو.

(فَقِــهَ. فَقَهــاً): فێربــوو/ بــوو بــە زانــاو تێگەیشت.

(فَقِــهَ- الشــيءَ أَو الكلامَ): لە شــتەكە یان ئاخاوتنەكە گەیشت/ لێیبەئاگا بوو.

(فَقُهَ. فَقاهَةً): زانا بوو و تێگەیشت.

(فَقیه): زانا/ تێگەیشتوو بە ئاگابوو.

(فَقَّــهَ وأَفْقَــهَ- فُلانــاً): فیســاری فێركردو تێگەیاندو كردی بە زانا.

(فاقَهَ- فُلانــاً): لەو زاناترو تێگەیشــتووتر بوو/ لەو زۆرتر شارەزا بوو.

(تَفَقَّــهَ- الرَجُــلُ): لــە زانســتی ئایینــیو ڕێوشــوێنیدا خۆی شــارەزاو زانا كردو كاری پێكرد.

(-الشيءَ): لە شتەكە گەیشت.

(اَلفِقه): ١-لە شت گەیشتنو زانین پەیداكردنی ٢-زانابوون لە كاروبارو شــوێنی شــەریعەتو بەڵگــەو دەوســتووری تــەواوی ٣-كارامەییو هوشیارییو زرنگیی.

(اَلفَقِهُ والفَقُهُ والفَقیــهُ (م) فَقِهَةٌ وفَقیهَةٌ (ج) فُقَهــاء فَقائِــه): ١-كەســێك كــە زۆر تێگەیشــتوو بێت زانایەكی زیرەكو زرنگبێت ٢-زاناو شارەزای شــەرعو دەستووری ئایینیو ڕێو شوێنی.

(اَلْمُسْــتَفقِهَةُ): ئافرەتێــك كــە بــە ســۆز بلاوێنێتەوەو كاریكاتە سەر دڵی خەڵك.

فقو. (فَقَا- أَثَرَهُ. فَقْواً): شوێنپێی هەڵگرت/ دوای ئەو كەوت.

فكّ: (فَكَّ- الشَــيءَ فَكّاً): شــتەكەی لە یەك هەڵوەشاند/ پارچەكانی لە یەك جیاكردەوە.

(-العُقْدَةَ): گرێكەی كردەوە.

(-العَظمَ): ئێسكەكەی (لەجێبرد/ لەخرتكەبرد).

(-الخَتْمَ): مۆرەكەی لێكردەوەو شكاند.

(-اللُغْزَ) (عامیــة): مەتەڵەكــەی هەڵهێنا/ دۆزییەوە.

(-عَدداً أَو عِبــارَةً جَبرِیَّة) (ع ح): ژمارەكە یان دەربڕە جەبرەكەی شیتەڵكرد وەك ٣٠ بۆ ٢×٣×٥ هاوكێشەكەی (ع ح) شیكردەوە.

(فَكَّ- الأَسَــیر. فَكّاً وفِكاكاً وفَكاكاً): دیلەكەی (ئازاد كردو ڕزگاركرد/ بەرەڵا كرد).

(-یَدَهُ): دەستی كردەوەو بەردا.

(-إدغــامَ الحَــرفِ): تێهەڵكێشــی وشــەكەی هەڵوەشاندەوە وەك: (لاتَمْدُدْ) كە (لاتَمُدَّ)یە.

(-الرَهنَ- فَــكّاً وفُكوكاً): شــتە بارمتەكەی دەرهێناو پارەی بارمتەكردنەكەیدایەوە.

(-الرَجُلُ): پیاوەكە تەواو ئیختیارو پەككەوتە بوو.

(-العَظــمُ. فَــكّاً وفَــكَكاً): ئێســقانەكە (لە جێچوو/ لە خرتكە چوو).

(-فَكاً وفَكَّةً): گەوجبوو/ سستو بێهەستبوو.
(فَكَّ-هُ):١-جیایکردەوە/ رزگاریکرد ٢-شیتەڵیکرد.
(-حَلَّلَ عَـدداً أو عِبارةً جَبرِيَة): ژمارەیەکی یان دەربڕە جەبرییەکی شـیتەڵکرد وەك (ع ح) وەك گۆڕینی ژمارە (٣٠) بۆ = ٢×٢×٥.
(فَكَّ- المعادَلَة): هاوکێشەکەی شیتەڵکرد.
(أفَكَّ- الظَبيُ مِن حِبالِهِ): ئاسکەکە خۆی لە داوی ڕاوەکە کردەوە/ بەرداو دەرباز بوو.
(تَفَكَّكَ):١-بەرەڵا بوو ٢-لێکهەڵوەشا.
(-المُخَنَّثُ):١-نێـرە مووکەکە لـە گەوجیی خۆیـدا شـلو شـێواو خۆنەگرتـوو بـوو ٢-ڕۆیشـتنێکی بێشـەرمو شـکۆو بێنابڕوانە ڕۆیشت بەرەڵایانە ڕۆیشت.
(إفْتَـكَّ- الرَّهْـنَ): بارمتەکـەی (دەرهێنا/ کردەوە).
(إنْفَـكَّ):١-بەربـوو/ بـەرەڵا بـوو ٢-ترازا/ هەڵوەشا/ لێکجیابووەوە.
(-العَظْمُ):ئێسقانەکە (لە شوێنی خۆی ترازا/ لەجێچوو/ لە خرتکە چوو).
(-العَبدُ): کۆیلەکە ئازاد بوو/ بەردرا.
(ماإنْفَكَّ يَفعَلُ كذا»): هێشـتا هەر خەریکی ئەوەیەو ئەوە دەکات.
(إسْـتَفَكَّ):١-داوای (بـەردان/ بەرەڵاکردن/ ئازادکردن)ی کرد ٢-داوای هەڵوەشانەوەیکرد.
(ألفـاك (فـا) (ج) فِكَكـة وفِـكاك):١-زۆر ئیختیارو پەککەوتە ٢-زۆر گەوج.

(ألفَكّ (مص) (ج) فُكُوك): کاکیلە/ شەویلکە/ کە دوانن کاکیلەی سەرەوەو خوارەوە.
(ألفَكَّةُ): تێکچوون/ کار شلبوون/ سستبوون.
(«في فلان فَكَّةٌ»): فیسـار خاوە/ سسـتە لە ڕادەربڕیندا.
(الفِـكاك والفَـكاك): ئـەوەی بارمتەکـەی پێدەردەهێنرێـت یـان دیلەکەی پـێ بەرەڵا دەکرێتو هی لەو بابەتانە.
(الفَكّاك): ئازادکار/ بەرەڵاکارێکی بەدەسـت، هەڵوەشێنێکی بەتوانا.
(ألأفَكّ (م) فَكّاء (ج) فُكّ): کەسێکە جومگەی شـوێنێکی لـە خرتکە چووبێـت/ جومگەی لەجێچووبێت.
الملحق:
فـك: (المِفَـك): جەربـادەر کـە بورغـووی پێدەکرێتەوە یان قایمدەکرێت.

فكت: (فِكتوريا، فَلَكِيَّة) (ن): گەنمەشـامیی ئاویـی/ شـالیلۆپەر. ڕووەکێکـی ئاوییـە لە ئەمەریـکای کەمەریدا زۆرە لـە زەلکاوەکاندا دەڕوێت گەڵاکەی زۆر گەورەیە تیرەی گەڵایەکی سەر ئاوی دوو مەترە دەبێت لەوانەیە منداڵێك بتوانێت لەسەری بووەستێنێت بەرگەی ئەوە بگرێت.
فكر: ١-(فَكَرَ وفَكَّرَ وأفْكَرَ وتَفَكَّرَ- في الأمرِ): بیری لە کارەکە کردەوە لێوردبووەوەو ڕاما/ لێکۆڵییەوە.

(إِفْتَكَرَ- فِي الأَمرِ) (عامية): بیری لە کارەکە کردەوەو لێیراما.

(أَلفِكــر (ج) أَفْكار): ١-هــزر/ بیروبۆچوون/ کردەی مێشــك بــۆ کارێك کــە تێبیگات یان چارەسەریبکات ٢-ئەوەی بەدڵدادێت.

(«لي في الأَمرِ فِكرٌ»): من بیروبۆچوونێکم لە کارەکەدا هەیە.

(«مالي في الأَمرِ فَكْرٌ أَو فِكْرٌ»): بیرم لەو کارە نەکردۆتەوەو پێویستیشم پێی نییە.

(أَلفِكْرَةُ والفِكْرى (ج) فِكَر): هزر/ بۆچوون/ بیر ئەوەی بەدڵدا دێت.

(أَلفِكِّير والفَيكَر): بەبیرو هزر/ کەسێکە زۆر بیربکاتەوەو لە شت رابمێنێت.

٢-(أَلفاكورَة (ج) فَواكير) (سريانية): دەرگاگیر دارێکــە دەدرێتە بەر دەرگا یــان پەنجەرە کە نایەڵێت لەخۆیەوە بکرێتەوە.

الملحق:

فكــر: (التَفكــير): بیرکردنــەوەو تێرامــان کاری مێشــکە کە ئــەوەی پێــدا تێدەپەرێت بیربێت ئەندێشــە بێت وێنە بێــت هەڵگێرو داگێریدەکات/ وێقلەمەیدەکات/ ورد سەرنجی لێدەدات و لێی رادەمێنێت و بەراوردی دەکات.

(ألإِستِغراق في التفكير): قووڵ بیرکردنەوەو بە شــتەوە خەریکبــوون. (تکویــن الرَّأي): راپێکەوەنان.

(«تَفكــير صحيح»): بیرکردنەوەی راســت و دروســت و بەجێ کە کاری مێشکە لە کارێکدا بۆ چارەسەرکردنی.

(«أَلتَفكير في الخُرُوج مِن مَأْزَق»): بیرکردنەوە بۆ ئەوەی لە کێشــەیەك لــە تەنگانەیەك لە هەڵوێستێکی خراپ دەربچێت.

(أَلمُفَكِّــرَة): دەفتــەری یاداشــت/ بیرنامــە دەفتەرێکی بچووکە ئەوەی تێدا دەنوسیت کە بتەوێت بیرتبکەوێتەوە.

فكع: (فَكَعَ. فَكْعاً وفُكُوعاً): دوای رۆژبوونەوە رۆیشــت/ زوو رۆیشــت/ زوویکــرد. («ذَهَبَ فَمايُــدري أَينَ غَــدا): رۆیشــت و نازانرێت روویکردە کوێ و لە کوێیە.

(فَكِعَ- الرَجُــلُ. فَكْعاً وفُكُوعاً): دۆشــداماو ســەری نەویکرد لــە داخ و خەفەتــدا یان لە رقاندا.

(أَلفَكْع): کوکە/ کۆکین.

فكل: (إِفْتَكَلَ- فِي فِعْلِهِ): بەتەنگ کارەکەیەوە هات و بە خۆشییەوە کردی.

(أَلأُفكَل): ١-کۆمەڵێك خەڵك.

(«جــاءَ القَــومُ بِأَفْكَلِهِــم وبأَفاكيلِهِــم»): خوێشــگەل بە کۆمەڵ هاتن یــان هەموویان هاتن ٢-لەرزین.

(«أَخَذَهُ أَفْكَلٌ»): لەرز گرتی/ لەرزی لێهات لە لەتاو سەرما یان لە ترساندا.

(أَلمَفكُول): لەرز گرتوو/ لەرز لێهاتوو.

فكــن: (فَكَنَ- فِي الكَذِبِ فَكْناً): لە درۆکردندا

زیادڕەویکــردو لەســەری ڕۆیشــت/ درۆی شاخداریکرد.

(تَفَکَّنَ):١-سەرسامبوو/ حەپەسا ٢-بیریکردەوە/ ڕاما ٣-بـۆی شـپرزەو بـە داخـەوە بـوو ٤-پەشیمانبووەوە.

فکه: ١-(فَکِهَ. فَکَهاً و فَکاهَةً): ڕووخۆشـبوو خۆشمەشـرەف بـوو/ دەمبەپێکەنـین‌و سوعبەتچی بوو/ گەمەکار بوو/ قۆشمە بوو.

(فاکِـهٌ وفَکِـهٌ وفَیْکَهان): خۆشمەشـرەف/ ڕووخـۆش/ سـوعبەتچی‌و دەمبەپێکەنین/ گەمەباز.

(فَکِهَ- مِنهُ): بەلایەوە سـەیر بوو/ سـەیری لێهات/ سەری لێسوڕما.

(-للشيءِ): سەری لە شتەکە سوڕماو بەلایەوە سەیر بوو.

(«لو سَـمِعْتَ حَدیثَ فُلان لَما فَکِهْتَ لَهُ»): ئەگەر گوێت لە قسەی فیسار ببوایە بەلاتەوە سەیر نەدەبوو.

(فَکَّـهَ- الرَجُلَ):١-بە قسـەی خۆش‌و گەمە کابرای هێنایە پێکەنین‌و شـادیکرد ٢-میوەی درەخوارددا.

(فاکَهَ- الرَجُلَ مُفاکَهَةً):(گەمەی/ سوعبەتی) لەگەڵدا کرد.

(تَفَکَّهَ): میوەیخوارد.

(-بالشَّيءِ): خۆشی‌و چێژی لە شتەکە (بینی/ وەرگرت).

(-بِهِ): پێی ڕابواردو کاتی پێبردە سەر.

(-مِنهُ): بەلایەوە سەیر بوو/ سەیری لێهات.

(-بِفُلان): لە پاشـملە بە خراپە باسـیکردو بەدگۆیی دەربارە کرد.

(«تَرَکْـتُ القَومَ یَتَفَکَّهُـون بِعَرضِ فُلان»): خوێنـگەلم بەجێهێشـت کە بە خراپە باسی ناموسـی فیسـاریان دەکردو پێان ڕادەبواردو بەدگۆییان بەرامبەر دەکرد.

(تَفاکَـهَ- القَـومُ): گەمەیان لەگـەڵ یەکدا دەکردو قسەی خۆشیاندەکرد.

(ألفاکِه):١-قسەخۆش/ ڕووخۆش/ سوعبەتچی/ خۆشمەشرەف ٢ میوەدار/ خاوەن میوە.

(الفاکِهَةُ (ج) فَواکِه): ١-مێی وشەی (الفاکِه) ٢ میوە/ هەموو میوەجات ٣-هەموو شـتێکی بەچێژ.

(فاکِهَةُ الشِّتاءِ): ئاگر.

(ألفَکِـه (م) فَکِـهَ (ج) فَکِهـات): ١-دڵسـاف ڕووخـۆش‌و دەمبەپێکەنـین/ قۆشـمە/ گاڵتەچی/ گەمەکارو قسـەخۆش ٢-سەرسـام ٣ چەتوون‌و سەرکێش/ بزێو ٤-میوەخۆر.

(الفاکِهانِيّ): میوەفرۆش.

(ألفُکاهَة والفَکیهَة): گاڵتەوگەپ/ سوعبەت‌و قسەی خۆش.

(ألأفْکَه): زۆر گاڵتەبازو قۆشمە/ زۆر سوعبەتچی.

(«فُـلان مِـن أفْکَـهِ النـاس»): فیسـار قۆشمەترین‌و سوعبەتچیترین خەڵکە.

(الأُفكوهَــة (ج) أفاكيــه): قســەی ســەیرو سەمەرەو خۆشو بەچێژ.

٢-(تَفَكَّهَ): پەشیمانبووەوە.

فل: ١-(فَلَّ وفَلَلَ- السَّيفَ. فَلاًّ): شمشێرەکەی کولکرد.

(-القَــومَ): خوێشــگەلی شــکاندو ڕاوینــان/ بەزاندنی.

(تَفَلَّلَ وانْفَلَّ- السَيفُ): شمشێرەکە کولبوو.

(-القَومُ): شکانو هەڵاتن.

(إفْتَلَّ- السَّيفُ): شمشێرەکە کولبوو.

(إسْتَفَلَّ- السَيفَ): برشتی شمشێرەکەی بڕی/ کولیکرد.

(-الشــيءَ): بچووکترین پارچەی لە شــتەکە کردەوەو وەرگرت.

(ألفَلّ (مص) (ج) فُلُول): کوڵیی یان لێقرتانو لێپەرینی دەمی شمشێر.

(ألفَــل (ج) فُلُــول وفِلال): ١-ئــەوەی کە لە شــتێك ببێتەوەو بپەرێت وەك برشتی ئاسن یان پریشکی ئاگر ٢-کۆمەڵ/ گروپ.

(رَجُــلٌ فَلٌّ وقَومٌ فَــلٌّ): پیاوێکــی هەڵاتوو خویشــگەلێکی هەڵاتوو (تاكو کۆ لێرەدا وەك یەکە). یان بە (أفْلال وفُلُول)کۆدەکرێتەوە.

(ألفَلَــل): کولبوونــی/ دەمخورانــی/ دەمــی شمشێر.

(ألفَلَّة): کولیی/ خوراویی/ دەمی شمشێر.

(كتيبَةٌ فُلَّى): دەستە سەربازێکی هەڵاتوو.

(ألفَليل): کۆمەڵ.

(سَيفٌ فَليل وأفَلُّ ومَفْلُول ومُنْفَلّ): شمشێرێکی دەمکول/ دەمخوراو/ کۆڵ. (مُنثَلِم): کۆڵ.

٢-(فَلَّ عَن فُلانٍ عَقْلُه فَلاًّ): فیســار ئاوەزی تێکچوو پاشان چاکبووەوە.

(-الرَّجُلُ) (عامية): چوو/ ڕۆیشت.

(فَلَّــلَ-هُ) (عاميــة): پاڵی پێوەنــا بڕوات/ ڕەواندی.

(ألفَلَّة): ڕۆیشتن/ لاچوون.

٣-أفَلَّ- القَومُ: لە زەوییەکی وشکدا/ زەوییەکی بێگیاو ڕووەکدا خستیان/ دابەزین.

(-الرَّجُلُ): ســامانو داراکەی لەدەستچوو/ لە زەوی وشکەوە وەرگیراوە.

(ألفَلّ (ج) فَلّ والفِــل والفِليَّة (ج) فَلالِيّ): زەوییەکــی بێپیــت کــە هیچی تێدا ســەوز نەبێت.

(«هو فَلٌّ مِنَ الخَيرِ»): ئەو بێفەڕو بێچاکەیە/ بێخێرە.

٤-(الفُلّ. الواحِدَةَ فُلَّة): ڕاســقی، ڕووەکێکە لــە کۆمەڵــەی زەیتونەکانــەو لــە بەشــی یاســەمینە گوڵێکی هەیە وەك هی یاســەمین زۆر بۆنخۆشەو سپییەکی ڕووتە پێشیدەڵێن: (الياسمين الزَنْبَقي).

(الفَليل والفَليلَة): قژی بەیەکداچوو/ کۆ.

٥-(فَلْفَلَ- الطَّعــامَ): خواردنەکەی بێبەراوی کرد.

(تَفَلْفَــلَ-ت حُلَمــاتُ الضَــرْعِ): (ســەری گوانەکان/ گوێی گوانەکان) ڕەشهەڵگەڕان.

(-شَعْرُ الأسْــوَدِ): قژە ڕەشەکە (تەواو چنگی دایە یەك/ بەیەکداچوو) تەواو لوولبوو.

(ألفِلْفِــل والفُلفُــل) (ن): درەختــی ئاڵەت. درەختێکە لە هندستانەوە هاتووە بە تایبەتی لە خوارووی ئاســیاو مالیزیــادا دەروێنرێت. بەرەکــەی زۆر توونــە. دەهاڕێــت و بــۆ خۆشکردن دەکرێتە خواردنەوە.

(فِلْفِلة): درەختێکی ئاڵەت.

(ألفِلْفِل الکاذب) (ن): گەندە بیبەر درەختێکی جوانە گەڵاکەی هەمیشــە ســەوزەو ئاوێتەیە بەرەکــەی ترێ شــێوەیە ســوورەو لە پیرۆوە هاتووە بۆ جوانی لــە ناوچە گەرمەکانداو لە وڵاتی دەریای ناوەڕاستدا دەروێنرێت.

(ألفُلَیفِلَــة): دەلوبیبــەر ڕووەکێکــی گیایی یەکســاڵەیە لــە کۆمەڵــەی باینجانــە لــە ئەمەریــکای خــوارووەوە هاتــووە بەرەکەی کاتی پێگەیشــتنی سوورهەڵدەگەڕێت بە پێی جۆری بە ســەوزیی دەخورێــت یان ناوەکەی پڕدەکەن و لێدەنرێــت و دەخورێت هەندێکی توونەو هەیشە توون نییە.

(المُفَلْفَل): تیژ/ توون.

(شَــرابٌ مُفَلْفَــل): خواردنەوەیەکی (توون/ تیژ).

(شَعَرٌ مُفَلْفَل): قژێکی زۆر لوول و بەیەکداچوو.

(ألرزّ المُفَلْفَل) (ط): برنجێکی لێنراو کە دانە دانە وەســتابێت و بەهاراتــی تێکرابێت وەك ئاڵەت و بیبەرو بەهاراتیتر.

٦-(فَلْفَلَ): بە هەنگاوی کورت و بەخۆبادان و گەنجەفەوە ڕۆیشت.

(-القَــومُ) (عامیــة): یــەك لــە دوای یەك دەرچوون و ڕۆیشتن.

(تَفَلْفَلَ): (بە هەنگاوی وردو خۆبادانەوە/ بە فیزەوە) ڕۆیشت.

فلت: ١-(فَلَــتَ. فَلْتاً): دەربازبوو/ ڕزگاربوو/ فرتەیکرد/ دەرپەڕی.

(-ەُ): ١-دەربازیکــرد/ ڕزگاریکــرد ٢-بەریدا/ بەرەڵایکرد.

(أفْلَــتَ): دەرباز بــوو،/ دەرپەڕییە دەرەوە/ ڕزگاریبوو.

(-ەُ): دەریپەڕاند/ ڕزگاریکرد.

(-إلی الشــيءِ): هەڵپــەی بــۆ شــتەکە کردو ئارەزوومەندیبوو.

(تَفَلَّتَ): ڕزگاریبوو.

(-الی الشــيءِ): هەڵپــەی بــۆ شــتەکە کردو ئارەزوومەندیبوو.

(إنْفَلَتَ): دەرپەڕی/ ڕزگاریبوو.

(تَبغٌ فَلْــتٌ): توتنی نەپێچــراوە، نەکراو بە جگەرە.

(ألفَلَت): ڕزگاربوون/ دەرپەڕین.

(«مالَكَ مِنهُ فَلَتٌ»): لێی ڕزگار نابیت.

(اَلفَلْتَــةُ (ج) فَلَتات): ١-جارێك ٠رزگاربوون/ دەرپەڕین) ٢-دوا شــەوی مانگە یان دوارۆژی مانگی پێش موحەرەم، چونكە وەكو شتێك لە كۆت رزگاربووبێت وایە، بۆیە وا ناونراوە.

(«هو في بُردَةٍ لَهُ فَلْتَةٍ»): ئەو لە تەنگانەیەكی سووكەدایەو رزگاربوونی دەبێت.

(اَلفَلتِيُّ) (عامية): كەسـێكە خۆی لە گوناه ناپارێزێت/ كەسێكی بەرەڵایە.

(كَســاءٌ فَلــوتٌ): بەرگێكە تەســكە نایەتەوە یەك.

(اَلفالِــت) (فــا) (عاميــة): ١-ئاژەڵــی بەرەڵا ٢-گەنجی بەرەڵای دوای ئارەزوو. هەوەسكەوتوو.

(اَلفالِتَةُ): ١-مێی وشــەی (اَلفالِت) ٢-ئافرەتی بەرەڵای بێخاوەنو نەپارێزراو.

(النَّغمَــة الفالِتَة) (مو): ئاوازێكی مۆسـیقای هەرەمەكــی كە لەســەر دەســتوورو ئاوازێكی رێكوپێك نەڕوات (عامیە)/ ئاوازی گەرەلاوژێ.

(اَلإنْفِلات= الإِنْبِســاط) (ف): ئەزمبوونەوەی پەســتانی گاز لە ماوەیەكــی زۆر كەمدا وەك هی ئامێری هەڵمیو لوولەكی ئوتومبیل.

٢-(فالَتَ - هُ. فَلاتاً مُفالَتَةً): ١-لە ناكاودا/ لە پرێكدا لە بەردەمیدابوو ٢-رێكەوتیكرد.

(تَفَلَّتَ- عليه): ئامبازیبوو/ لێراپەڕی.

(إفْتَلَــتَ- الــكَلامَ): هەروەها قســەكەیكردو دەرپەڕاند/ بێخــۆ ئامادەكردنو بیركردنەوە كردی.

(-الشيءَ): شتەكەی گورج برد.

(-الأَمرَ): كارەكەی بێوەستانو بەپەلە كرد.

(- عَلَيهِ):كارەكەی بێئەو ئەنجامدا.

(أُفْتُلِتَ): لە پڕ مرد.

(-بِأَمــرِ كذا): بەرلــەوەی خۆی بــۆ ئامادە بــكات/ ئامادە بێت كارەكەی بــۆ هاتەپێشو بەسەریدا كەوت.

(-الشيءَ): لە ناكاودا شتەكەی لێبرا.

إِسْتَفْلَتَ- الشــيءَ مِن يَدِهِ: شتەكەی بە زۆر لەدەست هەڵیچڕاندو لێیداگیركرد.

(أَلفَلْتَــةُ (ج) فَلَتَــات): كارێكە لــە خۆیەوە رووبدات بێئامادەبوونو پێشەكی.

(«خَرَجَ الرَّجُلُ فَلْتَةً»): لەپڕ كابرا دەرچوو.

(«حَدَثَ الأَمــرُ فَلْتَةً»): كارەكــە لە پڕێكا/ لەناكاودا بەبێ بۆ ئامادەبوونی روویدا.

(فَلَتاتُ الكَلامِ): هەڵەو زەلەی زمان كە لە پڕ لە دەم دەردەچێت/ تەتەڵەكردنی زمان.

(فَــرَسٌ فَلَتــات (ج) فِلْتــان): چارەوێییەكی چابوك/ خێرا/ گورج.

(رَجُلٌ فَلَتــان): پیاوێكی بێباكــی بێپەروا/ چابــوكو شــەڕانیی/ شــەڕەنگێزو ئامادەی خراپە.

(فَــرَسٌ فُلَتٌ وفُلَّتٌ): چارەوێكیەكی چابوكو خێرا.

فلج: ١-(فَلَجَ الشيءَ فَلْجاً وفُلُوجاً): شتەكەی هەڵقڵیشاندو كوتكوتیكردو بەشیكرد.

(-الحَـرّاثُ الأَرضَ): كێڵەرەكـە زەویەكـەی كێڵاو ئامادەی كشتیكرد.

(-الوالـي الجزيَـةَ بَـينَ القَـومِ وعَلَيهم): (فەرمانڕەواكـە) والییەكە، سـەرانەكەی یان باجی زەویانەكەی بۆ خوێشـگەل دیاریكردن كە هەر كەسە بەشی خۆی بدات.

(فَلِـجَ فَلْجـاً وفَلْجَةً): ١-تووشـی (شـەپلە/ گێریی/ ئیفلیجی) بـوو ٢-میانەی نێوان پێی یان دەسـتی یان دانی زۆرتـر بوو/ لەیەكتری دووركەوتنەوە.

(أَفْلَـج (ج) فَلْجـاء (ج) فُلج): گـۆجو گێر/ ئیفلیج/ گۆتبوو.

(فُلِجَ): تووشی گۆجیبوو/ گێربوو.

(فَلَّجَ- الشيءَ): شتەكەی بەشكرد.

(-الأمْرَ): لە كارەكەی ڕوانییو چارەسەریكرد.

(تَفَلَّجَ): قلیش قلیشبوو.

(إنْفَلَجَ- الصُبحُ): ڕۆژ بووەوە/ بەیانیدا.

(ألفَلْج (ج) (مص) فُلُوج): نیو/ نیوە.

(ألفِلْج): نیوە.

(ألفِلْج والفالِج والفالَج (ج) فَوالِج): پێوەر/ شتپێو.

(ألفَلَجْ) (مص): ١-بەیان/سپێدە ٢-خواربوونەوەی پێ بەلای ڕاستداو ترازانی پاژنە.

(ألفالِج) (طب): ئیفلیجبوونی لایەكی لەشو پەككەوتنی جووڵەو هەستی.

(ألفالِج) (ح): حوشـتری دوو كۆپارە (بۆیە وا ناونراوە چونكە كۆپارەكەی دوو پارچەیە).

(ألفَلّوجة (ج) فَلالیج): زەویی خۆشـكراوی كشتوكاڵ.

(ألفَليجَـة): بەشـێك لە بەشـەكانی دەوار/ خێوەت.

(ألمُفَلَّجَة- من الأَسنان): دانی شاش.

(ألمَفلـوج (ج) مَفالیج): تووشـبووی دەردی گۆتیی/ ئیفلیجیی.

٢-(فَلَـجَ- القَومَ وعلى القَـومِ فَلْجاً وفُلْجاً): بەسەریاندا (زاڵبوو/ سەركەوت).

(-سَـهْمُهُ): تیرەكەی (بردەوە/ سـەركەوت) نیشانەكەی پێكا.

(-الرَجُلُ): ئەوەی ویستی بۆیبوو/ دەستگیریبوو.

(-علـى خَصْمِـهِ): بەسـەر (دوژمنەكەیدا/ ناحەزەكەیدا) زاڵبوو.

(-لَهُ): بڕیاری بەسەر ناحەزەكەیدا بۆدا.

(-بحاجَتِهِ): پێویسـتیەكەی دەستگیر بوو و سەپاند.

(فالَجَ-هُ فَفَلَجَهُ): پێشبڕكێی لە باشەدا لەگەڵدا كردو لێیبردەوە بەسەریدا زاڵبوو.

(أفْلَجَ): بە خواسـتی خۆی گەیشـت/ ئەوەی ویستی دەستگیریبوو.

(-على خَصْمِهِ): بەسەر ناحەزەكەیدا زاڵبوو/ بەزاندی.

(-اللهُ فُلاناً على فُلانٍ): خودا فیساری بەسەر فیساردا زاڵكردو سەرخست.

(-بُرهانَــهُ): بەڵگەکەی پیشـانداو خسـتیە بەرچاو/ پێشکەشیکرد.
(-لي): بڕیاری بەسەر ناحەزەکەمدا بۆدام.
(ألفَلْج) (مص): دەستگیربوونو سەرکەوتن/ زاڵبوون.
(الفَلْج (ج) فُلُوج): مانگ.
(ألفُلْج والفُلْجَة): دەستگیربوونو سەرکەتن/ زاڵوبون/ بردنەوە.
(ألفالِج- مِنَ السهام): تیری براوە.
الملحق:
فلج: (فَلِجَ): تووشــی ئیفلیجیبوو/ تووشــی گۆتیبوو/ تووشی شەپڵە بوو.

فلــح: ١-(فَلَــحَ- الأرضَ. فَلْحــاً): زەویەکەی کێڵا.
(فَلِحَ. فَلَحاً): لچی قڵیشا.
(أفْلَحَ): لچ قڵیشاو.
(ألشَــفَةُ الفَلحــاء): لچی قڵیشــاو. (ج) (فُلْح ألفَلح (ج) فُلُوح): قڵیش.
(الفَلح والفَلَحَةُ): قڵیشێك لە لچدا.
(الفِلاحَــةُ والفَلاحَةُ): کێــلان/ وەرزێری/ جوتیاری.
(الفَــلاّح (ج) فَلاّحَــة وفَلاّحــون): کێڵەر/ جوتیــار/ کشــتیار / وەرزێــر ٢-وڵاخــدار ٣-دەریاوان/ پاپۆڕەوان.
(مُتَفَلِّحُ- الشَــفَةِ أو اليَدَيــن أو القَدَمَين): لچ قڵیشاو یان هەردوو دەستو هەردوو قاچ (قڵیشاو/ ترەکیو) بە هۆی سەرماوەو سارديیەوە.
٢-(فَلَحَ- فُلاناً فَلْحاً): فریویدا/ لەخشتەیبرد.
(-لِلقَــوم وبالقَــوم): لە کڕینو فرۆشــتندا شتەکانی لا شــیرینکردنو جوانکرد تا بیکڕن هانیدانو لاسیدان.
(فَلَّحَ- بِهِ): ١-گاڵتەپێکرد ٢-لە خشــتەیبردو هەڵیخەڵەتاند.
٣-(أفْلَحَ- الرَجُلُ): ١-بە مەرام گەیشت/ ئەوەی دەیویســت دەســتگیربوو ٢-لە کۆششەکەیدا سەرکەوتو کارەکەی سەریگرت.
(-بالشَيءِ): بە شتەکە ژیا.
(إسْــتَفْلَحَ- بِهِ): سەرکەوتو ئەوەی دەستگیر بوو کە دەیویســت (ئەمە لە پێش ئیسـلامدا بــۆ دەســتبەرداربوونی ژنبــوو. پیاوەکــە دەیــوت: (إسْــتَفْلِحي بَأمــرِكِ): خۆت کاری خۆت بەڕێوەبەرە کــە ئەمە ئیدیۆمە/ وتەی جێگیرەو بۆ تەڵاقدانی ئافەرتەکە بووە.
(الفَلَــح والفَلاح): ســەرکەوتن/ دەرچوون/ دەســتگیربوون ٢-باروگــوزەران چاکبــوون ٣-مانەوەو ژیان ٤ ڕزگاریی/ ڕزگاربوون.
(«حَــيَّ على الفَلاح»): پەلە بکەنو وەرن بۆ نوێژکردن.
(ألمَفْلَحَة): مایەی سەرکەوتنو ڕزگاریی.
فلخ: (فَلَخَ- الشيءَ. فَلْخاً): شتەیکەی شەقار کرد/ قڵەشت/ هەڵقڵیشاند.
(-الأمرَ): کارەکەی (ڕوونکردەوەو دەرخست)

یەکالآیکردەوە.

(فَلَّخَ-هُ): لێیدا.

(ألفَيلَخ (ج) فَيالِخ): دەستار.

فلذ: (فَلَذَ- لَهُ مِنَ المالِ شَيْئاً): شتێك پارەی بۆ بڕییەوە.

(فَلَّذَ- الشيءَ): شتەکەی لەتکرد.

(إفْتَلَذَ-هُ المالَ): پارچەیەکی/ بەشێکی ماڵەکەی ئەوی وەرگرت/ برد.

(-مِن فُلان حَقَّهُ): مافەکەی خۆی لە فیسار وەرگرتەوەو لە ژێر چنگی دەرهێنا.

(ألفِلْذ أفلاذ): جگەری حوشتر.

(ألفِلْذَة (ج) فِلَذ وفِلْذ وأفْلاذ): پارچەیەکی جگەر یان پارچە گۆشتێكو پارچە زێڕێكو پارچەی شتێتر.

(أفلاذُ الأرض): گەنجی ناوزەوی.

٢-(ألفالُوذ والفالُوذَج والفالُوذَق (ج) فَواليذ) (ط) (فارسية): پەڵووڵە. لە ئاردو ڕۆنو هەنگوین دەکرێت.

(ألفُولاذ (ج) فَواليذ) (ك) (فارسية): پۆڵا/ ڕەقترین ئاسنە.

(ألمُفَلْوَذ- مِنَ السُّيوف): شمشێری پۆڵاییکراو.

الملحق:

فلذ: (فَوْلَذَ- الحَديدَ): ئاسنەکەی گۆڕی کردی بە پۆڵا.

(-الألَمِنيوم): بەرگی پۆڵای گرتە قاقۆنەکەو یان سەختییو قایمیی پۆڵایدایە.

فلز: (ألفِلِز والفِلِزّ والفِلُزّ): ١-جۆرە مسێکی سپییە ٢-خڵتەی ئاسن ٣-بە هەموو کانزای زەوی دەوترێت ٤-پیاوی توندوتیژی سەرسەخت ٥-چرووك/ ڕژد ٦-ئەو شتەی دەمی شمشێری پێتاقیدەکرێتەوە.

فلس: (فَلَّسَ- القاضِي فُلاناً): دادوەر بڕیاری لەسەر نابووتبوونی فیسارداو جاریدا.

(أفْلَسَ): نابووتبوو/ هیچی نەما. ئەمە وا دەڵێت کە تاکە فلسێکیشی پێنییەو نییە.

(مُفلِس): نابووت. (ج) مُفلِسون ومَفالِيس

ألفَلْس (ج) أفْلُس وفُلُوس: فلس/ پوولەسوورە/ پارچە پارەیەکی مسە.

(«فلان فَلْسٌ مِن كُلِّ خَيرٍ»): فیسار تەواو بێبەرەو هیچ بەرێکی لێناوەشێتەوە.

(فُلوسُ السَمَك): پوولەکەی پێستی ماسی.

(ألفَلاَّس): پووڵگۆڕەرەوە/ پووڵفرۆش.

(ألمُفَلَّس) (مفع): کەسێکە یان شتێکە کە پێستەکەی پەڵەی وەك پوولەکەی ماسیی پێوەیە.

٢-(تَفَلْسَفَ): ١-داناییو فەلسەفەکارییکردو لەسەری ڕۆیشت ٢-لە کارە زانستیەکاندا فەیلەسووفانەو دانایانە لێکیدایەوەو تەماشایکرد ٣-خۆی بە فەیلەسووف شارەزاو دانا نواند.

(ألفَلْسَفَة): ١-دانایی ٢-قووڵو لێزانانەو هونەرمەندانەو زانایانە لە کارە زانستیەکان

بكۆڵرێتەوە ٣ زانستیی شت سەرەتاییانو هۆکاری بوونو پەیدابوونیان ٤-زانیاریی کاری خوداییو مرۆڤایەتیو خۆناسینی مرۆڤ. وشەکە وشەیەکی لێکدراوی یۆنانییە لە وشەی (فیلیا) واتا خۆشەویستیو وشەی(صوفیا) واتا دانایی دەبنە: خۆشەویستیو دانایی.

(الفَیلَسوف (ج) فَلاسِفَة): ١-زانای فەلسەفە/ فەیلەسوف ٢-ئەرستۆ تالیس کە زانایەکی یونانییە لەم بوارەدا.

الملحق:

فلس: (الإفلاس): نابوتبوون/ لە بوونەوە بۆ نەبوونیی لە دەسرۆییەوە بۆ دەستکورتی.

(الإفلاس في القانون): نابووتبوون بە پێی یاسا ئەوەیە بازرگانەکە نەیبێت ئەو، وامانەی لەسەریەتی بیداتەوەو ئەو بەڵێنانەی داویەتی بیبابەتە سەر.

(«إشهار الإفلاس»): جاڕدانی مایەپووچیو نابووتیی کەسێك/ لایەك.

(الإفلاس مَجازاً): بەخوازمیش سەرنەکەوتنێکی پەرێشانەو بێدەسەڵاتیی.

(إفلاس السیاسة الاقتصادیة): تێشکانو مایەپووچیی رامیاریی ئابووری.

(ألتَفلیسَة): ١-نابوتیی/ مایەپووچییو تێشکان ٢-پەیرەوییە یاساییەکانە بەرامبەر نابووتبوویەك دەربارەی ئەو قەرزانەی لەسەریەتیو ئەو داراو ماڵەی کە هەیەتی.

(فَلْسَفَ- الشيءَ): شتەکەی بە فەلسەفە لێکدایەوەو فەلسەفانە تێیروانی.

فلش: (فَلَشَ- الأَمْتِعَةَ وفَلْفَشَها) (عامية سريانية): شتەکەی پەرشو بڵاوکردەوە.

(ألمَفلُوش) (عامية): مرۆڤی پنتی کە نازانێت کاروباری خۆی رێکبخات.

فلص: (فَلَّصَ- الرَّجُلَ): پیاوەکەی قوتارکرد/ رزگارکرد.

(أفْلَصَ وتَفَلَّصَ وانفَلَصَ): رزگاربوو/ قوتار بوو.

فلط: ١-(فَلَطَ- عَنِ الشيءِ. فَلْطاً): لە شتەکە سەرسامبوو/ واقی لێ ورما.

(فالَطَ-هُ): ١-لە ناکاودا لەبەردەمیدا پەیدابوو ٢-رێکەوتیکرد.

(أفْلَطَ-هُ الأَمرُ): لە ناکاودا کارەکە بەرەو رویبووەوە.

(أُفْتُلِطَ- بالأَمرِ): لە پڕ کارەکەی لێپەیدابوو.

(ألفَلَط): لەپڕ/ لەناکاو.

٢-(فَلْطَحَ- القُرصَ. فَلْطَحَةً): خەپلەکەی راخستو پانکردەوە.

(ألفِلطاح= المُفَلْطَح): هێلکەیی لە پانو درێژیدا.

(تَفَلْطُح أو تَبْطيطُ الأَرض): زەوی هێلکە شێوەیی جیاوازیی نێوان هەردوو تیرەی کەمەرەو جەمسەری گۆی زەوی دابەشی تیرەی کەمەرەکەی دەکرێت کە دەکاتە ٢٩٧/١

و هێلکە شێوەیی (بەرجیس/ مشتەری) دەکاتە ١/١٥یە.

فلع: (فَلَعَ وفَلَّعَ- الشيءَ فَلْعاً): شتەکەی قڵەشت/ هەڵقڵیشاند.

(تَفَلَّعَ): قڵیش قڵیشبوو/ شەقیبرد.

(إنْفَلَعَ): قڵیشاو لێکبووەوە.

(اَلفَلْع والفِلْع (ج) فُلُوع): قڵیشی قاچو شوێنو شتیتر.

(اَلفِلْعَةُ (ج) فِلَع): پارچەیەکی/ لایەکی (کۆپارەی حوشتر).

(الفالِعَةُ (ج) فَوالِع): چورتوم/ وەی/ بەڵا.

(سَيفٌ فَلُوعٌ (ج) فُلُع ومَفْلَعٌ): شمشێری تیژی برەر.

(مَزادَةٌ مُفَلَّعَةٌ): جەوەندەیەك کە لە پارچە پارچەی پێست دروستکرابێتو درابێتە دەمیەك.

فلغ: (فَلَغَ- رأسَهُ. فَلْغاً): سەری قرنجاند/ شکاند.

(تَفَلَّغَ- الشيءُ): شتەکە وردوخاشبوو.

فلق: (فَلَقَ وفَلَّقَ- الشيءَ فَلْقاً): قڵیشاندی/ شەقیکرد.

(-اللهُ الصُبْحَ): خودا ڕۆژیکردەوەو تاریکیی لابرد.

(تَفَلَّقَ): شەقارشەقار بوو.

(-الصُبحُ): سپێدەیدا/ ڕۆژبووەوە/ بەیانیدا.

(إنْفَلَقَ): شەقیبرد.

(اَلفالِق) (فا): قڵیشی کێو/ شەقبردوو.

(اَلفالِقَةُ): ١-مێی وشەی (الفالِق) ٢-تەختاییو نزمیی نێوان دوو بەرزی/ دوو گرد.

(اَلفَلْق) (ج) (مص) فُلُوق): قڵیش.

(«في رجلِهِ فُلُوقٌ»): پێی قڵیش قڵیشە/ قڵیشی زۆر تێدایە.

(كَلَّمَني مِن فَلْقِ فيهِ): لە درزی/ لە قڵیشی (دەمیەوە) قسەی لەگەڵدا کردم.

(فَلْقُ الرأس): ناوەراستو نیوەی سەر.

(مثَلَّثاتُ الفُلُوق) (ح): دەستە زیندەوەرە توێکڵدارە هەرە کۆنە بە بەردبووەکانە کە لەشیان سێ بەشی لاکێشەیی بووە لە زەویە کۆنە دروستبووەکاندایەو بە کۆنترین زیندەوەرێك دەزانرێن کە ناسراوبن.

(اَلفِلْق): نیوە کەرتی شتێکی شەقبوو/ کەرتبوو.

(اَلفَلَق (ج) فُلْقان): ١-بەیان/ ڕۆژ ٢-هەموو بوونەوەر ٣-دەرکەوتنو ڕوونبوونەوەی هەق/ ڕاستی کە لەوەپێش ئاڵۆزکابوو/ چەواشە بوو ٤-نزمیی نێوان دوو گرد یان دوو بەرزی ٥-دۆزەخ/ جەهەنەم ٦-قڵیشی شاخ.

(اَلفَلَق (ج) أفْلاق): فەلاقە دارێکە هەردوو سەرەکەی بە پەتێك بەیەکەوە دەبەسترێت. قاچی تاوانبارەکە دەخرێتە ناو پەتەکەوەو پێی توند دەکرێتو بە قاچیدا دەکێشرێت/ لێیدەدەن بەوە فەلاقەیدەکەن.

(اَلفَلَق- مِنَ اللَّبَن): ماستی شەقارشەقار

بووی ترشــبوونی یان شــیری ترشــاوی گورۆ گورۆ بوو.

(أَلفِلْقَة (ج) فِلَق): ١-نیوەی شــتی شــەقبوو/ کەرتبــوو ٢-پارچەیــەك ٣-(ز)گەلاّیەکــی بەرخۆلەیــی رووەکــە کــە لە تــۆوی رووەکە گوڵدارەکاندا دەبێت کاتێك تۆوەکە دەروێت ئەو گەلاّیە وەك گەلاّیەکی ئاسایی گەورە دەبێت.

(أَلفَلْقَة): نیوەی شتی کەرتبوو/ نیوەکەرت.

أَلفَلوق: دووکەرتبوو/ دووقلیشبوو.

(لبنٌ فُلاقٌ وفَلوق): شــیرێك بزرکابێت وەك پەنیری لێهاتبێت.

(«صارَ اللَّبنُ فُلاقاً وفِلاقاً وأَفْلاقاً»): شیرەکە برزکاوەو پارچەپارچە بووەو ترشاوە.

(أَلفَلاقَةُ (ج) فُلاق): کەرت/ پارچە.

(أَلثَّمَــرُ الفُلَيِّــق والمُفَلَّــق): میوەیــەك کــە وشــکبکرێتەوەو دەمبکاتــەوەو تۆوەکــەی دەربێتو لێبجیابێتەوە.

٢-(أَفْلَقَ- الشاعِرُ): هۆزانڤانەکە شتی سەیرو تازەی داهێناو هۆنییەوە.

(شاعِرٌ مُفلِق): هۆزانڤانێکی داهێنەرو دانەری شیعری بالاّو تازەو سەیر.

(أَفْلَــقَ- بالأَمــر): لــە کارەکــەدا کارامانەو لێزانانە بوو.

(تَفَلَّــقَ): لــە راکردنەکــەد وا خۆی گوشــی کۆششیکرد سەری سورماند.

(إِفْتَلَقَ): ١-شــتی سەیرو ســەمەرەی داهێناو کرد ٢-لە راکردنەکەدا کۆششی زۆریکرد.

(«مَــرَّ يَفتَلِــقُ في عَدوِهِ»): رابــورد وا تیژو خێرا رایدەکرد سەری سوردەهێنا.

(أَلفِلْق): ١-شــتی ســەیر/ کاری سەرسورمێن ٢-چورتوم/ وەی/ ئاپۆرە.

(أَلفِلْقَة (ج) فِلَق): چورتوم.

(أَلفَلْيــق والفَليقَــة والمُفْلَقَــة والفَلْقــى): ١-چورتوم/ وەی.

(«يا للفليقَة»): بۆ سەرسورمان لە قەوماوێکی سەخت یان کارێکی نەشیاو دەوترێت) ٢-کاری سەیرو سەمەرە.

(أَلفَيلَــق (ج) فَيالِــق): ١-ســوپایەکی مەزن ٢-پیاوی مەزن/ گەورە پیاو.

(إِمْرَأَةٌ فَيلَــقٌ): ئافرەتێکی زۆرزانی بەهاتو هاوار.

(شاعِرٌ مُفْلِقٌ): هۆزانڤانێکی داهێنەر.

(أَلمِفْلاق (ج) مَفاليق): سەرسەریو بەدرەوشت/ نامەرد.

(أَلفَلَق (ج) أَفْلاق): جۆرە شــیرێك کە لە بنی جامەکەدا دەمێنێتەوە.

(«يــا ابــن شــارِب الفَلَــق»): هــەی کوری پاشــماوەخۆر (بــۆ ســووکیی بــە یەکێك وا دەڵێن).

(أَلفُلقان): درۆی بێشەرمو شکۆو دیار.

(أَلفَليق): دەمارێکە لە ملدا دەردەکەوێت.

(رَجُلٌ فَيلَق): پیاوێکی کوێر.

(اَلِمفْــلاق): پيــاوى رەجــاڵو هيــچ نەبوو/ نەدارا.

(رَجُــلٌ مِفْــلاق): پياوێكى بــەدى خوێرى پووشتى رسواى بەدرەفتار.

٤-(فَلْقَحَ- مافي الإناءِ): هەرچى لە (دەفرەكە/ قاپەكە)دا بوو خواردیەوە.

(تَفَلْقَحَ- إلى القَومِ): مژدەى بە خوێشكەلدا.

(-الوَلَــدُ) (عاميــة): كورەكــە دەرچــوو/ سەركەوت كە لە پێشدا نازيرەكبوو.

(اَلفَلْقَحي): رووخۆش.

فلك: (فَلَكَ- ثَديُ الجارِيَةِ فَلْكاً) كەنيزەكەكە مەمكى خربوو.

(-تِ الجارِيَةُ): مەمكى خركرد.

(فالِك (ج) فَوالِك): مەمكخركردوو.

(فَلَّكَ-تِ الجارِيَةُ): كيژەكە مەمكى خركرد.

(-الثَديُ): مەمكەكە خر بوو.

(أَفْلَكَ- الثَديُ): مەمكەكە خربوو.

(تَفَلَّكَ- ثَدي الجارِيَةِ): مەمكى كەنيزەكەكە خربوو.

(-فُلانٌ) (عامية): بوو بە ئەســتێرەگەر لە نەبەدييە قسەى دەكردو وەكو لە گەردوونەكان بدوێت.

(إِسْــتَفلَكَ ثَديُ الجارِيَــةِ): مەمكى كيژەكە خربوو.

(الفُلْك): پاپۆر (بە مێو نێر دەكرێت).

(اَلفَلَــك (ج) فُلْك وفُلُك وأَفْلاك): خولگەى/ سورگەى ئەستێرەكان.

(الفَلَكُ الواحِدَةُ فَلَكَه (ج) فِلاك): ١-پارچەيەك زەويــى گــردەو بەرزتــرە لەمــلاولاى/ لــە دەوروپشتى ٢-گردە لمێك كە هيچى لەملاولاوە نەبێت.

(-مِــنَ البَحر): شــەپۆلى هەســتاوى خرى دەريا.

(-مِن كُلِّ شــيءٍ): بەشى هەرە زۆرى شت كە خر بێت.

(فَلَكُ البُــروج) (فــك): بازنەيەكە خۆر لە سوورانەوەيدا دەيكێشێتو بە ساڵێكە بازنەكە دەكرێت بــە دوازدە بورجەوەو هەر بورجەى (٣٠) پلەكە. هاوسەدەكان بێئەوەى پێويستبێت ناويانناوە بازنەى خۆرگيران.

(فَلَــك التَدوير عنــد الأَقدَمين): گەردوونە خرەكــە لــەلاى كۆنەكان (فــك) بازنەيەكە هەســارەى گەرۆك پيايــدا دەرۆن لەو كاتەدا چەقى گەردوون دەچێتــە بازنەيەكى ترەوە كە سوورى زەوى دەداتو پێيدەڵێن گەردوونى لوتكە.

(عِلــمُ الفَلَــك) (فك): زانســتى گــەردوون: زانستێكە كە لە بارەى ئەستێرە بەرزەكانەوە دەدوێتو دەكۆڵێتەوە.

(اَلفَلِك): ١-ئێسقان دەرپەڕيو ٢-جومگە قەبە ٣-كەســێكە كــە ئــازار لــە كلاوەى ئەژنۆيدا هەبێت.

(رَجُلٌ فَلِك): پیاوی سمتپان‌و گه‌وره.
(ألفَلْكَةُ (ج) فَلْك وفَلَك): هه‌رچی به‌رزبێته‌وه‌و ده‌رپه‌ڕیبێت‌و سووڕیدابێت/ خڕبێت وه‌ك كلاوه‌ی ئه‌ژنۆو شتی له‌و بابه‌ته.
(ألفَلْكَة): تاوێرێكی خڕی تاك.
(فَلْكَةُ المِغْزَل (ج) فِلَك): سه‌ری ته‌شی كه خڕه.
(ثَقَّالَة المِغْزَل) (عامية): سه‌ری ته‌شی.
(ألفَلَكِي): ١-گه‌ردوونیی ٢-زانای گه‌ردوونی/ گه‌ردووناس/ ئه‌ستێرەناس.
(الأفَلَك): ئه‌وه‌ی به سووڕی گردی لەدا ده‌سوڕێته‌وه كه هیچی به‌ده‌وردا نییه.
(ألإفلِيكان) (ع ا): ئالووكانی قورگ كه له‌مبه‌رو له‌وبه‌ری زمانه بچكۆله‌ن.
(ألمُفلِك والمُفَلَّك مِن النساء): ژنانی مه‌مكخڕ.
٢-(فَلَّكَ وأفْلَكَ الرَجُلُ في الأمر): له‌سه‌ر كاره‌كه ویره‌ویری زۆر كردو زۆری له‌سه‌ر ڕۆیشت.
٣-(ألفِلَكْسِرَةُ) (ح): ترتول: مێرووی مێو مێروویه‌كی بچووكه هه‌ندێكی میكرۆسكۆبییه (له كۆمه‌ڵه‌ی نیوباڵه) زیانی ته‌واو به ڕه‌گی مێو ده‌گه‌یه‌نێت.
فلم: (إفْتَلَمَ أنْفَهُ): لووتی بڕی.
(ألفِلْم (ج) أفلام) (انكليزية): شریتێكی سلیلۆزه كه توێژاڵێكی جه‌لاتین‌و برۆمۆری به‌سه‌ره‌وه‌یه ئه‌مه بۆ گرتنی وێنه‌ی فۆتۆگرافی‌و سینه‌مایی به‌كاردێت.
(الفِلم): فلیم كه چیرۆكێكی سینه‌مایی‌یه.
(«فِلْمٌ جَمِيلٌ»): چیرۆكێكی سینه‌مایی جوانه.
فلن: (فُلانٌ وفُلانَة): بۆ ناونه‌هێنانی كه‌سێك به‌كاردێت ده‌ڵێن: فِلان: فیسار.
(جاءَ فُلانٌ ولكن جاءَت فِلانَة): فیسار هات فیسار ژنیش هات به‌ڵام ئه‌گه‌ر بۆ شتێك به‌كاربێت بێئاوه‌ز بێت ده‌بێت (أل)ی بخرێته سه‌ر ده‌ڵێن: («رَكِبتُ الفِلان وحلَبتُ الفلانَة»): سواری فیسار شتبوم‌و فیسارم دۆشی.
فلو: ١-(فَلا. فَلْواً وفَلاءً): گوزاریكرد/ بۆ گوزار چوو.
(أفلَى- الرَجُلُ): ڕووه‌و بیابان ڕۆیشت یان چووه ناو بیابانه‌وه.
(ألفَلاة (ج) فَلَوات وفَلاً وفُلِيّ وفَلِيّ وجمع فَلاً أفْلاءً): بیابانی فراوان.
(ألفلا) (عند العامة): (لای ڕه‌شه خه‌ڵكه‌كه) ده‌شت/ زه‌وییه‌ك كه خانه‌ی تێدا نه‌كرابێت.
(«نامَ في الفَلا»): له‌ده‌شت نوست له شوێنێكدا كه سه‌ری نه‌گیرابێت.
٢-(فَلا- الصَبيَّ أو المَهرَ فَلْواً وفَلاءً): كوڕپه‌كه یان جوانوه‌كه‌ی له شیر بڕییه‌وه‌و له دایكی دوورخسته‌وه.
(-الغُلامَ): مێردمنداڵه‌كه‌ی به‌خێوكردو

پەرومردە کرد.

(أَفْلَــى- الصَبِيَّ أَو المَهــرَ):١-منداڵەکەی یان جوانووەکــەی لەشــیر برییــەوەو لــە دایکی جیاکردەوە.

(-الغُــلامَ): مێردمنداڵەکــەی بەخێوکــردو پەرومردە کرد.

(-تِ الفَــرَسُ): ماینەکــە جوانوویەکــی یەکســاڵەی هەبــوو کە لــە شــیر برابووەوە ٢-منداڵەکەی گەیشــتە تەمەنی ئەوەی کە لە شیر ببڕێتەوە.

(مُفلٍ ومُفلِيَةٍ):دایکێکە کە منداڵەکەی دەمی لە شیر بڕینەوەی هاتبێت.

(إِفْتَلَــى- الصَبِــيَّ أَو المهــرَ): منداڵەکە یان جوانووەکــەی لە شــیر بڕییەوەو لــە دایکی جیاکردەوە.

(-الغُــلامَ): مێردمنداڵەکــەی بەخێوکــردو پەرومردە کرد.

(-هُ لِنَفسِهِ):بردی‌و کردی بە هی خۆی.

(اَلفِلْــو (ج) أَفْلاء وفِلاء والفَلْــوّ والفُلُوّ (ج) أَفْلاء وفَلاوى (م) فِلْوَة وفَلُوَّة):جاشــولکە یان جوانوو کە لە شیر برابێتەوە یان یەکساڵە بێت.

٣-(فَلا-هُ بِالسَّــيفِ فَلْواً وفَلاءً):بە شمشــێر لێیدا.

(-القَومَ): خۆی کرد بە ناویاندا.

فلي: ١-(فَلَــى الأَمْرَ فَلْياً):کارەکەی هەڵگێڕو داگێڕ کردو سەرنجی لێگرت بیری لێکردەوە.

(-الشِــعْرَ):هەڵبەســتەکەی هەڵگێڕو داگێڕ کــردو واتاکــەی دەرهێنــاو شــتە ســەیرە ناوێزەکانی پیشاندا.

(-زَيــداً عَــن عَقلِــهِ):لــە ئــاوەزی زەیــد وردبووەوەو هەڵیسەنگاند.

(إِفتَلَــى- القَومَ بِعَينِهِ):بــە چاو وێقڵەمەی خۆێشگەلیکردو سەرنجی لێدان.

٢-(فَلَى وفَلَّى رَأسَــهُ أَو ثَوبَهُ. فَلْياً وتَفلِيَةً): ســەری یان کراســەکەی دۆزی‌و لە ئەســپێ پاکیکردەوە.

(تَفَلَّــى):ســەری یــان جلەکەی لە ئەســپێ پاککردەوە.

(-الطائِرُ):باڵندەکە بە دەنووك خۆی دۆزی یان خوراند یان خۆی پاککردەوە.

(تَفالى):حەزی لە دۆزینی خۆیکردو داوایکرد کە بیدۆزن.

(تِ النِساءُ):ژنان یەکتریاندۆزی.

(-تِ الحُمُــرُ):کــەرەکان خۆیــان لە یەکتری هەڵســوو وەکــو خۆیان بــدۆزن/ تا ناڵۆشــی لەشیان بشکێت.

(إِسْتَفلى):حەزیکردو داوایکرد کە بیدۆزن.

(الفِلايَة= التَفلِيَة):خۆدۆزین‌و ناڵۆششکاندن‌و خۆ لە ئەسپێ رزگارکردن‌و پاککردنەوە.

٣-(فَلى-هُ بِالسَّيفِ. فَلْياً)شمشێری پێداکێشا/ بە شمشێر لێیدا.

(-القَومَ): خۆیکرد بە ناویاندا.

(فَلِيَ- الشيءُ يَفلى فلىً): شتەکە/ برا/ پچڕا.
(أَفلى وافتلى- القَومَ): خۆیکرد بە ناویاندا.
(إِسْـتَفلى-هُ): لێوەی تووشـی ئـەوە بوو بە شمشێر بەسەریدا بکێشن/ لەسەری بدەن.
(اَلفالِيَةُ): چەقۆ.
٤-(اَلفالِيَـةُ) (ح): قالۆنچەیەکی خاڵخاڵاوییە بە کونی مار ڕاهاتـووە لەبەرئەوە پێیدەڵێن:
(فالِيَةُ الأَفاعي): قالۆنچە مارانە.
(فالِيَـةُ الأَفاعـي): سـەرمتای خراپـەو بەدکاریی.
(اَلفَلَيون (م) فَلْيونَة- عند النصارى): لەلای عیسـاییەکان بەو کورە دەڵێن کە پیاوەکە لە ناوی پیرۆزکردنی هەڵدەکێشـێت بە کورەکە دەڵێن فەلیون ئەو دەبێتە پیرۆزکەری. کچوکە (فلیونتـە) دەبێت ئەو ژنەی لەگەڵیدا دەبێت ئەویش دەبێتە پیرۆزکەری ( ایطالیة).
(اَلفِلِّـين الواحدة فلِّيِنَـة) (یونانیة): فلین. مادەیەکـی نەرمـی لاسـتیکییە دەکرێت بە دەمەلبێن‌و سەرقاپی گەلێك قاپ‌و قاپی شووشە لە توێکڵی بەرووی فلین دروستدەکرێت.
فم: (أَلفَمُ والفُمُ والفِمُ مِنَ الإِنسان) (ع ا): زار دەم شوێنی قسـەکردن‌و خواردن لە (فوه)ەوە هاتووە.
(فَمـان وفَمَوان وفَمَيـان): دوو (زار/ دەم).
(ج) أَفْواه و أَفْمام.
(فَمِيّ وفَمَوِيّ): دەمیی/ زاریی.

فـنّ: ١-(فَـنَّ- الشـيءَ فَنّـاً): ڕازاندیەوەو جوانیکرد.
(-الإِبِلَ): حوشترەکەی دەرکرد.
(فَنَّـنَ- النـاسَ): خەڵکەکـەی ڕازانـدەوە دەستەدەستەیکردن.
(-رأَيَـهُ): هەردەمـە ڕایەکی هەبوو لەسـەر ڕایەك نەوەستایەوە.
(-الشيءَ بِالشَّيءِ): شتەکەی تێکەڵی شتەکەیتر کرد.
(تَفَنَّنَ- الشـيءُ): شـتەکە باروجۆرو ڕەنگی زۆر بوو.
(-في الحَديثَ أَو العَمَلِ): لە گوفتار یان کاردا جۆرەهـا ڕێگەو شـێوازی جـوان‌و هونەریی بەکارهێنا.
(إِفْتَنَّ وتَفَنَّنَ- في الخصومَة): لە ناکۆکییەکەیدا جۆرەها ڕێگەی گرت‌و لـە دوژمنایەتییەکەی فراوانتر کرد.
(-الحمارُ بِأُتُنِـهِ): نێرە کەرەکە ماکەرەکانی بە ڕاست‌و چەپ‌و ئەملاولادا ڕافراند.
(إِسْتَفَنَّ- فَرَسَهُ): چارەوێکەی ناچار کرد بە جۆرەها جۆر بڕوات.
(اَلفَـنّ (مص) (ج) أَفْنـان وفُنُون و (جج) أَفانـين): ١-جۆری شـتێك‌و ڕەنگ‌و شـێوەی ٢-بار/ دۆخ/ ڕەوش ٣-ئەوەیە کە هونەرمەندەکە چی زانیاریی هەیە بیخاتـە کارەوەو بەکاری بهێنێت بۆ کێشـانی وێنەیەکی سروشـتیی‌و

بیگەیەنێتــە ئەوپەڕی ئامانجــی هزرێك یان سۆزێك كە دەربڕینی جوانیی باڵا بێتو چێژ بە دڵو مێشك بدات.

(فُنون الشِــعْر): جۆری هۆزان/ هەڵبەســت/ شیعر.

(الفُنون الجَميلَة): هونەرە جوانەكان ئەومیە كە وێنەی جوانیی بنوێنێت وەك مۆســیقەو وێنەكێشــانو هۆزان/ شــیعرو ڕەوانبێژییو پەیكەرتاشینو هونەری خانەسازییو سەما.

(الفُنــون اللذیــذة): هونەرە خۆشــەكان كە چێژو خۆشی بە بكەرەكەی دەگەیێنێت كاتێك پەیــڕەوی دەكات وەك ســەماو هەڵپەركــێو مۆسیقاو گۆرانیو سواریو ڕمبازێن.

(ألفُنُون الحُــرَّة): هونەرە سەربەســتەكان/ ئازادەكان، ئەو هونەرمیە كە زۆرتر كاری بیرو مێشــك بێت لــەوە كە كاری دەســتبێت وەك هۆزان/ شیعر.

(الفُنون اليَدَويَّة أو الحِيلِيَّة):هونەری دەستیی ئەومیە كە زۆرتر كاری دەستبێت لەوەی كاری مێشــكو بیر بێت وەك پەیكەرتاشین/ ئیشی دەست.

(أفانين الكَلام): هونەری ئاخاوتن/ شــێوازو ڕێگەو چۆنیەتی دەربڕین.

(«هو فِنُّ عِلــم»): ئەو چاكــی لێدەزانێتو جوانو چاك پێیهەڵدەستێت.

(ألفَنَّةُ): جارێك بەكارهێنانی هونەر.

(ألفَنَّــان): ١-هونەرمەنــد ٢-داهێنــەر لــە هونەرەكەیدا كە شــتی سەیرو ناوێزەو جوان پیشــانبدات ٢-كەرە كێویی لە غاركردنیدا بە گەلێك جۆرو ڕێگەو شێوە غاردەكات.

(الأُفْنُون (ج) أفانين): جۆر یان ڕەنگی شتێك یان نموونەی.

(ألمِفَن (م) مَفَنَّة): ئەو كەســەی شتی سەیرو سەمەرەو كاری ناوێزە دادەهێنێو دەنوێنێت.

(ألتَّفنين- في الثَّوب): هونەر كاریی لە بەرگدا كە لە وێنەی نەكرابێت.

(«ثَوبٌ ذوو تَفنين»): بەرگێكە هونەری تێدا كراوە كە لە وێنەی نییە.

(ألمُتَفَنِّن) (فا): كەسێكە كە لە پیشەكەیدا یان لە ڕەوشی خۆیدا هونەروەر بێت.

٢-(فَنَّ- الرَجُلَ. فَنّاً): تووشــی ماندوێتییو كولەمەرگییكرد.

(ألفَنّ): ماندوێتییەكی زۆر.

(«لَقيتُ مِنهُ فَنّاً»): بە دەســتییەوە تووشی ماندوێتییەكی زۆر بووم.

٣-(فَــنَّ-هُ في البَيع فَنّاً): لە فرۆشــتنەكەدا دەغەڵیی لەگەڵدا كرد/ گزیی لێكرد.

(-الدَيــنَ): بــۆ دانەوەی قەرزەكــە/ وامەكە دەستیدەستیی پێكردو خایاندی.

٤-(تَفَنَّــنَ): وەك (لقێكــی/ چلێكی) ڕاســتە شیرزە بوو.

(ألفَنَن (ج) أفْنــان و (حج) أفانين): (لقی/

چلی) راستی درەخت.
(ألفُنَّةُ): گیایەکی زۆر.
(شَــجَرَةٌ فَنَّاء وفَنْواء): درەختێکە لقی ڕەپو راستی زۆرە.
(ألأُفْنُــون (ج) أفانــين): ١-پەلــی تێکئالاوی درەخــت ٢-هەرەتــی (هەرزەکاریــی/ لاویی/ گەنجێتی) یان ســەرەتای هــەور ٣-ئاخاوتنی شپرزەیی.
(ألفَنيــان): قــژی درێــژ (لە پەلــی درێژی درەختەوە وەرگیراوە).
(شَــعَرٌ فَيْنــان): قــژی درێــژی جــوانو ڕێکوپێك.
٥-(ألفَنَّة): دەمێکی ڕۆژگار.
(ألأُفْنُون (ج) أفانين) (ح): مار.
(ألمُفَنَّنَة): پیری بەدرەفتار.
فنأ: (ألفَنء): گروپ/ کۆمەڵ.
(ألفَنأ): زۆریی.
فنــج: ١-(فَنْجَرَ- عَيْنَيْــه) (عامية): چاوی ئەبڵەقیکرد/ دەرپەڕاند.
(ألفَناجِرَة): سوارچاکەکان.
٢-(ألفِنْجــان (ج) فَناجــين) (فارســية) لە (فنکان)ەوە وەرگیراوە ١-فنجان ٢-کلاوزەڕ یان کلاومس کە ژنانی شاریی لەسەرسەریاندەناو پێچیان بەسەرەوە دەبەست.
(ألفِنْجانَة): فنجانولکە/ فنجانی بچووك.
فنخ: ١-(فَنَخَ- هُ. فَنْخاً): بەســەریدا زاڵبوو سەری پێ شۆرکرد.
(-عَظْمَهُ): ئێسقانەکەیی بێقڵیشاندنو خوێن لێهێنان وردکرد.
(-هُ فَنْخاً وفُنُوخاً): بێهێزو شپرزەیکرد.
(فَنَّخَ-هُ): زاڵیبوو سەرشۆڕیکرد.
(-عَظْمَهُ): ئێســقانەکەی وردکــرد بێئەوەی بیقڵیشێنێتو خوێنی لێبهێنێت.
(أفْنَخَ رَأسَــهُ): سەری شکاندو شەرشۆڕیکرد/ داماویکرد.
(تَفَنَّخَ-هُ): بەســـەریدا زاڵبوو تەواو زەبوونو سەرشۆڕیکرد.
(ألفَنيخ): ١-شــلو شــێواوی بێتوانــا/ بێهێز ٢-پیر.
(ألمِفْنَخ): زەبربەدەستێکی وا کە دوژمنەکانی خۆی زۆر زەبوون بکاتو سەریان بشکێنێت.
٢-(فَنْخَرَ. فَنْخَــرَةً): فوویکردە کونە لووتی خۆی/ لووتی فشکرد.
(ألفُناخِر (م) فُناخِرَة): ١-لوتکەورە/ لووتزل ٢-کەتە/ چەتەوڵ زەبەلاح.
(ألفُنْخُــر (م) فُنْخُــرَة): چەتــەوڵ/ کەتە/ زەبەلاح.
(ألفِنخيرَة): خۆهەڵکێش/ زۆربەخۆدا نازیو.
فنــد: ١-(فَنِــدَ. فَنَــداً): خەڵەفــاوو ئاوەز سووکبوو.
(-في الرَّأيِ أوِ القَولِ): لە ڕاو قسەدا هەڵەیکرد.
(فَنَّدَ-هُ): ١-بەدرۆیخســتەوە ٢-ڕاکەی بە هیچ

نەزانیو پووچەڵیکردەوە ٣-سەرزەنشتیکرد.
(-الحسـابَ) (عامية): ژمێرەکەی تۆزە تۆزە جیاکردەوە.
(أَفْنَـدَ): خەڵەفـاو کەمئـاوەز بـوو/ ئەقڵی سووکبوو.
(-في الـرَأي أو القَولِ): لە ڕاو قسـەکەیدا بە هەڵەدا چوو.
(-هُ): ڕاکەی بە هەڵە دانا.
(-هُ الكِبَرُ): گەورەیی تەمەن/ پیریی تووشـی خەڵەفانیکردو ئاوەزی کزکرد.
(ألفَنَـد (مـص) (ج) أفنـاد): ١-پەککەوتن ٢-کفرانەی نازو خۆشـیی کە خودا داوێتی بە یەکێك.
٢-(فَنِدَ وأَفْنَدَ. فَنَداً): درۆیکرد.
(فَنَّدَ-هُ): بەدرۆیخستەوە.
٣-(فَنَّدَ- في الشَّـراب): سـەری کردە سـەر خواردنەوەو لەسەری بەردەوام بوو.
٤-(فَنَّدَ- الفَرَسَ): چارەوێکەی چرووسـاند/ لەرکرد.
(-الكَـرْمَ) (عامية): مێوەکـەی قونار کرد/ هەڵپاچی/ لـقو پۆپە وشـكو بێکەڵکەکانی بری.
(ألفِنْـد (ج) فُنُود أَفناد): (لق/ چڵ/ پەل)ی درەخت.
٥-(فَنَّدَ وفانَـدَ وتَفَنَّدَ فُلانـاً على الأَمرِ): کارەکەی لە فیسار داواکردو لێیویست.
٦-(تَفَنَّدَ- مِن كذا): لەوە پەشیمانبووەوە.
٧-(ألفَنْد): چیای مەزن.
(ألفِنْـد (ج) فُنُود وأَفْنـاد): ١-کێوی گەورە ٢-جۆر ٣-خوێشگەلی کۆمەڵبوو.
(«أَتَـو أَفْنـاداً»): کۆمـەڵ کۆمـەڵ هاتـن ٤-زەوییەك بارانی لێنەباریبێت.
(أَفْنادُ اللَّيل): شەوگەڕەکان.
٨-)(الفُندُق (ج) فَنادق): ١-خان/ کاروانسەرا ٢-ئوتێل/ میوانخانە کە بۆ ڕێبوارو گوزارکارو گەشـتیار دامـەزراوە تـا تیایـدا دابـەزنو بحەوێنەوە.
(ألفُنْداق (ج) فَناديق): دەفتەری ژمێرە.
فنـر: (ألفَنـار (ج) فَنَارات): ١-مەشـخەڵ/ چراوك ٢-منارە ٣-فەنەر (فارسـيە) لە کاغەز یـان چنراوێـك وەك لوولەك دروسـتدەکەن بنێکی بـۆ دەکەن مۆمێك لەسـەر بنکەکەی دادەنێـنو دایدەگیرسـێننو بەدەسـت لـە شـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکیتر دەیگوێزنەوەو ڕووناکیی دەدات بێنەوەی بە با بکوژێتەوە.
فنس: (الفانـوس (ج) فَوانيـس= النَمَّام): ١-دووزمـان/ زمانبەد/ ئاشـووبگێر ٢-چرای دەستی، دەشێت ئەو وشەیە عەرەبی نەبێت).
فنـش: (فَنَّـشَ- في الأَمـرِ): لـە کارەکەدا خاوبووەوەو سستیکرد.
فنـط: (ألفَنطـاس (ج) فَناطيـس): ١-گۆلی نـاو پاپۆڕ کـە ئاوی شـیرینی تێدا بۆ

خواردنـــەوە هەڵدەگیرێـــتو دادەنرێـــت ٢- جامێکە لە پاپۆڕەکەدا ئاوی خواردنەوەی پێ دابەشدەکرێت.

(أَنْفُ فِنطاس): لووتێکی پان.

(ألفِنطیس (ج) فَناطیس): ١-مرۆڤی ناپاك: بەدزمـــان ٢-لووتێـــك کـــە کونەکانـــی فش‌و پەرەکەکانی پانبووبێتەوە ٣- لووتپان.

(ألفِنْطِیسة): لۆزی بەراز.

فنـــع: (فَنِـــعَ. فَنَعاً): دارابوو ســـامانی زۆری پێکەوەنا.

(فَنْـــعٌ وفَنیعٌ): ســـامانداریکی قـــورس/ زۆر دەوڵەمەند.

(ألفَنـــع) (مـــص): ١-جوامێرییەکـــی تەاوو/ بەخشـــندەییەکی زۆر ٢-چاکەو پیاوەتییەکی لە ئەندازە بەدەر ٣-هەموو شتێکی زۆر ٤ بۆنی مسك/ بۆنی خۆش.

(«مِسْـــكٌ ذو فَنَـــع»): مســـکێکی بۆنخـــۆش بۆنبلاو.

(ألفَنَع): ناوبانگباش.

فنق: ١-(فَنَقَ وفانَقَ الغُـــلامَ): مێردمنداڵەکەی خستە گوزەرانێکی خۆشەوەو ناسك بەخێویکرد.

(أَفْنَـــقَ): خۆشـــگوزەرانبوو کـــە لەوەپێـــش نەبووبوو.

(تَفَنَّقَ- الغُلامُ): مێردمنداڵەکە خۆشگوزەران‌و ژیان ناسکبوو.

(جاریَـــةٌ فُنُـــق ومِفنـــاقٌ): کەنیزەکێکـــی خۆشگوزەران‌و ناسکژیاو.

(ألفَنیـــق (ج) فُنُق وأَفناق): کەڵە ئەســـپێك یان نێرە حوشـــترێکی دابەستەو خۆشەویست نەســـواریدەبن‌و نـــە بـــاری پێدەبـــەن لەبەر رەسەنیی.

(ألفَنیقَـــة (ج) فَنائِـــق): ژنـــی نـــازدارو خۆشگوزەران.

(عَیشٌ مُفانِق): ژیانێکی نەرمی خۆشگوزەرانیی.

(تَفَنَّقَ- في الأمرِ): لە کارەکەدا دەستڕەنگینیی نواندو کارامە کارەکەیکرد.

٣-(ألفَنیقَةُ (ج) فَنائِق): دەفرێکە لە خەرار بچووکتر.

فنك: ١-(فَنَكَ- بِالمَكانِ فُنوكاً): لە شوێنەکەدا نیشتەنیبوو.

(فَنَـــكَ وأَفْنَكَ- علی الأمرِ): لەســـەر کارەکە سەرومر بوو/ بەردەوام بوو.

(-في الأمرِ): لەســـەر کارەکـــە ویرەویری زۆر کردو جەختی لەسەر کرد/ پێیداگرت.

(فَنَّـــكَ- في الشَـــرِّ أَو الكَـــذِبِ تَفنیـــكاً): لە خراپەکاریی یان درۆکردندا سەرسەختییکردو پێیداگرت.

(فانَـــكَ. مُفانَكَـــةً- في الأَمـــرِ): چـــووە ناو کارەکەوە.

(-في الشَرِّ أَوِ الكَذِب): لە بەدیی‌و خراپەکاریی یان درۆکردندا سەرســـەختییکردو لەســـەری سوور بوو.

(ألفِنك): دەرگا/ دەروازە.
٢-(فَنَكَ وأَفْنَكَ فُنُوكاً): درۆیکرد.
٣-(الفَنْك): سەیروسەمەرە.
(ألفِنْك والفُنْك): بەشێکی شەو.
(ألفَنَك): ١-سەیروسەمەرە ٢-بەشێکی شەو ٣-(ح) دەڵەك. زیندەوەرێکی بچووکە لە کۆمەڵەی سەگە لە ڕێوی دەچێت بەڵام گوێی گەورەیە درێژی لە چل سانتیمەتر زۆرتر نابێت ئەویش بە کلکەکەیەوە پێستەکەی زۆر بەنرخەو باشترین فەرووە. لە میسردا ناسراوە.
(ألفَنيك): ١-شوێنی بەیەکگەیشتنی ڕیش کە لە ناوەڕاستی چەناگەدایە ٢-بنی کلکی باڵندە.
(حامِض الفينيك) (ك): ترشی فینیك. ترشێکی پاکژکەرەوەیە لەو شلەرۆنە دەردێت کە لە پاڵاوتنی قەترانی خەڵووزی بەرد دەردێت(فرنسیة).
(الإفنيك): بنی کلکی باڵندە.
(ألمُتَفَنِّكة): ئافرەتی گەوج.
فنو: (ألفَناة (ج) فنَوات): پشقل.
(ألفَناة (ج) فَناً (ن)): ڕەزڵە.
(شَجَرَةٌ فَنواء): درەختێکی پەلوپۆ زۆرو بە سێبەر/ سێبەر فراوان.
فني: ١-(فَنِيَ وفَنَى. يَفْنى فَناءً): لەناوچوو/ فەوتا/ نەما.
(-الرَّجُلُ): تەواو ئیختیار بوو پەکیکەوت/ ئیفتادە بوو.
(أفنى- الشيءَ. إفناءً): ١-شتەکەی فەوتاندو نەهێشت ٢-لەناویبرد.
(تَفانى- القَومُ): خوێشگەل یەکتریان بڕییەوە/ فەوتاند.
(ألفاني) (فا): ئیختیاری پەککەوتە کە نزیکی مردن بووبێتەوە/ ئیفتادە.
(«صارَ شَيْخاً فانياً»): بوو بە پیرێکی پەککەوتە/ تەواو ئیختیار بوو/ ئیفتادە بوو.
(ألفَناء) (مص): ١-فەوتان/ دوابڕان/ لەناوچوون/ نەمان/ قڕتێکەوتن ٢-مردن.
٢-(فانى- الرَجُلَ. مُفاناةً): ١-دڵی ڕاگرت ٢-دایمرکاند.
(«كَما يُفاني الشُمُوسَ قائِدُها»): وەك چۆن سوارەکە ئەسپە سەرکێشەکەی ڕادەگرێت و دایدەمرکێنێت.
(فانى- المالَ): سامانەکەی باش هەڵسووڕاند.
(«كانَ يُفاني الأَيامَ لاهياً»): بە ڕابواردن ڕۆژانی بەسەر دەبرد.
٣-(ألفِناء (ج) أفْنِيَة وفُنِيّ): حەوشەو دەشتی بەردەمی خانوو.
(فَناءُ الطيور): کولانەی مریشك و باڵندەو کونی کەروێشك و لەو بابەتە.
(«هوَ مِن أفناء الناس» والواحِد فِنْوٌ): کەس نازانێت کێیە/ لە چ تیرەیەکە.

فه‌: (فَهِهَ. فَهاهَةً): شه‌كه‌ت‌و بێهێز بوو.
(فَهٌ وفَهِيهٌ): شه‌كه‌ت‌و په‌ككه‌وته‌و بێهێز.
(فَهَّ فَهاهَةً): شه‌كه‌ت‌و بێتوانا بوو.
(-الشيءَ وعَنِ الشيءِ. فَهّاً): شته‌كه‌ی (له‌بیرچووه‌وه‌/ له‌یادكرد).
(فَهَّهَ- اللهُ الرَجُلَ): خودا په‌كی پیاوه‌كه‌ی خست‌و هۆشی له‌به‌ر بری.
(أفَهَّ-اللهُ الرَجُلَ): خودا هۆشی له‌به‌ر پیاوه‌كه بری.
(-هُ الشيءَ): شته‌كه‌ی له‌بیربردهوه‌.
(ألفَهَّةُ): ١-مێی وشه‌ی (ألفَهّ) ٢-شه‌كه‌ت ٣-بێهۆشیی‌و بێیاگایی. زمانته‌ته‌ڵه‌كردن‌و هه‌ڵه‌گۆییكردن.
(مارأيتُ مِنهُ فَهَّةً): زمانته‌ته‌ڵه‌یی‌و هه‌ڵه‌م لێنه‌دیوه‌.
فهد: ١-(فَهَدَ- لِفُلانٍ. فَهْداً): له‌ پاشمله‌/ كه‌ له‌وێ نه‌بوو پیاوه‌تی‌و چاكه‌ی به‌رامبه‌ر كرد.
٢-(فَهِدَ. فَهَداً): ١-له‌نوستن‌و خۆكێشانه‌وه‌و توروه‌بووندا له‌ یۆزچوو ٢-نوست‌و له‌ كاری سه‌رشانی، خۆی بێئاگا كرد.
(فَهِدٌ وفَهِدٌ): یۆزڕه‌فتار بوو له‌ نوستن‌و خۆ كێشانه‌وه‌و توورِه‌بووندا یان له‌ كاروباردا گوێنه‌ده‌رو خۆبێئاگاكه‌ر بوو.
(فَهِدَ- عَنهُ): لێی بێئاگا بوو.
(ألفَهْدُ (ج) فُهود وأَفْهُد) (ح): یۆز/ جۆره‌ درنده‌یه‌كه‌ له‌شی له‌ نێوان سه‌گ‌و پڵنگدایه‌.
په‌لی له‌ په‌لی پڵنگ درێژتره‌ خاڵخاڵاویی ره‌شه‌و وه‌ك پڵنگ بازنه‌یی نییه‌ به‌ خه‌وخۆشیی به‌ناوبانگه‌.
(ألفَهْدَةُ (ج) فَهَدات) (ح): مایۆز.
(ألفَهّاد): ١-كه‌سێكه‌ كه‌ یۆز بۆ راو په‌روه‌رده‌و فێربكات ٢-خاوه‌ن یۆز/ یۆزه‌وان.
٣-(ألفَهْدَةُ): بن/ بێخ.
(ألفَوْهَدُ (م) فَوهَدَة والأُفْهُود (ج) أفاهيد): مێردمنداڵی قه‌ڵه‌وی له‌شجوان.
فهر: ١-(فَهَّرَ- الفَرَسُ): چاره‌وێكه‌ له‌ غاردا ماندوو بوو دایه‌ دواوه‌.
(-الرَجُلُ): شه‌كه‌تبوو.
٢-(فَهَّرَ- زَيدٌ): گۆشته‌كه‌ی نیشته‌ سه‌ریه‌ك‌و یه‌كپارچه‌ بوو له‌شی ناشیرینبوو.
(ألمفاهِر): گۆشتی سه‌رسه‌نگ.
(أفْهَرَ): جه‌ژنی فوهری كرد.
(ألفُهْر): جه‌ژنێكی جووله‌كه‌یه‌ یان خانه‌یه‌كه‌ بۆ خوێندنی ته‌ورات له‌ جه‌ژندا تیایدا كۆده‌بنه‌وه‌ (عبرانیه‌).
٤-(تَفَهَّرَ- في المالِ والكَلامِ): دارایییه‌كه‌ی په‌لیهاویشت ده‌وڵه‌مه‌ند بوو یان له‌ قسه‌دا درێژه‌یدایه‌و له‌سه‌ری رۆیشت‌و به‌توانا بوو.
٥-(ألفِهْر (ج) أفهار وفُهُور والفِهْرَةُ) (طب): به‌ردێكی ته‌نكه‌ ده‌رمانی پێده‌هارن.
٦-(فَهْرَسَ- الكِتابَ فَهْرَسَةً): پێرستی بۆ كتێبه‌كه‌ كرد.

(ألفِهرِس والفِهرِست (ج) فَهارِس) (فارسية): ١-پێرستی ناوی هەموو کتێبەکانە لە کتێبێکدا ٢-پێرستی کتێبە لە سەرەتای یان دواوەی کتێبەکەدایە بۆ بەشەکانو لقەکانی ئەو کتێبە (فارسیە).

فهض: (فَهَضَ-هُ. فَهْضاً): شکاندیو قرنجاندی.

فهق: ١-(فَهَقَ- الرَجُلَ فَهْقاً): کێشای بە یەکەم گرێی ملیدا.

(ألفَهْقَةُ (ج) فِهاق) (ع ا): یەکەمین گرێی مل.

٢-(فَهِقَ- الإناءُ. فَهْقاً وفَهَقاً): قاپەکە پڕو سەرڕێژ بوو.

(أفْهَقَ- الإناءَ): قاپەکەی پڕکرد.

(تَفَهَّقَ وانْفَهَقَ- الحَوضَ بالماءِ): گۆلەکەی پڕو سەرڕێژکرد.

(ألفاهِقَةُ): تیغپێداکردنێک کە خوێنی لێبچۆڕێتەوە.

(بِئْرٌ فِهاق): چاڵاوێك کە ناوی زۆر بێت.

٣-(أفْهَقَ- البَرقُ وغَيْرُهُ): هەورەبرووسکەکەیان لەو بابەتە (بەربلاو بوو/ فراوانبوو).

(ألْمُنْفَهِق): فراوان/ بەربلاو.

فهم: (فَهِمَ- الأَمْرَ أَو المَعْنى. فَهْماً وفَهَماً وفَهامَةً وفِهامَةً): کارەکەی یان واتاکەی زانیو تێیگەیشتو بۆیچوو.

(فَهَّمَ وأَفْهَمَ- هُ الأَمْرُ): تێیگەیاندو فێریکرد.

(تَفَهَّمَ- الكلامَ): وردە وردەو بە شێنەیی لە قسەکە گەیشتو بۆی ڕوونبووەوە.

(تَفاهَمَ- القَومُ): لەیەکتری گەیشتن.

(إسْتَفهَمَ- هُ الأمرَ): داوایلێکرد کارەکەی تێبگەیەنێت یان هەوڵی کارەکەی پێرابگەیەنێت.

(ألفَهْم) (مص): لە شت گەیشتنو زانینیو هاتنە بەرچاوو مێشك، پەی پێبردن.

(ألفَهِم): وشیار/ زوو لە شت گەیشتوو/ زرنگ/ هۆشیار.

(ألفَهّامَة): زۆرو زوو لە شتگەیشتوو/ زرنگ/ هۆشیار/ هەستپێکەر (ئەو (ت)یە بۆ زیادرەوییە).

(ألفَهيم (ج) فُهَماء): خاوەن تێگەیشتن/ خاوەنهەست/ تێگەیشتوو/ هوشیار/ پەیپێبەر.

الملحق:

فهم: (الإستِفهام): پرسیار/ پرسکردن دەربارەی شتێك بۆ وەرگرتنی زانیاری دەربارەی ئەو شتە/ بۆ هەواڵزانین/ بۆ وەرگرتنی زانیاری.

(ألإستِفهام عَن سبب الغِياب): پرسیار دەربارەی دیارنەبوونو ونبوون/ نەهاتن.

(ألإستفهام- في القواعِد): جۆرە داخوازییەکی دارشتنە وەکو: (ماذا تَفعَل): چی دەکەیت؟

(ألإستفهام في البَديع): پرسیار لە جوانکاریدا. پرسیارەکە بۆ زانینی کارێك نییە بەڵکو

بۆ ئەوەیــە کە گوێگــر پێبزانێت کە چۆنەو پێیبناســێت وەك: («أين الآباد والأجداد»): کوان باوكو باپیران واتا هەموو ڕۆیشــتوون/ مردوون.

فهــو: (فَها- عَــنِ الأمرِ. فَهواً): لــە کارکەدا بەهەڵەدا چوو لە بیریچوو.

(الأفْهاء): گێلیی.

(فو) : دەم.

١-(فوت): (فاتَ- الأمرُ فَوْتاً وفَواتاً): کارەکە ١-تێپەڕی/ ڕابورد/ بەسەرچوو/ دەمی کردنی ڕۆیشت.

(-هُ الأمــرُ): کارەکــەی دەویســتو هەلــی ئەنجامدانی لەدەستچوو.

(هُ فُلانٌ في كذا): لەوەدا فیســار پێشیکەوت/ دەستپێشخەریکرد.

(-الشــيءَ): لــە شــتەکە تێپــەڕی خســتیە پشتیەوە.

(-في الشيءِ) (عامية): چووە ناو شتەکەوە.

(فَوَّتَ-هُ): خستیە ناویەوە. پێیدا تێیپەڕاند.

(-الوَردُ ونَحْــوَهُ) (عامية): دەمی (چنینی/ ڕنینــی/ لێکردنــەوەی) گوڵەکــە تێپــەڕی/ گوڵەکە گەڵاکانی هەڵوەریو بۆنی بڕا.

(أفــاتَ-هُ الأمرَ): کارەکەی لەدەســت ئەو داو لێیدوورخستەوە.

(تَفَــوَّتَ- عليه مِن مالِهِ): بە زۆر ســامانو ماڵەکــەی ئــەوی هەڵســوڕاندو دەســتی پێوەگرت.

(إفْتاتَ-هُ الأمرُ): کارەکەی لەدەستچوو.

(-الــكَلامَ): ئاخاوتنەکەی داهێنــاو پێکهێنا/ داهێنانی تێدا کرد.

(ألفَوات) (مص): لەدەســتدان/ لەدەستچوون ٢-بەسەرچوون.

(مَوتُ الفَوات): مردنی لەناکاو.

٢-(تَفــاوَتَ- الشَــيئان. تَفاوُتــاً وتَفاوِتــاً وتَفاوَتاً): دوو شــتەکە جیاواز بوون/ لەیەك نەچوون/ نێوانیان دوور بوو.

(تَفاوَتا- في الفَضِــلِ»): لە چاکەو پیاوەتیدا جیاوازییان هەیەو لەیەك ناچن.

(ألفَــوْت (ج) أفْوات): ١-بۆشــایی نێوان دوو پەنجە ٢-تێپەڕین.

(«جَعَــلَ اللهُ رِزقَــهُ فَــوتَ فَمِــهِ»): خــودا وایلێکــردووە دەمــی ناگاتــە ڕۆژییەکــەی هەرچەندە لەبەردەمیدایە.

٣-(إفْتاتَ- على فُلان في الأمرِ): لە کارەکەدا (دژی ئەو ڕایدەربڕی/ دژی ئەو وەستایەوە).

٤-(إفتاتَ برَأيِهِ): لەســەر ڕایخۆی سووربوو/ پەسەند دیدەی ڕای خۆیبوو.

(-بأمرِهِ): بەبێ ڕاوێژی کەس لەسەر کارەکەی ڕۆیشت/ گوێی بە کەس نەدا.

(«فُلان يَفتاتُ عَلَيهِ»): فیسار بە بێ ڕای ئەو هیچ ناکات.

(ألفُوَيــت): (بــۆ مــێو نێــر): کەســێکە

سەرســەختانە كاربكاتو ڕا بە قســەی كەس نەكات/ قسە هەر قسەی خۆیبێت.

فوج: ١-(فاجَ- المِسْكُ. فَوْجاً): بۆنی مسكەكە بڵاوبووەوە.

(أفاجَ- الرَجُلُ): پیاوەكە پەلەیكرد.

(-الفَرَسُ): چارەویێكە غاریكرد.

٢-(فاجَ- النَّهارُ. فَوجاً): ڕۆژەكە ســاردبوو/ ساردیكرد.

(فَوَّجَ- عَن نَفسِهِ): خۆی فێنككردەوە.

(«لســتُ بِرائِحٍ حتى أُفَوِّجَ عَن نَفســي»): ناڕۆم تا خۆم فێنك نەكەمەوە.

٣-(أُستُفيجَ): گاڵتەی پێكرا.

٤-(ألفَــوج (ج) أفْواج وفُؤوج و (جج) أفاوِج وأفاجيج وأفاويج): ١-كۆمەڵ/ دەستە/ تاقمو پارچەیەكو بەشێكی سوپا.

(الفائِجة): ١-كۆمەڵ/ گــروپ. میانەی نێوان دوو گردە لم یان دوو بەرزایی.

فــوح: (فــاحَ-تِ القِــدرُ. فَوحــاً وفُؤُوحــاً وفَوَحاناً): مەنجەڵەكە هاتەكوڵ.

(-تِ الشَجَّةُ): برینەكە خوێنی لێهات.

(-الزَهرُ): گوڵەكە بۆنی خۆشی دایەوە.

(-المِسْــكُ أَو الطيــبُ): بۆنی مســكەكە یان عەترەكە بڵاوبووەوە.

(أفاحَ- الدَمَ): خوێنی ڕشت.

(-القِــدرَ): مەنجەڵەكــەی (هێنایــە كــوڵ/ جۆش).

(تَفاوَحَ- الزَهرُ): گوڵەكە بۆنی بڵاوكردەوە.

(فَــوحُ الحَرِّ): جۆشــی گەرما/ تاوســەندنی گەرما.

فوخ: (فاخَ-تِ الرِّيــحُ فَوَحاناً): باهەڵیكردو لوورمیهات.

(-الرَجُلُ): كابرا بای لێبەربووەوە/ تڕی یان تسی.

(أَفاخ الرَجُلُ) كابرا بای لێبەربووەوە.

(-الزِقُّ): مەشكەكە یان كوندەكە دەمیكرایەوە تا بۆنەكەی بڕوات.

فود: ١-(فادَ. فَوْداً): مرد.

(أَفادَ- الرَجُــلَ. إفــادَةً): ١-پیاوەكەی مراند ٢-لەناوبرد.

(المِفْواد): لەناوبەر/ فەوتێن.

(فــادَ- المالُ لِفُلان. فَوْداً): داراكە بۆ فیســار ساغبووەوە.

(أَفائِدَة): سوود.

(-أَفادَ- فُلانٌ المالَ. إفادَةً): (ماڵی/ دارای) بۆ خۆی (پەیداكرد/ دەستخست).

(-فُلاناً مالاً أَو علماً): داراو ماڵی یان زانستیی دایە فیسارو دەستگیریكرد/ كەڵكی پێگەیاند.

(-إســتَفادَةً-هُ): كەڵكی لێبینیو دەســتگیری خۆیكرد/ پەیدایكرد.

٣-(فادَ- الشــيءَ بِالشَّــيءِ. فَوْداً): شــتەكەی تێكەڵی شتەكەیتر كرد.

٤-(تَفَــوَّدَ- الوَعِــلُ فَــوقَ الجَبَــلِ): بزنــە

کێوییەکەی لەسەر شاخەکەوە ڕوانیە خوارەوە.

٥-(ألفَوْد (ج) أفواد) (ع ا): ١ لاجانگی سەر ٢-مووی لاجانگی سەر.

(«بَدَأَ الشَیبُ بِفَوْدَیهِ»): سپێتیی قژی لە هەردوو لاجانگییەوە دەستی پێکردو سەریدەرکرد ٣-جەوالو خەرار ٤-کۆمەڵەو دەستەی سوپا ٥-کەنار/ لا.

(فَوْدُ الخِباءِ أو الوادي): تەنشتو لای چادرەکە یان کەناری دۆڵەکە.

٦-(الفَودَج (ج) = الهَودَج): کەژاوەو باروبنەی بووك.

الملحق:

فود: (الفُودكا): خواردنەوەیەکی ڕووسییە کە لە گەنمەشامی یان گەنم دەردەهێنرێتو دروستدەکرێت.

---

فور: ١-(فارَ-تِ القِدرُ فَوْراً وفَوَراناً وفُؤوراً): مەنجەڵەکە هاتە کوڵو هەڵچوو.

(-الماءُ): ئاوەکە هەڵقوڵاو لەبەری ڕۆیشت.

(-العِرْقُ): دەمارەکە هەستاو توند لێیدا.

(-المِسكُ فَوراً وفَوَراناً): بۆنی مسك بڵاوبووەوە/ پەخشبوو.

(فارَ وأفارَ- القِدرَ. فَوراً): مەنجەڵەکەی هێنایە کوڵو هەڵچوون/ هەڵیچواند.

(ألفائر): هەڵچوو/ ڕقهەستاو/ توورە بوو.

(«فارَ فائِرُهُ»): دەمارگیر بوو/ ڕقی هەستاو گەرمبوو.

(«فارَةُ الإبِلِ»): بۆنی پێستی حوشتر کە تەردەبێت لە کاتی ئاودانیدا.

(الفَور) (مص): دەستبەجێ/ هەرزوو/ گورج/ یەکسەر/ دەمودەست/ دەستبەدەست.

(«رَجَعَ مِن فَورِه»): (هەر زوو/ دەستبەجێ) گەڕایەوە.

(فَوْرُ کُلِّ شَيءٍ): سەرەتای هەموو شتێك.

(الفَورَةُ مِنَ الحَرِّ أو الغَضَبِ): جۆشی گەرما یان ئەوپەڕی توورەبوون.

(«اَخَذتُ الشَيءَ بِفَوْرَتِهِ»): شتەکەم بە تازەیی برد.

(فَورَةُ النَّهارِ): سەرەتای ڕۆژ/ سەرلەبەیانی.

(- العَشاءِ): کە تاریکداهات.

(-الناسِ): کۆمەڵبوونی خەڵك/ کۆبوونەوەی خەڵك.

(فَورَةُ- الکَبَدِ (طب): هەوکردنیی جگەر کە زۆر جار دەبێتە هۆی خوێنپژانی لووت/ خوێنی لووتبەربوون.

(الفُوارة): ئەوەی لە مەنجەڵەکە هەڵدەچێتو دەڕژێت.

(ألفَوّار): ئازا هەڵچوو.

(الفَوّارة): مێی وشەی (ألفَوّار): سەرچاوەی هەڵقوڵین/ کانییو سەرچاوەی کانیی.

(ألفَوّار) (عند العامة): فوارە/ ئاوپەڕ کە ئاو بۆ سەرەوە هەڵدەدات.

(ألفَيُور): قوشقی/ مرۆڤی زوو هەڵچوو/ توندڕەوشت/ زوو تووڕەبوو.

٢-(فارَ وأفارَ- الميزانَ فَوْراً): دوو ڕاگری بۆ زمانەی ترازووەکە کرد.

(ألفَياران): دوو ئاسنن ڕاگری زمانەی ترازوون.

٣-(ألفار. الواحِدَةُ فارَة (ح) = فَأر): مشك. مشك.

(«حَبِلَ الجَبَلُ فَوَلَدَ فارَة»): شاخێکی زلە ئاوسبوو کە بووی مشکێکی بوو. بۆ کاری زۆر گرنگو گەورە کە ئەنجامێکی بێبایەخو هیچی ببێت.

(ألفُوْرُ) (ح): ئاسك.

(فائِر): ئاسکێك.

فوز: ١-(فازَ- بِالأَمرِ فَوزاً): لە کارەکەدا سەرکەوتو بە ئامانج گەیشت/ بردیەوە.

(-مِنَ المَكْروهِ): لە ناخۆشییەکە ڕزگاریبوو.

(فَوَّزَ- الطَريقُ تَفويزاً): ڕێگەکە دەرکەوتو کەوتەڕوو.

(أفازَ- فُلاناً بِكَذا): ئەوەی دەستگیری فیسار کرد.

(ألمَفازَة (ج) مَفازات ومَفاوز): دەروو/ بوار/ شوێنی ڕزگاربوون مایەی ڕزگاریی یان مایەی سەرکەوتن.

٢-(فازَ- الرَجُلُ. فَوْزاً): فەوتا/ مرد.

(فَوَّزَ. تَفويزاً): ١-لە خاکێکە دەرچووە خاکێکیتر.

(-الرجُلُ): ١-ڕابورد/ تێپەڕی ٢-مرد.

(-الراعي بِإبِلِهِ): شوانەکە حوشترەکانی بردە بیابانەکەوە.

(تَفَوَّزَ): لە زەمینێکەوە چووە زەمینێکیتر.

(ألفازَةُ): چەترێکی دوو ستوون یان دەوارێکی دوو ستوونی.

(«ضَرَبَ الفازَة في المَفازَةِ»): دەوارەکەی لە بیابانێکی وشکدا هەڵدا.

(المَفازَة (ج) مَفازات ومَفاوِز): ١-فەوتگە/ شوێنی فەلاکەتو مردن.

٢-(الفَلاة لاماءَ فيها): بیابانێکی وشكو بێئاو لە وشەی (فَوْزَ)ەوە هاتووە واتا مرد چونکە ئەو بیابانە جێی مردنە لەبەر بێئاوی دەیشڵێن بۆیە ناونراوە (مَفازَة) چونکە هەر کەسێك لێیدەرچێت سەرکەوتووەو ڕزگاریبووە).

فوش: (الفُوشيا) (ن): دەوەنێکە لە مەکسیكو زیلەندەی تازەوە هاتووەو بڵاوبۆتەوە گوڵەکانی جوانن ڕەنگرەنگن، ڕەنگیان زۆرە لە باخچەکاندا یان خانە دەستکردە تایبەتیەکاندا لە هەر شوێنێکدا بشێت دەروێنرێت.

فوض: ١-(فَوَّضَ- إلَيهِ الأَمرَ تَفويضاً): کردی بە بریکاری خۆی کارەکەی بەو سپاردو دەستەڵاتی خۆی دایە.

(ألمُفَوَّض): کەسێکە کە دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی وڵاتێکی لە لایەن دەوڵەتێکەوە

پێدرابێــت کــە ئــەو دەوڵەتە سەرپەرشــتی ئــەو وڵاتــە دەکات وەك(المفوض الســامي) دەســەڵات پێدراوی باڵا. یان کەســێکە کاری فەرمانگەیەکی پێبسپێرێت کە هی میرییەك بێت وەك ئەفسەرێکی پۆلیس/ قۆمیسەر یان کەســێکە کە دەوڵەتەکەی یــان کۆمەڵەکەی دەیکاتە نوێنەری خــۆی لە کۆنگرەیەکدا یان لە شــوێنێکی وەهادا تا راماریی‌و چونیەتی بۆچوونی خۆیان بگەیەنێت بۆیان پشتگیریی خۆی پیشانبدات‌و جەخت لەسەر ئەوە بکات.

(اَلْمُفَوَّضِيَّة): پێسپێردراوێتی.

(مَنصَب المُفَوَّض): پلەوپایەی ئەفســەرێکی پۆلیس/ قۆمیسەر.

٢-(فَوَّضَ- المَرأَةَ:تَفْويضاً): ژنەکەی بیمارەیی مارەکردو هێنای.

٣-(فــاوَضَ-هُ في الأَمــرِ مُفاوَضَــةً): ١-لــە کارەکەدا پێی یەکسانبوو ٢-بەشداریی لەگەڵدا کرد/ بــوو بــە هاوبەشــی ٢-پێبەپێــی ئەو رۆیشــت‌و دانوســانی لەگەڵدا کرد تا بکەونە رێکەوتنێك.

(تَفاوَضَ- القَومُ في كذا): خوێشگەل بۆ ئەوە دانووســانیانکرد/ گفتوگۆیــان لەســەر ئەوە کرد.

(-الشَــريكانَ في المالِ): دوو هاوبەشــەکە ١-لە داراکــەدا هاوبەشــییانکردن وەك یەکبوون‌و یەکسانبوون ٢-دانوسانیانکرد/ گفتوگۆیانکرد.

(«قَومٌ فَوَضى»): خوێشــگەلێکی یەکســان‌و وەك یەکن‌و سەرگەورەیان نییە.

(«أَمْرُهُــم فَوضــى بَينَهُــم وفَوْضُوضــى وفَوضُوضــاء»): خەڵکێکی تێکــەڵ بەیەك‌و وەك یــەك بێجیــاوازی کەڵك لە شــتی یەك دەبینن‌و وەردەگرن.

(«أَموالُهــم فَوضــى بَينَهُــم وفَوضُوضــى وفَوضُوضَــاء»): هەرچیــان هەیــە تیایــدا هاوبەشن‌و یەکســانن هیچ جیاوازییەکیان لە نێواندا نییەو کەسیان شــتی تایبەتیی خۆی نییە.

(اَلفَوضَــوي): کەســێکە کە ســەر بە بەرەی بەرەڵایی بێت‌و لە ژێر هیچ یاساو رێسایەکدا نەبێت.

(اَلفَوضَويَّــة): ١-شــیرازەیەکی رامیــاری‌و کۆمەڵایەتییــە کە تاکەکــەس تیایدا بەرەڵاو ئازادەو سەربەســتە لە هەموو دەســەڵاتێکی میریــی ٢-بارێکــی میللەتــە کە گــەل تیایدا بێســەرۆکە هەمــوو دەســەڵاتێکی میریــی وەستێنراوەو بەربەســتکراوە یان دواخراوە. ئەمــە رێرەوێکیشــە داوای ئــەوە دەکات کە میریی نەمێنێت‌و دەسەڵاتی میریی نەبێت.

(المُفاوَضَة) (مص): ١-دانوسان.

(شَــركَةَ مُفاوَضَــةُ وشِــركَةُ مفاوَضَــةٍ): هاوبەشــییەکە/ کۆمپانیایەکــە کــە تیایــدا هاوبەشــەکان لە داراو گێرانــی کۆمپانیاکەو

وامــدا یەکســاندەبن ئەمــە پێچەوانــەی کۆمپانیــای ( العنان) کە ئەوەیــە دوو کەس لــە کۆمپانیایەکدان هەر یەکە بە بەشــێکی ســامانەکەی بەشــداربێتو ئەویــتری واتــا ســامانەکەیتری خــۆی هەڵیســووڕێنێتو لە کۆمپاناکەدا نەبێت.

(مفاوَضَــة العُلَمــاء): گفتوگــۆو دانوســانو پێداچوونەوەیزاناکانلەزانستوبەیادهێنانەوەی هەریەکــە ئــەوەی دەیزانێت بیــدات بەوانیترو ئەوانیتر چی دەزانن لێیان وەرگرێت.

(اَلمُفاوَضات): دانوســان/ گفتوگــۆو وتوێژی نێــوان دوو کــەس یان زۆرتر یــان دوو تیپ. دوولا.

(مفاوضات تجارية او سياســية):دانوسانی بازرگانی یان رامیاری.

فوط: (فَوَّط-هُ):کراسە کورتەکەی لەبەرکرد یان بەرکۆشەکەی پێبەست.

(اَلفُوطَــة (ج) فُــوَط):کراســێکی کورتــە یان بەرکۆشــێکە کــە خزمەتــکارو کارەکەر دەیپۆشنو دەیبەستن (دەڵێن وشەکە سندییە یان تورکییە لەلای خەڵکە رەشۆکەکە ئەوەیە کە دەستی پێ وشــکدەکەنەوەو خاولییە یان دەستەسرە.

فوظ: (فاظَ. فَوْظاً وفَواظاً):مرد.

(«حان فَوظُهُ»):کاتی مردنی هاتووە.

فوع: (فــاعَ-تِ الحَشَــراتُ فَوعــاً) (عامية): مێرووچەکان ووروژانو بە کۆمەڵ هاتنەدەرێ.

(تَفَــوَّعَ- المَريــضُ) (عامية):نەخۆشــەکە رشایەوە.

(اَلفَوعَــة- مِــنَ الطيــب):پەخشــی بۆنی خۆش.

(-مِــنَ السَــمٌ):کارو تیژیــی بــۆنو توانای بۆنکردن.

(-مِنَ الشَّباب):سەرەتاو هەرەتی هەرزەکاریی.

فوغ: ١-(فاغَ- الطيبُ. فَوَغاً):بۆ نەخۆشەکە بەسەرداهاتو بلاوبووەوە.

اَلفَوغَــة- مِــنَ الطيب:پەخشــبوونی بۆنی خۆش.

(اَلفائِغَة):بۆنێکی تیژ کە لووت بچووزێنێتەوە.

(اَلفَوَغ):دەمزلیی.

(الأَفْوَغ):دەمقەبەو زل.

(«فَمٌ أَفْوَغ»):دەمێکی قەبەو زل.

(رَجُلٌ أَفْوَغ):پیاوێ:ی دەمقەبەو زل.

فوف: ١-(فاف. فَوْفاً):ئاماژەیە بۆ یەکێك کە شتێك بخوازێت بە لێدانی نینۆکی گەورەی لە نینۆکی پەنجەی شــایەتمانیو تێبیگەیەنێت کە هیچی ناداتێ تا هێندەی نینۆکێکیش.

(اَلفُــوف الواحِدَةُ فَوفَة (ج) اَفْواف):توێکڵی دانەوێڵە.

(اَلفُوف والفَوْف الواحِدَةُ فَوفَة (ج) أفواف): پەڵەی ســپی کە لە نینۆکــی منداڵاندا هەیە

٢-پارچە لۆکە.

(«ماذاقَ خُوفــاً وما أَغنى فُوفــاً»): هیچی نەچێشتو هیچی دەستنەکەوت.

٢-(ثَوبُ أَفْوافٍ وثَوبٌ مُفَوَّفٌ): ١-(بەرگێکی/ کراسـێکی) تەنك ٢-بەرگێك کە میلی سـپی ناودامانی تێدابێت.

٢-(ألفُــوف والفَوْف. الواحِــدَةُ فُوْفَة وفَوْفَة (ج) أَفْــواف): ١-میزڵدانــی مانگاو گا ٢-جۆرە بەرگێکی یەمەنییە.

٣-(ألفَوْفَل والفُوفَــل): دارخورمای ئەریکا/ گوێزی بێتیل، (ن) بەری درەختێکی هندستانە لە بەری درەختی (واڵــەك/ گوێزی بۆنخۆش دەچێت لە هندســتان دەروێت. بۆنخۆشــە بۆ پزیشــکیش بەکاردێتو رەقیەکەی لە هێزی سەندەلەوە نزیکە.

فوق: ١-(فاقَ- الشيءَ فَوقاً وفَواقاً): لە شتەکە زۆرتر بوو/ باڵاتر بوو/ سەری شتەکە کەوت.

(-أَصحابَــهُ بِالفَضــلِ أَو العِلْــم): لە چاکەو پیاوەتیو زانســتیدا لە هاوەڵەکانی لەپێشترو باڵاتر بوو.

(فَوَّقَ-هُ علــى قَومِهِ): لە خوێشــگەلەکەیی لەپێشترو بەرزتر گرت.

(تَفَوَّقَ- علىقَومِهِ):سەرداریخوێشگەلەکەیبوو/ لەوان بەرزتر بوو.

(ألفائِــق (فا) (ج) فائِقون وفَوَقَة): ١-نایابو چاكو ناوێزەی جۆری خۆی ٢-سەرکەوتووتر/ دەرچووتر.

(فَوقَ): (بۆ شــوێن) لەسەر/ لە سەرو/ سەر/ ژوور/ لە ژوورو ٢-پتر. زۆرتر (بۆکات).

(أَقَمْتُ فَوقَ شَهرٍ): لە مانگێك پتر (مامەوە/ نیشتەنیبووم).

(ألعَشرةُ فَوقَ التِسعَة): دە لە نۆ زۆرترە/ دە لە سەروو نۆوەیە ٣-باشتر/ لەپێشتر.

(«هذا فَــوقَ ذاكَ»): ئەمە لەو باشــترە/ لە پێشــترە ٤-لە جێی ناودێت وەك («إذا ذُكرتَ فَكُلُّ فَوْقٍ دونُ): کاتێك ناوی تۆ دێت هەموو/ هەرچــی لەســەروو تۆوەیە دێتە خــوارەوە نزمدەبێتەوە.

(ألفَوقاني): باڵایی/ سەروەیی.

(فيقَــةُ الضُحــى (ج) فِيَق وفيَــق وفيقات وأَفواق وأَفاويق): سەرەتای چێشتەنگاو دەمی بەرزبوونەوەی خۆر.

(«أَرضَعَني أَفاويق بِرِّه»): بە باشترین چاکەی خۆی پەروەردەیکردم.

(شــاعِرٌ مفيق- مُفْلِق): هۆزانڤانێکی مەزنی داهێنەر.

٢-(فاقَ- فُواقاً): هەناسەی هەڵکێشا.

(-الرَجُــلُ. فُواقاً وفُؤُوقاً): خەریکبوو گیانی دەدا/ لەسەرەمەرگدا بوو یان مرد.

(إنْفــاقَ- الجَمَلُ إنْفياقاً): حوشــترەکە تەواو لەر بوو مرداربووەوە.

(ألفُوَاق (ج) أَفْوِقَة وآفِقَة و (حج) أَفْوِقات): ١-هەنســکی ســەرەمەرگو مــردن ٢-(طب):

هەنسـك/ نزگـەرە. (الحازوقـة) (عامية): نزگەرە.
٣-(فاقَ- السَّهمَ فَوقاً): سەری تیرەکەی شکاند.
(-الشيءَ): شتەکەی شکاند.
(فاقَ. يَفاقُ وفَوِقَ. يَفْوَقُ- السَّهمُ. فاقاً وفَوْقاً وفَوَقاً): سـەری تیرەکە خواریی تێدابوو یان شکاویی تێدابوو.
(فَـوَّقَ- السَّـهمَ): سـەری تـیرە خوارەکەی لێکردەوەو بۆی دروستکردەوە.
(أفاقَ وأَفْـوَقَ وأوفَقَ- السَـهْمَ. إفاقَةً إفْواقاً وإيفاقاً): نووکی تیرەکەی خستە کەوانەکەوە تا بیهاوێت.
(إنْفـاقَ- السَّـهمُ. إنْفياقـاً): نووکی تیرەکە شکا.
(اَلفُوْق (ج) فُوَق وأفْواق): نووکی سەری تیرە کە دەخرێتە سەر ژێکە.
(«لَـهُ مِن كـذا سَـهْمٌ ذو فُـوق»): لەوەدا شانسێکی زۆری هەیە.
(هـو أعلاهُم فوقـاً»): لە هەمـوان بەختی باشترو بەشی زۆرترە.
(اَلفَوَق): خواریی‌و شکاویی نووکی تیر.
اَلفَواق (مص) («له مِن كذا سَهمُ ذو فَواق»): لەوەدا شانسێکی/ بەختێکی تەواوی هەیە.
(اَلفُوقَة (ج) فُوَق وفُقاً): ئەو جێی ژێیەی کە سەری تیرەکەی دەخرێتە سەر.
(اَلفائِـق) (ع ا): بێخـی مل کە بە سـەرەوە دەنوسێت.
(اَلسَّـهمُ الأَفْـوَق): ئـەو تـیرەی کە سـەری نوکەکەی شکاوە شکستی هەیە.
٤-(فَـوَّقَ- الفَصيلَ): ناوەناوە شـیرەکەی بە بەچکەکە دا.
(أفاقَ الحالِبُ. إفاقَةً): شیردۆشـەکە لە نێوان دوو جار دۆشیندا پشوویدا.
(-تِ النّاقَةُ): مێحوشترەکە پاش دۆشینی، شیر کەوتەوە گوانی.
(مُفيـق ومُفيقَـة (ج) مَفاويـق وفُيُـق): حوشتری شیر تێهاتوو.
(تَفَوَّقَ- الشَرابَ): شەربەتەکەی چۆرە چۆرە خواردەوە.
(-النّاقَةَ): حوشترەکەی بە پشوو دۆشی.
(حلـب الفَـواق): دۆشـینی پشـوو، ئەوەیە بیدۆشـێت پاش ئەوە بەچکەکەی ماوەیەکی کەم تێبەردات‌و دایکی بمژێت بۆ ئەوەی شیر دابداتەوەو بدۆشرێتەوە.
(تَفَـوَّقَ- الفَصيـلُ): بەچکەکە بە پشـوو و ناوبەناو لەگەڵ دۆشینی دایکیدا دایکی مژی.
(-مالَهُ): داراکەی بە شێنەیی خەرجکرد.
(إسْتَفاقَ- النّاقَةَ): حوشترەکەی بە شێنەیی‌و بە پشوو ناوبەناو دۆشی.
(اَلفيقَـة (ج) فيق وفيَق وفيقـات وأفْواق وأفاويق): شیرێك کە لە گوانی مێحوشترەکەدا لە نێوان دوو دۆشیندا کۆدەبێتەوە.

(ألأفاويق): ئەو ئاوەی هەور دەیگرێتە خۆیو تاوتاو دەیبارێنێت.

(ألفَــواق والفُواق) (دوو چاوگن): كاتی نێوان كردنەوەی دەســتی شیردۆشــەكەو گوشــینی گوانەكە.

(«أمْهِلنــي قَدَرَ فُــوَاقِ حالِــب»): هێندەی دەســتكردنەوەو گوشــینێكی گوانی حوشترم ماوە بدە. واتا ماوەیەكی زۆر كەم ماوەمبدە.

(طَعــامٌ مُفَــوَّقٌ): خواردنێــك چكــە چكە بخورێت.

٥-(أفــاقَ- مِــن مَرَضِــهِ إفاقَةً): نەخۆشــەكە (خۆشوبوەوە/ تەندروستبووەوە)/ چاكبووەوە).

(-السَــكْرانُ مِــن ســكرِهِ): سەرخۆشــەكە سەرخۆشی بەریدا/ هۆشیاربووەوە.

(-مِنَ النَوم): لە خەو راپەڕی/ خەوبەریدا.

(-المَجنــونُ مِن جُنونِهِ): شــێتەكە هۆشــی هاتەوە بەرخۆیو چاكبووەوە.

(-الزمــانُ): رۆژگــار پــاش تەنگانــە فەرو خۆشگوزەرانیی هاورد.

(-عَنهُ النُعاسُ): وەنەوزو خەو بەریدا.

(-مِن غَفْلَتِهِ): لە بێئاگاییەكەی رزگاریبوو و خۆشی هاتەوە بەر خۆی.

(إسْــتَفاقَ- الرُجُلُ مِن نَومِــهِ أو مَرَضِهِ أو غَفْلَتِــهِ- أفاقَ): پیاوەكە لە خەو راپەڕی یان لە نەخۆشــییەكەی چاكبووەوە یان بێئاگایی بەریداو هۆشی بە خۆیدا هاتەوە.

(ألفُــواق): لــە نەخۆشــی خۆشــبوونەوەو راستبوونەوە/ هەستناوە.

٦-(إفْتــاقَ- الرَجُلُ): هەژار كــەوت/ نەبوو بوو.

(ألفاق): بیابان.

(ألفاقَةُ): دەستكورتیی/ هەژاریی/ نەبوونیی/ نەدارایی.

٧-(ألفاق): ١-لەگەنی پڕ لە خواردن ٢-شانە.

(ألفُوْق): ١-سەری زمان ٢-یەكەم رێگا.

(«مارْتَــدَّ علــی فُوقِــهِ»): ئــەو رێگەیەی پیادارۆیشت لێینەگەرایەوە/ نەهاتە دواوە.

(ألفیقَةُ (ج) فیق وفیَــق وفیقات وأفْواق و أفاویق- مِنَ اللَیل): بەشی زۆری شەو.

فــول: (ألفُــول) (فارســیة) (ن): پاقلــە: رووەكێكــی گیاییــە لــە زۆر دەمێكــەوە دەچێنرێت گوڵی ســپی دەگرێــت كە پەڵەی رەشــی پێوەیە كەلوویەكی زۆرو چڕ دەگرێت كە ناوكی تێدایەو بۆ خواردن باشە بە كاڵیو بە كوڵاویی دەخورێتو جۆری زۆرە.

(ألفَــوَّال): ١-پاقلەفــرۆش ٢-پاقلــە (كوڵێن/ لێنەر).

فوم: ١-(فَوَّمَ): نانیكردەوە.

(ألفُــوْم (ج) فُوْمــان) (ز):١-گەنــم ٢-نــان ٣-هەمــوو ئــەو دانەوێڵانــەی كــە بــە نان دەكرێن.

(ألفُوْمَة (ج) فُوَم واحدة الفُوم): گوڵە گەنم

یان گوڵە جۆ.

٢-(أَلفُــوْم (ج) فُوْمــان) (ن): ١-ســیر ٢-(ن) نۆك.

(أَلفُومَــة (ج) فُوْم): ئەوەی بــە دوو پەنجە هەڵیدەگریت.

(أَلفُومــي الأَسْــوَد) (ن): هەڵەکۆکــی ڕەش. گوڵەکــەی زەردە بۆ ڕەگەکەی دەروێنرێت کە خواردەمەنییەکی باش‌و بەکەڵکە.

(أَلفامِيّ): بەقاڵ.

(فــون): (أَلفَاوانیا أَو عــودُ الصَليب) (ن): دارچــاخ: ڕووەکێکــە گوڵگەورە ســوورە یان ئەرخەوانــی بــە زۆری لــە باخچەکانــدا دەروێنرێت.

فوه: ١-(فــاهَ- بِکَذا. فَوهاً): ئــەوەی لە دەم هاتە دەرێ/ ئەوەیوت.

(فَوِهَ. فَوَهاً): داندرێژو دانریچ/ داندەرپەڕیوو دانشاش.

(فَوَّهَ-هُ): دانریچ‌و شاشبێت‌و دەرکەوێت.

(فاوَهَ وفاهــی- فُلاناً. مُفاوَهَــةً ومُفاهاةً): ١-دوانــدی/ قســەی لەگەڵدا کرد ٢-شــانازیی بەسەردا کرد.

(تَفَوَّهَ بِکَذا): ئەوەی وت/ ئەوەی لە دەمهاتە دەرەوە.

(-المکانَ): چووە دەمی شوێنەکەوە.

(تَفاوَهَ- القَومُ بِکَذا): خوێشگەل لەوە دوان/ دەربارەی ئەوە قسەیانکرد.

(إِسْتَفاهَ. إِسْتِفاهاً وإِسْتِفاهَةً): زۆری خواردو خواردەوە/ شپرزەی خواردن‌و خواردنەوە بوو چونکە لەوەپێش نەبــوو بیخوات/ ژەمبوردە بوو.

(أَلفُوهُ والفاهُ و الفیْهُ (ج) أَفواه): دەم/ دەو/ زار.

(فو): یەکێکە لــە پێنج ناوەکە لە عەرەبیدا. دەوترێــت (فوهُ وفاهُ وفیــهِ): دەمی/ دەوی/ زاری.

(سَــقَطَ- لِفیهِ): بەدەمدا کەوت/ لەپەوروو کەوت بەسەردەمدا کەوت.

(کَلَّمتُهُ فاهُ إِلی فِيَّ): ڕووبەڕوو قسەم لەگەڵدا کرد دەم بە دەم دواندم.

(أَلفَــوَه): دەمپانــی دان ڕیچــی دەرپەڕیوی داندرێژو شاش.

(أَلفُویه): دەمولکە/ دەمی بچووك.

(أَلفُوهَــة (ج) فُوْهات- مِنَ الوادي والطریق وجَبَــل النارِ): دەمی دۆڵ یان دەمی ڕێگا یان دەمی گڕکان.

(أَلفَوهَة): ١-جارێك دەمکردنەوە ٢ دەم.

(أَلفُوَّهَــة): واتــە واتە/ وتە تەی پاشــملەی خەڵك.

(«فُلان یَخافُ فُوَّهَةَ الناس»): فیسار لەواتە واتەو قسەی پاشــملەی خەڵك دەترسێت/ لە دەمی خەڵك دەترسێت.

(«إِنَّهُ لَــذُو فُوَّهَةٍ»): زۆربلــی‌و زماندرێژە/

زۆر بە دەمو زمانە.
(إنَّ رَدَّ الفُوَّهَةِ لَشَــديد): گێڕانەوەی قسە کە لە دەم دەرچوو گرانە.
(اَلفُوَّهَــة (ج) فَوَّهــات وأفــواه وفَوائِــه): سەرەتای/ دەمی شت.
(-مِــن الطريق والوادي وجبل النار): دەمی ڕێگەو دۆڵو کێوی ئاگرین/ گڕکان.
(اَلفُوَّهَــةُ التَنَفُّسِــيَّة): دەمــی کۆئەندامــی هەناسەدانی مۆریچە (مێروو).
(اَلفَيِّــه (م) فَيهَة): ١-دەمپــاراو/ ڕەوانبێژ/ بــەدەمو زمان/ قســەزان ٢-مــرۆڤو هیتری زۆرخۆر/ چڵێس.
(اَلأَفْــوَه (م) فَوْهــاء (ج) فُــوْه): دەمپــەل/ دەمگەورە.
(طَعْنَــةٌ فَوْهــاء): تیغبرینێکــی دەمگەورە/ دەمکراوەو فراوان.
(اَلمُفَوَّه): ١-بە گفتەو زمــان ٢-بە دەموزمان/ قسەزان ٢-ڕەوانبێژ.
(«خَطيبٌ مُفَوَّه»): وتاربێژێکی ڕەوانبێژەو بە گفتەوزمان.
٢-(اَلفُوَّهُ والفُوَّةُ) (يونانية): یاس/ ڕووەکێکە قەدەکــەی لکی زۆر لێدەبێتەوەو ئەســتوورە ڕەگــی وردی درێــژی ســووری هەیــە کە بۆ ڕەنگو دەرمــان بەکاردێــت پێیدەڵێن ڕەگی بۆیاخچییــەکان لە خۆرهەڵاتداو لە دەشــت دەڕوێت کە بنەڕەتو سەرچاوەیەتی.

(اَلأَفْواه (ج) أَفاويه والواحِدُ فُوه): ١ بەهارات ٢ تیژیی‌و کەســکونیی بۆنــی خۆش ٣-جۆرو چەشن‌و ڕەنگی شت.
(اَلمُفَوَّه): ١-بەرۆنیاس بۆیەکراو.
(شَرابٌ مُفَوَّه): ئاوی میوەیەك کە بە دەرمانی بۆنخۆش خۆشکرابێت/ بۆندرابێت.
(اَلمُفَوَّى): بەرۆنیاس ڕەنگکراوە.
فوا: (اَلفُــو) (ن): ڕووەکێکە ئازاری کەلەکەو مووڕزەی پێ چارەسەردەکرێت.
(اَلفُوَّة): ڕۆنیاس.
(أَرضٌ مُفَوّاة): زەوییەکی ڕووەکی یاســی زۆر بێت.
(في): پیتــی ژێرخەری وشــەیە لە عەرەبیدا. بــۆ ئاوەڵفرمان بەکلردێت بــی واتای ١-لەناو وەکو: («اَلخَمــرُ في الــزِق»): مەیەکە لەناو کووپەکەدایە ٢-لەگــەڵ وەکو: (جاءَ في القَوم وقُمتُ في شروقِ الشَمسْ): لەگەڵ خۆیشگەلدا هات‌و لەگەڵ خۆرهەڵاتدا هەستام ٣-بە هۆی/ لەبــەر وەك: («قُتِــلَ في ذنبِــهِ»): بە هۆی تاوانەکەیەوە کوژرا ٤ بــەراوردو پێوان وەك: (ماعِلمــي في بَحرِهِ إلاّ قَطرَةً): زانســتیم لە چاو هی ئەودا کــە دەریایە کە دڵۆپەیەکە ٥ بەرزکردنــەوە وەك: («لأَصْلِبَنَّكُم في جذوعِ النَّخــلِ»): بە لقــی دارخورماکــەدا هەڵتان دەواسم.
٦-(مــرادف لِـ(باء): هاو واتــای (ب)یە/ە بە،

وەك: («أَنتَ بَصيرٌ بِعَمَلِك»): تۆ بە كارەكەت شارەزايت.

٧-(مرادفة لـ (إلى): بۆ.

(«رَدَّ يَـدَهُ إلى جَيبِهِ»): دەسـتى بۆ گيرفانى بردەوە.

(مرادفة (مِن): بە، وەك: (مَضَت عَلَيَّ ثَلاثَةُ أشهر في ثلاث سنين): سێ مانگم بە سێ ساڵ لێرۆيشت.

(فيأ): ١-فاءَ. يَفيءُ فَيْأً): گەڕايەوە.

(«حتـى تفيءَ إلى أمرِ اللهِ»): تا بۆ فەرمانى خودا دەگەڕێتەوە.

(-الظِلُّ): سێبەرەكە گەڕايەوە.

(-الأمرَ. فَيئاً وفُيُوءً): گەڕايەوە سـەر/ لاى كارەكە.

(فَيَّأَ- الشَجرُ تَفيئةً): درەختەكە سێبەريكرد.

(-تِ الريـاحُ الغُصُـونَ): بـاكان چڵەكانـى هێناوبرد/ شەكانديانەوە.

(أفاءَ- الظِلُّ. إفاءَةً): سێبەرەكە گەڕايەوە.

(-هُ إلى كذا): بۆ ئەوەى گێڕايەوە.

(تَفَيَّأَ- الظِلُّ. تَفَيُّؤاً): سێبەرەكە گەڕايەوە.

(-الشَـجَرَةَ وفي الشَـجَرَةِ): لەژێـر سـايەى درەختەكـەدا (دانيشـت/ بوو)، چـووە ژێر (سايە/ سێبەرى) درەختەكەوە.

(-فُلانٌ): فيسـار شوێن سـێبەرەكە كەوتو لەگەڵيدا رۆيشت.

(«تَفَيَّأَ بِفيئِهِ»): خۆى خسـتە بەر سايەى/ خۆى دايە پەناو پاڵى/ پەناى بۆ برد.

(إسْتَفاءَ. إستِفاءَةً): گەڕايەوە.

(ألفَيء (مص) (ج) أفْياء وفُيُوء):١-سـێبەر/ سـايە كە هى شـتى بەرخۆرە (بۆيـە وتراوە (فَـيء) چونكـە سـێبەرەكە لـە لايەكـەوە دەگەڕێتەوە بۆ لايەكيتر) ٢-پۆلە مەل.

(ألفَيئَة): ١-سـێبەركردنێك ٢-گەڕانەوەيەكى سێبەر.

(ألفَيْئَة): جۆرى گەڕانەوە.

(«إنَّهُ حَسَنُ الفَيئَة»): ئەو چاك دەگەڕێتەوە.

(ألتَفيئَة) (مص): كاتو دەم.

(«دخل على تفيئَــة فُلان»): (بە دواى/ بە شوێن) ئەودا هاتە ژوورەوە.

(ألمُفاء): دەستبەسەرداگيراو.

(ألمَفْيَأة والمُفيُؤَة): ١-شـوێنى نسرم كە هەتاو لێينادات ٢-سێبەر.

٢-(فـاء- الغَنيمَـةَ فَيْئـاً): تالانييەكەيبرد/ تالانييكرد.

(أفـاءَ- علـى القَوم فَيئـاً. إفـاءَةً): تالانيى لايەكيترى بۆ ئەوان برد.

(أفـاءَ- اللهُ عَلَيهِ مالَ القَوم): خودا ماڵى ئەو خوێشكەلەى بەودا.

(تَفَيَّأَ- الأخبـارَ تَفَيُّؤاً): گوێى بۆ هەواڵەكان هەڵخست بە دوايدا گەڕاو ويستى بيزانێت.

(إسْـتَفاءَ- المـالَ إسْـتِفاءَةً): ماڵەكـەى بەتالانبرد.

(-ألأخبـارَ): بـۆ هـەواڵ گـەڕاو گوێـی بۆ هەڵخست.

(ألفَـيء (ج) أفْيـاء وفُيُـوء): ١-تاڵانیـی/ دەستکەوتی مفت ٢-باجو سـەرانە ٣-سێبەر/ سایە.

٣-(ألفَیئَةُ): دەم/ کات/ حەل.

الملحق:

فیـت: (ألفیتامـین): ڤیتامـین مادەیەکـی ئەندامییـە ڕووەك پەیدایـدەکات نـەك زینـدەوەر. بۆ لـەش زۆر پێویسـتە دەبێتە مایـەی کەڵکوەرگرتن لە خواردنو چالاکییو گورجوگۆڵی لەش.

(ألفیتو أو حَق النَقض): مافی هەڵوەشاندنەوەو پێقایلنەبـوون مافێکـە هی پێنـج دەوڵەتە گەورەکەیـە کـە ئەندامـی هەمیشـەیی ئەنجومەنی ئاسایشی دەوڵەتانن کە ئەمانەن: (چین. ڕوسیا/ یەکێتی سۆڤێتی جاران ولایەتە یەکگرتووەکانـی ئەمەریـکاو ئینگلتـەرەو فەرەنسـان) هەریەکە لەم پێنجـە دەتوانێت ئەو بڕیـارە ڕابگرێت هەڵیبوەشـێنێتەوە کە ئەنجومەنی ئاسـایش بیەوێت ئەنجامی بدات ئەگەر ئـەو مافی «ڤیتۆ» واتـا ڕەتکردنەوەی بڕیارەکەی بەکارهێنا.

فیـج: ١-(أفـاجَ- في عَـدوِهِ): غارەکەی یان ڕاکردنەکەی هێواشکردەوە.

(-القَومُ في الأرضِ): ڕۆیشـتنو بەسەرزەویدا بڵاوبوونەوە.

(ألفَیْـج (ج) فُیُوج): ١-پەیامبـەری پیادەی سـوڵتان ٢-نۆکـەر (وشـەکە لـە (پەیـك)ی فارسـیەوە وەرگـیراوەو کـراوە بـە عەرەبی ٢-کۆمەڵە خەڵکێك.

٢-(ألفَیـج (ج) فُیوج): زەویـی نزمو چاڵ/ نشێو.

(ألفائِجَة (ج) فَوائِج): دۆڵی نێوان دوو شاخ.

٣-(الفیجیتالـین) (لاتینیة): شـلە ڕۆنێکی ڕووەکـە کـە وەك ڕۆنیـتر بـۆ چێشـتو سوورکردنەوە بەکاردێت.

فیـح: ١-(فـاحَ- الحَـرُّ. فَیْحـاً وفَیَحاناً): گەرماتاویسەند/ جۆشیسەند.

(-تِ القِـدرُ): مەنجەڵەکـە هاتـە (جۆش/ کوڵ).

(أفاحَ- القِدرَ): مەنجەڵەکـەی هێنایە کوڵ/ جۆش.

٢-(فاحَ. فَیحاً): فراوانبوو/ کرایەوە.

(-الغارَةُ): هێرشەکە بەربڵاو بوو و تەنییەوە.

(-الدَمُ. فَیْحاً وفُیُوحـاً): خوێنەکە لەبەری ڕۆیشت.

(- تِ الشَـجَّةُ): برینەکـە خوێنێکـی زۆری لەبەر ڕۆیشت.

(-الشيءَ) (عامیة): شتەکەی دەرخست.

(-الربیـعُ): بەهـار سەرتاسـەری گرتەوەو هەموو لایەك سەوز بوو.

(فاحَ. يَفاحُ. فَيْحاً): فراوانبوو.

(فاح-تِ الغارَةُ): پەلامارەکە بەربلاو بوو.

(فَيَّــح- الشــيءَ): شــتەکەی پــەرش‌و بلاوکردەوە.

(«لو مَلَكْتَ الدنيا لَفَيَّحْتَها في يَوم واحِدٍ»): ئەگــەر هەمو دنیا هــی تۆ بێت بــە رۆژێك پەرش‌و بلاوی دەکەیتەوە.

(أَفاحَ- الدِّماءَ): خوێنێکی زۆری ڕشت.

(ألفَيْــح والفَيَــح): فراوانیــی/ بەربلاویی/ بلاویی.

(فَياح): شالاو/ هێرش/ پەلامار.

(«فَيْحــی فَيــاحِ»): ســوارانی هێرشــبەر بلاوببنەوەو بەری فراوان بگرن.

(ألغارَة): سوارانی هێرشبەر.

(ألفَيَّاح (م) فَيَّاحَة): ١-هێرشــی زۆر بەربلاو ٢-پری لێوانرێژ ٣-زۆر فراوان.

(«بَحــرٌ فَيَّاح»): دەریایەکــی (پان‌و بەرین/ بێپایان.

(رَجُــلٌ فَيــاحٌ): پیاوێکــی جوامێــرو لــە بەخشندەندا زۆر دەستبلاو.

(ألأَفْيَح (م) فَيْحاء (ج) فَيْح): ١-خاوەندارایەکی قورس‌و بەتوانا ٢-فراوان/ بێپایان.

(ألفَيحاء): ١-خانەی فــراوان ٢-ئاوەدانییەکی گەورە ٣-نازناوی شــاری بەســرەو دیمەشق‌و تەرابلوسە.

فيخ: (فاخَ. فَيْخاً وفيخاناً): لووراندی.

(فاخَ يَفوخُ- الواوي): چەقەڵەکە لووراندی.

فيد: ١-(فادَ. فَيْداً): مرد.

(-المالُ لَــهُ): داراکە بۆ ئەو چوو/ بوو بە هی ئەو.

(أَفادَ- الرَجُلَ إفادَةً): پیاوەکەی مراند.

(-الجَزورَ): ناژەڵەکەی سەربری.

٢-(-فَيْداً): بوو بە هی ئەو.

(-ت لَــهُ فائِــدَةٌ): ســوودی (لێوەرگرت/ بۆ بوو).

(-الرَجُلَ عِلْماً أو مالاً. إفادَةً): سوودی زانستی یان (ماڵی/ دارایی) پێگەیاند.

(-مِنــهُ علمــاً أو مالاً): زانســت یــان دارای لێوەرگرت‌و دەستگیریبوو.

(تَفايَدَ- القَومُ بالمالِ): خوێشــگەل ســوودی داراو سامانیان بەیەك گەیاند.

(إسْــتَفادَ- مِنهُ عِلماً أَو مالاً): کەڵکی زانست یان دارای لێوەرگرت/ بینی.

(ألفائِدَة (ج) فَوائد): ئەو زیادەیەی کە مرۆڤ لە شتێکدا دەســتیدەکەوێت ٢-ماڵ‌و دارایەك یان زانستێك کە دەســتگیری دەبێت/ کەڵك/ قازانج/ سوود.

(ت): ســوود کە خاوەنقەرزەکــە وەردەگرێت بــە هــۆی لــە لامانــەوەی قەرزەکــەوە لای قەرزدارەکــەوەو لــە ســەدا بــە ڕێژەیەکی دیاریکراوە.

(الفائِدة البســيطة) (ع ح): ســووکە سوود،

لەوە پەیدادەبێت کە سـوودەکە بخرێتە سەر پارە سەرمایە کارخراوەکە/ ئاوێتەی سەرمایە ئەبێت.

(اَلفائدة المُرَكَّبَة) (ع ح): ئاوێتە سـەرمایە: سوودەکە دەخرێتە سەر سەرمایەکەو لە کۆتایی هەموو ماوەیەکی دیاریکراودا کە سـاڵێك یان شـەش مانگ یان هەر ماوەیەکیتربێت لەگەڵ سـەرمایە دانراوەکەدا دەبێتە سەرمایە پاش چەند ماوەیەك: س (سـەرمایە کارخراوەکە + سـوودەکە × ماوەکان = دەبێتە سەرمایەی کۆتایی‌و ئاوێتە سەرمایە.

٣-(فـادَ وفَیَّـدَ وتَفَیَّـدَ= الرَجُـلُ. فَیْداً): خۆیباداو گەنجەفەیکرد/ فیزینواند.

(اَلفَیَّاد والفَیَّـادَة): خۆبادەر/ گەنجەفەکەر/ بەفیزو دەعیە.

(«هوَ یَمشـي علی الأرضِ فَیَّـاداً مَیَّاداً): بە فیـزو دەعیـەو خۆبادانەوە بەسـەر زەویدا دەروات/ بە کەش‌و فشەوە دەڕوات.

٤-(فَیَّدَ): سڵی لە دەنگی نێرە کوندە بەبووەکە کردەوە.

(اَلفَیَّاد) (ح): نێرە کوندە بەبوو.

٥-(اَلفَیْد): گەڵای زەعفەران.

فـیر: (اَلفِـیرُوز والفَیْـروزَج والفـیروزَج (فارسیة): بەردی پیرۆزە بەردێکی بەنرخە.

الملحق:

فیر: (اَلفَیْـرُوس): میکرۆبێکی زۆر وردە کە بە زەرەبینی ئاسـایی نابینرێت. دەبێتە هۆی هەندێك نەخۆشی وەك ئاوڵەو هاریی.

فیـش: ١-(فـاشَ. فَیشـاً): فشەفشـیکردو خـۆی بـادا/ فیزینوانـد/ شـتی وای وت کە لێیناوەشێتەوە.

(فائِش): فشەکەرو لووتبەرزی بەخۆناز.

(فایَشَ-هُ. فیاشـاً و مُفایَشَـةً): شانازیی بە سەردا کردو خۆی بەسەردا بادا.

(-الرَجُـلُ): فشەفشـی لـە جەنگـدا کردو هەڕەشەیکردو هیچیشی نەکرد.

(تَفَیَّشَ- الأمرَ): بە فیشاڵ کارەکەی دایە پاڵ خۆی.

(تَفایَشَ- القَومُ): خۆیشگەل شانازییانکرد.

(اَلفَیَّـاش): ١-گـەورەی لەپێش گـیراو ٢-زۆر فشـەکەرو بەخۆناز فیشـاڵی وایکردو شـتی وایوت کە لێی ناوەشێتەوە.

(اَلفَیوش): فیشاڵکەری بەخۆنازیو.

٢-(فَیَّشَ عَنِ الأمرِ): زۆر ترساو پاشەکشەیکرد خۆی لە کارەکە دزییەوە.

(تَفَیَّشَ- عَنهُ): لە بێدەسەڵاتی‌و بێتواناییدا هەڵگەڕایەوەو پاشگەز بووەوە.

(اَلفَیـوش): زیرەکـردووی بێدەسـەڵات/ بوودەڵە.

٣-(الفائِـش (عنـد العامَّـة): سـەرناوو شلەکەوتوو پێچەوانەی بنکەوتوو.

٤-(الفاشسـتي): کەسـێکە سـەر بە ڕژێمی

فاشستیەگان بێت.
(اَلفاشســتیة): ڕژێمێك بوو لــە ئیتالیادا لە ١٩٢٢-١٩٤٥ ســستەمی تاکە پارتیبوو. هەستی تیژڕەویی دەمارگیریی نەتەوەیی ڕێرەویبوو.
فیــض: (فــاضَ- في الأَرضِ فَيصاً): بەســەر زەویدا ڕۆیشت.
(-ەُ): لە دەستی دەرپەڕی.
(-مِنهُ): خۆی لێلادا.
(«مافِضــتُ أفْعَل»): هێشــتا هــەر خەریکم کاردەکەم.
(أَفاضَ- الكَلامَ): ئاخاوتنەکەی دەرخستو بە ڕوونی وتی.
(-ت يَــدُهُ): دەســتو پەنجــەی لە شــتەکە گیرنەبوو.
(«مالَــكَ عَنــهُ مَفيــضٌ): هیــچ چــارەو دەرفەتێکت نییە.
فیــض: ١-(فاضَ- السَــيلُ فَيْضــاً وفَيَضاناً وفُيُوضاً فُيُوضَــةً وفَيَضوضَةً): لێشــاوەکە بووبە لافاوو لە دۆڵەکەوە سەریکرد.
(-كُلُّ ســائِلٍ): هەمــوو شــلەیەك لــە بەری ڕۆیشت.
(«فاضَت عَينُهُ»): چاوی فرمێسکی بە خوڕی ڕژاند.
(-الشيءُ): شتەکە لێشاو بوو.
(-الخَبَرُ): هەواڵەکە بڵاوبووەوە.
(-الإِناءُ): قاپەکە پڕبوو/ لێی ڕژا.

(-صَــدْرُهُ بالسِــرِّ): نهێنییەکــەی لــە دڵدا پێرانەگیراو دەریبڕی.
(أَفاضَ- الدَمعَ. إِفاضَةً): فرمێسکەکەی ڕژاند.
(-الإِنــاءَ): (دەفرەکــەی/ قاپەکــەی) پــڕ، لێوانڕێژ کرد.
(-القَومُ مِنَ المَكانِ): خوێشــگەل لە شوێنەکە دەرپەڕینو بڵاوەیان لێکرد.
(- القَــومُ في الحديثِ): خوێشــگەل کەوتنە قسەو درێژەو پەلەیان لێکرد.
(-القَومُ على الرَجُلِ): بۆ پیاوەکە دەرپەڕینو بەزاندیان.
(-بالشيءِ): پاڵی بە شتەکەوە ناو فڕێیدا.
(«ماأَفــاضَ بِكَلِمَــةٍ»): وشــەیەکی لــە دەم نەهێنایە دەرێ.
(تَفَيَّــضَ- الجِفــنُ): پێڵوەکان فرمێســکیان ڕشت.
(إِسْــتَفاضَ- الخَبَرُ. إِســتِفاضَةً): هەواڵەکە هەموو لایەکی گرتەوە/ بڵاوبووەوە/ جاردرا.
(-الرَجُــلَ): داوای لە پیاوەکە کرد کە ئاوەکە بە لێشاو بڕوات/ بەربداتەوە.
(-المَكانُ): شوێنەکە فراوانبوو.
(القَــداحَ بَالقَــداحِ): پەرداخەکــەی بــە پەرداخەکەدا دا.
(-القَومُ في الحَديثِ): کەوتنە قســە هێنانو بردنو درێژەپێدانی.
(-الــوادي شَــجَراً): دۆڵەکــە فــراوانو پــڕ

درەختبوو.

(دِرعٌ فاضَةٌ): قەڵغانێکی پان.

(اَلفَيْــض (ج) فُيُوض وأَفْيــاض): زۆر زۆر/ لێشاو/ فرە/ بێشومار.

(ماءُ فَيضٌ): ئاوێکی (لێشاو/ زۆر).

(«أَعْطــاهُ غَيضاً مِن فَيض»): کەمەکێکی لە لێشاوێك دايە.

(رَجُــلٌ فَيــضٌ): پياوێکی زۆر بەخشــندەو جوامێرو چاکەکار.

(-مِــنَ الخَيلِ): ئەســپێکی بــە توانا کە زۆر بڕوات/ غاربکات.

(أَرضٌ ذاتِ فُيُــوض): زەوييەکــی بەئــاو/ زۆنگ.

(اَلفَيَّاض): پڕئاو/ بە ئاوی زۆر.

(نَهرٌ فَيَّاض): ڕووبارێکی ئاو زۆر.

(رَجُــلٌ فَيَّــاض): پياوێکی زۆر بەخشــندەو سەخی/ دڵفراوانو دەستکراوە.

(حديــثٌ مُفاض ومُسْــتَفيض ومُســتَفاض فيه): ئاخاوتنێکی بڵاوو بيستراو.

(دِرعٌ مُفاضَة): قەڵغانێکی دەڵبو پان.

٢-(فــاضَ. فَيْضــاً وفُيُوضاً): مــرد/ گيانی دەرچوو.

(-ت نَفسُهُ): گيانی دەرچوو.

(اَلفَيض) (مص): مردن.

(ذَهبنــا فِي فَيــضِ فُــلان): لەگــەڵ تەرمی فيساردا ڕۆيشتين.

الملحق:

فيــض: (اَلفائِض): زۆرو زەبەندە/ ئەوەی لە شتێك زياد دەبێت.

(«خَيْرٌ فائِض»): فەڕو خێرێکی بەلێشــاو/ زۆرو زەبەندە.

(مَحصولٌ فائِض»): بەرهەمێکی ئێجگار زۆر کە لەوە زۆرتر بێت کــە دياريکرابێت يان لە ژمارەکە زۆرتر بێت.

(اَلفائِض مِن مَبلَغ): لە پارەيەکی ديار زۆرتر/ زيادەی پارەيەکی دياريکراو.

(«فائِض الميزانِيَّة»): زيادەی بودجە.

(«بــاعَ الفائِــضَ مِــنَ الإنتــاج): بەرهەمە زيادەکەی فرۆشــت/ زيــادەی بەرهەمەکەی فرۆشت.

(اَلفائِض (ج) فَوائِض): سوود کە سوودخۆرێك لەو پارەيەی داوێتی بە سوود وەريدەگرێت.

(اَلفَيَضان): لافاو.

(فَيضانُ النيل): لافاوی ڕوباری نيل. لافاو: بە هۆی بارانی زۆرو لێشاوی هاتووەوە ئاوچەيەك دادەپۆشێت.

(«اَلأَضــرار التي تُسَــبِّبُها الفَيَضانــات»): ئەو زيانانــەی کە لافــاوەکان دەيگەيەنــن بە وڵاتو خەڵك.

(اَلفيضان مَجازاً): لێشــاو بە خوازە: لێشاوی کاڵاو بەرهەمــی زۆر کــە بــازار دابگرێــتو ڕيبکات.

(«فَيَضانُ السِلَعَ الأَجنبيَّةِ في الأَسواق الوطنية»): لێشاوی کاڵاو شتومەکی بێگانە کە بازارە نیشتمانییەکان دادەگرێت‌و پڕدەکات.

فیظ: (فاظَ. فَيظاً وفَيَظاناً وفُيوظاً وفَلَيظُوظَةً): مرد.

(أَفاظَ- ه اللهُ): خودا مراندی/ گیانی دەرکرد/ کوشتی.

(«ضَرَبْتُه حتى أَفَظْتُ نَفْسَهُ»): هێندەم لێدا تا گیانم دەرکرد/ کوشتم.

(أَلفَيْظ) (مص): مردن.

(«حان فَيظُهُ»): کاتی مردنی هات.

فيف: (أَلفَيْف (ج) أَفْياف وفُيُوف): ١-بیابانێکی وشکی بێئاو ٢-شوێنێکی تەختانی.

(-مِنَ الأَرضِ): زەویەیەک کە لە هەموو لایەکەوە بای لێهەڵبکات.

(أَلفَيْفاء (ج) فَيافٍ): تاوێری لووس.

(أَلفَيفاء والفَيْفاة والفَيْفى (ج) فَيافٍ): ١-بیابانێکی وشکی بێئاو ٢-شوێنێکی تەختانی.

فيق: (فاقَ. فَيْقاً): گیانی بە دەستەوە داو مرد.

(أَفْيَقَ- الشاعِرُ إِفْياقاً): هۆزانڤانەکە/ شاعیرەکە لە هەڵبەستەکەیدا شتی وا جوان‌و باڵای دانا کە سەرسوڕبمێنێ.

(أَلفَيْق) (مص): کارمگاری مریشک.

فيل: ١-(فالَ- رَأْيُهُ فَيْلَةً وفُيُولَةً وفَيْلُولَةً): راکەی هەڵەو پووچبوو.

(فائِلُ الرَأْيِ وفالُهُ وفيلُهُ وفِيِّلُهُ): کەسێکە را هەڵەو لاواز/ را پووچ.

(فَيَّلَ رأيَهُ): راکەی بە هەڵەو ناشیرین دانا بە نادروستی دایە قەڵەم.

(فَيَّلَ- الرُجُلُ في رأيِهِ): راکەی نەپێکاو نادروستبوو.

(تَفَيَّلَ رأيُهُ): راکەی ناتەواو بوو.

(فالُ الرَأْيِ وفائِلُهُ وفيلُهُ): رای ناتەواو/ لاواز/ نادروست.

(أَلفَيْلَةُ) (مص): هەل.

(«أَتَتني فَيلَةٌ على فُلان») (عامية): هەلێکم بۆ هەڵکەوت کە چیم بوێت لە فیساری دەربهێنم.

(فَيِّلُ الرَأْيِ (ج) أَفيال): رای کز/ ناتەواو/ پووچەڵ.

(أَلفَيالَة): (لاوازیی/ ناتەواویی) را.

٢-(فالَ- الرَجُلُ. فَيْلَةً وفُيُولَةً وفَيْلُولَةً): کەتەو قەبە بوو وەك فیلی لێهات.

(تَفَيَّلَ- الرَجُلُ): زۆر قەڵەو بوو.

(الفيل (ح) (ج) أَفيال وفيَلَة وفُيُول (م) فيْلَة): فیل: زیندەوەرێکە لە هەموو زیندەوەرێك گەورەترە لووتێکی درێژی هەیە ئاڵف‌و ئاوی پێ دەبات بۆ دەم‌و دەیشیوەشێنێت.

(الفيل): قەبەی رسوا.

(داءُ الفيل) (طب): پاگرە/ لاق ئەستوور بوون. نەخۆشییەکە لاق‌و پێی زۆر ئەستوور

دەبێت و لووی چەوریی تێدا پەیدادەبێت.
(ألفيّال (ج) فَيَّالَة): فیلەوان یان خاوەنفیل.
(فَيِّلُ اللَّحْم (ج) أفيال): گۆشتی زۆر.
(ألمَفيولاء) (ح): بەچکە فیل.
٣-(تَفَيَّـلَ- النَبـاتُ): ڕووەکەکـە پـیر بوو پەکیکەوت.
(-الشَبابُ): گەنجێتیی و جوانی، تەواو گەیشت/ پیری تێدا دەرکەوت.
٤-(ألفـال): سـوککردنی وشـەی(ألفـأل): نوقلآنەلێدان.
٥-(ألفيلَجَـة (ج) فَيالِـج ويُقالُ لَهـا أيضاً الصُلَّجَة) (ایطالیـة): پەردەیەکی خۆپارێزە لە ئاوریشمە کرمی ئاوریشم بەدەوری خۆیدا دروسـتیدەکات تیایدا دەنوێت ئەوە پەردەی کرمی ئاوریشـمەکە ئاوریشـمەکەیەو ڕەشە خەڵکەکە پێیدەڵێن:(شَـرنَقَة) قۆزاخەی کرمی ئاوریشم.
٦-(الفَيْلَـق (ج) فَيالِـق): ١-سـوپای مـەزن ٢-پیاوی مەزن.
٧-(ألفَيْلَـم (ج) فَيالِـم): ١-زۆر ترسـنۆك: زیرەکـردوو ٢-چـاڵاوی دەمپان و پەل ٣-شـانە ٤-پارچە چەرمێکە دەخرێتە ژێر کەسێك کە ملی دەقرتێنرێت یان سزا دەدرێت ٥-خڵتەی زۆر.
(ألفيلَم والفَيْلَماني): پیـاوی مەزنی کەتە/ چەتەوڵ.
٨-(ألفِيليرِيًـة) (ن): فیلیریـا: دەومنێکـە لە زەیتونە کێویلە دەچێت، گەڵاکەی هێلکەییەو کەمەکێك درکاوییە. بەرەکەی وەك تریبەکی وردە. بۆ جوانیی و ڕزاندنەوە دەروێنرێت.
فين: (فانَ. فَيْناً): هات.
(ألفَيْنَـة): ناوە نـاوە/ ناوبەنـاو/ تاوەتاوە/ تاوتاو.
(ألقاهُ ألفَيْنَةَ بَعدَ الفَيْنَةِ أو فَيْنَةً بَعدَ فَيْنَةِ): (ناوبەناو یان تاو تاو یان ناوەناوە) دەیبینم.
(ألفَيْنَة) (عامية): زیرەکردن/ زۆرترسان.
(«فـانَ فَهوَ فائِن») (عامية): زیرەکرد ئەو زیرەکردووە/ زۆرترسنۆکە.
(«فَيَّنَهُم فُلانٌ»): فیسار ئابرووی زیرەکردنی بردن و دەریخست.
(ألفَينان (م) فَينانَة): قژجوانی قژ درێژ.
فيه: (تَفَيْهَق- في الكَلام): درێژەی بە قسەدا/ لەسەر قسەکە ڕۆیشت.
(-في مَشـيَتِهِ): (بـەلارو لەنجـە/ بـە فیزو خۆبادان) ڕۆیشت.
(-عَلَيهِ بِكَذا): بەوە نازی بەسەردا کرد/ خۆی بەسەردا بادا/ خۆی بەسەردا فشکردەوە.
(ألفَيهَق (ج) فَياهِق): هەموو شتێکی فراوان/ پان و پۆڕ.